زنجیره پەرتووکی کەشکۆڵی کەڵاتەرزان ١





# گەنجینەی پزیشکیی حەکیمانی کوردەواری

بەشی یەکەم

ئامادەکردن و نووسین
**ئیرەج مورادی باقلاوایی**

زنجیرە پەرتووکی **کەشکۆڵی کەڵاتەرزان ـ ١**

# گەنجینەی پزیشکیی حەکیمانی کوردەواری

**(بەشی یەکەم)**

**ئامادەکردن و نووسین:**

**ئیرەج مورادی باقلاوایی**

| | |
|---|---|
| سرشناسه: | ایرج مرادی، ۱۳۶۳ |
| نام و عنوان پدیدآور: | کەشکولی کەلاتەرزان، ئیرەج موڕادی باقلاوایی |
| مشخصات نشر: | سنندج: انتشارات روژ، ۱۳۹۰- |
| مشخصات ظاهری: | ج. ۱، ق.۱. |
| شابک: | ۹۷۸-۶۲۲-۹۵۱۷۵-۱-۲ |
| وضعیت فهرست نویسی: | فیپا |
| یادداشت: | کُردی |
| یادداشت: | فهرستنویسی بر اساس جلد اول، ۱۳۹۸ |
| مندرجات: | - ج. ۱، ق.۱. گەنجینەی پزیشکیی حەکیمانی کوردەواری |
| موضوع: | پزشکی سنتی -- ایران – کردستان |
| موضوع: | Traditional medicine -- Iran – Kurdestan |
| موضوع: | پزشکی—ایران— تاریخ |
| موضوع: | Medicine -- Iran – History |
| ردەبندی کنگره: | ۱۳۹۰ی م ۳۷ ک ۱۳۷/۸/۹ R |
| ردەبندی دیویی: | ۶۱۰/۹۵۵۴۲ |
| شماره کتابشناسی ملی: | ۵۵۲۴۱۶۹ |

زنجیرە پەرتووکی **کەشکۆڵی کەڵاتەرزان ـ١**

# گەنجینەی پزیشکیی حەکیمانی کوردەواری

(بەرگی ۱، بەشی یەکەم)

ناسنامەی پەرتووک

ناوی پەرتووک: گەنجینەی پزیشکیی حەکیمانی کوردەواری

نووسەر: ئیرەج موڕادی باقلاوایی

ڕازانەوە و ڕێکخستنی دەق: مەحیەدین کەریمیان

ڕووبەرگ: سیروان بابائاغایی

شابەك (ISBN): ۲-۱-۹۵۱۷۵-۶۲۲-۹۷۸

نۆرە و ساڵی چاپ: یەکەم، ۲۰۱۹/ بەهاری ۱۳۹۸

پەخشانگا: ڕۆژ

تیراژ: ۱۰۰۰ دانە

نرخ: ۱۰۰۰۰ دینار

ناوەندی بڵاوکردنەوە: شارەکانی ڕۆژهەڵات و باشووری کوردستان

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتیی کتێبخانە گشتیەکان

ژمارە سپاردنی (١١٤١)ی ساڵی (٢٠١٩)ی پێدراوە.

### کەشکۆڵ

هەمان کەرەستەی خڕ و درێژۆکەیە لە جنسی کۆلکە و کوولەکە یا کانزا کە سەردەمانی کۆن دەروێش و گەڕیدەکان لە شانیان دەکرد و بۆ هەڵگرتنی توێشە و نان و ئاو بەکاریان هێناوە، هەروەها کەشکۆڵ، واتا هەمان دەفتەری بیرەوەری و تێبینی و ئەزموونی مەلا و میرزا و دیواخاندارەکان کە زیاتر لە قەبارەیەکی درێژدا بووە.

### کەلاتەرزان

ناوچەیەکی بەربڵاوە کەوتووەتە نێوان شارەکانی سنە و مەریوان. لە کۆنترین بەڵگە مێژووییەکان سەر بە کوێستانەکانی شارەزوور ئەژمێردراوە. پێش میرنشینی ئەردەڵان و بابان سەر بە دەسەڵاتی شارەزوور بووە. دواتر کەوتووەتە ژێر دەسەڵاتی میری قەلاکانی زەڵم، مەریوان، حەسەناوا، هەورامان و سنە.

سەردەمانی کۆن ئەو ناوچەیە بریتی بووە لە سێ بەشی "پشترێ"، "بەررێ" و "کورەوێز".پاشان بووەتە کەلاتەرزان و کوڕەوێز. لە دوا چارەنووسی جوغرافیاییدا بووەتە ناوچەکانی ئێستەی کەلاتەرزان، کۆماسی، ئاریز، سەرنوێ و بەرپلە.

باقلاوا یەکێك لە ئاواییەکانی ناوچەی کەلاتەرزانە کە بۆخۆم لەوێ لەدایك بوومە و فرچکی ژیانم گرتووە.

ئەم بەرهەمە پێشکەش بەو:

**پیرەژن و پیرەپیاوانەی کە،**

**بە دڵ و بە گیان ئەزموون و زانستی کۆنیی**

**حەکیمانی کوردەوارییان پاراستووە و گەیاندوویانەتە نەوەی ئێستا؛**

**هەروەها دیاری بەوانەی تێ دەکۆشن ئەو کەلتوور و**

**گەنجینەیە لەبیر نەچێتەوە و دەیپارێزن و دەینووسن و بڵاوی دەکەنەوە.**

**و دیاری بە هاوژینم «حەلیمە» و کەنیلەم «ژیانا»**

# پێڕست

## پێشەکی نووسەر

هەمووی لەسای خوێندنی دواناوەندی لە هونەرستانی کشتوکاڵی شاری سنە سەری هەڵدا. لە پۆلی دە جیا لە خوێندنی قوتابخانە، لە فێرگەی مامۆستا شەریف حوسەین‌پەناهی ڕێنووس و ڕێزمانی کوردی فێر بووم. هەر ئەوە بوو ڕۆژبەڕۆژ کەڵکەڵەی نووسین و خوێندنەوەی کوردی لام فرەتر دەبوو. قۆناغی دواناوەندی و پاشان حەوت ساڵ زانکۆ تا قۆناغی ماستەر (فوق لیسانس) لە بەشەکانی زراعە، گیاپزیشکی، باخداری و گیابژارەکان درێژەم بە خوێندن دا. هەر لە کاتی هونەرستانەوە ناوی زۆربەی گیاکان بە کوردی لە دەفتەر و کتێبەکانمدا یاداشت دەکرد. بەرەبەرە هەمبەری کوردی و فارسی گیا و گوڵەکان لەچاو کەسانی دەوروبەر زیاتر دەزانی و دەمناسیەوە. لەلایەکی ترەوە لەدایکبووی گوند و پەروەردەی بەردەستی باوك و دایكێك هۆگر بە کاری کشتوکاڵ و گیا و سروشت بووم. بەهارانە دایکم بۆ گیابرژیوە دەشت و کوێستانی دەکرد و هەمەگیا و تامی ناوچێشتی کۆ دەکردەوە و باوکم بە گیادروون و دروێنە و بژار خەریك بوو. ئەمانە هەموو بوونە پاشخانێکی باش لەسەر خوێندن لە بواری زانستی کشتوکاڵ و دوایی بوونە پاڵنەر بۆ گەشە و پێشکەوتن لەو بوارەدا.

شارەزابوون بە ناوی گوڵ و گیای کوردەواری بەختێکی باش بوو. گەلێك دەرچە و ڕێچکەی داهاتوو بەو بۆنەوە لە بەردەم ژیانمدا کرانەوە. لەپاڵ گیاناسی و شارەزابوون بە ناوی گوڵ و گیاکان، لەگەڵ بواری چارەسەریی بە گیا ئاشنا بووم. ئەگەرچی هەمیشە لەبەرا خۆم بە گیاناس زانیوە و ئەگەر هەندێ بەرپرسیارەتی بەرامبەر بە خەڵکی و هۆگری بە بواری کەلتووری کۆنی پزیشکی کوردەواری نەبێت دەست لە کاروباری گیادەرمانی نادەم و دەیسپێرم بە پسپۆڕانی خۆی. ئەڵبەت تا وەکوو ئێستا لە بواری چارەسەریدا خۆم بە شایانی ئەوە نەزانیوە کاری کرداری بکەم. چونکە گیاناسی و گیادەرمانی لە هەموو وڵاتانی دنیا دوو بەستێن و بواری جیاوازن. ئەگەرچی لە کۆنەوە لە کوردەواری وا باو بووە کە حەکیمان و نۆژداران سەرەتا بەپێی پێویست گیا و گوڵی دەوروبەری خۆیان ناسیوە تا بۆ ماجووم و هەتوان و هەنوونی بەردەستیان بەکاری بهێنن. چونکا ئەوساکە زۆربەی دەرمان و گیراوەکان

لە ماکی گژوگیا و هەندێ بەرهەمی ئاژەڵی و کانزایی و خاکی دروست کراون. هەر بۆیە شارەزایی و ناسینی گیاکان و سروشت پێشینەیەکی لەبەر و پێویست بووە تا حەکیم بتوانێت کاری گیادەرمانی و چارەسەری بەچاکی ئەنجام بدات. بەداخەوە ئەورۆکە زۆربەی نەریت و باوی حەکیمانی کۆن لەبەر چاو ناگیردرێت و بەشێکی کەم لەوانەی پیشەیان بووەتە گیادەرمانی، بازارێکی خەڵك فریودان و پارە خڕ کردنەوەیان ساز کردووە. بە بەڵگەی بەرچاو ئێستاکە چەندین ئاسیو و نارێکی کەوتووەتە ناو بواری گیادەرمانی کە پێویستە ویژدانی کۆمەڵگا و لایەنی پێوەندیداری حکوومەت ئاوڕی لێ بداتەوە تا زیاتر تەشەنە نەکات:

*- کەسانێك بەشێوەی ناڕاست خۆیان هەڵواسیوە بە بنەماڵەی حەکیمانی کۆن. وەك نهێنی و سێحر و جادوو باسی ڕەچەتەکانی حەکیمی دەکەن و لای ئەوان درکاندنی ناوەرۆکی دەرمان و ڕەچەتەکان، هەموو جزوبەندێکی پزیشکیان هەڵدەوەشێتەوە.*

*- کەسانێك هیچ دەستی پزیشکی و نوژدارییان نییە. هەر ئەوەی سەر بە بنەماڵەی حەکیمێك ئەژمار دەکرێن دووکان و دەفتەرێ دەکەنەوە. خەڵك بەهۆی ناسراوی باب یا باپیری حەکیمی ئەوان سەردانیان دەکەن.*

*- کەسانێك مامۆستای ئایینین و بەهۆی شارەزایی لە قورئان و فەرموودە، تونەدڕەوانە بۆچوونی هەڵێنجراوی خۆیان لەو سەرچاوانە بە شێوەی دەرمان و ڕەچەتە بۆ چارەسەری نەخۆشان ئەنووێنن. هەندێ جار ڕەچەتەی وا لەو کەسانە دەرکەوتووە کە هیچ پێوەندیەکی بە قورئان و فەرموودەوە نییە و تەنیا فریواندنێکە.*

*- کەسانێك هەن لە زانکۆکان "گیاپزشکی" و "کشت و کار گیاهان دارویی" خوێندووە. کاتێك دەگەڕێنەوە بۆ بازاڕ و ڕوو لە بژیوی ژیان دەکەن بە ناوی پسپۆڕی گیادەرمانی دەستبەجێ دووکانێك دەکەنەوە. کەسێك گیاپزیشکی خوێندووە پسپۆڕیی لە بواری نەخۆشی، گیابژار و مێرووە زیانبەخشەکانی بەرهەمی کشتوکاڵی بە دەست هێناوە، هەروەها خوێندکارێك کە کشتوکاڵی ڕوەکە دەرمانیەکانی خوێندووە کاری لەسەر چۆنیەتی بەرهەم هێنان و چاندن و کۆکردنەوەی بەرهەمی ئەو گیا و گوڵە پزیشکانە بووە. کەواتە باسی گرتنەبەری پیشەی گیادەرمانی لەو دوو بوارەدا کارێکی نەشیاوە و دروست نییە.*

*- هەندێ جار ئەبینرێت کە کەسانێك هۆگر و هەواداری بواری ژینگە، شاخەوانی، کشتوکاڵ، بەرهەمی سروشتی و گیافرۆشین. ئەوانیش پیشەی گیادەرمانی دەگرنە بەر و لاسایی حەکیم و نوژداران دەکەنەوە. هەندێ جار وەستای کەڵەشاخ، ناوكگرتنەوە، پشتشێلان، کەهەنگ و هتد، کاری گیادەرمانی دەکەن.*

بە هەرحاڵ ئەورۆکە ئاسیوەکانی سەرەوە لە بواری گیادەرمانی و پزیشکی خۆماڵی کوردەواری بەرچاو دەکەوێت. لەو چەند ساڵەدا کە بۆ کۆکردنەوەی بەرهەم و بەسەرهاتی حەکیمان و نوژدارانی ئەو نیشتمانە بە شار و گوندەکاندا گەڕاوم گەلێك بابەتی سەیر و سەمەرە لە کەسانێك وا خۆیان بە حەکیم و پزیشك داناوە، بینیوە. لە لایەکی دی گەلێك شۆڕەژن و شێرەپیاوی نەناسراوم بینیوە کە تەنیا لەڕاهی خودا و خزمەت بە خەڵکی نەخۆش و دەردەدار، پیشەی پزیشکییان وە ئەستۆ گرتووە. بەڕاستی ئەرکێکی لەبەر و پێویستە کە هەوڵێکی فراوان بخرێتە گەڕ، پزیشك و کۆلکەپزیشکان لێك جیا بکرێتەوە. حەکیمی گەورە "ابوعلی سینا" لە "قانون در طب" کۆلکەپزیشك و لاسایی‌کەرەوەکانی حەکیمی بە "مطبب: پزشکنما" داناوە.[1] کەواتە وا دەخوازێت بۆ چارەسەری ژان و نەخۆشی، ڕوو لە پزیشك و حەکیمان بکەین نەك کۆلکەحەکیم و دووکاندارانی پزیشکی.

با بگەڕێینەوە سەر باسی ئەزموونی خۆم لە توێژینەوەی بواری گیاناسی و گیادەرمانی. وەك هاتە بەرباس، گیاناسی و گیادەرمانی دوو بواری جیاوازن. ئەگەرچی لەو نێوانەدا دەبێ پێوەندیەك هەبێت. چونکە کەسێك گیایەك دەخاتە ناو ماجووم و هەتوان و دەرمانێك، دەبێ سەروبەری ئەو گیایە بناسێت. ئەگینا لەوانەیە لێکەوتە و پێشهاتە خراپەکانی ئەو گیایە ئاستی نەخۆشەکە چەند قات ناخۆشتر بکات. ئەگەر خوێندنەوەیەك لەسەر چینی گیادەرمانانی تازە لە کوردەواریدا بکەین بەتایبەت ئەوانەی لە شار لەدایك بوون و کەمتر کەشی سروشت و ژینگە و کشتوکاڵیان دیتووە، ئاستی گیاناسی ئەوانە شیاوی پێشینەی پێویستی پیشەی پزیشکی نییە. پێش داهاتنی ڕێکخستنی تازەی پزیشکی و دەرمانخانەکانی سەردەم، سروشت و ژینگەی دەوڵەمەند بە گوڵ و گیا پاڵپشتی سەرەکی حەکیمان و پزیشکان بووە. بۆ نموونە کاتێ ژیاننامەی حەکیمی گەورە، سەید موحەمەد ئەلیاسی ناسراو بە "ابن‌سینا دووەم یا اشرف الحکما" دەخوێنینەوە، ئەو پیاوە گەلێك ڕەنجی کێشاوە تا زەوی‌وزاری ئاوایی حسەین خانی ناوچەی گەرووس بکڕێت تا بەدەستی خۆی گیا دەرمانیەکان کۆ بکاتەوە یا دەگێڕنەوە کە گوتوویە: تا چڵە گیایەك نەکەوێتە ناو توورەکەی دەواکانم کە خاوەن زەویەکە بە هەڵکەندنی ڕازی نەبێ.

وەك لەسەرەوە باسمان کرد خوێندنی قوتابخانە و زانکۆ لە زانستی کشتوکاڵدا، هەروەها هۆگر بوون بە بواری زمانی کوردی و لەدایکبوون لە لادێ، وایکرد کە لە ساڵەکانی دووهەم

---

۱. بەرگی یەك، لاپەڕە ۷ (وەرگێڕانی مامۆستا هەژار)

و سێهەمی زانکۆ دەستم دایە نووسینی کتێبی *"فەرهەنگی گیاناسی کوردستان: کوردی، فارسی، عەرەبی، ئینگلیزی و لاتین"*. ڕۆژبەڕۆژ پێوەندیم لەگەڵ کەسانێك وا گیادەرمان و گیاناسی زانکۆ و بازاڕ بوون، زیاتر دەبوو، بەتایبەت ئاشنابوون بە ناوەندی گیادەرمانی شەفا لە شاری سنە و کۆمەڵەی گیادەرمانانی هەولێر و سلێمانی. خاڵێکی تر کە جێی ئاماژەیە، باسی دەفتەرەکانی بەرەڕۆچکەیە. هاوکات لەگەڵ ئاشنابوون بە خوێندنی کوردی، لە پۆلی دە و یازدە دەستم دایە کۆکردنەوەی وشە، پەند، قسەی پێشینیان، دەنگەناو، چیرۆك، هۆنراوەی فۆلکلۆری، دەرمان و چارەسەری لادێیی، چێشت و خۆراکی کوردی، و هتد. ئەگەرچی سەرەتا تەنیا تایبەت بە ناوچەی کەلاتەرزان بوو، بەلام دواتر کراوەتر لەو ناوچەیە هەوڵەکانم خستە گەڕ. تا وەکوو ئێستا لەو بوارەدا ۲۲ دەفتەر بە ۱۰۰ بەرگ و ۲۰۰ بەرگەوە بە ناوی "بەرەڕۆچکە" نووسیوە. بەرەڕۆچکە هەمان پەنا دیوار و دەرکەیە کە بەساڵاچووانی دێ پاش کاری ڕۆژانەیان بەتایبەت وەرزی زستان لەوێ کۆ دەبنەوە و لەسەر هەموو باس و بابەتێکی ژیان قسە دەکەن. واتا بنکەیەکی هەمیشەیی پیران و ئەزمووندارنە کە کانگای هاتوچۆی بەڵگە و باسی فۆلکلۆر و باسی ڕەسەنی کوردەوارییە. تا ئەو جێگەیە ڕەخساوە و سەردانی ئاواییم کردووە لە بەرەڕۆچکەکان سوودم وەرگرتووە. هەروەها تا پێش داهاتنی ئامێری مۆبایل، هەمیشە قەڵەم و قاقەزم لە گیرفاندا هەڵگرتووە و هەر قسەیەك لەو بارەوە بەرگوێم کەوتووە دەستبەجێ نووسیومەتەوە. ئینجا لە ماڵەوە لە دەفتەرەکانی بەرەڕۆچکە یاداشتم کردووە.

پێوەندییەکانم لەگەڵ ناوەندی گیادەرمانی شەفا لە سنە ئەو ڕێچکەیە کردەوە کە لایەنێکی گرینگ لە ئەزموونی ژیان لەسەر گیادەرمانی دابمەزرێنم. بەرەبەرە لەگەڵ هەندێ بنەما و پەرتووك و خوێندکار و حەکیم و دەرمانخانە ئاشنا بووم. هەروەها ماوەی ساڵەکانی ۲۰۱۳ تا ۲۰۱۵ کە لە سلێمانی بووم لەوێ بە پێشنیاری بەشی ڕاگەیاندنی کۆمەڵەی ڕوەکناسانی[1] کوردستان، کاك جەلال کەریم عومەر "اساسنامه طب سنتی ایران" وەرگێڕایەوە سەر کوردی. هەروەها بەشێك لە ئەزموون و نووسراوەکان لەسەر بواری پزیشکی کوردەواری، کۆ کردەوە. دواتر لە توێی پەرتووکی *"پێشەکیەك لەسەر گیاناسی، گیادەرمانی و پزیشکی خۆماڵی کوردەواری"* چاپ کران. بڕیار وابوو کە ئەوان دەقی ئەو کتێبە لەگەڵ هەندێ نووسراو و پێشنیار و پەسەندکراوی خۆیان ڕادەستی لایەنی

---

۱. مەبەست هەمان کۆمەڵەی گیادەرمانان

پێوەندیدار بکەن تا لەو ڕێگەیەوە لە پارلەمانی کوردستان، "پرۆژە یاسای پزیشکی خۆماڵی" پەسەند بکرێت. داخەکەم پاش چەند ساڵ هێشتا ئەو بڕیارە بە ئەنجامی خۆی نەگەیشتووە. بەو هیوایە پەرتووکی بەردەست و سەرچاوەکانی دیکە وا لەو ماوەیەدا چاپ بوون ببێتە پاڵپشتێك بۆ پەسەند کردنی ئەو یاسایە. پەسەند کردنی پزیشکی خۆماڵی کوردەواری لە یاسای حکوومەتی هەرێمی کوردستان یا هەر وڵاتێکی دیکە کە کورد لەوێ نیشتەجێیە هۆی ناساندنی زیاتری ئەو گەنجینە نایاب و بێوێنەیە بە جیهان و تەندروستی مرۆڤایەتی.

بەشێکی تر لەو هەوڵ و تێکۆشانە کۆکردنەوە و نووسینی ئەزموون و بەرهەمی حەکیمانی شار و گوندی کوردەواری بوو. تا ئەو جێگەیە گونجاوە و ژیان بواری داوە سەردانی کەسی دوور و نزیکم کردووە و ئاسان و دژوار زانیاریم بە دەست هێناوە. جاری وابووە بۆ بەدەست هێنانی زانیاریەك لای پیرێك لە سووچی گوندێك یا کەناری شارێك لە ڕێگەی چەندین پێوەندی و تەلەفۆن و ڕاسپاردە توانیومە گۆشەیەك لە ئەزموونی ئەو کەسە کۆ بکەمەوە. ئەگەرچی هەندێ جار لەبەر هەندێ بەرژەوەندی یا ترس لە بڵاوبوونەوەی نهێنی دەرمان و چارەسەرەکان بێ ئەنجام لەو سەردان و ڕوونیانە گەڕاومەتەوە. ئەڵبەت لەو نێوانەدا کەسی وابووە تەنیا لاسایی حەکیم و نۆژداری کردووەتەوە. هەر بۆیە زانیاریەکانی ئەو کەسانە شیاوی نووسین و توێژینەوە نەبوون و تەنیا خۆخڵەتان و خەڵك فریودانێك بووە. هەر بۆیە لە نووسینی زانیاری ئەو کەسانە خۆم بواردووە. جیا لەمانە بەشێکی زۆر لە حەکیمان وا ناوبانگیان هێشتا لە گێڕانەوە و دەمباسی خەڵکدا ماوەتەوە زانیاریەکانیان نەنووسراونەتەوە. هەندێ جار بنەماڵە و نەوەی ئەوانە هاوکاری کەم یا زیادیان کردووە و زۆر جاریش بەهۆی کەمتەرخەمی لە تۆمارکردنی ئەزموونی ئەو گەورەپیاوانە تەنیا ناوێك و چەند قسەیەکی ناو خەڵکی لەو کەسانە ماوەتەوە. بۆ ئەو بەشە بەڕاستی هەوڵ و ماندووبوونی زیاتری پێویستە و هەل و بەرنامەی بەربڵاوتری گەرەك. لە داهاتوودا بۆ بەشەکانی دیکەی ئەم کتێبە زیاتر لەسەر ئەو لایەنە هەوڵەکان چڕ دەکەمەوە.

سەبارەت بە حەکیمانی ناوچەکانی باشوور، ڕۆژاوا و باکووری کوردستان بەشێکی زۆری ئەو زانیاریانە لە ڕێی تەلەفۆن و پەیام و تۆڕە کۆمەڵایەتیەکان بە دەستم هێناوە. واتا هاوڕێیانم لەو بەشانە هاوکاریان کردووە و زانیاریان ناردووە. بۆ نموونە سەبارەت بە حەکیم کوێخا ئەحمەد لە ئاوایی کۆیلێ ناوچەی باڵەیانی قەندیل لە ڕێگەی چەندین کەسەوە زانیاریەکانم بە دەست هێناوە: *شاسوار ئەحمەد عەبدوڵا هەرشەمی (مامۆستا، تەمەن ٥٩ ساڵ، دانشتووی ستۆکهۆڵم)، جەماڵ مەولوود (کارمەندی خانەنشینی وەزارەتی تەندروستی،*

*تەمەن ٦٠ ساڵ، دانشتووی هەولێر)، لوقمان کوڕی شەهید ئیبراهیم کوڕی حەکیم کوێخا ئەحمەد (خویندکار، تەمەن ٤٨ ساڵ، خەڵکی کۆییلێ و دانشتووی ڕانیە)، هاوڕێ ڕەمەزان (کارمەند، تەمەن ٣٠ ساڵ، خەڵکی کۆییلێ و دانشتووی شارۆچکەی قەسرێ)، سۆران موحەمەد مەولوود (مامۆستای زمانی کوردی، تەمەن ٢٨ ساڵ، خەڵکی بۆران لە دۆڵی باڵەیان، دانشتووی قەسرێ)، زۆسك حەمەد مینە (ڕۆژنامەنووس، تەمەن ٣٠ ساڵ، خەڵکی کۆییلێ و دانشتووی چۆمان)، گۆران کوڕی حاجی جەلال کوڕی حەکیم کوێخا ئەحمەد (تەمەن ٣٠ ساڵ، خەڵکی کۆییلێ و دانشتووی هەولێر) و هێرش کەماڵ ڕێکانی (تەمەن ٣٥ ساڵ، نووسەر و مامۆستا، دانشتووی زاخۆ).* یا بۆ کۆکردنەوەی زانیاری پزیشکی خۆماڵی ناوچەی عەفرین لە ڕێی دکتۆر فەخری عەبدۆ کە بۆخۆی لە بەرلین پزیشکی دەخوێنێت و پیشەی نوژدارییە و هەروەها کاك ئاری خۆرشید زاوای ماڵباتی ئاغای گوندی چوولابی عەفرین و بۆخۆی خەڵکی کەرکووکە و دانشتووی وڵاتی دانمارکە، کۆ کراوەتەوە.

لایەنێکی گرینگ لە پزیشکی خۆماڵی کوردەواری، دەستنووس و کتێبە نووسراوەکانی پزیشکی و گیاناسی زانا و حەکیمانی کوردەوارییە. خۆشبەختانە چەندین پەرتووك و نامیلکە و کەشکۆلی کوردی و فارسی و عەرەبی کە یادگاری حەکیمانی کۆنی کوردەوارییە یا زانایان و نووسەرانی کورد بۆ ئێمەیان بە جێ هێشتووە کۆ کراوەتەوە و ناونیشانیان لە توێی ئەم کتێبەدا هاتووە. دژوارترین بەشی تێکۆشانی کتێبی بەردەست، دەست خستنی کتێبە دەستنووسەکانی پزیشکی بووە، بەڵام بە شیرینترین دەستکەوت ئەژمار دەکرێت. بۆ نموونە بۆ دوو دەستنووسی کۆنی کتێبی پزیشکی مەلا موحەمەد ئەرواسی، چەند ساڵ بەدواداچوونم کردووە تا بەدەستم هێناوە:

*ساڵی ٢٠١٤ کاناڵی کوردی ڕووداو هەواڵی چاپی کۆنترین دەستنووسی پزیشکی کوردی لە ماردین بڵاو بووەوە. ماوەیەك دەقی لە ماڵپەڕ و تۆڕە کۆمەڵایەتیەکان بە هەواڵێکی گرینگ، واتا "کۆنترین دەستنووسی کۆنی کوردی و پزیشکی کوردستان" دەستاودەست دەبوو. چەندین بەرنامەم داڕشت کە ئەو دەستنووسە بە دەست بهێنم. لەڕێی چەند دۆست و برادەرەوە ژمارە مۆبایلی پەیامنێری ڕووداو لە ئامەد، ماشەڵا دەکاك دەست خست و پێوەندیم پێوە گرت. ئەو بەڕێزە حەواڵەی ئامادەکاری چاپی کتێبەکە دکتۆر قەدری یەڵدرمی کردم و ڕەقەمی پێوەندی ئەویشم بە دەست هێنا. ئەوکاتە دکتۆر قەدری ئەندام پەرلەمان بوو، وڵامدانەوەی بە تەلەفۆن و پەیام ئەستەم بوو. بەهۆی یەکێك لە هاوڕێیانم لەگەڵ خوێندکارێکی کورد خەڵکی وان لە زانکۆی تاران، خەدیجە هێلین یڵماز ئاشنا بووم.*

*ئەو بەرێزە بەڵێنی دا گەڕایەوە بۆ وان کتێبەکەم بۆ بکرێت. پاش ماوەیەك کە گەڕایەوە و کتێبەکەی دەست نەکەوت لە سەردانێك بۆ ئانکارا سەردانی نووسینگەی دکتۆر قەدری کردبوو. خۆشبەختانە چاپی ئەو کتێبە بە دەستم گەیشت. بەهاری ٢٠١٨ کە بەشداریم لە کۆنفرانسی زانایانی زاب لە زانکۆی جۆلەمێرگ کرد بەهۆی چەند دۆست و ئاشنا لەگەڵ دکتۆر قەدری قسەمان کرد. وتاری من لەو کونفرانسە لەسەر سمایل حەکیم سلێڤانی دهۆکی بوو. لە پەراوێزی قسەکانم داوام لە ئامادەبووان کرد ئەگەر لە باکووری کوردستان بەڵگە و دەستنووسی زانایانی کۆنی کورد بەتایبەت لەسەر پزیشکی شك دەبەن بیناسنەوە و بیپارێزن با نەفەوتن. پاش وتارەکە، دکتۆر ئەرگین ئۆپێنگین خەڵکی شەمزینان مامۆستای زمانی کوردی لە زانکۆی ئۆپسالا هاتە پێش و باسی دەستنووسێکی مەلا موحەمەد ئەرواسی وانی کرد کە کۆپیەکی لای ئەو پارێزراوە و لە مامۆستا مەحفووز وانی وەرگرتووە. هەروەها یەکێك لە توێژەرانی بادینان سەرنووسەری گۆڤاری نیژەن، کاك هێرش ڕێکانی باسی ئەوەی کرد کە پێش دکتۆر قەدری یەڵدرم، ساڵی ٢٠٠٠ مامۆستا تەحسین دۆسکی لە کتێبی "ل دۆر ئەدەبێ کرمانجی ل سەد ساڵا نۆزدێ و بیستێ زایینیدا" دەقی دەستنووسی مەلا موحەمەد ئەرواسی کە مەلا زەینەدین ئامەدی نووسیویەتیەوە و چاپی کردووە. پاش گەڕانەوە بۆ بادینان بەڕێزیان دەقی ئەو کتێبەی ڕەوانە کرد. یەکەم جار ساڵی ١٨٩١ لە کتێبی (الهدية الحميدية في اللغة الكردية) و دواتر ١٩٣٢ لە گۆڤاری هاوار باسی مەلا موحەمەد ئەرواسی کراوە. پاش چەندین جار پێوەندی بە مامۆستا ڕەفیق ساڵح بەرپرسی ناوەندی بنکەی ژین لە سلێمانی، دەقی هەر دوو سەرچاوەی ناوبراو بە دەستم گەیشت. پاش ماوەیەك دکتۆر هێمن خۆشناو لە زانکۆی بینگۆڵ سەردانی مزگەوتی گەورەی شاری ئامەدی کردبوو. کۆپیەك لە ئەسڵی هەمان دەستنووسی مەلا زەینەدینی وەرگرتبوو کە خۆشبەختانە ئەویش بە دەستم گەیشت.*

بەشێکی بەرچاو لە دەستنووس و بەڵگەنامەکانی پزیشکی ناو ئەم کتێبە بە ماندووبوونێکی زۆر بە دەست هاتوون تا ناوەرۆك و ناونیشانیان لێرەدا بنووسرێت. دڵخۆشی بەندە ئەوەیە بە دەرکەوتن و چاپی ئەم کتێبە توێژەران و خوێندەوارانی بواری گیادەرمانی و گیاناسی بەرچاوڕوونی زیاتریان دەبێت لەسەر دەستنووس و سەرچاوەکانی پزیشکی، گیادەرمانی و گیاناسی زانایان و حەکیمانی کوردەواری.

خاڵێکی گرینگ لە بواری گەنجینەی پزیشکی حەکیمانی کوردەواری گرینگیدان بە ئەزموون و زانستی خۆماڵی ئەو پیرەژن و پیرەپیاوانەیە کە ساڵانێکی زۆرە بێ هیچ

چاوەڕوانیەکی مادی یا بە کەمترین دەستخۆشانە نەخۆش و دەردەداریان چارەسەر کردووە و لای خەڵکی دوور و نزیك ناسراون. ئەوانە خۆبەخشانە و لەڕێی خودا کار بۆ کەمکردنەوەی ژانی خەڵکی دەکەن. کەواتە ئەگەر ئەوانە تا وەکوو ئێستە وەك پێویست نەکەوتوونەتە بەر نووسین و توێژینەوە، شیاوی خۆیە ناویان تۆمار بکرێت و بەسەرهات و بەرهەم و باریان بە ناوی خۆیانەوە بنووسرێت تا یادیان هەمیشە لە لاپەڕەی مێژووی کوردستانی خۆشەویستدا بمێنێتەوە و ببێتە پاشخان و گەنجینەیەك بۆ نەوەکانی داهاتوومان. نووسینی ناوی ئەو ژن و پیاوە حەکیم و دەرمانگەر و مامۆستایانە وا کەمتر ناسراوان و کۆمەڵگای ڕۆشنبیری کەمتر ئاوڕی لێ داونەتەوە، بە نووسین و ناوهێنانێك لە توێی کتێبێك، پێزانین و سپاسێکی ئەوڕۆ و شانازییەکە بۆ داهاتووی نیشتمان ئەژمار دەکرێت.

خۆشەویستینە! تکایە بە ناردنی پەیام و پەیڤی پێشنیار و ڕەخنە و ڕێنوێنیتان هەڵە و پەڵە و کەمایەسیەکانی ئەم کتێبە هەڵپەرتێون و بۆ تۆکمە و تەیار کردنی چاپی بەشی دووهەم و دواتر، هاریکاری و هاوکاریمان بکەن. بە ئەمانەتداریەوە ناو و ناونیشانی خۆتان و ناوەرۆکی نێردراوتان دەنووسین و ڕەچاوی ئارەزووی ڕاستیی دڵی ئێوە دەکەین. تکاکارم ئەگەر هەڵە و پەڵەیەك بە پێنووسی نەزانراوی یا کاڵفامیم لەم کتێبە کەوتووە، خوای میری مەزن لێم نەگریت و نەینووسێتە ڕێنامەی ژیان و کارنامەی تەمەنم. هیوادارم ئێوەی خوێنەر و توێژەری تژی لە پاکی و هێژایی لە نزای پاراوی خۆتان بێبەریمان نەکەن.

پێویستە لێرە دەستخۆشی لە هاوڕیانی خۆشەویست مامۆستا جەماڵ مەولوود (بەڕێوبەری گشتی پێشووی دیوانی وزارەتی تەندروستی هەرێمی کوردستان)، جەلال کەریم ئۆمەر، ئیسماعیل موشیر عوسمان، ڕەنج فارۆق فەتاح و کارگەی بەهار لە سلێمانی بکەم کە ئەرکی لەچاپدانی ئەم کتێبەیان وەئەستۆ گرت.

ڕێگای پێوەندی بۆ وەرگرتنی پەیام و پەیڤی خوێنەران:

- *komasy2706@gmail.com*
- *Telegram.me/irajmoradi*

براتان ئیرەج موڕادی باقلاوایی
شارۆچکەی ڕەبەت ـ سەردەشت
شەوی ٢٢ گەلاڕێزانی ٢٧١٨ کوردی

## گوتەیەکی گرینگ

زۆر لەمێژە دەزانم حەز و ویستێکی بەهێز لای برای بەڕێزم ئەندازیار ئیرەج حوسەین مورادی دروست بووە بۆ تۆمارکردنی تەواوی پێگە و ئەزموونەکانی پزیشکی میللی و ڕەسەنی کوردەواری. هەڵبەتە بۆ دەسپێکردن و بەردەوامی لەسەر ئەو کارە مەزنە لەمپەر و ڕێگر لەبەردەمیا زۆر بوون، وەکوو ئاوارەیی و بەجێهێشتنی خاك و ماڵ و منداڵی بۆ پەیداکردنی بژیوی قورسی ژیان و بێتوانایی دارایی و هەندێك گوشاری نابەجێ بۆ ئەوەی دەست هەڵگرێت لەو کارانە، بەڵام ئەو بەڕێزە تا دەهات سوورتر دەبوو لەسەر درێژەدان و پێشبردنی ئەو پرۆژە جوان و بەپێزە. بۆ نموونە نووسینی "فەرهەنگی ڕووەکناسی کوردستان بە زمانەکانی کوردی، فارسی، عەرەبی، ئینگلیزی و لاتین" لە ساڵی ٢٠١٥ و "پێشەکیەك لەسەر گیاناسی، گیادەرمانی و پزیشکی خۆماڵی کوردەواری" لە ساڵی ٢٠١٦ کە ئێمە ئاگادارین لەسەریان تووشی چەندین کێشە و قەیران بووەوە، بەڵام سپاس بۆ خوای گەورە هەموویانی تێ پەڕاند و لە جاران بەهێزتر هاتەوە مەیدان و ئەمجارە سەرەڕای کاروباری فەرمانگەی خۆی و بەڕێوەبردنی چەرخی ماڵ و منداڵی، لە ڕۆژهەڵات و باشوور و باکووری کوردستان شار بە شار و گونداوگوند دەگەڕا تا ئەوەی لە پیرەپیاو و داپیرەیەك و بنەماڵەی حەکیمێکی کۆنی کوردەواری زانیاری تەواو و ورد وەربگرێت و لەسەر ژیاننامەی پزیشکان و حەکیم و دەرمانساز و گیاناس و شکستەبەند و کەڵەشاخگر و هەموو ئەوانەی لەو بوارە گرینگەدا کاریان کردووە و جێ دەست و پەنجەیان دیار بووە، پاشان تۆمارکردن و پاکنووسی کردنیان بۆ ماوەی چەند ساڵ تا کەشکۆڵی بەردەست بەرهەم هاتووە و بکەوێتە بەردیدی خوێنەری کورد.

ماوەتەوە بزانین ئێمەش هیچمان لە گەلانی درواسێ کەمتر نییە و خاوەنی زمان و خاك و کەلتووری تایبەت بە خۆمانین، بەڵام بەهۆی داگیرکاری دەرەکی و هەندێك جار

خۆخۆری نەمانتوانیوە ئەوەی هەمـانە بـیكەین بە بەڵـگە و دۆكۆمێنـت، و بیپـارێزین تـا نەوەكانی داهاتوو سوودی لـێ ببیـنن. بـۆیە دەبینـین ئێسـتاكە ئـێمە ئەركمـان گرانتـرە بەتایبەت كە ڕۆژبەڕۆژ پیران و ئەزموونداراانی ڕەسەنی ئەو بوارە كە شـایەتحاڵی مێـژووی دوێنی كوردن، ژمارەیان كەم دەبێتەوە و قەیرانەكانیش زیـاتر كەڵەكە دەبـن. بـۆیە كـاك ئیرەج ناچار بووە پەنا بەرێتە بەر خەڵكی ئاسایی و كاسبكار تا كتێبەكەی بۆ چـاپ بـكەن بە بەرنــامەی سپۆنســەر و ڕیكــلام كە بەداخەوە دەبـوو دەزگـایەكی نیشـتمانی هەبـوایە سەرپەرشتی ئەو بوارەی بكردایە و زیاتر گرینگـایەتی بە بـوارە ڕەســەنەكانی فەرهەنـگ و كەلتووری كورد بدایە، بەتایبەت ڕێبازی پزیشكی خۆماڵی كوردەواری.

لە كۆتاییدا دەخوازم چیتر خەمساردی نەكرێت لەو بوارەدا و هەلـی زێـڕین لەدەسـت نەدەین. لانیكەم دژایەتی نەكرێت بە نـاوی زانسـت و پێشـكەوتنی سـەردەمەوە بەرانـبەر ژیانەوە و گەشەپێدانی پزیشكی ڕەســەنی كـورد. چـونكە ئەمە مێـژووە و مـوڵكی هەمـوو گەلی كوردە بە چاك و خراپییەوە. دڵسۆزی ڕاستەقینە بارە چاكەكەی گەشە پـێ ئەدات و دەیپارێزێ. هەروەها داواكارم دڵسۆزانی ئەم وڵاتە لە بەرپرسـانی حكـوومی و ڕۆشـنبیر و مێژوونووسان تەنانەت پزیشك و دەرمانسازانی ئەمەكدار كە ئاوڕێكی جـددی لەو پاشـخانە دەوڵەمەنـدە بـدەنەوە و نەهـێڵن ئەزموونەكـانی لەنـاو بچێـت. بەڵكـوو كـار بـكەن و لە ڕێكخراوەی تەندروستی جیهانی (WHO) تۆمـاری بـكەن تـا وەكـوو پزیشـكی ڕەسـەنی چینی، هێندی، مـالایی، و هتـد ببێـتە ناسـێنەری گەلەكەی. هەروەهـا گـرینگە یاسـای تایبەت دەربكرێت لە پەرلەمانی كوردستان و وەزارەتی تەندروستی حكوومەتی هەرێـم بـۆ ڕێكخستنی پیشەوەرانی ئەو بوارە و ڕێز لە پێشینیان و ئەزموونداراانی ئەو پیشـەیە بگرێـت و خولی ڕاهێنان و فێركاری بەردەوامی هەبێت بۆ تازەپێگەیشـتوان تـا بە هەڵە كارەكـان ئەنجام نەدەن و نموونەیەكی جوان نیشانی جیهان بدەن.

جەلال سەید كەریم گەڕاوی

بایۆلۆژیست و نووسەر لە بواری پزیشكی میللی و هاوچەرخ

سلێمانی، گەڕەكی ڕاپەڕین — ٢٠١٩/٠١/٢١

## گەڕان بەدوای ڕێکخستنی بنەما و بنکە و بەرهەمەکانی پزیشکی خۆماڵی کوردەواری (KTM)[1]

ئەگەر لە دوورەوە چاوێك بە جوغرافیای سەرزەوی کوردستاندا بخشێنین و قووڵایی زانست و ئەزموونی ئەو وڵاتە بکۆڵینەوە، دەتوانین بەبەڵگەوە سەرەداوی پزیشکی و چارەسەری کوردەواری بگەڕێنەوە بۆ سەردەمانی پێش مێژووی ئیسلام.

گەلی کورد وەك دیارە نیشتمانی لە شیو و شاخ و دەشتەکانی زاگرۆس و چیا سەرکەشەکانی قەندیل، شەنگال، جوودی، مشتەنوور و کرمانجدا هەڵکەوتووە. لەو شوێنانە پەنای گرتووە و لە چنگ داگیرکەر و هێرشبەران ڕزگاری بووە و بەدرێژایی مێژوو ناسنامە و شارستانیەتی خۆی پاراستووە. وەك سیاسیەکانی ئەورۆ لە کوردستان ئێژن: *پشتیوانی ڕاستی کورد هەمیشە چیاکان بووە*. تایبەتمەندی ژیان و گوزەران لە چیا و شاخە بەفراوی و کوێستانیەکان، مرۆڤ بەرەو خۆبژێوی، خۆبەڕێوبەری، خۆپەنایی و خۆچارەسەریی دەبات. چونکا سروشتی هەڵەمووت و سەخت و دژواری ڕێگاوبانی چیا و چۆڵەکانی کوردستان وای خواستووە کە مرۆڤی کورد بەپێی تەمەن هەنبانەی ئەزموونی لە دابینکردن و دۆزینەوە و هەڵگرتنی ماکەکانی ژیان وەکوو خۆراك، چێشت، نان، دەرمان، چارەسەریی، هەتوان، وچان، خەوتن، و هتد، هەر دەم تۆکمە و تەیارتر بکات. ئەگەر ئێستاکەش سەیری ژیان و بەسەرهاتی خەڵکی گوندە دوورەکان و هەوارە بەرزەکانی ئەو نیشتمانە بکەین پەی بەو ڕاستییە دەبەین کە تاکی کورد لە پیریدا کەسێکی ئەزموونـدار و پڕ لە لێزانینە بۆ ژیانی خۆی و خەڵکەکەی. ئاخر ئەوان ناچارن و بەتایبەت ئەوسا کە چەند مانگی ساڵ بەهۆی بەفر و زۆزان ڕێگا و پرد و پێوەندیان براوە و لە پەگاڵ و پەنا و پەسیوی خۆیان تا ڕەشەمە و نەورۆز ماونەتەوە. جیا لەوە، خاڵێکی تر کە لە مێژووی کورددا دەیخوێنینەوە کۆچەریی و

1. Kurdish Traditional Medicine

پیشەی ئاژەڵداری زۆربەی هۆز و خێڵەكانی كوردە. لە داب و نەریتی كۆچەریی بووندا كەسێك سەركەوتووە كە لە هەموو بوارێكی پیشەكەیدا شارەزا و لێهاتوو بێت. واتا لە تفاق و لەوەڕ و ئاوەڵ و تیمار و چارەسەری مەڕ و مالاتەكەی بزانێت و ئەزموونی خۆی بەكار بهێنێت. سەیر بكەن زۆربەی دەرمانگەر و حەكیمانی كورد، پێشینەی پزیشكی ئاژەڵی باشیان هەیە و شكستەبەندی و تەقەڵ و هەنوون و تیمار و كوتان و زۆرێك بابەتی دیكەی چارەسەریی لەسەر مەڕ و بزن و مانگا و گوێدرێژ فێر بوون. ئینجا ترسیان شكاوە و دەستیان وەرداوەتە كاروباری پزیشكی و دەرمان و چارەسەریی مرۆڤەكان.

بۆخۆم لە ژیان و بەسەرهاتی زۆرێك لەو پیرەژن و پیرەپیاوانەی گوند و شارەكان وا دەستی پزیشكی و چارەسەریان هەیە ورد بوومەتەوە. بەدەر لەوانەی ئێستاكە دانیشتووی شارەكانن و دوور بوونەتەوە لە كەشی گوندنشینی، هەموویان هاوكات لەگەڵ دانانی دەرمان و ڕەچەتە بۆ چارەسەری نەخۆشی و ئازاری مرۆڤەكان بۆ ئاژەڵ و پەلەوەرەكانیش دەستی لێهاتوویی و لێزانی بالایان هەیە. ئەمە بۆخۆی خاڵێكی ئەرێنی و بێوێنەیە بۆ پاشخان و پێشینەی پزیشكی وڵاتی ئێمە.

وەك گوتمان پیشەی پزیشكی و حەكیمی لە وڵاتی كوردەواری، نەریتێكە سەرچاوەكەی ئەزموونی مرۆڤەكانە بەدرێژایی تەمەن. كاتێك بنەماڵەیەك سەرجەم بەهرەیەك وا خوا پێی بەخشیون بكەوێتە بواری پزیشكییەوە، ئەو دەستكەوت و بەرهەمانە لەو بەهرەمەندییە بە دەست دێت دەكەوێتە یەك ڕێچكە و سەرنجام پیاو یا ژنی سەرپەستی ئەو بنەماڵە دەبێتە پێشڕەوی ئەو ڕێبازە و بە حەكیم یا دەردناس دەناسرێت. ئەوەیە كە حەكیمی كوردەواری بێ هیچ بارهێنان و ڕاهێنانێكی زانكۆیی و قوتابخانەیی دەرسكێت و خزمەتگوزاری خۆی پێشكەش دەكات. ئەوساكە فەرهەنگ و چاندی هۆزایەتی و خێڵەكی لە كوردەواری پشكی بە پیرەكان داوە كە جیا لە ئەزموونی تەمەنی خۆیان، سەرجەم ئەزموونی بنەماڵە و هۆزەكەیان بكەوێتە دەست كەسێك یا زیاتر و ئەوانە بە پیری دەردناس و حەكیمی كارامە ناسراون. بەگشتی لە كوردەواری پیر واتا سەرچاوەی هەموو ئەزموونێك. كانگایەك لە سەرچاوەی ئاژینی چاند و شارستانیەت و فەرهەنگ و ڕەسەنایەتی كورد. ئەگەر لەناو گەلی كورددا پردی نێوان پیر و بەرەی نوێ بپسێت ڕەسەنایەتی و ماكی كوردبوون خۆی ناگرێت و زوو دەفەوتێت و پێناسەمان دەتوێتەوە. كورد وتەنی: *پیران ئەزموووارەی ئێمەن*. واتا ئەو كارانەی پیرە حەكیم و وریا و سەردەرچووەكان كردوویانە ئەنجام و بەرهەمی ئەزموونكراوی پشتەكان و باپیرانە كە ئێستە لای ئەوانە و دەبێ ئێمە وەریبگرین و لەگەڵ

ئەزموونی ژیانی خۆمان تێکەڵی بکەین و بیکەین بە ئەزمـووارەیەك بـۆ چینەکـانی داهـاتوو. داخێکی گرانە هەندێك پێیان وایە ئەزموون و هەرمانی هەگبەی پیرانی کوردەواری بێســوود و ترۆیە و نابێ بگوازرێتەوە بۆ بەرەی نوێ. بەبۆچوونی ئەو کەسانە دەبێ تەنیـا و تەنیـا ڕوو بکەینە هاوردەکردنی ئەزموون و زانستی پێشینیان و زانکۆکانی چینی و ژاپـۆنی و تـورك و ڕۆم. بەڵێ بەکارهێنانی ئەزموونی گەلانی تر پێویستە، بەڵام کاتێ هاوردەکردنی ئەو زانسـت و ئەزموونانە ڕێگەپێدراوە کە لەپاڵ ئەزموون و زانستی خۆماندا بێـت. چونکـا دواکەوتـوویی گەلانــی ژێردەســت لەوەوە ســەرچاوەی گرتــووە کە پشــت بە شارســتانیەت و کەلتــوور و فەرهەنگی خۆیان نابەستن و هەرچی لە دەرەوە بێت لە هی خۆیـان بە باشـتری دەزانــن و بابەتی بیانی زوو وەردەگرن و بابەتی خۆیان زوو فڕێ ئەدەن.

ئەرکــی سەرشــانی ئــێمە لە بەرەی نوێـدا ئەوەیە کە ئەزمــوون و لێزانــی و شــارەزاییە پزیشکیەکانی پیران و پێشینیانمان کۆ بکەینەوە و بینووسین و سەر یەکـی بخەیـن. ئینجـا پاڵفتەی بکەین و بیخەینە سەر ئەزمـوونی ژیـانی ڕۆژانە و ئەنجـامی لێکـۆڵینەوەی زانکـۆ و توێژینگەکانمان. ئەوکاتە دەبینین کە پاڵپشت بە پێشینیانی نیشتمانەکەمان پێش کەوتووین و لەگەڵ کـاروانی گەلان و وڵاتـانی دیـکە پلەکـانی پەیـژەی پێشـکەوتن دەبـڕین و بەرەو لووتکەی بڵیندی مرۆڤایەتی هەنگاو دەنێین. چونکە بۆچوونی سەرجەم زانایـان و تـوێژەرانی بواری مێژووی زانست ئەوەیە کە قۆناغەکانی زانست ئەنجامی هێڵێك دیارە کە لە ڕابردووەوە کێشراوە و گەیشتووە بە ئێســتە. ئەو هــێڵە دەبــێ دیســان بکێشــرێت و بــڕوات تــا دەگــاتە قۆناغەکـانی داهـاتوو. بەپێـی ئەو بۆچـوونە تاکەکـانی یەك بنەمـاڵە هەرکـام هێڵـی خۆیـان دەکێشن. ئینجا ئەو هێڵە لەگەڵ هێڵی بنەماڵەکانی تـر دەبێـتە هێڵـی یەك هـۆز و گونـد و ناوچە. لە کۆتاییـدا سـەرجەم هێڵـی هـۆز و گونـد و ناوچەکـان لەسـەر هێڵـی نەتەوە یەك دەگرنەوە و بەرەو ڕاستەڕێگای یەکگرتوویی سەرجەم نەتەوەکانی جیهـان دەڕوات. کەوابـوو نابێ ئێمە لە کێشان و لەو نەخشەڕێگایە بێبەری بین و بەشمان پێوە نەبێت یـا چـاوەڕوانی هێڵی نەتەوەکانی دیکە بین کە لە دڵی نەتەوە و وڵاتی ئێمەدا بڕوات. داگیرکردنــی خــاك و ئــــاوی یەك وڵات بەپێــــی ئەو بۆچــــوونە، نەبــــوونی ئەو هــــێڵە تــــایبەتیەی نەتەوەیە و ڕێگەخۆشکردنە بۆ ڕاکێشانی هێڵی بیانی بە ناو خاك و خەڵکی وڵاتەکەماندا.

دەقی گشتی سەرەوە گەلێك خاڵی ورد و بچووکی تێدایە کە یەك بە یەکی تـان و پـۆی بەرگی ڕەنگین و سەنگین و زەنگینی پزیشکی خۆماڵی کوردەواری نیشـان ئەدات. ئەگەر تـا وەکوو ئێستا لە هیچ زانکۆ و توێژینگەیەك ڕاستەوخۆ باسی ئەو پزیشــکیەی نەتەوەی کــورد

شیکاری و توێکاری نەکراوە و لەسەری نەنووسراوە و ئاماژەی وردی پێ نەکراوە، بـۆ چەنـد هۆکار دەگەڕێتەوە:

* گەلی کورد وەك پێویست خـاوەنی سـەربەخۆیی دەفـتەر و دیـوانی خـۆی نەبـووە و ڕێگەی نەبووە کە لە قوتابخانە و حوجرە و زانکۆکان باسی ئەو چاند و کەلتـوورە نەتەوەیـیە بکەوێتە بەرباس. ئەگەرچـی مێـژوو نیشـانی ئەدات کوردەکـان زیـاتر لە درێژایـی مێـژووی ئیسلام خاوەنی شـارەزایی و پسـپۆڕی خۆیـان بـوون لەسـەر زانسـتەکان. بـۆ نمـوونە ابـن وەحشیە نەبتی کەلدانی لە نێوان سـەدەی ٢ و ٣ کۆچیـدا بـاس لە پسـپۆڕی و شـارەزایی کوردەکان لەسەر زانستی کشتوکاڵ و گیاناسی دەکات کە ئەو زانستانە لە کەلدانیەکان فێـر بوون و ئێستە لە ژیانی ڕۆژانەی خۆیان بەکـاری دەهێـنن. هەروەهـا ئامـاژە بە دوو کتێبـی "*علل المیاه*: ئاوناسی و شێوازەکانی دەرهێنـانی ئـاو" و "*افـلاح الکـرم و النخـل*: کشـتوکاڵ کردنی ڕەز و خورما" دەکات کە کوردەکان پێش لەدایکبوونی مەسـیح بە زمـانی کـوردی و بەڕێنووسی هیرۆگلیفی نووسیویانە.[1]

* بەهۆی ژێردەستەیی بـوونی کـورد لە حکـوومەتی گەلانـی فـارس، عەرەب، تـورك و ئەرمەن، زانایانی کورد هەمیشە بۆ ئەوەی لە کـاروانی زانسـت و پێشـکەوتن جـێ نەمێـنن هەوڵی خوێندن و فێربوونیان داوە و ئەگەر لە بـواری پزیشـکی و گیاناسـی و گیادەرمانیـدا بەرهەمێکیـان خولقانـدووە بە زمـانی گەلـی باڵادەسـت بـووە. بـۆ نمـوونە ئەبـووحەنیفەی دینەوەری کە لە ناوچەی کرماشـان ژیـاوە لە سـەدەی ٣ کـۆچی گەلێـك باسـی گیاناسـی، گیادەمانی، سروشت، کشتوکاڵ و ژینگەی وڵاتـانی عەرەبـی بە زمـانی عەرەبـی نووسـیوە و بەرهەمەکەی بە ناوی "کتاب النبـات" تـا ئێسـتە مـاوەتەوە یـا هەر لەو سـەردەمەدا زانـا و پزیشکی گەورە "ئیسحاق کوڕی عەلی ڕۆهایی" کە چەنـدین کتێبـی پزیشـکی بە عەرەبـی داناوە یا لە یۆنانی وەرگێـڕاوە بە نـاوی "کتـاب کنـاش، الصناعـة الصـغیر، ادب الطبیـب و النبض الصغیر". ئەو پزیشکە پـایەبەرزەی خەڵکـی ڕۆهـا لە بـاکووری کوردسـتان کـۆنترین

---

١. ابن وحشیە، شوق المستهام فی معرفة...، لاپەڕە ٢٠٥ (وەرگیراو لە: عەبدولی موحەممەد، الفبای زبان کردی بە روایت ابن وحشیە، ژمارە ١٢، گۆڤاری مەهاباد، ١٣٨٠) [میرعلم یەحیا حسان الطبان موحەممەد و مرایاتی موحەممەد، "شوق المستهام فی معرفة رموز الاقلام لابن وحشیة النبطی: اقدم مخطوط کشف بعض رموز الهیروغلیفیة"، ئەسکەندەریە: الندوة العالمیة الثامنة لتاریخ العلوم عند العرب، ٢٠٠٤]

کتێبی "ادب الطبیب" سەبارەت بە ئامۆژگارینامە، ئەخلاق و ڕەوشتی پزیشکی نووسیوە.[١]

* بە هاتنی ئایینی ئیسلام بۆ کوردستان و هەروەها دەسەڵاتە باڵادەستەکانی فارس و عەرەب و تورك، تا چەند سەدەی پێشوو سەرجەم جمگەکانی ڕۆشنبیری و بارهێنان و ڕاهێنانی قوتابخانەیی و حوجرەیی وا داگیر کردبوو کە گرینگیدان بە چاند و شارستانیەتی کوردی وەکوو بواری پزیشکی خۆماڵی کوردەواری لای زانایان و نووسەرانی کورد باوی نەبووە و پشتگوێ خراوە. تەنانەت میرنشینە کوردی و دەسەڵاتە خۆماڵیەکان لە بەرزیکانی و بتلیس و ئەردەڵان و بابانیشەوە ئاوڕیان لەو بوارانە نەداوەتەوە و زاناکانی کوردیش کە لەو نیمچە دەسەڵاتە کوردیەدا بوون گرینگیان بە بواری نووسین بە کوردی و تۆمارکردنی بابەتەکانی کوردی نەداوە. بۆ نموونە کەسایەتی بەرز و زانای کورد مەلا فەخرەدین ڕواری کوڕی مەلا ئەحمەد کە لە سەدەی ١١ و ١٢ کۆچی کە لە هەورامان ژیاوە دوو کتێبی پزیشکی (*عرفان الخیول و کنز الهدایة*) لەسەر بنەماکانی ڕاگرتن و بەخێوکردن و نەخۆشیەکانی ئەسپ داناوە و دیاری کردووە بە والیەکانی ئەردەڵان.[٢]

* نەبوونی ئەو دەفتەر و دیوانە سەربەخۆ کوردیە تا نزیك بە سێ سەدەی پێشوو، وای کردبوو زانایان و حەکیمانی کورد ئاوڕیان لە تۆمارکردنی گەنجینە و پاشخانی فۆلکلۆری و کەلتووری پزیشکی خۆیان نەداوەتەوە یا بە زمانی گەلی خۆیان هیچیان نەنووسیوە. بەرەبەرە بە سەرهەڵدانی شۆڕشی نەتەوایەتی لە کوردستان کەسانێك هەوڵیان خستووەتە گەڕ و ڕچەی نووسین بە کوردییان شکاندووە. مەلا موحەممەد ئەرواسی وانی (مردن ١٧٨٨ زایینی) کە لە نێوان ساڵەکانی سەدەی ١٧ ژیاوە دەستی داوەتە نووسین بو کوردی و کتێبی "*پزیشکی جالینووسی*" وەرگێڕاوەتەوە سەر کوردی کرمانجی و لەگەڵ هەندێ بابەتی پزیشکی کوردەواری لە توێی کتێبێك نووسیوە.

* ئەگەرچی بابەتی پزیشکی و چارەسەریی خۆماڵی کوردەواری وەك پێویست نەکەوتووەتە ناو دەق و بەرهەمە نووسراوەکان، بەڵام هەمیشە لەناو ڕەوتی ژیان و ژیواری کۆمەڵگای کوردیدا بە شێوەی گوێزراوە و زارەکی بووە. ئەگەر چاوێك بە پێشەکی وەرگێڕ لە

---

١. کتێبی "ادب الطبیب" ساڵی ١٣٩١ پەخشانگای طب سنتی ایران، مریەم پووتی و مینۆ عەلی میرزایی لە عەرەبیەوە کردوویانە فارسی.

٢. ناونیشانی نموونەی دەستنووسی ئەو کتێبانە لە فایلی (فهرستواره نسخەهای عکسی مشاهیر کرد موجود در کتابخانه، آرشیو و مجموعه شخصی محمد عبدلی لە مەهاباد)، بەشی پزیشکی، لاپەڕە ١٣ هەیە. [باسی ئەو دوو سەرچاوەیە لە کتێبی "اسبنامەهای پارسی، نووسەر: دکتۆر نادر کریمیان سەردەشتی" هاتووە.]

وەرگێڕانی کتێبی "قانون در طب" بکەین مامۆستا هەژار باس لەوە دەکات کە شوێنەواری زمان و تێکەڵاوی کۆمەڵایەتی کوردی لەناو دەقی کتێبەکەی "ابن‌سینا" بەرچاو دەکەوێت. واتا ابن‌سینا کە بەشێکی تەمەنی لە ناوچەی هەمەدان بووە بەدڵنیاییەوە تێکەڵاوی و هاتوچۆیی بووە لەگەڵ نەخۆش و حەکیمان و خەڵکی کورد. وێدەچێ ئەوکاتە لەچاو ئێستە جەماوەری هۆزەکانی لەك و لوڕ لە هەمەدان زیاتر بوون. چونکا سەردەمی ژیانی حەکیم "ابن‌سینا" یەکێك لە شارە گرینگ و گەورەکانی کوردستان، لە نزیك هەمەدان، شاری بەهار بووە. واتا هەمان بابەتی کاریگەری و شوێنەواری زمانی کورد بووە لەسەر دەقی عەرەبی "قانون فی طب" کە چەندین سەدە پاش ئەو حەکیمە گەورەیە بە هەمان شێوە بێ وەرگێڕانی فارسی مابووەوە. مامۆستا هەژار موکریانی خاوەنی چەندین پشکی تایبەتی زمانی بوو (وەکوو شارەزایی بە چەندین شێوەزاری فەرمی و خێڵەکی عەرەبی، فارسی کۆن و نوێ، هەروەها زاراوەکانی کوردی) کە بەخت یاوەری بووە و پاش هەزار ساڵ ئەو کتێبەی کردووە بە فارسی.

* جیا لە هۆکار و ئاسیوناسیەکانی سەرەوە کە بۆچی بابەتی پزیشکی خۆماڵی کوردەواری وەك پێویست لە ئاست گوێتراوەیی ناو خەڵك و سەرزارەکی بوون بۆ قۆناغی نووسین و تۆمارکردن کاری بۆ نەکراوە، دەتوانین ئاماژە بە ئاستی ڕۆشنبیری و فەرهەنگی تاك و کۆمەڵی کورد بکەین. ساڵانێکی زۆر نییە کە ڕێبازە خۆماڵیەکانی پزیشکی گەلانی دیکە وەکوو پزیشکی مالایی، چینی، ئێرانی، دەرزیاژن، کەڵەشاخ، و هتد بەفەرمی ناسراون و لەپاڵ پزیشکی هاوچەرخ لە خەستەخانە و زانکۆ و توێژینگەکان کاریان لەسەر دەکرێت و خەڵك لە خزمەتگوازی و تایبەتمەندیەکانی کەڵك وەردەگرن. دەی بۆچی بەو هەموو بانگەشەی پاراستن و پشتیوانی لە چاند و فەرهەنگی کوردی و دانانی دەیان بنکە و ناوەندی گیادەرمانی و پزیشکی خۆماڵی لە شارەکانی کوردستان هێشتاکە ڕێبازی پزیشکی خۆماڵی کوردەواری نەناسراوە و تەنیا جارجارە وەك سووکەبایەك بە کەناری کۆڕ و کۆبوونەوە و دانشتنەکاندا تێ دەپەڕێت؟ ئایا کاتی ئەوە نەهاتووە هەوڵی چڕتر بخەینە گەڕ تا لەوە زیاتر پیرانی حەکیم و هەڵگرانی ڕاستەقینەی ئەو گەنجینەیە کۆچیان نەکردووە و نەمردوون ئێمە ئەزموون و لێزانی و زانستەکانی زارەکی ئەوان بنووسین و تۆماری بکەین با نەفەوتن؟ چەندین ئاسیو و هەوای دژ هەیە کە ناهێڵێت ئەو گەنجینەیە زیاتر تۆمار بکرێت و زیاتر کات دەکوژرێت و هەل دەفەوتێ تا پیران و حەکیمانی ڕاستی بمرن و بمێنێتەوە چینی نوێ کە کەمترین بەش لەو گەنجینەیان وەرگرتووە. نموونەی چەند لەو

ئاسیوانە ئەمەیە:

- زۆربەی ئەو پیر و حەکیمانە نەخوێندەوار و لادێیی و هەژارن.

- سەرجەم بانگەواز و بانگەشەی خەستەخانە و یانەکانی تەندروستی شار و گوندەکان دژ بە ئامۆژگاری و ڕەچەتەی دایکان و باوکانی بەئەزموونی بواری پزیشکی و چارەسەریی، بەرز دەکرێتەوە و هیچ گرینگی بەو ئەزموونانە نادرێت.

ـ لە شار و ئاواییەکان کە هێشتا کەسانێك پێداگری دەکەن و پشت بە پاشخانی پێشینیانی کورد دەبەستن و لەپاڵ پزیشکی هاوچەرخ ئامۆژگاری و قسە و ڕەچەتەی پیرانی حەکیم و دایك و باوکانی بەئەزموون گوێ دەگرن و لە ڕەوتی ژیانیان جێبەجێی دەکەن، دەکەونە بەر تانە و تەشەر و قسەی تاڵ و ڕووخێنەر. بەداخەوە لایەنی بەرامبەر ئەو کەسانە بە قسەی سووك ناودێر دەکات، وەکوو: "قسەی پرووپیرەژن"، "قسەی دووکتەر بان قووڵینە"، "حەکایەتی کۆلکە دووکتەر"، "بەیتی هەنوون و مەڵهەم"، و هتد.

ـ بڵاوبوونەوەی ڕێکخستنی نوێی خوێندن و قوتابخانە و خوێندواری لە شار و گوندەکانی کوردەواری، هەروەها میدیا و ڕۆژنامە و کتێبی لایەنی دەسەڵاتی باڵادەست وای کردووە کە ڕێ و جێ بۆ زیندووبوون و بووژانەوەی بواری پزیشکی خۆماڵی کوردەواری لێژ بووە و بە خێرایی بەو لێژاییەدا دائەگەڕێت.

- کەمتەرخەمی لایەنەکانی تاك و کۆمەڵی گیادەرمان و پزیشکی خۆماڵی لە شار و گوندەکان لەسەر گرینگیدان بە بار و بەرهەمەکانی ئەو بوارە پزیشکیە. بەداخەوە بەشێکی بەرچاو لەو کەسانە تەنیا و تەنیا وەك پیشە و بژیوی ژیان ڕوویان لەو بوارە کردووە و هیچ لە بابەتی پزیشکی خۆماڵی نەتەوەی خۆیان نازانن. بەشێك لەو کەسانە خەریکی گەشەپێدان و بڵاوکردنەوەی ڕێبازە پزیشکیەکانی دیکە وەکوو دەرزیاژن، ماساژی ژاپۆنی، پزیشکی چینی و ئێرانین و بواری پزیشکی نەتەوەی خۆیان پشتگوێ خستووە و تەنانەت زۆرجار پاڵنەرێکی بەهێزن بۆ دژبەریەکانی لایەنی پزیشکی هاوچەرخ بەرامبەر هەندێ تایبەتمەندی پزیشکی خۆماڵی کوردەواری، وەکوو ناوكگرتنەوە، کەهەنگ، شێلان و هتد.

- بەداخەوە هەندێك کۆلکە حەکیم (وەك ابن‌سینا دەڵێت: مطبب) و دووکانداری دەرمانگەری و پزیشکی داهاتوون کە تەنیا لە بیری پڕکردنی گیرفانی خۆیانن و هیچ گوێ نادەن بە ویژدان و ڕەوشتی ڕاستی حەکیمان. ئەوان تەنیا بە لاسایی کردنەوەی حەکیمان و پزیشکانی ڕاستی پارە پەیدا ئەکەن، بەڵام ئاگایان لەوە نییە چ گورزێکی کاری و زەبرێکی کوشندە لە ڕیشەی قووڵی پزیشکی خۆماڵی ئەدەن.

ـ بەشێك لە نەوە و وەچەی حەكیمانی كوردەواری خۆیان توند هەڵواسیوە بە ناو و ناوبانگی باب و باپیرانیانەوە و ڕێگە نادەن كەس بزانێت ناوەرۆك و پێكهاتەی ڕەچەتە و ماكە دەرمانی و چارەسەریەكانی ئەو حەكیمانە چی بووە. ئەوانە وەك نهێنیەك تەنیا لای خۆیان هەڵیان گرتووە و چەشنی دزی و دزیكاری مامەڵەی پێوە دەكەن. بێ ئەوەی بینووسنەوە یا وتاری لەسەر بنووسن و لە كۆڕ و كۆنفرانسە پزیشكیەكان باسی بكەن.

ـ بەشێكی دیكە لە نەوە و وەچەی حەكیمانی كوردەواری هاوشێوەی باب و باپیرانیان خزمەتگوزاری خۆیان بەرامبەر خەڵكی نەخۆش و دەردەدار نیشان ئەدەن، بەڵام ئەوانیش هیچ لە ناوەرۆك و پێكهاتەی ڕەچەتە و دەرمانەكانیان بۆ كەس دەرناخەن. هەندێ جار مەترسی ئەو دەستە ئەوەیە كە ئەو ڕەچەتە و دەرمانە تەنیا كەسێك لە بنەماڵەی ئەو حەكیمانە دەزانێت و بە مردنی ئەو كەسە ئەو میراتەیش دەمرێت و دەبڕێتەوە.

ـ جیا لە بابەتەكانی سەرەوە خاڵێكی ئێجگار گرینگ، هەبوونی گەلێك خورافات و بابەتی دوور لە عەقڵە كە تێكەڵاوی بواری پزیشكی خۆماڵی كوردەواری بووە. بەداخەوە ئەو بابەتە وای كردووە هەندێ جار سەرجەم توێشەی ناو هەنبانەی ئەو ڕێبازە پزیشكیە بە خورافات و درۆ و دوور لە عەقڵ ئەژمار دەكرێت. وەك دەزانین بنەمای پزیشكی هاوچەرخ ترازووی تاقیگە و تاقیكردنەوەی مژارەكانی پێیە. ئەو بۆچوونە گشتییە كە پزیشكی خۆماڵی سەرجەم خورافاتە لە تای ئەو ترازووە و لە بواری ئەو تاقیكردنەوە دەرناچێت. زانستی پزیشكی هاوچەرخ، شیاوی نازانێت خورافات هەڵبسەنگێنێت و تاوتوێی زانستی بكات. چونكا خورافات بنەڕەتی زانستی نییە و بابەتێكی خەیاڵی و وەهم و درۆیە. كەواتە ئەركی سەرشانی گیادەرمان و پزیشك و خوازیارانی دڵسۆزە كە ئەگەر لە بواری پزیشكی خۆماڵی كوردەواریدا كار و توێژینەوە دەكەن بەوپەڕی دڵسۆزیەوە هەڵسوكەوت بكەن و حەكیمانە ڕێچكەی حەكیمی و دەرمانگەری بگرنە بەر.

ئاگەداربوون و سەردەركردن لە بارودۆخ و هەلومەرجی هەنووكەیی پزیشكی خۆماڵی كوردەواری بەپێی كورتە ئاوڕدانەوەی سەرەوە، بۆ هەموومان پێویستە. چونكا ئاگەدارنەبوون لەو ڕێبازە پزیشكییە بۆ زۆرێك لە تاكی كورد وەك ئەوە وایە كە كەسێك لە بناغەوە دەوڵەمەند بێ و ملك و ماشێكی مشەمەری بێ، بەڵام پرژ و بڵاو، سەریەك نەخراو، پچرپچر، تاك و ترا لەیەك، بەد سەرپەرشتیاری كراو و چەندین بابەتی هاوشێوەی دیكە. جیا لە بارودۆخی ناوبراو، ئەگەر ئەو كەسە هەڵوێستێكی وای نەبێ كە ئەو ملك و ماشە سەر یەك بخات و كۆیان بكاتەوە و بەرنامەیان بۆ دابڕێژێ و سەرپەرشتیاری چاكیان بكات، لەوانەیە

کـاتێ بە منـاڵ و نەوەکـانی گەیشـت زۆر دەرفەت و کـات لە دەسـت چووبێـت و بـار و بەرهەمی خۆی لەناو چووبێت و سنووری مڵکەکانی داگیر کرابێت و بەو شێوەیە شتێکی بە دەستەوە نەمێنێت. بەداخەوە بارودۆخی پزیشکی خۆماڵی کوردەواریش کارەسـاتێکی وای بە سەردا هاتووە. ڕۆژبەڕۆژ بەرهەمە ڕەسەنەکانی ئەو ڕێبازە بە ناوی پزیشکی گەلانـی دیـکەوە تۆمار دەکرێت و بازنەی سنووری ئەو پزیشکییە تەسك و تەنگتـر دەبێـتەوە. ئەگەر ئەوڕۆکە هەڵوێست نەگرین بەدڵنیاییەوە بۆ سبەینێ گەلێك دوا کەوتووین. نموونەیەك لە چارەنووسـی بەشێکی گرینگی پزیشکی خۆماڵی کوردەواری باس بکەین:

کاك بورهان حوسەینی دامەزرێنەری ناوەندی گیادەرمانی شەفا لە سنە چەند ساڵ پێش گێڕایەوە: "*پێش دامەزراندنی زانکۆ و دەرمانگە و خەستەخانە فەرمیەکانی پزیشکی خۆمـاڵی لە ئێران، جارێك لە کۆبوونەوەیەکی کۆمەڵەی گیادەرمـانی گشـتی ئێـران لە تـاران بەشـدار بـووم. لە نـۆرەی قسـەکردندا، باسـی دەوڵەمەنـدی پزیشـکی خۆمـاڵی و کـۆنی نـاوچەی کوردستانم کرد و بۆ نموونە ئاماژەم بە چەندین شێواز لە گـرتنەوەی دەرچـوونی نـاوك لای کوردەکان کرد. گوایە لە کاتی ئەو قسانەدا و بـاس لە نـاوكکەوتـن، بەشـێك لە پسـپۆڕان و شارەزایانی ئامادەبوو بە بزە و لە ژێر لێوەوە باسیان لە بێبنەمابوونی ناوك کەوتن و گـرتنەوە دەکرد و وڵامی قسەکەی بەندەیان ئەدایەوە.*" ئەوڕۆ ئەگەر سـەرێك لە زانکۆکـانی پزیشـکی خۆماڵی ئێران بدەین و چاوێك بە ڕیـزی وانەکانیـدا بخشـێنین یەکێـك لە وانە گرینگەکـان باسی "ناف افتـادن یـا نـاف دررفتگی"ـیە، بەڵام داخەکەم ئەو نەریـتە پزیشـکیە وەك زۆر بـابەتی دیـکە خـۆ بە نـاوی دانیشـتوانی نـاوچەی زاگـرۆس کە خاوەنـداری سـەرەکی ئەو گەنجینـەیەن تۆمـار نەکـراوە. تەنـانەت لەوانەیە نکـوولی بکرێـت لەو ڕاسـتییە و بە مڵکـی ناوچەکانی دیکەی ئێران باسی بکەن.

باسی بەندە لە وتاری بەردەست ئەوە نیـیە کە هاوشـێوەی پزیشـکی خۆمـاڵی و کـۆنی ئێرانی لێرە ڕیزبەندی و پۆلێنێك بۆ پزیشـکی خۆمـاڵی کـوردەواری بـکەم. چونکـا ئەو کـارە پێویستی بە هاوبیری و ڕاوێژی پسپۆڕان هەیە و هەروەها کاتێك دەتوانین ئەو کـارە بکەیـن کە سەرجەم بابەتەکانی ئەو سامانە کەلتووریە کۆ بکەینەوە و لەبەری دابنیشـین و تـاوتوێی بکەین و سەنگایی و زەنگینی بکێشین و هەڵیسەنگێنین. ئەڵـبەت لێـرە تەنیـا بـۆ ئامـاژە و بەرچاوڕۆشنیەك، بەپێی بەدواداچوون و توێژینەوەکانی خۆم ئاماژە بە هەنـدێك لە سـەنگایی توێشەی ناو هەنبانەی ڕەنگین و سەنگین و زەنگینی پزیشکی خۆماڵی کوردەواری دەکەم:

* بنەڕەتی ئەو ڕێبازە پزیشکیە بەقەد مێژووی نیشـتەجێبوونی گەلـی کـورد لە ناوچەکـانی

زاگرۆس و جوودی و قەندیل و چیای کرمانج قووڵایی هەیە و ڕیشەی لە خوارەوەیە.
* بەهۆی جۆراجۆری هۆز و زاراوە و ئایینی جەماوەری کورد لە ناوچە جیاجیاکان، ڕەنگاوڕەنگیەکی بەرچاو لە توێشە و بەرهەمی ئەو پزیشکیە بەدی دەکرێت.
* تا پێش داهاتنی ڕێکخستنی پزیشکی هاوچەرخ کە سەرجەم بواری دەرمان و چارەسەریی لە کوردستان، بەتایبەت لە گوندەکان و شارە بچووکەکان بەکارهێنانی پزیشکی خۆماڵی کوردەواری لە ئاستی سەروو و لەبەرتر بووە.[١]
* لە پزیشکی خۆماڵی کوردەواری ئاستی پسپۆڕی و شارەزایی بەپێی تەمەنی دەرمانگەر و حەکیمەکانە. واتا ئەو کەسەی دەستی داوەتە دەرمان و چارەسەرکردن بەپێی تەمەنی خۆی ئەزموونی ژیانی خستووەتە سەر ئەو ئەزموون و زانستەی لە باب و باپیرانیەوە پێی گەیشتووە. کەوابوو هەتا تەمەنی پیرتر بێت دەرمانگەر و حەکیمی باشترە.
* لە کوردستان نەریتی دەرمانگەری و حەکیمی بۆ هەندێك بنەماڵە وەك میرات وایە. چین بە چین منداڵی ئەو بنەماڵەیە بە شاگردی ڕاهێنان و بارهێنان دەکرێن لەبەردەستی داپیر و باپیر یا دایك و باوکیانەوە. شاگرد لەو بنەماڵە بەپێی بەهرەمەندی و بلیمەتی خۆی فێر دەبێت و دەستی ڕادێت. ئەڵبەت تا کاتێ مامۆستاکانی زیندوون ئەو کەسە وەك شاگردێك لای ئەوان کار دەکات یا لە قوژبنێکی جیا و بە سەرپەرشتیاری دوور و نزیکی ئەوان خزمەت ئەکات. بەهەرحاڵ ئەزموون و ئاستی پسپۆڕی بەپێی تەمەن ئاشکرا دەبێت.
* دژایەتی کردن بەرامبەر یەك لای حەکیمانی ڕاستی کوردەواری بەدی ناکرێت. چونکا کاتێ لە ئاواییەك شارەزای دەرمان و چارەسەر کاری نەخۆش و تیمار و دەردێکی پێ چارەسەر نەکراوە، ئەو کەسەی ڕێنموونی و ڕێنیشاندەری کردووە کە سەردانی کەسی سەرووتر لە خۆی بکات. نەخۆش کاتێ سەردانی حەکیمی دیکەی کردووە و گەڕاوەتەوە ئەو کەسە لە ناودێ چاوی پێ کەوتووە و هەوڵی داوە کە ناوەڕۆك و پێکهاتەی دەرمان و ئامۆژگاری ئەو حەکیمەی تر بزانێت تا ئەگەر کاریگەر بوو ئەویش دواجار بەکاری بهێنێت بۆ نەخۆشانی تر. بەو شێوەیە هەمیشە هێڵی خوار بۆ بان یا هەمان شاگرد بۆ مامۆستا ڕەچاو

---

١. سەردەمی قاجارەکان کە هاوکات بووە لەگەڵ داهاتنی ڕێکخستنی پزیشکی هاوچەرخ لە جیهان، بەشێك لە بانگخوازانی جوولەکە و مەسیحی بەناوی پزیشك و دەرمانگەر لە کوردستان نیشتەجێ بوون و لەپاڵ خزمەتگوزاری خۆیان بانگەوازی ئایینیان کردووە. بۆ نموونە پزیشکانی هاوڕێی دکتۆر سەعید خان کوردستانی لە سنە و هەمەدان، یا میرزا حوسێن حەکیمزادەی سەردەشتی کە ماوەیەك شاگردی میس داڵی نۆروێژی بووە لە مەهاباد بۆ هەندێ کاروباری پزیشکی.

کراوە. لەوانەیە ئەو هێڵە چەندین قۆناغ شـاگردی و مامۆسـتایی تێـدا بـێ. بـۆ نمـوونە لە ناوچەی موکریان سەرەڕای چەندین مامۆستای گەورە وەکوو حەکیمە کۆڵەی گردەکشـانێ، میرزا حوسەین حەکیمزادەی سەردەشتی، بنەماڵەی مەولەوی مەهابـاد، حەکیمـانی ئـاوایی سـەبەتڵووی بـانە و هتـد، جـاری وابـووە ئەو بەڕێـزانە نەخۆشـیان نـاردووەتە لای شـێخ عەلائەدین لە بیارە یا شێخ عوسمان لە دووڕۆی سەولاوا.

* لە پزیشکی خۆماڵی کوردەواری حەکیم و پسپۆڕی ڕاستی بریتـی بـووە لەو کەسـەی کە سەرجەم یا زۆرترین بەشەکانی چارەسەر، کاری دەست و دەرمانی ئەو ڕێبـازەی زانیـوە. بـۆ نموونە ئەگەر سەردەرچوویی بووە لە چارەسـەر و ڕەچەتە و ئامۆژگـاری، هاوکـات چەنـدین شـێوە نـاوکگـرتنەوە، سـەرگرتنەوە، شکسـتەبەندی، تەقەڵ و دروونەوە، نەشـتەرگەری، کەڵەشاخ، خوێنبەردان، شێلان، کەهەنگ و بابەتی دیکەی شارەزا بووە.

* پسـپۆڕی تـایبەت بە بەشـە جیاجیاکـانی ئەو ڕێبـازە پزیشـکیە دیـار بـووە و هەرکەس شـارەزایی زیـاتری لە بـارێکەوە بـووە. بـۆ نمـوونە، وەسـتای نـاوکگـرتنەوە، سـەرگرتنەوە، کەهەنگ، بین‌بەردان، شکستەبەندی، منالبوون، کەڵەشاخ، نەشـتەرگەری کـوان و بـرین، و هتد.

* خاڵێکی گرینگ ئەوەیە پسپۆڕان و حەکیمانی کوردەواری جیا لە پزیشکی و چارەسـەری مرۆڤەکان، لە بواری ئاژەڵ و پەلەوەرەکـانیش شـارەزا بـوون. بەشـێکی زۆر لە ڕچەشـکێنی بەکارهێنانی دەرمان و چارەسـەری و شـێوازی نوێکـاری، سـەرەتا لەسـەر ئـاژەڵ و پەلەوەر تاقییان کردووەتەوە.

* حەکیمانی کوردەواری تەنیا پێداگری و ئامۆژگاری و ڕاسپاردەیان لەسەر دانـان و پێـدانی دەرمان نەبووە. بەڵکوو بابەتی چێشت و خۆراك، باش کردنی شـێوازی ژیـان، هەڵسـوکەوتی بنەماڵەیی و کۆمەڵایەتی، جموجووڵ و گەڕان، دوورکەوتنەوە لە دەسـتەئەژنۆ بـوون و خـۆ قەتیس کردن، پشت بەستن بە پەروەردگار و چەنـدین بـابەتی دیـکە لای ئەوان گرینگـی زۆری پێ دراوە.

* خۆراك و دەرمان لای حەکیمانی کورد بەپێی گەرم و سارد دانراوە. سروشتی نەرمونیـانی و تووڕەبوون، کزی و قەڵەوی نەخۆش، ئاستی تێگەیشتوویی و ناتێگەیوی، کاروبار و جۆری ژیان، ژینگەی کوێستان و گەرمیانی بوون، و هتد لەبەرچاو گیراوە.

* حەکیمـان جیـا لە دەرمـان و دەوای دەواخـانەکەی خۆیـان، هـاوڕێی نەخۆشـەکەیان ڕاسپاردووە کە لە ژینگەی گوند و شاری خۆیان گیـا و گـوڵ و بەرهەمـی ئـاژەڵ و مـاکی

کانزایی و خاکی دابین بکەن. واتا حەکیم بابەتی ژینگەی نەخۆشی لەبەرچاو گرتووە و بەپێی هەبوونی دەرمان و خۆراك لە ناوچەی نەخۆش ڕەچەتەی داناوە و خۆراك و چێشتی بۆ نووسیوە. نەك دانانی دەرمان و خۆراکێك کە دەستی نەخۆشی پێ نەگەیشتووە یا ڕیشەی دەرکێشاوە تا بە دەستی هێناوە. بەگشتی دەرمانی حەکیمانی کوردەواری ساکار و ئاسان و بەردەست بووە.

* زۆربەی دەرمانگەر و حەکیمانی کوردەواری هاوکات کەسایەتیەکی بەرز و ناوداری ئایینیش بوون و لایەنی ئایین و ئاکاربەرزی لای ئەوان زەق بووە. خزمەتگوزاری پێشکەش کردن لای ئەو حەکیمانە لەپێشدا خێر و خوایی بووە ئینجا بۆ بواری بژیو و دەستخۆشانە.

ئەوسا حەکیم کەمتر بەرژەوەندی پلە و پارەی بۆ خۆی لەبەرچاو گرتووە. نموونەی حەکیمی وا بووە بەڕاشکاوی هەڵیداوە لە خزمەتگوزاری تایبەت بە میر و پاشاکان و خۆی نزیك کردووەتەوە لە چینی هەژار و دەستکورتی کۆمەڵگە. بۆ نموونە لە سەردەمی عوسمانیەکاندا لە میرنشینی ئامێدی، سمایل پاشا، بانگ لە سمایل حەکیم سلێڤانی دەکات لە ناوچەی زاخۆ کە وەك پزیشکی خۆی و وەزیر و گزیرەکانی لە قەڵا و کۆشکەکەی دابنیشێت و سێبەری سەهەنی میری بەسەرەوە بێت. سمایل حەکیم ماوەیەك لە کۆشکی میری ئامێدی دەمێنێتەوە، بەڵام دواتر کەشی میر و میرایەتی پێ خۆش نابێت و دەگەڕێتەوە بۆ گوندەکەی خۆی. یا سەردەمی قاجارەکان، موزەفەردین شا بانگ لە سەید موحەممەد حەکیم ناسراو بە "ابن سینا دووەم یا اشرف الحکمای کوردستان" دەکات کە ببێتە پزیشکی ناو کۆشکەکەی، بەڵام ئەو کەسایەتیە وە دوای ئەو بانگێشتنە ناکەوێت و لە شاری سنە و گوندی حسەین خانی گەڕووس خزمەتگوزاری خۆی دەکات.

* ڕەچاوکردنی وردبینی و لێزانی تەواو لە بەکارهێنانی خۆراك و دەرمان بەپێی کات و شوێنی نەخۆشەکان. بۆ نموونە حەکیمانی کوردەواری پشتاوپشت لە پێشینیانیانەوە بۆیان ماوەتەوە کە: خواردنی هەنگوین لە وەرزی بەهار و هاوین باش نیە، دۆینە بە پوونگە و پیازداخەوە لە زستانان و ڕۆژانی بەفر و باران و گوێنە و ڕۆن لە هاوین و بەهار بخورێت، هەزبی مێرگی کوێستان و شاخە بەفراویەکان بۆ نەخۆشی گەرمیانی چارەسەریی تەواوە، ڕۆنی زەنگ بە دۆشاو و شۆکە بۆ نەخۆشی کزی و لەڕی باشە و بۆ نەخۆشی قەڵەو و گۆشتن زیانبەخشە، ماست و دۆی ترش بۆ ژنی دووگیانی زستانەزێ ژەهرە (وەك حەکیمان دەڵێن: *ژان و باریی سواری زەیستانی دەکات*) و بۆ ژنی دووگیانی هاوینەزێ خواردنی ماست و دۆ شیری زەیستان زیاد دەکات، و گەلێك بابەتی حەکیمانەی دیکە.

* لە ڕێبازی پزیشکی خۆماڵی کوردەواری گەلێك بابەت و دەستەواژە هەیە کە هەم لە باری ڕێزمانی و هەم ڕیشەناسی پزیشکیەوە تایبەت بە فەرهەنگ و شارستانیەتی کوردە، وەکوو:

بۆ نەخۆشی و دەرد و ژان: ناوك گرتنەوە/ هێنانەوە، دڵ کەوتن، سەرکەوتن، باریی سوار کردن، لەش گران بوون، دڵ خاو بوونەوە، بە دڵی خاڵی، دڵ کار کردن (ڕەوانی ناوسك)، دڵ داکەوتن، لەسەرخۆ چوون، دڵ وێڵ بوون، خوێن گەرم بوون، سارد بوون (لە پێوەندی و هەڵسوکەوت)، جەمام/ گۆت بوون، داگیریان (توندبوونەوەی ماسوولکە و ڕەگ)، سك چوون، ئاو زانە دەم، دەرد کاری بوون، چارە بڕیان، گیان کردنە گیان کەسێك، پەنجەیەك گەرم بوون (کەمترین ئازار دیتن)، دووگیانی، شەیتان ئاوس، لە سك چوونەوە، ڕەحەت بوون، نانوێژی بوونی ژن، سەر و عوزر شۆردن، بەرچاو ڕەش بوون، بەرچاو ڕێچکە و پێچکە کردن، مرۆژانە کردن، خوێن تەڕەوە بوون، دەم وشك بوون، سەردڵ (سینگ)، فێڵە، یاو بڕین، وڵك بڕین، چاو توونیانەوە، قنگ سۆڵیانەوە، گێرپێچ/ گاپێچ کردن، باپەڕ کردن، سەرما کێشان، سەرما/ تاو بردن، لە پیاوەتی کەوتن، پیاوەتی لێ هاتن، کچێنی، بن پژیان، لووت/ خوێن ڕاسان، خوێن لووت بەربوون، گۆشەك کەوتن، مووی مێردی، سپڵ ئەنجنین، بالووك و بیرۆ بڕین، گڕاو، چاو داتەکاندن، تۆم تکیان، قانگدان (دووکەڵدان بڕین)، حەمامی کووزەڵە و هتد.

بۆ ئامێر و کەرەستەی چارەسەریی: جەوەنە (بۆ ناوك هێنانەوە و جەمامی)، مشتەکۆڵە خوێ (بۆ بەستن لەسەر ناوك)، ناوکبەند، پرێسکە (بۆ ژانەسەر)، دۆخین (بۆ سەرگرتنەوە)، کاڵکێش (بۆ ددان کێشان)، کافرمان (چەقۆی نەشتەر و کردنەوەی کوان و ڕدێن تاشین)، دەمنە (بۆ با تێکردن لە کاتی مناڵبوون)، کاسەکەڵ (گۆزەشکاو: بۆ خستنەوە جێ دەرچوونی ئێسکی پێ)، پووشەڵە (پووشێکی قامیشی باریك بۆ بەردانی میز)، تیرۆك (بۆ پشت تەقاندن و شێلاندن)، کووپە و کەڵەشاخ (بۆ خوێنگرتن و خوێنبەردان)، مشەمای هێلکە، مشەمای ترشکە، سنگ (بۆ داخ کردن کلۆری دیان)، پاشۆر (بەردەپێ)، فیشقە، ترۆمپای دەوا و هتد.

بۆ دەرمان و پیکهاتەکان: نیمەنمەك (هەویر و خوێ)، خەرمەڵهەم (شیلەی تەرسی کولاو)، زەفت و قیر (مادەی مۆمیا و قیر)، میز و مامیلە، ڕۆنسوور (ڕۆنی قرچاو بۆ برژاندنەوەی برین)، تەپاڵە کووجیلە، بەز و بنێشت، مێخەك بەرۆك، سمڵ و مێخەك، سزگ (تیژاوی دۆ)، دۆ سۆڵە، خورما و دوو، قاووت، کولێرە مەژگ، کەلانە، کولێرە گاڵگاڵی، ڕۆن و دۆشاوی ناو خیگە، کاوڵ دیوار، دیمەشۆر (دیمەنشۆر)، هەڵواقەنی، گۆچانقەن، هەلیماو،

*شـیروا، یەکـاوە، قاتوقەیمـاخ، سـرێش و مـاس، جەوی و ڕۆن، دەوارەشـە، مەڵهەمەڕەشـە، دەواسەوزە، حەوتۆکە (پەڕۆ و جواڵ و دڕك بۆ سەر کوان)، حەفدەرمانە، گیاحەکیم، گیـابڕ، گیاژان، بەرەمێو، مێو و ڕۆن، و هتد.*

## ڕیزبەندیەک لە پێگەکانی پزیشکی خۆماڵی کوردەواری

ئەگەرچی تا وەکوو ئێستا کارێك لەسەر پۆلێن و ڕیزبەندی پیشە و پێگەکـانی نـاو پزیشـکی خۆماڵی کوردەواری نەکراوە، بەڵام ئەوەی کە هەموو کەسێك لەو ڕێبازە کەلتووری پزیشـکی و چارەسەرییە دەیبینێت چەندین پیشە و پێگەیە کە وەك هەمـوو لقەکـانی پزیشـکی دنیـا بەشێکیان هاوبەشە و بەشێکی دیکە تەنیا تایبەت بە ڕێبازی پزیشکی کوردەوارییە. خـاڵێکی تـر ئەوەیە لە کـۆنەوە تـا ئێسـتە ئەوانەی پسـپۆڕیان لە سـەرجەم یـا چەنـد پـێگەی ئەو پزیشـکیەدا هەیە بە "حەکـیم"، "دووکـتەر" و "تـوژدار" ناسـراون. ئەوانـی دیـکە کە تەنیـا پسپۆڕی لە یەك یا دوو پێگەدا هەیە بە وەستا ناوبانگیان بووە.

* **حەکیم**: لای کـوردانی کرمـانج وشـەی "تـوژدار" بەرامـبەر "حکـیم" لە زمـانی فارسـی و عەرەبی بەکار دەچێت. نموونەی چەنـد لە حەکیمـانی کـوردەواری کە لەکـۆنەوە تـا ئێسـتا ڕێچکەیان درێژەی بووە. ئەو کەسانە بەشێکیان وەك نوژدار و نووسەری ناسـراوی سـەرەمی خۆیان بوون و کتێبە پزیشکیەکانیان ئێستاکە لە دنیا چاپ کراوە یا هێشـتا بە دەسـتنووس لە کتێبخانەکان ماوەتەوە. بەشێکی دیکە لە مێژووی پزیشکی کوردەواری ناویان ماوەتەوە و خەڵك هێشتا لەگەڵ ڕەچەتە و ئامۆژگـاری و ڕێبازەکەیـان ئاشـنایە. بـۆ نمـوونە: سـەرگیس سەرێکانی، ئێسحاق کـوڕی عەلـی ڕۆهـایی، مەلا مـوحەمەد ئەرواسـی وانـی، عەلائەدینـی تەبیبی هەولێری، سمایل حەکیم سلێڤانی دهۆکی، مامۆستا سـەیدی هەورامـی، مەلا خـدر ڕواری، مەلا عبدالسلام مەولەوی تەبیبی سـابلاخی، شـێخ بابـا سـەعید غەوسـاباتی، شـێخ عەلائەدین بیارە، مسباح دیوان (ئەدەب)، ئەشرەفولحوکەمای کوردستانی (سـەید مـوحەمەد ئەلیاسی)، دکتۆر سەعید خانی کوردستانی، شێخ عەبـدولا هەزارکانیـانی مەردۆخـی، شـێخ عوسمان دووڕۆ، حەکیم خاوەری کرماشانی، مەلا کاکە حەمەی گەرمیانی، فەقێ حسـەینی مەنتك، خـاتوو یاسـەمەنی پلـوورە، سـەید مـوحەمەد حەکـیم سـەبەتلوو، میـنە حەکیمـی سوورەبانی (شاربازێڕی)، شێخ موحەمەد سوورکەوڵ و بورهان حوسەینی شەفا.

* **گیاژان**: بریتیە لەو کەسـانەی زیـاتر لە عەتـار و گیادەرمانەکـان گـوڵ و گیـا خـۆراکی و دەرمانیەکان دەناسن. ئەو کەسانە زۆر جاران دەستیاری و یاریدەدەری حەکیمانیان کـردووە

و بابەتی تایبەتمەندی و سوودی گیاکان دەزانن. واتا شاگردی حەکیمەکان بوون و بە گیادەرمانی شارەزا دەناسرێنەوە. هەروەها جیا لە دەرمانسازی و پێچانەوەی ڕەچەتە، لە بواری ناسینی ماکە سروشتیەکان (وەکوو بابەتی ئاژەڵ و کانزا) ژمارەیەکی بەرچاو گژ و گیای ناوچە و وڵاتی خۆیان دەناسن. بۆ نموونە سۆفیەکانی شێخ عەلائەدین و شێخ عوسمان لەو بارەوە لەسەر ناسینی گیا خۆراکی و پزیشکیەکان شارەزاییان بووە. بۆ نموونە: میرزا سدیق چنگیانی، حەکیمە کوڵەی گردەکشانێ، حاجی سەید خەلیل، کاك خەسرەو حەمە ڕەشید و حاجی عەلی هەنگ.

* **گیادەرمان یا ڕوەکدەرمان**:[1] زۆرترین ڕێژەی پیشەوەرانی بواری پزیشکی خۆماڵی کوردەواری، گیادەرمانەکانە. ژمارەی ئەوانە لە حەکیم، گیازان، گیاناس، عەتار و وەستاکان زۆرترە. گیادەرمانەکانی کوردەواری زیاتر نەوەی بنەماڵەی حەکیمان و گیازانەکانی کۆنە یا بۆخۆیان لەبەردەستی گیازان و گیادەرمانە تازەکان شاگردییان کردووە یا لە زانکۆ و توێژینەگان خوێندوویانە. نووسینگە و نۆرینگەی گیادەرمانەکان هاوچەشنی عەتارەکان بابەتی گیای پزیشکی و خۆراکی وشك و هاڕاوە، دەوای گیایی، بەهارات، ئاوتك و شیلە و دۆشاو، مەڵهەم، هەنوون، قاووت، کرێم، سابوون، و هتد دەفرۆشنەوە. ئەو کەسانە هاوکات ڕەچەتەی چارەسەریی لە بابەتی ناو دووکانەکەیان دەپێچنەوە و ڕادەستی نەخۆشی دەکەن. بۆ نموونە ئێستاکە زۆربەی نۆرینگە و دەرمانخانە گیاییەکانی کوردەواری لە نوێنەرایەتی کۆمپانیایەکی دەرمانی یا ناوەندێکی گیادەرمانی کوردستان یا دەرەوەیان هەیە لە ڕیزی گیادەرمان ئەژمێردرێن. لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان بەشێکی بەرچاو لە گیادەرمانی شارەکان نوێنەرایەتی ناوەندی گیادەرمانی شەفا لە شاری سنەیان هەیە.

* **گیاناس**: ئەوساکە کەسانێك بوون کە هۆگریان بە ناسین و پێناسە کردنی گیا و گوڵی

---

١. لە باشووری کوردستان بەرامبەر بە "طب الاعشاب" ڕوەکناسی دانراوە. هەمبەرێکی هەڵەیە و لەگەڵ باری ڕێزمانی و وشەسازی کوردیدا یەك ناگرێتەوە. چونکا دەکرێت کەسێك گیایەك بناسێت و ناو و ناونیشانی بزانێت، بەڵام ئاگەداری باری خۆراکی و پزیشکیەکەی نەبێت. ئەگەرچی پاکانەی ئەوان بۆ وشەی "ڕوەکناسی" ئەوەیە کە کۆمەڵەی ئەوان تاوەکوو ئێستا لەلایەن وزارەتی تەندروستیەوە بەفەرمی نەناسراوە و مۆڵەتی ئەو وزارەتەیان نییە. بەڵکوو لە وزارەتی ناوخۆ و بەشی ئاسایش و پارێزگا مۆڵەتی کارکردنیان هەیە. ئەوانیش بۆ پێشگرتن بە وێکەوتنی ناوی پزیشکی و دەرمان بە وشەکەوە، لەبری "ڕوەکدەرمانی یا گیادەرمانی" وشەی ڕوەکناسیان پەسەند کردووە. لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان هاوشێوەی فارسەکان "گیادەرمانی" و "طب سنتی" و لە باکوور و ڕۆژاوای کوردستان "پزیشکی گەلەری" بەکار دەچێت.

خۆراکی، پزیشکی، جوانکاری، لەوەڕ و پیشەسازی بووە. بۆ نموونە ئەبووحەنیفەی دینەوەری لە سەدەی ٣ کۆچی یەکێك لە گیاناسانی سەردەمی خۆی بووە. زۆر جاران حەکیم، گیـازان و گیادەمانەکان سەردانی گیاناسەکان دەکەن و لەسەر جیاوازی ڕواڵەت و ناوەرۆکی جـۆری گیاکان پرس و ڕا دەکەن. بەواتـایەکی تـر ئەگەر پسـپۆڕی گیاناسـی نەبێـت پاڵپشـتێك بـۆ پێناسـە کردنـی جۆرەکـانی گیـا لەبەردەسـتی حەکـیم و گیـازان و گیادەرمانەکانـدا نیـیە. ئێستاکە کۆمپانیا گەورەکانی دەرمانسازی پزیشـکی هـاوچەرخ یـا ناوەنـدەکانی پیشەسـازی خۆراك بەشێوەی کاتی یا بەردەوام گیاناسێك دائەمەزرێنن و سـوود لە پسـپۆڕی ئەو کەسـە دەبینن.

* **گیافرۆش و عەتار:** لە کۆنەوە دووکانی گیا و بەهارات و ترشیات و وشـکەدان و دانەوێـڵە لە بازاڕی شـارەکان بە نـاوی دووکـانی "عـلاف"، "عطـار"، "وشـکەبار" و "گیـافرۆش" بـووە. لەوانەیە هەندێ جار بابەتی ئەو دووکانانە زیاتر لەسەر بەرهەمێك بێت، بۆ نمـوونە بەهـارات، وشکەدان یا گیای خۆراکی و پزیشکی، بەڵام بەگشتی ئەو دووکانانە لای حەکـیم، گیـازان، گیاناس و گیادەرمانەکان ناسراون. ئەوڕۆکە لە کوردسـتان بەشـێك لەو گیافرۆشـانە بـوونەتە نوێنەری کۆمپانیاکانی دەرمانسازی دەوای خۆماڵی لە ئێران بۆ کـۆکردنەوەی بـابەتی گیـای پزیشکی. بۆ نمـوونە چەنـد سـاڵێکە لە شـاری مەریـوان کەسـانێك خەریکـی کـۆکردنەوەی چەقچەقە، خەشخاشکە، شـیلان، جـاترە، کاسەشـۆرە، بنێشـت، جەوی و چەنـدین بـابەتی دیکەن.

* **دەرمانگەری خۆماڵی:** ئەگەرچی ئەو کەسانە لە کوردەواری بە ناوێکی تـایبەتی یـا بەرچـاو ناناسـرێن و بەپێـی نـاوچە و ئـاوایی ڕێـزی خۆیـان هەیە، بەڵام ئەو کەسـانە دەکرێـت بە "دەرمـانگەری خۆمـاڵی"، "چارەسـەرکار" و "هەتوانسـاز" بناسـرێنەوە. هاوشـێوەی حەکـیمە گەورەکان، بەڵام لە ئاستێکی خوارتر و لە بازنەیەکی بچووکتـر، کەسـانێك هەن شـارەزاییان لە چەندین بابەت وەکوو گیازانی، گیادەرمـانی، وەسـتایی و گیاناسـیدا هەیە. لەنـاو پیرانـی بەئەزموونی لادێ، کەسانێك هەڵدەکەون کە دەستێکی باڵایـان لە چارەسـەری و دەرمـان و شکستەبەندی و وەستایی بوارەکانی دیکەی پزیشکیدا هەیە. ئەو کەسانە بۆخۆیان بۆ خێـر و خوا یا هەندێ جار بەرامبەر بە وەرگرتنی دەستخۆشانەیەکی کەم، گیا و گوڵ و دەرمانی تر لە کێو یا لە بـازاڕ دابـین دەکەن و لە مـاڵی خۆیـان دەیگـرنەوە و دەرمـانی تـایبەتی سـاز دەکەن. کەسـانێك وا سـەردانیان دەکەن لە تـوورەکە و قوتـووی هەرەسـاکاری خۆیـان بەو نەخۆشانە ئەدەن. هەروەها سەبارەت بە بابەتی وەستایی وەکوو شێلان، نـاوك، دڵ، شـکیان،

گەڕی، بیرۆ، و هتد هاوشێوەی حەکیمەکان دەستیان شەفای پێوەیە و شارەزاییان هەیە. لەوانەیە کەمتر لە حەکیمی باڵا پسپۆڕ بن، بەڵام ئەو کەسانە چونکا خۆڕسک و ئەزموواره ئەو پیشەیانە گرتووەتە بەر کەسێکی ئامادە و نموونەن بۆ حەکیمی. واتا ئەگەر کاریان لەسەر بکرێت و لایەنێکی پێوەندیدار ئەرکیان وەئەستۆ بگرێت، بێ گومان زیاتر بلیمەت و هەڵکەوتەییان ئاشکرا ئەبێت. بۆ نموونە: خات بەسێ لە ئاوایی داوداوێ سەردەشت، خات زینەت لە ئاوایی شوێ بانە و ئیبراهیم حاسڵی لە ئاوایی خوێڵێنەی دێولان.

* **پیشەی وەستایی:** ئەوەیکە لە کوردی بۆ ئەو کەسانە لە بوارێکی تایبەتی پزیشکی خۆماڵی شارەزاییان هەیە و لەو بارەوە ناسراون و لێزانن ناوی تایبەتی نییە، بەڵام دەبیسترێت کە فلانی "پسپۆڕ" یا "مامۆستا"یە لە ناوک‌گرتنەوە، گیراوی بەردان، ترس‌بڕین، کەهەنگ یا شێلان. کەواتە دەکرێت بۆ ئەو کەسانە یەکێك لەو نازناوانە (پسپۆڕ، مامۆستا و وەستا) بەکار ببرێت. یەکێك لەو لایەنانە کە ڕێبازی پزیشکی خۆماڵی کوردەواری بابەتی تایبەت بە خۆی هەیە و لەوانەیە لە ڕێبازە پزیشکیەکانی دیکە نەبێت یا پێگەی بەرچاوتر نەبێ، بواره جۆراجۆرەکانی وەستاییە. دەکرێت وای بۆ بچین کە وەستایی جۆرێك هونەر و لێهاتوویی خۆڕسك و خۆکردی کەسەکان بۆخۆیانە. واتا لە بنەڕەتدا ئەو کەسانە لێهاتوون بۆ ئەنجامدانی ئەو کارە یا ئەوەیکە وەك نەریت لە بنەماڵەیاندا بووە. بۆ نموونە: *کەهەنگ، شێلان، کۆڵنج گرتن/ پرواندن، جەمامی/ گۆتی دەرکردن، ناوك گرتنەوە، فریشك گرتنەوە، ملاشوو گرتنەوە، گۆشەك گرتنەوە، دڵ گرتنەوە، منالدان خستنەوەجێ، مامانی، سەرگرتنەوە، گیراوی بەردان، بین‌بەردان، شکستەبەندی، برینپێچی، سپڵ ئەنجنین، چاوداتەکاندن، بیرۆ برین، بای‌سوور برین، بالووك‌برین، کەڵەشاخ، خوێنبەردان، هەتوانی پێست (جوانکاری و سووتان)، جوانکاری موو، دیانکێشی، خەتەنە (سوننەت کردن)، گوڵە برین و گجی برین (هی مانگا)، نەریەسە برین (هی مەڕ)، ناڵبەنی، خەساندن، و هتد.*

**تێبینی گرینگ:**

* لە پزیشکی خۆماڵی کوردەواری بابەتی دەرمانسازی وەك پیشە و پسپۆڕیەکی تایبەت و جیا نییە. بەڵکوو کەسانێك وەکوو حەکیم، گیازان، گیادەرمان، دەرمانگەر و وەستا بۆ مسۆگەری پێداویستی کاری خۆیان دەرمانی پێویست دەگرنەوە و سازی دەکەن.

* وەك دیارە ڕێبازی پزیشکی خۆماڵی کوردەواری لەگەڵ ڕێبازی گشتی پزیشکی خۆماڵی ئێرانی کە بە "سینایی و مەزدیسنایی"ش دەناسرێت، وێکچوونی هەیە و هەر دوو ڕێباز لە بنەمادا یەك دەگرنەوە و دەڕۆنەوە سەر یەك سەرچاوە. بۆ نموونە لە باری سروشت (طبع) و

مەزاج، وشكی و تەڕی، گەرمی و ساردی، حیكمەت و لیزانی. ئەگەرچی هەندێ باری پسپۆڕی و پیشەیی ئەو دوو ڕێبازە بەپێی داب و نەریتی خاوەنداری نەتەوەییان جیاوازیان هەیە. بۆ نموونە بابەتەكانی گرتنەوە و كەوتن (سەر، دڵ، ناوك، مناڵدان و مەلاشوو) یا گیراوی، چاوداتەكاندن، سپڵ ئەنجنین، هەنوونە تایبەتیەكان (نیمەنمەك، بەز و بنێشت، زەفت و قیر، خورما و دوو، مێو و ڕۆن و هتد) لە پزیشكی خۆماڵی كوردەواریدا هەیە و لە لایەنی ئێرانیەكەدا نییە یا دەركەوتنی زۆر بەرچاو نییە. خاڵێكی تر ئەوەیە بەشێكی بەرچاو لە بابەتەكان وەك هەموو ڕێبازە پزیشكیەكانی دنیا لەو دوو ڕێبازە دەق بە دەق هاوسان و یەكسانە، وەك كەڵەشاخ، خوێنبەردان، نەشتەرگەری، برینپێچی، شكستەبەندی و هتد. كەوابوو ئەگەر تا وەكوو ئێستا كارێكی زۆر ئاكادمی لەسەر ڕێكخستنی بنەما و بەرهەم و بابەتەكانی پزیشكی خۆماڵی كوردەواری نەكراوە، دەبێ ئێمە هەوڵی زیاتر بخەینە گەڕ تا ئەو ڕێبازە پزیشكیەش بناسرێت.

پوختەی قسە ئەوەیە بۆ زیاتر دەركەوتنی وێكچوون و جیاوازیەكانی نێوان هەر دوو ڕێبازی پزیشكی خۆماڵی كوردەواری و ئێرانی لە سێ وتاری خوارەوە هەندێ بەرچاوڕوونی ئەدرێت تا زیاتر بەرەو ناوەرۆكی بنەما و بابەتەكانی پزیشكی خۆماڵی كوردەواری هەنگاو بنێین:

1. **پوختەیەک لە ڕوانگەی "ابن سینا" لەسەر پزیشكی**
2. **پوختەیەک لە یاسای پزیشكی كۆن و میللی ئێران پەسەندكراو لە وەزارەتی تەندروستی**
3. **پێوەندی «قانون فی الطب» و زمانی كوردی**

## پوختەیەک لە ڕوانگەی "ابن سینا" لەسەر پزیشکی[1]

بەیارمەتی زانستی پزیشکی ئەتوانین پەی بە چەند و چۆنی تەنی مرۆڤەکان ببەین. ئامانجی سەرەکی پزیشکی، پاراستنی تەندروستیە لە کاتی خۆشی و گەڕانەوەی تەندروستی لە کاتی نەخۆشی بۆ مرۆڤەکان. ئەڵبەت کەسانێك هەن ئێژن: پزیشکی بریتیە لە دوو بەشی بیرۆکەیی (تئوری: نظری) و کرداریی (عملی)، بەڵام من بە دانانی وشەی "زانست" لەپاڵ "پزیشکی" تەنیا ئاماژە بە بوارە بیرۆکەییەکەی دەکەم. لە وڵامی ئەو کەسانە کە پزیشکیان بەو دوو بەشە داناوە، ڕوونی دەکەمەوە: لە سەرجەم پیشەکاندا دوو بواری بیرۆکەیی و کرداری هەیە. هەروەها لە فەلسەفەیش ئەو دوو بوارە دەبینرێت. کەواتە لە پزیشکیش هەر بەو شێوەیە دەڕواتە پێش، بەڵام پێناسەی بیرۆکەیی و کرداری لە پزیشکیدا هەندێ جیاوازترە. چونکە لە بواری بیرۆکەییدا باس لە فێرکاری و بواری کرداری باس لە بەکارهێنانی کردەکی نییە. پێناسەکە شتێکی دیکەیە: چونکە پزیشکی بیرۆکەیی و پزیشکی کرداری هەر دوو دەکەونە خانەی زانستەوە. واتا بواری بیرۆکەیی هەمان زانستی بنەما و بناغەکانی پزیشکیە و بواری کرداریی شێوازەکانی بەکارهێنانی بنەماکانە.

مەبەستی من لە بەکارهێنانی وشەی "کرداری" لە زانستی پزیشکی پەی بردن بە شێوازەکانی بەکارهێنانی ئەو زانستەیە. بۆ نموونە: سەبارەت بە چارەسەری ئاوسانە (ورم) گەرمەکان، سەرەتا دەبێ مادەکانی گەڕانەوە (گەڕاندنەوە لە تەشەنە و پەرەی نەخۆشی)، فێنككەرەوە و دەرخەر (کشاف) بەکار بهێنین. ئینجا دەرمانی نەرمکار زیاد بکەین بە دەرمانی گەڕانەوە. کاتێك ئاوسانەکە نیشتەوە، دەبێ بە دەرمانە تراوەکان ئاوسانەکە

1. قانون در طب، بەرگی ١، لاپەڕە ٢-٩ (وەرگێڕانی مامۆستا هەژار، چاپی دوازدەهەم، ١٣٩٠)

دابشــۆرین. مەگەر ئەوەیــکە ئاوســانەکە بەهــۆی دەرکردنــی چڵــك و زووخــی ئەنــدامە سەرەکیەکانی لەشەوە بێت. کەواتە زانستی پزیشکی کرداری فێرمان دەکـات کە چـۆن ئەو کارە بکەین. کەوابوو ئەگەر هەر دوو بەشی زانستەکە فێر بووین، دەبین بە خاوەنی زانسـتی بیرۆکەیــی و زانســتی کــرداری پزیشــکی. تەنــانەت ئەگەر لەو بوارەشــدا هــیچ کــارێکی کردەکیمان ئەنجام نەدابێت.

وا باس دەکرێت تەنی مرۆڤەکان سێ دۆخی هەیە: تەندروست، نەخــۆش و دۆخێــك لەو نێوانە. ئەو بۆچوونە تەواو هەڵەیە. بەبۆچوونی من تەنی مرۆڤ تەنیا دوو دۆخــی تەندروســت و نەخۆشی هەیە. چونکە دۆخی نێوان، هەمان نەخۆش بوونە. کەوابوو دۆخی تەندروســت و نەخۆش دروستترە. لە دۆخی تەندروستدا سەرجەم ئەندامەکانی مرۆڤ بەشێوەیەکی ڕاست و دروســت کــار دەکەن، بەڵام لە دۆخــی نەخۆشــیدا تەنــی مــرۆڤ دوور ئەکەوێــتەوە لە تەندروستی. ئیتر باس و لێکۆڵینەوەی زیادەی ناوێ و با پزیشــك لەســەر ئەو باســە نەڕوات. چونکە ئەو باس کردنە زیادەیە هەم بۆ پزیشــکان و هەم ئەوانەی لەو بــوارەدا ئــیش دەکەن هیچ سوودێکی بۆ زانستی پزیشکی نییە. دۆزینەوەی ئەنجامی دروست، بە کەڵــك وەرگــرتن لە چەنەبەچەنێ و لێکۆڵینەوە کردن نەریتی بوارەکانی دیکەی زانستە و دوورە لــە ئامــانجی پزیشکی.

وەك دەزانین ئامانج لە زانستی پزیشــکی ئەوەیە کــە بــزانین تەنــی مــرۆڤ تەندروســتە یــا نەخۆش. کەوابوو پەی بردن و پێناسە کردنــی هۆکارەکــانی تەندروســتی و نەخۆشــی لەلایەن پزیشــکەوە ئەرکێکــی پێویســتە و دەبــێ هۆکــار و کارتێکەریەکــانی تەندروســتی و نەخۆشــی بەچاکی بزانرێت. ئەو هۆکارانە دەتوانن هەم بەرچاو و ڕواڵەتی بن و هەم شاراوە و نهێنــی، یــا ئەوەیکە هەستیان پێ نەکرێــت و دەبــێ لە ڕووی نیشــانەکانیانەوە پەی پــێ ببــرێن. کەوابــوو پێویستە ئەو نیشانانە لە کاتی تەندروستی و نەخۆشیدا لەســەر تەنــی مرۆڤەکــان دەر ئەکەون، بەچاکی بناسرێنەوە.

بەڕای بیرمەندانی زانستی پایە (علوم حقیقی) پێناســە کردنــی هەمــوو شــتێك بەنــدە بە ناسینەوەی ئێمە لە ڕووی سەرچاوکە و هۆکارەکانی ئەو شتە. بە مەرجێــك ئەو ســەرچاوە و هۆکارانە بە دەرەوە بن. ئەگینا دەبێ بەپێی ڕووداو و نیشــانەکانی دەروونــی و شــاراوە پێــی بگەین. هۆکارەکان بریتین لە: مادی، فاعلی، صوری و غایی.

* هۆکارەکــانی مــادی: بــریتیە لەو پێــوەرانە کە دۆخــی تەندروســتی و نەخۆشــی پــێ هەڵسەنگێرێت. نزیکترین پێوەر بۆ ئەو هەڵسەنگاندنە، ئەنــدامەکان یــا کاروبــاری دەروونــی

ئەندامە و پاشان خەڵتەکان و دواجار ئەرکان. خەڵتەکان و ئەرکان (چوار توخمی سەرەکی) لە ئەنجامی ئاوێتەبوون بە دەست دێن. ئەگەرچی دۆخی خەڵت و ڕۆکن دەشگۆڕێت. ئەگەر بەو شێوەیە درێژەی بێت سەرنجام جۆرێك هاوسانی و یەکگرتوویی دێتە ئاراوە. ئەو هاوسانیە بە مەزاج (سروشت) یا شێوە (هیئت: شکل) دەناسرێت. مەزاج بەهۆی گۆڕانی دۆخەکان دروست دەبێت و شێوە لە ئەنجامی تێکەڵاوبوونەکانی دۆخەکان.

* هۆکارەکانی فاعلی: بریتیە لەو هۆکار و کارتێکەریانە کە تەنی مرۆڤ ڕادەگرن یا دەیگۆڕن، وەکوو: هەوا، خۆراك، ئاو، خواردنەوە، ڕشانەوە و فرێدان (پاکسازی: تخلیە)، ڕاگرتن (هێشتنەوە: احتباس)، ژینگە، نشینگە و خانوو، چالاکی و وچانی تەن و دەروون، خەوتن، بێداری، گۆڕانەکانی تەمەن، نێر و مێیی، پیشە، ڕەوشت و شتی دیکە کە تەنی مرۆڤ لەگەڵیان سەروکاری هەیە و لەگەڵ سروشت سازگارە یا ناسازگار.

* هۆکارەکانی بەرچاو (صوری): بریتین لە مەزاجەکان، وزەکان (هێز و وزە) و تەرکیبەکان

* هۆکارەکانی کۆتایی (تمامی: غایی): بریتیە لە کارتێکەریەکان. بۆ پێناسەی کارتێکەریەکان پێویستە هێزەکان و ئەو وزانە کە هێزەکان هەڵدەگرن، بناسینەوە.

ئەوانەی سەرەوە بابەتەکانی پیشەی پزیشکییە کە چۆنیەتی تەندروستی و نەخۆشی تەنی مرۆڤەکان لە ڕووی ئەوانە دەپشکێندرێت. بۆ گەڕان و تویژینەوەی زیاتری ئەو پشکنینانە پێویستە چەندین باس و تەوەری دیکە و پێداویستی و کەرەستەکانی هەر دوو دۆخی تەندروستی و نەخۆشی لەبەرچاو بگرین. وەکوو: دەستنیشانکردنی جۆری خواردن و خواردنەوە، پاکی و پیسی هەوا، ڕاگرتنی هاوسانی لە چالاکی و پشوودان، چارەسەری بەیارمەتی دەرمان و کاری دەست (نەشتەرگەری، برینپێچی، شێلان، پرواندن، کەڵەشاخ، و هتد). سەرجەم ئەو بابەتانە بۆ پزیشك گرینگی خۆیان هەیە.

لە پوختە و پێشەکی باسکراودا بەو دەرەنجامە دەگەین کە بازنەی زانستی پزیشکی سەرجەم بریتیە لە توخمەکان، مەزاجەکان، خەڵتەکان، ئەندامە ساکارەکان، کۆندامەکان، ڕۆحەکان (وزە و هێزەکان)، هێزەکانی سروشتی و حەیوانی و ئینسانی، کارتێکەریەکان، دۆخەکانی تەندروستی و نەخۆشی، بارودۆخی مامناوەندی نێوانیان و هۆکارەکانیان وەکوو: خواردن، خواردنەوە، کەش و هەوا، نشینگە (شار و دێ)، خانوبەرە، ڕشانەوە و فرێدان، ڕاگرتن و هێشتنەوە، پیشە، خووخدە، جموجووڵی دەرەکی و ناوەکی، هێمنی، قۆناغەکانی تەمەن، نێر و مێیی، کاریگەری هۆکارە دەرەکیەکان لەسەر جەستە، هەڵبژاردنی خواردن و خواردنەوە، هەڵمژینی هەوای پاك و گونجاو، بەرنامەی چالاکی و پشوودان، چارەسەری

بەیارمەتی دەرمان یا کاری دەست.

پزیشك بە مەبەستی پاراستنی باری تەندروستی و چارەسەری نەخۆشی دەبێ برێـك لەو بابەتانەی سەرەوە بەگوێرەی زانستی خۆی بزانێ و تێی بگات، هەروەها سەبارەت بە لێزانـی و تێگەیشتنەکانی خۆی باوڕی وابێ ئەو ئەنجام و دەستکەوتانەی لەلایەن یەکێك لە زانایانی زانستی سروشتدا پەسەند و قەبووڵ کـراوە. بـۆ بەشـی دیـکەی بابەتەکـان، پزیشـك دەبـێ پاڵشت بە پیشە و پسپۆڕی خـۆی، ڕا و بۆچـوونێکی بـۆ ئەو دۆخە بەدەسـتەوە بێـت. لەو بوارەدا ئەوەی کە لە ڕیزی بنەماکاندا (اصول) ئەژمـار دەکـرێن ئەرکـی سەرشـانی پزیشـکە شوێنی بکەوێت و ئەنجامی بدات. چونکا بنەماکانی زانست بەشێکی نەگۆڕن و سەرچاوکەی هەموو زانستەکان بەرەو حکمەتی سـەرەتا (حکمـت اولـی) بەرز دەبێـتەوە و ئەو حکـمەتە سەرەتایە بە زانستی "ماوراء الطبیعه" دەناسرێت.

ئەگەر لەو بارەوە کەسێکی کۆلکەپزیشك[1] بۆچوونێکی دیـکەی سـەبارەت بە سـەلماندنی توخمەکان، مەزاجەکان و ئەنجامی ئەوانە کە بابەتێکی زانستی سروشتە هەبێت، لەڕاسـتیدا تووشـی دوو هەڵەی زەق بـووە: یەکەم، هەنـدێ شـتی بە پزیشـکیەوە لکانـدووە کە لەو زانستەدا نییە. دووهەم ئەو کەسە پێی وایە شتێکی دۆزیوەتەوە. لە حاڵێکـدا شـتێکی نـوێی نەگوتووە و نەدۆزیوەتەوە.

ئەرکی پزیشکە لە ڕووی چۆنیەتی یەکێك لـە دۆخەکـان پەی بە هۆکارەکـان ببـات و ئەگەر نەیتوانی بەیارمەتی پشکنینە سەرەتاییەکان، بـارودۆخی حـاڵەت (دۆخ) بە دەسـت بهێنێـت و لە بەهرەی پسپۆڕی و پیشەیی خۆی کەڵك وەربگـرێ، پرسـیار و پەرسـڤەکانی خـوارەوە لەبەرچـاو بگرێ:

ئایا ئەو هۆکارە بەهـۆی توخمەکـانەوە دروسـت بـووە؟ ئەگەر وایە، ئەو تـوخمە چەنـدە کاریگەری هەیە؟ ئەگەر بەهـۆی مەزاج دروسـت بـووە چەنـدی و چـۆنیەتیەکەی کـامەیە؟ ڕەنگە بەهۆی خەڵتەکانەوە بێ کە پێویستە جۆری خەڵت و ڕێژەکەی (چەندی و چـۆنیەتی) دەستنیشان بکرێت. لەوانەیە بەهۆی هێزەکانەوە بێ. لێـرەش دەبـێ ڕێـژەکەی بزانرێـت. لە کۆتاییشدا ڕەنگە بەهۆی ڕۆحەکانەوە بـێ. پێویسـتە لەو حـاڵەتە ڕێـژەکەی دیـاری بکرێـت. مانەوە و گـۆڕانی هەر دۆخێـك کە لەوانەیە بە نـاوی هۆکـار و نیشـانە لەبەرچـاو بگیرێـت،

١. ابن سینا لە دەقی عەرەبی "قانون فی الطب" ئەو کەسانەی بە "مطبب" داناوە و مامۆستا هەژار لە وەرگێڕانەکەی بۆ فارسی، بە "پزشکنما" نووسیوە. دەکرێت لە کوردیدا بە "چەکەپزیشك"، "چەکەحەکیم" و "کۆلکە پزیشك" واتای بکەینەوە.

دیسان پێویستە ڕێژەکەی دیاری بکرێت. هەروەها پزیشك دەبێ ئەندامەکان و دەوری ئەندام بەیارمەتی پشکنین و تێڕوانین پێناسە بکـات و بیناسـێتەوە و ئەوەیـکە پێویسـتە لە بیـری خۆیدا وێنای بکات و هۆکـاری بـۆ بهێنێـتەوە و بیسـەلمێنێت. هەروەهـا دەبـێ بزانـێ کـە نەخۆشیەکە چۆن چارەسەر دەکرێ و تەندروستی چۆن مسۆگەر دەکرێتەوە. پزیشـك دەبـێ لەو هەڵسەنگاندنەدا تەواو وردبـین بێـت و پشـکنینەکانی هەمەلایەنە بـێ، هەروەهـا هـۆی دەرەنجام و سـەلماندنەکانی خـۆی لەسـەر هۆکـارە شـاراوەکان بەوردی و ڕاشـکاوانە شـی بکاتەوە.

[لە خوارەوە دەقی سـادەکراوی بابەتەکـانی ئەرکـان، مەزاج و خەڵـت، کە لە چەنـدین سـەرچاوەی حەکیمـان و تـوێژەرانی سـەردەم وەرگیـراون و بەدڵنیـاییەوە سـەرچاوەی سەرەکیان هەمان دەقی "قانون فی الطب" بووە و لە کتێبی "پێشەکیەك لەسەر ڕووەکناسـی، گیادەرمانی و پزیشکی خۆماڵی کوردەواری" کۆ کراوەتەوە، باسی دەکەین.]

**بنەماکان**

حەکیمان باوڕیان وایە هەموو شتێکی ئەم جیهانە پێکهاتووە لە چوار توخمی: ئاو، ئـاور، با و خاك. ئەڵبەتە مەبەست لەمانە ئەو ماکە ڕواڵەتیەی ئاو، ئاور یا هەوا و خاکی نـاو ژیـنگە نییە. بەڵکوو تەمسیل و وێنایەکە لەو چوار توخمەی سروشت. حەکیمان ئەو چـوار توخمـە[١] بە تەنەکان[٢]، بنەماکان[٣] یا توخمە چوارینەکان[٤] دەناسنەوە.

سووکی و قورسی توخمەکانی سروشت لە دیدی حەکیمانی کۆن:

* **سووکی پەتی:** ئاور نیشانەی سووکی پەتیە و خاوەنی کواڵێتی گەرم و وشکە
* **سووکی ڕێژەیی:** با[٥] نیشانەی سووکی ڕێژەییە و خاوەنی کواڵێتی گەرم و تەڕە
* **قورسی ڕێژەیی:** ئاو نیشانەی قورسی ڕێژەییە و خاوەنی کواڵێتی سارد و تەڕە
* **قورسی پەتی:** خاك نیشانەی قورسی پەتیە و خاوەنی کواڵێتی سارد و وشکە.

کواڵێتی بنەماکانی سروشت لە ڕوانگەی حەکیمانی کۆن:

* **ساردی:** توخمەکانی ئاو و خاك نیشانەی ساردین

---

١. عناصر
٢. اجرام
٣. ارکان
۴. عناصر اربعه
۵. به واتایەکی تر "هەوا"

* **گەرمی:** توخمەکانی ئاور و با نیشانەی گەرمین
* **تەڕی:** توخمەکانی با و ئاو نیشانەی تەڕین
* **وشکی:** توخمەکانی ئاور و خاك نیشانەی وشکین

**سروشت (مەزاج)**

مەزاج وشەیەکی عەرەبیە بە واتای ئاوێتەبوون. لە زانستی پزیشکی کۆندا سروشت یانێ دەرەنجامی تێکەڵبوونی توخمە چوارینەکان. لە بارودۆخێکی ئاساییدا توخمەکان دەتوانن لە ٩ دۆخی جیاوازدا تێکەڵ ببن و ٩ مەزاجی تایبەت دروست بکەن:

١) مامناوەند[1]: مەزاجێکە هەر چوار توخمی ئاو، ئاور، با و خاك بە ڕێژەیەکی یەکسان پێکەوە تێکەڵ بوونە و هاوسانی لە نێوانیاندا هەیە و کواڵێتی هەر چوار توخمەکەی تێدایە.

٢) سارد: مەزاجێکە لە تێکەڵبوونی دوو توخمی ئاو و خاك

٣) گەرم: مەزاجێکە لە تێکەڵبوونی دوو توخمی با و ئاور

٤) تەڕ: مەزاجێکە لە تێکەڵبوونی دوو توخمی با و ئاو

٥) وشك: مەزاجێکە لە تێکەڵبوونی دوو توخمی ئاور و خاك

٦) گەرم و تەڕ: مەزاجێکە لە تێکەڵبوونی ئاور، با و ئاو پێك دێت و توخمی خاکی تێدا نییە. چونکە خاك وشك و ساردە.

٧) گەرم و وشك: مەزاجێکە لە تێکەڵبوونی ئاور، با و خاك پێك دێ و توخمی ئاوی تێدا نییە. چونکە ئاو سارد و تەڕە.

٨) سارد و تەڕ: مەزاجێکە لە تێکەڵبوونی ئاو، با و خاك پێك دێ و توخمی ئاوری تێدا نییە. چونکە ئاور گەرم و وشکە.

٩) سارد و وشك: مەزاجێکە لە تێکەڵبوونی ئاور، ئاو و خاك پێك دێ و توخمی بای تێدا نییە. چونکە با گەرم و تەڕە.

**مەزاجەکانی سەرەوە لە بارودۆخی ناو جەستەی مرۆڤەکاندا (واتا مەزاجی مرۆڤ) دەتوانێت بە شێوازی خوارەوە شیکاری و ڕوون بکرێنەوە:**

١) سروشتی مامناوەند: باری تەڕی، وشکی، ساردی و گەرمەیەکەی مامناوەندە و حاڵەتی سروشتی خۆی هەیە.

---

١. مەزاجی هاوسان یا ئاسایی: مزاج معتدل

٢) سروشتی گەرم: تەڕی و وشکیەکەی مامناوەندە و گەرمی بە سەر ساردیدا زاڵە.

٣) سروشتی سارد: تەڕی و وشکیەکەی مامناوەندە و ساردی بە سەر گەرمیدا زاڵە.

۴) سروشتی وشك: گەرمی و ساردیەکەی مامناوەندە و وشکی بە سەر تەڕیدا زاڵە.

۵) سروشتی تەڕ: گەرمی و ساردیەکەی مامناوەندە و تەڕی بە سەر وشکیدا زاڵە.

۶) مەزاجی گەرم و وشك[١]: گەرمی بە سەر ساردی و وشکی بە سەر تەڕیدا زاڵ بووە، واتا مەزاجی سەفراوی یا زەرداویە.

٧) سروشتی گەرم و تەڕ[٢]: گەرمی بە سەر ساردی و تەڕی بە سەر وشکیدا زاڵ بووە، واتا مەزاجی خوێنیە.

٨) سروشتی سارد و تەڕ[٣]: ساردی بە سەر گەرمی و تەڕی بە سەر وشکیدا زاڵ بووە، واتا مەزاجی بەڵغەمیە.

٩) سروشتی سارد و وشك[٤]: ساردی بە سەر گەرمی و وشکی بە سەر تەڕیدا زاڵ بووە، واتا مەزاجی سەوداویە.

مرۆڤ هەمیشە بەهۆی کاریگەریەکانی مەزاجی دایك و باوکی، و هەروەها کاردانەوەکانی قۆناغەکانی ناوسکی دایکی بە مەزاجێکی خۆماك[٥] یا سروشتی یا ژێنێتیك[٦] یا کێوی[٧] لەدایك دەبێت، بەڵام ئەو مەزاجە خۆماکی و سروشتیە لە ماوەی تەمەنیدا بەردەوام دەکەوێتە بەر کاریگەریەکانی ژینگەیی، خۆراك و پلەکانی تەمەنیەوە. کەواتە هەر جۆرە هەوڵێك بۆ گۆڕانکاری و ترازانی ئەو مەزاجە مرۆڤ بەرەو نەخۆشی دەبات. حەکیمی دڵسۆز هەوڵی ئەوەیە مەزاجی ئەو نەخۆشە بگەڕێنێتەوە سەر باری سروشتی و خۆماکیەکەی خۆی. ئەو مەزاجە خۆماکیە نەگۆڕە و لە ئەنجامی ڕێژەی خەڵتە چوارینەکانی (زەرداو، خوێن، بەڵغەم و سەودا) لە جەستەدا دروست دەبێت. واتا ئەگەر مرۆڤ بەهۆی شتێکەوە مەزاجی خۆماکیەکەی لە باری هاوسانی خۆی ترازا و چووە سەر مەزاجێکی دیکە، ئەو مەزاجە

---

١ مەزاجی زەرداوی: مزاج صفراوی

٢ مەزاجی خوێنی: مزاج دموی

٣. سروشتی بەڵغەمی: مزاج بلغمی

٤. سروشتی سەوداوی: مزاج سوداوی

۵. ذاتی

۶. وراثی

٧. جبلی

ناتوانێ جێگیر بێت چونکە جێگیر بوونی مەزاجی تازە واتا سەرهەڵدانی نەخۆشـی. هـونەری حەکیم ئەوەیە بە ئاسانترین و ساکارترین شێوە مەزاجی نەخۆش ڕێك بکـاتەوە و بیخـاتەوە سـەر مەزاجـی خۆمـاك و سروشـتی خـۆی. مـرۆڤ لە سـەرەتای لەدایکبـوونیەوە بەردەوام دەکەوێتە ژێر کاریگەری و کاردانەوەی بارودۆخی ژینگەیی جیاواز وەکوو قۆناغەکـانی ژیـان (منداڵی، مێرمنداڵی، جوانی، پێش پیری و پیری)، خواردن، کەش و هەوای ژینگە، پیشـە، نەخۆشــی و هتــد. کەواتە مـرۆڤ بەهـۆی ئەو هۆکـارانە بەردەوام سروشـتی خۆمـاکی لە هەڵکشــان و داکشــانە و لە دەوروبەری مەزاجــی خۆمـاکی گۆڕانکـاری بە سـەریدا دێـت. هەمیشە حەکیمان تێبینی سەرەکیان ئەوەیە کە ڕێژەی دوورکەوتنەوە لە خـاڵی سروشـتی خۆماکی زۆرتر نەبێت تا وەکوو نەخۆشی نەیتە گـۆڕێ. مـرۆڤ هەرچـی لە خـاڵی مەزاجـی خۆماکی زیاتر دوور بکەوێتەوە تەشەنە کردن و گرانبوونی نەخۆشیەکە زۆرترە.

**بەپێی ڕوانگە و بۆچوونی حەکیمانی کۆن هەمـوو بـوونەوەرانی مـادی و مەعنەوی ئەم دنیـایە مەزاج و سروشتی تـایبەت بە خۆیان هەیە:**

١) مەزاجی کات: شەو لەچاو ڕۆژ سارد و تەڕتـرە، بەهـار گەرم و تەڕە، هـاوین گەرم و وشکە، پاییز سارد و وشکە، زستان سارد و تەڕە.

٢) مەزاجی شوێن: خەڵکی ئەورووپا چونکە زۆرتر سەر بە یاسا و سیاسـەت و ئـابوورین مەزاجـی سـاردیان هەیە، بەڵام خەڵکـی ئاسـیا بەتـایبەت ڕۆژهەڵاتـی نـاوین چـونکە تـا ئەندازەیەك یاسابەزێن و هەستی شێعر و ئەوین و عێرفانیان هەیە خاوەنی مەزاجی گەرمن.

٣) مەزاجی ڕوەك: گەرم و وشك (خورما و گوێز)، گەرم و تەڕ (هەرمێ و کـاڵەك)، سـارد و وشك (هەڵووژەی سەوز و هەناری ترش)، سارد و تەڕ (شووتی و خەیار).

٤) مەزاجی ئاژەڵ: گەرم و وشك (گۆشتی وشتر)، سارد و وشك (گۆشـتی مانگـا و گـا)، گەرم و تەڕ (گۆشتی مەڕ)، سارد و تەڕ (گۆشتی ماسی)

٥) مەزاجی ژن و پیاو: ژنان لەچاو پیاوان مەزاجیان سارد و تەڕترە.

٦) مەزاجـی تەمەن: منـداڵ (گەرم و تەڕ)، بەڵام مێرمنـداڵ و گەنجـان هەر بە هەمـان ڕێژە کە گەرمە، ڕێژەی تەڕیەکەی کەمترە. لە تەمەنی پیران و بەساڵاچوان مەزاجی سارد و وشك بەڵام لەگەڵ زۆربوونی تەمەن گەرما و تەڕی جەستەی پیران کەم دەبێتەوە.

٧) مەزاجی بوونەوەرانی بێ گیان: مەزاجی کاوڵ گەرمە و مەزاجی گەچ ساردە.

٨)

**بەپێی ڕوانگە و بۆچوونی حەکیمانی کۆن هەموو بـابەتە مـادی و مەعنەویەکـانی ئەو دنیـایە**

**مەزاج و سروشتی تایبەت بە خۆیان هەیە:**

١) بینین و چاولێکردن: مەزاجی ڕەنگی شین و سەوز مامناوەندییە (مەزاجی زۆرتر مەیلەو گەرم)، ڕەنگی زەرد و سوور مەزاجی گەرم، و ڕەنگی سپی و ڕەش مەزاجی ساردە. لە زانستی تازەدا بۆ ڕەنگەکان باس لە ڕنگی سارد و گەرم دەکرێ.

٢) بیستن و گوێگرتن: وشە و قسەی خۆشەویستی و هیوامەند گەرمی دەبەخشێ، و جنێو و وشەی ناخۆش مرۆڤ دڵسارد دەکەنەوە، واتا مەزاجی سارد و گەرمیان هەیە.

٣) بۆن و بەرامە: بۆنی شتێکی نەرم و سووتێنەر و شیرین و بۆنخۆش مەزاجی گەرمی هەیە، بەڵام بۆنی چڵك و کەڕوو، ترشاو و هەندێ ماکی بۆنخۆش وەك کافوور مەزاجی ساردی هەیە.

٤) ڕەوشت و هەڵسوکەوت: ڕق و ترس کە ڕەوشتی ساردن و زۆرتر پێکەوە دەبینرێن و ئازایەتی و دڵفراوانی پێکەوەن و مەزاجی گەرمیان هەیە.

٥) دەست پێوەدان: جلی خوری کە پێستی جەستەی وێ ئەکەوێت مەزاجی مرۆڤ گەرم دەکات، بەڵام جلی پەموویینە فێنك و ساردە.

٦) خواردن و خواردنەوە: تام و چێژە گەرمەکان بە ڕیزەوە تیژی، تاڵی، سوێری و شیرینی (تامی شیرینی زۆر بە مەزاجی مامناوەندەوە نزیکە) و چێژە ساردەکان بە ڕیزەوە مێخۆش، تفت و گرس (تامی قابض)[١]، ترش و بێتام. چەوری تامێکی مامناوەندی هەیە.

**بە پێی ڕوانگە و ڕای حەکیمانی کۆن مەزاجی مرۆڤەکان دابەش دەبێت بە:**

١) کەسانی خوێنی مەزاج[٢]: مەزاجی گەرم و تەڕ، دەموچاوی سوور و پڕ خوێن، قورسی و گرانی لە ئەندامەکان بەتایبەت لە سەر و مێشك، تەپەڵۆس و تەمبەڵ، خەوتنی زیاد، زۆربڵێ (فرەوێژ)، باڵایان بەرەو کورتییە، دەست و پەلیان کراوە و فشۆڵە، زۆرتر خۆش ڕەوشت، بەزم خۆش و دەم بە پێکەنین، هۆی شادی خەڵکین، ئازا و بەجەرگ، تامی زاریان شیرینە، پێست و زمان و چاویان سوورە، خوێنبەربوون لە پووك و لووتیان باوە، شوێنی کەڵەشاخ و خوێنگرتنیان دەبێتە برین. ئەڵبەت ئەو نیشانانە لە وەرزی بەهاردا زۆرتر خۆ دەر ئەخەن.

---

١. وەك تامی توێکڵی هەنار و بەهێ کاڵ یا هەرمێ نەگەیشتوو. ئەم چێژە لە فارسیدا پێی دەڵێن (گس) و بە کوردی تفت، گرس، کرچ و کاڵکرچ

٢. دموی مزاج: خوێن لەم کەسانەدا زاڵتر و دیارترە

٢) کەسانی بەڵغەمی مەزاج[1]: مەزاجی سارد و تەڕ، ڕەنگی دەموچاویان سپییە، پێست سارد و نەرم و ڕوون، زۆر جار بەهۆی تەڕی زۆرەوە پێستی ژێرچاو و بن هەنگڵیان چرچ و لۆچ دەبێ، تف و گلۆپزی ناودەمیان زۆرە، کەمتر تینوویان دەبێ، جنسی گۆشتیان نەرمە، تەمبەڵ و تەپەلۆسن، قورقێنەی ترش ئەدەنەوە، گەدەیان زوو زوو ترش دەکات، جموجووڵیان خاوە، پشوودرێژ و خۆڕاگرن، بەشێنەیی قسە دەکەن، لە ڕێگە ڕۆیشتندا بە جێ دەمێنن و زوو ماندوو دەبن، ماست و دۆ و خۆراکە ساردەکانی دیکە دوژمنی ئەمانەیە، خەوی خۆشیان هەیە، بەخاوی تێ دەگەن و فێر دەبن، توانای مێشك و یادگەیان دادەبەزێت، بەیانیانە ڕەنگی میزیان ڕوون و بەرەو ئاوییە، سەر زمانیان زۆر جار سپی دەبێتەوە. ئەو نیشانانە لە وەرزی زستاندا زۆرتر خۆیان نیشان ئەدەن و نەخۆشی ئەو کەسانە لەو وەرزەدا زۆرتر باوە.

٣) کەسانی زەرداوی مەزاج[2]: مەزاجی گەرم و وشك، ڕوخسار و سپێنەی چاویان کەمێك زەردە، ناو دەم و لووتیان وشکە، زمانیان زوور و وشك و تاڵە، زوو زوو تینوویان دەبێ، ئارەزووی خواردنیان کەمە، بەژن و باڵای کز و لاوازیان هەیە، زوو فێر دەبن و تێدەگەن، بە ئاسانی ناخڵەتن و فریو ناخۆن، خەویان کەمە و لە کاتی نووستندا وریان، زوو هەڵدەچن و تووڕە دەبن، پێستیان گەرم و وشکە، دەور چاویان بەهۆی تەڕایی و چەوری کەمەوە چاڵ و قووڵ دەبێ، خورووی پێستیان هەیە، گوێیان دەزرینگێتەوە، ژانەسەریان زۆرە بە تایبەت لە هەوای گەرم و کاتی تووڕەبووندا، ئەگەر دەستیان پێوە ئەدەیت پێستیان گەرمە و حەز ئەکەن بە هەوای فێنك، یەکەم میزی بەیانیانیان پڕڕەنگ و هەندێ جار کزانەوەی لەگەڵە، ڕێژەی گەرمی و وشکییان لە وەرزی هاویندا زۆر دەبێ، لە تەمەنی گەنجیدا زۆرترین کێشە و تێکچوونی تەندروستیان بۆ پێش دێت بەتایبەت لە هاویندا.

٤) کەسانی سەوداوی مەزاج[3]: مەزاجی سارد و وشك، ڕەشتاڵە، پێستیان وشکە و نەرم و نۆڵ نییە، خوێنی کەڵەشاخیان ڕەش و خەستە، زۆر دەچنە ناو بیر و خەیاڵ و هەوای بابەت و کێشەی دەوروبەریان، خەوی هەڵیت و پەڵیت زۆر دەبینن، بەهۆی خێرایی تێفکرینەوە ئەم دەستەیە زۆرترین شاعێر و سیاسەتمەداریان لێ هەڵدەکەوێت، ئەگەر شێوازی خواردن و هەڵسوکەوتیان چاك نەکرێت زۆرترین کێشەی دەروونیان بۆ پێش دێت،

١. بلغم مزاج
٢. صفراوی مزاج
٣. سودا مزاج

خەمۆکی و دوورەپەرێزی و تێکەڵاو نەبوون لەگەڵ خەڵکدا ڕەوشتی ئەمانەیە، کزانەوەی سەر گەدە و سەردڵ، جەمام کەوتن و داگیرانی ماسوولکەکانی پشت پووزی پێ، داگیرانی و ژانی ئەندامی قوڕگ بە شێوەی یەك بازنە، حەز و ئارەزووی درۆینەیان بۆ خواردن هەیە، کوڵك و موو و خاڵی ڕەش لە سەر پێستیان دەرئەکەوێت. ئەمانە لە وەرزی بەهاردا مەزاج و تەندروستیان باشترە، بەڵام پاییزانە نەخۆشیەکانیان زۆرتر سەر هەڵەدات.

**بە پێی ڕوانگە و بۆچوونی حەکیمانی کۆن هەموو ئەندامەکانی لەشی مرۆڤ مەزاج و سروشتی تایبەت بە خۆیان هەیە:**

١) مەزاجی گەرم: (بەڕیزەوە) دڵ، خوێن، جەرگ، گۆشت و ماسوولکە، سپڵ، گورچیلە، دەمارە ترپەدارەکان (سوورەدەمار: دەماری خوێنبەر) و دەمارە بێ ترپەکان (ڕەشەدەمار: دەماری خوێنهێن)

٢) مەزاجی سارد: (بەڕیزەوە) بەڵغەم، پی و بەز، چەوری، ئێسك، کرکرۆژکە، دەماری عەسەب، مۆرخەوانە[1]، مێشك و پێست

٣) مەزاجی تەڕ: (بەڕیزەوە) بەڵغەم، خوێن، چەوری، پی و بەز، مێشك، مۆرخەوانە، گۆشت، مەمك، گون، سی و ناوپەنچك، جەرگ، سپڵ، گورچیلە، ماسوولکە و پێست

٤) مەزاجی گەرم: (بەڕیزەوە) موو، ئێسك، کرکرۆژکە، سوورەدەمار، ڕەشەدەمار، عەسەبەکانی جوولە[2]، دڵ، عەسەبی هەست[3] و پێست

**بە پێی دیدی حەکیمانی کۆن سەرجەم بابەتە ڕواڵەتی و دەروونیەکان مەزاجی تایبەتی دەبەخشن بە مرۆڤەکان:**

١) ئەو شتانەی خاوەنی مەزاجی گەرمی دەبەخشن: خواردن بە ئەندازەی پێویست و مامناوەند، جووڵە و وەرزشی مامناوەند، شێلان و دەستماڵینی مامناوەندی جەستە، بەکارهێنانی کەڵەشاخی وشك، خۆراك و دەرمانی گەرم مەزاج، حەمام کردنی مامناوەند و گەرماوی شیلەوگەرم، مەڵهەم و نیمەنمەك و گیراوەی گەرم، خەو و خەبەربوون بە ئەندازە و ڕێژەی گونجاو، تووڕەبوون و هەڵچوون، خەم و پەژارەیەك کە زۆر نەبێت، شادی و خۆشحاڵی بە ئەندازەی مامناوەند، هەندێ لە چڵك و کێمەکان، کرانەوەی هەناو و دەروونی جەستە، گووشین و ترەنجاندی پێستی جەستە

١. دەماری عەسەبی نوخاع لە ناو بربرەی پشت

٢. عصب حرکتی

٣. عصب حسی

٢) ئەو شتانەی مەزاجی ساردی دەبەخشن: جموجووڵی زۆر (بەهۆی کەمبوونەوەی گەرما و تینی خۆماکی دەروونی و غەریزی)، ئارامگرتن و هێمنی زۆر (بەهۆی کوژانەوە و دامرکاندنی تین و گەرمای خۆماکی دەروونی و غەریزی)، زۆر یا کەم خواردن، خۆراك و دەرمانێك کە مەزاجی ساردی هەیە، زێدەڕەوی لە وەرگرتن و بەرکەوتنی گەرمابەخشەکان وەکوو هەوای گەرم، مەڵهەمە گەرمەکان و ئاوی گەرمی حەمام، زێدەڕەوی لە بابەتی ڕاگرتنی[1] مەواد لە ناو جەستەدا، پاکسازی[2] لە ئەندازەی زۆر، ڕاگیرانی میز، توند بەستن و جەڕاندنی ئەندامەکان، خەم و ترس و شادی و خۆشی لە ئەندازەی زۆر

٣) ئەو شتانەی مەزاجی تەڕی دەبەخشن: ئارامگرتن و هێمنی، نووستن، مانەوەی ئەو مەوادانەی کە پێویستە پاکسازی بکرێن و لەش فڕەیان بدا، پاکسازی و فڕێدانی خەڵتی وشك، زۆر خواردن، خۆراك و دەرمانێك کە مەزاجی تەڕی هەیە، وەرگرتن و بەرکەوتنی تەڕیبەخشەکان وەکوو حەمام کردن بە سکی تێر، وەرگرتن و بەرکەوتنی ساردیبەخشەکان کە تەڕی کۆ دەکەنەوە، وەرگرتن و بەرکەوتنی ئەو شتانەی کە ڕێژەی گەرمی یەکسان دەبەخشن و تەڕی وە جووڵە ئەخەنەوە.

٤) ئەو شتانەی مەزاجی وشکی دەبەخشن: جموجووڵ و وەرزش، شەو نەنووستن و بەخەبەربوون، پاکسازی (تخلیە) زۆر، نزیکی و سەرجێیی، کەم خواردن، بەکارهێنانی خۆراك و دەرمانی وشك، هەموو جۆرە چالاکی دەروونی کە ئەندازەی زیاد بێت، خۆراك و دەرمانە قەبز و گرسەکان، شتی زۆر گەرم، شۆردن و حەمام کردنی زۆر

**تینی خۆماکی دەروون**[3]: هێزی سەرەکی ژیانە کە لە سەرەتای ژیانەوە لە مرۆڤدا هەیە و وردە وردە کەم دەبێتەوە تا ئەوەیکە لە کاتی مەرگدا بە تەواوی نامێنێت. تینی خۆماکی هەمان سووتەمەنی چرای ژیانی مرۆڤە.

**خەڵت**

مرۆڤ کاتێ خۆراکێك بەکار دەهێنێت و دەیخوات پاش جوین و قووتدان، خۆراکی وردکراو

---

١. ئەم ڕاگرتنە لە عەرەبی و فارسیدا پێی دەڵێن (احتباس) واتا: ڕاگرتن و پاکسازی نەکردنی مەوادی زیادەی لەش کە بەهۆی ئەم مەوادانەوە گەرمای خۆماکی دەروونی کۆ دەبێتەوە و ڕادەوەستێت

٢. پاکسازی لە عەرەبی و فارسی کۆن بە (استفراغ) ناوی لێ دەهێنن، واتا دەرکردنی ئەو مەوادە کە پێویستە بە شێوەی سروشتی لە جەستە بکرێتە دەرەوە، وەکوو: عارەق، خۆراکی ژەهراوی بوونی ناو گەدە، ئاوی جنسی و سێکسی، چڵم، کێم و زووخ، چڵك، کەمێلە، پیسایی و میز

٣. گەرمای غەریزی

دەچێتە ناو ئەندامی گەدە و پێش گەدەیەوە. بۆیە خانە و شانەی ئەندامەکانی جەستە پێویستیانە کە ماکی پێویستی ناو ئەو خۆراکە وردکراوە وەربگرن و وزەی ژیان و زیندوو مانەوەی خۆیان دابین بکەن. کەواتە خۆراکی وردکراو پێویستە چەند قۆناغ ببڕێت تا وەکوو بگات بە ئاستێك کە خۆراکی وزەی ناو خانە و شانەی ئەندامەکان مسۆگەر بێ. سەرەتا خۆراکی وردکراو بە یارمەتی تف و لیکی ناودەم تەڕ دەبێت و بە بۆری خۆراکدا دەچێتە ناو گەدەوە. لە ناو گەدە دووبارە هێندێ تراوی پێویست وەکوو لینجاوی گەدە و ئەنزیمەکانی دیوارەی گەدەی پێ زیاد دەبێت و بە یارمەتی جووڵانەوەی ماسوولکەکانی گەدە و جووڵەی خۆماکی گەدە خۆراکی ناو گەدە بەردەوام دیواودیوی پێ دەکرێت و چەشنی هەویر و پاشان شیلەیەکی تەڕی لێ دێت. لە قۆناغی سەرەتادا خۆراکی هەرسکراو چەشنی هەویر و شیلەی خەستی (ماکی کیمووس)[1] لێ دێت کە ئەم هەرسە پێی دەڵێن هەرسی یەکەم[2]، دواتر بە هێندێ ئالوگۆڕی ترەوە دەچێتە ناو ڕیخۆڵەکان و لەوێ شیلەیەکی زۆر تراو ڕادەستی دەمارەکانی ماساریقای[3] جەرگ دەکرێت کە لێرە پێی دەڵێن هەرسی ئامادە[4]. ماکی هەرسی ئامادە کە شیلەیەکی تراوە پێی دەڵێن خەڵت[5]. بە بۆچوونی حەکیمان ئەگەر ئەم تراوە ئامادەیە بکرێتە ناو کەرەستەی بۆری تاقیگە و ماوەیەك دایبنێیت تا بنیشێت، دەبێت بە تراوێکی چوار نهۆمی جیاوازەوە کە ماك و تراوی هەر نهۆم پێی دەڵێن خەڵت.

**ئەگەر ماک و تراوی بۆری (لوولە) تاقیگەکە شیکاری بکەین بەم شێوەیە دەتوانین تێی بگەین:**

* خەڵتی سەودا: بنەوەی بۆریەکە تەنێکی ڕەش و قورس دەبینرێت کە ڕێژەکەی زۆر کەمە و چۆنیەتی و کواڵێتی سارد و وشکە.
* خەڵتی بەڵغەم: پاش خەڵتی سەودا، تراوێکی خەستترە و کواڵێتی سارد و تەڕە.
* خەڵتی خوێن: پاش خەڵتی بەڵغەم، تراوێکی نیوەخەستە و کواڵێتی گەرم و تەڕی

١. تراوێکی نیوەخەستە بە شێوەی هەویر. لە زانستی پزیشکی کۆندا بەم کردارە دەڵێن هەرسی گەدە (طبخ معدی) یا هەرسی یەکەم (طبخ اول)

٢. طبخ اول

٣. ماساریقا یا ماساریقین وشەیەکی یۆنانیە، بەو ڕەگ و دەمارانە دەگوترێت کە بەسراونەتەوە بە بەشی چاڵایی جەرگەوە

٤. طبخ ثانوی

٥. کۆی تراو و ماکی ئەم چوار نهۆمە لە زانستی پزیشکی کۆندا پێی دەڵێن (اخلاط)

هەیە.

* خەڵتی زەرداو: پاش خەڵتی خوێن کەوتووە و سەرووترین خەڵتە. تراوێکی ڕوون و زەردە و کواڵێتی گەرم و وشکی هەیە.

حەکیمانی کۆن چوار خەڵتی سەودا، بەڵغەم، خوێن و زەرداویان بە خەڵتە چوارینەکان[1] داناوە. ماك و جنسی ئەو خۆراکە کە مرۆڤ دەیخوات و قۆناغەکانی هەرس و ئامادە کردن دەپێویێت تا دەگاتە ئەندامی جەرگ، ماکی خەڵت دەر ئەکەوێت. واتا خۆراکێك کە تایبەتمەندی و جنس و کواڵێتی دروست بوونی خەڵتی بەڵغەمی هەبێت ئیدی نابێ بە خەڵتی سەودا یا خوێن و زەرداو، هەروەتر بە پێچەوانە. خەڵتی سەودا و بەڵغەم سەنگین و ساردن و خەڵتی خوێن و زەرداو سووك و گەرمە. لە ئەنجامی کار و کاردانەوەی ئەو چوار خەڵتە، دۆخێکی مامناوەند لە نێوان گەرمی، ساردی، تەڕی و وشکی دێتە ئاراوە کە پێی دەگوترێ: مەزاج یا سروشت.

**ئەندام:**[2] مەبەست هەمان ئەندامەکانی جەستەیە وەکوو دڵ، مێشك، جەرگ، گورچیلە، پێ، دەست، دەمار، گەدە، ددان و هتد.

**ڕەوانەکان:**[3] حەکیمان دەڵێن مەبەست لە ئەرواح ئەو ڕۆحە نادیار و ناسراوە نییە بەڵکوو ئەو ڕۆحە تەنێکی ڕەوان و ڕوونە کە پاش قۆناغی هەرسی خەڵتەکان (بخار اخلاط)، لە کۆتاییدا دەبێت بە ماکێکی زۆر ڕوون و ڕەوان کە هەمان هێزی جەستەیە و لەشی مرۆڤی پێ دەجووڵێت.

**هێز:**[4] ڕێچکەی هەرسی خۆراك هەرچی دەچێتە پێشەوە ماکی بەدەستهاتوو ڕوونتر و ڕەوانتر دەبێ. لە قۆناغی کۆتاییدا دەبێتە ماکێکی هەڵم. لە کۆتاخاڵدا هەڵمەکە نابینرێ و

---

١. اخلاط اربعه

٢. عضو

٣. ارواح: باشترین هەمبەری کوردی بۆ واتای ڕۆح لە پزیشکی کۆن وشەی ڕەوانە. چونکە لە زانستی پزیشکی کۆن روح واتایەکی جیاوازتری لە واتای ڕۆحی ئاسایی و ناسراو هەیە. لە ئەدەبیاتی فارسی و کوردیدا کاتێ باس لە هێزێك لە جنسی گیانی مرۆڤ دەکرێت واتای مادی هەیە و مەبەست لە ڕۆح نییە، وشەی ڕەوان بەکار دەهێنن. تەنانەت لە فارسیدا بۆ زانستی دەروونناسی، وشەی ڕەوانناسی بەکار دەبرێت. لێرەشدا مەبەست لە ڕۆحی ئاسایی نییە بەڵکوو بوونێکە تایبەتمەندی هاوبەشی ڕۆحی ئاسایی و مادەی هەیە. هێزەکانی جەستەی مرۆڤیش هەمان تەنی نادیارن کە نە مادەی پەتین و نە ڕۆحی نادیار.

٤. قوه

تەنیا هەستی پێ دەکرێت و لەوێ بە هێز دەناسرێ. ئەگەر هێز نەبێت کردار و کردەوەی لەش ئەنجام نابێت و بە پێچەوانەیشەوە ئەگەر کردەوە نەبێت سەرچاوەی هێز مسۆگەر نابێت. هێزەکان سەرچاوەی سەرەکی جووڵە و کردارەکانی هزر و هەست و دەروونە. ماکی هێز لە کۆتاییدا دابەش دەبێت بە سێ لقی جیاوازەوە واتا کۆمەڵێك هێز بۆ جووڵە و کردارەکانی جەستە. ئەو هیزە، وزە دەبەخشێ بە ئەندامە سەرەکیەکان[1] بۆ ئەنجامدانی کارەکانیان.

**هێزە سەرەکیەکانی مرۆڤ**

١. **هێزی سروشتی**[2]: جەرگ و سیپەلاك سەرچاوەی سەرەکی ئەو هێزەیە[3]. بۆ کاروباری ئاسایی جەستە و هەروەها دروست کردن و بەدنیاهێنانی منداڵی خواردنی پێویستی ئەو هێزەیە. ئەرکەکانی سەرەکی هێزی سروشتی مرۆڤ: یەکەم دابین کردنی خۆراك بۆ زیندووبوونی ئەندامەکان. ناوەندی ئەو کارە جەرگە و بە یارمەتی دەمارەکان ئەو مەوادە بڵاو دەبێتەوە. دووهەم جیاکردنەوە و وەرگرتنی ماکی تۆواوکی[4] پیاو لە هەموو خەڵتەکانی لەش، پاشان ئامادەکردن و پوختە کردنی ئەو مەوادە بە بۆ تێکەڵبوون لەگەڵ هێلکەی[5] ژن. بەیارمەتی هەندێ دەماری تایبەت لە ئەندامی جەرگ کاری وەرگرتن و جیاکردنەوەی تۆواوك ئەنجام دەبێ و ڕادەستی گونی پیاو دەکرێ.

**تێبینی**: سەرچاوەکانی زانستی پزیشکی کۆن زۆر بە ڕوونی ئاماژەیان بە سەرچاوەی هێز و ماکی ناو تۆوی ژنانیان نەکردووە و زۆرتر بابەتەکە چڕتر کراوەتەوە سەر ئاوی پیاوان.

٢. **هێزی حەیوانی**[6]: دڵ[7]، سەرچاوەی سەرەکی ئەو هێزەیە. بە یارمەتی دڵ و هێزی حەیوانی، ماکی هێزەکانی سروشتی و مرۆڤی بۆ ئەندامە سەرەکیەکان وەردەگیردرێت تا ببێ بە سەرچاوەی سەرەکی. بە واتایەکی تر بە یارمەتی هێزی حەیوانی کردار و واتای ژیان خۆی نیشان ئەدات. کەواتە دەمارە خوێنبەرەکانی لەش ئەو هێزە بڵاو دەکەنەوە بە

١. عضو رئیسیە
٢. قوە طبیعی
٣. کبد: لە کوردیدا بەشی خورماییەکەی جەرگە و سپیەکەی سیپەلاکە
۴. منی
۵. تخم
۶. قوە حیوانی
٧. قلب

هەموو ئەندامەکانی لەش. لە ئەنجامی کاری هێزی حەیوانیدا ڕەوانی هەڵمی[1] تێکەڵاوی ماکی ئەندامی دڵ دەبێت و هێزی حەیوانی بڵاو دەکاتەوە بە هەموو ئەندامەکانی لەشدا. واتە ڕەوان لە ئەندامی دڵ دەبێت بە ماکی هێزی حەیوانی و سەرچاوەی وزەی حەیوانی بۆ هەموو ئەندامەکانی جەستە. ئەندامی دڵ خاوەنی مەزاجی گەرمە و ماکی ڕەوانی هەڵمی لەو ئەندامە مەزاجی گەرمی دڵ دەگرێت، بەڵام ماکی ئەو هێزە دەگوازرێتەوە بۆ ئەندامەکانی دیکە و بەپێی ئەندامەکانی جەستە مەزاجەکەی دەگۆڕێت.

کەواتە خاڵی گرینگ لە ئەولەویەتی ئەندامی دڵ، مسۆگەر کردنی سەرچاوەی دوو هێزی دیکە لە ئەندامەکانی جەرگ و مێشکی مرۆڤ. بۆ نموونە گریمان لە ئەندامەکانی چاو و گوێچکە هەم خۆراکی پێویست هەیە بۆ هێزی سروشتی و هەم دەرکردنی فەرمانی بینین و بیستن، بەڵام خاڵە گرینگەکە لێرەدایە کە تا وەکوو ماکی هێزی حەیوانی لە سەر ڕەوانی هەڵمی سوار نەبێت و نەچێتە ناو ئەندامەکانی گوێچکە و چاو و هەروەها سروشتی ئەو دوو ئەندامە وەرنەگرێت، کرداری بینینی چاو و بیستنی گوێ دەرناکەوێت. بۆیە ئەگەر هێزی ئینسانی لە ئەندامێك نەمێنێت تا وەکوو ئەو کاتەی هێزی حەیوانی لە ئەندامی دڵدا هەیە ئەو ئەندامە زیندووە (وەکوو ئیفلیج بوونی ئەندامێك). کەواتە کاتێ هەوڵ ئەدرێت کە هێزی مرۆیی بگەڕێندرێتەوە بۆ ئەندامە ئیفلیجەکە، تا وەکوو ئەو کاتەی ئەو ئەندامە هێزی حەیوانی تیا ماوە هەوڵدان ڕێگەپێدراو و دەکرێ، بەڵام کاتێ هێزی حەیوانی تیا نەمێنێ هەوڵدان کارێکی نەگونجاو و نەشیاوە. چونکە ئەو ئەندامە مردووە. لە زانستی پزیشکی سەردەمدا کاتێ ئەندامێ تووشی نەخۆشی قانقاریا[2] دەبێت پزیشك نەشتەرگەری دەکات و ئەو ئەندامە دەبڕێتەوە، بەڵام لە پزیشکی کۆن حەکیم کۆتا هیوای چارەسەر کردنی لە دەست نادات و هەوڵی خۆی ئەخاتە گەڕ تا هێزی مرۆیی بگەڕێتەوە و نەیبڕێتەوە.

٣. **هێزی هەناوی**[3] **یا هێزی مرۆیی (ئینسانی)**[4]: مێشك[1]، سەرچاوەی سەرەکی ئەو هێزەیە.

---

١. روح بخاری

٢. قانقاریا (Clostridium perfringens): ڕەشبوونەوەی بەشێکی ماسوولکە و ئێسك کە هۆکارەکەی ئەوەیە کە خوێنی ناو دەمارەکانی ئەم بەشە تێکەڵاوی هۆکاری نەخۆشیەکە دەبێت و دەمارەکە بەرەو مردن و گەندەڵی دەبات و ڕەش و شین دەبێتەوە و چڵك و زووخی لێ دێتە دەرەوە و بۆگەند دەکات. ئەم نەخۆشیە بەهۆی بەکتریای (Clostridium perfringens) دروست دەبێت.

٣. قوه نفسانی

۴. قوه انسانی

٨. شامه: حس بویایی

٩. حاسه الذوق: حس چشایی

ئەرکی هەست پێ کردن و جووڵانەوەی جەستە بە ئەستۆی هێزی مرۆیی یا هەمان هێزی هەناوییە. ناوەندی ئەو هێزە ئەندامی مێشکە و بە یارمەتی دەمارەکانی عەسەب کە لە مێشك و نۆخاع سەرچاوە دەگرن، ئەرك و ڕاسپاردەکانی ئەو هێزە ئەنجام دەبێت. ئەو هێزە دابەش دەبێ بە سەر دوو هەستی گرینگی: **هەستی ڕواڵەتی**[٢] و **هەستی نهێنی**[٣]

* هەستە ڕواڵەتیەکان بریتین لە **بینایی**[٤] (هەستی تایبەتی بۆ بینین لە ئەندامی چاو)، (**بیسایی**)[٥] هەستی تایبەتی بۆ بیستن لە ئەندامی گوێچکە، (**بۆیایی**)[٨] هەستی تایبەتی بۆ بۆن کردن لە ئەندامی لووت، (**چێژایی**)[٩] هەستی تایبەتی بۆ چێژتن لە ئەندامی زمان، (**ساویایی**)[١٠] هەستی تایبەتی بۆ ساوین و دەست پێدا هێنان لە پێست

* هەستە نهێنیەکان بریتین لە (**هەستی هاوبەش**)[١١] هەستێکە لە پێشدا هەموو شتە بەرهەستەکان[١٢] دەچنە خانەی ئەو و هەموویان کۆ دەکاتەوە و پاشان دەیانگەیێنێتە هەستە نهێنیەکانی دیکە، (**هەستی وێنا و خەیاڵ**)[١٣] یاد هەگبە و شوێنی ئەو هەستەیە. لە خانەی یاد وێنەی شتە بەرهەستەکان کە وەرگیراوە وەبێ هیچ دەستێوەردانێك وێنا دەکرێن و سیمای خەیاڵی دەگرن، (**هەستی تێفکرین**)[١٤] ئەم هەستە وێنە خەیاڵیەکانی یاد هەڵدەگرێت و لێکدانەوە و شیکاریان بۆ دەکات و وێنای تازەیان لێ دروست دەکات. لەوانەیە ئەو وێنە تازانە ناڕاستیش بن و لە دنیای دەرەوە بوونیان نەبێت، بەڵام ئەمانەیش سەر بە بەرهەستەکانن، وەکوو هەڵفرینی مرۆڤ یان بینینی کێوێك زێڕ، (**هەستی وەهمی**)[١٥] لە خانەی ئەم هەستەدا لە وێنەی شتە بەرهەستەکان، دەرکی نابەرهەستی دەکرێت، وەکوو لە ئەنجامی بینینی گورگ، واتای دوژمنایەتی و دڕندایەتی درك دەکرێت و (**هەستی بیرەوەری و یادگە**)[١٦] کۆگا و شوێنی واتا نابەرهەستەکانە[١٧] کە لە وێناکانی بەرهەستدا وەرگیراون.

---

١. مغز
٢. حس ظاهری
٣. حس باطنی
٤. حس بصری: بینایی
٥. حس سمعی: شنوایی
١٠. حس لامسە
١١. حس مشترک
١٢. محسوسات
١٣. حس خیال
١٤. حس تفکر
١٥. حس متوهمە
١٦. حس حافظە
١٧. نامحسوس: نابەرهەست

**شەش بنەمای سەرەکی تەندروستی**[١]

هەوا، خواردن و خواردنەوە، ڕاگرتن و پاکسازی،[٢] وەرزش و پشوودان،[٣] کەش و هەوای هەناو،[٤] خەوتن و خەوەری[٥]

تەندروستی بریتیە لە دەرکەوتنی کرداری ڕاست و تەندروست لە ڕواڵەت و ناوەرۆکی جەستە و هەناوی مرۆڤ، هەروەها بەپێی بۆچوون و ڕوانگەی پزیشکان و حەکیمانی کۆن پاراستنی تەندروستی[٦] یانێ زانین و ناسینی کاروباری جەستە تەندروستەکان. جالینووس حەکیمی گەورەی یۆنانی دەڵێت: ئەگەر پێوانە و ڕێژەی شەش بنەمای سەرەکی تەندروستی مرۆڤ بە شێوەی شیاو و گونجاو و لە ئەندازەی هاوسان و سروشتیدا بمێنێتەوە، جەستە و ڕەوانی مرۆڤ تەندروست دەبێ. لە ڕوانگەی حەکیمانی ڕێبازی پزیشکی کۆنی ئێرانی بۆ ئەوەی مرۆڤ بتوانێت بە شێوازی سروشتی درێژە بدات بە ژیانی، پێویستە مەرجەکانی تەندروستیەکانی خوارەوە ڕەچاو بکات:

١) **هەوا**: توخمی هەوا بەهۆی تایبەتمەندیەکانی ڕوونی و خەستی، پلەی گەرما و سەرما، ئاوێتەبوون لەگەڵ توخمەکانی زەوی و دووکەڵەکان یا پاکژبوون لە دوکەڵ و ئەو توخمانە دەتوانێت کاریگەری بەرچاوی هەبێت لە سەر تەندروستی جەستەی مرۆڤ. بۆ نموونە هەوای تێکەڵ بە مەوادی پیس (وەکوو هەوای زێراب و گەنکاوەکان) دەبێتە هۆی نەخۆشی، بەڵام هەوایەکە مەوادی پیسی تێدا نەبێت دەبێتە هۆی تەندروستی و سلامەتی. هەمیشە بارودۆخی هەوا بەهۆی هۆکارەکانی وەرزەکانی ساڵ و کەشی جۆگرافیایی دەگۆڕدرێت. کەواتە هەر وەرزێکی ساڵ مەزاج و سروشتی تایبەت بە خۆی هەیە. بەهار مەزاجی هاوسان و مامناوەند، هاوین گەرم و وشك، پاییز سارد و وشك و وەرزی زستان مەزاجی سارد و تەڕە، هەروەها هەر کەشێکی جۆگرافیایی زەوین وەکوو کاتی شەو و ڕۆژ،

---

١. ستە ضروریە

٢. احتباس و استفراغ. لێرە استفراغ سەرووترە لە ڕشانەوە یانێ ڕشانەوە جۆرێکە لە استفراغ

٣. ریاضت و استراحت

۴. حالات روحی

۵. نوم و یقظە: نووستن و بیرداری (بێداری، خەوەری). وشەی بیداری کە لە زمانی فارسیدا بەکار دەچێت یەکێ لەو هەزاران وشەیە کە لە کوردیەوە چووەتە ناو فارسی. لەبنەڕەتدا بیداری هەمان بیرداری کوردیە کە بەواتای لە سەر هۆش و بیربوون کە مرۆڤ کاتێ نەخەوتووە بیری لای خۆیە و خاوەنی بیر و هۆشە

۶ حفظ الصحە

کوێستان و پێدەشتەکان، پلەی گەرمی، شەوبا[1] و ڕۆژبا[2] (لای شنیان و هەڵکردنی با)، ڕەنگی خاکی زەوین، ئاوی ژێرخان و ڕووی زەوین و هتد ئەویش مەزاجی خۆی هەیە.

٢) **خواردەمەنی و خواردنەوە**: هیچ مرۆڤ و تەنانەت بوونەوەرێك نییە کە پێویستی بە خواردن و خواردنەوە نەبێت. تا وەکوو ئێستا کەس نەبووە وەبێ بەکارهێنانی ماکی خواردن و خواردنەوە بژیت و ژیانی بەرێتە سەر. جا ئەمەیکە مرۆڤ چی بخوات و چی بخواتەوە زۆر گرینگە. چونکە هەموو خواردن و خواردنەوەیەك یان هەر ڕێژەیەکی کەم و زیادی خواردن و خواردنەوە بۆ مرۆڤەکان شیاو نییە. بۆ یەکجار هەڵە کردن لە خواردن و خواردنەوەی هەندێ ماکی ئەو دنیایە بۆ هەمیشە گیان لە جەستە نامێنێت و مرۆڤ تووشی مەرگ دەبێت یا وەکوو هەڵەی ورد و درشت لە بەکارهێنانی ماکەکانی خواردن و خواردنەوە دەتوانێت وردە وردە تەندروستی تەمەن دابەزێنێ و ژیان بەرەو نەخۆشی و ناخۆشی ببات و مەرگ نزیك بکاتەوە. کەواتە زۆر گرینگە مرۆڤەکان لە سەر ماك و بەرنامەی خواردن و خواردنەوەیان ڕۆژبەڕۆژ زانست و شارەزایی زیاتری بێت.

٣) **ڕاگرتن و پاکسازی**: ڕاگرتن یانێ هێشتنەوەی بەشێك لە پشکە پێویستیەکانی ناو جەستە (وەکوو ڕاگرتنی ئاو بە ڕادەی پێویست) و پاکسازی یانێ فڕێدان و کردنە دەرەوەی مەوادی ناپێویستی ناو جەستە (وەکوو فڕێدان و کردنە دەرەوەی مەوادی ژەهراوی ناو خوێن بە یارمەتی گورچیلە کە پێی دەڵێن میز). ئەگەر کەسێك نەتوانێت مەوادی پێداویستی لە جەستەیدا ڕابگرێ یا مەوادی ژەهراوی و زیادەی فڕێ بدات، ئەو کەسە تووشی نەخۆشی بووە.

٤) **وەرزش (چالاکی) و پشوودان**: وەرزش هەمان جووڵانەوە و چالاکی ڕۆژانەیە، بەڵام پشوودان دۆخێکە کە جەستە و ڕەوان هێمن دەبێتەوە و بێدەنگ دەبێت. زۆرێك لە کردارە پێویستیەکانی جەستە لە دۆخی پشوودان و حەسانەوەدا ئەنجام دەبێت. کەسێ کە نەتوانێت بە ئەندازەی پێویست پشوو بدات و وەحەسێت یا جووڵە و وەرزشی کەم بێت تووشی نەخۆشی دەبێت. وەرزش و جووڵانەوە بەشێکە لە کاتی خەوەری و بیرداری ژیان، کەواتە جەستە و ڕەوان، وزە و ورەی پاشەکەوت لە کاتی نووستن و پشوودانیدا گل دەدەنەوە. مرۆڤ کاتێ دەتوانێت لە کاتی وەرزش و جووڵانەوە و بەگشتی لە کاتی

---

١. شەوبا: هەڵکردن و شنیانی با لە ڕۆژهەڵاتەوە بۆ ڕۆژاوا

٢. ڕۆژبا: هەڵکردن و شنیانی با لە ڕۆژاواوە بۆ ڕۆژهەڵات

خەوەریدا ژیانی تێپەڕێنێت کە بە گونجاوی و لەباری پشووی دابێ و نووستبێ.

٥) **کەشی دەروونی:** مەبەست دۆخەکانی شادی، خۆشی، پێکەنین، گەشکەبوون، شانازی کردن، گەشانەوە، گریان و خەم، تووڕەیی، ڕق، هەڵچوون و هتد کە لە ناوەڕۆکی مرۆڤەکان ساز دەبێت و لە ڕواڵەتدا خۆی دەر ئەخات. پێویستە ئەو دۆخانە لە کەسی ئاسایی و سروشتیدا بە ئەندازە پێویست بێ. ئەگەر ئەندازەکەی لە جێ خۆی بوو ئەو کەسە تەندروستە و ناکەوێتە دۆخی نەخۆشی.

٦) **خەوتن و خەوەربوون:** نووستن دەبێتە هۆی بەهێزبوونی خۆگرتوویی و مانەوەی کرداره ماوسوولکەییەکانی لەش، هەروەها خەو دەبێتە هۆی ئەوە کە ژیان کوتوپڕ ڕانەوەستێت و درێژەی ژیان لە کاتی خەوەری و بیرداری داهاتوودا بمێنێتەوە. چەندە کات، شوێن و ڕێژەی نووستن گرینگە هێندە کات، شوێن و ڕێژەی بیرداری و خەوەریش گرینگایەتی هەیە. پێویستە ئەو لفەدوانەیە وەك یەك گرینگی پێ بدرێت و ڕێزی ژیانی بۆ دابنرێت چونکە هەر دوو ژیان پێك دەهێنن. هەندێ تەمەنی ژیان تەنیا بە کاتی بیرداری و بەخەبەر بوون دەزانن، بەڵام لە ڕوانگەی حەکیمانی کۆن و پسپۆڕانی ئێستاشدا بیرداری نیوەی ژیانە و نیوەکەی دیکە هەمان کاتی نووستن و پشوودانی دوای جووڵانەوە و وەرزشە.

**نەخۆشیەکانی مرۆڤ**

لە ڕوانگەی حەکیمانی پزیشکی خۆماڵی ئێرانیەوە نەخۆشیەکانی مرۆڤ بریتین لە نەخۆشیە ساکار و تێکەڵەکان

**نەخۆشیە ساکارەکان:** بریتیە لە سێ دەستەی بەدسروشتی یا بەدمەزاجی[1]، بەدپێکهاتەیی[2] و لێکەوەبوون و پێکەوەبوونی[3] ئەندامی لەش

١) **بەدمەزاجی:** لێکترازان و تێکچوونی مەزاجی سروشتی مرۆڤ بەرەو لای زۆری یا کەمی خاڵی ناوەڕاستی هێڵی مەزاج. بەدمەزاجی هەم لە یەك ئەندام ڕوو دەدات و هەم لە گشت ئەندامەکانی لەش. بەدمەزاجی دوو جۆرە: بەدمەزاجیی ساکار (تەنیا یەك چۆنیەتی و کواڵێتی دەگۆڕێت، وەکوو ئەگەر گەرمای گەدە هێندێك لە ئەندازەی پێویست هەڵبکشێت، ئەو گەرما زیادەیە بە خواردن و بەکارهێنانی ساردکەرەوەکان دادەبەزێت و دەگەڕێتەوە سەر

---

١. سوء مزاج

٢. سوء ترکیب

٣. تفرق و اتصال

دۆخی سروشتیی خۆی) و بەدمەزاجیی مادی (ئەگەر یەك خەڵت یا زیاتر لە ناو خەڵتە چوارینەکانی سەودا، بەڵغەم، خوێن و زەرداو لە یەك ئەندام یا زیاتر تووشی گۆڕانکاری چۆنیەتی و چەندیەتی مەزاجی بێت، بەدمەزاجیی مادی سەرهەڵدەدات. کەواتە چارەسەرکردنی بەدمەزاجی مادی دژوارترە و پێویستی بە چاکسازی خەڵت و پاڵپێوەنان و کردنە دەرەوەی خەڵتی زیادییە لە جەستە).

پزیشکی لێزان و دڵسۆز بۆ کاری چارەسەری و دەرمانگەری نەخۆش، پێویستە سەرەتا مەزاجی سروشتی کەسی نەخۆش بدۆزێتەوە، پاشان هەوڵ بدات لارەسەنگی مەزاج ڕاست بکاتەوە و بیگەڕێنێتەوە سەر خاڵی مەزاجی سروشتی. هەر کەسێك لە هەر قۆناغێکی تەمەنیدا مەزاجێکی دیاریکراوی خۆی هەیە: قۆناغی تەمەنی گەشەی[1] جەستەی مرۆڤ زۆرتر گەرما و تەڕی زاڵە یانێ مەزاج خوێنیە، تەمەنی ٣٠ بۆ ٦٠ ساڵان تین و گەرمای جەستە بەرەو کەمبوونەوە دەچێت و ساردی و وشکی زاڵ دەبێت یانێ مەزاج سەوداویە، بەڵام تەمەنی سەرووی ٦٠ ساڵ مەزاج جیاوازە واتا بەپێی خواردن و خواردنەوە مەزاجی جەستەی بەساڵاچوو دەگۆڕدرێت.

٢) **بەدپێکهاتەیی:** واتا ناسروشتی بوونی یەك ئەندام کە بریتیە لە:

* هەبوونی کێشە لە ڕواڵەتی جەستەدا، بۆ نموونە کەسێك لاقی شەلە و بە سکماکی شەل لە دایك بووە

* ئەندازەی ئەندام کێشەی هەیە، بۆ نموونە کەسێك بە سکماکی لاقێکی لە لاقی دیکەی گەورەترە

* ژمارەی ئەندام ناسروشتیە، بۆ نموونە کەسێك بە سکماکی دەستێکی شەش قامکی هەیە.

٣) **لێکەوەبوون و پێکەوەبوونی پەیوەستەیی ئەندام:** لێرە ئەندامەکان لە سەر جێ خۆیان نامێنن و ئەندام هەڵدەوەشێت و لێك جیا دەبێتەوە (وەکوو برین و بڕین) و یا ئەندام بە شێوەیەکی نایەکسان جێگیر بووە (بۆ نموونە کەسێك ئێسکی دەشکێت، بەڵام ڕاست ناگیرسێتەوە و گرێ و گۆلی تێدا دروست دەبێت).

**نەخۆشیە تێکەڵەکان:** لە ئاوێتەبوونی دوو یا چەند نەخۆشی ساکار ڕوو ئەدات. زیپکە و کوان نموونەیەکی ساکارە لە نەخۆشی تێکەڵ کە بەهۆی بەدمەزاجیەوە دروست دەبێت. واتا

---

١. واتا سەرەتای منداڵی تا تەمەنی ٣٠ ساڵی

سەرەتا لە شوێنی کوان یا زیپکەکە بەدمەزاجی پێك دێت و ئەو شـوێنە دوایـی دەئاوسـێت. ئینجا ئاوسانەکە دەتەقێت و پێوەستەیی ئەندام هەڵدەوەشێت و لێك جیا دەبێتەوە.

**چارەسەری نەخۆشیە ساکار و تێکەڵەکان**

بەپێـی ڕێبـازی پزیشـکی خۆمـاڵی ئێرانـی کاتێـك بەهـۆی بەدمەزاجـی، بەدپێکهـاتەیی و یـا لێکەوەبوون و پێکەوەبوونی یەك یا چەند ئەندامی جەسـتە جـۆری نەخۆشـیەکە دیـاری کـرا، پزیشك دەست ئەکات بە چارەسـەری و دەرمـانی نەخۆشـیەکە. ئەگەر هۆکـاری نەخۆشـیەکە بەهۆی بەدپێکهاتی و لێکەوەبوون و پێکەوەبوونەوە بوو ئەوە کـاری چارەسـەری دوور و درێـژ دەبێت و نەخۆش پێویستە بەردەوام بێت لە سەردان کردنی پزیشك و پـلە بە پـلە ڕێنمـایی و ڕەچەتەکان جـێبەجـێ بکـات و تەنـانەت خۆیشـی ئامـادە بکـات بـۆ کـاری نەشـتەرگەری. ڕوونکـردنەوەی شـێواز و ڕێگاکـانی دەرمـانی بـۆ بەدپێکهـاتی و لێکەوەبـوون و پێکەوەبـوون پێویستی بە بابەت و دەقی تۆکمە هەیە کە بۆ خـوێنەر ڕوون بێـتەوە، بەڵام بەگشـتی بـابەتی دەرمانی بەدمەزاجی ئاسانترە و لەم یەك دێڕەدا دەکرێت سیمای گشـتیەکەی بـزانین. پزیشـك بۆ چارەسەر کردنی بەدمەزاجی ئەندامەکانی جەستە بەگوێرەی داڕشتنی بەرنامەی خواردن بـۆ نەخۆش، جـۆری بەدمەزاجـیەکە دەسنیشـان دەکـات و بە یـارمەتی ئەو بەرنـامەیە و بەپێـی پێویست بە پێدانی دەرمان و ئەنجامدانی کاری دەستی (بۆ نموونە کەڵەشاخ گرتن بۆ دەرمـانی زاڵبوونی خوێن) مەزاجی نەخۆش بەرەو هاوسانی و سروشتی بوون ڕێك دەکاتەوە. بـۆ نمـوونە ئەگەر نەخۆش مەزاجی بەرەو سـاردی بتـرازێ پزیشـك بە یـارمەتی ڕەچەتەی خـواردن و یـا ئەگەر پێویست بوو بەیارمەتی دەرمانە گەرم مەزاجەکان مەزاجی ڕێك دەخـاتەوە. هەروەتـر بـۆ تێکچوونی مەزاجەکانی دیکە خواردن و دەرمانی جیـاواز دەسنیشـان دەکـات. خـاڵی گرینـگ ئەوەیە کە زۆربەی نەخۆشیەکانی مرۆڤ بەهۆی پێوانە و ڕێژەی نەشیاو و ناڕێکی شەش بنەمـا سەرەکیەکەی تەندروستی دروست دەبێت. کەواتە پێویستە هەم تاکی نەخۆش و هەم پزیشـك گرینگی بدەن بە پاراستنی تەندروستی جەستە و دەروون، و بە هاوکـاری ڕێنمـایی و ڕێکـارە تەندروستیەکان وەکوو ڕێکخستنی دۆخی هەناسەکێشان، ژینگە و هەوای پاکژ، ئاوی خـاوێن، نەخواردن و کەم خواردنی سوورکراوە و خواردنی پـڕ ڕۆن و خـوێ و شـەکر، خـۆراکی تـازە، خەوتنی شەوانە و زوو هەستانی بەیانیان، وەرزش و جووڵەی دروسـت و پێویسـت، شـادی و ئارامی و هتد، هاوکات لەگەڵ گرتنەبەری ڕێوشـوێنی دەرمـانی (چاکسـازی مەزاج سـەرەتا بە خواردن، پاشان دەرمان و دواتر نەشـتەرگەری) بـۆ هەمیشـە تەندروسـتی بپارێزێـت و خـۆی بخاتە بازنەی ئاسوودەیی و ئاسایشەوە.

## پێوەندی «قانون فی الطب» و زمانی کوردی[1]

هیچ پێویست ناکات کە ئێمە بەگۆترە پینە و پەراوێزی زیادە بلکێنین بە ژیان و بەرهەمەکانی پوور سینا (ابو علی سینا) بەتایبەت لەسەر بابەتە پزیشکیەکانی وەکوو بەرهەمی قانوونی پزیشکی، شەفا، کۆڵنج و ڕەگناسی. بەڵکوو دەبێ تیشك بخەینە سەر تێبینیەکانی ناو وەرگێڕان و توێژەرانی ئەورووپی و لاتینی لەسەر دەقی سەرەکی و وەرگێڕانی بەرهەمەکانی ئەبوو عەلی سینا کە وەرگێڕەکان هەمیشە هەمبەری هەندێك بابەت و زاراوە و وشەی ناو کتێبی "قانوون فی طب" وەکوو خۆیان نووسیوەتەوە و بەردەوام وەك گرێکوێرەیەك سەیری ئەو وشە و واتا نامۆ و نەناسراوەیان کردووە. تەنانەت پاش ژیانی ئەبووعەلی سینا خودی فارسەکانیش لە وەرگێڕانی دەقێکی پوخت و تەواوی ئەو بەرهەمە سەرکەوتوو نەبوون و هیچ کات نەیانتوانی دەقێکی وەرگێڕانی فارسی ئامادە بکەن، تا وەکوو بەخت هەڵسوورا و ئەم پشکە گەنج و گەوهەرە وە بەر مامۆستا هەژاری موکریانی کەوت.

کاك بورهان حوسەینی دەیگێڕایەوە: *ساڵی ١٣٥٨ لە تاران کونگرەیەکی ناودەوڵەتیان ڕێك خست بۆ ڕێزلێنان و ناساندنی حەکیم ئەبووعەلی سینا. هاوکات پێشانگایەکیش بۆ نیشاندانی دەقە دەستنووسەکانی، و وەرگێڕانە ناتەواو و تەواونەبووەکان و بابەت و نامیلکەی نووسراو لەسەر پەرتووکی «قانون فی الطب». خاڵی گرینگ و هاوبەش لە سەرجەم وەرگێڕانە ناتەواوەکانی ئەو پەرتووکە ئەوە بوو کە هەزار ساڵە فارس زمانەکان هەوڵیان داوە بەرهەمەکەی ئەبووعەلی سینای فارس زمان کە بە عەرەبیەکی کۆن نووسراوە وەریبگێڕنەوە سەر زمانی فارسی سەردەم و هەمیشە تووشی گرێکوێرەی ناو کتێبەکە هاتوون و سەرکەوتوو نەبوون. تا ئەو کاتە بۆ کەس ڕوون نەبوو کە گرێکوێرەی تەواو نەکردنی «قانون فی الطب» لە عەرەبیەوە بۆ فارسی چییە، پاشان بەخت یار دەبێت و ئەم گرێکوێرەیە مامۆستا هەژاری کورد*

---

١. ئەو بەشە وەرگیراوە لە کتێبی "پێشەکیەك لەسەر ڕووەکناسی، گیادەرمانی و پزیشکی خۆماڵی کوردەواری"، ئیرەج موڕادی، چاپی یەکەم، کۆمەڵەی ڕووەکناسانی کوردستان، سلێمانی، ٢٠١٦

*دەیکاتەوە*. تایبەتمەندیەکانی ئەزموونی ژیان و زمانی مامۆستا هەژار بۆ وەرگێڕانی ئەو کتێبە کارساز و چارەسەری تەواو بوون. مامۆستا هەژار ژیانی لە خوێندنگەی فەقێیاتی مزگەوتەکانی موکریان دەست پێ کردووە، پاشان چارەنووسی هەڵوەدایی و ئاوارەیی بەرەو وڵاتانی عەرەبی و گیرسانەوە لای نەتەوەی عەرەب و کورد لە عێراق، سووریە، تورکیە و لوبنان ڕایدەکێشێ تا وەکوو لە کۆتایی ژیانی دەگەڕێتەوە و ئەمجارە بۆ دۆزینەوەی کار و دابین کردنی بژیوی ژیانی ڕوو لە تاران و کەرەج دەکات تا وەکوو ئەوەی چەند شاکاری کوردی و فارسی لە دوایین ساڵەکانی ژیانی بە چاپ دەگەینێت.[1]

خاڵێکی گرینگتری ژیانی ویژەیی و ڕۆشنبیری مامۆستا هەژار، کار کردن لە سەر کۆکردنەوەی سەرجەم وشە و زاراوەکانی هەموو شێوەزارەکانی (لەکی، لوڕی، کەلوڕی، هەورامی، بادینی، شەمزینی، زازاکی، ئەردەڵانی و سۆرانی) زمانی کوردی بووە و هەروەها خوێندنی پەرتووکە کۆنەکانی ویژەیی زمانی کۆنی فارسی لە سەردەمی فەقێیایەتی و ئاشنابوون بە کتێبە عەرەبیەکانی کتێبخانەکانی بەعلبەکی لوبنان و ناوشاری بەغدا بووە. ئەمانە و کۆمەڵێك بەهرەی ئەزموون و زانستی ژیانی ئەو کەڵەپیاوە هەموو خاڵی ئەرێنی و گرنگ بوون بۆ وەرگێڕانێکی سەرکەوتووی ئەو کتێبە دەگمەنە.

ئێمەی کورد ناکرێت بە تەنیا خۆمان بە خاوەنی کردنەوەی ئەو گرێکوێرەیە بناسین، بەڵام پشکێکی شیاومان لە چارەسەری گرێ و وشە گرانەکانی قانوونی پزیشکی پوورسینادا هەبووە و هەیە. چونکە زمانی پوورسینا شێوەزاری فارسی دەری وڵاتی ئۆزبەکستانە و زۆربەی ژیانی بە ڕێگەی سەفەرەوە بووە بەتایبەت کە بەشێکی زۆری ژیانی (٢٣ ساڵ)[2] لە هەمەدان[3] تێ پەڕاندووە. جا لێرەدا گرینگ ئەوەیە دیسانەوە سەیری مێژووی دەڤەر و

١. لەچاپدانی فەرهەنگی کوردی بە کوردی و فارسی هەنبانەبۆرینە، وەرگێڕانی قورئانی پیرۆز بە کوردی پەتی، وەرگێڕانی ٧ بەرگ کتێبی قانوونی پزیشکی ئەبووعەلی سینا لە عەرەبی بۆ سەر فارسی و هەروەها ئامادە کردنی فەرهەنگی فارسی بە کوردی کە هێشتا چاپ نەبووە.

٢. ئەبووعەلی سینا لە درێژەی سەفەری ژیانیدا پاش بوخارا، بەلخ، و گورگانج، ساڵێك لە ڕەی دەمێنێتەوە، پاشان بە ڕێگەی قەزوێن بەرەو هەمەدان هەڵدەکۆچێت و بێجگە لە یەك ساڵ ژیانی لە ئەسفەهان ٢٣ ساڵ پاشماوەی تەمەنی لە شاری هەمەدان بە سەر بردووە.

٣. هەمەدان یەکەم پایتەختی نەتەوەی ئاریا بووە کە مادەکان وەکوو پایتەختی هاوینەی خۆیان بنیاتیان ناوە. هێرۆدۆت مێژوونووسی یۆنانی، دیاکۆ پاشای ماد بە دامەزرێنەر و بنیاتنەری شاری هەمەدان یا هێگمەتانە دادەنێت و ساڵی ٧٠٨ پێش زایین تا وەکوو هێرشی کوورۆشی هەخامەنشی لە ساڵی ٥٥٠ پێش زایین بۆ سەر مادەکان و ڕووخانی دەسەڵاتەکەیان ئەو شارە هاوشانی ئاتێن و ڕۆم پایتەختی ژیان و ژیار بووە.

شاری هەمەدان بکەین کە زۆر بە ڕاشکاوی دەرئەکەوێت کە هەمەدان نیشتمان و مەڵبەندی سەرەکی هۆزی لەك و بەشێك لە هۆزەکانی کەڵهوڕ و لوڕ ئەژمار دەکرێ. تەنانەت شاعیر و عارفی گەورەی لەك بابەتاهێری هەمەدانی لەو شارەدا ژیاوە. ئێستاکەش هێشتا جەماوەرێکی زۆر لە ئاخێوەرانی لەك و لوڕ و کەڵهوڕ لەپاڵ نەتەوەکانی دیکە وەکوو فارس و ئازەری پێکەوە هەمەدان بە نیشتمانی خۆیان دەزانن. کەواتە ئەگەر بە چاویلکەی مێژوویەوە بچینەوە سەردەمی پوورسینا و شاری هەمەدان بهێنینەوە پێش چاوی خۆمان کە هێشتا مەغۆل هێرشی نەهێناوە و هەواڵێك لە جەماوەری ئازەری لەو دەڤەرەدا نییە و دوو نەتەوەی کورد و فارس لەو شارەدا ژیاون و پسپۆڕێکی بلیمەت و خاوەن بەهرەی ناوازە هاتووەتە ناویان و ڕۆژانە خەڵکی نەخۆش و دەردەداری شار و دەڤەرەکە لە کورد و فارس هاتوچۆی دەکەن. حەکیمێك کە ناوبانگی سنوورەکانی بەزاندووە بەهۆی ئەوە کە پاش سەردانی دەیان حەکیم و پزیشکی بیانی و ناوخۆیی تەنیا پوورسینا بووە پاشای دوو دەسەڵاتی ئەو سەردەمەی ئێران واتا سامانیەکان[1] لە بەلخ و دەیلەمیەکان[2] لە ڕەی لە نەخۆشی کوشندە ڕزگار کردووە.

بەو شێوەیە بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە زۆر ئاساییە پوورسینا کە زمانی دایکی فارسی دەری بووە و بۆ ڕاپەراندنی کاروباری ڕۆژانە و تێگەیشتن لە ژان و ئازاری خەڵك و تێگەیاندنی خەڵکەکەی پێویستی بووە کە هاوشێوەی ئەوان بە فارسی و لەکی و لوڕی قسە بکات یاخود تێکەڵەیەك لە زمانی خۆی و زمانی ئەوان لای خۆی ساز بکات تا وەکوو ئیش و کاری دەرمانگەری و چارەسەر کردنی بە چاکی و تەواوی جێبەجێ ببێت. لە لایەکی ترەوە ئەبووعەلی سینای فارس زمان زانستی پزیشکی و ئەزموون و ئەنجامەکانی بە زمانی عەرەبی نووسیوە. چارەنووسی ژیانی ئەو حەکیمە دەریدەخات کە ڕێبواریەکەی هەموو بە ناو هۆز و شارەکانی فارس و تات و لەك و لوڕەکاندا تێپەڕیوە نەك بە ناو زاراوە و هۆزە عەرەبەکاندا. کەواتە بێگومان کاریگەری زمان و شێوەزارەکانی ناعەرەبی لە دەق و بەرهەمەکانی دەر ئەکەوێت و وەك خاڵێکی ئاسایی خۆی دەردەخات. ئەبووعەلی سینا دەیان وشە و واتای وشە

١. میری ئەو سەردەمەی سامانیەکان نوح کوڕی مەنسووری سامانی بووە و پوورسینا تەمەنی ١٨ ساڵان بووە. پوورسینا داوا دەکات لە بەرامبەر دەستخۆشانەی میری سامانیان مۆڵەتی بدات لە کتێبخانەکەی ناو دەرباری سامانیان خەریکی خوێندن و توێژینەوە بێت. پوورسینا دەڵێت ئەم کتێبخانەیە خاوەنی دەیان و هەزاران پەرتووکی نایاب و ناوازە بووە.

٢. میری ئەو سەردەمەی دەیلەمیەکان موجدولدەولە بووە و پوورسینا تەمەنی ٣٤ ساڵان بووە.

و ناوی ڕوەکی لە خەڵکی لەك و لوڕەوە خستۆتە ناو کتێبە عەرەبیەکەی. ئێستاکەش بەهۆی ئەو کتێبەوە گەلێك ناوی کوردی، فارسی و لوڕی چووەتە ناو زمانی عەرەبی، وەکوو:

اسفناج (ئەسپیناخ، سپیناخ، ئەسپەناج)[1]، بابونج (بەیبوون، باوینە و باوین)، بنفسج (بەنەوشە و وەنەوشە)، نارنج (نارنگ)، بصل (پسڵ)، زعفران (زافەران، زەفیرۆ)، مسك و میسك (مۆشك)، بادرنجبویە (بادرەنگبۆ و نارنجبۆ)، باذنجان (باینجان و بامجان)[2]، بلوط (بەلوو، بەڕوو، پەلووت)، بذرالبنج (خەربەنگ، خەروەنگ)، بنج (بەنگ، حەشیش)، ترنجبین (تەرەنگوین)، کلنکبین (گوڵەنگوین)، مازوج (مازوو، مازی، مازگ و مازوول)، برسیاوشان (پەرسیاوەش، پەرسیاوەشان)[3]، فیجن (پێچەن)، فستق (پستە)، فونج و فودنج (پوونگە، پنگ و پوونگ)، جرجیر (گەرگیر)[4]، توث (توو، تووت)[5]، اشترغاز (وشترخوار)، دم الاخوین (خوێن سیاوەشان)[6]، حنا (خەنە، هونە)، دارصینی (دارچین)، رازیانج (ڕازیانە)، شاهترج (شاتەرە)[7]، ریباس (ڕیواس، ڕیڤاس، ڕمبێز، ڕیواو)[8]، شبث (شویت، شبیت، شوید)[9]، شیرخشك (شیرخشت)، کرفس (کەرەوز، کەرەسپ)، بندق (فنەق، فەنەق، فەندەق)[10]، جوز (گوێز، وەزی، گردەکان)، جلنار (گوڵ هەنار، گوڵنار)[11]، لاذن (لادەن)[12]، نرجس (نێرگس، نێرگز)[13]، جزر (گەزەر، گێزەر)، جاورس (گاورەس، گاڵ) و هتد.

مامۆستا هەژار لە پێشەکیەکەی بەرگی ٢ وەرگێڕانی قانوون باسی لەوە کردووە کە دەیان وشە لە دەقە عەرەبیەکەی پوورسینا هەیە کە دەقاودەق وەرگێڕانی کوردییە بۆ عەرەبی و واتای ئەو وشانە لە فارسی و عەرەبی ناتوانێ ڕستەی دەقەکە تەواو بکات. بەڵکوو دەبێ کوردیزانێك شی بکاتەوە کە ئەوانە کوردییە، وەکوو: علی الراس (لە سەرڕا) بۆ دیسانەوە، یشبە (وێدەچێ) بۆ باوڕم وایە، فی الفور (لە جێ) بۆ خێرا و دەستبەجێ، و تاد.

---

1. Spinacia oleracea
2. Solanum melongena
3. Adiantum capillus-veneris L.
4. *Eruca sativa*
5. Morus alba
6. *Dracaena fragrans*
7. Fumaria officinalis
8. Rheum ribes
9. Anethum graveolens
10. Corylus avellana
11. Punica granatum
12. *Tropaeolum majus*
13. Fumaria officinalis

## پوختەیەکی یاسای پزیشکی کۆن و میللی ئێران پەســـەندکــراو لە وزارەتـی تەندروســـتی[1]

ڕێکەوتی ٢٠٠١/٠٥/١٩ پاڵپشت بە پێشنیاری وەزارەتی خوێنـدنی بـاڵا بـە ژمـارە ٦٢٦/١٥، پاشـان ٢٠٠٢/٠٨/٢٧ دوابەدوای پەسـەند کردنـی مـادەی ٥٠٣ ئەنجـومەنی بـاڵای شۆڕشـی ڕۆشنبیری ئێران، یاسا و پێڕەونامەی گشتی پزیشکی خۆماڵی و سروشـتی ئێرانـی پەسـەند کراوە و بۆ فەرمانگە، توێژینگە و زانکۆکان چەند بڕیار و بڕگەی یاسایی دەرکراوە:

١) دانانی "ئەنجومەنی بـاڵای پزیشـکی خۆمـاڵی ئێرانـی" لە وزارەتـی تەندروسـتی، بـۆ هەڵسەنگاندنی لێهاتوویی و ئاستی زانسـتی ئەو پسـپۆڕانەی لە بـواری پزیشـکی خۆمـاڵی و سروشتی ئێرانیدا بڕوانامەیان نیـیە و پـاش تێپەڕانـدنی خـول و وانەکـان لە تاقیکاریەکـان دەرچــوون و پــێگەی حەکـیم و پزیشــك و دەرمــانگەری خۆماڵیــان وەرگرتــووە و دەبــێ بڕوانامەیان پێ بدرێت.

٢) ئاست و ڕێـژەی ئەزمـوونی حەکـیم، پیشـەوەر، دەرمـانگەر و تـوێژەرانی بلـیمەت و هەڵکەوتەی هەر کام لە لقەکانی پزیشکی خۆماڵی ئێرانی (پزیشکی هۆز و نـاوچە، پزیشـکی تەواوکاری و ئەو کەسانەی بەپێی ڕاسپاردە و بنەماکانی ئایینی کاری دەرمان و چارەسـەری پزیشکی دەکەن بەڵام خاوەنی بڕوانامەی ئاکـادمی و زانکـۆیی نـین) یـا کەسـانێك خـاوەنی بەرهەم و تـوێژینەوەی زانسـتیانەن لەسـەر ئەو ڕێبـاز و پیشـە پزیشـکیە بەپێـی یاسـا و

---

١. وەرگێڕانێکی پوخت و کورتە لە نامیلکەکانی "سند ملی گیاهان دارویی و طب سنتی (وەرگیراو لە: بەشی ئەلف بڕگەی ٥-١ بابەتی پێنجەم "نقشه جامع علمی کشور") چاپ: دبیرخانه شورای عالی انقلاب فرهنگی، تاران، ١٣٩٢" و "اساسنامه توسعه طب سنتی و طبیعی، چاپ: ریاست جمهوری، ١٣٩٠" و "معرفی کلی جامعه پژوهشهای طب سنتی ایران، چاپ: جامعه پژوهشهای طب بومی ایران دانشکده علوم پزشکی دانشگاه تهران، ١٣٩٢" – سەرجەم دەقی هەر سێ نامیلکەی ناوبراو ساڵی ٢٠١٥ بەپێشنیاری کاك جەلال کەریم عومەر لە سلێمانی بۆ بەشی ڕاگەیاندنی کۆمەڵەی ڕوەکناسانی هەرێمی کوردستان ئامادە کراوە. [نووسەر]

پێڕەونامەکان بڕوانامەی ئاستی ١ (ڕاهێنەر) و ٢ (دەستیار) بەو کەسانە بدرێت. تا ئەوانە بتوانن لە زانکۆ یا پەیمانگاکانی فێرکاری و توێژینەوەی بواری پزیشکی خۆماڵی بخوێنن یا مامۆستایی بکەن.

٣) سەرجەم ڕێنماییەکان، نووسراوەکان و ناوەرۆکی بەرنامەی تاقیکاری بۆ هەڵسەنگاندن و تاقیکردنەوەی ئەو پسپۆڕ و حەکیمانەی بڕوانامەیان نییە و لە زانکۆ و پەیمانگا و توێژینگەکانی پزیشکی خۆماڵی داوای هاوکاری یا هەلی دامەزراندن دەکەن، دەبێ لەلایەن ئەنجومەنی باڵای پزیشکی خۆماڵی وزارەتی تەندروستییەوە پاڵپشت بکرێن. ئینجا بەشی دیوانی یاریدەدەری فێرکاری ئەو وزارەتە فەرمان و گشتاندنی بۆ دەربکات.

٤) لە ئەنجومەنی باڵای پزیشکی خۆماڵی وزارەت بەشێك بە ناوی "ئەنجومەنی دەستنیشانکردنی لێهاتوویی و لێزانی پسپۆڕانی بێ بڕوانامەی ئاکادمی" دەکرێتەوە. ئەو ئەنجومەنە پێك هاتووە لە بەشەکانی: یاریدەدەری پزیشکی خۆماڵی، یاریدەدەری فێرکاری، یاریدەدەری توێژینەوە. یەکێ لە ڕاگرەکانی زانکۆی پزیشکی خۆماڵی و پێنج کەس لە پسپۆڕانی ناسراوی پزیشکی و دەرمانسازانی پزیشکی خۆماڵی لەو ئەنجومەنەدا دەبن کە ئەنجومەنی باڵای پزیشکی خۆماڵی هەڵیان دەبژێرێت.

**مەرجەکانی ناو ئەنجومەنی باڵای پزیشکی خۆماڵی ئێرانی:**

١) هەموو ئەندامانی ئەنجومەن دەبێ ئاستی زانستی گشتی و لێهاتووییان لەسەرەوە بێ.

٢) ئەو کەسەی بڕوانامەی دەوێ پێویستە پێشینە و سی‌ڤی چالاکی و کارەکانی پێشکەش بکا.

٣) خوازیار لە باری ڕەوشت و هەڵسوکەوتی کۆمەڵایەتیەوە پێشینەی خراپی نەبێت و لەلایەن دادگا و ئاسایشەوە کێشەی نەبێ.

٤) بەرهەمەکانی زانستی و توێژینەوەیی خوازیار کە لەسەر بوار و پیشەی پزیشکی خۆماڵی ئەنجام بووە، لەلایەن ئەنجومەنەوە پەسەند بکرێت.

٥) خوازیار دەبێ لەسەر ئەزموون و لێهاتووی خۆی نامیلکەیەکی زانستی بنووسێت و ئاستی پسپۆڕی خۆی نیشان بدات. ئەو نامیلکەیە دەبێ لەلایەن ئەنجومەنەوە پەسەند بکرێت، هەروەها لە تاقیکاری و پرسیارنامەی ئەنجومەن دەربچێت و نمرەی شیاو وەربگرێت.

٦) پێویستە خوازیار چەندین بەڵگەی پەرەستاری یا وتاری زانستی سەبارەت بە کاریگەری و سوودبەخشی شێوازەکانی دەرمانی و چارەسەری بواری پسپۆڕی خۆی

پێشکەش بە ئەنجومەن بکات و پەسەند بکرێت.

٧) پێڕەونامەی ئەنجومەنی باڵای پزیشکی خۆماڵی ئێرانی ئەو کەسانە ناگرێتەوە کە بڕوانامەی بواری پزیشکی هاوچەرخ یا دەرمانسازی گشتیان هەیە. چونکە ئەو کەسانە دەتوانن لە ڕێگەی زانکۆ پزیشکیەکان خوێندنی خۆیان درێژە پێ بدەن و بڕوانامەی پێویست وەر بگرن.

٨) سەرەتا ماوەی یەك ساڵ کارکردنی فەرمی ئەدرێت بە حەکیم و پیشەوەرانی دەرمان و چارەسەری (بۆ دیاریکردنی نرخی خزمەتگوزاری، پێناسەی نەخۆشیەکان و شێوازی دەستێوەردان لە چاکردنەوە و چارەسەری) و چالاکانی بواری پزیشکی خۆماڵی. بۆ تازەکردنەوەی ئەو مۆڵەتە پێویستە پسپۆڕ گوزارشتی کار و چالاکیەکانی پێشکەش بکات. ئەنجومەن پاش وردبینی و پێداچوونەوە ئەنجام و پەسەندکردنەکەی ڕادەگەینێت. جاری دووهەم مۆڵەتەکە بۆ ٣ ساڵان و ئینجا بۆ ٥ ساڵ تازە دەکرێتەوە.

٩) پسپۆڕان و شارەزایانی ئەو بوارە کە پێناسە و بڕوانامەی پزیشکیان نیە پێویستە سەرجەم مافەکانی نەخۆش و بنەما و ڕێنماییەکانی تەندروستی و پزیشکی وزارەت ڕەچاو بکەن و بەوردی بابەتەکانی دەرمانە تایبەتی و حاڵەتە مەترسیدارەکان وەربگرن و لەسەر هەموو ڕەچەتە و بەڵگەنامەی دەرمانی و چارەسەریەکان مۆر و واژۆی پێوە بێت. چونکە ئەو کەسە لە بەرامبەر سەرجەم ڕەچەتە، ڕێژەی دەرمان و دەستێوەردانی تەندروستی بەرپرسیارەتی تەواوی هەیە. هەروەها پێویستە ئەو کەسانە سەر نەکێشنە ناو کاروباری پسپۆڕی و شارەزایی پزیشکانی دیکە.

١٠) ئەو پسپۆڕ و شارەزایانەی هێشتا بڕوانامەی ئاکادمیان بە دەست نەهێناوە دەتوانن ئەزموون و پسپۆڕی و شێوازی چارەسەری تایبەت بە بواری خۆیان لە خول و بەرنامە تایبەتەکاندا فێری پزیشکان و دەستیارانی دکتۆرای پزیشکی و دەرمانسازی خۆماڵی پێشکەش بکەن تا وەکوو زیاتر بچێتە بواری کار و توێژینەوە. تا وەرگرتنی بڕوانامە، ئەنجومەن ڕێگە نادات ئەو کەسانە بە شێوەی فەرمی ئەزموون و زانستی خۆیان فێری کەسانی دەرەوەی بواری پزیشکی بکەن. چونکە ئەنجومەن و لایەنەکانی پێوەندیدار بۆ ڕێکخستنی بواری ئەزموون و زانستی کەسانی بێ بڕوانامە بە دەرکردنی دەیان ڕێنمایی و تێبینی هەوڵیان داوە گەنجینەی ئەم لقە پزیشکیە بخەنە بەرنامەی کار و توێژینەوە و خزمەتگوزاری فەرمیەوە و ڕێگەی خورافات و دوور لە زانست نەگرێتە بەر.

(١١

## پێگەی پزیشکی خۆماڵی ئێرانی لە پرۆژەی گەشتیاریی تەندروستی

بەپێی پێناسەی ڕێکخراوەی جیهانی گەشتیاری (UN- WTO)، ئارەزووەکانی تەندروستی گەشتیاریە کە گەشتیاران هان ئەدات بۆ گەشت کردن. گەشتیاریی تەندروستی بەشێکی گرینگە لە گەشتیاری. مەبەست لەو جۆرە تەندروستییە چاکسازی و تەندروست کردنەوەی باری جەستەیی و ڕەوانی گەشتیارە کە مرۆڤێك بۆ ماوەی ٢٤ کاتژمێر تا یەك ساڵ سەردانی وڵات یا ناوچەیەکی تەندروست دەکات. کەواتە بەهۆی تەوەرەکانی جیهانیبوون و بازرگانی ئازاد لە بەشی تەندروستیدا، پێویستە ئەو وڵاتانەی پزیشکی و چارەسەری خۆماڵیان هەیە گرینگی زیاتر بدەن بە بووژانەوە و ناساندنی کەلتووری کۆن و خاوەن پێشینەی خۆیان تا وڵاتانی دیکە بە باری گەشتیاریدا ئاوڕیان لێ بدەنەوە و ببێتە هۆی گەشەی ژێرخان و سەرخانی ئابووری و ناساندنی فەرهەنگ و شارستانیەتی ئەو وڵاتە.

### گەشتیاریی تەندروستی لە ئێران

سەرەڕای ئاستی پێشکەوتووی پزیشکی سەردەم لە ئێران، بووژاندنەوە و گەشەپێدانی ڕێبازی پزیشکی خۆماڵی ئێرانی کە پێشینەیەکی کۆن و مێژوویی هەیە دەکرێت سەرجەم شێواز و ڕێکار و دەرمانەکانی ئەو بەشە پزیشکی مێژووییە بۆ خزمەتگوزاری ناوخۆ بێ یا هەناردەی وڵاتانی دەرەوە بکرێت. جیا لە تایبەتمەندیەکانی دەرمانگەری و چارەسەری پزیشکی خۆماڵی، گەلێك بابەتی دیکە لە وڵاتی ئێران هەیە کە پەیوەست بە سروشت و ژینگەیە، وەکوو: لم و لیتەی دەرمانی کەناری دەریاکان، کانی با و ئاوە شەفابەخشەکان (گراو، ئاوی گەرم و کانزاوی)، دیمەن و بەرژەوەندی ڕەنگاوڕەنگ لە سروشتی کوێستان و بیابانەکان، کەش و هەوای جۆراجۆر لە یەك وەرزی ساڵ، هەروەها شوێنەوارە ڕۆشنبیری و مێژوویەکانی ناوخۆی ئێران کە هەموو دەتوانن هەلێکی باش و شیاو بن بۆ ڕاکێشانی گەشتیاریی تەندروستی. خۆشبەختانە ئێستاکە لە هەندێ زانکۆکانی تاران و شارەکانی دیکە نووسینگەی فەرمی گەشتیاریی تەندروستی دامەزراوە. ئەو نووسینگانە زەمینەیەکی لەبار دەڕەخسێنن بۆ پەرەپێدانی بواری گەشتیاری دەرمانی تەندروستی و چارەسەری خۆماڵی و مێژوویی ئێرانی.

### پێکەوبوونی سروشت دەرمانی و پزیشکی خۆماڵی لە ئێران

یەکێ لە لقەکانی گەشتیاریی تەندروستی، سروشت دەرمانیە. لقی سروشت دەرمانی زۆرتر پاڵ ئەدات بە تایبەتمەندیەکانی کەش و هەوا و دیمەنە جیاوازەکانی شاخ و دەشت و

بیابانەکانەوە. یەکێك لە سەرچاوەکانی سەرەکی سروشتدەرمانی، کانی گراو و کانزاوەکانە. ئەورۆکە کەڵك وەرگرتن لە ئاوە گەرمە کانزاییەکان بۆ دەرمان و چارەسەری نەخۆشیەکان لە بواری پزیشکی هاوچەرخ و پزیشکی تەواوکاری پێگەیەکی گرینگ و بەرزی هەیە. لە زۆربەی وڵاتان بابەتی کانی و سەرچاوکەی ئاوی گەرم یا گەرمی کانزایی، پشك و بەختێکی گونجاوە بۆ ڕاکێشانی گەشتیاران بەتایبەت گەشتیارانی تەندروستی. وڵاتی ئێران بانتر لە ٤٥٠ سەرچاوەی ئاوی گەرمی کانزایی هەیە کە خاوەنی دەیان مادەی سوودبەخشی دەرمانی و چارەسەرییە بۆ نەخۆشی و کێشە تەندروستیەکانی مرۆڤ. جیا لەو کانی و ئاوانە، لیتە و لمی کەناری دەریاچەی ورمێ و داوێنی چیای تەفتان لە بەلووچستان، ئەویش بابەتێکی دیکەی سروشتدەرمانیە. هەروەها بژوێن و سەیرانگا خۆشەکان کە ساڵانە خەڵکێکی زۆر ڕووی تێ دەکەن و دەحەوێنەوە و وچانێکی ڕۆحی وەردەگرن و بووەتە وچانگە و دەرمانگەیەکی ڕۆحی و گیانی بۆ مرۆڤەکان.

## دەوا و دەرمان لە ڕێبازی پزیشکی خۆماڵی و سروشتی ئێرانی

لە پزیشکی خۆماڵی کۆنی ئێرانیدا دەرمان بریتیە لە بەرهەمی چارەسەر کردن (ماجووم، مەڵهەم، هەویر، هەنوون، گیراوە، شەربەت، حەب، تۆز، هاڕاوە، خووسان، پلیتە، چایی، و هتد) کە بەگوێرەی ناوەرۆك و دەقی سەرچاوە کۆنە باوڕپێکراوەکانی ئەو ڕێبازە و هەروەها بە ڕەچاوکردنی پێوەرە گشتیەکانی دەرمانسازی هاوچەرخ ساز دەکرێت. پێوەرە گشتیەکانی وەکوو بابەتی گیاناسی (بەرهەمی گیایی)، کانزاناسی (بەرهەمی خاکی و کانزایی)، زیندەوەرناسی (بەرهەمی ئاژەڵ، پەلەوەر و مێروو)، چاندن، بەخێوکردن، کۆکردنەوە، وشك- کردن، هاڕانەوە، گرتنەوە، ڕۆنگرتن، گوشران، گولاج کردن، قوتووکردن و هەڵگرتنی دەرمانەکان.

دەرمانسازی لە ڕێبازی پزیشکی خوماڵی ئێرانیدا زۆرتر لە سەر بنەمای پۆلێنبەندی مەزاجی مرۆڤەکان و ڕێژەی چەندی و چۆنی خەڵتەکان (سەودا، بەڵغەم، خوێن و زەرداو) بنیات نراوە، هەروەها هەلومەرجی ڕێژەی توندی و هێمنی نەخۆشی، کاتی نەخۆشی، ژن یا پیاو، تەمەن، ئەندامی جەستە، وزەی جەستە و ورەی دەروونی، کار و پیشە، ژینگەی نەخۆش و خۆ و خدەی نەخۆش، ئەمانە هەموو کاریگەری دائەنێت لەسەر شێوازی گرتنەوە و ڕێکخستنی دەرمان، ڕێژەی بەکارهێنان و ژەمەنی خواردنی دەرمانەکە. کەواتە ڕادەی هاوکاری و یاریدەی نێوان نەخۆش و پزیشك لە ڕەچەتەی چارەسەریی پزیشکی خۆماڵیدا

گەلێك پێویستە و ناكرێت پشتگوێ بخرێت.

بەگوێرەی ڕێبازی پزیشکی خۆماڵی ئێرانی نەخۆش واتا گۆڕان و لادانی مەزاج لە ڕێچکەی سروشتی خۆی و دەرمان و چارەسەریش یانێ هەوڵدان بۆ ڕێکخستنەوە و خستنەوە سەر ڕێی سەرەکی مەزاجی نەخۆش. کەواتە ئامۆژگاری حەکیمان و پزیشکانی ئەو ڕێبازە ئەوەیە پاراستنی تەندروستی و ڕێکارەکانی خۆپاریزی بخرێتە پێش دانانی ڕەچەتە و چارەسەری و نەشتەرگەری. هەروەها بەردەوام بە نەخۆش و کەسانی هاوڕێی ڕادەسپێرن هەلومەرجی ژیان و ژینگەی نەخۆش، شێواز و جۆری خواردن، باردودۆخی دەروونی ـ ڕەوانی، چالاکی جەستەیی و پشوودان و هتد، لەبەرچاو بگیرێت و هەوڵ بدرێت نەخۆش بەرەو یەکسانی و هێور کردنەوەی مەزاج و سروشتی دەروونی بڕوات تا ئاستی یەکسانی مەزاج و خەڵتەکانی نەشێوێت.

خاڵێکی دیکە لە ڕێبازی پزیشکی خۆماڵی ئێرانی گرنگیدان بە ریزبەندی بنەڕەتی دەرمان و چارەسەرییە: چارەسەر بە یارمەتی بەکارهێنانی خواردن و چێشت، دەرمانی تاك و ساکار (ادویه مفرده)، دەرمانی تێکەڵی سادە و دواجار دەرمانی تێکەڵ کە کاریگەری بەهێزی هەیە. بۆ گرتنەوەی دەرمان لە ڕێبازی پزیشکی خۆماڵی سەرەڕای شێواز و چۆنیەتی و چەندیەتی دەرمان پێویستە دەرمانساز دڵنیا بێت لە پێناسەی دروست و بژاردەی دەرمانە تاکەکان واتا ڕوەکێکی دەرمانی بەکار دەهێنێت بە جوانی و چاکی بیناسێت و لە ناوەرۆك و ڕواڵەتی ئەو دەرمانە ئاگەداری تەواوی بێت. ئەوڕۆکە هەموو پسپۆڕانی پزیشکی و تەنانەت خەڵکی ئاسایی بەوە گەیشتوون کە بەکارهێنانی دەرمانە خۆماڵی و سروشتیەکان زیانی لاوەکیان کەمترە و هاوکات بۆ چارەسەری چەند نەخۆشی بەکار دەهێنرێت.

**پێوەرەکانی دەرمانسازی هاوچەرخ بۆ دروستکردنی دەرمان لە پزیشکی خۆماڵی:**

١) توێژینەوە و شیکاری شوێنی ڕوانی ڕوەکەکان و بەهای ئابووری دەرمانە تاکەکان بە تایبەت ڕوەکە پزیشکیەکان لە سنووری ناوخۆی ئیران تا وەکوو هاوکاری نێوان وەزارەتەکانی تەندروستی، کشتوکاڵ، بازرگانی و گەشتیاری پەرەی پێ بدرێت. بۆ نموونە بەشێکی زۆر لە سەرچاوەی دەرمانە ڕوەکیەکان وەکوو گوڵەباخ، عەناو، جاترە و ڕازیانە لە ئێرانەوە هەناردەی هێندوستان دەکرێت و هەلێکی بەربلاوە بۆ هەموو وزارەتەکان لەو بوارەدا.

٢) پشکنین، دۆزینەوە و دانانی ریزبەندی ڕوەکە گرینگەکان لە قۆناغی چاندن،

بەخێوکردن، کۆکردنەوە و بەستەبەندی ڕووەکە پزیشکیەکان بەپێی فرمۆلەیشێنی دروست تا وەکوو هاوکاری نێوان وەزارەتەکانی تەندروستی، کشتوکاڵ، بازرگانی و گەشتیاری پەرەی پێ بدرێت و هەلی کار برەخسێت و زەمینە خۆش ببێت بۆ بەرزکردنەوەی ئاستی کوالێتی دەرمان و بەرهەمی کشتوکاڵی و بەتایبەت دەرمان و بەرهەمی ئۆرگانیکی و پاکژ و تەندروست. چونکە ڕۆژبەڕۆژ لایەنگرانی بەشی دەرمانی سروشتی، پاکژ و ئۆرگانیك زۆرتر دەبێت. کەواتە پێویستە زۆر بە وردی لە هەموو قۆناغەکانی چاندن تا وەکوو قوتووکردن و گرتنەوە هەوڵ بدرێت هەموو زانیاری و پێداویستیەکانی بەرهەم و دەرمانەکە دروست و ڕاستبینانە بێ و پیناسەیەکی تۆکمە بۆ هەموو دەرمانەکان ڕێك بخرێت تا متمانەی تەواو لە هەنارده و هاوردەی جیهانیدا مسۆگەر بکات.

٣) هەوڵ بدرێت نموونەی خزمەتگوزاریە پزیشکی و خۆراکیەکان لە ڕێکار و ڕەچەتەکانی پاراستنی تەندروستی و خۆپاراستن لە نەخۆشی بە هەموو ناو و ناونیشانی چارەسەری پزیشکی خۆماڵیەوە بخرێتە بەر دیدی خەڵك. تا وەکوو خەڵك ڕوو بکەنە بەکارهێنانی ئەو خواردەمەنی و خواردنەوە سوودبەخش و پاکژ و تەندروستانە و ئارەزووی خواردنی خۆراك و ساردەمەنیەکانی پیشەسازی و پڕ لە مەوادی زیانبەخش کەم بێتەوە و بەو شێوەیە زەمینەیەکی خۆش و لەبار مسۆگەر بێت بۆ گەشە و بەرهەمهێنانی بەرهەمەکانی خۆراك و خواردنەوەکانی خۆماڵی.

٤) توێژینەوە و خوێندنەوە لە خۆراك و دەرمان و مەوادی جوانکاری بەگوێرەی ڕێبازی پزیشکی خۆماڵی ئێرانی بۆ جێگیرکردن لە ڕێکخستنی دەرمان و خۆراکسازی هاوچەرخ

**بەرهەمهێنان و خستنەبازاڕی بەرهەمەکانی دەرمانی پزیشکی خۆماڵی:**

* **بەرهەمهێنانی دەرمان:** پێویستە بۆ دروستکردنی دەرمان مۆڵەت و یاساکانی ئەنجومەنی باڵای پزیشکی خۆماڵی لە وزارەتی تەندروستی ڕەچاو بکرێت. سەرەتا بە نامە و داواکاری نموونەی بەرهەم ڕادەستی ئەنجومەن بکرێ. پاش وەرگرتنی مۆڵەتی ئەنجومەن دەبێ کۆمیسیۆنی یاسایی دروست کردن و هاوردە کردنی ڕێکخراوەی دەرمان و خۆراکی وەزارەتی تەندروستی پێداچوونەوەی کۆتایی بە دەرمانەکەدا بکا تا پشتگیری وزارەتیش بە دەست بهێنێ. شایانی باسە ئێستاکە دەیان دەرمانی خۆماڵی و سروشتی مۆڵەتی بەرهەمهێنان و خستنەبازاڕیان لە ئەنجومەن و کۆمیسیۆنی ناوبراودا وەرگرتووە. بۆ بەدەست هێنانی بەرهەمی ستاندارد و دەرمانی پڕکاریگەر پێویستە پێوەرەکانی خوارەوە لەبەر چاو بگیردرێت:

١) دیزاین و داڕشتن و بەکارخستنی ئامێر و کەرەستە تایبەتیەکانی بەرهەمهێنان و

گـرتنەوە و پێچـانەوەی حەب، گـولاژ، ئاوتـك، شـیلە، ڕۆن، بـۆن، تامـاو، و هتـد، بەپێـی چوارچێوەکانی پیشەسازی سەردەم بێت.

٢) بۆ بەدەست هێنانی متمانە و بەها و برەوی دەرمانەکانی پزیشکی خۆمـاڵی بەرامـبەر بە پزیشکی هاوچەرخ، پێویستە خزمەتگوزاری ئەو دەرمانانە لە تاقیکاریەکـانی پەرسـتاری و خەستەخانەییدا دەربچێت.

٣) ئەگەر بۆ پێشکەوتن و پەرەپێـدانی زیـاتری ڕێبـازی پزیشـکی خۆمـاڵی هزرمەنـد و هەسـتەوەرانە هەڵسـوکەوت بکەیـن و لە پرۆسـەی کشـتوکاڵی، کـێڵگە، دروسـت کـردن، گرتنەوە و پێچانەوەی دەرمانەکاندا ئەوپەڕی دڵسۆزی خۆمان بەرامبەر بە نیشـتمان نیشـان بدەین بەتایبەت بۆ ئەو بەرهەمانە کە نموونە و هاوچەشنی بیانیان نیـیە خزمەتێکـی گەورە پێشکەشی ئەو کەلتوور و شارستانیەتە تەندروستیە دەکەین.

* **پیشاندان و خستنەبازاڕی دەرمان:** بۆ فرۆشتن و برەوپێـدانی دەرمـان جیـا لە ناوەنـدەکانی چارەسەرگە و دەرمانخانەی سەر بە زانکۆکانی پزیشکی خۆماڵی، دەکرێت کەرتی تـایبەتیش هان بدرێت کە بەپێی یاسا و ڕێنماییەکانی ئەو بـوارە دەسـت بـکەن بە کـار و چـالاکی لە پیشاندان و فرۆشتن و برەوپێدانی ئەو بەرهەمانە.

* **ئامادەکردن و ڕێکخستنی دەرماننامە:**

١) ڕێکخراوەی خۆراك و دەرمـانی وەزارەتـی تەندروسـتی و زانکـۆی پزیشـکی خۆمـاڵی تاران خەریکـی ئامـادەکردن و ڕێکخسـتنی دەرمـان‌نـامەی تـایبەت بەو بـوارە پزیشـکیەیە. ناوەرۆکی ئەو دەرمان‌نامەیە داگری چەندین بابەتە، وەکـوو: پێناسـە و ناسـاندنی دەرمـان و پێکهاتەکان، لایەنەکانی بەکارهێنان، شێوازی ڕەچەتەکردن، کارتێکردن و کاریگەری مـادەی دەرمان، دەرهاویشتە و زیانی لاوەکی، کارتێکەریەکانی لەگەڵ دەرمانەکانی دیـکە و گەلێـك مـژاری دیـکە. کەواتە پزیشـکان و دەرمانگەرەکـان دەتـوانن بە بەرچاوڕۆشـنی زۆرتـرەوە دەرمانەکان بدەن بە نەخۆشەکانیان و ڕەچەتەی بنووسن.

لە دروستکردنی دەرمانەکان پێویستە ستاندارد و زەمیـنەی بنەڕەتـی دروسـت، مـادەی بنەما و سەرەکی فرمۆلەیشنەکان دیاری بکرێت و بۆ هەرکام لە پێکهاتەکانی دەرمانی تاك و تێکەڵ پێناسەی ورد و دروست ڕێك بخرێت. بۆ نموونە پێناسەی دروسـتی دەرمـانی تـاکی خەیارچەمەر پێویسـتە کەلووەکـانی خەیـارچەمەر گەیشـتوو بێـت و کرمـۆڵ و پـووچەڵ و کەڕووواوی نەبێ. یا لە گیراوەی دەرمانی تورەنجەمین و ڕۆنی زەیتوون بۆ چارەسەری قەبزی بە هەمان شێوە پێویستە هەر دوو مادە خاوێن، بێخەوش، گەیشتوو، تەندروست و پـاکژ لە

ژەهر بێ. هەروەها ڕێژەی خەڵت و تڵتی زیادەی ناو دەرمانەکان، دەستنیشانکردنی پێوەرێك بۆ جیاکردنەوەی مادە و دەرمانی ساختە، دانانی شێوازەکانی شیکاری و ئەنەلیزی فیزیکۆکیمیکاڵ (ڕێژەی خۆڵەمێشی پەتی مادە، خۆڵەمێشی نەتواوە لە ناو مادەی ترش، ڕێژەی PH و هتد) بۆ دەرمانی ستانداردی تاك و تێکەڵ لەبەرچاو بگیردرێت. خاڵی گرینگ ئەوەیە کە پسپۆڕان و ئامادەکارانی ئەو دەرمان‌نامەیە بەوپەڕی وشیاری و وردبینیی هەموو خاڵە ئاوارتە و گرینگەکانی دەرمانسازی و ڕەچەتەی پزیشکی خۆماڵی ئێرانیان ڕەچاو دەکەن. بۆ نموونە مەبەست لە تاڵیشاری زەرد (صبر) لای حەکیمانی کۆن لەگەڵ جۆری تاڵیشاری ئەوڕۆ جیاوازە. بۆ ئاسانکاری لە دۆزینەوەی مەبەستی سەرەکی پەرتووکی حەکیمانی کۆنی ئەو بوارە بۆ دابین‌کردنی مادەی دەرمانی خۆماڵی (ڕوەکی، حەیوانی و کانزایی) دەبێ شوێنی سەرەکی ئەو مادەیە لە پەرتووك و ئاسەواری پزیشکانی کۆنی ئێرانیدا بدۆزینەوە. [بۆ نموونە لە کتێبی قەرابادین کاتێ باس لە دەرمانەکان دەکات جۆری ئەسڵ و نائەسڵ یا شوێنی ڕوان و بەرهەم‌هێنانی دەرمان نیشان ئەدات.]

٢) بەپێی ڕێکەتنامەی نێوان یاریدەدەری زانست و تەکنەلۆژیای نووسینگەی سەرۆك-کۆماری و ئەنجومەنی پێداچوونەوە و داڕشتنی دەرمانە سروشتیەکانی ئێران، دەرمان‌نامەکە بەجۆرێك ئامادە و ڕێك خراوە کە زۆرتر ئاماژە بە جۆرەکانی ڕوەکی ئێرانی کراوە [جۆرەکانی ئێندمیکی فلۆرای ئێران و ئەوانەی لە خاکی ئەو وڵاتە شین دەبن]. بۆ ئەوەی پرۆسەی بەرهەم‌هێنانی دەرمان لە ڕێبازی پزیشکی خۆماڵی ئێرانیدا زیاتر پێش بکەوێت و شانازی زۆرتر مسۆگەر بکات بۆ خەڵکی ئێران.

**بەرنامەی هەرزانسازی خزمەتگوزاری دەرمان و چارەسەری لە پزیشکی خۆماڵی:**

١) بیمەدار کردنی هەموو ئەو دەرمانانە کە ستاندارد و پێوەری دروستی بنەمای دەرمانسازی و ئەنجومەنی پزیشکانی ئێرانیان هەیە. ساڵی ٢٠١١ بۆ یەکەم جار چەتری بیمە ٥٦ دەرمانی ستاندارد و پێوەرداری وە ئەستۆ گرتووە. کەواتە ئیدی نەخۆشان بە ئاسانی و هەرزانی دەتوانن بە دەستی بهێنن.

٢) پشتگیری و پشتیوانی لە بەرهەم‌هێنانی ئەو دەرمانانە لە هەموو بەشەکانی کشتوکاڵ و پیشەسازی

٣) ڕێکخستن و گشتاندنی سەرجەم ڕێنمایی و پێڕەونامە پێویستەکان بۆ پرۆسەی بەرهەم‌هێنان، پیشاندان و خستنە بازاڕی دەرمانەکان

٤) زەمینەسازی ڕۆشنبیری، میدیایی و فەرهەنگی بۆ بەکارهێنانی ئەو دەرمانانە

**پۆلێنبەندی و سنووری کاروباری پیشەوەران لە پزیشکی تەواوکاری و پزیشکی خۆماڵی ئێرانی**

بەگوێرەی پێڕەونامە و یاسای گشتی پزیشکی کۆن و نەتەوەیی ئێران کە لە وەزارەتی تەندروستی و زانکۆکانی پزیشکی ئەو وڵاتە کە چەندین جار پێداچوونەوە و پەسەند کراوە و لەگەڵ یاسا گشتیەکانی ڕێبازی پزیشکی خۆماڵی و نیشتمانی نەتەوەکانی دنیا ڕێك خراوە، ڕیزبەندی و پۆلێنێك بۆ سەرجەم بوارەکانی دانراوە تا شان لە شانی ڕێبازی پزیشکی سەردەمیانە بدات و کەم بایەخ نیشان نەدرێ و بنەڕەتیانە و ژیرانەتر دەربکەوێت.

١) **ڕوەکزان**[1]: بە کەسێك دەوترێت کە دوو تایبەتمەندی پسپۆڕی هەبێت: دەرمانناسی و کۆکردنەوەی دەرمانی ڕوەکی. بە گشتی سەرجەم جۆری ڕوەکە دەرمانیەکان دەناسێت و دەتوانێت بڕواتە ناو سروشت کۆیان بکاتەوە یا بۆی کۆ بکەنەوە. پێویستە ئەو کەسە بتوانێت لانیکەم سەد دەرمانی تاك (ادویه مفرده) هەم ڕوەکی، کانزایی و هەم حەیوانی لە ئاستێکی شیاودا بناسێت، هەروەها ناوچە و شوێنەکانی شینبوون و دابینکردنی ئەو سێ سەرچاوەیە لە سروشت و کاتی کۆکردنەوە و شێوازی وشككردنەوە و هەڵگرتنیان بزانێت.

٢) **عەتار**[2]: بە کەسێك دەوترێت کە پیشەی فرۆشتنی ڕەگ و لاسك و گوڵ و بەرهەمە لاوەکی و سەرەکیەکانی ڕوەکە دەرمانیەکانە. بەپێی ئاست و پێگەی زانیاریە بیرۆکەیی و کردەییەکانیان، عەتارەکان بە دوو دەستە دابەش دەکرێن:

* **عەتاری وردەواڵەفرۆش**[3]: ئەو کەسە تەنیا دەرمان و ڕوەکەکانی عەتاری دەفرۆشێت و چەشنی دووکاندارێکی ئاساییە و شوێنەکەی دووکانە نەك دەرمانخانە و دەرمانگا.
* **عەتاری شارەزا**[4]: ئەو کەسە سەرەڕای فرۆشتنی دەرمان و ڕوەکەکانی عەتاری، و لە بواری سوودە پزیشکیەکانی دەرمانی تاك و تێکەڵ و هەروەها لە لێکەوتەی خراپ و زیانی لاوەکی دەرمانەکان شارەزایی هەیە. ئەو کەسەی بڕوانامەی عەتاری شارەزا وەردەگرێ پێویستە تایبەتمەندی و سوودی پزیشکی دەرمانە ناسراوەکانی تاك و تێکەڵ بزانێ تا وەکوو لە وەڵامدانەوەی کڕیار و نەخۆشەکان شارەزایانە تایبەتمەندیەکان و زیانە لاوەکیەکان ڕوون بکاتەوە. بەو جۆرە نەخۆش و کڕیارەکان ئاگەدار دەکرێنەوە چی وەردەگرن، چی دەخۆن و لەگەڵ بەکارهێنانی ئەو دەرمانە، چە گۆڕانکاریەك بەسەر

---

١. گیاەچین، گیاەشناس، عشاب، حشاشی، حشاش، شجار و نباتی
٢. عطار
٣. سقط فروش
۴. عطار خبیر

تەندروستی و باری گشتی جەستە و ڕەوانیاندا دێت.

[پیشەکانی خوارەوە پاش ئەوەی بە چاوەدێری و سەرپەرستی حەکیمی ناسراو یا بنکەی پەرەپێدانی ڕێبازی پزیشکی خۆماڵی و نەتەوەیی ئێرانی و لە خولەکانی ئەو بوارەدا بەشداریان کرد و لە ئاستی بەرزدا بڕوانامەیان وەرگرت بۆیان هەیە نۆرینگە و دەرمانخانەی تایبەتی خۆیان بکەنەوە. خاڵی گرینگ ئەوەیە سەرجەم ئەزموون و زانستەکانی بواری پیشەیی ئەو پزیشکییە بەگوێرەی بنەماکانی ناو دەقە باوڕپێکراوەکانی پزیشکی ئەو ڕێبازە بێت. ئەوانەی لەو بوارەدا بڕوانامە وەردەگرن، بۆیان هەیە بەشداری وەرگرتنی ئەم هەل و پشکانە بکەن: دەتوانن لە نۆرینگەی پزیشکان، خەستەخانە و بنکەکانی تەندروستی شار و گوندەکان دابمەزرن، قەرز و یارمەتی بانکی بۆ گەشەپێدانی کارەکەیان لە حکوومەت وەربگرن و بۆیان هەیە خولی فێرخوازی و ڕاهێنانی شێلان و مشتوماڵ بکەنەوە.]

٣) **وەستای شێلان**[1]: بە کەسێك دەوترێت بە گوێرەی بنەماکانی زانستی و ئەزموونی پزیشکی خۆماڵی ئێرانی کاری شێلان، دەستپێدا هێنان و مشتوماڵ ئەنجام دەدات. ئەو پیشەیە لە زاراوەی پزیشکی خۆماڵیدا بە (تدلیك) دەناسرێتەوە.

٤) **وەستای کەڵەشاخ**[2] **و خوێنبەردان**[3]: بە کەسێك دەوترێت بەپێی هەموو ڕێنمایی و بنەماکانی پزیشکی خۆماڵی ئێرانی و هەروەها ڕەچاو کردنی ڕێنماییەکانی گشتی و چاوەدێری تەندروستی سەردەم کاری کەڵەشاخ و خوێنبەردان ئەنجام ئەدات. ئەو کەسەی کاری جۆرەکانی کەڵەشاخ (وشك و تەڕ) و خوێنبەردان دەکات کاریگەری و بواری تەندروستی و بەکارهێنانی کەڵەشاخ و خوێنبەردان لە سەر جەستە ئەزانێت و شارەزایی تەواوی هەیە و ڕێنمایی و بنەماکانی پزیشکی ئەوڕۆ لە بواری تەندروستی خوێن ڕەچاو ئەکات.

٥) **جوانکار**[4]: بە کەسێك دەوترێت بەپێی هەموو ڕێنمایی و بنەماکانی پزیشکی خۆماڵی ئێرانی و هەروەها ڕەچاو کردنی ڕێنماییەکانی تەندروستی سەردەم، کاری ئارایشتی موو، پێست و جوانکاری جەستە بکات. پێویستە جوانکار کاریگەری و بواری تەندروستی و بەکارهێنانی هەرکام لە بەشەکانی ئەم کارە لەسەر جەستە بزانێت و شارەزایی تەواوی

---

١. مدلک

٢. حجام

٣. فصاد

٤. مزین

هەبێت و ڕێنمایی و بنەماکانی پزیشکی ئەوڕۆ لە بواری تەندروستی پێست و مـوودا ڕەچـاو بکات.

٦) **شکستەبەند**[١]: بە کەسێك دەوترێت کە بەپێی هەموو ڕێنمـایی و بنەماکـانی پزیشـکی خۆماڵی ئێرانی و هەروەها ڕەچاو کردنی ڕێنماییەکانی تەندروستی ئەوڕۆ، کـاری گـرتنەوە و گیرساندنەوەی ئێسکی شکاو و لەجێچوون ئەنجام بدات.

٧) **درمـانگەری خۆمـاڵی**: بە کەســێك دەوترێــت کە ســەرجەم شــێوازە دەرمــانی و چارەسەریەکان کە سینەبەسینە لە حەکیمان و ئەزمووندارانی خۆماڵی ناوچە، هۆز یـا گونـد هاتووە، وەریگرتووە و بە کـاری دەهێنێـت. شـوێنی ئەو کەسـانە زۆرتـر لای گوندنشـینانە، بەتایبەت گونـدە دوورەدەسـت و نـاوچە شـاخاوییەکان کە ڕێـگەی پێوەنـدییان بە شـار و دەرمــانگە فەرمیەکـانەوە دوورە و چەنـد مانـگ لە چـوار وەرزی سـاڵ بەدژواری دەتـوانن هاتوچۆی شار و بنکەکـانی تەندروسـتی بـکەن و خزمەتگـوزاری فەرمـی پزیشـکییان وەك پێویست پێ ناگات.

٨) **وەسـتای بـینبەردان**[٢]: بە کەســێك دەوترێــت کە بەپێــی ئەو ڕێکــار و ئەزموونــانەی سینەبەسینە لە پێشینیانی حەکیم و پسپۆڕی ئەو بـوارەوە پێـی گەیشـتووە بینـی گیـراوی منداڵی ساوا دەکاتەوە. وەستای بینبەردان لە فارسیدا بە "تـول‌گیـر" دەناسـرێت. "تـول" بە شتێ ورد و بچووك دەگوترێت. منداڵان کاتێ دەست بە خـواردنی چێشـت و میـوە دەکەن هەندێ جار بەهۆی ڕانەهاتن بە جوین و قووتدان دەنکەوردە و تیتـۆڵی نـان و خـواردن لە بینیان گیر دەکات و دەبێـتە هـۆی تـا و لەرز، بـێخەوی، دەنـگ‌گـۆڕان، گریـان و دەسـت کێشانەوە لە خواردن. زۆرتر منداڵانی نێـوان یەك تـا ٥ سـاڵان تووشـی بـین‌گیـران دەبـن. [بەپێی ئەزموونی حەکیمانی کوردەواری، یەکێ لە نیشانە بەرچاوەکانی ئەو کێشـەیە ئەوەیە منداڵ بەردەوام پشتە دەستی دێنێت بە دەم و لووتیـدا و هەسـت بە بێـزاری دەکـات. جـا دەرمانگەری بـینبەردان زۆر بە ئاسـانی زاری منـداڵەکە دەکـاتەوە و بە هێواشـی تەوژمێـك ئەداتە قوڕگی منداڵەکە و وردە شتەکە دەر ئەکێشێت یا پاڵی پێوە ئەنێـت بـۆ خـوارەوە یـا دەمی دەگرێت و پفێك ئەکات بە لووتی منداڵەکە و ورکەکە فڕێ دەداتە خوارەوە.]

٩) **وەسـتای کەهەنـگ** بە کەســێك دەوترێــت کە بەپێــی ئەو ڕێکــار و ئەزموونــانەی

١. مجبر
٢. تول‌گیر

سینەبەسینە لە پێشینیانی حەکیم و پسپۆڕی ئەم بوارەوە پێی گەیشتووە گیراوی و جەمامی ڕەگ و ماسوولکەکان بەر ئەدات. [یەکێك لە پیشە تایبەتەکانی ڕێبازی پزیشکی کوردەوارییە و تەنیا لە کوردستاندا هەیە. تەنانەت وشەی کەهەنگ بۆخۆی وشەیەکی موکریانیە و لەو ناوچەیە دەبیسترێت. وەستا بەناوبانگەکانی کەهەنگ لە مەهاباد قادر ئاغای شەختان، عەودڵا چاوڕەق و بلە لاچینی بووە.]

١٠) **وەستای ناوکگرتنەوە:** بە کەسێك دەوترێت کە بەپێی ئەو ڕێکار و ئەزموونانەی سینە بە سینە لە پێشینیانی حەکیم و پسپۆڕی ئەو بوارەوە پێی گەیشتووە و کاری جێ خستنەوەی ناوکی مرۆڤەکان دەکات. [یەکێك لە پیشە تایبەتیەکانی ڕێبازی پزیشکی کوردەوارییە و زۆرتر لە کوردستان و ناوچەکانی زاگرۆس بەرچاو دەکەوێت. لە کوردەواری چەندین شێواز بۆ جێ خستنەوەی ناوك هەیە. ئەوڕۆکە توێژەرانی ئێرانی بۆ دۆزینەوەی سەرچاوەی کۆن و پاڵپێوەدانی ناوكگرتنەوە بە ئەزموونی نەتەوەیی ئێران، دەستیان بە توێژینەوە و نووسینی وتار کردووە و بە "نافدررفتگی" و "سقوط السره" ناوی دەبەن.[1]]

١١) **حەکیمی ئێرانی یا پسپۆڕی پزیشکی خۆماڵی:** بە کەسێك دەوترێت لەسەر پێشینەی لێزانی پێشینان خاوەنی ئەزموون و زانیاری شیاوی پزیشکی بێ و خەڵك لەسەر دەستی چارەسەر بوون و چاك بوونەتەوە و ناو و ناوبانگی بە دوور و نزیکاندا بڵاو بووەتەوە. ئەو کەسانە ئەگەر لە تاقیکاریەکانی پزیشکی خۆماڵی بەشداری بکەن دەبێ نمرەی قەبووڵی شیاو وەربگرن. جیا لەوە کەسانێك بەگوێرەی یاسا و پێڕەونامەکانی زانکۆی پزیشکی خۆماڵی و هەروەها خوێندنی وانە و پەرتووکەکانی ڕێبازی پزیشکی خۆماڵی خوێندنی پسپۆڕی ئەو بوارە تەواو دەکەن بە حەکیمی ئێرانی دەناسرێن. ساڵانە نووسینگەی پزیشکی خۆماڵی ئێرانی و یاریدەدەری تاقیکردنەوەکانی وەزارەتی تەندروستی تاقیکاری سەرتاسەری وانە و ئەزموون و زاست و بنەماکانی پزیشکی خۆماڵی ئێرانی ڕێك دەخات بۆ ئەو کەسانەی پسپۆڕی شارەزای ئەو بوارەن و بڕوانامەی ئاکادمییان نییە. ئەمانە هەر چەند لە ئاستی پسپۆڕانی دەرچووی کۆلێژی پزیشکی خۆماڵیدا نین بەڵام دەتوانن چەشنی پسپۆڕی پزیشکی خۆماڵی (نە پزیشك) لەو بوارە خزمەتگوزاری خۆیان پێشکەش بکەن. بڕوانامەی ئەو پسپۆڕانە پێویستە لە لایەن ئەنجومەنی وردبینی و پێداچوونەوەی پسپۆڕانی بێ بڕوانامە پشتگیری بکرێت.

١. بۆ نموونە سەردانی وتاری "بررسی دررفتگی ناف از منظر طب سنتی ایران" بکە کە پزیشکانی بەشی "طب سنتی" زانکۆی پزیشکی شەهید پزیشکی تاران نووسیویانە. [سەرچاوە: گۆڤاری طب سنتی اسلام و ایران، ساڵی ٧، ژمارە ١، ١٣٩٥]

**ڕیزبەندی کارە ئەنجامدراوەکان بۆ ڕێبازی پزیشکی خۆماڵی و سروشتی ئێرانی**

١) بە پێشنیاری سەرۆککۆمار ڕێکەوتی ٢٠١٢/٠٤/٠٩ پاڵپشت بە مادەی ١٢٧ دەستووری گشتی بەیارمەتی جێگری یەکەمی سەرۆککۆمار، جێگری زانستی و تەکنەلۆژیای سەرۆککۆمار، دەستیار و ڕاوێژکاری تایبەتی سەرۆککۆمار، وەزیرانی تەندروستی، هەرەوەزی، کاروباری کۆمەلایەتی، کشتوکاڵ، پیشەسازی و بازرگانی و ٧ پسپۆڕ و شارەزای بواری پزیشکی خۆماڵی دەستنیشانکراو سەرجەم بەرنامە و پرۆژەی گشتی پزیشکی خۆماڵی ئێرانی چووە بواری جێبەجێ کردن.

٢) پەسەندکردن و گشتاندنی پێڕەونامەی گەشەپیدانی پزیشکی خۆماڵی ئیرانی

٣) تەرخانکردنی بوودجە بۆ دروست کردنی ژێرخان و سەرخانی کەرتی فێرکاری، تویژینەوە و چارەسەری و دەرمانی ئەو ڕێبازە پزیشکیە بە هەماهەنگی فەرمانگەی گەشەپێدانی سەرچاوە ئینسانیەکانی سەرۆککۆماری

٤) وەزارەتی تەندروستی پابەند کراوە بە ئەنجامدانی ئەرکەکانی خوارەوە:

* تەرخان کردنی بەشێك لە بوودجەی تەندروستی وزارەت بۆ گەشەپێدان و بەهادار کردنی ڕێبازی پزیشکی خۆماڵی ئێرانی

* پێكهێنانی ڕێکخراوەی پزیشکی خۆماڵی ئێرانی لە ناو وەزارەتی تەندروستی و پەسەند کردنی پێکهاتەی کارگێڕی و یاسایی ئەو ڕێکخراوەیە لە لایەن یاریدەدەری سەرۆككۆمار

* پێكهێنانی ئەنجومەنی باڵای دارشتنی بەرنامە و پلان بۆ پزیشکی خۆماڵی ئێرانی کە پێك هاتووە لە وەزیر و جێگرەکانی و بەرپرسە پێوەندیدارەکان

* پێكهێنانی حیکمەتسەرای (خانەی حەکیمان) سەر بە وەزارەتی تەندروستی لە چوارچێوەی تویژینگەی گشتی بووژانەوەی ڕێبازی پزیشکی خۆماڵی ئێرانی

* گشتاندن بۆ جێبەجێ کردنی بەرنامەی بووژانەوەی پزیشکی خۆماڵی ئێرانی بۆ هەموو زانکۆ و کۆلیژە پزیشکیەکانی وڵات

* ئاسانکاری و خێراکاری لە وەرگرتنی فێرخوازانی پزیشکی و دەرمانسازی خۆماڵی لە لایەن زانکۆ پزیشکیەکان، هەروەها تەرخانکردنی پشکی تایبەت بۆ دامەزراندنی پسپۆڕانی شیاو لەو زانکۆیانە و تەرخانکردنی بەرنامەی تواناسازی پسپۆڕانی دامەزراوی ئەو بوارە لە هەموو زانکۆکانی تیپی ١ و ٢

* بەرزکردنەوەی ئاستی فەرمانگەی ڕووەکەدەرمانی و سروشتیەکان لە ڕێکخراوەی

خۆراك و دەرمانی وزارەت بۆ پلەی بەڕێوبەرایەتی تۆمار کـردن و بەرهەمهێنـانی دەرمـان و خۆراك ـ دەرمانەکانی پزیشکی خۆماڵی

* جـێ‌کـردنەوەی بەرنـامە و خزمەتگوزاریەکـانی پزیشـکی خۆمـاڵی ئێرانـی لەپـاڵ ڕێکخستنی پزیشکی هاوچەرخ لە هەموو بنکە تەندروستی و خەستەخانەکان

* زیادکردنی قۆناغی پسپۆڕی پەرەستاری پزیشکی خۆماڵی شانبەشـانی گرینگیـدان بـە Ph.D پزیشکی خۆماڵی

* گەشەپیدانی ناوەندەکانی پزیشکی و دەرمانسازی خۆماڵی بە مەبەسـتی دابـین‌کردنـی پێداویستی ناوخۆ و هەناردە کردنی دەرمانی خۆماڵی بۆ دەرەوەی وڵات

* دانانی خوێندنگەی باڵای بارهێنانی پسپۆڕی (حەکـیم) پزیشـکی خۆمـاڵی ئێرانـی بە مەبەستی دابین‌کردنی مامۆستا بۆ زانکۆ و کۆلیژەکانی پزیشکی خۆماڵی

* پێکهێنانی ئەنجومەنی باڵای هەڵسەنگاندن بـۆ ئەو پسـپۆڕ و حەکیمـانەی بڕوانـامەی پزیشکی خۆماڵی ئێرانیان نییە

* پیـکهێنـانی لیـژنەی هەڵسـەنگاندنی بڕوانـامەی خوینـدنی پزیشـکانی هـاوچەرخ و تەواوکاری لە زانکۆکانی ناوخۆ و دەرەوە بۆ هاتنەناو بواری پزیشکی خۆماڵی

* پێکهێنانی دەستەی پزیشکی خۆماڵی ئێرانی لە هەموو زانکۆکانی پزیشکی هاوچەرخ

* زیادکردنی ژمارەی زانکۆ و کۆلیژەکانی پزیشکی خۆماڵی ئێرانی لە بواری چارەسـەر و دەرمانسازی

* داڕشتن و ڕێکخستنی خولەکانی فێرکاری بە شێوەی بەردەوام و گەشـەپێدانی بـواری فێرکاریی پزیشکی بۆ پزیشکانی دەرچووی زانکۆ و هەروەها بۆ پزیشکانی پـڕۆژەی پزیشـکی بنەماڵە

* ئامـادەکردن و ڕێکخسـتنی سـەرجەم یەکە و وانەکـانی خوێنـدنی پزیشـکی و پیراپزیشکی لە ڕێبازی پزیشکی خۆماڵی ئێرانی. لە قۆناغ سەرەتا زانکۆکانی پزیشـکی تـاران، شەهید بەهەشتی، شـیراز، تەورێـز و مەشـهەد مامۆسـتا و خوێنـدکاران دەتـوانن لەوێ تـا پلەکانی سەرووتریش درێژە بەو خوێندنە بدەن.

* دەرکردنی مۆڵەت و دامەزراندنی لانیکەم ساڵێك یەك کۆلیژی پزیشکی خۆماڵی ئێرانـی لە پارێزگاکان

* داڕشـتن و ڕێکخسـتنی لقەکـانی خوێنـدنی پشـتیوان و پشـتگیر بـۆ گەشـەپێدانی خزمەتگـوزاری پزیشـکی خۆمـاڵی ئێرانـی و خسـتنە بەردەسـتی هەمـوو کەرەسـتە و

پێداویستیەکان بۆ پەرەپێدانی خزمەتگوزاریی هەموو ئاستەکانی خوێندنی باڵای ئێران لە سەرجەم ئاستەکانی پزیشکی خۆماڵی، وەکوو: فلۆشیپە پسپۆڕیەکان، بەرهەمهێنانی دەرمانە سروشتیەکان لە قۆناغی دکتۆرای باڵا، پەرەستاری، تاقیگە، بنکەی شێلان و ماساژ، ناساندنی و دەرخستن و نیشاندانی یەکە دەرمانیە سروشتیەکان، تەندروستی تاکەکەسی و منداڵبوون و بنەماڵە و هاوسەرگیری، بوارەکانی مێژوو و ڕەوشت و خۆراك، هەروەها ناساندن و پەرەپێدانی پزیشکی هۆز و نەتەوەکانی ناوخۆی ئێران

٥) ئەرکی سەرشانی وەزارەتی کاروباری کۆمەڵایەتی و کارە کە ڕێکخراوەکانی بیمە پابەند بکات بۆ هاوکاری و پشتیوانی پسپۆڕانی پزیشکی خۆماڵی و هەروەها بیمەدار کردنی خزمەتگوزاری و دەرمانەکانی ئەو بوارە پزیشکیە

٦) وەزارەتەکانی بازرگانی و پیشەسازی و کشتوکاڵ پابەندن بەوەی ئەرکەکانی خوارەوە جێبەجێ بکەن:

* ڕێکخستنی عەتارەکان و دووکانەکانی فرۆشتنی گیا و گوڵ و بەهارات، هەروەها بە هاوکاری وەزارەتی تەندروستی پەکەیج و پلانێك بۆ پشتگیری و پشتیوانی لایەنەکانی بەرهەمهێنان و گەشەی بواری ڕووەکە دەرمانیەکان ئامادە بکەن.

* دانانی بوودجە بۆ قەرزی درێژخایەن و کورتخایەن و لێخۆشبوونی باج بۆ دانان و گەشەپێدانی: گوندی تەندروستی و ناوەندەکانی گەشەی گەشتیاری و ڕاکێشانی گەشتیاری تەندروستی، ناوەندەکانی چارەسەری تەندروستیبین و ڕاوێژکاری بۆ چاکسازی شێوازی ژیان، هەروەها ناوەندەکانی چارەسەریی ـ توێژینەوەی زانکۆیی و کەرتی تایبەتی ئەو بوارە

٧) بۆ توێژینەوە و بەرهەمهێنانی دەرمان لە بنکەکانی دانش بۆنیان، پێویستە فەرمانگەی یاریدەدەری زانستی و تەکنەلۆژیای سەرۆككۆمار و نووسینگەی گەشەپێدانی توێژینەوەی ڕووەکە دەرمانیەکان و پزیشکی ئێرانی وزارەتی تەندروستی پشتیوانی ڕاستەوخۆ و کاریگەر و فراوانی خۆیان لە کۆمپانیاکانی (دانش بۆنیان) بکەن.

٨) گەشە و برەوپێدانی ڕۆشنبیری پزیشکی خۆماڵی و چاکسازی شێوازی ژیان بە هاوکاری میدیا و ڕاگەیاندنەکان و وەزارەتی ڕۆشنبیری و تەندروستی

# ئەبووحەنیفە کوڕی داوود کوڕی وەنەندی دینەوەری نووسەری "کتاب النبات"[1]

ابوحنیفە احمد کوڕی داوود دینەوەری یەکێك لە زانایـان و گەورەپیـاوانی مێـژووی وڵاتـی ئێران [و کوردستانە. خەڵکی دەینەوەری[2] ناوچەی کرماشان بووە.] لە نێـوان سـاڵەکانی ٨٨٩ – ٨٢٨ زایینی (سەدەی ٣ کۆچی) لە ڕۆژگاری سامانیەکانی ئێراندا ژیاوە و شـارەزا بـووە لە زمـانی عەرەبـی و هێنـدی. مـاڵپەڕی ویکیپێـدیای فارسـی نووسـیویەتی: «ڕۆژهەڵاتناسـی فەڕەنسی، لۆکلیرك، دەڵێت: ئەبووحەنیفە کوردێکە لە تۆرەمەی لەکی دینەوەر و گەورەتـرین گیاناسـی ئەوکـاتەی ڕۆژهەڵات بـووە. زۆر سـەیرە کە ابـن ابـی اصـبیغە باسـی ژیـانی ئەبووحەنیفەی لەبیر چووە. ابن بیطار ناوی ٥٠ ڕووەکـی کە پێشـینیانی ئەوان ئاگایـان لێـی نەبووە لە کتێبی ئەبووحەنیفە وەرگرتووە. چونکە دینەوەری تەنیا تیشکی نەخستووەتە سـەر نووسـین و گێڕانەوەکـانی پـێش خـۆی، بەڵکـوو بـۆ هەمـوو گژوگیاکـان ڕووی لە کێـو و دەشتەکان کردووە و لە نزیکەوە گیاکانی دیتووە و بـاس و شـرۆڤەیانی لە "کتـاب النبـات"

---

١. ئەم وتارە لە گۆڤاری هەگبەی سروشت، ژمارە ١، سلێمانی، ساڵی ٢٠١٧ چاپ کراوە.

٢. دینەوەر ناوی شارێکی کەونارایە لە دەشتێکی پان و بەرینی ٤٠ کیلۆمەتری ڕۆژهەڵاتی کرماشان. دینەوەر لە ڕۆژگاری خەلیفەی دووهەم عومەری کوڕی خەتاب ئاوەدان بووە و لە جەنگی نەهاوەند (٢١ کۆچی بەرامبەر بە ٦٤٢ زایینی) کەوتە دەست موسڵمانەکان. لە سەردەمی موعاویە بە (ماە الکوفە) ناوبانگی بووە، چونکە داهات و باجەکانی دەڕۆیشت بۆ شاری کووفە. دینەوەر لە سەدەی چواری کۆچیدا پایتەختی حکوومەتی خۆجێیی کوردانی حەسەنوویە بووە (حکوومەتی کوردانی ئالی حەسەنوویە لە نێوان ساڵەکانی ٣٤٨ تا ٤٠٥ کۆچی لە بەشێکی بەربڵاوی سنە، هەمەدان، کرماشان، ئیلام و لوڕستان بووە). مێژوونووس حمداله مستوفی لە سەدەی حەوتەمی کۆچی دینەوەر بە شارێکی ئاوەدان و بە کەش و هەوای خۆش و خاوەن بەرهەم و پڕ داهاتی ئاو و گەنم و ترێ باس دەکات. ساڵی ٣٢٠ کۆچی دینەوەر بەشێوەیەکی کاتی دوژمنان کاولی دەکەن و کوردەکان دیسان ئاوەدانی دەکەنەوە. مێژوونووسان باس لەوە دەکەن پاش سەدەی ٧ و ٨ کۆچی بەهۆی بوومەلەرزەیەکی بەهێزەوە دینەوەر بوو بە شارویرانێکی تەواو. ئەورۆکە شوێنی دینەوەری کۆن (تەپۆڵکەی شێخی ئاوا لە گوندی کرتویچی سەرەوە لە بەشی شارستانی سەحنە) لە فەرمانگەی شوێنەوارە مێژووییەکانی ئێران تۆمار کراوە و لەو تەپۆڵکەیە ئاسەواری ژیانی ١١ هەزار و ٨٠٠ ساڵ دۆزراوەتەوە.

نووسیوە. یەکێ تر لە کتێبەکانی دینەوەری، (انساب الاکراد)[١] باس لە بنەچە و خێڵەکانی کوردی کردووە. کتێبە مێژوویەکانی لە نێوان ساڵەکانی ١٨٨٨ تا ١٩١٢ بە تێکۆشانی ڤلادیمیر گیرگاس و کراخکۆفسکی لە شاری لیدنی هۆڵەندا کراوە بە فەرەنسی و چاپ بووە».

بە قسەی زۆربەی نووسەرانی هاوچەرخی دینەوەری و دواتریش، زانیاری ئەوتۆ لەمەڕ ئەو کەڵەپیاوە سەبارەت بە ژیانی لەبەردەستدا نییە. تەنیا زانیاریەکی کورت لە تویێی بەرهەمەکانی ابن ندیم و ابوحیان تەوحیدیدا هاتووە. دواتر هەر باسێك کراوە هەمان قسەی ابن ندیم و ابوحیان تەوحیدیە. سەرجەم قسە و باسەکان لەسەر ژیان و بەرهەمەکانی ئەبووحەنیفەی دینەوەری لە کتێبی (سیر اعلام النباء، چاپی ڕێکخراوی الرساله بەیرووت، بەرگی ١٣، لاپەڕەی ٤٢٢)دا هاتووە. ئەو پیاوە پاش دینەوەر چووەتە بەسرە و کووفە و لەوێ فێری زانست و وێژە بووە. اسحاق سکیت و یعقوب سکیت بە سەرەکیترین مامۆستاکانی دینەوەری دەناسرێن (ابن ندیم، بەرگی ١، بەشی ١، لاپەڕەی ٢٣٨). ئەڵبەت سەردانی شاری ئێسفەهانیشی کردووە و هەم لەوێ و هەم لە دینەوەر بە کاری ئەستێرەناسیەوە خەریك بووە. کەسێك بە ناوی ابن مسبح لە پشت دەستنووسێکی کتاب النبات، ساڵی ٢٨٢ کۆچی بە ساڵی مردنی دینەوەری داناوە (کە ئەمە زۆرتر بە ڕاستیەوە نزیکە). لە لایەکی دیکەوە ابن قطلوبغا (لە لاپەڕەی ٣٨) و زەهەبی دەڵێن: دینەوەری کەسایەتیەکی گەورەی مەزهەبی حەنەفی بووە (یاقووت حەمەوی، بەرگی ١، لاپەڕەی ١٢٤، هەروەها زەهەبی، بەرگی ١٣، لاپەڕەی ٤٢٢). بەگشتی دینەوەری لە بوارەکانی ڕێزمانی عەرەبی، فەلسەفە، ڕووەکناسی، جۆگرافیا، ئەستێرەناسی، هەندەسە و مێژوو کتێبی نووسیوە.

١. ئەگەر ئەم کتێبە بکەوێتە بەردەست توێژەرانی کورد، ئەوە یەکەم کتێب دەبێت کە باسی مێژووی کورد دەکات. دەستنووسێك لەم کتێبە لە کتێبخانەی سەنپترزبۆرگی ڕووسیە هەڵگیراوە و وێنەیەکیشی لە کتێبخانەی خوراسان ناسیە لە تارانە. هاوڕێ خۆشەویستم دکتۆر موحەمەد عەبدولی خاوەنی گۆڤاری دەستنووس و بەڵگەکانی کوردستان لە مەهاباد (کەشکۆڵ) باس لەوە دەکات کە هەوڵی زۆری داوە کۆپیەك لەو دەستنووسە بە دەست بهێنێت، بەڵام بەرپرسانی ئەو کتێبخانە دەڵێن جارێك ناتوانین نیشانی دەرەوەی بدەین. کاك ئەسکەندەر مورادی خەڵکی پاوە توێژەر لە بواری بەڵگە کۆنەکان، دەستنووسێکی لەو انساب الاکرادە لە گوندی بورناج لە دەڤەری بێستوونی کرماشان چاو پێکەوتووە. هەندێ لە پسپۆڕان پێیان وایە ئەم کتێبە هی ئەبووحەنیفەی دینەوەری نییە بەڵکوو نووسەرەکەی نەناسراوە و گوایە دەستنووسەکەی انساب الاکراد کە لە ڕووسیەیە ١٢٣٣ کۆچی ڕوونووسی کراوەتەوە. کەواتە بۆ باسی ئەم کتێبە پێویستە لێکۆڵینەوەی زیاتر بکرێت.

کتێبی (الانواء) بەشێوەیەکی زانستی و پێشکەفتی و (کتاب الانبات)ی بە شێوەیەکی ساکار و شێوەزاری لادێیی زمانی عەرەبی نووسیوەتەوە. ئەو کەڵەپیاوە جیا لە کتاب النبات و چەندین کتێبی تری بیرکاری، مێژوویی (اخبار الطوال) ڕێزمانی و زانستی سروشتی نووسیوە. لە اخبار الطوال باسی مێژووی ئێران و ناوچەکە تا کۆتایی سەدەی ٣ کۆچی هاتووە.

بە بۆچوونی زۆربەی مێژوونووسان گرینگترین بەرهەمی ئەبووحەنیفەی دینەوەری کتاب النباتە. سیووتی (بەرگی ١، لاپەڕەی ٣٠٦) ئەم کتێبە بە بەرهەمێکی کەموێنە و ناوازە دەزانێت. وادیارە ئامانجی دینەوەری لە نووسینی ئەو کتێبە لە پلەی یەکەمدا تیشك خستنە سەر تەوەری زمانی عەرەبی بووە، بەڵام ئەوڕۆکە وەك سەرچاوەیەکی گرینگی گیاناسی سەردەمی کۆنی مێژووی ئیسلامی دەناسرێ (سارتۆن، بەرگی ١، لاپەڕەی ٥٨٦، سزگین، بەرگی ٨، لاپەڕەی ١٦٩). زانایانی بواری قامووس (وەکوو: ابن منظور) و زۆرێك لە پزیشکان (وەکوو: ابن ابی اصیبعە) بۆ نووسینی بەرهەمی خۆیان سوودیان لەو کتێبە وەرگرتووە. هەندێك باس لەوە دەکەن کە ئەو کتێبە تێکەڵەیەك لە بەرهەمی نووسراوی پێشینیان، ئەدەبیاتی زارەکی لادێیی و ئەزموونەکانی خۆیە[1]. لۆکلێر (بەرگی ١، لاپەڕەی ٢٩٨) دەڵێت وێدەچێ کە دینەوەری بۆ نووسینی ئەو کتێبە گەلێك شار و دێ و کێو گەڕاوە تا ناو و شوێنی شینبوونی ڕووەکەکان بزانێت و لە کتێبەکەیدا بینووسێت.

تا ساڵی ١٩٤٧ زایینی هیچ دەستنووسێك لە کتێبی (کتاب النبات) لەبەردەستدا نەبووە. تەنیا ئەوە نەبێت کە لە فهارستی کتێبی زانایانی ئیسلام (وەکوو: ابن ندیم) و ئاماژەی ناو کتێبەکانی دیکەی دینەوەری، خوێنەر و توێژەر ناوی ئەو کتێبەیان زانیوە. ساڵی ١٩٤٧ مامۆستایەکی زانکۆی عوسمانیەی حەیدەرابادی پاکستان (محمد حمیدالله) ٤٠ لاپەڕەی لەو کتێبەی لە توێی کتێبە کۆنەکانی کتێبخانەیەکی شاری مەدینە دۆزیوەتەوە. ساڵێك دواتر، لە کتێبخانەی زانکۆی ئەستەمبوڵ دەستنووسێکی تر لەو کتێبە دۆزراوەتەوە (دینەوەری، ١٩٥٣، بەرگی ٥، پێشەکی بۆرنهارد لوین، لاپەڕەی ١). دوو بەش لە کتاب النبات بە هەوڵی بورنهارد لوین لە ساڵی ١٩٥٣ و ١٩٧٤ ڕوونووسی کراوە و هەروەها مامۆستا موحەمەد حمیدالله کۆکراوەی ئەو بەشانەی لە کتێبەکانی دیکە کەسانی تر لە ئەبووحەنیفەیان وەرگرتووە چاپ کردووە. لە ڕووی ئاماژە و یادداشتەکانی ئەو دەستنووسانە

---

١. بەدڵنیاییەوە ئەبووحەنیفە گەلێك بابەت و ئەزموونی وڵاتی کوردەواری خۆی ئاخنیوەتە ناو کتاب النبات.

و کتێبەکانی تر، وا دەرئەکەوێت کە کتاب النبات ١٠ بەرگی گەورە بووە. لە دەسپێکی بەشی پێنجەم (لاپەڕەی ١) هاتووە: «بەشی هەشتەم لە بابەتەکانی قاضی کوڕی سعید سیرافی».

هەندێ لە باسەکانی کتێبی سێهەم (چاپی ١٩٧٤) بریتیە لە: ئافەت و نەخۆشیەکانی کشتوکاڵی، لەوەڕگاکان و شوێنە تایبەتەکان بۆ لەوەڕاندنی ئاژەڵ، ڕێنوێنیە سوودبەخشەکان بۆ چارەسەری و تیمار و هەتوانی ئاژەڵەکان بەتایبەت بۆ وشتر، باسی کوللە، کارگی دومەڵان، جۆرەکانی جەوی و شیلەی ڕوەکەکان، ئەو ڕوەکانە بۆ دەباغی و خۆشە کردنی کوندە و مەشکە بەکاری دەهێنن، ئەو دار و چیلکانە بۆ ئاورکردنەوە و دەستاور سوودی لێ وەردەگرن، باسی ئاور، خۆڵەمیش و دووکەڵ، ئەو ڕوەکانە بۆ ڕەنگ کردن و ڕەنگرێژی بە کاری دەهێنن، ڕوەکە خۆشبو و بۆگەندەکان، ئەو ڕوەکانە بۆ سیواك و خاوێنکردنەوەی دەم و ددان بەکاری دەهێنن، هەنگوین و هەنگ. هەروەها لە بەشی یەکەمی کتێبی پێنجەمی کتاب النبات باسی کەوان و تیر و تیرهاوێژی کردووە. لە بەشێکی دیکەی کتێبی پێنجەم، باسی ئەو ڕوەکانەی هێناوە وا لە زمانی عەرەبی بە پیتی (الف) تا (ز) دەست پێ دەکەن. لە لاپەڕەی کۆتایی کتێبی پێنجەم، پێڕستی ئەو ڕوەکانە هاتووە کە بە پیتی (س) دەست پێ دەکات و ئاماژەی داوە کە لە کتێبی شەشەم باسی دەکات. بەگشتی دینەوەری لەو دوو بەشەی کتێبەکەیدا باسی ١١٢٠ جۆر ڕوەکی کردووە. لە سەدەی چواری کۆچیدا ابونعیم علی کوڕی حەمزەی بەسری پۆلێنبەندیەك لەسەر کتێبی (کتاب النبات) نووسیوە. هەروەها موفق الدین عبداللطیف بەغدادی کتاب النباتی کورت کردووەتەوە و سەرجەم دە بەرگەکەی لە یەك بەرگدا نووسیوەتەوە.

بەگشتی سەرجەم ئەو کتێبە پزیشکیانەی وا زانایانی موسڵمان لە سەردەمانی زوو نووسیویانە دوو کێشەی گەورەیان هەیە: یەکەم) هەمیشە بە چاوی خواردن یا دەرمانەوە مامەلەیان لەگەڵ گیا کردووە و کەمتر پەرژاونەتەوە سەر باسی گیا و زانستی گیاناسی کە ئەورۆ دەناسرێت و دەخوێنرێتەوە. دووهەم) بەرهەمی پزیشکان و ڕوەکناسانی کۆنی ئیسلامی وەرگیراوێکە لە نووسین و بۆچوونی یۆنانیەکان، بەڵام (کتاب النبات) لاسایی یۆنانیەکانی نەکردووەتەوە. هەر بۆیە بە کتێبێکی ناوازە و ڕچەشکێن دەناسرێت. دینەوەری بۆ نووسینی ئەو کتێبە زۆرتر هەوڵی خستووەتە سەر ئەزموونەکانی خۆی و پێشینیانی وڵاتەکەی و لادێیەکانی وڵاتی عەرەب، نەك وەرگێڕان و وەرگیران لە ڕێباز و کتێبە یۆنانیەکان. [بەگوێرەی دەقی کتاب النبات دیارە کە پاش دامەزراندنی بیت الحکمەی

موعتەسەمی عەباسی هێشتاکە وەرگێرانی زانستەکان لە دەقی یوونانیەوە بۆ عەرەبی لەسەر نووسین و توێژینەوەی گەلانی موسڵمان لەو سەردەمە کاریگەری دانەناوە]. چونکە زۆرتر پەرژاوەتە سەر باسی گشتی ڕوەکناسی (چەشنی گیاناسی سەردەمی ئێستە) و تەنیا باسی دەرمان و تەوەرە جادووییەکانی گیای نەکردووە. لەگەڵ ئەو باسە دەستەواژەی زمانی، هۆنراوە و پەندی پێوەندیداری عەرەبی سەبارەت بە گیا و گوڵی لەو کتێبەدا هێناوە. خاڵێکی تر ئەوەیە وێدەچێ دینەوەری ناچار بووە بۆ کۆکردنەوە و یادداشت کردنی ئەو هەموو زانیارییانە گەشتی زۆر کردووە و بە دەشت و کێوی گەلێك شار و گوندی وڵاتی خۆی و وڵاتانی دەوروبەردا گەڕاوە. چونکە لە زۆر جێگەی کتێبەکەیدا ئاماژەی بە ئەزموونی بیابان‌نشینانی عەرەب کردووە (بۆ نموونە: بەرگی ٥، لاپەڕەی ٢٣، ٢٥، ٢٩ و ٣١).

زیلبربرگ زۆرترین توێژینەوەی لەسەر کتاب النبات کردووە (سزگین، بەرگی ٤، لاپەڕەی ٣٣٨). ئەو پسپۆڕە پێگەی دینەوەری لە بواری ڕوەکناسیەوە لەگەڵ تێئۆفوراست و دیسقوریدۆسی یۆنانی داناوە و هەندێ جار زیاتر لەوان ڕێزی بۆ دینەوەری داناوە و بەرزتریشی زانیوە. هەروەها تۆماس باوری ئەڵمانیش لەسەر ئەو کەڵەپیاوەی کورد گەلێك توێژینەوەی کردووە.

لە ماڵپەڕی (ویکی فقه) هاتووە: ئێستاکە زۆربەی بەشەکانی کتێبی (کتاب النبات) نەماوە و نازانین چی بە سەر هاتووە. عەبدولقادر بەغدادی کتاب النباتی لە ٦ بەرگی گەورەدا دیتوویە. لەو ٦ بەرگە ئەوڕۆ تەنیا بەرگی ٣ و نیوەی بەرگی ٥ دیارە. هەروەها ئێمە نازانین ئامانجی دینەوەری لە نووسینی ئەو کتێبە بە تەواوی چی بووە. چونکە بەشی هەرەزۆری کتێبەکە فەوتاوە و ساڵی نووسین و چوارچێوەی تەواوی کتێبەکە نەماوە. بەرگی سێهەمی لە ١٣ بابەتی گەورە پێك هاتووە. بەگشتی دینەوەری لەو دوو بەشەی کتێبەکەی باسی ١١٢٠ ڕوەکی کردووە.

خۆشبەختانە دەستنووسێکی چاپکراوی کتاب النبات لە کتێبخانەی ناوەندی گیادەرمانی شەفای کوردستان لە شاری سنە هەیە و خوێنەرانی ئارەزوومەند و هۆگر دەتوانن لە نزیکەوە ئەو کتێبە ببینن و کاری لەسەر بکەن. هیوادارم ڕۆژێك بێت ئەو بەرهەمە بکرێتەوە کوردی و خوێنەرانی کوردیش هاوچەشنی عەرەبەکان دینەوەری بناسن. نموونەی یەکێك لە چاپەکانی ئەو کتێبە، ساڵی ١٣٨٦ لە پەخشانگای زانکۆی پزیشکی ئیران لە شاری تاران

چاپی کراوە.[1]

هەندێ لەو کتێبانەی ئەبووحەنیفەی دینەوەری نووسیویەتی (سەرچاوە: الفهرست، ابن ندیم):

* کتاب تفسیر القران، کتاب الانواء، اصلاح المنطق، لحن العامه، حساب الدور و الوصایا، الزیج، کتاب النبات، الجبر و المقابله، جواهر العلم، الرد علی رصد الاصبهانی، الشعر و الشعراء، اخبار الاطوال، کتاب فی حساب الخطائین، کتاب البلدان، القبلة و الزوال، البحث فی حساب الهند، الجمع و التفریق، نوادر الجبر، کتاب الاکراد (انساب الاکراد)

سەرچاوە:

- [(دینوری، ابوحنیفه احمد بن داوود: دانشمند جامع الاطراف ایرانی در قرن سوم) (ماڵپەڕی (دانشنامه جهان اسلام)]
- ویکیپیدیای فارسی، بەرواری وەرگرتن: ١٤ نەورۆزی ٢٧١٧ کوردی، [https://fa.wikipedia.org/wiki ابوحنیفه دینوری]
- ماڵپەڕی ویکی فیڕەقی ئێرانی (کتاب النبات دینوری (http://www.wikifeqh.ir/

١. بڕوانە وتاری "ناساندنی حەکیمانی کوردەواری: ئەبوحەنیفەی دینەوەری"، ئیرەج مورادی، گۆڤاری هەگبەی سروشت، ژمارە ١، سلێمانی، ساڵی ٢٠١٧.

## چارەسەریا کرمانجی یا دەرمانی کوردەواری

گەلێك کە ڕێز لە کەلتوور و نەریت و فەرهەنگە جوان و پەسەندەکانی خۆی نەگرێت، باری نەریتی و ناپەسەندی کەلتوور و نەریتەکانی ئەو گەلە هەڵدەبەزنەوە و بەختی پاڵ پێوە دەنێن بەرەو چاڵی فەوتان و نەمان. بە گەواهیی مێژوو، سنووری دیاریکراوی هەنووکەی کوردستان لە قۆناغێك شوێنی ڕسکانەوەی مرۆڤایەتی بووە. هەروەها دەڵێن پەرەسەندنەوەی چینی مرۆڤایەتی پاش تۆفانە گەورەکە لە کوردستان و داوێنی چیای جوودیدا بووە. کەواتە ئەگەر نەریت و کەلتوورێکی کۆن لەو نیشتمانەدا هێشتا ماوەتەوە ئەوە لە زێڕ و زێو نرخی زیاترە و توێژینەوە لەسەری ئەرکێکی گرانترە و پاراستنی لەبەرترە.

لەدایکبووی لادێم و بە هەوا و نەوای ئاوایی فرچکم گرتووە. وەك دەڵێن بیری منداڵی تیژە، گەلێك قسە و باسی سەردەمانی منداڵی هەیە ئێستاکەش لە گوێمدا جارجارە دەزرینگێنەوە. یەکێك لەو زەنگە زەنگینانە "دووکتەر بان قوولینە"یە. ئاخر خوالێخۆشبووان هەر دوو نەنکم، نەنێ پەریجان و دایەشێ لە چاکردنەوە و کەمکردنەوەی هەندێ لە ئازارەکانی جەستەیی و ڕۆحی ئەوسای خەڵکی گوندی باقلاوای کەلاتەرزان دەستیان هەبوو. خەڵك ڕۆژانە سەردانی ئەو دوو پیرەژنەیان دەکرد و هەر کەس بەجۆرێك (ناوك-گرتنەوە، فریشكگرتنەوە، سەرگرتنەوە، گیراوی بەردان، پشت شێلان، شکستەبەندی، ناودەم هەڵزڵەپیان، دریادان کوانی و لووی گەورە، حەمام کووزەڵە، هەنوون، ماجووم و هتد) داوای چارەسەری و چابوونەوەی دەکرد. بەڕاستی کاری ئەو جۆرە مرۆڤانە لە ڕیزی گەورەترین خێرەکانە بۆ دنیای ڕۆشن و ڕۆژی پەسلان. بەداخەوە هەندێ جار تەنانەت لە کەسانی نزیکی ئەو شۆڕەژنە پسپۆڕانەم بەرگوێ کەوتووە کە "*ها هەمیسان قسەکەی دووکتەر بان قوولینەس*". بەکارهێنانی دووکتەر بان قوولینە خۆی لەخۆیدا گەورەترین

کەرەستەیە بۆ ڕووخاندنی دیواخانی ئەزموون و زانستی بواری پزیشکی خۆماڵی کوردەواری لە ئاواییەکی چکۆلە وەك باقلاوا. جا ئەو سنووورە ئەگەر هەندێك پانتری بکەینەوە ئەو دەستەواژەیە یا بێژەکانی دیکەی (دەرمانی پروپیرەژنان، دەرمانە پیرەژنە، ڕەچەتەی پڕوپووچ، پزیشکی دێهاتی، و تاد) لە ناوچە و هەرێمەکانی دیکەی کوردستاندا دەبیسترێن. ئەو دەستەواژانە بۆ فەرهەنگ و کەلەپووری پێشینیانی کورد مەترسی گەورەیە و تاپۆی دارووخان و فەوتانە.

بە تێگەیشتنی ئاسیوەکانی سەرەوە ئەتوانین بارێکی دیکەی بواری پزیشکی خۆماڵی بخەینە بەر باس. ئەگەر بە باری ڕاستی و جوانەکەیدا پێشینە و پرێسکەی پزیشکی کوردەواری زیاتر بە دەرمانی کوردەواری، داودەرمانی کوردی، دەرمان خۆمانە، چارەسەریا کرمانجی، پزیشکی خۆماڵی، چارەسەری کوردەواری و تاد، بناسینەوە ئەو ئاسیو و مەترسیانەی بەرۆکمان دەگرن، کاریگەر نابن.

ئەگەر ئێمە ترسی توانەوە و لەناوچوونی ناوەرۆك و پێشینەی کەلتووری پزیشکی کۆنی ولاتەکەمان هەبێت پێویستە کۆڵ نەدەین وەك ئەرکێکی نیشتمانی، نەتەوایەتی و مرۆڤایەتی شانی بۆ شل کەین و هەموو قوژبنی هەوار و لادێ و شارێك بپشکنین و سەرجەم ئەزموون و زانستی پزیشکی خۆماڵی کوردەواری کۆ بکەینەوە و بیخەینە تویێ بەرگی پەرتووکی زێڕین و بەنرخی "*پزیشکی خۆماڵی کوردەواری، چارەسەریا کرمانجی یا پرێسکەی پزیشکی پێشینیان*". بە دەرخستنی ئەو کتێبە و پێشکەش کردنی خزمەتگوزاریەکانی لەپاڵ پزیشکی هاوچەرخ خزمەتێکی گەورەی مرۆڤایەتیمان کردووە و دەردێك لە کۆڵەدەردی کۆمەڵگامان لا بردووە. خۆشبەختانە لەو چەند ساڵەدا دەستەواژەی پەسەند و جوانی "طب سنتی کوردەواری: پزیشکی کۆن/ خۆماڵی کوردەواری" کە یەکەم جار لەلایەن ناوەندی گیادەرمانی شەفای کوردستان دانراوە، بووەتە زانیاریەکی سەربەخۆ لە دنیای بنکەدراوی زانیاری (Database) دنیای پەرتووك، بانگەشە، میدیا و ئینترنێت.

بەو بۆنەوە پاش لەچاپدانی "فەرهەنگی ڕوەکناسی کوردستان بە زمانەکانی کوردی، فارسی، عەرەبی، ئینگلیزی و لاتین" لە بەهاری ٢٠١٦ بە هاوکاری کۆمەڵەی ڕوەکناسانی ـ گیادەرمانان ـ هەرێمی کوردستان کتێبی "پێشەکیەك لەسەر ڕوەکناسی، گیادەرمانی و پزیشکی خۆماڵی کوردەواری" بەندە هاتە چاپ کردن و لەو دوو کتێبە بەڕاشکاوی هەندێك ئاماژە بەو ڕێبازە پزیشکیەی کوردەواری کراوە.

**چەند بیرەوەری سەبارەت بە پزیشکی کوردەواری لە باکووری کوردستان**

* ساڵی ٢٠١٤ یەکەم جار بوو کە ناوی کتێبی [طب جالینووس] شێخ موحەممەد ئەرواسی خەڵکی گوندی مەکسی لە شارستانی وان بەرگوێم کەوت. ئەو کتێبە زیاتر لە ٢٠٠ ساڵ پێش ئێستا بە کوردی کرمانجی نووسراوەتەوە. نیشان ئەدات کە لای خەڵکی کورد زانین و تێگەیین لە تەوەری زانستی پزیشکی گرینگ بووە هەر لە کۆنەوە تا ئێستە.

* ڕێکەوتی ٢٠١٧/٠٨/١٩ هەر بەڕێکەوت سەیری یەکێك لە زنجیرە بەرنامەکانی "گزینگ" لە کەناڵێکی ئاسمانی دەکرد.[١] گزینگ زیاتر پەرژاوەتە سەر بابەتی سروشت و کشتوکاڵ و ژینگە و پزیشکی کوردەواری و تا ئێستەش بەردەوامە. دیمانەی ئەوجارە باسی پزیشکی و چارەسەری یەکێك لە کۆنە حەکیمانی بەئەزموونی شاری وان لە باکووری کوردستان بوو. بەگشتی لە دەڤەرەکانی شێوەزاری کرمانجی، ئەو کەسەی وا پسپۆڕی هەیە لە بواری پزیشکی و چارەسەری جا چە کۆن و چە نوێ، بە نوژدار دەیناسن. نوژداری ئەوجارەی بەرباسی گزینگ بە "حەکیم مەلا نوورەدین بتلیسی" دەناسرا. ئەو پیاوە باسی لەوە دەکرد کە خەڵکی ئێمە پاش ئەوەی بۆ چارەسەری نەخۆشیەکانیان لە دکتۆر و دەوای ئەوروپاکە بێهیوا دەبن سەردانی حەکیمانی کرمانجی/ کوردی دەکەن. دەستەواژەی باوی ئەو مامۆستایە بۆ کەسانی شیاو و لێزان و پسپۆڕی بواری گیادەرمانی و پزیشکی خۆماڵی حەکیم بوو. یەکێك لە پرسیارەکانی پێشکەشکاری بەرنامەکە ئەوە بوو کە ناوی ئەو پیشەیەی ئێوە چییە لە باکووری کوردستان. پەرسڤەکەی "چارەسەریا کرمانجی یا چارەسەریا کوردی" بوو. مەلا نوورەدین ساڵی ١٩٤٥ لە گوندێکی ناوچەی بتلیس لەدایك بووە و ئێستە لە وان بە حەکیم نوورەدین بتلیسی دەناسرێت. پیشەی نوژداری لە باب و باپیرانیەوە بۆی بە جێ ماوە. پاش وەرگرتنی ئیجازەی مەلایەتی ماوەی ١٥ ساڵ لە گوندەکانی بتلیس و وان پێشنوێژ و وتارخوێنی مزگەوتەکان بووە و زیاتر لە ٢٠ ساڵە لە وان دەرمانخانەی گیایی هەیە. یەکێك لە شێواز و ڕەچەتەکانی حەکیم نوورەدین کە لەو بەرنامەیەدا هەندێك باسی کرا، بنێشت و چەکەم[٢] بوو. پارچە پەڕۆیەکی سپی بوو کە

---

١. تەلەڤزیۆنی ئاریەن تی‌ڤی

٢. چەکەم: مەلا نوورەدین بە گیا ناوی دەهێنا و دەیگوت ئەگەر ڕەگەکەی بریندار بکەیت جەوی دەردێت. مەبەستی جۆرێك گیای جنسی کەما (*Ferula sp.*) بوو کە ڕەگەکەی جەوی دەر ئەدات لەوانەیە هەمان چەکمەڕەش بێ.. گیای چەکمەڕەش جۆرێکە لە کەمایە. لاپەڕە ١٦٠ کتێبی (ئەحمەد قاسم ئوغلوو، فەرهەنگا ناڤێن نەباتان ئە کوردی، چاپی یەکەم، پەخشانگای زانکۆی ماردین، ٢٠١٣) چەکەمی بە داری سەوڵەکێوی (*Juniperus sp.*) و داخۆرك (*Viscum album*) هێناوە.

دیوێکی شیلە و جەوی چەکەم و نێرەبەند[1] بوو. هاوشێوەی زەفت و قیری خۆمان بۆ شکستەبەندی و گرتنەوەی سینگ و پراسووی شکاو بەکاری دەهێنا.

* کاك ئاری خۆرشید خەڵکی کەرکووك کە ئێستە لە وڵاتی دانمارك ئەژی ماوەیەکە دوورادوور پێکەوە پێوەندیمان هەیە و هەندێ جار لەسەر بابەتی کەلتووری و سروشتی کوردەواری ڕاوبۆچوون دەگۆڕینەوە. زستانی ١٣٩٦ بابەتێکی بە ناوی جۆری پەنیرا تاڵمە (تاڵما) بۆ هەناردم. پەنیری تاڵمە هاوشێوەی پەنیری دەڵەمەیە، بەڵام لەبری هەوێنی گیراوە (شیلاوقەی بەرخۆڵە بەتەنیا یا تێکەڵ بە سیر و خوێ) لە تاڵمە بە شیلەی هەنجیر ئامیان دەکرێت. خێزانی کاك ئاری خەڵکی گوندی چوولاب لە نزیك شاری عەفرینی ڕۆژاوای کوردستانە. دەگێڕێتەوە کە باپیری خێزانی ئاغای گوندی چوولاب بووە و کاتی خۆی ژیانێکی خۆشنشین و شاهانەی بووە. کاتی خۆی ئەو ئاغایە بەهۆی کێشەیەکی کۆمەڵایەتی لە باکووری کوردستان بەرەو عەفرین کۆچی کردووە. یەکێك لە خۆراکەکانی ژەمی بەیانیانەی ئاغای چوولاب پەنیری تاڵمە بووە کە بە دەستی کابانی پسپۆڕ دروست کراوە. دیارە پەنیرێکی تازە بووە وەبەر دڵی ئاغا کەوتووە.

* بەهاری ١٣٩٧ لە کۆنفرانسی جیهانی "زانایانی زاب" لە زانکۆی جۆلەمێرگ بەشداریم کرد. وتارێکم لەسەر گەورە نوژداری کورد "سمایل حەکیمی سلێڤانی دهۆکی" پزیشکی ناسراوی سەردەمی عوسمانیەکان پێشکەش کرد. خۆشبەختانە لەو سەفەرەدا هەڤاڵێکی خوێنشیرین "دکتۆر ئەرکین ئۆپێنگین" مامۆستای زانکۆی ئۆپسالای سوید دڵفراوانی نواند و کۆپیەك لە فایلی ئێسکەنکراوی کتێبەکەی شێخ موحەمەد ئەرواسی پێدام. دیسان لەو سەفەرەدا لە ڕێگەی دکتۆر هێمن خۆشناو مامۆستای بەشی کوردی زانکۆی بینگۆڵ هەواڵی ئەوەم پێ گەیشت کە دکتۆر تەکین، خوێندکاری بەشی کوردی ئەو زانکۆیە بابەتی پایاننامەکەی لەسەر "*پزیشکی پێشینیانی ناوچەی کوردنشینی سەمسوور*" لە باکووری کوردستان تەرخان کردووە. لە پێوەندیەك لەگەڵ دکتۆر تەکین بڕیارە وتارێك لەسەر هەمان بابەتی پزیشکی خۆماڵی کرمانجی ناوچەی سەمسوور بۆ کۆنفرانسی "طب سنتی" لە سنە بنووسێت. دکتۆر تەکین هاوڕێی نزیکی تویژەری بەناوبانگی کوردە، پرۆفیسۆر قەدری

---

١. نەرەبەند: جۆرێك گیای هالیکۆکە (*Scorzonera sp.*) کە ئەگەر ڕەگ و سەلکەکەی بقلاشیتەوە یا بریندار بکەیت شیلەیەك دەرئەدات وەك بنێشتی وەن. (لاپەڕە ٥٦٦، فەرهەنگا ناوێن نەباتان ئە کوردی)

یەڵدرم[١] کە لەو بارەوە زۆر یارمەتی لەو پرۆفیسۆرە وەرگرتووە.

* لەو سەفەرە بۆ زانکۆی جۆلەمێرگ تا ئەو جێگەیە بوارم بۆ دەرەخسا لەگەڵ خەڵکی باسم دەورووژاند و گوێم هەڵدەخست تا سەرەداوی زیاتر لەسەر مژاری پزیشکی کوردەواری باکووری کوردستان بە دەست بهێنم. لە ناو خەڵکی ئەوێدا ئەو باسە زیاتر بە "چارەسەریا کەون، چارەسەریا کرمانجی، دەرمانا حەکیمی و تەداویا کوردی" دەناسن.

١. دکتۆر قەدری یەڵدرم پێشتر سەرۆکی زانکۆی ماردین بووە و پاڵپشتی سەرەکی بۆ دامەزراندنی خوێندنی بەشی کوردی لەو زانکۆیە بووە. ئێستاکە نوێنەری پارلەمانی تورکیەیە لەسەر لیستی دەمیرتاش. دکتۆر قەدری ساڵی ٢٠١٣ کتێبەکەی شێخ موحەمەد ئەرواسی بە ناوی "تبا مەلایێ ئەرواسی" بە کوردی و تورکی چاپ کردووە. [خۆشبەختانە لە بەهاری ٩٧ تا وەکوو ئێستا لەسەر بابەتی پزیشکی خۆماڵی و تەوەری دیکە چەندین جار پێوەندی تەلەفۆنیمان بووە.]

# چەپکێک لە پەند و پەیڤ و ئامۆژگاری حەکیمیی پێشینیان

ئاشکرایە پێشینیانی کوردەواری زۆرینەی بەرهەمەکانیان بەشێوەی سەرزارەکی و گێڕانەوەیە و نەنووسراوە و بە قسە و باسی فۆلکلۆری گەیشتووە بە ئێمە. بەگشتی ئەوەی ئێستاکە لە زانستەکانی دیکە وەك پەرتووك و سەرچاوە لەبەردەستدایە و دەخوێنرێتەوە و سوودی لێ وەردەگیردرێت رۆژێك ئەزموون و زانستی کەسێك بووە و چین لەسەر چین کۆ بووەتەوە و رۆژێك کۆ کراوەتەوە و هەموو کەس توانیویە ببینێت. دوو دەردی کوشندە کە هەر لەکۆنەوە بەرۆکی کەلتووری کوردی گرتووە: یەکەم، حەکیمان و بەگشتی ئەو کەسانەی ئەزموونێکی کارا و بەکارهاتوویان بووە و خەڵك بۆ چارەسەری و چاکبوونەوە روویان تێ کردووە ئەوان شاردوویانەتەوە و ناوەرۆکەکەی تا ئەو جێگەیە توانراوە تەنیا خۆیان و کەسی بەردەستیان زانیویانە. جا هەر ئەوەیە کە حەکیم هەندێ جار رێگەی بە کەسانێك داوە پاش خۆی رێگەکەی درێژە بدەن. واتا کەسێك ودمی حەکیم یا مەلایەکی پێ بووە و بووەتە جێنشینی. دووهەم، هەلی نووسینی کوردی و دەفتەر و دیوانێك بۆ حەکیمان نەبووە کە رێز لەو ئەزموونە خۆماڵییە بگرن. کەواتە ئەگەر ئێستاکە سەرەڕای دوو گرفتی ناوبراو، لانیکەم رەچەتە و ئامۆژگاری حەکیمانی کوردەواری کۆ بکرێنەوە و ئەوەی ماوەتەوە لەناو بەیت و حەیران و گۆرانی و چیرۆك و قسەی رۆژانەی خەڵکدا بنووسرێنەوە بەدڵنیاییەوە دەبێتە یەکێك لە ناوازەترین بەرهەمەکانی تەندروستی و پزیشکی مرۆڤ.

سەرجەم ئەو خاڵ و تێبینی و یاداشتانە بۆ نووسینی وتاری بەردەست لە چەند رێگەوە بە دەست هاتوون و بوونەتە ئەزموونی ژیان و بەسەرهاتی رۆژانەی خۆم. ئەو قسانە لەوانەیە لە ناو خەڵکیدا بە قسەی پرو‌پیرەژنان، باسی قەیمی و قسەی کۆن بیناسن، بەڵام بەشێکە لە هەگبەی پەیڤ و پەندی پێشینیانی کوردەواری کە گەنجینەیەکی بێوێنەی کەلەپوور و کەلتووری ویژەیی ئێمەی کوردە. لەو رۆژەوە پێنووسم بۆ کوردی نووسین هەڵگرتووە

بەردەوام ئەو شتانەی وەك وشـە، پەنـد، قسـەی قەیمـی، داودەرمـان، هـۆنراوەی فولکلـۆر، دەنگەنـاو، جنێـو، وشـەی خۆشەویسـتی، چیرۆکـی کـۆن و بەیـت و بـالۆرە بەتـایبەت لە ناوچەکـانی کەلاتەرزان و کۆماسـی سـنە و مەریـوان بەرگـوێم کەوتـووە نووسـیومە و لە دەفتەری ڕۆژانە واتا "بەرەڕۆچکە" دامنـاوە. ئەو دەفـتەرانە بـۆ تـوێژینەوە و بەرهەم هێنـانی چەند چەمك و تەوەرێكی کوردی گۆڕەپانی تـوێژینەوەیکی گەورەیە. بەشـی ئەم وتـارە کـە بابەتی داودەرمان، ڕێنمایی پزیشکی، باسی چێشت و پێخـۆر و بـابەتی پەیوەندیـدارە لە ٢١ دەفتەری بەرەرۆچکە کە ژمارە یەکی ساڵی ١٣٧٨ دەستی پێ کراوە و تا ئێستەش درێـژەی هەیە[١]، دەرهێنراوە. جێی تێبینی و ئاماژەیە کە بەشێکی زۆر لەو بابەتانە کاتی خـۆی لە هەر دوو دایەگەورەم (دایە پەریجان و ڕابێعە خانم) و هەروەها دواتر دایکی بەڕێزم فەریدە خـانم وەرگرتووە. بەشێکی دیکە لە پەندەکان لە کتێبی پەندی پیرەمێردی نەمر وەرگیراوە.[٢]

هەوڵـی ئەم وتـارە ئەوەیە وەك تێکۆشـانێکی شەخسـی، بەشـێك لەو قسـە و ئیـدیۆم و ئامۆژگارییانەی لە بەرەرۆچکەدا کۆ کراونەتەوە، لێـرە ڕیزیـان بـکەم و تـوێژینەوەی زیـاتری بمێنێتەوە بۆ لێکۆڵەرانی داهاتوو. ناوەرۆکی پەند و پەیڤەکانی خوارەوە بە جۆرێك پێوەنـدیان بە باری پزیشکی و تەندروستیەوە هەیە.

[تێبینی: بەشێکی بەرچـاو لە پەنـد و پەیڤەکـانی خـوارەوە تـایبەت بە کەلاتەرزانە. ئەو نـاوچەیە ئاخافتنیـان بە شـێوەزاری ئەردەلانـیە. دیـارە کـە هەنـدێ شـوێنەواری زمـانی کەلاتەرزانی بە پەندەکانەوە ماوە.]

١. پشتوێن پیاو توند و تۆڵ ئەکاتەوە.

*لێرە تەنیا مەبەست لە پشتوێنی پیاوان نییە بەڵکوو ژنانیش دەگرێتەوە.*

٢. زستانان زوو زوو خۆت مەشۆ، ڕۆوەنج ئەکەیت.

*ڕۆوەنج وشەیەکی ئەردەلانییە و واتای سەرما و سـۆڵە کێشـانە کە ئـازاردەرە و جەسـتە ڕەق دەبێت.*

٣. شەوانە گایەك بخۆ و گوێزێك مەخۆ.

*گوایە چەوری گوێز دێر هەرس دەبێت و دەمێنێتەوە. جا شـەوانە ئەگەر جەسـتە تەنیـا*

١. ئەو دەفتەرانە لە قەبارەی دەفتەری نووسینی ١٠٠ بەرگ و دەفتەری ساڵنامەیە.

٢. کتێبی: سەرجەم پەندەکانی پیرەمێرد، کۆکردنەوە و ساقکردنەوە: فایەق هۆشیار، چاپی دووەم، چاپخانەی شڤان، سلێمانی، ٢٠٠٧

*خەریکی هەرسی خۆراك بێ کابرا خەوێکی ئاسوودەی نابێت و تا بەیانی خەوی شێلە و پێلە دەبینێت.*

٤. نانی بەیانیانت بەتەنیا بخۆ، نانی نیوەڕۆ لەتەك دۆستدا و نانی شەوت لەگەڵ دوژمنت.

*ئاستی خواردنی ژەمەن نیشان ئەدات کە بەیانیانە پێویستە وزەی زۆر کۆ بکرێتەوە بە خواردن. چونکا بنەڕۆژەیە و کار دەست پێ دەکات. نیوەڕوانە بەهۆی ماندووبوونەوە باشتر وایە کەم بخورێت و خواردنەکە دابەش بکرێت و بۆ نموونە کەسێك لەگەڵمان بخوات. بۆ شەوانە کە باشتر وایە خواردنێکی زۆر سووك بێت و وەك ئەوە وابێ کە دوژمن خواردنەکەمانی بردووە و یا هیچمان بۆ نەماوەتەوە یا کەمێك ماوەتەوە.*

٥. ڕەمەزانان خورما و سایلەت لەبیر نەچێت.

*سایلە یا هەمان چێشتی قاوتورۆن خۆراکێکی تەندروستە. لە هاڕاوەی کونجی یا گەنم دروست دەکرێت. پاش کوڵاندنی قاوت ڕۆنی خۆمانەی تێ دەکەن. ئەوسا بەربانگان خواردنی سایلە باشترین چێشت بووە و ناوسك و ڕیخۆڵەکانی هەم نەرم کردووەتەوە و هەم وزەی بەخشیوە. لە کوردیا باوە کەسێك وا تەمەڵ و نەبزووت و لەشگرانە، پێی ئەڵێن: ئێژی سایلەی ساردەوبووە. ئەڵبەت سایلە بە گەرمی خۆشە. ساردەوە بوو وەك قوڕەپەستەی لێ دێت و خواردنی خۆش نامێنێت.*

٦. تیکەی حەرام ڕەگ/ خوێنی حیزی و دزی ئەخاتە کۆرپەی ناوسکی دایك.

*مەبەست لە تیکەی حەرام بەرەچە و داهاتی نەشیاو و حەرامە کە پیاوی ماڵ ئەیهێنێتەوە بۆ خاوخێزانی. واتا ئەگەر تیکەی حەرامە بخورێت تەنانەت کۆرپەی ناوسکی دایکیش تووشی خراپە دەکات بۆ داهاتوو.*

٧. دڵ کەس مەشکێنە دێر ساق ئەوێتەو.

*دڵشکانن هەمان دلگران و نارەحەت کردنی کەسێکە بە ئازار و ژانی زمان و قسە پێگوتن. یا ئەوەیکە زلم لە کەسێك بکەیت و هەقی کەسێك بخرێتە ژێر پێ و ئەو نەتوانێ بە هەقی خۆی بگاتەوە. یا ئەوەیکە ڕێگە لە گەیشتنی کەسێك بە سەرکەوتن و جێگەی هەقی خۆی بگریت و نەتوانێ بگا بە مەبەست و ئامانجی خۆی. هەموو ئەمانە بەجۆرێك ئەو کەسە نارەحەت دەکات و دڵی خەمبار دەکات و ئاخەکەی لەسەر دڵی دەمێنێتەوە.*

٨. قسەی تاڵ لە هەزار شەق ناخۆشترە.

*شەق و لێدان بە جەستە پاش ڕەوانەوەی کوتران و گیرانی لێدانەکە و گیرساندنەوەی خوێنەکەی چاك دەبێتەوە و لەوانەیە تەنیا بۆ ماوەیەك شوێنەکەی بمێنێتەوە یا ئەوەیکە ئەو*

*کەسەیش شەقێ لەو هەڵبدات و سەربەسەر دێتەوە. بەڵام کاتێ قسەیەکی ناخۆش، تەشەرێکی جەرگبڕ و جنێوێکی کاری لە کەسێك بەرگوێ دەکەوێت یا ناوی کابرا بە خراپی دەهێندرێت و دەیزرێنن ئیتر ئەوە زۆر ناخۆشە و ژان و نیشانەی بۆ چەندین ساڵ و لەوانەیە بۆ تەمەنێك بمێنێتەوە.*

٩. سفرەی دڵت لای هەچی کەسا مەکەرەو.

*بۆخۆی ئینسان بە گوتن و دەربڕکردنی ئازار و ئارێشەی بۆ کەسانێك کە باوڕی پێیانە و خۆشیانی دەوێت، جۆرێك سوکنایی و ئارامبەخشییە، بەڵام هەموو کەسێك بۆ ئەوە نابێ لای دابنیشیت و باس لە کێشە و ئازار و گرفتەکانی ژیانی بۆ بکەیت. چونکە هەندێك هەن کە ئەو قسانە دواجار وەك تانە و تەشەر بەکار ئەهێنن و ئازاری دڵت زیاتر ئەکەن.*

١٠. دەردت لە ماڵم کەوێت.

*کاتێ بۆ کەسێکی خۆشەویست وەك منداڵ، یار و دایك و باوك یا هەر خۆشەویستێکی دیکە ئەوپەڕی پەرۆشی خۆ نیشان بدەیت و لە خوا بپاڕێتەوە کە دەردەکەی کەم بکاتەوە ئەم دەستەواژەیە بەکار ئەهێنرێت. واتا دەردی ئەو کەسە بە داشکانی دەوڵەمەندی و هەبوونی ماڵیی کەم ببێتەوە.*

١١. دەردی کارییە.

*دەردی کاریی واتا نەخۆشی و ژان و ئازارێکی زۆر سەخت. کاتێ بابەتێکی ئازاردەر زۆر تەشەنە دەکات و بەری زۆرتر دائەگرێت و ژانی زیاتر دەکات و باری نەخۆشییەکە قورستر دەبێت بە دەردی کاریی دەناسرێت.*

١٢. بە دەرد خۆیەو داکەوتیە.

*مەبەست لە کەسێکە کە لەگەڵ ئازار و نەخۆشی و گرفت و ناکۆکی ژیانی خۆی سازاوە و کردوویە بە بەشێك لە ژیانی خۆی. کاری بە کار کەسەوە نییە و سەر ناکێشێتە ناو ژیانی کەس و دەستێوەردانی کاروباری کەس ناکات. ئەو کەسانە خۆشەویستی خۆیان لای خەڵك دەپارێزن.*

١٣. ئینسان نابێ سلێدڕاو بێت. چونکا بەری تەنگانە لەبەرە.

*سلێدڕاو مەبەست لەو کەسانەیە کە دەست بە خواردن و خواردنەوە ناگرن و هەتا زیاتر بێت دەخۆن و ناکشێنەوە. وەك میران و شاهان دەخۆن و ورگ بەر ئەدەنەوە و تێ ئەکەن. واتا زیاتر لە تێری دەخۆن. جا "بەری تەنگانە لەبەرە"، مەبەرست لەوەیە کە پاش تێری و پڕی لەوانەیە نەبوونی و برسیەتی بێتە ئاراوە و مرۆڤی قانع و دەستپێوەگر ڕەنگە بەرگە*

*بگرێت، بەڵام ئینسانە سلڵدراوەكان هەر زوو تیا ئەچن.*

١٤. خوا دەرد ئەدات و دەرمانیچ.

*ئەگەر نەخۆشی و ئازار و ژانێك لەو دنیایە هەبێت بێگومان چارەسەر و دەرمانیشی هەیە. جا ئەو دەرمانە چە بە ئاشكرا دەست بكەوێت و بۆ هەموو كەسێك وەك ئاو هەبێت یا ئەوەیكە پێویستە بۆ بەدەست هێنانی كردوكۆش بكەیت و سەردانی حەكیمان بكەیت.*

١٥. سێبەرنشینان و خۆشنشینان بەرگەی باوبۆرانی ڕۆژگار ناگرن.

*ئەوانەی وا خۆشنشین و خۆش ڕابوێرن و تاڵی و سوێری دنیایان كەم دیتووە بەرگەی ئاوارەیی و سەختی و دژواری باری ژیان ناگرن و هەر زوو ژیانی دینی و دنیایان لەناو ئەچێت و ئەیدۆڕێنن. چونكا ئەزموونی ئەو ڕۆژانەیان نییە.*

١٦. دزیەتی و حیزیەتی تامێ زیاتری ها تیا.

*تامی زیاتر مەبەست هەمان شیرین بوونی بابەتەكەیە لەبەرچاوی دز یا حیزەكە. لە نەریتی ئایینیدا باس لەوە دەكرێت كە شەیتان بابەتی حیزی و دزی شیرین دەكات لەبەرچاوان و تامی خۆشتر دەكات تا زیاتر گیرۆدەی بیت و بۆی ڕابكێشریت.*

١٧. دەستی خواردن درێژە.

*مەبەست لە خواردن و برسیەتیە كە مرۆڤ بۆ چارەسەر كردنی برسیەتی هەوڵی زیاتر ئەدات و خۆی زیاتر دەكێشێت و مەینەتی زیاتر وەبەر خۆی دەخات تا بگاتە خواردن. بەتایبەت مرۆڤ كاتێ خوانێكی بۆ ڕاخراوە بۆ گەیشتن بە بابەتەكانی سەر سفرەكە ئەو دەستەواژەیە بەكار دەهێنێت.*

١٨. كار لە بنەڕۆژەوە خۆشە.

*ئەگەر كەسێك بیهەوێت بەجوانی و چاكی شان بداتە ژێر ئەنجامدانی كارێك، بەیانی زوو بچێتە سەر كارەكە نەك ئەوەیكە نیوەڕۆ بچێت. چونكا لەش گران دەبێت و دڵ زووتر سارد دەبێتەوە لە كاردكە. بۆ هەموو كارێك ئەو قسەیە بەكار دەچێت. واتا كار لە سەرەتاوە و لە یەكەم كاتەوە بكرێت نەك بخرێتە دواوە.*

١٩. ئێوارانە خۆرنشین و بەیانیانە خۆرهەڵات ببینە.

*ئەوسا نەریتی كوردەواری بەو جۆرە بوو كە خەڵك تا خۆراوا لە سەربان و بانیژەی ماڵ دەبوون، پاشان ئەچوونە ژوورەوە بۆ شێو خواردن و خەوتن. بەیانیانیش زوو لە خەو هەڵدەستان و كاروباریان دەست پێ ئەكرد. تاوێك لەسەر بانیژە و حەوشەی ماڵەكەی هەوایان هەڵدەمژی ئینجا نانی بەیانیان ئەخوارد.*

٢٠. خەوی ئێوارانە ناوەختە/ بەیۆمنە.

*تەنانەت منالی ساوایش لە ئێواران واتا تەنگەی خۆراوا لە بێشکە هەڵدەگرت و هەندێ باوشیان دەکرد. کەسێك تەنگەی خۆراوا دەخەوت زوو هەڵیاندەساند. چونکە بە کاتێکی لەباریان نەدەزانی و ناوەخت ئەیانناسی.*

٢١. بەیانیانە خۆرکەوتن ببینە و ئێوارانە خۆرنشین. جا دوایی نان و چایی بخۆ.

*ئەوسا خەڵك بەگشتی زوو لە خەو هەڵدەستان و شەوانەیش زوو دەخەوتن. ئەم ئامۆژگارییە بۆ ئەوەیە کە مرۆڤ کاتەکانی رۆژ و شەو هەست بکات. چونکە کەسێك کاتی لێ بشێوێت وەك گێژ دێت و دەڕوات. مەبەست لەو قسە ئەوەیە بەیانیان پاش تاو هەڵاتن و ئێواران پێش تاونیشتن نان و چایی بخۆ.*

٢٢. ئێژن، کۆڵنج وتییە نەمپروێنی، ئەتپروێنم. [پروانـدن: گـرتن و ورد کـردن و کوتاندنە]

*لە کۆڵنجی سەرما ڕەگ و دەمار و ماسوولکەکان دەگیرێت و توند دەبێت و ژان و ئازار دێنێتە ئاراوە. جا ئەگەر کەسێك تووشی کۆڵنج کردن هات دەبێ بە گرتن و دەست پێداهێنانی ئەو شوێنە و هەروەها ماڵشت و پرواندن و تەقاندن ئەو ڕەگە بەشێنەیی نەرم و گەرم بکرێت تا توندییەکە بەر بێت و خاو بێتەوە. ئەگەر کۆڵنج لە بەشی سینگ و ئەستۆدا بێت بە گرتنی دەماری بنهەنگڵ و هەندێ پرواندن و گوشین، چارەسەر دەبێت. ئەگەر کۆڵنجەکە لە پشتدا بێت، پاش دەست پێداهێنان و گەرم کردنەکە، دوو ئەژنۆی پێوە دەنێت و دەیتەقێنێت. لە کوردەواریدا بەم ڕەوتە لە چارەسەری کۆڵنج دەگوترێت: "کۆڵنج تەقاندن".*

٢٣. کۆڵنج تەنیا بە سەرما نییە. هاوینان کۆڵنجی گەرمایش هەیە.

*گوایە بەهۆی گەرماوە ڕەگ و دەمارەکان تووشی گیران و بەستن دەبن. بە هەمان شێوەی تەقاندن لە کۆڵنجی سەرما، چارەسەری کۆڵنجی گەرمایش دەکرێت.*

٢٤. منال کاتێ ددانی دەرهات دانوولەی پێ بدە.

*دانوولە بە نۆك و گەنمی کوڵاو دەگوترێت. ئەو چێشتە بە دانۆکە و ددانگرەیش دەگوترێت. کاتێ منالی ساوا ددان دەر ئەکات بۆ ئەوەی فێری خواردن و ددان گرتن بێت چێشتی دانوولە باشترین خواردنە. هەر لە کۆنەوە ئەم نەریتە بووە. ئەڵبەت ئەگەر ئەو دانوولەیە تام چێشت و گیاوگژی بۆنخۆشی وەکوو هەزبی و بیزا و نارنجبۆی تێ بکەیت دەبێتە چێشتێکی دیواخان.*

٢٥. منالّی ساوا زۆر ختیلکە مەدە و زۆری پێ مەکەنێنە، ژان ئەکا.

*مەبەست لە پێکەناندنی زۆرە. ئەگەر زۆر بێت منالّەکە بەرگە ناگرێت و بەقەد گریانەکە کاریگەری خراپی لەسەر ئەبێت. ژان هەمان ئازاری برك و ژانی بەرسکە. زۆرتر بەهۆی ساردی کردن و سەرمابوون منالّ تووشی ئەبێت.*

٢٦. گوێدرێژ نابێ هیچ کات سەری ببڕی. قۆزەڕەشە دائەکەوێت.

*خواردنی گۆشتی ئەو ئاژەڵە ڕەوا نییە. لەوانەیە بۆ نەخواردن و زیاتر ڕەوانەبوونی گۆشتی بابەتی قۆزەڕەشەیان دانابێت. ئەوسا ئەگەر نەخۆشیەك کوتوپڕ بڵاو بووەتەوە بە داکەوتن ناویان هێناوە.*

٢٧. پیاو خشڵ و پشلّی ژنانە هەڵگرێت تووی مێردی کەم ئەبێتەوە.

*مەبەست لە ڕوونیانی پیاوە بە خووگرتن بە ئاکار و نیشانەی ژنانەوە. ئەو خدە و ڕەوشتانەی ژنان هەیانە بۆ پیاو ناشێ و بەپێچەوانەش ژن نابێ ڕەوشتی پیاوانەی بێت.*

٢٨. ئەگەر نان یا هەر شتێکی خۆشت خوارد و کوڕ یا پیاوێك لێت نزیك بووەوە و چاوی پێتەوە بوو، بەشی بدە ئەگینا "تۆمی ئەتکێ".

*مەبەستی ئەوەیە کە ئەو کەسە دڵی ئەچێتە سەر ئەو خواردنە و لە دڵیدا ئەمێنێتەوە. تۆم تکان لە پیاودا بەئاشکرا کاتێ ڕوو ئەدات کە زۆر حەزی لە ژنێك بێت و نەتوانێت لێی نزیك بێتەوە. لەبەر خۆیەوە سوێی دێتەوە و لە ئەنجامدا ئاوی دەرژێت.*

٢٩. ئەوسا زاوا کە نەیدەتوانی پەردەی بووکێنی بپژێنێ یا لێی هەڵنەدەستا و نەدەبووە زاوا، دایك و بەربووك ئاوی ساردیان وە سەر زاوادا ئەکرد. ئەیانگوت: ئەگەر ئاوی ساردی پێدا بکەیت زاوا کرژ ئەبێتەوە.

*ئەو حاڵەتە زۆرتر بەهۆی ترسانی کوڕەکەوە بووە کە لە بەربووك ترساوە و زووکە زووکەی لێ گرتووە لە پشت درگاکە. یا ئەوەیکە بووك ترساوە و نەیهێشتووە نزیکی بێتەوە و تێی بخات.*

٣٠. دایك پێش ئەوەی زاوا بچێتە لای بووك، جەرگی مەڕی بۆ ئەبرژاند و بەشی بووك و زاوای ئەدا.

*ئەوسا دوای بووك داگرتن و میوانان بەڕێ کردن یەکەم کار، ئامادە کردنی جێگە بووە لەلایەن بەربووکەوە بۆ بووك و زاوا. بەربووك کەسی ماڵ بووك بووە کە پەڕۆی سووریان بۆ بباتەوە و ڕووسووری کچەکەیان وەك شانازی پێ بداتەوە. دایکی زاوا وەك لایەنگری ئەم لا، ئەویش پیاوانە دەرکەوتنی کوڕەکەی بۆ شانازی بووە. هەرچی زاوا زووتر لە دیوی بووك*

*هاتووەتە دەرەوە شانازی بووە و زیاتر پیاوەتی زاوای نیشان داوە. جا خواردنی جەرگ وەك خۆراکێکی خۆش و خوێنبەخش بۆ بووك و زاوا پێویست بووە.*

٣١. کوڕ بەربووك نەبینێت و بپەڕێت زڕناقی ئەبێت و سەڕی دێت.

*زڕناقی بوون و سەرهاتن بۆ نێرەکەر بەکار دەچێ. ئەگەر نێرەکەر ماوەیەك نەپەڕێ و کوتوپڕ وەسەر ماکەرێك بکەوێ، یەکسەر هەڵ و پەلی دەرچوون و جووتە هاویشتن و نەچوونە ژێر بار و سوار نەکردن و داخستنی سوارەکەی دەبێ. ئەم قسە بۆ ئەوەیە کە ئەگەر کوڕێك یەکەم ئەزموونی لە نزیکی کردن، بەدەر لە نەریتی زەماوەنی خۆی بێت و لەگەڵ ژنی دیکە تێکەڵاوی بێت ئەوە تووشی هەڵسوکەوتی ناشیرین و نەشیاوی ناو کۆمەڵگە دەبێت کە کەس قەبووڵی ناکات.*

٣٢. شەخس تا ئەزمووارە نەبێت خەڵك کولێرە نابەنە سەری.

*لە ڕوانگەی پزیشکی کۆنەوە باری یەقین و باوڕی دەروونی نەخۆشەکان زۆر گرینگ بووە. کاتێ نەخۆش پاڵی داوەتە کێلی پیاوچاکێك یا دارنیشانی گڵکۆیەکی ماچ کردووە و متفەرکی لە دەست و ملی کردووە و دەستی بە خاکی گۆڕی کەسێکی چاکەسوار و شۆڕەسوارێك هێناوە، بۆی ئارامبەخش بووە و ورەی گرتووە و هەستی بە هیوا و هەوای تازە کردووە. ئەوسا بەپێی نەریت شەخس و مەزاری کەسێك بووەتە نەزرگە و نەخۆشخانەی دەروونی مرۆڤەکان. هەر شەخسێك شتێکیان بردووەتە سەری و بەخشیویانەتەوە بە خەڵکدا، وەکوو: کولێرە، دانووڵە، پەتلە، نانی گەنم و شتی دیکە. "ئەزمووارە" هەمان ئەزموونکراوی بابەتێکە. کاتێ شتێك بەپێی ئەزموون پێی بگەن بە ئەزمووارە دەناسرێت. ئاو ئەزموارەیە بۆ تینوەتی شکان. کەواتە بەو شێوەیە ئەوسا باوڕیان وابووە کە شەخسەکان بەپێی ئەزمووارە هەرکام بۆ بابەتێکی نەخۆشی دانراون و تا ئەزمووارە نەکرابێت کولێرەیان بۆ سەر شەخس نەبردووە.*

٣٣. دار لە تەڕیدا ئەچەمێتەوە. وشك بوو ئەشکێتەوە.

*مەبەست پەروەردە و فێرکردنی منالە. سەردەمی منالی و ساوایی باشترین و بنەڕەتی-ترین کاتە بۆ پەروەرد کردنی منالان. لەو تەمەنە دڵ و دەروونی مرۆڤ وەك پەڕەیەکی ساف وایە هەموو شتێك وەردەگرێت. کاتێ گەورە بوو سەختە کار کردن لەسەری و لەوانەیە زۆر لێ کردن بۆ ئەنجامدانی بابەتێکی پەروەردەیی ببێتە هۆی بەلارێداچوونی کەسەکە.*

٣٤. گۆشتی مەڕ و بەرخ لە زستانا بخۆ و گۆشتی مانگا و گوێرەکە لە هاوینا.

*لەوانەیە بەهۆی ساردی و گەرمــی گۆشــتەکانەوە بێــت. چونکــا سروشــتی گۆشــتی مەڕ گەرمە و هی مانگا سـاردە. جـا ئەگەر گۆشـتێکی گەرم لە کەشـێکی سـاردی وەك زسـتانا بخورێت تەندروستترە تا ئەوەیکە گۆشتێکی سارد لە کەشێکی ساردا.*

٣٥. بۆ ئەوە نەگەنێ هەچی شتە خوێی ئەکەن. خوێ هیچی پێ ناکەن تا نەگەنێ.

*خوێ مادەیەکی تایبەتیە بۆ پێشگرتن بە گەندەڵ بوونی خواردەمەنی و گۆشت.*

٣٦. ژنی سوورهاڵ پیاوکوژ و پیاوبڕە.

*مەبەست لە هێز و وزەی ئەو ژنانەیە کە مەزاجیان خوێنیە و سـیمای سـوورییان هەیە. پیاو ئەگەر سەرجێیی زۆر لەگەڵ ئەو ژنانە بکات، دائەهێزرێ.*

٣٧. ژنێك پشت پووزی پڕ بێت بۆ پیاو خۆشە.

*پشت پووز پڕ بوون واتا دوو چاڵی پشتی پێ گۆشتن و قەڵەو بوون.*

٣٨. پیاو بە پشتوێن توند و تۆڵ ئەبێتەوە.

*توند و تۆڵی بۆ مرۆڤ پێویستە و هەر بۆیە لە کـوردەواری پشـتوێن دانـدراوە. پشـتوێن بۆخۆی واتا "پشتێند". وەك چۆن دەگوترێت دەستبەند و ملبەند و دەمبـێن. لێـرە "ــێن" و "ــێند" واتا بەستن و توند کردن.*

٣٩. جوانە و جەنگەی جەنگیە.

*تەمەنی لاوی و جوانی تین و تاوی مرۆڤ زۆرە و هەرِەتی گەشەیە. لەشکری جوانان لە شەڕدا درەنگ ئەبەزن.*

٤٠. جوان هێلکە بخەیتە بن هەنگڵی ئەیپیشێنێ.

*مەبەست لە سروشتی گەرم و گوڕی تەمەنی لاویە کە درەنگ سەرمای دەبێت.*

٤١. چاوی کەوتووەتە بەفر.

*زستانان کەسێك زۆر بە سەر بەفردا بڕوا، بەتایبەت ڕێبوار و ڕاویـاران تووشــی ئاوهـاتنی چاو دەبن. ئەگەر ماوەی گەڕانەکەیان و چـاوکەوتن بە بەفـر زۆر بێـت لەوانەیە ئەو کەسـە نەبینێت و چاوی هەڵنەیت. ئەوسا کە چاویلکە نەبووە تۆزێ قوڕی سـووریان لەبەر چاویـان داوە تا لە ڕێگەڕۆیشتندا گۆشـەی نیگایـان بەو قـوڕە بکەوێـت و یەکسـەر چاویـان لەسـەر بەفرەکە نەبێت.*

٤٢. پاش نەورۆز تا کۆتایی جۆزەردان ماسی ناخورێت.

*ئەوسا لە وەرزی نێوان نەورۆز تا کۆتـایی مـانگی یەکـی هـاوین خەڵکـی ڕاوە ماسـییان نەکردووە. ماسی لەو وەرزە گەرا دەکات و بێچووی دەبێت. گوایە وەك ژنی بێزیەوان ماسـی*

*لە وەرزی ڕێواس، خۆی ڕادەکێشێ بۆ ئاوی شەتاو و کانیاوەکان. تا بەشکوو ڕێواساوی پێوە بێت و لێی بخواتەوە. واتا ترشاو و ڕێواساو بۆ وەرزی گەرا و بێچوو لە ماسیدا پێویستە، وەك چۆن دەڵێن ژنان زۆرتر مژدی دەکەن بە ترش و هەڵووچەوە.*

٤٣. بە هاوینا گۆشتی ڕیوی نەخۆیت گەڕ دەبیت.

*ڕێوی بە وەرزی هاوینا زۆر حەزی لە ناوەدۆڵ و مێرگ و ناو پوونگەی سەرکانی هەیە. لەوێ خۆی دەشارێتەوە. ئەم ئاژەڵە بەهار دادێت تووك ئەداتەوە و گەڕ دەبێت. گوایە بۆیە خۆی دەخاتە ناو فێنکایی و پوونگە کە چاك بێتەوە. لەم وەرزا گۆشتی بۆگەندی هەیە و ناخورێت.*

٤٤. گۆشتی حەچە/ نێری بە هاوینا ناخورێت.

*بزنی نێری بە هاوینا زۆر ئەپەڕێت و بۆگەنی لێ دێت. بۆیە وەك ڕێوی وایە گۆشتی ناخۆن تا سەرما دادێتەوە.*

٤٥. دەنگی نێر بووە. [کەڵەشێرەی خوێندووە.]

*بۆ کوڕان بەکار دەچێت کە تازە پێگەیشتوون و پایان ناوەتە ناو قۆناغی مێرمنداڵییەوە. هەندێ خووخدەی پیاوانە دەگرن و مووی دموچاویان بۆر دەبێت و دەنگیان گەورەتر دەبێتەوە.*

٤٦. دایك بە شل نەیپێچاسەو. [دایك بە شل نەیپێچاوەتەوە.]

*مەبەست لە کەسێکە زوو نەخڵەتێت و کڵاو نەچێتە سەری و خەڵك نەتوانێ زڵمی لێ بکات. ئەم دەستەواژەیە وا هاتووە کە ئەگەر دایك بە مناڵی ڕۆڵەکەی توند و تۆڵ مەلۆتکە بکات و بەچاکی لە بێشکەی بخات و چاك بەخێوی بکات کاتێ گەورە بوو بە هەمان شێوە گورج و گۆڵ و زیرەك دەبێت.*

٤٧. خانمێك سووری مانگانەی ناڕێکە و دوور و درێژە، یا بەردەوام خوێنیان لەبەر دەچێت مێوژ بکوڵێنن و بیخۆن بەسوودە بۆیان.

٤٨. بۆ سووتاندن و بەردانەوەی دەنکە بلۆق و برینی نەخۆشی مایەسیری، تووی گیاکەوو بخرێتە کۆمەوە، چاکە.

*گیاکەوو هاوینان لەناو شێف و جاڕەکاندا سەوز ئەبێت و ڕواڵەتێکی سەوزی تووکن و ئارداوی هەیە. کۆتایی هاوین گوڵەکانی دەبنە توویەکی خڕی چەور و ڕەق. ئەم گیایە بە فارسی دەبێتە (آفتاب پرست) و لاتینەکەی (Heliotropium europaeum).*

٤٩. خواردنی تەڕەتیزە و کووزەڵە لە کاتی سووڕی مانگانە بۆ کەمکردنەوەی ژانی ژنان

بەسوودە.

*ئەوسا ئەو ژنانەی وا بە سووری مانگانە تووشی ژان و ژلیوەی ناوسك دەهاتن و بەتایبەت ڕۆژەكانی سەرەتا ئازارێكی زۆریان هەبوو. ئامۆژگاری حەكیمان ئەوە بوو تەرەتیزە و كووزەڵە بخۆن لە ڕۆژێك پێش دەستپێكی سوورەكە و ڕۆژەكانی سەرەتای سوور.*

٥٠. یاخوا ماڵت بە قوڕی [گەرووی] حەكیم و زاڵما نەچێت.

*لێرە ماڵ بۆ حەكیم مەبەست هەمان دەستخۆشانە و مزەی چاككردنەوەیە. كەواتە كابرا نەخۆش كەوت هەم كاركردنی لە دەست ئەدا و هەم ماڵی دائەچێنێ بۆ چاكبوونەوەی. سەبارەت بە زاڵمیش دیارە كە زاڵم ئەگەر هەڵبكوتێتە سەر كابرا و ماڵەكەی ببات، زەرەرمەندیەكی گەورەیە.*

٥١. هەزار حەكیم بەقەی دەردەدارێكی لێ نازانێت.

*كەسێك وا بۆخۆی نەخۆشینێكی هەبێت یا دەورەی نەخۆشینێكی تێ پەڕاندووە تەواوی نیشانە و ئازار و حوكمی نەخۆشیەكە دەزانێت. حەكیم لە ڕووی نیشانەكانی نەخۆشیەكە دەزانێت كە كابرا چە نەخۆشیەكی هەیە. ئەگەر لە دەردەدارێك پرسیاری ئەو نەخۆشییە بكەیت تەواوی وردەكاری نەخۆشینەكە دەزانێت.*

٥٢. كەی حەكیم بۆ لای دەردەدار چووە.

*ئەگەرچی ئەوسا ڕۆیشتنی حەكیم بۆ لای نەخۆشان نەریتێكی باو بووە. جاری وابووە كە نەخۆشێك نەیتوانیوە لە ماڵ بێتە دەر یا لاقی شكاوە و بۆ هێنانەدەرەوە نەبووە. چوونەتە شوێن حەكیم تا سەردانی نەخۆشەكە بكات. ئەوەی مەبەستی ئەم پەندەیە ئەوەیە كە لە بنەڕەتدا نەخۆشان و كەسی دەردەدار سەردانی حەكیمی كردووە و بۆ چارەسەری و چاكبوونەوەی چووە.*

٥٣. كار ئینسان گەرم ئەكاتەوە.

*جووڵاندنەوە و ماندووبوون بۆخۆی وزە سووتاندنە و جەستە لە ڕواڵەت و ناوەرۆكدا گەرم دادەگەڕێت. هەروەها لە باری دەروونیشەوە كاتێ كەسێك كار دەكات و جەوهەری كار لە خۆیدا دەنوێنێت هەست بە ئاسوودەیی دڵ و هیوابوونی ژیان دەكات و تەمەڵی و بێكارەیی ڕووی تێ ناكات. چونكا تەمەڵی بۆخۆی جەستە و دەروونی مرۆڤ خاو دەكاتەوە. خاوبوونەوە و تەمەڵی ساردی پێوەیە و گەرما لە دەست ئەدات.*

٥٤. خەیار ساردی تێرێت.

*سروشتی خەیار و میوەكانی دیكە وەكوو شووتی، كاڵەك، هەڵووژەترشە، سێوەتاڵ، و*

هیتر، ئەمانە سروشتی سارد و تەڕیان هەیە. كاتێ كەسێك بە سروشتی سارد و تەڕ، ئەو میوە و بەرە ساردانە بخوات برك و ژان و ئازاری ناوسك دەگرێ و زوو كۆڵنج دەكات و جەستەی دەگیرێت. ساردی كردن لە ئامۆژگاری حەكیمانی كوردەواری زۆر پێداگری لەسەری كراوە كە ڕەچاو بكرێت. ڕشانەوە یەكێك لە نیشانەكانی ساردی كردنە.

٥٥. كوڕ ڕۆن و دۆشاوە.

لە بەرامبەر ئەم قسەیە دەگوترێت: كوڕ ڕۆنە حلەیە. واتا كەسێكە بە هەموو با و نەخۆشی و ئازار و ناخۆشیەك چۆك دائەدات و دائەبڕێت لە ژیان. وەك بەرەی منالی ئەم سەردەمە كە زۆر لاواز و نەمەگین. ئەوسا منال بە ڕۆنی كوردی و دۆشاوی ترێ و توو گەورە ئەبوو نەك بە بازیلی دووكان و بازاڕان. گوایە خەڵكی ئەوسا زۆر تونـدوتۆڵتر بوون و خەڵكی ئێستا شلەپەتەن. ڕۆن و دۆشاوێك كە هاوینان دەكرایە خیگە و جێ دەكەوت تا زستان. ئینجا زاركیان دەكردەوە و بەیانیانە لەوە نانی بەیانیان دەخوارد. خۆراكێكی تەواو پڕ و دەوڵەمەند بوو.

٥٦. بە بەهار و هاوینا گوێز مەخۆ كەچەڵ ئەبیت.

پێویستی بە توێژینەوەیە. ئەوەی دیارە گوێز میوەیەكی چەورە و سروشتی گەرمە. كاتێ خۆراكێك سروشتی گەرم بێت بۆ وەرزێك كە ئەویش سروشتی گەرمە، نەشیاوە.

٥٧. هەوای بەری داویەتی لە سەری.

مەبەست لە كەسانێكە كە هەوای جنسی زۆری بۆ هێناون و كاری وا دەكەن كە زۆر نەشیاوە و لە ڕووی عەقڵەوە نییە. جاری وایە كەسێكی پیر و بەساڵاچوو ئەم هەوایە دەكەوێتە سەری و دوای ژن دەكەوێت.

٥٨. كابرا خوێن بەرچاوی گرت زۆری لەگەڵ مەڵێ و لێی گەڕێ.

خوێن بەرچاو گرتن واتا ئەوپەڕی ئاستی تووڕە و قەڵس بوونی كەسێك. مرۆڤ لەو كاتەدا لەبەر تووڕەیی خۆی لەوانەیە هەڵوێستی خراپ بگرێتە بەر، وەكوو: چەقۆوەشاندن و پەل فڕێدان. ئامۆژگاری حەكیمان ئەوەیە كە تاكی بەرامبەر كە هەستی بەم دۆخە كرت ئارام بگرێت و دیان بە جەرگی خۆیدا بنێت و بەرانبەركێ نەكات و دەم نەنێتە دەمی. ئەگەر جنێو و ناتۆرەیشی گوت. چونكا بەرەبەرە ئەو كەسە خاڵی ئەبێتەوە و دائەساكێت.

٥٩. خواردنی دۆینە و ڕۆن بۆ زستان و كاتی نەخۆشی پەتا و ئالامەت خاسە.

دۆینە خۆراكێكە بەهارانە و سەرەتای هاوین لە دۆ خەستە و بڕوێش و ساوەر ساز دەكرێت. سەڵكی دۆینە لەسەر پڕژ و پووشی پوونگە وشك دەكرێتەوە. ئینجا لە كوڵاندنا

*پوونگە و ڕۆنی تێ دەكەن تا تام بگرێت. دۆینە درەنگ سارد دەبێتەوە و خواردنی بۆ كەسێك كە بەهۆی سەرماوە نەخۆش كەوتووە بەسوودە. جیا لە گەرمی دۆینە هەڵمژینی بۆن و تامی پوونگە لە كاتی وشككردنەوە و تێكردنی نەعنا و پنگ لە كاتی كوڵاندنا دەبێتە هۆی گەرمیبەخشین بەو چێشتە. كەواتە لە كەشێكی ساردی زستانە و بۆ چاكبوونەوەی نەخۆشی سەرما، دۆینە باشترین چارەسەرە. پوونگە، نەعنا و هەزبی سێ ڕوەكن كە سروشتی گەرمیان هەیە و بۆ چێشتێك كە سروشتی ساردە، باشترین چاشنی چاكسازە.*

٦٠. بۆ لە شیرچوونەوەی ژنان كەرتەشی بكە بە ملوانكە.

*كاتێ دایك مناڵەكەی لە شیر دەگرێتەوە چەند ڕۆژ یا زیاتر شیر لە مەمكیدا بەردەوام دەبێ و هەیە. ئەم شیرە دەبێتە هۆی كێشە و ژان. هەرچی زووتر چۆڕایی بێت باشترە. ڕێگایەكی ئەوەیە كە تۆپە دڕكاویەكەی كەرتەشی بهێنێت و لە توورەكەیكی بخات و بیكاتە ملی. ئەو چڵەكاندنەوە و ترساندنە لەوەی كە كەرتەشیەكە ئازاری نەدات و تێی هەڵنەچەقێت دەبێتە هۆی لەشیر چوونەوەی.*

٦١. شەوانە گۆزەی ئاو سەری بنەرەوە با جنۆكە و ئەوانیەل میزی تێ نەكەن.

*سەرنانەوەی گۆزە هێمایەكە بۆ ئەوەی كە خۆراك و ئاوی سەرتاك مەترسی تێكەوتنی ژەهر و پیسایی و شتی دەرەكی هەیە. لێرە مەبەست لە جنۆكە، دەكرێت وەك كەسانی نەیار و دەرەكی بیشوبهێنین. ئەوانەیل بە هەموو ئەو كەسە ناسراو و نەناسانە دەگوترێت كە لەوانەیە ڕق هەڵگرن لە ئێمە و شەو ژەهرێ یا شتێك بكەنە ناو ئاوەكە بۆمان. ئەڵبەت دەشكرێت مەبەست ئەوە بێت كە گۆزەی سەرتاك، ئەگەری ئەوەی هەیە گیانلەدار و مێروویەكی زیانبەخشی تێ بكەوێت.*

٦٢. وردە بەردێك كەوتە ناوچاوی كەسێك دەبێ بە نووكی زوان دەری بهێنیت.

*ئەم شێوە دەرهێنانە ئاسانترین و سادەترین ڕێگەیە بۆ ئەوە كە زەبر و زیانی زیاتر بەر چاو نەكەوێت و بریندار نەبێت و خوێنی تێ نەزێت. یا خوانەخواسە چاو تووشی تانە نەبێت.*

٦٣. ئەوانەی گوێیان ژان ئەكا یا بەهۆی تێكەوتنی شتێكەوە ئێشێت، كرۆكی پیاز یا كوڵۆیەك سیری پیشاوی تێ بخات.

*ئەوسا دایك بۆ دەركێشانی چڵك و ئاوجزی گوێ و مراندن كفتوكۆی ناوگوێی منالەكەی، پیازی دەپیشاند و ئینجا توێكڵەكەی لێ دەكردەوە و كرۆكەكەی دەخستە ناوگوێ و بە پەڕۆیەك سەری دەبەست تا كاتژمێرێك یا زیاتر. ئەم كارە چەند جار و چەند ڕۆژ دووپات*

*دەکرایەوە تا چڵکەکە دەربکێشێت.*

٦٤. کەسێ چاوی گل ئەکا و سوور ئەبێتەوە، شیری ژنی تێ بکا چاك ئەبێتەوە.

*دەبێ شیری ئەو دایکانە بێت کە منالەکەیان کچە. چونکە گوایە شیری دایکی کچ تراوترە و لە ناو چاودا چاکتر دەسووڕێتەوە و چڵك و چیلکە فڕێ دەداتە دەرەوە و گلی چاو دەمرێنێت.*

٦٥. بۆ شکاندنی ژانی ددان مێخەك، سمڵ، جەوی هەڵووژە و شێلانە و تریاکیان خستووەتە کلۆری ددانەکە. یا ئەوەیکە ناو کولۆرەکەیان داخ کردووە. یا ئەوەیکە پەڕۆی گەرمیان لەسەر لاشەویلکە داناوە.

٦٦. ماجوومی سرێش و ماس ئەگەر بیخەیتە سەر پووکی ددان و تاوێ ڕایگری، چڵك و زووخی ددانەکە کۆ ئەکاتەوە و ئاسان درگای ئەبێ و ئەو چڵکە دێتە دەرەوە.

*باشتر وایە ئەو کەسەی ددانەکەی ئێشێ پشوودرێژ بێ و هەرچی زیاتر ئەو ماجوومە لەسەر پووکەکەی بێ زووتر ڕزگاری دەبێ لە دەست کیس و کیمی ددانەکەی. ئەڵبەت نابێ ئاوی ناودەمی قووت بدات تا ماجوومەکەی پێیە.*

٦٧. پاش ددان کێشان تا ڕۆژێك دەبێ چایی ڕەش و تاڵ وەردەیت لە ناودەم و تفی بکەیتەوە. تا برینەکە ببرژێنێتەوە و خوێنەکەی بگیرسێتەوە.

٦٨. کەسانێك وا پێستی سەر یا لاشەیان گەڕ دەبێ پاش شۆردن بە سابوونی ڕەقی و ئەسپۆن، بە ماجوومی گەڕی هەڵیبناوە.

*ئەو ماجوومە لە شارەزەردەواڵەی کوتراو یا سووتاو لەگەڵ ماستدا دەگیرایەوە. ئینجا چەند جار لە شوێنەکەیان دەگرت.*

٦٩. ئاژەڵ بەتایبەت مەڕ و مانگا کاتێ شوێنێکی تووك ئەداتەوە یا گەڕ دەبێ، جەوتاوی بەڕوو یا ڕیتاڵەی گەوڕی تێ ئەگرن.

*جەوتاو هەمان کوڵاندنی جەوتی بەڕووە کە پێست توند دەکاتەوە. ڕیتاڵە بە شیاکە و پەینی شلی بەهارانەی ناو گەوڕی مانگا دەگوترێت.*

٧٠. چەپەڵی بە چەپەڵیەوە ئەچێت.

*ئەوسا هەندێ نەخۆشی وەك کوان و قوونێر و گولی بە نەخۆشی چەپەڵی دانراون. بیستوومە کە پیسایی مرۆڤیان لە کوان گرتووە کە درگای بێت. یا خوێنی کیسەڵیان لە پێستی گول گرتووە چاك بێتەوە.*

٧١. کولێرەمەژگە بخۆ با گەرمت بێتەوە و پاییزەڕێز نەبیت.

*پاییزانە کاتێ گوێز پێ ئەگات وەرزی کاکڵە و سەلکە پیازە. دایکان کاکڵە وشکە بە سەلکە پیازی سپییەوە دەکوتن و وەك کەلانە، کولێرەی لێ دروست دەکەن و بە کولێرەمەژگە دەناسرێ. ئەم نەریتە تایبەتی ناوچەی هەورامان و شارەزوور و ئەردەڵانە. مەژی یا مەژگ هەمان مەغز و مێشکە. سروشتی گوێز و پیواز گەرمە و تایبەتی وەرزی سەرماوسۆڵەیە کە جەستە گەرم دەکەنەوە.*

٧٢. تۆم لە هەمرۆ و بەیا بگرسێت و لە ناوشێلانان لەدایك بێت.

*ئەوسا ئەمە ئامۆژگاریەك بووە کە ئەگەر تووی منداڵ لە سەرەتای پاییزدا بگرسێت کە وەرزێکی پڕ میوەی جوانە وەك گوێز، هەرمێ، هەڵووژەڕەشە، بەهێ، گوێژ، هەشتاڵوو پاییزە، قەزوان، و هیتر. هەروەها دیسانەوە کۆتایی بەهار کە دەسپێکی گەیشتنی هاڵەبلاّلووك و شێلانە و بێستانە، دایك وزەی پڕ وەرئەگرێت و داناهێزرێ و منداڵەکە پڕ و پوخت دەر دێت. دایکان کاتێ هەستیان ئەکرد سکیان پڕ بووە و دووگیانن، بەهێیان هەڵدەگرت و بەرەبەرە ئەیانخوارد تا منداڵەکەیان ئەبوو. چونکا باوڕیان وابوو بەهێ منداڵ جوان و شیرین ئەکات.*

٧٣. لێدانی منداڵ بە دەستی دایك، گۆشتی پێ ئەگرێت.

*ئەم قسەیە لە چیرۆکێك سەرچاوەی گرتووە. گوایە ژنێك ئامۆژگاری پیاوەکەی دەکات کە ئەگەر مردم باڵم ببڕەوە و بیپێچە بە پەڕۆیەکدا. بیدە بە دەست باوەژنی منداڵەکانم با بەو باڵە لێیان بات. پیاوەکە ئەم وەسیەتە گوێ ئەگرێت. باوەژنەکە قینی زۆری لە منداڵی مێردەکەی بووە. هەرچی کوتەکیان ئەدات ئەوان زیاتر گۆشت ئەگرن. ئاخری ڕۆژێك دەلیلی تێ ئەگەڕێت و گومانی تێ ئەکەوێت لە ماکی کوتەکەکە. ئینجا دەیکاتەوە و نهێنیەکەی بۆ دەر ئەکەوێت". ئەڵبەت لێرە مەبەست لە لێدان ئازاردان و کوشتوبڕ نییە. بەڵکوو زللەیەکی بچووك و مشتەکۆڵێ بەئەسپایی دایك بۆ منداڵ جۆرێك گێڕانەوەیە لە بێپەروەردەیی و لاساریی.*

٧٤. کەنیشك و کوڕ دوای منداڵی تا نزیکەو هاوسەرگیریيان بەقەی پیاوی سەرە کاریان پێ مەکەن با نەکۆرییێنەو.

*کۆریانەوە واتا دواکەوتن لە گەشە. کاتێ کەسێك پاش منداڵی کاری زۆر دەکات و وزەی زۆر لە دەست ئەدات و جێگرەوەی وزەی کەمە. تووشی ڕاوەستانی باڵا دەبێت. پیاوی سەرە بەوانەی دەگوترێت کە کەوتوونەتە پاش قۆناغی گەشەی بالا و هاوسەرگیرییان کردووە و وزەیان جێ کەوتووە. هەندێ جار لە کوردەواری منداڵ هێندە کاری سەخت و گران دەکات کە جەستەی تووشی لاوازی دەبێت و باڵا ناکات و داکوتراو ئەمێنێتەوە.*

٧٥. دووری دۆست سۆ ئەداتە دڵ.

*دۆست و دەزگیرانـی شـوێنی دوور بـۆ یـار دژوارە. ئەوسـا وەك ئێسـتا نەبـووە بەهـۆی تەلەفۆنەوە پێوەندییەکان زوو زوو بێ. زۆر چـاوەڕوانی و تـامەزرۆیی و تاسـەکردن بۆخـۆی دەردی گرانە کە تەنیا چاوپێکەوتن و دیدار و بەیەك گەیشتنەوە دەرمانی دەکا. سۆ یا سویێ هەمان دەردە. هەندێ جار بە "سۆڵە"یش دەگوترێت. بۆ نموونە دەگوترێت: دیانم سۆڵەسـۆڵ ئەکا. یا ناوسکم سۆڵەی تێ ئەو ترشیمە خوارد.*

٧٦. قسەی تاڵ لەسەر دڵ ئەمێنێتەوە.

*قسەی تاڵ واتا قسەیەکی ناخۆش و ناتۆرە کە کەسێك بە ڕق یـا شـەڕەوە بە کەسـێکی بەرامـبەری دەڵێـت. لەسـەر دڵ مـانەوە واتـا کـاریگەری نـاخۆش بـوونی قسـەکە لەلایەن قسەپێگوتراوەکە کە هێشتا لەبیری نەچووەتەوە و چاوەڕێیە داوای لێبوردنی لـێ بکـات و لە دڵـی دەربکـات. ئەوانەی کە قسـەی تـاڵ بەکـار دەهێـنن، هەنـدێ جـار بە "قسەسـۆڵ و قسەبچڕیاو"ـیش دەناسرێن.*

٧٧. خوێنت بەر بوو جارێ خۆت مەشۆ. ئاوجز ئەکەیت.

*ئەم ئامۆژگارییە بۆ خانمان ئەبێت کە سووڕی مانگانەیان هەیە. ئەم قسەیە بـۆ سـەرەتای سووڕەکەیە کە خوێن یەکەژە بەر دەبێتەوە. ئاوجز هەمان ئاودزەیە کە بەدەن ئاو دەکێشێت و تووشی چڵك و کۆڵنج و برك دەبێت.*

٧٨. کچ لە کاتی سەروعوزر شۆردن هەنگویناو و جەرگی برژاوی بخوا با لە پێ نەکەوێ.

*کچان لەم قۆناغەدا وزەی زۆر لە دەست ئەدەن و ورەیان هەندێك دەشـکێت. هەنگوینـاو و جەرگی برژاو دەبێتە هۆی قەرەبووکردنەوەی داشکانی ئەو وزەیە.*

٧٩. ئەگەر منداڵێك گەشکە یا فێی لێ هات پەڕۆیەك ڕەش بدەرە مل چاویا.

*ئەم نەریتە تایبەتی ناوچەی بادینانە. کاك ئیسماعیل شاهین تەهـا لە دهـۆك باسـەکەی گێڕایەوە. ئەوسا کاتێك منداڵێك یا تەنانەت گەورەیەك تووشی فێ دەهاتن یا پیرانیـان دەکـرد پەڕۆی ڕەشیان بۆ تاوێك دەدایە سەریاندا. باوریان وابوو کە گەشـکە و فـێ لەبەر دواکردنـی مانگەشەووەوە تووشی مرۆڤ دەبێت. جا کاتێ مانگ دەگیرا پەڕۆیەکی ڕەشیان لەسـەر بـانی بەرز ڕادەخست تا مانگ بەر دەبوو. کەسێك کە ئەو پەڕۆیەی پێ بوو تـا مانـگ گیرانـی تـر بەردەوام خەڵك سـەردانیان دەکـرد و منـداڵیان کە گەشـکەی کـردووە بردوویـانە تـا چـاك بووەتەوە. بادینی بە گەشکە دەڵێن: کێمك یا پەرکەم.*

٨٠. گەلاوێژ هەڵهات شەوانە لە کانی و کارێزی دەرەوە ئاو مەخۆرەوە.

*ئەڵبەت ئەمە جۆرێك پارێزە. تـوونیەتی چـاوی لەمـانە نیـیە و پێشـی ناگیرێـت، بەڵام کاکڵەی مەبەسـت ئەوەیە کە گەلاوێـژ هەڵـدێت هەوا بەرەو سـاردی دەڕوات و کانیاوەکـان سارد دەبنەوە و ئاو دەژێتەوە و هەڵماو کەم دەبێتەوە و تەنانەت میوە و بەری بێستان ترش دەبن. ئەمانە هەموو نیشانەی سروشتی ساردە و نەخۆشی ساردییان پێوەیە. جا بۆ پێشگرتن لە ساردی کردن پێویستە لە خواردن و خواردنەوەی ئەمانە ئامۆژگارییەکان لەبەرچاو بگرین با پاییزەڕێز نەبین.*

٨١. بۆ ئەوەی قۆزە و قوڕگێشەت خاس بێتەوە ئاوی تووی بەهێ بخۆ.

*تووی بەهێ ئەگەر بکرێتە ئاو و شـەوێك بمێنێـتەوە. لینجاوێـك ئەداتەوە. خـواردنی ئەم لینجاوە بە سێ ژەمە دەبێتە هۆی چاکبوونەوەی ئازاری قوڕگ و کۆخە.*

٨٢. خوێاوك هەڵدان لە ناودەم بۆ لابردنی نەخۆشی دەم و ددان و لابردنی چڵکـی گەروو چاکە.

٨٣. ناوگەڵی منالی ساوا بۆ ئەوەی نەسووتێتەوە، گڵی سواغی دیواری لێ بدە.

*گڵی ماڵ ناوینەوە یا هەمان سواغی دیوار لە خـاکی گڵەجـانێ و کـانی قسـڵ و زەرد و سپی دابین دەکرێت. پاییزانە کە ماڵ ناوینەوە دەکرێت و وشك دەبێتەوە، دایك هەر جارە بۆ پێشـگرتن لە سـووتانەوەی نـاوگەڵی منـاڵە کـۆرپەکەی لە گڵـی دیـوارە سـواخدراوەکە دەکەنێتەوە و پێیدا دەکات.*

٨٤. خواردنی بەڕووی پیشاو بـۆ لابردنـی برینـی گەدە و گیرسـانەوەی خـوێنی ناوسـك بەسوودە.

*بەڕووی داری بەڕووەخاسە ئەگەر سەر و قوونی بگریت و لە خەڵووز یا خیزی ناو کوانوو بیپیشێنی و بیخۆیت زۆر بەسوودە و پاش چەند ڕۆژ ژانی گەدە و ناوسك ناهێڵێت. ئەڵـبەت هەندێ گرسە و بۆ قەبزی خراپە.*

٨٥. جاری یەکەم ئـاوت لە دەسـت کچـێ قەیـرە خـواردەوە، جـاری دووهەم لە پـۆیلە کردنیدا بیخۆرەوە.

*ئەڵـبەت ئەم قسـەیە بە شـێوەی تونـدتریش دەگوترێـت: ئـاوی دەسـت کچـی قەیـرە مەخۆرەوە. مەبەست لەم قسە ئەوەیە کاتێ کچێك کە ماوەتەوە لە مێرد کـردن، ئـاوی بـۆت هێنا ئەو چاکەیەت لەبەر چاو بێت و قۆڵی بۆ هەڵماڵە و بە مێردی بدە با بچێتە سەر ماڵ و ژیانی خۆی. پۆیلەکردن نەریتی زەماوەندی کـوردانە کە پـاش نـاوتێلانە کە بـووك لە مـاڵی*

*خۆی دەست بە کار دەکات، خەڵك سەردانی دەکەن و بەخێر هاتنی پێ دەڵێن و شتی بۆ دەبەن.*

٨٦. کاتێ شوێنێکت کوترا و خوێنی تێ زا، یا تووشی ئازار هات، یا زەبرێکی وێ کەوت و ڕەش بووەوە. نیمەنمەکی لێ بگرە.

*نیمەنمەك هەویری خاوی سوێرە. کاتێ لە شوێنی کوتران و ژانی دەگری کفت و کۆی ئەو شوێنە دەمرێنێت و ژانەکەی دەشکێت. دەبێ پەڕۆیەکی پێوە ببەستیت تا بەیانی. جاری وایە نیمەنمەك بۆ ژانی ددانیش بەکار هاتووە.*

٨٧. ئەوانەی لووتیان دەشکێت یا زەبری وێ دەکەوێت بۆ کفتوکۆ مراندنی نیمەنمەکی بە دۆشاوەوە لێ بگرن.

*جاری وا هەیە کە زەبرێك بەر لووت دەکەوێت و خوێن دەکەوێتە ناولووت و وشك دەبێتەوە. کوتران یا شکانی ئێسکی لووت لەگەڵ خوێنبەربوونەکە دەبێتە هۆی مینگن بوونی کەسەکە. جا بۆ ئەم مەبەستە نیمەنمەك بە دۆشاوی توو بگریتەوە ئینجا شەوانە لەسەر لووتی بگریت تا بەیانی و ئەم کارە چەند شەوان دووپات بکریتەوە. دەبێتە هۆی خاوبوونەوەی خوێن و چڵکە وشکبووەکە و بەردانی خوێنە تێزاوەکە لە ناو گۆشتەکە کە ڕاگیراوە.*

٨٨. بۆ دەرهێنانی چەقڵی دەست نیمەنمەکی چەور بەکار بهێنە.

*ئەوسا وەك ئێستا کەرەستەی پێویست نەبووە و خەڵك لاق و دەستیان زوو بریندار بووە و چەقڵ، وردە بەرد و شتی تیژی پێدا چووە بۆ دەرهێنانی نیمەنمەکی چەوریان لێ گرتووە.*

٨٩. ئەگەر منالی ساوا تووشی تاوبردوویی هاتووە ماست و پەڵپینەی تێ هەڵدەسوون.

*منالی ساوا کە ناتوانێت بۆ ڕزگاربوون بە دەست تاوبردنەوە دۆغرمە و شۆرباوی پەڵپینە بخوات، ئەگەر ماست و پەڵپینەی جنراوی تێ هەڵسووی چاك دەبێتەوە. بۆ ئەم کارە شەو پەڵپینەکە بشۆرەوە و بیهەنجنە و لە ماستەکەی بکە و لە مەنجەڵێکی سەرتاکی بکە تا بەیانی لەبەر هەوا دایبنە. ئینجا چێشتەنگاو منالەکە بهێنە و ماست و پەڵپینەکەی تێ هەڵسوو.*

٩٠. بۆ ئەوە گەرما نەتبا چێشتی دۆغرمە و شۆرباوی پەڵپینە بخۆ.

*دۆغرمە لە خەیاری جنراو و ماست و نانەڕەق دروست دەکرێت کە خۆراکێکی تەواو سارده و بابەتی وەرزی هاوینە. پەڵپینەش کە گیایەکی ئاودار و پڕ لە ترشییە، ئەویش بە*

*کاڵی و کوڵیوی زۆر بەسوودە بۆ تاوبردن.*

٩١. ئەگەر جەستەت بەهۆی گەرما، کارکردن یا وەرزشەوە ئارەقی کرد، خێرا جلەکان دەر مەهێنە. با وشکت بێتەوە و "باپەڕ" نەبیت.

*باپەڕ جۆرێك کۆڵنج کردن و گیرانی دەمار و ماسوولکەکانی لەشە کە بەهۆی خێرا ساردبوونەوەی دوای گەرم داهاتن دروست دەبێ. ئەم باپەڕ کردنە بەهۆی گۆڕانی هەوای جەستە لە گەرماوە بۆ سەرما دروست دەبێ. جاری وا هەیە کابرا لە ماڵەوەیە و کاتی زستانە. ژوورەوە هەوا گەرم و خۆشە. کە دێتە دەرەوە جەستە سارد دەبیتەوە، باپەڕ دەکەی.*

٩٢. برسیەتی ڕەگی هاری ها پێیەو.

*هاری واتا هەوڵدان بۆ گەستن و گرتنی گۆشتی کەسێك. هاری لە سەگ و گورگدا هەیە. کاتێ دەم لە خوێن و گۆشتی تازە و زیندەوەری تازە ئەدەن هار دەبن. تەنانەت ئەگەر گوێدرێژیش شێت بێت و قەپ بگرێت لە کەسێك و تامی خوێن بکات دەڵێن ئەو گوێدرێژە هار بووە جا دەبێ چەند ڕۆژ بار ببات تا هاریەکەی بنیشێتەوە. ئەگەر بزنێك قەپ بگرێت و تام لە خوێن بکات و هار ببێت سەری دەبڕن و زۆر جار گۆشتەکەشی ناخۆن. جا کەسێك کە برسی بێت هەڵوێستی نەشیاو دەگرێت و و کارێکی هاوشێوەی بزن و گوێدرێژ بکات.*

٩٣. برسی لە تێری تووڕە ناوێ.

*مەبەست لەوەیە کەس لەخۆڕا و هەڕەمە تووڕە نابێ. تووڕەیی هۆکاری هەیە. نەبووە کەسێك بەهۆی برسیەتیەوە تووڕە بێت و حەکیم بڵێت کە ئەم کەسە برسییە، و تێرە کە تووڕە بووە.*

٩٤. خواردنی تووی کاڵ، مرۆڤ تووشی گرفتی ناوسك دەکات.

*لە کوردەواری بە بەری داری توو کە کاڵ و کرچە، دەگوترێت: گرفت. جا ئەگەر لە قۆناغی کاڵی کەسێك بیخوات تووشی گرس و قەبزی و برك و ژان دەبێت.*

٩٥. فلانی پشتی زەخمە.

*مەبەست لە کەسێکە کە گومانێکی قورسی بەرامبەر بە کەسێك لە دڵدا هەیە و بەردەوام خۆی دەخواتەوە و ئاخ هەڵدەکێشێت و ئازار دەچێژێت. ئەم دەستەواژەیە زۆرتر بۆ ژن و مێرد بەکار دەچێت. کاتێ یەکێك لەوان دڵی پیس ئەکات کە بەرامبەرەکەی کەین‌وبەینی خۆش کردووە لەگەڵ کەسێکی دیکەدا و دڵداری ئەکات و دوور لە چاوی ئەم قسە و باس*

*دەكات. یا ئەوەیكە تەنیا دڵ پیس كردن بێت و هیچ خەوەرێك نەبێت تەنیا ترساندنە لە سازبوونی كەین‌وبەینێك. ئەو كەسە وا بەردەوام بەو خەمەوە ئەتلێتەوە كزی و لاوازی و نەخۆشی ڕووی تێ ئەكات. لە بنەڕەتدا پشت زەخمی لە گوێدرێژدا هەیە كە بەهۆی كار و باركێشانەوە پشتی بریندار ئەبێت. جا چونكا كورتانی لێ دەكرێت و بەدەرەوە نییە بەردەوام ئەو برینە كاریگەر دەبێت لەسەری و ئازاری ئەدات و لاوازی ئەكات. خۆ كەس نایبینێت كە بەهۆی ئەو برینەیەوە وا كز دەبێت.*

٩٦. ئاوی گەنەمێرگ و كانی ناو مۆڵگەی گاگەل و گاڕان مەخۆرەوە گورچیلەت بەردی تێ ئەكەوێت.

*گەنەمێرگ بەو مێرگە دەگوترێت كە شوێنێكە شیناوردی هەیە و زەویەكەی تەڕە و ئەگەر شوێنێكی چاڵی تێ بكەوێت ئاوی تێ ئەچێت، بەڵام نارِوات و ئاژین نابێت. ئاوی گەنەمێرگ قورسە و ئینسان لە ناچاری دەیخواتەوە. كانیاوی لای مۆڵە گاگەل و گاڕان پڕە لە پەیین و پاڵ و تۆزی گاگەلەرێكە.*

٩٧. سوێند بەم قورئانە [= نانە] كە هەر كەس نەیبێت حیز و دز ئەبێت.

٩٨. ماست [و دۆ و شیر] لەتەك شێلانە [قەیسی] پێكەوە ناخورێت.

٩٩. خواردنی سێفزمینی و دۆ [و ماست و شیر] پێكەوە بەڵەكی پێست دروست ئەكا.

١٠٠. هەنگوێن و كاڵەك پێكەوە كەر بیخوات تەختی ئەكا.

١٠١. دۆ [و ماست و شیر] لەتەك ماسی پێكەوە ناخورێت.

١٠٢. ئەوسا چێشتی خزمەتی كرێكاران گونێنە بوو.

١٠٣. ئەوسا ژەمێك لە ناو ڕۆژدا چێشتی خزمەتیان بە كرێكار ئەدا یا ئەوەیكە بە ماست و نان و دۆ ئەیساچاند و ژەمی شێوان خزمەتیەكەی لە ماڵەوە دەخوارد.

١٠٤. ئێژی سایلەی ساردەوبووە.

*سایلە چێشتێكە لە قاوتی گەنم یا كونجی لێی دەنن و دەبێ ڕۆنی زەنگی تێ بكەیت تا بخورێت. سایلە كاتێك سارد بێتەوە زۆر ڕەق دەبێت. كەسێك گێژ و تەمەڵ و نەجووڵە بە سایلەی ساردەوبوو دەیشوبهێنن.*

١٠٥. كابرا بە پیازپاككەرەیش حەساو ناكەن.

*پیاز پاككەر كەمترین پێگەی كار و پیشەیە.*

١٠٦. ماڵەكەی بە چەپكێ پیاز فرۆشت.

*چەپكێ پیاز واتا كەمترین نرخ*

۱۰۷. ڕیخۆڵەی هەڵقرچیاو، مەگەر سایلەی پڕ ڕۆنی پێ بەن بێتەوە خاسەوە بێ.

*ئەوسا کە ڕەمەزان ئەکەوتە ناو هاوین، خەڵك ئێوارانە چێشتی سایلەی کونجی یا برویشیان ئەخوارد. چونکا سایلە گەدە و ڕیخۆڵەی وشکەوەبوو تەڕ ئەکاتەوە و هەروەها چێشتێکی چەور و بەهێزیشە. کەسانێك وا توانستی جوینی نان و چێشتیان نەبووە و نەخۆش بوون، چێشتی سایلەی کونجی باشترین چێشت بووە بۆیان.*

۱۰۸. ئێژی بە تووڵ سرینچك هاتووە.

*مەبەست لە مەڕ و ماڵاتێکە کز و لاوازن. تووڵی داری سرنیچك درەنگ دەشکێتەوە و نەرمە. بە شوان و چێوداران دەگوترێت کە تووڵ و داردەستی داری سرینچك بەکار مەهێنن. چونکا ژانی زۆرە بۆ ئەو ئاژەڵانە و ژانەکەی کزیان دەکات.*

۱۰۹. ئێژی کەر سێففرۆشە.

*بە کەسێك ئەگوترێ کە زۆر قەڵەو بێت. لەوانەیە ئاژەڵ سێوی زۆر بخوا قەڵەو و گۆشتن بێ.*

۱۱۰. بەهارانە منداڵ مەبەنە ژێر داری سرینچك کە گوڵی کردووە. بۆنی گوڵی سرینچك منداڵ نەخۆش ئەخات.

۱۱۱. مەهێڵن ژنان برۆنە ناو بێستانی ترۆزی و کاڵەك و خەیار، بەرهەمەکە کرمۆڵ دەبێت.

*ئەم قسەیە زۆرتر بۆ ئەو ژنانە دەگوترێت کە کراسی شۆڕیان لەبەرە. ئەگینا بیستوومە بۆ ئەو ژنانە وا پانتۆڵ لەبەر دەکەن، وتوویانە قەیدی نییە. ئەگەری ئەوەیە کە کراسی شۆڕ کە بەسەر گەڵا و لاسکی بێستانەکەدا دەکێشرێت گرای مێش و مێرووە زیانبەخشەکان بڵاو بکاتەوە و کرمۆڵی بە هەموو بێستانەکە بڵاو بێتەوە.*

۱۱۲. چێشت و پێخۆری سارد بۆ چیامانی خراپە.

۱۱۳. تووی کاڵ مەخۆن گرفت ئەکەن.

*گرفت و گیران هەمان گیراوی ناوسکە کە کابرا تووشی قەبزی دەبێت و نانی بۆ ناخورێت. بە تووی کاڵ و کرچیش دەگوترێ گرفت.*

۱۱۴. تووی گوڵەبەڕۆژە بەکاڵی زۆر مەخۆن کەچەڵ ئەبن.

۱۱۵. گەڵای سەلکی پیواز وا لە ژێرخان و ئەنبار چەکەرەی کردووە مەیخۆن، کەچەڵ ئەبن.

۱۱۶. شیری کەری خواردووە کە ئەو کارەی کردووە.

*بە کەسێك دەگوترێ ئەوپەڕی خیانەت بکا بە کەسێك وا خزمێکــی نــزیکیە وەك دایــك و خوشکی.*

۱۱۷. ئێژی مەغزە [ناوکە] بادامی خواردووە.

*بە کەسێك دەگوترێ کە توانایی قسەکردن و شەڕەقسەی زۆر بێ.*

۱۱۸. ئەو فرمێسکە وا لە لاسکی بڕاوی مێو ئەتکێــت بــۆ خــاوکردنەوەی مــووی ســەر، سوودبەخشە.

۱۱۹. ئێژی مەغزە کەری خواردووە.

*بە کەسێك دەگوترێت کە ئاستی تێگەیشتنی لە خوار بێت.*

۱۲۰. ئەوسا منداڵی ساوا کە تاوبردوو ئەبوو بە ماســت و پەڵپیــنە یــا ماســت و گەلابــی چاکیان دەکردەوە.

*واتا پەڵپینەیان ورد ورد ئەکرد و ئەیانکردە ناو ماست. ئەم گیراوەیانە شەو تــا بەیــانی لە دەرەوە دائەنا. بەیانی منداڵەکەیان ڕووت ئەکردەوە و بەدەنیان دەگرتە ئەو ماست و پەڵپینە. یا ئەوەیکە گەلای داری بی دەستنیشانیان ورد دەکرد و دەیانخستە نــاو گــۆزەیەك شــەو تــا بەیــانی. وەك ماســت و پەڵپیــنەکە بەیــانی بەدەنــی منــداڵەکەیان بە ئــاوەکە ئەشــۆرد. بــی دەستنیشان بەو بییە دەگوترێت کە خۆڕسك نەبێت بەڵکوو بە دەست ناشترابێت.*

۱۲۱. خــواردنی چێشــتی پەڵپیــنە بــۆ هاوینــان زۆر سوودبەخشــە. چــونکە پــێش بە تاوبردوویی دەگرێت.

۱۲۲. ئەوانەی وا ســـەریان ژان دەکـــات یـــا بەهـــۆی ژانەســـەرەوە مـــووی ســـەریان هەڵدەوەرێت، ئەگەر چەند ڕۆژان خووساوی گوڵی هێرۆ شــەو تــا بەیــانی بگــرنەوە ســەریان چاك دەبنەوە.

۱۲۳. شۆردنی مووی سەر بە کولاتەی ئاوی گوڵە هێــرۆ، هەڵــوەرینی مــووی ســەر کەم دەکاتەوە.

۱۲۴. ئەوانەی وا چیامانی چووەتە ناو ئێسك و پێشەیان، کووزەڵە و مــاکووز بکــوڵێنن و بیخەنە ژێــر قورســین و خۆیــان ڕووت بــکەنەوە و بچــنە ژێــر قورســیەکە تــا تەواو عــارەق دەرئەدات. ئەم کارە چەند جار دووپات بکاتەوە. هەروەها دەکرێت هاوینان لە قەراخی چــۆم، بە ڕۆژی نیوەڕۆدا کە تاو گەرمە خۆیان ڕووت بکەنەوە یا بە لۆی جلێکــی ناســکەوە خۆیــان لە خیز و لمی چۆم داشارێن.

*حەمامی کووزەڵە تایبەتی پزیشکی کوردەواریە.*

١٢٥. پیسی بە پیسییەوە ئەڕوات.

*هەندێ جار برێك نەخۆشی وەك لك و لوو یا كوانی سەر پێست، كە بە دەرمانێك لا ئەچێت لەوانەیە پیس بێت. وەك پشكەڵ و تەرس و لەم جۆرە شتانە.*

١٢٦. ئەوانەی سەریان گرویێ ئەبێ، تێكەڵەی ماست و خۆڵەمێشی شارە زەردەواڵە لە گروێیەكە بگرە. پاشان بە سابوونی ڕەقی بیشۆ.

١٢٧. پیچك و كنیواڵ بخۆ با كرم و كەوی ناوسك بكوژێت.

١٢٨. ئەوسا كە هاوڵە و سووریژە ئەكەوتە ناو ئاوایی، ژنان كۆ ئەبوونەوە و قشقەڕەیەكیان ئەكوشت. یەكسەر بە تووك و گۆشت و سەرەوە ئەیانكوڵاند. ئاوەكەیان ئەدا بە منداڵان تا نەخۆشیەكە نەگرن.

١٢٩. شەوانە گۆزە سەرتاك دامەنە. بەیانیانە لەم ئاوە نەخۆنەوە.

*ئەوسا ئەیانگوت جنۆكە میز ئەكاتە ناو گۆزەی سەرتاك. ڕاستیەكەی ئەوەیە كە گۆزەیەك سەرەی نەبێت لەوانەیە شتێكی پیس یا مێروویەكی تێ بكەوێت.*

١٣٠. كەر ئەبێ بتۆپێ ئینجا فرەی بدەیت. كەری نەخۆش و لاكەوتە نابێ سەری ببڕیت. لە هەر شوێنێك كەر سەری ببڕن قۆزەڕەشە بڵاو ئەبێتەوە. تەنانەت ئێژن ئەگەر هاتوو كەریان سەر بڕی. خێرا فریای بكەون و بیكەنە ژێر خاكەوە.

١٣١. بەفری سەربانان مەخۆن، نەخۆش ئەكەون.

*ئەوسا ئەیانگوت بەفر سەربانان شەیتان میزی پێدا كردووە.*

١٣٢. گەییە خوێنجمان، جارێ نامرێت.

*وا باوە كە خەڵك زۆرتر بە پاییز و زستانا دەمرێت. گوایە ئەگەر كابرای نەخۆش گەیشتە وەرزی خوێنجمان، ئەوە جارێ نامرێت تا دیسانەوە سەرما و سۆڵەی پاییز دێتەوە. (خوێنجمان دەكەوێتە بەهار و بە شنەی بای نەورۆز دەست پێ ئەكات.)*

١٣٣. سەرەتای بەهار خوێنی بەدەن تەڕ ئەبێتەوە.

*[واتا خوێن تراو ئەبێت و خەستییەكەی كەم ئەبێتەوە]. جا هەر بۆیە ئینسان لە نەورۆزان و وەرزی گوڵان جارجارە سەرمای دەبێت و پەتا و ئالامەت دەگرێت. قەدیمی گوتوویانە: كۆتەرە تلیشانە بۆ هەمرۆپشكانە. واتا كاتی پشكوتنی داری هەرمێ لە بەهار ئەگەری هاتنی سەرما هێندە زۆرە كە پێویست دەكات كۆلكە و كۆتەرەی دار بشكێنیتەوە و لە سۆبەی بخەیت.*

١٣٤. نەورۆزان خوێنجمانە.

*واتا خوێن تەڕ ئەبێتەوە. ئینسان جموجووڵی زۆرترە. ئەگەر سەرمایەك لە بەهاردا بێت کابرا زووتر سەرمای ئەبێت.*

١٣٥. ئەوسا كەسانێك وا لە خوێندندا زۆر زیرەك بوون و گیرایی لەبەركردنیان لە سەریّ بووە. ئەیانگوت: لەوانەیە ئەوانە بە منداڵی سیسركە ڕەشەیان خواردبێت.

١٣٦. بێزوو ڕیخۆڵەی ئافرەت كرژ ئەكا، شیرینی ناویّ حەز لە ترش ئەكا.

١٣٧. كەنگر پێگەییشت هەر چەند باداره، دوو مانگ پیخۆری پیاوی هەژاره.

١٣٨. ڕاستە كە باقلە هۆش ئەشێوێنیّ، ڕێواسیش سەودا دائەمركێنیّ.

١٣٩. خوا لە بەهارا گوڵ ئەپشكوێنیّ، سەری قالۆنچەیش بە گوڵ ئەیشێنیّ.

١٤٠. ڕازیانە لەبەر درگامان بارە، كەچی زگێشە كەوتووەتە ئەم شارە.

١٤١. بەتوانج ئەڵێن دوومەڵان زۆڵە، خۆ ئەوەی زۆڵە خەڵات لە كۆڵە.

*دوومەڵان: دومبەڵان یا چمە بەو جۆرە كارگە دەگوترێت كە لە ژێر خاكەوە هەڵدەتۆقیّ و وەك سەلكی سێفزەمینی وایە و نایەتە سەر خاكەكە. بەرهەمێكی گرانە و ئێستاكە لە شەنگاڵ، چەمچەماڵ، هەولێر، خۆی و ئەیوان دەڕسكیّ.*

١٤٢. بە ماڵ دڵخۆش كە لە ڕێی خوادا، مێو تا نەیبڕی بەری زۆر نادا.

١٤٣. ژنان چەپكی گیای برێنجداس یا چنوور بە مەشكەیانەوە هەڵدەبەستن كە بۆی مەشكەكەیان خۆش بێت. هەندیّ ژنان گیاكە ئەخەنە ناو مەشكەكە تا بۆی دۆكەیان خۆش بكات.

*برێنجداس هەمان جۆری گەڵا بارێك و بۆنخۆشی گیا بێژانە.*

١٤٤. ئامۆژگاری ژنان دەكرێت كە كاتیّ قول هەڵدەكەن و ئەڕۆنە ناو ئەستێر و كانی، كووزەڵە هەڵبكەنن. ئاگەدار بن كە گوڵ و گەڵای گیای ماكووز لە شەرمگایان نەكەوێت. چونكا دەیماسێنێت و بریندار دەبێت. هەر بۆیە ماكووز بە "كوزەماسە"یش دەناسریّ.

*ماكووز (گیای كوزەماسە) لەگەڵ كووزەڵە سەوز دەبیّ و بە فارسی بە "سیزاب جویباری" دەناسریّ.*

١٤٥. كچ دەڵێی گیای شلەجافە، زوو گەورە ئەبێت.

*شلەجاف هەمان قۆنـاغی بەهاری گیای گوڵە ئاوەنیایە كە بەهارانە گەڵا لینج و درێژەكانی زوو سەر لە خاك دێنێتە دەر.*

١٤٦. ئێژی گاگلێنكەی خواردووە، گێژ بووە و ناتوانێت هەستێت.

*گاگلێنكە بە چەند گیا دەگوتریّ: جۆریّ گیای خاشخاشكەیە، جۆریّ پۆلكەیە، جۆری*

*وێنجە كێویلەیە كە بە وێنجە دڕكینە دەناسرێت.*

١٤٧. پۆلكە مارانە مەخۆن سەرەگێژە ئەگرن.

*پۆلكەمارانە جۆرێك گیای پۆلكەیە (بە فارسی: خلر، سنگینك) كە كەڵـووەكەی تـۆخێكی سپی و تووكنی پێوەیە.*

١٤٨. كوڕ ساڵێك یەك گەنم باڵا ئەكات و كچ ساڵێك دەنكە جۆیەك.

١٤٩. ئێژی ماخۆلاوییە هەر دێت و دەڕوات.

*ماخۆلاو یا ئاورۆشنەوكەرە بە هەمان مێـرووی سـەر ئـاوی كانیـاوان دەگـوترێ كە هەر دێت و دەڕوا و یەك چركە ڕاناوەستێ. جا گوایە ئەوانە وا تووشی نەخۆشـی مـاخۆلاو یـا بە فارسی ماخولیا دەبن، بەردەوام وەك ئەو ئاورۆشنەوكەرە دەسوورێنەوە.*

١٥٠. ئەگەر چوویتە سەر كانی و كارێز ئـاو بخـۆیتەوە. ئـاگەدار بە زەرووی نـاو ئـاوەكە نەخۆیتەوە. چونكا زەروو بچێتە ناوسكتەوە، نامرێت و بە ڕیخۆڵە و گەدەوە ئەچەسپێت.

*بە منداڵانیان دەگوت زەروو نەخۆن ئەبێتە گوێرەكەسوورە لە ناوسكتاندا.*

١٥١. ئێژی دایكی بەیخۆر بووە.

*بە منـداڵێك ئەگـوترێ سـیما و پێسـتێكی جـوانی هەیە. گـوایە ئەگەر دایكـان كـاتی دووگیانی بەهێ بخۆن منداڵەكەیان جوان دەبێت.*

١٥٢. گوێرەكەی كولكن و منداڵ لیكن هەر دوو ڕەسەنن.

*واتا كولكنی و لیكنی نابێتە هۆی زڕبوون و خراپی وەچەی منداڵەكە.*

١٥٣. ئێژن كۆڵنج وتوویە: نەمبڕوێنیت، ئەتبڕوێنم.

*واتا كاتێ كۆڵنجت كرد، دەبێ خێرا بكەویتە هەوڵی ئەوە كەسێك دەستی پێـدا بهێنێـت و نەرمی بكات و بیتەقێنێ. ئەڵبەت لە دروێنە كردن "كۆڵنج بڕین" هەیە. كاتێ چەند كەس پێكەوە دروێنە دەكەن و یەكیان بەرەدرەوەكەی بۆ ناچێتە پێشەوە و جێ ئەمێنـێ. ئەو بەرە جێماوە بە كۆڵنج دەناسرێت. دەڵێن: كۆڵنجیان بڕیوە بۆی تازە كۆڵنجی ئەتەقێ.*

١٥٤. نانی بەیانی بە تەنیا بخۆ. نانی نیـوەڕوان لەگەڵ دۆسـتێك و نـانی شـەوانە لەگەڵ دوژمنەكەت بخۆ.

*لێرە نرخی ژەمەكان نیشان ئەدات كە نانی بەیانی چەندە بەسوودە بخورێت و خـواردنی نانی شەوانە نرخی وەهایە كە ئەگەر ویستت لە دوژمن نزیـك نەبیـتەوە و نـانەكە نەخۆیـت كێشە نییە.*

١٥٥. لە گۆشت بەرخ خۆشترە.

*بە خۆشترین خۆراك دەگوترێت. گوایە گۆشتی بەرخۆڵە زۆر خۆشە.*

١٥٦. شیرەكەی دایكی حەڵاڵ كرد.

*واتا كارێكی كرد بۆ دایكی كە ئەوپەڕی خۆشەویستی خۆی و ئەمەگداری بە دایكی نیشان دا.*

١٥٧. ئێژی چاو قرژانگە.

*مەبەست لە ئاوی كانییەكە كە ڕوون و بێ خەوشە. گوایە چاوی قرژاڵ زۆر ڕوونە.*

١٥٨. ماسی لە ناو ئاو هەر وەخت بیگری تازەیە.

١٥٩. هاوینان و بەهاران گوێز و كاكڵەی وشك مەخۆ، كەچەڵ ئەبیت.

١٦٠. كەر زڕناقی جۆیشی بۆ ناخورێت.

*كاتێك گوێدرێژێكی نێر ڕێگەی ئەكەوێت و ماكەرێك فاڵ ئەدا تا ماوەیەكی زۆر هێندە بزۆز و چرووسك ئەبێت و ناچێتە ژێر بار و جووتە ئەوەشێنێت كە تەنانەت جۆ كە كەر زۆر خۆشی لێ دێت، نایخوات و تەنیا لە بیری فاڵدانەكەیە. لێرە مەبەست لە باری نەرێنی هەوەسبازی مرۆڤە.*

١٦١. فڵانە كەس پشتی بریندارە وا هێندە كز و لاوازە.

*بە هاوسەرێك لە مێردەكەی دڵ پیسە و خانەگومانە، دەوترێ. دایم بیری لای ئەوەیە كە مێردەكەی دۆستی هەیە و ڕۆژێك سەربەهەوەی دەكات. جا كاتێ ژنێك بێهۆ كز دەبێت. دەگوترێت كە ئەوە بیر لەوە دەكاتەوە وای لێ دێت.*

١٦٢. لە چاوی خۆشتری دەوێت.

*واتا سەرووترین ئاستی خۆشەویستی.*

١٦٣. جەرگ خۆشەویستە.

*جەرگ واتا منداڵ.*

١٦٤. جەرگی كونكونە بە دەست فڵانییەوە.

*سەیری جەرگی كون بووە، بكە.*

١٦٥. جەرگی كون بووە بە دەستیەوە.

*واتا لە دەست كردار و ئاكار و قسەی كەسێ، كەسێكی تر لەوپەڕی ئازاردا بێت.*

١٦٦. دڵی داكەوت یا دڵی بەر بووەوە.

*واتا كەسێك بە بینین یا بیستنی هەواڵێك بەتوندی ڕاچڵەكێ.*

١٦٧. وەختە دڵی دەربێت.

*واتا ئەوپەڕی ویست و خوازی کەسێك نیشان ئەدات بۆ کەسێك یا شتێك.*

١٦٨. خوێن بەرچاوی گرتووە.

*واتا زۆر تووڕە و قەڵسە و ئەگەر بەرانبەرەکەی جواوی بداتەوە وەی و شـەڕێکی خراپـی تووش دەبێت. چونکە هەڵوێستی کوشتنی گرتووەتە بەر.*

١٦٩. دڵی لە ڕیشە دەرهات.

*واتـا ئەوپەڕی کـاریگەری خراپـی تـووش بـووە بەهـۆی ڕاچڵەکـین و زانینـی هەواڵ و کارەساتێکی ناخۆشەوە.*

١٧٠. ئاو زاوەتە دەمی.

*واتا باسی شتێ خۆشیان بۆی کردووە یا لە دوورەوە چاوی لە شـتێ خۆشـە و دەسـتی پێی ناگا. هەر بۆیە بیری لێ دەکاتەوە و ئاو دێتە ناو دەمی.*

١٧١. ئاو پەڕیوەتە چاوی.

*واتا فرمێسکی هاتووەتە ناو چاوانی.*

١٧٢. لووتی بۆ ناژنەوێت یا لووتی کەڕ بووە.

*واتا هەستی بۆیایی نەماوە. ژنەوتن لێرە واتا هەست کردنی بۆن.*

١٧٣. گوێز دەستی ناخورێت.

*بە کابانێك دەگوترێت کە دەستاو و چێشت و نانی دەستی ناخۆشە و پیسکارە.*

١٧٤. دەستاوی خۆشە.

*بە کابانێ دەگوترێت کە دەستاو و پوختی خۆشە.*

١٧٥. گیان بکەیتە گیانیدا چاك نابێتەوە.

*واتا دیسانەوە گیانێ تر بخەیتە جەستەیەوە چارەسەری نـایەت. ئەوپەڕی بـێهیـوایی لە چاکبوونەوەی کەسێك نیشان ئەدات.*

١٧٦. ئێژن گاجووت وتوویە: حەفتەیەك جەمـامیم بشـکێنە و حەفتـا ڕۆژ جـووتە ڕەقەم پێ بکە.

*واتا بۆ هەر کارێك سەرەتا نەرمش و خۆگەرم کردنێکی دەوێت. ئینجا کاری سـەرەکیەکە دەست پێ بکە.*

١٧٧. دڵی بە بەهار خۆشە. گۆتی و خوێنجمان نابینێت.

*واتـا دیـمەن و هەوای بەهـاران خۆشـە، بەڵام هەوای ئەو وەرزە خـوێنی مـرۆڤ تـراو دەکاتەوە و زوو سەرمای دەبێت و زوو جەمام دەبێت. گـۆت واتـا گیـران و جەمـام بـوونی*

*ماسوولکەی لەش.*

١٧٨. دڵێك هەزار دڵ حەیرانییە.

*واتا زۆر جوانە و دیمەن و سیمایەکی خۆشی هەیە و کابرا هەر پێی خۆشە سەیری بکات.*

١٧٩. لە ڕێواساوا ماسی گرا ئەکات. لەو کاتا ماسی نەخۆیت نەخۆش ئەبیت.

*ڕێواساو بە وەرزی پێگەیشتنی ڕێواس ئەگوترێت. گوایە ئەوکاتەی ماسی گرا ئەکا مژدی بە تاماوی ڕێواسەوە ئەکات. ڕێواس تامێکی ترشی هەیە و ئەگەر باران لێی بدات و بە چۆڕاوە و شەتاو بگاتە چۆمەکان، ماسی ئەتوانێ بیخوات. گوایە ژنان زۆرتر بە بابەتی ترشەوە مژدی ئەکەن. جا بۆیە لێرە باس لە ترشاوی ڕێواس ئەکەن بۆ گرا کردنی ماسی.*

١٨٠. ئێژی مووسا گرتوویە و عیسا خنیویەتیەوە.

*واتا کەسێك زۆر قەڵەو بووە.*

١٨١. ئێژی جەڕ و پێچەنت داوە.

*واتا زۆر کز و لاوازە.*

١٨٢. هەرچی ئەخۆیت بە شەو تاریك، دەمت/ ملت دریژ و قولت باریك.

*قسەیەکی جنیوئاسایە. واتا ئەو هەمووە کە دەخوات، بەڵام هەر کز و لاوازە و قەڵەو نابێت.*

١٨٣. لیمان ئەخات.

*واتا هێندە قنگقورس و تەمەڵ و تەوەزەلە، لەشی هیچ کارێکی نییە. وەك چۆن مانگا چەند ڕۆژ پێش زایین کەمتر ئەجووڵێت و تەنیا پێی خۆشە بخەوێت و ڕاوەستێت و لینجاوێك لە ئەندامی زاوزێی دێتە دەر. ئەو کەسانەیش وا تەمبەڵن بەو شێوەیە تاقەتی کار و جووڵانەوەیان نییە.*

١٨٤. هەوای بەری داویەتی لە سەری.

*مەبەست لە کەسێکە تێفکرینی نەماوە بەهۆی هەوەسەوە.*

١٨٥. کێری ناوەتە شانەوە.

*ئەوپەڕی هەوەسبازی پیاو نیشان ئەدات.*

١٨٦. مووی بەدەنی ڕووشکەڵەی کردووە.

*واتا بەهۆی ترسەوە مووی لاشەی ڕاست بووەتەوە.*

١٨٧. مووی نالەرێتەوە.

*واتا هیچ کاردانەوە و وڵامدانەوەیەکی نییە.*

١٨٨. مووی مێردی دەر نەهێناوە.

*بە کوڕ دەگوترێت کە هێشتا ڕیش و سمێڵی دەرنەهێناوە.*

١٨٩. ئاور بە بان پشتیەوە بکەرەوە.

*واتا ئەوپەڕی ملکەجی کەسێك بەرانبەر کەسێ تر نیشان ئەدات کە هەرچیکی پێ بڵێت بە قسەی دەکات.*

١٩٠. دۆڵەی پڕ ڕاستی/ ئاشتیماڵە.

*واتا شەڕ و ئاژاوە و ناخۆشی ناو بنەماڵە، بەهۆی نەبوونیەوە دێت. دۆڵە واتا نانـدێن. بەگشتی لێرە مەبەست لە خەزێنە و پاشەکەوت و بوونی چاکی بنەماڵەیە.*

١٩١. ڕەنگ مردووی لێ نشتووە.

*بە کەسێکی نەخۆش دەگوترێت کە شوێنەواری نەخۆشییەکەی کاریگەری خراپی لەسەری دانابێت و ئەگەری مردنی زۆرە.*

١٩٢. ڕەق و تەق و مردووی زیارەتانە.

*واتا کەسێك زۆر نەخۆشە و زۆر لاواز بووە و ئەگەری مردنی هەیە.*

١٩٣. خاکی مردوو/ زیارەتانیان بە سەریدا کردووە/ ڕشتووە/ پرژاندووە.

*واتا شوێنێك کرِوکپ و بێدەنگ. زۆرتر بۆ ئاوەدانی و شوێنی ژیانی خەڵك دەگوترێت کە هیچ هەست و هەوایەکی ژیانی ڕاستی تێدا نەماوە.*

١٩٤. تاقەت خۆیشی نەماوە.

*واتا ئەوپەڕی وەڕەزی و جاڕزی کەسێك نیشان ئەدات.*

١٩٥. بەرگەی دڵ گرتن.

*ئەو ماستە بە نانەوە بیخۆ با بەرگەی دڵت بگرێ و زوو برسیت نەوێ.*

١٩٦. دەنگی نێرە.

*واتا کەسێك ئازایەتی و بوێری بە قسە و باسیەوە دیارە و خاترجەمە.*

١٩٧. وڵکی بڕی.

*واتا بەهۆی پێکەنینی زۆر، لێدان و کوتانی زۆر بە ناوسك، داکەوتنە خوارەوە، یا هەر تەوژم و گوشارێك بەندی گورچیلەی ببڕێ.*

١٩٨. ئەونە پێکەنی وڵکی بڕیا.

١٩٩. ئەونە گریا خوێن خۆی لە خوا سەند.

*واتا زۆر گریا.*

٢٠٠. فلانی پچڕیا/ پساوه.

*واتا بەهۆی هەڵگرتنی بار یا کارێکی قورسەوه کەسێك توانستی کار و زۆرکردنی نەمێنێ. گوایه ڕەگێك له پشتوێنەی کەمەردا دەپچڕێت و ناوی ڕێـزڵه یـا ڕەزڵەیه کە کـابرا وای لـێ دێت.*

٢٠١. ڕێزڵەی بڕیا.

*سەیری فلانی پچڕاوه بکه.*

٢٠٢. تازه هەڵووچەی بەهاری خواردیه، نامرێ.

*وەك هەمان قسه کە بۆ خوێن جمانی بەهار ئەکرێت.*

٢٠٣. بەهارانه بەڕواریچ بدۆشه شیری هەس.

*واتا هەموو گوانداریێ له بەهارا شیری مشەمەره.*

٢٠٤. له تەڕ خواردیه و له وشك خەفتیه.

*واتا لەوپەڕی ناز و خۆشی و گوزەراندا بووه.*

٢٠٥. به گەوڕ کەریچ ناشێ/ نامەحرەمه.

*واتا پیاوێکه لەوپەڕی داوێن‌پیسی و شواڵ‌چەپەڵیدا.*

٢٠٦. ئاو به ئاوەزا/ ئاوەڵ/ ئاوەڕێ/ ئاوەڕێژا ئەچێ.

*مەبەســت له پەروەردەی منــداڵه کە ئەوان ســەیری گەورەکــان ئەکەن و وەك ئەوان پەروەرده ئەبن.*

٢٠٧. گەوره ئاو ئەڕژێنێ و بووچك پای تێ ئەخا.

*سەیری ئاو به ئاوەزا ئەچێ، بکه.*

٢٠٨. پووش دنیای خستیه.

*واتا دەستی له دنیا داشۆردووه و خۆی ئاماده کردووه بمرێت.*

٢٠٩. زۆڵ هاره ئەکەن وه بان سەریچیەو نامرێ.

*ئەوسا ئەگەر ژنێ دووگیان دەبوو به منالێ نابەجێ و ناشـەرعی، بـۆ کوشـتنی هارەیـان خستووەته سەر سك ژنەکه و سووڕاندوویاتەوه.*

٢١٠. حکمەت ها لەوا زۆڵ فرەتریان کوڕه.

*گوایه منالی زۆڵ فرەتریان کـوڕه. لەوانەیه بـابەتێکی زانسـتی له پشـت ئەو کوڕبـوونەوه بێت.*

٢١١. کاورا فرە بگەڕێت یا کوڵ تێریتەو یا زۆڵ.

٢١٢. فرەگەڕیاو فرەدڕیاویچە.

*کەسێك زۆر بگەڕێت و گەشتی زۆر بکات لە زۆر کوێت و بەندی دەمارگری و بەرچاوتەنگی و قەفەسی چاك و خراپ ئەڕەویتەوە.*

٢١٣. سمڵی بێ مێخەك بۆ دیاری ناوێ.

*سمڵ و مێخەك ئەو هێشووە بۆنخۆشەی بەرۆکی دایکانی کۆنی کوردەوارییە کە هەمیشە پێکەوەن. زۆر جار بیستوومە لە پیرەژنەکانی دێ کە سمڵ و مێخەك ژنان قورس و جێکەوتوو دەکات و زیاتر ڕەنگی ژنانە دەگرێ و ئارامبەخشە بۆیان. هەروەها زۆر جار دایکان کە منداڵەکانیان دیانیان هاتووەتە ئێش، خێرا لەتکێ لە سمڵەکە یا مێخەکەکەیان دەرهێناوە و لە کلۆری ددانەکەیان خستووە ئارامی کردووەتەوە.*

٢١٤. بە شەوا گایەك بخۆ و گوێزێك مەخۆ.

*گوێز لە ناوسکدا شەوانە کەم ئەجووڵێت و ئەبێتە هۆی خەوی هەڵیت و پەڵیت.*

٢١٥. ئەگەر کەسێك میز بە پشیلەدا بکات، ئەو کەسە بالووکە دەر ئەدات.

٢١٦. سێبەری داری گوێز خاوەنیارە و کەسێك لە سێبەریدا بخەوێت خاوەنەکەی دەیگرێت و سڕ دەبێت.

٢١٧. کابرایەك لە بن دار گوێزێك خەوتبوو. مارێك خشکا و لێی نزیك بووەوە کە پێوەی بات. گوێزەکە، وتی بە مارەکە: پێوەی مەدە. من پێش تۆ پێمەوە داوە.

٢١٨. کەر سەربڕین، قۆزەڕەشە دائەخات. ئەگەر کەسێك گەرەکی بوو کەرێك سەر ببڕێت پێویستە خەڵکی تر پێشی بگرن. چونکە نەخۆشی قۆزەڕەشە بڵاو دەبێتەوە.

٢١٩. سووتاندنی گەنم و جۆ، ڕۆژ ڕەشی دائەخات لە وڵات.

٢٢٠. گوناحە بێژیت: هەنگ تۆپیوە یا مردار بووەتەوە. دەبێ بگوترێت: هەنگ مردووە.

٢٢١. بۆ شۆخی بە منداڵان ئێژن: کەڵەکە چەرمووەکانت [واتا دیان] بە قنگ کێ؟ منداڵی زیرەك ئێژێت: بە قنگ هەنگ.

*واتا توورەکەی شیلە هەنگوینەکەی.*

٢٢٢. هەنگ بە دەست چل گەورە و چل بچووکەوە دەر ئەچێت و هەزار ڕێگە و ڕێبازی کاروانی ئەکات تا قومێ شیلە هەڵدەگرێت، بەڵام ڕۆخانە سوور بەهار ئەیکوژێت.

*واتا هەنگ لە پەرینەوە بەسەر ئاودا کلۆلە.*

٢٢٣. لای کانی و کاریزا منداڵی ساوە مەلە مەدە. جنۆکە و ئەوانیەل دەستی لێ

ئەوەشێنن و ئەمرێت.

٢٢٤. ژن وەسە بەن موو: ڕاست بای بەیت و پلی لێ بەیت کرژە و چەپ بای بەیت و هەڵیدەیت، خاوە.

٢٢٥. کاژەلەی بەهار قاراندی دۆینەی پارەکە مەخۆن.

*ماوەی بەسەر چووە و دەبێ دۆینەی تازە دروست بکەیت.*

٢٢٦. بە شەوا گایەك بخۆ و گوێزێك مەخۆ.

*گوێز هەرسکردنی بۆ شەو قورسە و خەوی هەڵیت و پەڵیت دەهێنێ.*

٢٢٧. بە شەوا گەسك لێ مەدە، نەهامەتی دێنێت.

*ئەوسا شەوانە تاریك بووە. گەسكلێدان کارێکی باش نەبووە. چونکا زبڵ و زاڵی خستووەتە ناو گۆزە ئاو و شتی تر.*

٢٢٨. ئەگەر گەسكت لێدا وریا بە گەسکەکە وە کەس نەکەوێت. ئەو کەسە ئاکاری حیز دەبێت.

*بۆ ئەوە گەسك بۆخۆی پیسی پێوەیە.*

٢٢٩. زستان گوتوویە: لە کونی دەرزیشەوە بێت سەرما و سۆڵە ئەنێرمە ژوورەوە بۆ منداڵەکانتان ئالامەت بگرن.

٢٣٠. لە زستان شەوێ و لە پیران تەوێ.

*زستان شەوێکی مابێت بەفری خۆی دەبارێنێ و بەسالاچوویش لەوانەیە بە تا و یاوێ بمرێت.*

٢٣١. کۆڵنج گوتوویە: نەمپروێنی، ئەتپروێنم.

*واتا دەبێ کاتێ کۆڵنجت کرد. زوو فریای خۆت بکەویت و دەستی پێدا بهێنن. ئەگینا ئازاری کۆڵنج مەترسیت بۆ ساز دەکات.*

٢٣٢. شەوانە نینۆك مەکە. نینۆك بووکە. ئەتۆرێت.

*ئەوسا زۆرتر شەوانە تاریك بووە. لەوە ترساون نینۆکی قرتاو بکەوێتە ناو گۆزە ئاو و چێشت و چاییان.*

٢٣٣. لە ماڵ دوژمنەکەت نینۆك بکە و لە ماڵی دۆستت سەرت دابهێنە.

٢٣٤. بە ڕۆژا نینۆکە بکە و مەیکەرە بەرەپا، بیخەرە ژێر خاك یا گێجەنەی دریا.

٢٣٥. منالی ساوا نزگەرە بکا نیشانەی تەندروستییە و بالا ئەکات و گەورە ئەبێت.

٢٣٦. دووکەڵ کوانوو بە چاو هەر کەسێکدا بچێت. نیشانەی ئەوەیە: خەسوو خۆشی

دەوێت.

۲۳۷. کەسێك نزگەرەی هات. بیخەرەوە بیر دزی منداڵی.

*نزگەرە بە بیرکردنەوە و تێفکرین لا ئەچێت. ئەگەر کەسێك پێی بڵێیت کە بە منداڵی دزیت کردووە ئەوە ئەکەوێتە بیری کۆن و تێ دەفکرێت و نزگەرەکەی لە بیر ئەچێتەوە.*

۲۳۸. منداڵ ڕۆحیانەتی پاکە. ئەگەر منداڵ شتێکی سەیر و سەمەر بە دەمیدا هات. گوێی لێ ڕاگرە و گرنگی پێ بدە. لەوانەیە ڕاست بێت و ڕێگەت پێ نیشان بدات.

۲۳۹. بەهارانە ڕێگە مەدەن منداڵەکانتان بە ناو گاڕان و گاگەلدا بڕۆن و فیقەنە و فیتوو بدەن. مەڕ و مانگاکانتان شیر کەم ئەکەن و سەرنجام دۆتان ئەبڕێت.

*واتا مەڕ و ماڵات مەترسێنن. شیر لە کەشێکی ئارام و ئاسوودەدا دێتە گوانی شیردەر.*

۲۴۰. مانگا تا هۆرە و باڵۆرەی بۆ نەکەیت شیرت پێ نادات.

۲۴۱. کاتێ منداڵ دیانی دەر هێنا سواری گوێدرێژی مەکە با دیانەکانی زل نەبن.

*ئەوکاتە منداڵ فێری قسە ئەبێت. لەوانەیە ئەم قسە بۆ ئەوە بێت کە نەکا بترسێت یا بکەوێتە خوارەوە و تووشی تری و تیکەی زمان بێت.*

۲۴۲. خوا دیانی دا و نانیش ئەدا.

۲۴۳. نەوبی کوڕێکی بوو. لەجیاتی ناوکی گونی بڕی.

*واتا ئەوانەی چاویان بە هیچ نەکەوتووە (بە فارسی ندید بدید) کاری سەیر و سەمەرە.*

۲۴۴. کچ لە ماڵ مامی بخەوێت و لە ماڵ خاڵۆی نان بخوات.

*باسی غیرەت و نامووسە کە لە کوردەواری بۆ بەرەی پشت و مام گرینگە و باسی خۆشەویستیە کە بۆ بەرەی دایك گرینگە.*

۲۴۵. گازەردی وتوویە: حەوت ڕۆژ جەمامیم بشکێنە و حەفتا ڕۆژ جووتم پێ کە.

*جەمامی هاوشێوەی نەرمشی پێش وەرزشە. واتا پێش کاری قورس سەرەتا هەندێ خۆ بە کاری سووکەوە گەرم بکە.*

۲۴۶. مناڵ مەبە ژێر داری سرینچك کە گوڵی کردووە. بۆی گوڵی سرنیچك مناڵ نەخۆش ئەخات.

۲۴۷. نینۆك درێژ بوو. شەیتان لە ژێریا ئەخەوێت و لە سەریا نوێژ ئەکات.

*مەبەست لە کۆ بوونەوەی پیسی و پۆخڵییە لە ژێر نینۆکدا.*

۲۴۸. بەر لەوەی کە ئاوی کوڵاتە بڕێژیتە ناو کۆڵان. ناوی خوا بهێنە و هاوار لە خوا بکە

با جنۆکە و ئەوانیەل نەسووتێنێت.

٢٤٩. ئەوسا پیاوی وا هەبوو کە خۆشی لە ژنەکەی نەهاتووە و گەرەکی نەبووە لەو ژنە منداڵی بێت. بۆ ئەم کارە ئەچووە بەر خۆرەتاو بەردێکی گەورەی هەڵدەگرت و ئەیبردە بەری نسار و پێچەوانە لە بەری نسار بەردێکی وای بۆ بەری خۆرەتاو دەیگواستەوە تا تووی بتکێت و ئەگەر نزیکی کرد لەگەڵ ئەو ژنە منداڵی لێ نەبێت.

٢٥٠. خاك ژێر پێی سووخۆر بکەیتە مل باڵووکا، هەڵدەوەرێت و لا ئەچێت.

٢٥١. کاتێك کەسێك دەمرێت. ئەوانەی بە دەوریدا کۆ بوونەتەوە هەوڵ بدەن زوو دەم و چاوی ببەستن. با چاو لە دوا نەبێت و کەسی تر بە شوێن خۆیدا نەبات.

٢٥٢. بە گورگیان وت: مامە گورگە بزن گەڕ ئەخۆیت؟ وتی: نە، بەڵام ها لە کوێ؟

٢٥٣. بزنێك گەڕ ڕانێك گەڕ ئەکات.

٢٥٤. بزن گەڕ لە بەرزیا ئەخەوێت.

٢٥٥. بزن گەڕ لە سەرچاوکە ئاو ئەخواتەوە.

٢٥٦. کیسەڵ و بایەقوش مەکوژە بەیۆمنن و ڕۆژڕەشی دێتن.

٢٥٧. دایك ئەگەر شیری کەم و کز بوو شەوانە گەنم برژیاو بخاتە ژێر سەری. بۆن و بەرامەی ئەو گەنمە شیرەکەی مشەمەر ئەکات.

٢٥٨. ئەوسا باو بوو کە دایکان کاتێ منداڵەکانیان لە شیر ئەبڕییەوە. بۆ ئەوە کە شیری ناو مەمکیان نەبێتە گرێ و گۆڵ. سەلکێ کەرتەشیان وە بان کراسەکەیانەوە هەڵدەواسی. بەم جۆرە شیرەکە زوو ئەچووەوە.

٢٥٩. قاسپەی کەو بۆیە هێندە خۆشە کە کەو هەمیشە ئاوی چاوی هەڵاڵەبرمە ئەخواتەوە.

*گوڵی هەڵاڵەبرمە کاتێ تەڕ و تازەیە چاڵی ژێرەوەی گوڵەکەی وە بەهارا پڕ ئەبێت لە شەونم و خوناوە. گوایە کەو لەو شەونمە ئەخواتەوە.*

٢٦٠. کچ ساڵێ یەك جۆ گەورە ئەبێت و کوڕ ساڵێ یەك گەنم.

٢٦١. منداڵی ساوە نابێ بخرێتە ناو جل و جێوبانی باوکی یا پیاوی تر. چونکا تووشی نەخۆشی خەرکانە ئەبێت.

٢٦٢. منداڵ تا چلاری و هەفتاری نابێ هێندە دەروماڵی پێ بکرێت. ئەگەریش ناچار بوون کە بۆ شوێنێکی ببەن ئەوە لەتێ نان بخەیە سەر سینەی با نەترسێت.

٢٦٣. کاتێ منداڵ ماڵەوماڵ پێ ئەکەن و ئەیگەڕێنن بۆ ئەوە کە جنۆکە دەستی لێ

نەوەشێنێت سەرلووتی بە سووتکێ تا ڕەژییەك ڕەش بکەن.

٢٦٤. منال بە چلاری و هەفتە بۆ ئەوە زۆر ئەگریت ئەوە ئێژێت: عومرم بە سەر چوو. بە گریان چلە و حەفتەم ڕەوانە کرد.

٢٦٥. کزەبا وتوویە: جێی خۆم بۆ هەمیشە لە ناو ئێسکی ئینسانا ئەکەمەوە و لە پیریدا ئەیکەمە چیامانی و ئێش و ڕێش.

٢٦٦. ئەوسا بۆ ئەسرەوتن و شکاندنی ژانی مەمك، پێلاوی کەیخوداژنیان ئەهێنایە سەر مەمکدا. چونکە ئەیانگوت: بەشکوو ژانی مەمك بە پیسایی ژێرپێلاوەکانی کەیخوداژن بڕوات.

٢٦٧. چەپەڵی بە چەپەڵییەوە ئەڕوات. هەر بۆیە هەندێ جار زۆر لك و لووی پیس بە گیراوەی پیس و پۆخڵ لا ئەچێت.

٢٦٨. دۆینە و ماستاو بووە شەڕیان. دۆینە گوتی: من ماڵی چلەی زستانم و لە ڕچە و ڕێبەندانا ئەخورێێم. ماستاو گوتی: منیش هی چلەی هاوینم و لە قرچەقرچ و سوورەتاوی هاوینا ئەخورێێم.

٢٦٩. هەر کەس بەیانیانە زوو لە خەو هەستێت و زووخێز بێت. فریشتەی ڕۆزی بەشی زۆرتری بۆ ئەهێنێت.

٢٧٠. خەوی ئێواران و تەنگی مەغریوان، نەهامەتی پێوەیە.

٢٧١. تریفەی مانگە شەو چەقیە ناو گۆڕستان. مردوو مەنێژن و هەڵیگرن و بەیانی بینێژن.

٢٧٢. ژێر پێی منداڵ ماچ مەکە. ئەترسێت دێر پێ هەڵدەگرێت.

٢٧٣. منالی دووەم کە بە دنیا هات بۆ ئەوە منالی یەکەم ڕکی لێ هەڵنەگرێت. منالی دووەم دوو سێ جار بە پشتا بخەرە کۆڵی. ئەگەر توانی بڕوات ئەوە ئیتر قینی لێ ناکات و ڕکی ئەشکێت.

٢٧٤. توول بە تووڵی ئەچەمێتەوە. ئەگینا بە داری ئەشکێتەوە.

*مەبەست لە پەروەردەی منداڵە.*

٢٧٥. وەچە و بەچە لەسەر بنەچە سەوز ئەبن.

*منال و ڕەسەنایەتی.*

٢٧٦. منالی لیکن، کوڕی چلکن، گوێرەکەی کولکن هەر سێ ڕەسەنن.

٢٧٧. یا خالۆ بەڵەو بە یا مامۆ بەڵەو.

*واتا منداڵ خووخدەی ئەچێتەوە سەر مامی یا خاڵۆی.*

٢٧٨. لە ناوسك نەبوو منالّ وە بەرەوە بوو، لە دۆخوای نەبوو دۆ وە سەرەوە بوو.

٢٧٩. نازیان دا پیاز دەستی کرد بە گازەگاز.

٢٨٠. لە ماڵیان پڕ بوو دەنکە ڕازیانە، منالّیان ئێژن ناوسك ئێشەمانە.

٢٨١. دان بۆ مامر و شیر بۆ منالان، ئۆسا بۆ شاگرد و شێخ بۆ دەوریشان.

٢٨٢. چونکە هاتوچۆت کەوتە تەك منالّ، ئەشێ تۆیش بکەی بزە و گڕوگالّ.

٢٨٣. تا هەور نەگرییێت ناکەنێ چیمەن، تا منالّ نەگیریێت شیری پێ نادەن.

٢٨٤. بیری منالّی تیژە.

٢٨٥. هەر بە منالّی شێرەکوڕ دیارە، لاوێچ نموونەی بار و خەروارە.

٢٨٦. خالّۆ گیان بۆیە پێت ئێژم خالّە، چۆلەکە بگری بۆ ئەم منالّە.

٢٨٧. باوك پیاز بێت، دایك پیازۆك، منالّ بۆگەنە و پۆزەپۆز ئەبێت.

٢٨٨. ئینسان دوو جار منالّە، جارێ بە بووچکی و جارێ بە پیری.

٢٨٩. منالّەزا خۆشەویستترە چونکە ناوکەیە.

٢٩٠. پیشۆك مەهێنەوە بۆ مالّ. هەر لە دەشتەوە بیخۆ. تویکلّەکەی مانگا بیخوات شیرەکەی وشك ئەکات.

٢٩١. پیاو ئەگەر نان بە بار هەلّگەڕاوە و پێچەوانە لە سەر سفرە دابنێت. ئەو پیاوە قیرەیە.

٢٩٢. ژن مەگیرانی کرد، یانێ: منالّەکە سەری تووکی کردووە.

٢٩٣. لە بێزیەوان نەکەویتە تاوان.

*ژنی بێزیەوان حەزی زۆرە و ئارەزووی خواردنی شتی هەیە. کەواتە دەبێ ئاگای لە خۆی بێت کە تووشی گوناح نەبێت.*

٢٩٤. گەورەکان بە شوان و چێودار ئێژن: تووڵی داری سرینچك مەڕ و مالات لەڕ و لاواز ئەکات.

٢٩٥. مێلوورە چووە هەر مالێك و شارەی کرد. هەوالّی چۆلی بۆ ئەو مالّە ئەبات.

٢٩٦. دار توو مەبڕە. ئاخر کێ دیتوویە کۆلەکەی مزگەوت بنکۆل بکرێت، بداریتەوە.

*واتا بڕینی داری توو وەك دارانەوەی کۆلەکەی مزگەوت کارێکی خراپە.*

٢٩٧. ژنان بۆ پێشگرتن لە چاو و چلەی خراپ داری ژالّە ئەنێژن و لە بانیژە و بەربانی مالّەکانیان دەیڕوێنن.

٢٩٨. وە بەرچاو خەلّکەوە نان مەخۆ. خەلّکی برسی نەوسیان دێتە ملت و شەو ئەبنە

مار و دێنە خەوت. هەروەها برسی چاوی بە پارووی تۆوە بێت تووی ئەتکێت و تـاوانی ئەو تووتکانەی هەتاهەتا دێتە ئەستۆی تۆ.

٢٩٩. لە ناو کاسەکەل و گۆزەی شکاودا ئاو مەخۆوە، گوناحە.

*لەوانەیە بۆ ئەوە بێت کە نەکا شوێنی کەلەکەی دەم و لێو ببڕێت.*

٣٠٠. وەك کچ ملوانکەی مووروو مەکەنە مل کوڕ. گەورە بوو ترسنۆك ئەبێ.

٣٠١. منالی ساوا هەندێ جـار ئەترسـێت و زوو زوو لە خەو ڕائەچڵەکێـت و دەسـت بە گریان ئەکات. ئێژن ئەوە ترساوە و دەبێ پیاز بساوێتە نـاو لەپـی دەسـتی و دەموچـاوی تـا ترسەکەی بڕەوێتەوە.

٣٠٢. کاتێ منـداڵ ئەکەوێـت و لەوانەیە ئێشـی پـێ گەیشـتبێت. بـۆ ئەوە نەگریـت و نەترسێت. پێی بڵێ: ئەها خوێنیەکەت ڕژاند. ئەویش سەیری جێی خۆی دەکـات و دەبینێـت هیچی لێ نییە. پێ ئەکەنێت و ئێشەکەی لە بیر ئەچێتەوە و ئەڕوات.

٣٠٣. پاییزانە کاتێ پەپووی گیـای گوڵەپەپـوو هـاتە نـاو ئـاوایی ئەوە نیشـانەی مـانگی خەرمانانە و هۆشداری ئەداتە کابانی ماڵ کە وەخـۆ بکەوێـت و زمهـاڕ بکـات و شـتومەکی خواردنی زستان کۆ بکاتەوە.

٣٠٤. ژن کە کەوتە سەرژان منالی بێت هەموو جمـگەی بەدەنـی لێـك جیـا ئەبێـتەوە. بێجگە لە کۆڵەکەی لووتی.

*گوایە گیان لە نووکی لووتەوە دەر ئەچێت و دایك لە کاتی منداڵبوونـدا تـا سـەرەمەرگ دەڕوات هێندە ژانی پێ دەگات.*

٣٠٥. ئەگەر نەخۆشی دانی کەوتە ناو مەڕ و ماڵات. ئەوە هەندێ لە بەردی دانی بهێـنە لە گوانی ئاژەڵی دۆشەنی بخشێنە با نەخۆشیەکە بە ناو کـاریلە و بەرخـۆلە و گوێرەکەکانـدا بڵاو نەبێتەوە.

*دانی یا دانگ نەخۆشییەکە کە زیاتر بەهارانە لەسەر پێستی ئاژەڵ زیپکە و زیچکە ئاشکرا دەبێـت و ئەگەر سـاوا بیگرێـت دەمرێـت. ئەوسـا هەنـدێ لە ئاواییەکـان گابەردێك لە سـنووری ئاواییەکەیـان تەرخـان دەکـرد و بە بەردەدانـی دەناسـرا. بەردی ئەو گـابەردە کرێژەبەردی زۆر پێوە دەبوو. ئەوەیان بۆ چارەسەری دانی بەکار ئەهێنا.*

٣٠٦. ئەگەر جل و بەرگی تازە و نـۆکرِدراو لە یەغانـدا هەڵبگرێـت و لە بەری نەکەیـت جنۆکە بە دزییەوە لە بەری ئەکات.

٣٠٧. پێڵی چاوی ڕاست بفرێت ئەوە مزگێنی خۆشی پێیە و ئەگەر پێڵـی چـاوی چەپ

فڕی هەواڵی ناخۆش دێت.

٣٠٨. ئەگەر سەرشانت بفرێت ئەوە مزگێنی پۆشینی جل و بەرگێكی جوان و دەگمەنت بۆ دێت.

٣٠٩. ئەگەر ژێر پێ بخورێ ئەوە هەواڵی سەفەرە.

٣١٠. بۆ دەرمانی نەخۆشی خەركانە و هەڵزلەپیانی نـاودەمی منـداڵ، ئەوسـا منـداڵەیان دەبردە لای ژنێك كە مێردی بە هێوەری خۆی كردبوو. پیرەژنە چەند تاڵ لە مـووی سـەری بە ناودەم منداڵەدا دەهێنا تا چاك بێتەوە.

٣١١. بۆ لابردنی بالووك: چوارشەمانە ئەچوونە كوێستان و لاسكی تەڕەبنەیان بـا ئەدا تـا ئاوی لێ بێت و بچۆڕێ و لەو ئاوەیان لە بالووكەكە ئەدا تا لا بچێ.

٣١٢. بۆ لابردنی لیكی منال: دایك بە خالۆی منداڵەكەی دەگوت كە بە مقەسـت لیكـی منداڵەكەی بۆ ببڕێت یا خوشكی دایك بووكەڵەیەكی لە چـل تـیكە پەڕۆی ڕەنگاوڕەنـگ بـۆ دروست ئەكرد تا لیكەكەی بگیرسێتەوە.

٣١٣. بۆ دەركردنی سیرەمۆزە و زەردەواڵە: كاتێ خەریكی شتێك دەخۆیت یـا گۆشـت و میوەت لە دەوروبەرە و سیرەمۆزە و زەردەواڵە لێت نزیـك بـوونەتەوە. بـۆ دوورخسـتنەوەیان بێژە: سیرە سیرە گۆشتم تاڵە، لاچۆ ڕووبكەرە كەلاوە.

٣١٤. شەوانە گۆرەوێ لە پشت سەرت دامەنێ. با خەو هەڵیت و پەڵیت نەبینی.

٣١٥. شەوانە جلەكانت هەروا فڕێ مەدە و ڕێكوپێـك هەڵیانواسـە بـا جنـۆكە لە بەریـان نەكات.

٣١٦. نەورۆز هات خوێن تەڕەو ئەبێت و كاتی خوێن جمـانە. هەر بـۆیە دیسـانەوە وەك زستان بەدەن ساردەوە دەبێـت و ئەلامەت و پەتـا زۆرە و بەدەن زۆرتـر هەسـت بە سـەرما دەكات.

٣١٧. بەهارانە وەرزی ڕێواس ماسی مژدی (مەگیرانی و بێزی) ئەكـات بە ڕێواسـاو. واتـا ماسی لەو وەرزە گرا دائەخات و بێچوو ئەكـات. نـابێ ئەوكـاتە ماسـی بگریـت و بیخۆیـت. نەخۆش ئەكەویت.

٣١٨. ئەوسا بۆ داخستن و نەهێشتنی هاڕیەی نۆكەفەریكە، ژنان بە لنـگ بـێ شـواڵەوە ئەچوونە ناو جاڕە نۆك و دایەنەكەیان پڕ دەكرد لە گڵ و وەك توو بچێنیت گڵیـان ئەپرژانـدە سەر نۆكەكاندا و ئەیانگوت: پێڵەخۆرەی پێڵەچی، لاچن دەرچن كوز هاتووە بە قەمچی.

٣١٩. خەم و پەژارە تەنیـا ئینسـان توانیـویە هەڵیگرێـت. بەردی گـابەرد و شـاخ

هەڵینەگرتووە.

٣٢٠. هەر کەس گێلاخەی بەهار بخوات ئیتر تا ساڵێ تر نامرێت.

٣٢١. باران باڵا بەرز ئەکات. ئەگەر باران باری بچۆرە ژێر باران با تەڕ بیت.

٣٢٢. ئەوسا بۆ دڵنیابوون لە کاتی بەهار ئەم شێعرەیان دەگوت: بێ درۆزنە، چنار عەشقنە، کێکف عەیارە، بەڕوار گەڵا بکات ئەمجا بەهارە.

*یا بەم جۆرەش دەگوترێت: کێکف درۆزن، براڵووك عەیار، ئا وەرزا وەشا گوڵ کەرۆ هەنار.*

٣٢٣. یاخوا دەردەگا نەکەوێتە ناودێ / پاقلە تەواو بوو وا باینجان دێ

ئینجا دەردەگا ڕووی کردە وڵات / ترێ گەنانە و چاوێشە داهات

٣٢٤. باران زۆر بارێ دەغڵ ژەنگ دێنێ / ئاو زۆر مایەوە کرم هەڵدێنێ

٣٢٥. چەرخ و فەلەکمان بۆ هەڵخراوە / بەڵام کەس هێزی گوژمەی نەماوە

*گوژمە هەمان کوتراوی مێوژ، گوێز، بادام، خورما و قەزوانی شێنو پێکەوە کە زستانان وەك شەوچەرە دەیخۆن.*

٣٢٦. بۆ خەسەخانەی ناوشار ڕامکێشە / ڕازیانەم خوارد و بوو بە زگێشە

٣٢٧. ئەی ئەو کەسانەی بە خۆ ئەنازن / تا ئەمرن حەسرەت بە نان و پیازن

٣٢٨. بۆنی گوڵ لە لای قالۆنچە دەردە / ژن بێ ڕووسووری ناچێتە پەردە

٣٢٩. خەیاڵبازییە چارەی دڵتەنگی / شەراو بە گەردش، بەنگ بە بێدەنگی

٣٣٠. وا گەرما داهات پاقلە پەیدا بوو / سەودایی مەشرەب شێت و شەیدا بوو

٣٣١. مەجلیسی دەوری حەوزەکەی خۆمان / ترێ و کاڵەك و شووتی و سێوی خوان / ئەمانەن شا و وەزیر و موشیر / خۆشگوزەرانی پێویستە بۆ پیر

٣٣٢. ئێژن گیا لەسەر پنجی خۆی ئەڕوێ / بەڵام بێستانیش بژاری ئەوێ / بێستانەکەمان پڕ لە بژارە / بۆیە ماڵیات مافەتەدارە

٣٣٣. نە مێوت هەیە بۆ کەس نە هەنگوین / مەگەر تۆ چزەی خۆت بکەی پەرژین

٣٣٤. دەردەگایش زۆرە و کوللە لە ناوە / تەرزەیش کوتاینە و هیچان نەماوە

٣٣٥. دەست بە جەرگی خۆوە نیان.

*یانێ "دەست بە ماڵ خۆوە نیان" و دڵ خۆ ڕازی کردن کە کارێك بکەیت یا شتێك بکرێت. هەمان دڵ هاتن بۆ کردنی کاری گەورە.*

٣٣٦. هەر تووتن نییە ئەو کڵوکۆیە / دووبەشی قرچەی ناو جەرگی تۆیە.

٣٣٧. هەندێ کەس بە شێعر سەری ئەماسێ / سیسرك بە بۆی گوڵ گیانی ئەتاسێ

٣٣٨. چواله گوپکەی کرد ئەرخەوان پشکووت / قارچـك هەڵتـۆقی بەلـووت و بـزووت / بەڵام ئەو کارگەی زوو سەری دەرکرد / لێره و له کەرکووك زۆر کەسی پێی مرد
٣٣٩. ترياكمان پێیه له مار ناترسین / لەبیر خستنەوەی مردن وەڕەسین
٣٤٠. خوا زۆر شت یەك ئەخات وەك کەنگر و ماست.
٣٤١. ئێستا هەموو کەس مام برینداره / هەرچیکت گەرەك له لای عەتتاره
٣٤٢. هەندێ به سیسرگ دەنگیان خۆش ئەکەن / لەجیاتی بایەم چواله خۆش ئەکەن
٣٤٣. تۆوی دەغڵ و دان هۆزێك ئەژیێنێ / تۆوی خراپه خێڵێك ئەمرێنێ
٣٤٤. بێزوو ڕیخۆڵەی ئافرەت کرژ ئەکا / شیرینی ناوێ حەز له ترش ئەکا
٣٤٥. کەنگر پێگەیی هەرچەن بـاداره / دوو مانـگ پێخـۆری پیـاوی هەژاره / کاشـکای دوومەڵان وەك ئەم بوایه / خەرجی عالەمی هەرزان بەهایه
٣٤٦. سەرەتای پاقله گڕی سەودایه / بەڵام ڕێواسی مزری له دوایه
٣٤٧. ڕاسته که پاقله هۆش ئەشێوێنێ / ڕێواسیش سەودا دائەمرکێنێ
٣٤٨. خوا له بەهارا گوڵ ئەپشکوێنێ / سەری قالۆنچەیش به ول ئێشێنێ
٣٤٩. ڕازیانه لەبەر درگامان باره / کەچی زگێشه کەوته ئەم شاره
٣٥٠. چێشتی ئەنگیناز له شاران باوه / لێره کەس نایخوا کەرتەشی ناوه
٣٥١. دار به پوازی خۆی ئەقەڵیشێ / گوڵی دۆست زیاتر له بەرد ئێشێ
٣٥٢. گەزۆ و شەلاقه بۆ جۆ ئەباری / ئیسته دەمتاڵن به دەردی کاری
٣٥٣. کرم که ڕەگی درەختیی خواردی / پیشەت ئەبێته هەناسەساردی
٣٥٤. ترشیت خوارد دیانت هاڵ ئەبێتەوه / که گریایت چاوت کاڵ ئەبێتەوه
٣٥٥. سێبەری داری گوێزی کوێر قورسه / له ژێر داری بی بنوو مەترسه
٣٥٦. سروشتمان چونکوو گەنمی تیایه / هەویر بۆ هەموو زاممان دەوایه
٣٥٧. لەخۆبایی بوون ماڵ ئەڕووخێنێ / وەك سرکه هەنگوین چۆن ئەترشێنێ
٣٥٨. هەنگوینیش چزووی هەنگی لەگەڵه / بەڵێ هەر نۆشێ ئێشی تێکەڵه
٣٥٩. سەیری نەزان که خەم ئەڕەوێنێ / تەرسەقول ژانی چاو ئەشکێنێ
٣٦٠. ئەوەی ژانی چەشت له زەردەواڵه / ئیتر هەنگوینی له دەمدا تاڵه
٣٦١. میوەی نەگەییو زگ ئەیەشێنێ / تەماع بۆ پیاوان ڕووزەردی دێنێ
٣٦٢. دەرمان ژاری مار وا به ترياکه / ئیسته به ترياك فره کەس هیلاکه
٣٦٣. با کەوته کەلله شعوور نامێنێ / ئاتەش مەزاجیش پیاو ئەسووتێنێ

٣٦٤. هەنگ لە گوڵ و گوڵزار ئەنیشێ / بە مژین مایەی هەنگوین ئەکێشێ / چزووکەی ژاری تاڵی تیایە / هەنگوینیش وا خـوا فەرمـووی شـیفایە / ئەمە نمـوونەی حـاڵی دنیـایە / شیرینی تاڵی هەر لە گەڵدایە

٣٦٥. میوەی کاڵ ژانی زگی لە دوایە / وەك دووگی چەوری سەر تەڵە وایە

٣٦٦. پێکەنین دوانە یەکێ هی خۆشی / ئەوی تر ژاری خەفەت ئەنۆشی

٣٦٧. ئێمە لە چوار شت دروست کراوین / لە خاك و هەوا و ئـاور و ئـاوین / ئەم چـوار توخمە وێکڕا هەڵناکەن / کێ ئەڵێ ئینسان پەیجۆری چاکەن؟

٣٦٨. هەمیشە دڵت خەفەتبار نەبێ / خواردنت لە لا ژاری مار نەبێ

٣٦٩. شەڕ و شیپۆڕان لە بێکارییە / ئێژن برسییەتی ڕەگی هارییە

٣٧٠. ئەوەی ئازاری نەبێ ئۆف ناکا / ئەوەیش بێزار بێ لە هیچ خۆف ناکا

٣٧١. کە خوێنێکی پیش کەوتە ناو گوپەی / ئەبێ بە نەشتەر ئەو خوێنە دەرکەی

٣٧٢. لەزەتی خواردن هەر لە دەمدایە / لە دێژەڕەشدا هەر یەك هەوایە

٣٧٣. سروشتی ئینسان چوار هێم و بەرە / ئاو و هەوا و خاك، هەمـیش ئـاگرە / ئەمـانە لەگەڵ یەکا هەڵناکەن / تا دەستیان بڕوا یەك لەناو ئەبەن

٣٧٤. کەبابی سەخی دەوای دەردانە / پاقلاوای چرووك دەرد و سندانە

٣٧٥. گەلێ جار تاڵی بە دەرمان ئەکەن / بە دەوا دەردی پێ دەرمان ئەکەن

٣٧٦. توورەکەی تەماع، هەم گەدە هەم دوو / کە هەرچیـت دەسـتکەوت تێـت ئـاخنی زوو / ئەویان ئەدڕێ و ئەمیان ئەشێوێ / جێگا نامێنێ شەوێ بۆ شـێوێ / چـارە ئەوەتە کە بەرەبەرە / تەمـاع لابەری و خـواردن دەربەرە / ئەوسـا دڵ و لەش بە پـاکی و چـاکی / ئەمێننەوە و لە خەم بێ باکی

٣٧٧. پار پارەی زۆریان لە تووتن دەسـت کەوت / ئیمسـاڵ بـاوکی پـار مـرد و نـاوکی کەوت

٣٧٨. هەر گوڵێ دڕکێ و هەر نۆشێ ئێشێ / تەنیا من جەرگم بۆ ئەوان ئێشێ

٣٧٩. بچۆرە ژێر بارێ کە پێت هەڵگیرێ / پارووی زل مەگرە لە بین ئەگیرێ

٣٨٠. ئەندازەی هێزی قورگە نەناسی / ڕۆژێ ئەخنکی بە دڕکەماسی

٣٨١. خوا بۆ بنیاتی دنیای بێ بنیا / چوار گەوهەری کرد بە مـایەی ئیجـا / ئەم چـوارە لەگەڵ یەکا ناگونجێن / خوا خستوونیە یەك لە سروشـتا جـوێن / ئـاگر و هەوا بـاوکی لای سەروون / خاك و ئاو پەستن دایکی بێ دەروون

٣٨٢. زستان زەیستان چلەی لەبارچوو / سەریان دەرهێنا کەنگر و کاردوو
٣٨٣. میوەگەنانە چاوئێشە لە ناو / خۆت زۆر دەرمەخە لەبەر خۆرەتاو
٣٨٤. هەتاوی زستان تینی خۆشییە / هاوین مێملّی زۆر نەخۆشییە
٣٨٥. پارووی زل گەروو ئەدرێنێ / زۆریشی لێ کەیت پیاو ئەخنکێنێ
٣٨٦. منداڵ لە ئاگر دەستی بسووتێ / پێی ئەڵێن بفڤە کە دی بزووتێ
٣٨٧. قەدەرێکە وا تەنیا بووم بۆخۆم / منیش خەریك بووم باینجان بخۆم / دوایی دیـیم ئەوەی باینجان خۆرە / هێند سەودای زۆرە لێی بووە بە خۆرە
٣٨٨. پیاو باری خەمی هات بەسەرا / ئەبینی چەند ڕۆژ مرخی بەسرا
٣٨٩. کەمترە تاڵی ترۆزی و خەیار / هەنگوین و کاڵەك ئەبنە ژەهری مار
٣٩٠. پاییزمان بۆ هات بۆ گیپە خواردن / برێکیش پارووی یەکتر ژماردن / پاش گیـپە، کەشکەك نەریتی کۆنە / کە بەفریش باری دۆکەشك و ڕۆنە
٣٩١. نانێ کە هەژار بە پێخۆر ئەیخوارد / پڕ لە کەپەك بوو، هەم هەویرێکی سارد
٣٩٢. قسە هەزارە و دوانی بەکارە / وەبا بێ و با بێ مەرگ بۆ هەژارە
٣٩٣. ئەڵێن مارانگاز گوێچکەی شل ئەکا / لە خشکەی مار و مێروو سڵ ئەکا
٣٩٤. زەروو کە خوێنی پیسی ئەمژێ / لە مار چاکترە بە ژار ئەتکوژێ
٣٩٥. برینی ڕمبە دەرمان ئەکرێت / برینی زمان جەرگت ئەبرێت
٣٩٦. برسیەتی چاکە گژوگیا ئەخورێ / بەڵام تونیەتی چاری ناکرێ
٣٩٧. ناڵێن پاشەرۆژ کە سەرما بزووت / هەڵامەت ئەگرین وا بە سەری ڕووت
٣٩٨. خۆت خوێندەواری کوڕیشت فێر کە / با نانی کەم خۆیت برسییەك تێر کە
٣٩٩. ساڵانی پێشوو بەختمان یار بوو / حەکیمەکەمان نەخوێندەوار بوو / نەمانبیســتبوو ئەم هەمووە دەردە / نەئەچووە زگمان دەرمان بە فەردە / ترس و دڵەڕاوکێ نەبـوو لە نـاوا / عیللەتمان بە ئاو ئەدا بە ئاوا / بە نووشتووی شێخێك یا لەرز برینــێ / نەدەمـا دەرد و ژانـی برینێ / هێلانەقوڵتە لەگەڵ شیری کەر / دەردەباریکەی لائەبرد لەسەر
٤٠٠. وا چلەمان چوو شوکر نەمردین / خوا لە دەست شەوە ڕزگاری کردین
٤٠١. نان و دۆیەکا و دڵێکی ڕەحەت / نە ترس و خەمی پادشای سەرتەخت
٤٠٢. بیستوومە ئەڵێن قین ژەنگی دڵە / دڵ کە ژەنگی گرت بۆ شەڕ بەکوڵە
٤٠٣. برینی لەشت چاری دەوایە / برینی دڵت سارێژی نایە
٤٠٤. بێ منەت بژی بە گیاگەپڵە / نان بدە بە سەگ مەیدە بە سپڵە

٤٠٥. هەر كەسێ بخوا دۆ و شێلانە / شوالّ باتە كۆلّیا بچێتە تەلّانە
٤٠٦. خوو لە گالّ تۆریا / چل مەن زیاوی كرد
٤٠٧. ماهەك كەرتەشی / قۆزە دەركێشی
٤٠٨. ئێژی گەلّا گویژی خواردیە: ئەونە بای كردیە.
٤٠٩. وەسە شەمامەی بانەگۆل: ئەونە ساق و جوانە
٤١٠. ئێژی گیای شوالّبەكۆلّی خواردیە: تەقەفیڕكە كەوتیەسە شوێنی
٤١١. شەوانە گایەك بخوە، گویزێك مەخوە.
٤١٢. كەنگر و ماست بە وەعدەی خۆی.
٤١٣. كابرا مالّەكەی پڕ بوو لە ڕازیانە، منالّەكەیان بە ناوسكێشە مرد.
٤١٤. پیشۆك بە كالّی زۆر مەخوە، كەچەلّ ئەوی.
٤١٥. تووی كالّ مەخۆ، گرفت ئەكەی.
٤١٦. كاكلّە گوێزی وشك كەم بخۆ، سپێ هەلّتێری.
٤١٧. ڕكێشە زووخ دەركێشە.
٤١٨. گوێز خاوەنیارە لە سێبەریدا مەخەوە.
٤١٩. پیاز عەوالّان خواردنی هەس و بردنی نییە.
٤٢٠. هالّیكۆكە پرچنە هەركە بتخوا فیڕنە.
٤٢١. ئێژی كەر سێف فرۆشە ئەونە چاخە.
٤٢٢. ئێژی بە توولّە سرینجك كوتاتە ئەونە لەڕ و لاوازە.
٤٢٣. ئێژی ناوكە بامی خواردیە، ئەونە قووەی قسە و شەڕكردنی هەس.

## پزیشکی کۆنی کوردیی ناوچەی عەفرین

کاتێك باس لە بابەتێك وەك "لقی پزیشکی خۆماڵی کوردەواری" دەکەین پێویستە بکۆشین سەرجەم بابەتەکانی ئەم مژارە لە هەموو ناوچەکانی کوردستان لە باکوور و باشوور و ڕۆژهەڵات و ڕۆژاوا کۆ بکەینەوە. ئینجا دەتوانین بێژین کاریگی بەربڵاو و بەرفراوانمان کردووە. بەختەوەرانە پاش هەوڵێکی فراوان لە ڕێی فەیسبووکەوە توانیم چەند هاوڕێیەکی ڕۆژاوای کوردستان بخەمە بەر ئامانجی کارەکە. کاك فەخری عەبدۆ کە دەمێکە بابەتە بەپێز و پاراوەکانی پەیگیر دەبم و دەیخوێنمەوە، هەر زوو لە مەبەستەکەم تێگەیشت. بەڕێزیان پزیشکن و ئێستە لە بەرلین نیشتەجێیە. بەدڵکراوەیی و ڕووکراوەییەوە فەرمووی ئێمە کۆمەڵێك چالاکی دەڤەری عەفرین چەند ساڵێکە هەوڵەکانمان سەر یەك خستووە و بەشێکی زۆر لە بابەتە پزیشکی و دەرمانیەکانی کۆنی کوردەواری لە شارستانی عەفرین و ناوچە کوردنشینەکانی نزیکی ئەو شارە ئامادە کردووە. هەر زوو فایلەکەیان ڕەوانە کرد. ئەگەرچی لەوانەیە وەك سۆرانیەکە، کرمانجی ڕۆژاوا تێ نەگەم، بەڵام پاش چەند جار خوێندنەوە تێگەیشتم کە کاریگی کارستانە و ئەوەی کە پێویستە ئەوان کردوویانە بۆ ئەفرین و تەنانەت گشت ڕۆژاوای کوردستان.

چەند ڕۆژێك لەبەری دانشتم و ڕێنووسەکەم لە لاتینەوە کرد بە ئارامی و پاشکۆی ڕۆژاوا و عەفرینم دانا و وەك بابەتێکی پوختە بۆ ڕۆژاوای کوردستان ئامادە کرد. هیوادارم ئەوانەی کرمانجی باش دەزانن لێی مەوەستن و بیکەنە سۆرانی با ئەم گەنجینەیەش ببێتە بەشێك لە پزیشکی خۆماڵی کوردەواری.

**ڕۆژاوای کوردستان**

ئەو بەشەی کوردستان دەکەوێتە باکووری سووریە لە پارێزگاکانی حەسەکە، ڕەقە و

حەڵەب. نزیك بە ٦٠ لەسەدی زەوی کشتوکاڵی وڵاتی سووریە لەو ناوچەیەدا هەڵکەوتووە. ساڵی ٢٠١١ بەدواوە دانیشتوانەکەی بۆخۆیان دەسەڵاتێکی خنجیلانە و لەوپەڕی ڕێکخستنی دیمۆکراتیکانە دامەزراندووە بە ناوی "خۆبەڕێوبەری دیمۆکراتیکی ڕۆژاوای کوردستان" و بووەتە سێ کانتۆنی جزیرە (دیرك، حەمکۆ، تربەسپی، سەرێکانی، رمێلان و تاد) و کۆبانێ (دەشتی سوروچ و کۆبانێ) و ئەفرین (بلبل، باسوتە، کانی دارە، راجۆ، بەرسایا، جندرێس، ئەدمانکێ و ماباتا[1]). نزیکەی دوو ملیۆن و نیو کەس کوردی موسڵمان و ئێزدی لە ڕۆژاوای کوردستان نیشتەجێن. بەشی بەرچاوی کوێستان و چیا بەرزەکانی ڕۆژاوای کوردستان لە عەفرین هەڵکەوتووە. چەندین ڕووباری بچووك و گەورە وەکوو دجلە، فورات، جغجغ، خابوور، ساجوور و عەفرین لە دڵی ئەو ناوچانە تێ دەپەڕێت.[2]

## عەفرین[3]

ئەفرین سەرەتا ناوی درێژترین ڕووباری ناوچەکە بووە، کە ١٣٩ کیلۆمەتر درێژە و لە باکوور تا باشووری ناوچەکە دەبڕێت. ناوی ئەفرین بە "عەفرین، عفرین و عیفرین"یش هاتووە. لە ڕۆژاوای کوردستان بە "بووکا کوردستانێ" ناسراوە و یەکێك لە سەرسەوزترین شار و ناوچەکانی وڵاتی سووریایە. شوێنەکەی دەکەوێتە ئەوپەڕی باشووری ڕۆژئاوای کوردستان. لە زمانی عەرەبی بەو ناوچەیە ئەفرینی تێدا هەڵکەوتووە "چیای کورمانج: جبل الاکراد" دەگوترێت. شارەکە بە تایبەتیی و ناوچەکەش هەمووی بە گشتیی شاخاوییە و زنجیرە کێوی "چیایا کورمانج" پاڵی پێوە داوە. کێوی هەوارە کە بەرزترین کێوی ناوچەکەیە و ١٢٠٠ مەتر لە ئاستی دەریا بەرزە. ناوەندی کانتۆنەکە شاری ئەفرینە کە زیاتر لە ١٠٠ هەزار جەماوەری هەیە. نزیکەی ٣٠٠ هەزار کەس دانیشتووی ٣٦٦ گوند و شارەدێی هەیە. پێکهاتەی ئەفرین بەزۆرینە کوردی موسڵمانە و بەشێك کوردی ئێزدی و مەسیحی، عەرەب و تورکمانی تێدایە. لە سنووری ئەفرین نزیکەی یەك میلیۆن داری زەیتوون هەیە. واتا داهاتی سەرەکی خەڵکەکە بەروبوومی زەیتوونە. ئەفرین لە ڕێکخستنی ئیداری سووریە دەکەوێتە ناو پارێزگای حەڵەب. شارۆچکە پیشەسازیەکانی حەڵەب لە هەموو ناوچەکە

---

١. دانیشتوانەکەی ئێزدین

٢. سەرچاوە: ویکیپێدیای فارسی، بابەتی: کردستان سوریە، ١٣٩٧/٠٤/١٩

٣. بەشێکی زۆر لە زانیاریەکانی ئەفرین لە مامۆستا شاسوار هەرشەمی خەڵکی هەولێر، دانیشتووی ستۆکهۆڵم و مامۆستای زمانی کوردی، وەرگیراوە.

ناسراوە. سابوونی سروشتی و گیایی "ڕەقی حەڵەب" بەرهەمی دەستی وەستایانی ئەفرینە.

لە گوندی کانی دارا لە ٥ کیلۆمتری ناوشاری ئەفرین شوێنەوارێکی مێژوویی هەیە. پاشماوەی گوندێکی مێژوویی سەردەمی چاخی بەردینە و بۆ ١٠ هەزار ساڵ پێش ئیستا دەگەڕێتەوە. بەشی سەرەوەی کانی دارا بریتیە لە پەرستگایەکی کۆنی ١٢٠٠ ساڵ پێش زایین کە پەیکەری گیانداری باڵدار، پەیکەری ئەبولهۆل، تابلۆیەکی بازێلتی ئیشتار و دەیان پەیکەر و نەمادی دیکە لەو شوێنەیە. [بەداخەوە بەشێکی بەرچاو لەو شوێنە مێژووییە لە هێرشە داگیرکاریەکەی ساڵی ٢٠١٨ سپای تورکیە بۆ سەر ئەفرین، وێران بوو.]

دوو خاڵی سەرنجڕاکێش لە زاراوەی کرمانجی ئەفرینی ئەوەیە کە وەك فارسی تارانی کە بە نان دەڵێن نوون، ئەفرینیش هاوشێوە ئەلفی نان دەکەن بە بۆرە [ۆ] و دەبێتە نۆن. هەروەها بەکارهێنانی پیتی عەین لە وشە کوردیەکاندا، وەکوو: چوار کە دەبێتە چعار، ماسی دەبێتە مەعسی، و تاد.

*باسی ئێمە لە وتاری بەردەست ئاوڕدانەوەیکە لە گەنجینەی کەلتوور و پاشخانی پزیشکی کۆنی کوردەواری لەو ناوچەیە. ئەم بابەتە ڕەنجی توێژینەوەی مەیدانی چەند چالاك و پسپۆڕێکی ئەفرینییە (فەخری عەبدۆ، عومەر حەسەن، موحەمەد هەمکۆچەر، وەهاب عەبدولحەنان، موحەمەد حەسەن، عەلی بەتال و حەسەن موحەمەد) کە وەك پرۆژەیەکی نیشتمانی و فۆلکلۆری ساڵەکانی ٢٠١٦ و ٢٠١٧ لە ڕۆژاوای کوردستان بەشی کانتۆنی ئەفرین ئەنجامیان داوە و بەندە بەئەمانەت [مەرجی ناوهێنانی ئەوان] دەقی توێژینەوەکەیان لە ژێر ناوی "پزیشك (نووژدار)یا گەلێری" لە توێی کتێبەکەم دادەنم.*

١) **ئاڤا چاڤانا گەور** (ئینگ: Glaucoma)، **وا رەش** (ئینگ: Cataract)

هنەکان سپیرتۆیا هشین دکرنێ، یان ڤەدخوارن! تەڤی کو ئەو سپیرتۆیا مرۆڤان دکوژە و ژەهرییە.

٢) **با** (ئینگ: Rheumatism)

بەرێ، ژ کەسێن باوی رە کولیلکا ئێر دکوتان و دیدنان سەر جیێ ئێشەکێ، رهەت دکر. چاویرێ، پەقرمە ل وا جیی چێدکرن و چەرم دکەیاند، لۆما ژی ناڤ کولیلکا ئێرە. هنەك کولیکێن روولکێ دکن ناڤ زێتێ زەیتوونان، و دیدنن بەر ئستێرکان ژ هیڤار دە هەتا بەربانگێ، و بەری کو رۆنیا رۆژێ پێدیێ، تینن هوندر، و وا زێتێ د گوڤدێ خوە ددن، ژ نەخوەشیێ بێ چێ دبن. هنەك ژی کەمبەرێ بکار تینن. کولیلکێن وێ دکوتن و

ل خوە دهێلن. هنکەس ژی هەنە، کراسێ ماران ل جانێ خوە دهێلن. کریـف، شـو عژیـان وەك دەرمانەکێ بۆ نەخوەشیا بێ دخون. هنەك ژی رۆژێن چارشەمێ دەرن بەر زیـارەتەکێ، دیکەکی، ئان مریشکەکێ سەرژێ دکن، و خوینا هەرکی تەڤ ل ئاخێ دسـترن و د جیـێ ئێشەکێ ددن، پێ رهەت دبن. هنەك دبێژن کو گۆشتێ شـوعژی و کپریـان دخـون، چـێ دبن!

٣) **باباسر** (ئینگ: Hemorrhoid)

ژ کەسێ نەخواشێ باباسرێ رە دگۆتن کو باباسری بوویە. ب کاردیێ ئەو دەرمان دکرن. ژ بلی وێ ژی هنەك خۆ دکن ناڤ ئاڤەکە گەرم و نەخـوەش خـوە ژ ژێـر ڤە رووت دکە و تێ دە روودنە، رهەت دبە. "هسێنێ عەلۆ" ژ گوندێ ئەرەندێ باباسر دەرمان دکر. هەتـا نهـا ل با مە ب کێردیێ تێ دەرمان کرن. پشتی کـو کـاردی دسـەڕدە، ئەو تەنەیـێن کێردیـێ دکن ناڤ چیچك دەسمالا وەراقی و دادقرتینن، دبێژن بیرەبیرە. هنـان دچـوون عەنجـووری کەرا هشك دکرن و دکوتان، پێ وەك هەبەیـان چێـدکرن و دخـوارن، ئـان ژی عەنجـووری کەران ب ئۆتراقا خوە دە دگوڤاشتن، ئان ژی ئاڤ گەرم دکرن و ئەو کەسێ کو باباسـر ڤـێ رە هەبایا، قوونا خوە تازی دکـر و د سـەر هولمـا ئـاڤێ رە دگـرت. گیـایەك دن ژ جنسـێ کێردیێ هەیە، پەلێن خوە پەهنن. کۆڤکێ خـوە هەیە. ژ عەردێ دە کـۆڤکێ خـوە رادبە، د ناڤ رە ژی نێریەك زراڤك هلدکشە. نێریا خوە تـووژکە، وەك هەیـی پێـزە، رەنـگ ژی رەش دبە. ئەڤ جنسایێ دەشتایە. نایێ خوارن. ئەو دەرمانێ باباسرێیە. هنەکان خنتـك د ئـاڤێ دە دکەلاندن، و تێ دە روودنشتن. هنەك ژی پرچا دۆرقوونا سەرچێ هلدکن، و قوونا سـەرچێ دیدنن سەر قوونا خوە، نەخوەشیێ ژێ دکشینە! هنەکان ژی ئاڤا عەنجـوورا ژی تـێ ددان، و هنان ئەو زێت دکر، و هنان شەهمێ ترەکتۆران تێ ددان، و هنـان جیـێ کـو وەرمـیە و خوین تێ دە کۆمبوویە شەفرە دکرن. پر کەس هەبوون دچـوون عەزازێ جەم پیـرا زێریـا، زێر بەرددان قوونێ، ئەو خوینا کو کۆمبوویە دمێتن و نەخـوەش پـێ ڤەدهەسـیا. گـۆ: هەر باباسر ل من قەرت دبێ و پەقرمە ل دۆر کوونا من مەزن دبن، ئەز دەرم عەزازێ جەم پیرا زێریا، ئەو زێریا بەرددیێ، وا خوینێ کۆمبوویە د پەقرما دا دمژن، و ئەز رهەت دبـم. و گـۆ: وەلەهی من جارا ل پێشێ ت کەسی خوە تۆمپەل نەکری ژ خێری پیرا زێریا ل عەزازێ.

٤) **بالووك** (**ئێن لاشێ مرۆڤ**) (**لاتین**: Verruca vulgaris)

بالوولك یان بالووك، پزرکن گزرەگزرەیی نە. ئەو بالووك ژ هەڤ ڤەدگرن و دکارن پر بـبن ل گۆر خورتیا سیستەما پاراستنێیا جانێ مرۆڤ. کەڤناران ـ مخابن ـ باوەر دکر کو گاڤا کـو

کەسەك دەستێ خوە ب کێسەفسان بکە ئەڤ بالووك لێ تێن دەر، ژ بەر کو سەر ڤالکێ وان بالووك بالووکییە! ژ بۆ دەرمانکرنا بالووکان، کەڤناران ژ کەسێ کو بالووك ل گوڤدێ وی هەبن رە دگۆتن کو هەرە بەر دارەکە زەیتوونێ و دو پەلان د ناڤ رە بچرپینە و بکە دو پەرچە، و مەرجە کو ئەڤ چلۆ ب دارێ ڤە بمینن، بێیی کو پەرچە ژ هەڤدو ببن، و پشت رە ئەو مرۆڤ ل سەر ستوو ڤەگەرێ هەیا کو دگهینە مال بێیی کو ل پاش خوە بنێرە. تا هەفتیەکێ ب راستی ئەو بالووك وندا دبوون. سەدەم ژی ئەوە، کو ئەڤ بالوولك ب باندۆرا سیکۆلۆژیا لاشێ مرۆڤ ڤە گرێداییە و وێ گاڤێ سیستەما پاراستنێ خورتتر دبێ و ل هەمبەر ڤیرۆسێن سووجدار دسەکنە و وان دشکینە. دەرمانەك دن ژی ئەو بوو کو ب کەسێ کو بالووك ل لاشێ وی بن رە دگۆتن کو „ هەرە بەر دارك هەژیرێ، و پیککێ هەژیرێ تەر و تەزە بشکین و ب سێ چار پار عك، لێ ئەو پار بلا ب قاندی هەژمارێ بالووکا بێ و گەرەك ئەو پیك و پار ژ هەڤ نەبن و ب دارێ ڤا هێل ببن، و ل سەر ستوو ڤەگەرە مال بێ گ تو ل پاش خوە بنری، تێ چێ ببێ". هنەکا ژی تەنەنن جەھ دهینان ب قاندی هەژمارا بالووکان و سەرێ هەر تەنەیەکێ د کۆکا بالووکێ رە دگەراندن و پشت رە ب وێ تەنەیێ هوندرێ بالووکێ هنەکی دگوڤاشتن، و دیسا دچوون تەنەیەك نوو و بالووکەك نوو هەیا ب داوی دبوون. باوەریەك گەلێری هەبوو کو کەسێ کو ستێرکا بژمێرە، ئان ب بەقان بلیزە، ئان کو بەقەکێ ئان کێسوویەکێ بکوژە، بالووکێ لێ وەرن. هنەکان شقنەك ژ دارا هەژیرێ ژێ دکرن، و داڤێتن سەر خانیەکی، هەتا کو هشك ببا ل بەر رۆژێ، بالووك چێدبوون! هنەکان ژی بەقەك دکوشتن و د ناڤ پاچەکێ دە دپێچان، و ل چاترێکەکێ دکرن بن عەردێ. هنەکان دەزیەك هەریری ئان ژی دەزی هشین ل کۆکا بالووکێ گرێددان، و رۆژ ب رۆژ لێ دشداندن، بالووك هلدبوو. هنەکان ژی شیرکێ کەرکێن هەژیران د بالووکان ددان. هنکان ژی هەستی پووشە پێ ڤەدنان.

۵) **باخە** (ئینگ: Dysphonia)

ئەگەر یەك دەنگێ خوە نە زەلال بە، ژێ رە دبێژن باخە. دەرمانێ وێ یان سوورافکێ خۆیێ دخرخراندن، یان ژی کەڤچیەك روونێ مالان و هونگوڤ تەڤ ل هەڤ دکرن و دخوارن، یان ژی کاسەك ئاراقی ڤەدخوارن. دەنگبێژان ژی بەری دەواتان وە دکرن.

۶) **باخمەجك**

هەرفا خ وەك غا عەرەبی ب لێڤ دبە. قچکێ کو چەل رۆژ هێن دەرباس نەکری، هن جاران دخەنقە و کەف ـ کویك ب سەر دێڤ دکەڤە. مۆرکێ خوە هەیە، مەرمەرییە، ب قاسی

پالووتەكێيە و وەك شير سپييە، و هانا تامارن رەنگين، بەرسۆرى، د نـاڤ رە هەنە. نـاڤێ خـوە مۆركێ باخمەجكێيە. وێ كەڤرى ب تۆپليەكێ ب سەر پيێ قچـك دخيـنن، رەهت دبە. هەڤ پر ئێزدى (گوندێ كورزێلا جوومێ، عەندارێ، كەفەرزيتێ، ...) وە دكن، لـێ ل هـن گونـدێن دن ژى هەيە. هنەكان ئەو مۆركا و مۆركێن شين دكرن بەنك، و دكرن ستوويێ قچكـان. بنـر بۆخمەجك

٧) **بايى قچك**

نەخوەشيێ بێ (باداری، روماتيزم)، دەما كو ل ژنكێ ئاڤس دخينەيە.

٨) **بەلەكبوون** (ئينگ: Poliosis)

هنەك هەنە عەيارێ خوە گشتك، ئـان جـهـ ب جـهـ هلـيس دبە، بەلەك بەلەكـى دبە، و عەيارێ تێ خويان سپيە، دبێژن كو „وى ل ســەر خەزينــێ زێـرا خەو كـريە، دەفينـاك ب تەلاسمە!"، ژ بەر وێ وها دبە. هەتا ناكا ژى تو دەرمان بۆ وێ بەلەكبوونێ تونەيە.

٩) **بەلخەم و سينگ ـ خەتمين**

دبێژن كو زەنجەفيل و بيبەرا رەش، سبێ ـ ئێڤارێ ل ئێخرينيێ ب قاسـى كەڤچيەكـێ ڤەدخـون، رەهت دكە. و يەك دن ژى هەيە دبێـژن كـو روون و هونگـوڤ ل ئێخرينيـێ ڤەدخون. تۆلكێ گايا (هيرۆ) سينگ و گەوريا مرۆڤ نەرم دكە. لۆما هەگەر سـينگێ يەكـى ڤێ رە بگرە، كوليكێن وێ تەڤ چايێ دكن و ڤەدخون. بەلخەمـێ رادكە و پـاك دكە. هەمـا ڤێ رە بەلخەم تێ ئاڤێتن.

١٠) **بەرسووجى**

ناڤێ نەخوەشيەكێيە. نەخوەش پر خوارنێن تەڤلهەڤى دخوە، و پـێ نەخـوەش دبە، ئـان ژى تشتەك خوار و لێ نەهات، ئانكو سووجێ نەخوێشە. پـر ڤەدرشـە و نـاڤ دەرە. دەرمـان ژى دووركەتنا ژ وا خوارنێيە.

١١) **بلندبوونا دەختا خوينێ** (ئينگ: Hypertension)

دگۆتن كو سيرنا بكوتن د دێو كن، ملا ڤەخوە.

١٢) **بنگوەكەتن، جوعەمى بووين** (ئينگ: Mumps)

بنگوهێ يەكى بوەرميـا، هەريـا زارەتـێ دهـانين (تـوبەرك) و تـێ ددان. ل رۆبـارلقێ، ژ وەرەما بنگوهێ رە دبێـژن جـوعەمى، و ب نەخـوێش رە دبێـژن كـو جـوعەمى بـوويە. ئەو گيايەكێ تينن، ناڤێ خوە بەنجە، پەلچمێن خوە گلۆڤەرن، رەنگێ وان كەسكێ ڤەكـريە، و وەك كولاڤايە، دكوتن و ديدنن سەر، رەهت دكە. ل گوندێ شيێ، فاتكا شـێخ هەبـوو. يەك

بنگوهێ وی دکەت رهەت نەدبوو گەر وێ ژنکێ خوەزیا خوەیا بمبارەك تێ نەدابا! هنەکـان نەخوەش دبرن جەم شێخەکی کۆکل و ب پەهنیا خوە چەند جاران لێدخسـت و تـێڤەددا، چێ دبوو! لۆما ب عەرەبی ژێ رە دبێژن: ئەبۆ کەعب (ئا ب پەهنـیێ)!

١٣) **برین**

ل گوندێ ئەرەندێ عێسۆیا دەدکێلێ چلۆیێ بەنیشتۆکێ دکوتاند و وەك نسقا دکـر و ل سەر پێچ رێدخست و دیدنا سەر دەرێ برین. (ئۆهـ) دیا من ژی وها دکە و دبێژە کـو بەرێ تزبیێ ژی فێدە دکە و بەنیشتێ سماقێ ژی. هنەکان ژی بەنیشتێ دارا مەرخێ و شـەکرێ پۆلات دکوتان، دیدنان سەر.

١٤) **برینا چاڤان**

گولیلك ب مت و دڕیا برین دبە. دمسێ رەزا دکنێ، رهەت دکە.

١٥) **برینا ڤورشینێ**

کو یەك ساچمە، قورشین لێ کەتا، د جی دە پاچەك دیدنان سەر برینێ دە کـو خـوین نەهەرکە. و دهاتن، ل سەر ئێر، کێرەك ئان ژی شیشەك تووژ گەرم دکرن و ب کێـرا تـووژا گەرمکری، ئەو قورشین ئان فیشەك ژێ دەردخستن. هـنەك ئـاراقی ددانـێ و د برینـێ ژی ددان دا کو پچەکی پاك بکە، و ژ بۆ ڤەخوارنێ ژی داکـو هنەکـی ئێشـێ تەهمـول بـکە، و ئاراقی ژی ل شوونا بەنجێ بوو ژی هەلبەت. پشتی وێ، ژ بۆ بـرین خـوە بگـرە، بمچـقە و وەرە هەڤ، ب پاچەکی پاك پەهت گرێددان.

١٦) **برینێن کورکرنێ**

بەربەر، چاخـا کـو دەرێ یەکـی بـرین بکـرا ب شـەفرێ، شـەب تـێ ددا، خوینبـوون رادوەستیا.

١٧) **برینێن کوور**

پر جاران برین ب دەرمانێ سۆرك،ێ کو ب ناڤێ تانترۆتێ تێ ناسین، پـاك دکـرن. ئەو ب خوە ژی باکتەریاکوژە. بەرێ سە ئیسپرتۆ و تانترۆت تونە بایا، ب سـەر برینـا دە میـز دکـرن!. میز ل جەم کوردان دەرمانەکی رەسەن بوو (ح)، لۆما ژی ژ کەسێ خەسەسز، سوودا خـوە ل کەسی نابە رە وەك بوێژ دبێژن: ب سەر پێچیێ کول دا میز نـاکە! مـن ئەڤ یەکـا ب چـاڤێن خوە دیت. کورێ مەتکا من کێر ل پێچیێ کەت ل چۆلێ، هەما بەزیا پشـت کەلەمـێ و پـێ دە میزکر و هنەك ئاخ ب سەر دەڤێ برینێ دە کر و گرێدا. گاڤا کـو سـەرێ یەکـی ب بـرین بووبایا، یان برینەکە پر خەدار و خورت بایـا، وەك بـرینێن شـوونا کێـران یـان شـووران یـان

فیشەکان، هەما د جیھ دە دەڤێ برینێ پاك دكرن و تینان هەڤ و بەنیشتنێ تەڕ ژ دارا مەرخێ دكرن دەڤێ برینێ و گوچلێن برینێ رند بەرهەڤ تینان و رند دشداندن (تەنێ جارەکێ وە دكرن). و ئەگەر بەنیشتێ نەرم و تەڕ تونە بایا، دچوونێ هشك هوور دكرن و دهێراندن و دكرن دەڤێ برینێ و دشداندن. ئەڤ ژی ب راستی دەرمانا برینانا یەکەمینە د جیهانێ دە، ژ بەر کو شوونا برینێ ژ بنی دە جارەکە دن خویا نابە مینا ئۆپەراسۆنەکە (کریار) نووژدارییە. ئەڤ ب تایبەت دایکا من، خەجێ، برینێن مرۆڤێن گوندێ مە، ئەرەندێ، دکەواند. ئێ کو برین ببایا، دگۆتن: ئامان ئاڤێ مەدن(ی) ئێ، ێ بمرە! و برین ب خۆیێ گور دکاواندن. ئەڤ خۆیا ژی ژ سەر زناران رێشدكرن.

١٨) **بینا لنگان**

کەسن هەنە بینا نەخوەش ب لنگێن وان دکەڤە. ژ وان رە ئاڤا خۆیێ تم گەرەك بوو کو لنگێن خوە تێخنیێ.

١٩) **بینا ڤچکان**

زارۆکێ کو نوو دبوو، ب سووراڤکێ دشوشتن دا کو مەزن بوو سە، بێهنا نەخوەشا گەمری ژێ نەتێ. هنەکان ژی تەنێ ب خۆیێ دشوشتن، دگۆتن کو بلا بینێ ساسی ژ ڤچك ڤەبە. چاخا کو ڤچك دبوو، رۆژا دن، یاا سسیێ، ئاڤا خۆیێ، سووراڤك، چێدکرن، و هنەك مەیانە دکوتان و دكرنێ و چیچك زێت ژی تەڤ لێ دكرنێ (یەك و نیڤ ڤەدەم ئاڤ، دو کەڤچیێن گێرمیێ زێت، چار کەڤچیێن گێرمیێ خۆ، کەڤچیەك ڤەهوێ مەیانە)، و چیچکی گەرم دكرن، شیرگەرمی دبوو، و شاشیەك تینان، تێ دە دكرن، و د هەر دەرەك ڤچك ددان، تەڤ سەری ژی. ڤچك رۆژەکێ وە دهێشتن و رند دپێچنین ژ بەر کو ب زێتە، و رۆژا دن ئەو دشوشتن. گوڤدێ ڤچك دکەویا، و ئەو نەدشەلقی. ئێ کو سووراڤك نەبوویە، بێهنا لنگان تمی هەیە.

٢٠) **بۆچك کەتن**

بۆچککەتن، ئانکو مۆفرکا داویێ ژ جھ لڤیە و کەرکێ قوونێ دێشێ و نەخوەش نکانێ ل سەر دووڤێ خوە روونێ. وا هنگێ دبێژن کو بۆچکا وی ژ ج لڤی. هنەك هەنە بۆچکێ مرۆڤان ب تلیا خوە دهینن ج. ئەو تلیا خوە د زۆتکا نەخوێش رە دكن، و پێ ل هەستیێ بۆچکێ زۆر دکن، هەتا کو بۆچك دهێ ج. هنەك خورما دیدنن سەر بۆچکێ پێ نەرم دكرن، پاشێ رادکن. ئەهمەدێ عەدێ، ب خوە عەرەب بوو، ل گوندێ مسکێ ژێرن روودنشت. وی ناڤك و بۆچك دهانین ج. گۆ یەکی ژ گوندێ باسلێ پێچ ڤالنگ بوو، بۆچك

دهانین ج. رۆکێ ژنك جان هات جهم، بۆچك کەتی. پێچیا خوە کرێ، ژنك ئێشیا، و کر قێر: ئۆی! گۆ: تەە کوشتم. گۆ: کە تو چۆ دیمیشی مێرك دبە؟ ێ گۆ: ئەهمەقــی مێــرك دکەفــێ ور؟! ژ پسپۆرێ چارەکرنا بۆچك کەتنێ رە دگۆتن بۆچکجی. هەری زێدە، ئەو ب تلیــا خــوەا نــاڤین بۆچکــا هلــددە. ئەڤ رەنگچــارە پــر کەڤــنە. (ئەب)ێ کــو بۆچــك دکەت ل جهم مە، دچوون جهم سەولیا پێکەت کو بۆچکێ هلینە. ژ خێری وێ ل گونــدێ شــیێ تــونە بــوون. بمبارەکێ، پێچین خوە زێدە قالنگ هەبوون. یەك وەنــا پشــت دێشــی ســە، دگــۆتن کــو ل پێشی رێ تونە نە ژ خێری سەولیێ و پیچێن وێ. ئێ پر ژ بۆچککەتیا رە دگــۆتن کــو یەك پێچی ـ زراڤ سەعکە، دا کو بۆچکێ تە هوونێ جهـ

۲۱) **بووزمەجە**

گاڤا کو زارۆك ژ داییــك دبە و پــر لاواز و زەر بە و نــاڤ دچە و پــر دگــری و تشــتەکی ناخوەیە. دو جورەیێن وا نەخوەشیێ هەنە، بووزمەجێ رەش: ئەو زارۆك دکوژە. ژ ژۆر ڤە لــێ دخینە، سینگ و لێڤ و بن نەینۆکێن دەستان هشین دبە. بــووزمەجێ زەر: ئەو ژی ژ ژێــر ڤە ل زارۆك دخینە، نەینۆکێن لنگان و زك هشین دبە. دەرمانێ بووزمەجێ ژی ئەڤ بــوو: ا. شــەوتاندن: ئەگەر زارۆك مــێ بــا، پشــت ب دو جیــان دشــەوتاندن و زك ب جیەکــی، ب فەتیلەکێ ژ پاچەکێ پەمبوویی قەت نابە کو لەستیك تــێ دە هەبە. و ئەگەر زارۆك نێــر بــا، بەر چچکێن زارۆك و پشتێ ڤە دشەوتاندن. ب. هنەکان مــۆریەك کەســك تامــاری ب زارۆك دخستن، ژێ رە دگۆتن مۆریکێ بووزمەجێ. ج. هنەکــان ژی دو تەنە ســیر د دەزیەکــێ رە دکرن و ب قچك دخستن. د. پەلوولێ ئێرد، ئانکو ئەسیدە، تەڤ نیسکێن هێراندی و هــنەك زێت دکەلاندن و ل سەر پاچەکی رێدخستن و دکشاندن زارۆك. یــان ژی بەختەنیــز هــوور دکرن، تەڤ هەلاوێ دکرن و چیچك زێت و دیدنان سەر زکێ قچك. ئەڤ هەردویــێن داوی دیا من بکاردانین. لێ تو دەرمانان تێ هوکار نەدکر. کو د هەفتەیەکێ دە قچکــێ نەخــوەش ب خوە چێبا، چێدبوو، کو چێنەبا ژی پشــتی هەفتەیەکــێ دمــر. وەختــا کــو قچــك دبــێ، گەرەکە کو تشتێ د زك دە چەببە و وەرە ئاڤێتن. کەڤچیەك هنداخ ددانیــێ. مەزن دبــوو وا قچکا، رادبوو نەخوەشیێ د پەعنیێ رە چەدکر، پەعنی کول دبــوو. پاشــێ ب قاســی شــوونا وەراقەکێ گرنیشی دبوو. ل ناڤ شێرەویان ژێ رە دبێژن بۆخمەجك. لێڤ و دەستێن قچکێ نووبوویی هشین دبن و ب سەر دە دمرە. مۆرکەك خوە هەیە، تا زار یەك ســالی دبــن دکــن ستوویێن وان. بنر باخمەجك

۲۲) **چاڤ خورین**

چاڤێ كو سڤك كول ببايا و بخوريا، دلۆپەك دمسێ شێرين دكرنێ، رهەت دبوو.

### ٢٣) چێل لهەڤدوكەتن

ژنا كو نوو زايى و هين بچێله (تەمەنا زارۆكێ وێ هين چێـل رۆژ دەربـاس نەكـرى) و چێلێ خوه ب سەرى نەكريه، نه ئەو نه ژى زارۆكـێ وێ نـابه كـو ژ مـال دەرێـن و هەرن سەردانا ژنەكه دن وەك وێێ بچێل. باوەر دكن كو چێلێن هەردو ژنانێ ل هەڤـدو كەڤـن و زارۆكێ خودانێ مالێ نەخوەش بكەڤه! و ئەگەر بێهەمـديا وان ژى ئەو پێرگـى هەڤ بـێن، دڤێ كو هەردو ژن تۆپليێن خوه ب هەڤدو بگوهەرن و وان د بەر هەڤ ره بكن. هنەك ژى دبێژن كو ئەگەر ژنەك كو زارۆكێ خوه نوو بووبه ل بـا يەكـا دن كـو زارۆكـێ خـوه چێـل رۆژەكى به روونشت، دڤێ دەرزيێن خـوه د بەر هەڤ ره بكـن، دا كـو چێليێـا نـوو نەرەيـا چێلێ خوه دەرباس بوويه و جـارەكه دن لـێ ڤەنەگەره! كـو ژنەكـێ زا و چێـل رۆژ هـين دەرباس نەبوويه و چـوو جەم ژنەك دن وێ كـو ژى زايـى و چێـل رۆژ دەربـاس نەبـوويه، زارۆكێا هوندر نەخواش دكەڤێ، دبێژن كو چێلێا هاتى ل زارۆكێـا هونـدر كەتـى، ژ بـۆ كـو چێل لێ نەكەڤێ دبـێ ژنـا هونـدر دەركەڤـێ دەر ڤه و ل بەر دەرى تۆپليـا خـوه ب هەڤ بـگەورن ل گـۆر باوەريـا نەزانـان. نه بەس ل زارۆكـا وه دبێـژن، رۆژەكـێ ئەم ل نێچيـرێ دگەرين ل چيايێ بەعيڤ ل ژۆرى گوندێ كۆسا، يەكى ژ كۆسا ژى ب مه ره بوو، كـو هەر فيشەكەك داڤێت و لێ نەدخست دگۆت كو چێل ب سيلەها من كەتى!

### ٢٤) دەبازى (ئينگ: Allergy)

هنەك هەنه دەبازى دبن، ئانكو تـم دخـورن. دبێـژن كـو ژ گۆشـت و هێكـان وه دبـێ! نەخوەشێ دەبازى گۆشت ناخوه. دبێژن كو ئاڤا بەهرێ چێ دكه، گەر نەخوەش خـوه تـێكه بەهرێ رهەت دبه و ئەو نەخوەشيا ژێ دەره. هنەكان، دەرزيێ عەبا ل سەر ئێر سۆر دكـرن و ب تامارا زكێ ئەنيشكێ، ئەو جهێ كو خوينێ ژێ دبن دەما تەهليلان، ڤەدنـان، و پارزيـا خوه ژى ئێكێ گۆشت، هێك، دۆن، روونێ نەباتى و دەندق نەخوارانا. هەر هنەك ژ تشـتەكى وه دبن. هنەك هەنه شل ببن، و بازەكى سار ل وان خينه، وه دبن. هـنەك هەنه ژ خوارنـان وه دبن، هنەك ژ دەرمانان. بۆ چارەكرنێ هنەك دچوون سەر بيرا گوندێ جەلا، ئاڤا بيـرێ ل خوه دكرن.

### ٢٥) دەرەنگمەشين

سه زارۆكەك دەرەنگ بما د مەشێ ده، شەڤيل (شەقوول) ڤەدكرن. براكەكى من شـەش سالى بووبوو هين نەدمەشيا، مه رابوو كـر زەمبيلەكـێ و ل هـارەتێ گەرانـد، هەر مـالەكێ

تشتەك دایێ، پاشێ مە هانی مال بەنکەك د پێچیێن مەزنێن هەردو لنگان گرێدان، پاشێ یەکی ئەو بەنك قەتاند و رەڤی و یەکی دن ژ پارا ڤە ب شەکالێ ئاڤێتێ. هەما پر نەچوو براکێ من ب سەر لنگان کەت. (هم) هنان هەفت هێلین مالا، قالقێ وان ئێکێ هەفت رۆژان ب بەر رۆژێ دن، و نیڤ کیلۆ لیمۆون ل بەر رۆژێ هشك دکرن، ئەو گشتك دهێراندن و هەفتەیەکێ ددان لێوك، پاشێ دمەشیا.

٢٦) **دەڤسستی**

زارۆکێ کو پر خەبەر بگۆتانا، شۆرێ عەیب بکرانا و دەڤ پێ نەسەکنیا، دگۆتن کو بلا شێخەکی کۆکل چەند سیلەیان ل سەر دێڤ بخە. دە جارکێ فاتکا شێخ هات مالا مە، دێکا من گۆت: هەلە ئەم ب مەهمەدی مە نکانن. دە قە من نزانی ئێکێ چۆ عکێ! بان من کر. ئەز چووم جەم. م جاکێ سەکر ب سیلا و تووکرنێ ب من کەت. و منی تێ را کرا!

٢٧) **دەڤ خواربوون** (ئینگ: Bell's palsy)

دەڤێ هنەکان فلیچ ببایا و ب یانەکی ببایا (هن جاران ژ ترسان رە وە دبوو)، رادهشتن تەکەکێ ژ پەپکێن (سۆل) زارۆکان، و بێیی کو نەخواش پێ بهەسیا، ژ نشکا ڤڤ ل سەر دەڤێ وی دخستن، هەما پێ رە چێدبوو. بەری ب چار - پێج سالان یەك ژ گوندێ قەرمیتلقێ دەڤ خوار بوو و کەسی نزانیبوو دەرمانێ وێ نەخواشیێ چیە. ئەو برن با شێخ بێرەم شێخ زێنەل ل رەجۆ. شێخ شمکەك سێ جاران ل سەر دەڤێ نەخوێش خست و د ج دە چێبوو. (ئەب) دبرن جەم شێخێن گوندێ تنبێ ژی، مالا شێخ هەمیت، عەرەبن. شەکالەك ل دێڤ دخست. لێ هەنە هن کەس د ناڤ رە ژی دبێژن کو مسدان ژێ رە گەرەکە!

٢٨) **دبەردامایین**

زارۆکێ کو تشتەك، خوارنەك د بەر دە دمایا، وەك، نۆکەکێ، دەندکەکێ.. و د گەوریێ دە مەکنی سە، ئەو زارۆك، دێ ئان باڤێ خوە ب لەز و د ج دە پێچیا خوە دبر گەوریێ و دەرتینا. کو دەرنەکەت سە، ب لنگان دگرتن و ل سەر دێڤ ل بانی دگرتن و ب تەپان ل ئۆمزا پشتێ دختن. (مچ) پێشیێن چك دگۆتن کو هەگەر نان د بەر یەکی دا ما ئاڤێ پێ گینن، و هەگەر ئاڤ د بەر دا ما کێرێ ب ئوست گینن!

٢٩) **دلێش**

پیژدانك دەرمانێ دلێشێیە. وێ دکەلینن و ڤەدخون.

### ٣٠) دران دەرکەتن و دران هلبوون

گاڤا کو درانێن زارۆکـان دەردکەتـن ژێ رە دان دکەلانـدن و ل هەر زارۆکەکـی بەلاڤ دکرن، و هنەك شێرانی ژی، وەك شێکر یان دمس ل سەر درانان دکرن دا کو شێرین بـبن و زارۆك شاد ببە و پێ هیس ببە گاڤا کـو زمـانێ خـوە د سـەر رە دەربـاس دکە. و هەگەر درانێ زارۆکانێ شیر هلبابایا، پێ دگـرتن و داڤێـتن سـەر خانیـان، یـان ژی دکـرن ئـۆلقێ مریشکان و مرازەك د دلێ خوە دە دخواستن، وێ بگۆتانا: هن ڤا درانی منـی زیڤـی، و کـا درانکی زێری! هنەکا ژی دگۆت: هنێ ڤـا درانـی هەسـتی، کـا درانکـی زێـری. ل گونـدێ هوسـسێ هەچی کو درانێ خوە دکەت، دبر و دکوتا بەدەنا دارەك گووزێ ل ژێری گوندە کو ژێ رە دبێژن بیشبەراقێ. درانێ کێ هلببایا ژی، ئاڤەك پر شۆر د دەڤێ خـوە وەردداا دا کـو شوونا برینێ کول نەبە، و زوو رەهەت ببە. و دەما کو زارۆکەکی درانـێن خـوە دەرنەکەتانـا و چەنەکرانا، فەتیلەك گۆشتێ سۆر، د خۆیێ دە دکـرن و نیڤبراشـتی دکـرن و ددان دەسـت زارۆك، قاسی وی ئەو دمێت، دراناان چەدکرن.

### ٣١) دران رەشبوون

بۆ درانا پاککرنێ، رەشی، ملهلێموون و خۆیێ ڤە تەڤ ل هەڤ دکـن و د درانـان ددن، سپی دبن. هنەکان ژی، دا کو درانێن خوە سپی بکن، ب ئارێ چەند جاران دشوشتن.

### ٣٢) دینبوون

دین دبرن سـەر شـێخان، وەراق و هجێـب ژێ رە دکـرن. دبـرن بەر ئووجـاقێ شـێخ. ئووجاقێ شێخانێ هاران هەیە،ێ دینان هەیە،ێ پێدادانا ماران هەیە. ئێ دین سند دکرن و ل عامموودا گرێددان، و ب شڤکا هەنارێ لێدخستن. گۆ: رۆکێ ل گونـدێ خلالکـا، ئەهـمەد ئاخا، براکی فاییق ئاخا برن جەم شێخ. شێخ هەو کربوو بەر زنجیرێ، سند کربـوو و مەکـن ب عێموود ڤا گرێ دابوو، و خانی خوە سـەر دو قەنـتەرایە، مەیـی خەو کـری. ئەم ژ خەو رابوون، ئەهمەد ئاخای تنەیە. هلکشین سەر خێن، بانگ کـرن: گونـدی خلالکا! گـۆ وەرن ئەهمەد ئاخای فلتییە، تنەیە. چوون را ل بنێ عەلەندارا گرتن. ب وێ سـندیێ ڤـا. چـوون هانین هاتن. لێ ناخن ژی ئلّە ب شڤکێ هەنارێ. شڤکێ هەنارێ هـانین و داگەرانـدنێ. قە نە دبێ ئاخ، نە دبێ ئووخ. دینە ها! وەلە ئاخر، یەکی گۆ: شـێخ هانـا نـابێ. هەڤـا نە ئیشـی دینایە. هەڤا ئیشی وەراقـایە! وەرە ئەم سـەکن هەلە. سـەکرن، گـۆ: هەرە، مەش ئەم هەرن مال. چوون مال. گۆ: ئێشیکێ بکۆلن. بەرێ سەری خوە د ئێشیکێ دا دشوشتن. دە هەمـام مەمام ل کو بوون. گیا د ئێشیکێ دا دشوشت. گۆت: کەڤری ئێشیکێ هلکـن. وەلە هلکـرن.

د بن ئێشیکێ دا ل سەر پێلی کەرێ یازمیشکرن . دەرخستن، خەرا کرن. ئەهمەد ئاخـایێ م بوو گور! ژنێ ژێ را وەراق کربوو.

### ٣٣) ئەجامەت

گاڤا پشتا یەکی بێشیا، کاسێن ئەجامەتان تینان و فەتیلەك چـێ دکـرن ژ پـاچنی و ل سەرێ دارکەکی دگەراندن و پشت رە هوت ناڤ قایزاخێ دکـرن هنەکـی دهێشـتن، و ئـار پێ دخستن و هوت ناڤ کاسا دکرن، و هین وا دوویا تێ دەیە ب لەز ب پشتێ نەخـوەش ڤەدنان تا کو باش بزەمرە، و وها دهێشـتن دۆرا نیـڤ سـاەتەکێ، و پشـت رە جـارەکە دن دوبارە دکرن، لێ ڤێ جـارێ ب شـەفرێ جهـێ عەجـامەتێ خیـز خیـزی دکـرن و دیسـا بەردەوام دکرن تا کو خوینا رەش و قرێژ ژ جانێ مرۆڤ دەرکەڤە و راوەستە و ساخ ببە.

### ٣٤) ئێشا چاڤان

چاڤ، ئێشەکا خوە زەهمەتە، ئیجار دەما کو چاڤێ یەکی بێشـیانا، هەلـبەت نە مەسـەلا قرش و رژالەکەتنێ با سە، دگۆتن کو پاچەکی گەرم بـکە و چـاڤێ خـوە دامـرینە و دیـنە سەر، گەرم بکە و پێ ڤەنە. پاشێ ژی دگۆتن کو ب پێچیێن خوە بەر قەباقـان بگوڤشـە، وا چاخێ نێم د سەرێ قەباقان رە دەردکەت و نەخوەش هنەکی ڤەدهەسیا.

### ٣٥) ئێشا درانان و دران هلکرن

گەر درانێ یەکی بێشیا، دچـوو جەم خـۆجە . ژێ رە ل سـەر وەراقەکـێ دنڤیسـاند: یە مەلعوون، یە شەمعوون! دگۆت: تـێ دەرزیـێ بکـوتێ هەرفـێ سـلەف ی. دو ـ سـێ دەقە چوون و ڤەنەهەسی، بکوت هەرفێ دودیێ، بکوت میمێ، بکوت لەمێ، بکوت عەینێ، بکوت نوونێ.. و پێ را هەرە. دە هەتا ساەتەکێ تلەمێ درانێ رهەت ببە. دران وەنا هێنـك دکـرن. درانێ تم بێشـیا و رهەت نەبوویـا ژی، هلـدکرن. درانهلکـرن کـارێ قوربەتـا بـوو بەرێ. ژ قوربەتان سەپەتچی هەبوون. سەپەت و قوف چێـدکرن. بەرێ هەو تـوخترێ درانـان بـوون. وان دران هل ژێ دکرن، و درانێن زێری و زیڤـی چـێ ژێ دکـرن، و فەك و داقـم ژێ، چ زیڤی با، چ زێری با، چێدکرن. درانێن زیڤی ژێ زێری هەلـبەت ئەرزانتـر بـوون. یەکـی ب عەگال دهات بازارا ئێفرینێ، بانگ دکر: دران هلکم، نێشینم! ل ناڤ بـازارێ دران هلـدکرن. هەگەر هیلکرن گەرەك با، سەرێ دەزیەکی مەکن ل درێن گرێ ددان، و ئـالیێ دێزیـێ دن ل کەڤرەك گرێ ددان، و کەڤر ژ سەر خانیەکی دە،یا جیەکی بلنـد دە ژ نشـکا ڤە بەرددان ژێر، دران ڤێ بەنج هلدکر. گۆ: رۆکێ درانێ کریفکی کول بوو، هلبـوونێ دخـوازە. دە چـوو سەر قوربەتکی. قوربەت دران سەکر، و بەنك هانی ل کۆکا درێن گرێدا و سـەرێ بێنـێ دن

ژی ل پێچیا لنگێ کریفا مەزن گرێدا. و ژ نشکا ڤا تلیك ژ پاش ڤـا د کریـف ڤەکـر. کریـف ڤەچەنگری، و دران ڤـێ را هلبـوو. ژ کریـف پـرس کـرن: چـۆ بـوو دران هلکـرن ل جەم قوربەت؟ گۆ: رند بوو، لێ رێکا پێ هلدکەیە نەا رند بـوو! بـاڤکێ مـن ژی دران د پیکەکـێ دارێ ڤە گرێ ددا و بەر خوە دخوشاند و پاشێ ژ نشکا ڤە بەر ددا. ل با مە، کالان دگـۆتن کو ئەگەر درانێ تە بێشێ هەرە چیچك خۆ دینە سەر، یان دگۆتن کو هنەك ئاراقی د دەڤـێ خوە وەردن، یان هنەکا دگۆت کـو هەرن تامـارێن بەلانـان بیـنن و دەهـ دەقەیـان بجـوون ئێشەکێ رهەت ببە. (ئۆه) هنەکان سەریەك سیر دکوتان و چیچـك خـۆ ددان سـەر درێـن، هێنك دکر. چاپێ هونگوڤ ژی دکرن درانێ کو دێشیا، شما ژی. بەری کـو قـوربەت کـارێ درانان بکن، بەربەران دکر. یەك دچوو سەر بێربەر و دگۆت کـو درانـێ مـن دێشـە. بێـربەر ددیت، کو ئەو هلکرنـێ دخـوەزە، ئەگەر دران دهەژیـا، دەزی ب بەر دخسـت و هلـدکر، و ئەگەر نەدێشیا، ئیسپرتۆ تێ ددا. (مـچ) چەکەم ژی د درانـێ ئێشـیایی ددان وەك دەرمـان. نزانم ژ چیە؟

### ٣٦) ئێشا گوڤدێ مەریان

دێکا من تاکێ کەمبەرێ هل دکر و قالقێ کۆکا کەمبەرێ دکوتا و دیدنا سـەر پـاچەکێ وەك نسقا، و ب دەرێ ئێش تێ دە ڤەدنان.

### ٣٧) ئێشا گوڤدێ مەریان ژ بەر کۆتەکان

کەسێ کو د هەبسان دە کۆتەکان پر دخوە، قاسی برین، ئێش لێ پـر دبـن، خشخشـێ دبە و نزانێ کو دەر خوە دێشێ. گۆشـتێ سـۆر ب خـاڤ دکـوتن و هـونەك خـۆ تەڤ لـێ دسترێن، و ل گوڤدێ وی دهێلن، چێدبە.

### ٣٨) ئێشا گووزک و زەندکا لنگا

یەکی ل گوندێ عەنداری دەستێ خوە هەبوو. نەخوەش ب مەش ئێکێ ژ گونـدێ خـوە بچوویا جەم. ب خوە رە کیلۆیەك خۆ دبر، و گـورزەك ژ بیـژکێن دارا زەیتـوونێێن تەزە. وی چلۆیێ زەیتوونێ د ناڤ چیچك ئاڤ دە دکوتـا، و پاشـێ دگوڤاشـت، وەك قەهـوێ ب بنـێ دکەت، ددا نەخوێش کو ڤەخوە. عین ئاخ بوو! خۆ ژی دکر ناڤ ئـاڤن گەرم و پـێ گووزکـا نەخوێش مستددا. وا چۆپێ چلۆیێن زەیتوونێ ژی دیدنا سەر خاسەیەکێ و پێ زەندکا لنگ دپێچا. گەرەك بوو کو نەخـوێش ب سـەر دە ل مـالا وی ٣ ـ ٤ سـاعەتان خەو بکـرا، و ب مەشێ ڤەگەریا مالا خوە. را ژ عێفرین ب مەشێ دهاتن جەم.

**٣٩) ئێشا هەستیان، خرپکیبوون، خرتکیبوون** (ئینگ: Osteoarthritis)

کەسێ کو مۆفرکێن هەستیێن خوە ژ هەڤ دخون و تم دکە خرپنی، دبێژن کو خرپکی بوونە هەستیێن من، ب سەر دە ژی ژ خوە رە کریە کار و تم خرچنیێ ڤێدخە! ب وی رە دبێژن کو کریجا خوە کێمە، ئیجار دەرمانێ خوە گەرەك مێست، شیر و پێنیر، هێکێن کەلاندی بێزەرتك بخوە، و هەر وها دبێژن کو تری ژی رندە. لێ هەلبەت ڤەهەسەك ژێ رە گەرەکە و خرپنیا کو ئەو تم ب خوە ڤێدخە بەردە.

**٤٠) ئێشا کابا**

کەراسێ ماران د کابێ خوە ددن دا کو رهەت ببن. هنەك ژی پووری دارا سنۆبەرێ کەسك، ژ دارێ دکن، دکەلین و ڤەدخون. هنەکان ژی زەنجەفیل هشك دکرن، دکوتان، و دیدنان سەر کابان. هنەکان نوختکەك ل سەر کابێ ژ هوندر ڤە، کێلەك سابوونێ، دەق دکوتان. هنەکان ژی ئاخا بەر زیارەتان، توبەرك، تینان، د ئاڤنێ دە دهەلاندن، و د کاب، پی و ئوستیێ خوەێ نە رهەت ددان، پێ چێ دبوون. هنەکان خۆ د ئاڤا گەرم دە دهەلاندن و هێری تێ دە دکرن و ددان سەر کابان. هەنە، خۆ و زێتێ ب هەڤ رە دسترێن وەك مەلهەمێ دبە و تێددن و توورکەکی نەیلۆیی ژی دگرن سەر دا کو گەرم بکە.

**٤١) ئێشا مەعدە**

مەعدێ یەکی کو سانجی ببە، چاقرێ دکەلینە و ڤەدخوە، ئان ژی هنەکی دخوە، ب سەر دە رهەت دبە. هنەك هەنە تەڵیێ دخون ژ بۆ وا یەکێ. هەما بێژە کو هەر مالەك چێك سالێ گورزەك تەعلی هشك دکر و ب دەرەك مالا خوە دە دادلەقاندن بۆ ڤا یەکێ. زکێ کێ ئێشیا، رادهشت چەند تاکان، و د ناف دەستێ خوە دە هوور دکر و داڤێت دەڤێ خوە، ب سەر دە سانجیا مەعدە دشکیا. (ڤا) جیرانەکی مە هەبوو ـ ئالاّه رهمەتێلەسن ـ دگۆت سالێ ئەز چوالك تەهلی هشك دکم. ئەڤ گیا ژی پر تەهلە. دکەلاندن و نەمازە ژ بۆ ئێشەکا مەعدە رە ڤەدخوارن. (هم) هنەکان شیر دکەلاندن، سار دبوو تەڤ ل دمسێ رەزان دکرن و ڤەدخوارن. (مچ) دگۆتن کو سەر مەعدە مایین، ئانکو مەعدە نکارێ خوارنێ بهەلینێ. دەرمانێ وێ گیایێ تەعلییێە. و ژ بەر کو پر تەهلە و پر کەس هەیە نکارێ وێ ڤەخوێ، ل گوندێ کۆکانا ژۆرن هەبێ تەعلیێ چێدکرن. ئاڤا تەعلیێ دکەلاندن تا تیر دبوو و ئارد تەڤ لێ دکرن، دستران، دکرن هەڤیر، و هەڤیر گلۆك دکرن وەك تەنێ نۆکان، و هشك دکرن، و پشتی خوارن خوارنێ، هەبەیەك دودو دخوارن.

**٤٢) ئێشا پشتێ، دیسک**

ژ نشكا ڤە پشتا هنەكـان دێشـيا، چـۆ وەك پشـتی راكرنـا تشـتەكی گـران، ئـان خـوە دالەڤاندنا ژ نشكا ڤە بە. هنەك ب ژهەڤكشاندنا بەدەنا نەخوێش، پشتا نەخـوێش دهيـنـن ج. نەخوەش ل سەر پشتێ درێژ دكـن، و يەك ل بەر سـەرێ وی روودنە و دەسـمالەكێ ئـان شەملەكێ د بن چەنگـێ وی رە دەربـاس دكە، و سـەرێ وی پـێ زەفـت دكە، و كەسـێ چارەكەر ب هەردو لنگێن نەخـوێش دگـرە، و ژ نشـكا ڤە وان ب هێـز ڤەدچەنگيـنە. هـن جاران ئاقل ژ سەرێ نەخوێش ژ بەر ئێشا ڤەچەنگاندنێ دچە، ب سەر دە رهەت دنبە. هەنە نەخـوێش ب لنگـان ڤە ب دار دخـن، و هێلـدكن. بەری ٧٠ سـالی، قچكـك ل گونـدی كەفرسەفرێ هەبوو، ناڤ ئۆسمان بوو. ل مالێ كالكی م پر دهەوی. دە رۆكێ ئێشەكك كەت پشتێ ئۆسمێن، و ڤا ئێشەكا رهەت نەبوو، چۆ كرن نەبـوو. رابـوو وەسـاندن پـێ „كـالكۆ"، كورمانجكی ژ شەرقێ بوو، ل ناڤ ڤـا گونـدنا دگەری، خەلـك دەرمـان دكـر، و ب وا تـۆنی دەبارا خوە دكر. كالكۆ هات، نالك ژ بەريكـێ خـوە دەرخسـت، و ب ماشـێ د نـاڤ كزۆتـد پخارێ دا سۆر كر. نـالا سـۆر دينـا سـەر عەردێ ئـاخی، و ب پەعنيـێ خـوە پـێ لـێ نـا. دوومانكی كەسك ژ پەعنيێ كالكۆ هات.ی مەسەلە ژ من را گۆتی، گۆ: من ب چەعڤێ خـوە دی. كالكۆ لنگ راكر و ب پشتێ ئۆسمێن ڤەنـا، گـۆ: ئـاااخ، ئۆسـمێن! دوومـانی كەسـك ژ پشتێ ئۆسمێن ژی هات. دگۆتن كەرامەتك كالكۆ هەيە.ێ دۆخر، كالكۆ مەريكی پاك بوو. ل گوندێ عێنهەجەرێ، شێخ بەرێ عەرەب، ب لێو ڤە، ئەهمەد، ئێشا پشتێ دەستێ وان بوو. وانێ ل سبەيەك چارشەمێ چاويرەك بهانينا، خوويا نەدكرن كا چ چاويرە، و وا چـاويراێ ب تشتەكی زێری، چ گوستيلك با، چ بازنگ بـا.. ببرِينـا، نەخواشـێ چـێ ببـا. دگـۆتن: هەڤـی دەست برِينێ. ل گوندێ كورزێلێ خودانده‌ست هەبوون، دگۆتن: كا مريشككێ ئەمێ ژ تە را ببرِن. ڤێجا چۆ زانين كو ديسكە؟ نەخوەش ل سەر زك درێژ دكرن و لنـگ ددان بەر هەڤ. هەگەر يەك ژ يەكێ درێژتـر بـا وێ گـاڤێ هەوە. نەخـوێش ل سـەر پشـتێ درێـژ دكـن و دۆلاقەكێ ل دۆر سەرێ نەخوێش دگەرينن و د بن چەنگـێ رە دبە پـاش سـێر و يەك ب لنگێن نەخوێش دگرە و يەك دۆلاقێ چەپ و راست دلەڤيـنە و ب دەربەكـێ رە ب شـوون دە دكشينە. (ئەب) وێ سالێ ناڤـا منـا زراڤ دێشـيا، گـۆتن ئەمينـی هەنـێ دكشـينێ. مە خەبەر شاند ژێ را، هات. وەلە مێرك گۆت: ڤاسـكك، هەلقينـك ئـاڤ بكەليـنن. مە كەلانـد، ئانی، گۆت: خوە شلف تەعز بكە و بەتانيكێ د خوە وەردە و تەختككی دينە سەر هەلقينـێ و ل سەر تێختك روونە، بلا وێ بۆخا گشت رابە ل كەركی قوونێ تە كەڤە و د بن بەتـانيێ دا ل پشتێ تە بەلا بە. مە وە كر و پاشێ ژی ئەز درێژ كرم، دەسمالكێ سەردەستا ئـانی ل

هەڤ مالت و يەك ل سەر بۆخازێ لنگێ مـن روونشـت و ئەمـين ژى ل بەر سـەرێ مـن دەسمال كر قرتكا من و ژ نشكاڤا كشاند و دو - سێ خرپـك ڤێخسـتن. جـارەك دن ژى، يەكى ئەز درێژ كرم و يەكى دن ژى لنگێ خوە ل پێ كرن بن چەنگـێن مـن. وى ژى ب بۆخازێ لنگێ من گرت و ئەز ڤەچەنگاندم و پاشێ ژى گۆت: سێ نەقـلان پشـتێ خـوە ل عەردێ خە. من وە كر. ل تاليێ ژى گۆت: دۆننـى پـر ل تەڤ روون و هونگـوڤ بـكە و ل سەر گرێدە. ب خودێ ژ خودێ بەرژێر، وان ئەز ئانيم سەر هەڤ. ئەز سێ مهـان د نـاڤ ج دا بووم.

**٤٣) ئێشا ڤلاڤان**

سە گوهێن يەكى دێشيان، كزابس بەرددانێ. يان ژى دو - سێ دلۆپێن زێتا زەيتوونـان چيچكى گەرم دكرن و دلۆپى هوندرێ گوه دكرن. هنەكان دو چلپـك ئاڤـا ترپـان دكرنـێ. هنەكان ژ بۆ گوهێشا زارۆكان دلۆپەك شيرێ ژنـان دكرنـێ. هنەكـان ژى دوويـێ جخـارێ هووفێ دكرنێ، يان ژى بن گوه ب دەرزيەكێ داخ دكرن.

**٤٤) ئێشا سابوونا كابا**

باميێ قەرت، وانێ بزر دانە دكەلاندن و چيچك ئـارد تەڤ لـێ دكرنـێ، هەڤـدو ددى و دگرتن سەر. ناكا ژى كۆكا كەمبەرێ هوور دكن و ب هەڤيرنـى رە ديـدنن سـەر تـوورەكى نەيلۆيى و ددن سەر.

**٤٥) ئێشا ئوست**

ژ باوەريێن گەليێرى ل چك: گەرەكە كو ژنەكێ كو جێوى هـانيبە، ژێ رە سـتوويێ وى مسدە،ێ رهەت ببە.

**٤٦) فەک ـ ژجچوون**

فەكا ژۆر وا ژێر ب هەوالدانا وەكى قولپايە، ژ هەڤ دفلتە. عەڤـدى هوسـكێ ل گونـدێ مسكێ، گولە دكر فەكا نەخوێش پاش دراناں، و يەك ژى دكـر بـن چەنگـێ، و ب دەسـتێ خوە ژى، دەستەك د بنێ جەنگێ دە، و يەك ل پاشيا سەرى ب گولە رە هار دكر داخـا كـو دلەقاند، ڤەدچەنگاند، گولە دكـر لـوپ! دەردكەت و فەك دكەتـن ج. رۆكـێ مچـێ بەكـۆ ژ گوندێ شيێ، فەك ژ هەڤ فلتيبوون. دە مچێ چ دخوار سە قاسـى فەك ڤەكـريە ژ هەڤـدو فلتينە. نيڤشەڤ هات جەم باڤكێ من. باڤكێ من گۆت: گولە گەرەكن و ل جەم مـن تـونە نە، هەر جەم ئەڤدى هوسكێ. رابوو گۆتن: ئەم نزانن. و باڤكێ مـن ڤـێ را چـوو. دەمـا كـو ڤەگەريا، من گۆت: باڤۆ، گولە چ نە؟ گۆت: دو گولان دكن دەڤـێ نەخـوێش و جـاركێ، دو

جاران دلەقينە وەك بەرێ دبە. گولە ژى دەركەت وەك گۆكێن بليارد‌ۆ نە.

٤٧) **فەرەنگى** (ئينگ: Syphilis)

ناڤێ نەخواشيەكێيە. ژنەك ژ گوندێ مەعملا د ناڤبەرا ساليێد چەلى و پێنجى دە پێ كەتبوو، هەركو عومرێ قچكێ خوە دبوو سالەك، دو سالى پێ دمر. ڤا نەخواشيێ ١٠ قچك ژنكێ برن. دگۆتن كو ئەو نەخواشيەك د خوينێ دەيە، و دگۆتن كو ژنكێ نەخواشى ژ مێرێ خوە ڤەگرتى.

٤٨) **فەتسين (نو بێهن كێشا چيكرى)**

ئەگەر مرۆڤەك بێهن لێ بچكيا يان د ئاڤێ دە بفەتسيا يان ژى ئێشا دل و فليچێ ل ئاليەكى وى بخستا، ب لەز چەك و جل و بەر و كنجێن وى ژێ دكرن و ل سەر پشتێ گێر دكرن و ب هەردو دەستان تم سينگ ددەوساندن ژ ئاليەكى ڤە، و ژ ئاليەكى دن ڤە دەڤێ خوە دخستن دەڤ و پۆزێ نەخوێش و ل پێ هەڤ رند پفێ دكرن، جارەكێ دودويان، و پشت رە سينگ ددەوساندن. هەر وها بەردەوام دكرن تا كو ئاڤا زك و سينگ دەركەڤە و بێهنا خوە ژ بنى نەچكە و نەمرە، و ژ ئاليەكى ڤە رادكرن توختر يان خەستەخانێ.

٤٩) **فتقێ قچكا**

ئەو دبرين، و ئار پێ ڤەدنان.

٥٠) **گەرگەرينە**

ئەڤ نەخوەشى ب تايبەت ب هەر دەرەك مرۆڤ دكەڤە، چ ئەندام دبە نە خەمە. ژ بەر كو تامارێن خوينێ دخەتمن و تێن گرتن و ئەو تەڤنێ ئەنداما مرۆڤ پووچ دبە و رەش و كوفكى دبە. ب تايبەت ئەو پر ب نەخوەشيا شێكر رە چێدبە. لێ مخابن دەرمان و چارە ئەوە كو ئەو ئەنداما لاشێ مرۆڤ وەرە ژێكرن و قوتكرن، چ لنگ بە، چ دەست بە، چ گورچك بەيە. لێ د هەياما بەرێ دە، پرانى قوت نەدكرن. ئەو دچوون باژارێ عەزازێ زێروو بەرددانێ. ئەو ژى كورمەكە خوينا تير و قرێژيا برينان پاقژ دكە. بنر نەخوەشيا رەش.

٥١) **گلێز هەركينا قچكان**

ئەگەر زارۆكەكى گلێز بهەركاندا، دچوون شەكالا خالكێ تينان و ژ نشكا ڤە يەك ل سەر ديڤ دخستن، راسوەستى.

٥٢) **هەب (ئا ل سەر گوڤدە)**

بەرێ هەب ل ڤيت و دەست و سەرچاڤێن گشتان هەبوون. هەڤير دستران، و ئاليەك

وێ دکرن زێتێ، و ئەو ئالیا دیدنان سەر هەبێ، ڤێ رە دەردبوو، و پاك دبوو. هنەك کۆکا تۆلکێ گایا (هیرۆ) دکوتن، و د ناڤ ئاڤێ دە مست ددن. ئۆپێ چەدکن، و وێ ئاڤێ تینن، چیچك ئارد پێ وەر دکن و ل سەر ئێر گەرم دکن، و وەك مەلهەمان ژێ چێدکن، و ددن سەر هەبان و پزکان. ئەو وان چێ دکە. هەبەیەك ل چاڤێ قچکەکی هات، پر مەزن بوو. بەعز بۆجکێ کەران دەرتێ، و سۆر دبە. چاڤێ لێوك `ین وە بوو. ژنکەکێ خوازیا خوە ل ئێخرین، بەری کو نێن بخوە، تێ دا و ب سەر دە داهات. ژنکێ گۆت کو نەخوەشێ ئەو هەبا لێ هاتی ژی پشتی رەهتبوونێ کانە وان هەبان ب خوە دەرمان بکە. ئەو دبە دەستێ وی. هەبەك دن پاشێ ل روویێ لێوك هات، ژنکێ گۆت کو هەڤ هەبا نێرە. گەرەکە مێرەك خوازیا خوە تێ بدە!

٥٣) **هەبا بولخور**

هەبەیەك سۆرە ل سەر روویێ مرۆڤان تێ دەر، و وەك قەیماقا زەر دگرە، و وەك تەنەیێن بولخور تێ دە چێدبن. رادهێژن پەنچەك بولخور و دجوون، دجوون، دکن هەڤیر و دیدنن سەر هەبێ و پێ ڤە دزەمرینن، رەهت دکە.

٥٤) **هەبا پێرۆز**

هەبا پێرۆز ل کەڤچکێ چاڤێن مرۆڤ تێدەر. مالباتەك ژ گوندێ شێێ هەیە ژێ رە دبێژن مالا خشرێ، دبێژن کو دەما یەکی ژ وان خوازیا خوە تێ بدا، چێ دبوو. ئیجا خەلکێ دچوو با وان خوازیا وان دکرن شیشەیەکی و تانین تێ ددان. یەکی گۆت: پێرۆز ل چاڤێ من هات. ئەز چووم مابەتا جەم کالکی. رابوو خوازیا خوە تێ دا. گۆ تێ هەرێ شیرنی وینێ، هیرۆیێ تێدا مستدێ، و تەناك ئارد تێوەردێ، و ب گەرم ژی ب سەر چاڤێ خوە دێ هەتا سبە دا، بلا وێ وەخمێ ژێ بکشینێ. گۆ من دا سەر. ب سبێ را، وەرم دینابوو. گۆ: بەرێ هەبا پێرۆز ل یەکی بهاتا، دبرن جەم سینکۆ، ل گوندێ ئۆمۆ،ێ تووکراییێ، چێ دبوو! دۆستکی سینکۆ ژی هەبوو ناڤ مەهمەد بوو. سنکۆ و مەهمەد ڤا تم مەسقەر ب هەڤ دکرن، وی دگۆ م د تە کرۆ، وی دگۆ م د تە فلتاندۆ! دە هەبك ژی ل کوونێ مەهمەد نەهات. ڤێ را گۆتن: هەرە جەم سینکۆ، بلا ژ تە را تووکییێ چێ ببە. وەلە ژ نەچار چوو جەم، و کوون ل پێشێ توومپەل کر. سینکۆ گۆ: من نە گۆ رۆکێ ئەزێ د تە کم! ئووسێ مابەتی (مالا ئووس کێلێ) خوازیا خوە تێ ددا، رەهت دبوو.

٥٥) **هەبا سالێ** (**لاتین**: Cutaneous leishmaniasis، ئینگ: Aleppo boil)

ل گوندێ ئەرەندێ سیر تێ ددان.

٥٦) **هەبا شەواتێ** (ئینگ: Herpes simplex)

ئێ پر، ل دۆر دێڤ دهات. دەستێ خوە ل گوندێ سێمالێ مەیدانا بوو. شەکرێ پۆلات دکوتا، دکوتا، و د ئێلەکێ رە دەرباس دکر و دکر ئێچێ ئێمزك، ب ئێمزکێ پوفێ دکر، دچوو ل سەر دنیشت، سێ - چار رۆژا داژۆت رهەت دبوو.

٥٧) **هەبا خوارنێ**

ژ شێرپەنچەیانە. دۆر خوە دخوە، لۆما ناڤ وە دینانە. دشەوتاندن.

٥٨) **هەسنکێمبوون، خوینزە`ئیفبوون، خوینکێمی**

ئێ کو هەسن د خوینا وی دە کێم دبوو، کەڤرێ هەورە دخوار. گۆ: چێچکۆیێ قێنتێر ئارتاق مەزن بووبوو، کێردووسکەك خوە هەبوو، تەێ بدیا تمی ل بەر زنارەکی هەورە سەکنیە و رێش دکە و دخوە. و نەخوەشێ کو خوینا خوە کێم دبە، دگۆتن کو کەزەبێ بخوە و بەختەنیزێ و گۆشتێ سۆر. زارۆکێ کو ب نەخواشیا کێمخوینیێ دکەت، بەنزێ وی زەر دبوو و زك دوەرمی و کاب لێ سست دبوون، ئاخ دخوار (ئاخ خوارن) چێ دبوو. هنەك ژن هەنە چاخا کو هەسنێ وان کێم ببە و خوینا وان زەعیف ببە، ئلەمێ چاخا کو ب هال دبن، کیلێ دخون. ئیلاجا ب رەنگان ژی هەیە، ئەو ژی نەخوەشێ خوین - زەعیف دڤێ رەنگێ سۆر ل خوە بکن. ویێ نەخەوشێن خوینێێن دن ڤێ رە هەبن، دڤێ رەنگێن هشین و ئەزمانی و مۆرشیرکی ل خوە بکن.

٥٩) **هێلک وەرمین**

ب دەرزیان دکوتان. چار - پێنج دەرزی دکرن گورز و پێ جیێ کو وەرمیە دکوتان.

٦٠) **هوما، هومیا** (ئینگ: Hyperthermia)

مرۆڤێ کو سەرێ وی دێشە، جارنان نزانە کو ژ بۆ چیە! ئیجار سەرێشیەك هەیە ژ شەوبلێخستنێ دێشە، ئانکو گەرمێ لێ خستیە، ژێ رە دبێژن: هومیا. ژ تشتێ کو وەك دەرمان ژ ڤێ نەخوەشیێ رە دکرن، ئا هەری پر ئاڤ لێ دکرن، دگۆتن: ژ بەر کو ژ گەرمێ وها بوویە گەرەکە تم خوە د ئاڤێ کە، و ئاڤا هێنك و سار ل خوە بکە، هەتا کو ئەو گەرما کو لێ خستیە بتەبتە. هەروها هەتا کو چێدبوو ژی خوارنا تۆق وەك شیر، ماست، پەنێر، روون، گۆشت ب تەڤایی نەددانیێ. هەولددان کو خوارنا نەخوێش سڤك بە. هەتا مهەکێ دودیا پارز دبوو و ئاڤ ل خوە دکر و نەدچوو بەر گەرمێ کو چێ ببا.

٦١) **ئسکینگ**

ئشکینگا یەکی ب سەر هەڤ دە هلدە و رهەت نەبە، وی دترسینن و ڤەدجنقینن،

رادوەستە. باوەر دكن كو كەسەك ب چێرا مـرۆڤ دبە، لۆمـا ئسـكینگا خـوە هلتـێ. دا كـو ئسكینگ بسەكنە، دڤێ كو ناڤێ ب چێرێ دبێیە هلـدە و بێـژە: مـا ئەجەب فلانكەسـا ب چێرێ من دبە؟ ما فلان بە؟ لێ فلان بە؟ و هیجا ناڤان دده پێ هەڤ، و دەمـا ئسـكینگێن وی راوەستە دبێژن كو ئەڤ كەس چێرا تە دكر. هنەك ژی هەفت گولم ئـاڤ ددن مـرۆڤ، پێ رهەت دبە. ژ بەر كو هەژمارا هەفت ژی پر پیرۆزە ل با كوردان ب تایبەت.

٦٢) **ئسقیتی بوون، كێمبوونا شیرێ ژنان** (ئینگ: Hypogalactorrhea)

ژنا كو زارۆكێ خوە دبوو و شیرێ خوە كێم با سە، دا كو شیر پێ وەرە، روونێ مالان و دمسێ رەزان دكرن پەلوول (ژێ رە دبێژن عەسیدە ژی)، و هەتا چەل رۆژی دخوار. دبێژن كو هەم شیرێ خوە پر دبوو، و هەم ژی گەمارا زكێ وێ پێ پاك دبـوو. هـن جـاران زارۆك دبرن ددان ژنەكە دن كو نوو زارۆك ئانیە، و بێ خوە رە دمێژاند. ئەو دبوون برایێن هەڤـێن شیر. لێ ئەگەر شیر تونە با، ژ بەر شیر ڤە یانەسـوون و ئاڤا شـێكر ژی، دا كـو بەر بگـرە، ددان زارۆك. ئەو ژنا شیركێم وها دكر، لێ ژنـا شـیرجە نە خەم بـوو، ژ بلـی شـیرێ خـوە تشتەك نەددایێ. (مچ) هنەكان بەخنیەك مۆریكێن هشین دكرن ستوویێ خـوە دا كـو شـیر زێدە ببە. هنەكان ژی كەڤرێ شیر (مۆركا شیر) دكر ستوویێ خوە. رەنگێ خوە سـپی بـوو، وەك پالووتان بوو. دا كو شیر ب ژنا ب شـیر وەرە، ئەو كەڤـرا دكـر سـتوویێ خـوە. هـنەك دچوون بەر زیارەتا چێل ـ خانێا ئێزیتان ل هافا گوندێ قیبارێ. ل ور شكەفتەك هەیە، ئاڤ ژ بانیێ وێ دادرڤە. هەر پێنج دەقەیانێ ببێ چپ! دلـۆپەكێ ژێ بكەڤـێ عەردێ. وا ئاڤـا د چچكێن خوە ددان، دگۆتن كو شیرێ من رند بوو.

٦٣) **ئیلانجق**

ئـیلان ب تركـی مـارە. وەك موویـان د بەر نەینووكـان رە دەردهـات، و گۆشـتێ بـن نەینووكێ هشین دبـوو. بەلكـم نەخوەشـیەك شـێرپەنچەیی بـوو. دەسـتێ خـوە ل گونـدێ شنگێلێ بوو. دارەك دهانی، نزانم چ دار بوو، دكر كۆمر و دكوتا و دیـدنا سـەر نەخوەشـیێ، نەخواشی ژێ دكشاند. ب سەر دە ئەو نەینووكا خوار دبوو. دیـا مـن گـۆت: دەمـا ئەز قیـز بووم، ژنك ل گوندێ مە، خازیانا، هەبا ئیلانجقێ ل دەستا هاتبوو، كەڤا دێست قـول بووبـوو ـ خودێ زانێ وەك مێخی گۆشت بوویە ـ گۆتن، هەرن شیێ جەم دێیا سـەولیا پـێكەت، ل جەم وێ مۆهركێ هەسپا هەیە. مۆهركك چووچك و هشین بوویە، دكـر وێ قـولا كـو ل كەڤا دێست هاتبوو و هێدی هێدی ب چێبوونێ را مۆهرك ب سەر دكەت، كەنگی مـۆهرك دەركەت قول دخەتمە و چێدبە. ئێهكوورێ دەدۆ ژی تێ بیرا مـن مەلهەمـك ژ وا هەبـێ را

چێدكر، ناڤێ وێ مەلهەمێ ژى هەواجين بوويە. هەواجين ژى ژ چ چێ دكرن نزانم!

٦٤) **ژجدەركەتنا سێڤكێ** (ئينگ: Hip dislocation)

دايبكێن مە بەرى كو عەرەبانەيێن قچكان دەركەڤن ئەم ل پشتا خوە دكرن، و شالەك د ناڤ لنگێن مە رە دەرباسدكرن و ل پشتا خوە دشداندن، ئانكو شەقێن مە ژ هەڤ دبوون. دەركەت ئەڤ ژى رێگرتنەك ل بەر ژجدەركەتنا سێڤكێ رەيە.

٦٥) **ژڤاوا تێكەتن، لمێزا نەبوون** (ئينگ: Impotence)

دەرمانێ قاواتێ ئانيێ پشتێيا ژێ راكرنا „مێرك"، بەهيڤێن هشك هنەكى دكن ئاڤێ كو پچەكى نەرم ببن و هەروها ژى ئيچێ گووزێن هشك ڤێ رە تەڤ ل هونگوڤێ خاشێلێ، سبە ب سبە بخوە، و ب سەر دە ژى روونێ مالايێ بەهتى و قەيماقێ ماستێ چێلان و ب سەر دە ژى مريشكێن براژتى، و بێهتر ژ مريشكێ سينگێ وێيە. و دبێژن گەرەكە كو مێر ل سەر ئيسفنجێ خەو نەكە، ژ بەر كو باندۆرێ ل پشتا وى دكە، و هەستيێ مرۆڤ دشەكلينە (لێ دشەلپينە؟). باڤێ من گۆ:

هەفت هەژير هشك و هەر يەكێ سەريك سير تێخە ناڤ / تەڤلێ بكە زەركك زيتى مالا و يەك ژى ئاڤ / تێكە تەوكێ سەر ئێر هەتا ژێ دەرە تشتێ خاڤ / تێخ قەتەرميزكى رۆوێ كەڤچيكى بگين هناڤ / زك تێر دبە / سينگ ڤەدبە / دل شا دبە / كير رادبە!

ئەڤ راچێتەيا گەلێرى ژ بۆ كەسێن ئێلپكى باشە، تامارێن دل ڤەدكە، نەفەسا ئينسێن رند دكە، بەر مەرا دگرە وا گرينگ ل مەرا رادكە! گۆ: رۆكێ يەكى ژ گوندێ مە شيێ زەوجى. شەڤا گێردەكێ چوو كەت پاش پەردێ، جەم بووكێ. هەتا وەختكێ شەڤێ نكانى بزەوجيا! پاشێ پيركێ جيرانا وان گۆت هەرن ئاڤك سار ل پشتێ كنێ لێ رابە. دە هەوالدانا گۆ: پشتى گ ئاڤا سار ل پشتێ كرن هەما مێركێ مێرك گۆ: لوپ! رابوو. گۆتن: پيرێ هەو ئاڤا سار چ دكە؟ پيرێ گۆت: تامارێ خوە كوتفينە هەڤ، وەختێ ئاڤ گيشتێ ڤەدزقتن و ژ هەڤ ڤەدبن. گۆ: باڤكى پشتى هەفتاكێ ژ داوەتا لاوێ خوە ژێ پرسى: ياورم، ئيشێ تە چۆيە؟ لێوك گۆت: باڤۆ، ئيشێ من پر رندە، لێ قاسى مەكنە تم ب زكێ من ڤا شدييە. رابوو باڤكێ چوو ژێ را نەچكك ئانى و ڤێ را گۆت: ياورم، بگر، تويێ د ئۆرتا زكێ خوە و وى كێ. دە پشتى مەهەكێ، دوديا، لێوك نەچك ئانى ژ باڤكێ خوە را و گۆت: باڤۆ بگر. ئيشێ من مەشى. دە باڤك مەرى مەزنە و پر ئيش ڤێ را دەرباسبوونە، ڤێ را گۆت: ياورم بلا ل جەم تە بێ، تويێ چەند سالى دن ژ بن ڤا تێكيێ.

٦٦) **ژ شير ڤەنەبوون (ڤوتكرنا زارۆكان ژ شيرێ دايبكان)**

گاڤا کو زارۆکەك تەمەنێ وی ب سەر دو سالیێ بکەتا و هین ژ شـیر ڤەنەببوویـا، ژنـان دچوون دو سەری ژ عەنجوورێ کەران تینان، ئاڤا د هوندر وێ دە ل گەل سیسـکان پـر و پر تالە، هەما چیچـك ئـاڤ ژ وێ ل سـەر مەمکـێن خـوە دکـرن و چچکـێن خـوە ب لەز دخستن دەڤێ زار، و گاڤا زار دەڤێ خوە دخستێ پر پۆشـمان دمـا و بـڤە دبـوو ژێ رە. دو جاران، سێ جاران زارۆك ژ شیر قوت دکرن. هن ژنان ئێسۆت د سەرێ مەمکێن خوە، ئـان ژی د سەرێ ئێمزك ددان. هنەکان ژی گێرەیەك دکرن ئێمزك، دەما زارۆك ئەو دمێت گێـرە تێ دە دلڤیا و زارۆك دترسیا و ئێمزك داڤێت!

٦٧) **کەلپک** (ئینگ: Dandruff)

ژنان بەرێ سەرێ خوە ب کیلێ دشوشتن، دگۆتن کو کەلبك ژێ دەرێ.

٦٨) **کەربوون**

هنەك وێ ب سەرچەیان دەرمان دکن. سـەرچەیەکێ ژ بـن سـیڤلەکێن مـالان دگـرن، تینن چەند پەرێن دۆر قوونێ ژێدکن و قوونێ تـازی دکـن، و دکـن نـاڤ لەپـێ خـوە دە، قەدەرێ کو نەرەڤە، و ب خواشی ب قاسی روب ساەتەکێ قوونـا وێ دیـدنن سـەر گـوهێ نەخوێش. سەکەێ باسکا ل خوە خە، و د ناڤ لەپێ مەرا دەێ بـوەرمێ، بـوەرمێ، و.. پـت! ئێ بمرێ. دبێژن کو ئەو بێ و گەمارێ ژ گوهێ نەخـوێش دکشـینە و پێـرە پێـرە سـەرچە دوەرمە.

٦٩) **کەتنا هەستیێ چاڤان، شیلاق، شەلمووت گرتن**

دەما کو چاڤێ کەسەکی کول ببە و بشەلقە (چاڤ شـەلمووت دگـرە و شـلۆقی دبە)، و بێشە و خەرێڤ بگرە، دبێژن کو هەستی چەڤا کەتی. د شـکەتێ دیڤـێ زۆر دە، ب قاسـی نۆکەکێ هەستیەك دادکەڤێ. نەخوێش دبن سەر یەکی خودان تەجرووبە، ئەو ژی تلیا خوەا بەرانێ کوور دکە هوندر دەڤێ وی دە و ئەزمانێ دەڤێ وی ژ پاشیێ ڤە ب سەرێ تلیا خوە زۆر دگوڤشە، و ب سەر دە چـاڤ رەهەت دبە و کولبـوون ژێ ڤەدبە. هنەکـان ب دووڤکـێ کەڤچیێ هەستی هلتینان. هەتا نها ئەڤ کریارا تێ کرن. مەحمەد مێرزۆ، ب خوە ژ باژارۆکـا تلعەرانێ بوو، ل گوندێ بێنێ روودنشت.ێ کو هەستیێ چاڤا دکەت، ژێ رە عەزمانێ دێـڤ هلددا. باڤێ من و داپیرا من ژێێ مە وە دکرن. ئەگەر زارۆکەك سبێ نیڤرۆ و ئێڤارێ چاڤێن وی ب هەڤ ڤە بزەلقینا و شەلمووت بگرتانا و قەباخێن زێر و زۆر ژ هەڤ نەبانا، دگۆتن کو هەستی چاڤا کەتی، کا ئەم بینن جهـ دەستێ خوە دکرن دەڤێ قچك. د بـن فەکـێ زۆر دە دو هەستی بلۆت بوونە یان تمبل بوونە، ئەو د ج دە ددەوساندن کو تێکەڤن جهێ خـوە، و

چاڤێن زارۆك چێ دبوون. سە یەکی ب دەستێ قچکا بگرتا و راکرا، دگۆتن: وە مەکە، هەستی چەعڤاێ بکەڤێ!

### ٧٠) کەڤر و قرشێ چاڤان

چاخا کو کەڤرێن هوور ئان خیزك دکەڤن کۆرتکێ چاڤان دە، ب لەقینا چاڤان رە ئەو خیز ل گۆگا چاڤی دکەڤە و وێ دێشینە. بۆ چارەکرنا ڤا یەکێ ژنن تایبەت هەنە ڤان چاڤان دالێسن. ئەو ژن زمانێ خوە درێژ و سەرتووژك دکە، و دکە ناڤبەرا گۆگ و کۆرتکا چاڤی دە، و زمانێ خوە تێ رە دگەرینە، و چ خیز و کەڤر هەنە ب بەر دخینە و ئەو وان ب سەرێ زمانێ خوە دەردێخینە. دبێژن: ژنکێ چەعڤێ من ئالاست. ئەو ژنێن چاڤ ئالێس ل بازارا عێفرین ژی هەتا دوهووپێر روودنشتن، چاڤێن خەلکێ ب پەرا دالێستن. گۆ: ژ مێژ ژنك کریف ل گوندێ خلالکا هەبوو، ناڤ مێرەمێ عەڤدك بوو، قرش ب زمانێ خوە دەردخستن. ژنك دن ژ گوند ژێ عەلمی. رۆکێ ئێکێ قرش ژ چاڤێ یەکی دەرخە، خوە ب سەر نەخوێش دا خوار کر، رابوو نەخوێش هەو ماچ کر. ب سەر وێ دا وێ کار بەردا. یەکی ژ خلالکا گۆ: رۆکێ یەك ژ گوندێ مەمالا هات مالا مە. وەختینە ملیس بوو. عەڤدکێ سمعەل بوو ناڤ. گۆ: چەعڤێ من ڤا سالکە دێشە، ئەز لێ هەیری مە، من تو توختر نێهێشتن و رهەت نەبوو. دبێن ژنك ل گوندی وە هەیە ب چەعڤا زانێ. باڤکێ من ب من را گۆ: هەر بان مێرەمێ کە‌ە چووم پێ، هات. هات نەخوەش درێژ کر، و ل چەعڤا نری، و گۆ: چەعڤی تە تشتکی د گولیلەکێ دایە. د ئێچ دایە و نە د قەباقێ دایە. گۆ د بن قەباقێ دا با، منێ ب زمانی خوە دەرخستا، لێ هەڤ کوور د گولیلەکێ دایە، و سەر ژی گۆشت گرتی. ژ مێژ کەتیێ. لۆما ئەز قارمیشێ نابم. گۆ: خواکا من، ژ من را دەرخە، کوور دبێ، چۆ دبێ، بلا ببێ. ئە نکێم خەو کم ژ دەس ئێشێ. ڤر دا وێ دا، باڤکێ من گۆ: چێك، زرار تنەیە. خالتیکا مێرەم ب من را گۆ: هەر پەلك هەژیرێ و سابوونکێ و ئاڤنێ وینە. من چوو پەلك ژ دارێ ژێکر هانی. وا پەلا ل چەعڤ هێشت، هێشت!! گۆ دەرکەت. ئستری کەڤن، بن ژی کول دبێ. گ سەر ئاچق بوو، پوولت! دەردکەڤێ. دمسن ژی بەردا چەعڤ، و گۆ: چێترە تو ل ڤر خەو عکی، ئەزێ دان ب دان وەرم تە ساخ کم، و دمس ژ تە را تێکمێ. تێ سبا هەرێ مالا خوە. ب شەڤ دیسا هات چەعڤ سەکر و دمس کرێ. رۆیا دن چەعڤ ساخ بوو، چوو مال. تو توختر نەهێشتن. وێ داخێ پێنج وەراق دانێ. پێنج وەراق کۆشك پەرە بوو. هەتا ناکا پیرەك ژ گوندێ مەروانیێ، بازار ب بازار تێ گوندێ شێێ و قرشا، یان کەڤرا ژ چاڤێ خەلکێ دەردخە، ڤێ رە دبێژن پیرێ قرشا. ئەو ژ توخترەکی بناڤترە، ناڤ

هەلیمەیە. پیرێ قرشا پرن، وەك توختورا. ل رەجۆ ژی هەبوو و ل عێفرین ژی هەبوو! عێفرین ناڤێ وێ زێنا هەم قورشینێ بوو. پیرا رەجۆ من جارەکێ باڤێ خوە بر جەم. ئەو قەباقان دقولبینە و ب پاچەکی قرش رادکە.یا مەروانییێ هەلیمە، ئەو زمانێ خوە د بن قەباقێ رە دگەرینە و زمانێ خوە ب بەر دخە و دەردخە، و دبێژە: هەرن دلۆپەك چایا سار تێکنێ. باڤێ من دبێژە کو نیڤێ پەرەیێن کو هەلیمێ گاندنە هەڤ، ئێ منن. پیرەك مە ژی هەیە، دو - سێ جاران ژ من رە ئاڤا پاتەتێ کرێ و رهەت کر.

۷۱) **کەڤرێ گورچکان** (ئینگ: Nephrolith)

کەسێ کو د گورچکان دە کەڤر، قووم چێ دبە، دەوشیا دێو و زێت و لێموونێ ل ئێخرین ڤەدخوە، و ب سەر دە ئاڤا تریان و مەختەنیسێ ژی ڤەدخوە و باشترە کو ئاڤا کو ئەو ڤەدخوە بکەلینە پاشێ ڤەخوە، رهەت دبە. هنەك ژی کۆکا عەنابێ تینان و دکەلاندن و ئاڤا وێ ڤەدخوارن، پێ رهەت دبوو. دگۆتن کو ڤەخوارنا ئاڤا بیرا ژی باشە ژ قووم و کەڤران رە. هنەك باوەر دکن، کو کەرگەزك دەرمانێ وێیە. وێ دکەلینن، و ئاڤا وێ هلتینن و دپارزینن و ڤەدخون. هنەك ژی قالکێ کۆکا دارا مازیێ و پالووتێ دکەلین و ڤەدخون.

۷۲) **کەڤرگەسک** (ئینگ: Calcaneal spur)

د پانییێ دە هن جاران کولبوون چێدبە، ژێ رە دبێژن نەخوەش کەڤرگەسکی بوویە. وەك چۆ پێ ل کەڤرەکی کربە، و ژ بەر وێ کول بووبە ها. ئەڤ کولبوونا دبە وەك متەکێ ب هەستییێ پانییێ ڤە ژ هوندر ڤە. ڤێجا نەخوەش نەویرە ژ بەر ئێشێ بمەشە. پەلۆکێ شیر دیدنان سەر، دو - سێ جارا دگەورین. گەر نەرم بوو، ب شەفرێ وا گۆشتێ هشك دبرین، دبرین، نەرم دکرن. وا چاخێ شووژن ل سەر ئێر سۆر بکرانا و هوت پانییێ کرانا، و نێمێ ژێ دەرکەتا.

۷۳) **کێچ**

بەرێ دەما کو کێچ دکەتن مەریا، ب سۆدێ و قازیخێ (قایزاق) رشکین دکرن. لێ دیا من دبێژە: راست،ێ تێکەتا سێر ب قازیخێ و سۆدێ کێچ دکوژتن، لێ ئەو ژ کۆکێ دا رانەدبوون، هەتا ڤێ دەرمانێ نوو دەرکەت. (مچ) شێخ رەشیتێ گوندێ بەعدینا ئسترانەك خوە هەبوو، دگۆت:

کێچێ، تو کێچا هاڤینێ.. / کێچ هلپەکی بەر دێخوینێ.. / کێچ چ قاس مەرا دخورینێ!

گۆتنەك پێشیێن مە ل چك هەیە، دبێژێ: ب چێرێ کێچا ببە، کوچەر (لێ کووچك؟) خوە دخورینن.

**٧٤) كێلبوون**

ئەگەر مرۆڤەك كێل با و سەرووت با، سیر دجەلقاندن تەڤ زێتن زەیتوونا دکرن و ل سەر ئەیارێ سێر دکرن، رۆژێ دو جاران. و هنەکان ژی کەرگەزك تینان و دگوڤشاندن و ئاڤا وێ ل پۆر دکرن تا ژ نوو ڤە شین ببا و ب سەر خوە بهاتا. (ئۆەھ) هنەك پۆرێ سەرێ خوە ب زێتا زەیتوونان و لێموونان ڤە دشۆن ژ بۆ کو پۆرێ وان خەرا نەبە.

**٧٥) کێلك**

زارۆکێ کو نوو دبە، هنەك هەنە وەك عەیاران ژ سێر رادبوو. ئەو هەفتە ب هەفتە زێت دکرن هەتا کو چێ دبوو.

**٧٦) کێلیا ناڤ بژانگان**

ئەڤ وەکی تەنەیێن برنجێ و هین بچووکترن. د ناڤ بژانگان دە تێن دەر. ئەو زێتا مالان تێ ددان، و هنکان ژی ب زلێ سبرگێ دەردکرن.

**٧٧) کنج هاتن**

ژنا کو کنجێن خوە مەھ ب مەھ وەك گەرەك نەتێ و ژ هەڤ برەڤە، دبێژن کو گەرەك یانسوونێ هەفتەیەکێ ل ئێخرین ڤەخوە بەری کو کنج بێن، و ب سەر وێ یەکێ دە ژی دبێژن کو بلا ئاڤا پیبازا بکەلینە و پاشێ سار بکە و ڤەخوە.

**٧٨) کرێج کێمبوون، کلس کێمبوون، نەخوەشیا هەستیا**

دەما کو یەك کرێجا جێن کێم ببا، لنگێ بەرخان ئان کەهران تینان و دکەلاندن هەتا کو ریند دکەلیان، پاشێ تەڤ هێستیا هوور هووری دکرن و ددانێ.

**٧٩) کولبوونا برینا**

باڤێ من دگۆت کو پرێ جاران مە چلۆیێ دارا بەنیشتۆکێ دیدنا سەر دەڤێ برینێ، پشتی کو مە رند دکوتا و زەلقۆکی دبوو، ئەو رهەت دکر.

**٨٠) کولبوونا بۆرێێد سینگ**

بابۆنێج ل سەر ئێر رند دکەلاندن، سەر دگرتن، و چارشەفەك دگرتن سەر سەرێ نەخوێش، و دەڤێ خوە د سەر قاسکا کو ئاڤا بابۆنێجێ تێ دە کەلیە رە دگرت، و وێ ئاڤا دکشاند و گەمار چەدکر، سینگ ڤێ رە پاك دبوو.

**٨١) کولبوونا چاڤان، چاڤ کولبوون و تەراخۆما**

ئێ پر وەختا هەژیرا چاڤ کول دبوون. موومکنە کو سەدەم شیرکی هەژیرێ بوو، ب دەستێ قچکا دبوو و دکرن چاڤێن خوە. گۆ: ژ عەتارا دەرمانی سۆرك دکرین، ب هلینکێ، و

دکـرن قوتیـك موتیكـان. چاخـا دەرمـان ئێكـێ د چەڤـا كرانـا، دهـانین دهەلانـدن و ب كەڤچیكێ بەردان چێعف. دەرمان ب سەر رووچكا دا دهەركی و ژێ نەدچوو. وا دەرمـانی چاڤ دكەیاندن، و پر دشەوتاند. دگۆتن: هەر گ بشـەوتە، چێتـرە! ئەو نیشـانا چێبـوونێیە! هنەكان شافیە دهانین. شەكرێ پۆلات، تەڤ ل بۆیـاخەكە، ئـا كـو پـێ رەزان بـۆیە دكـن، رەنگ ئاراڤی دكن، و هەردویان دكوتن، هوور دكن، دكن تۆز، و دكن چاڤێ كـول. پـێ رە ب سەر رووچكان دە دهەركی. د سالد پێنجی دە پر وە دكرن. ملە تووتا ژی دكـرن چـاڤێ كول. ئەو ل بازارا دكرین. بۆ تەراخۆمێ ژی چلۆیێ دارا هەژێرێ دهـانین و دقەتانـدن، وەك شیرك ژێ دهات، و قەباقا چاڤا لێ دقولباندن و پێ رێش دكرن. نەخواشیا تەراخۆمـا، چـاڤ سۆر دبوون و شەلمووت دگرتن و قەباق ب هەڤ ڤە دزەلقین. ئەو ب چایا سار پاك دكـرن. هنكان تەن ژی تێ ددان، شیركێ هەژیرێ دێشاند و دخورانـد ژی. هنـان چیچـك زەلقـێ مریشكا د تەنیێ ددان و ل سەر قەباقان دهێشتن. رۆژەكـێ، دووڤـمەقەس هـاتن هونـدرێ مە، دیا من گۆت كو مە یەك بگرتا و دووڤێ وێ د چاڤێن خوە بدا! من گۆت: چما؟ گـۆت: دووڤێ دوومەقەسكێ تێ بدە، چاڤێ مەرا كول نابن.

**٨٢) كولبوونا چاڤێن ڤچكێ نووبوویی**

بۆ پاككرنا چاڤێن زارۆكێ نووبـوویی و پاراسـتنا وان ژ كولبـوونێ، لێمـوون دگوڤاشـتن چاڤان و دكەواندن. فاتا شێخ، پتا من ژ گوندێ خلالكا، لێموون گوڤاشـت چاڤێـد خویشـكا من چاخا كو نوو بوویە، ئەو بالمیش بوو قاسـی داگـری! دەمـا بـووینێ، پـر سـەدەم هەنە دهێلن كو چاڤێن زارۆك كول ببن، وەك كولبوونا قەبـاخێن چاڤـان ژ هونـدر ڤە، لێـا هەری مەترسیدار ئەوە كو داییكـا كـو ب نەخواشـیا فەرەنگـێ كەتـبە. چـاڤێن زارۆكـا وێ چاخـا بووندنێ كول دبن، و ب سەر دە كوور ژی دبن. هن داییكان شیرێ خوە دگوڤاشت چاڤێن ڤچكێ خوە، رەهەت دبوو.

**٨٣) كولبوونا دێڤ**

گاڤا دەڤێ كەسەكی كول دبوو، چیچك دمسـێ هەنـاران تێـوەرددان، یـان ژی تـوویێن رەشكیێن ترش ـ ترشی دخوارن، و هنكا ژی سیراڤك تێـوەرددان، رەهەت دبـوو. و گەر دۆر دێڤ با، دیسا دمسێ هەنارێ تێددان. ڤەخوارنا دمسێ هەناران ژی كولبوونێ دهەلینە.

**٨٤) كولبوونا لێڤا** (ئینگ: Aphthous stomatitis)

هن جاران لێڤ ژ هونـدر ڤە كـول دبە و وەك دەقـێن سـپی لـێ تـێن دەر. پەلچمـێن زەیتوونان لێ دهێلن، چێدبە. ل گوندێ ئەرەنـدێ، هەبەك زەیتـوون، كـو هـین كەرك، گەز

دكرن و زريچكا وێ د دەڤێ خوە وەر ددان.

٨٥) **كولبوونا مالكا ڤچك** (ئينگ: Uretritis)

قالقێ كەلەما سنديگانێ و چيچك كەربۆنات دكوتن، و چەدكن دەڤێ خوە. هنەك دبێژن كو وێ رند دكەلينن و سێ رۆوان ڤەدخون، كولبوون دەرە.

٨٦) **كولبوونا مەعدە، ڤەرها** (ئينگ: Peptic ulcer)

كوليكێن گێن دكەلينن و وەك چاى ڤەدخـون. هـنەك ژى دبێـژن كـو گـێن دەرمـانێ نەخواشيێن كۆلۆنە ژى.

٨٧) **كولبوونا پەلەكێ**

ژنا كو پەلەكا وێ كول دبـوو، چلـۆيێ قسـانان (كەوزان)ێ قەرت تينـان و دكەلانـدن، دكرن تەشتێ و نەخوەش د ناڤ وێ ئاڤێ دە روودنشت.

٨٨) **كون(ە)ميزێ، بخوەداميزكرن**

نەخوەشيا ميزلەزكرنێ ل بـا زارۆكـانە. ب نەخواشـێ وێ رە دبێـژن كـونەميزى. بەرێ، ئەگەر زارۆكەكـى ب خـوە دە ميزبكرايـا - چ ب رۆژ، چ ب شـەڤێ د خەو دە بـا - و كونميزى ببوويا، دچوون پێرشانێ دەوێر ژێ رە تينان و دبراژتن و دقەوراندن و رۆژ ب رۆژ ددان زارۆك تا كو چێببوويا. گۆ: ل گوندێ بەرادێ قچككى يەكى هەبـوو، شـەڤ ب شـەڤ ب خوە دا ميز دكر، دۆشەك شل دكـر. چـوون جەم شـێخكى. شـێخ گـۆ هەرن مريشـكك رەشى قيل ژ من را وينن. ب نـاڤ گونـد كەتـن، مريشـكك گـرتن هـانين ژێ را. مريشـك سەرژێبوو، شـێخ خـوار، و ل خـوە هەلال كـر و گـۆ: ناكـا ئەز كـانم هجێبكـێ ژ لێـوك را يازميشكم. و يازميشكر، و گۆ هەرن، لاوكێ وە چێ بوو. رۆيا دن، ب سبێ ژ خەو رابـوون، دين گ لێوك بن خوە پيسكرى! و چ خەبەرا زانن، گى د بن فووتێ شێخ را دەرباس كرن.

٨٩) **كونێر (لاتين:** Abscessus)

رۆبارى ژێ رە دبێژن كينۆر. پەلۆكێ شير ديدنان سـەر، دا كـو بـگەرە و نـێم وەرە ژۆر. پاشێ كينۆر دەردكرن و قولدكرن، نێم ژێ دهەركە، رەهەت دبە. گيايەكە، ل گوندێ مەمـالا ژێ رە دبێژن هيرۆت، و ل بلبلـێ ژێ رە دبێـژن گـاورۆك، پەلـێ خـوە وەك كونـدرا نە، و كوليلكێن خوە ئاراڤى نە، د ئۆرتێ دە زەرە. پر ل سەر زبل هشين تێ. كو رادبـێ بـانى، پـر بلند دبێ. هەو دهانين، و سابوونا شلنەكرى رێش دكرن، و ئارد، و شـەب هـوور دكـرن، و دمسنێ رەزان، گشـت ب هەڤ رە د نـاڤ شـير دە دكوتـان، دهەلـى، و دبـوو پەلـوول. وا پەلوولێ ديدنن سەر كونێرا و پاچەكى لێ دپێچن، سـبێ هەتـا ب ئيڤـارێ. قـۆرەك دن ژى

دیدنن سەر. هەر پەلوولەك ژ گەیا و ئارد و تشتێن دن چێدکرن و ددان سەر کونێران یـان سەر زك یان کابا ناڤێ وێ „ریێت“یە. پتا من چیچەکێ هیرۆیێ ب چلۆ ڤە دکوتـا و ئـارد و ئاڤ تەڤێ دکر و دکەلاند، تیر دبوو، ل سەر پاچەکی رێدخست هنەکی سار دبوو، ددا سەر کونێرێ و گرێددا. هنەکان ئاردکێ عەنابان ددان سەر. کـونێرەك مەزن هەیە، ژێ رە دبێـژن „سووسـارك”. سووسـارك ب خـوە ژی چڤـیکەك مەزنە تـێ مرشـیکان دخـوە. دچـوون سووسارکەك دکوشتن و تینان ب وی تۆنی تەڤ پەران، عوور و سێری دهەجقاندن و ددان سەر وا کونێرێ، رهەت دبوو.

### ۹۰) کونێرا بەرپێچیان

د بن نەینووکان دە دەرتـێ، وێ پـر سـە قونـدرێ خـوە تەنـگ بـن وە دبـن. ئەڤ ب بەنیشتێ مەرخان چێ دبە. (مچ) هنەك ژی وێ دقەلێشن و دەردکن، پاشێ دەرمانی سۆرك تێ ددن.

### ۹۱) کونێرا هەفت تاقی

ژ کونێرا کـوور رە کـو ل کـودەرێ بهاتـا وە دبیـژن. هەگەر ئەو ل بـن چەنگـێ بهاتـا، بەنیشتێ مەرخێ دیدنان سەر چێ دبوو. هنکان ژی قوت دکرن. ئەو نەخوەشـیا، دەمـا کـو دەربیا، ئەو کونێرا گشت ئاڤ ژێ دچوو. ل بەر پیێ باژارۆکا رەجۆ، ژ کونێرا کوور رە دبێـژن کونێرا چێلتاقی. ئەو ل پر جیا تێ دەر، لێا هەری زێدە د پانیێ دە. تژی نێم دبە.

### ۹۲) کورم

قچکا بەرێ، بەنیشت پر تنە بوو، ژ بەر ڤە گەنم دجووتن. مسـتەك گەنـم دکـرن دەڤـێ خوە دە و دجووتن، دجووتن، دکرن بەنیشت. ڤێ رە دگـۆتن: وە مەکـن، پاشـێ کـورمێ د زکی وە کەڤن ها! نە گێنم، و نە ژی ئێرد ب خـاڤ مەخـن. دگـۆتن ژی کـو دەنـدکان ب خاڤ مەرا بخوە سە، کورمێ د زکی مەرا کەڤن. ئلەمێ ژی دەندکێ کونـدری قـش. هەگەر کورمێن بچـووك ب مرۆڤـان رە د رووڤکـان دە هەبـن، کـو کـاردیێ بخـوە، هەو کورمکنـا هەمووێ ژێ دە بکەڤن. یەك کورم ڤێ رە هەبن، هەبەکـێ ژ وا بـزرێ نێریـا وێ داقـرتینە، کورم ئۆلان ڤێ رە نامینن. دکن ناڤ پەلکێن جخارەیان یان ژی چیچك کـاخەت، و لـهەڤ دپێچن و دادقرتینن، داکو ئەو گەوریێ نەشەوتینە. برێ من وە کر گۆت کیسەك (تۆپاچەك) کورم ژ من کەت. (ئۆھ) هنکان زێتن بەرددان پۆز و دەڤـێ نەخـوێش و چەدکـرن. مـن ب خوە دیت. گۆتنەك ژی هەبوو کو خوارنا نیسکێن پەهنك ب خاڤی ئەو ژی کورمـان د زکـێ مرۆڤان دە چێدکە.

**٩٣) كوتفاندنا تاماران، لهەڤگەرینا تاماران**

كەسێن كو كار نەكرنە، ژ مێـژ دە روونشـتنە و نەخەبتیـنە، پـر جـاران تامـارێن خـوە دكـوفتن هەڤ. ئیجـا ژ وێ مەسـەلێ رە مسـدان گەرەك دبە. دە مسـدان ژی نە كـارێ هەركەسییە! ئانكو ئێتمانەك خوە هەیە. نەخوێش ل سەر زك درێژ دكن، تازی دكن، هێـدی هێدی، مسددن. پاشێ گۆشتێ پشتێ وەكی كێلپـدانێ ب بەر دو پێچیـێن خـوەیێن مەزن (تلیێن بەرانێ) دخن، كێلی ب كێلی ژ هەڤ دكن ژ قرتكێ دە هەتـا ب ناڤـا زراڤ، پاشـێ ب دەستان ل سەر هەڤ زوو ـ زوو لێدخن، پاشێ ژی دەستێ چەپـێ و لنگـێ راسـتێ دو جاران ب ڤاجی هەڤ دكشینن، خرپنی ڤێدكەڤن، ئانكو هەستیێن خوە نەرم بوون، تامـار ژ هەڤ ڤەبوون. هنەك ژی ل پێ ل پاش دسەكنن و پێیێن نەخـوێش ب هەڤ رە دبـن و ژ پارا ڤە دكشینە و رادكە و دلەقینە.

**٩٤) كوخك**

كوخكێ درێژ بكرا سە، دمسێ شێرین وەك دەرمان ڤەدخـوارن، پـێ گەوریـا خـوە نەرم دكرن، و كوخك پێ كۆ دبوو. هنەكان ژی شەكرێ پـۆلات دخـوارن، گەروری رهەت دكـر. هن جاران بابۆنێجێ، زەعنتەرێ، بووكمەزاڤێ، یەكجـاران ژی جەهـنم جنەتـێ ژی تەڤ ل هەڤ دكن، و دكەلینن و ڤەدخون.

**٩٥) كوخكا ڤیقی** (ئینگ: Pertussis)

دەما كو مرۆڤ پێ دكەت وەك دیكان دكر قیقـی! دەرمـانێ خـوە كولیلكـا دارا چنـارێ دكوتان و ڤەدخوارن. هنەكان قچكێ كو ب كوخكا قیقی دكەت، چەند سبەیان، ل بەربانگـا سبەهێ، بەری كـو رۆ هلـێ، دەردخسـتن نـاڤ پرێزەیەكـێ، و ل ور ب ئاڤـا ئۆلێـڤ روو و سەرچاڤێن وی دشوشتن، ب سـەر دە ژ كـوخكێ ڤەدبـوو. ل پیـێ گونـدێ بلبلـێ، رۆژێ جارەكێ ب قاسی كەڤچیەك چای ژ دوعن قوتێددان زارۆكێ نەخـواش دا كـو بخـوە، پـێ رهەت دبوو. ل هافا گونـدێ قـۆپێ بەنەك هەیە، ژێ رە دبێـژن بەنـێ كەلۆشـكێ. دیـكەیە. كەڤرەك د ناڤ وا بەنێ دە هەیە ژێ رە دبێژن كەڤری كوخكێ. باوەر دكن كـو نەخـوەش د بن وا كەڤری رە دەرباس ببە سە، ژ كوخكا قیقی ڤەدبە. و ل هافا گونـدێ قیبـارێ زنـارەك قول هەیە، نەخوەش سبێ چارشەمێ بەری شـفاقێ تـێ رە دەربـاس دكـرن، رهەت دبـوو. هنەكان ژی نەخوەش دبرن گۆمیتێ و ل ور داسقولەك هەبـوو، نەخـواش تـێ رە دەربـاس دبوو و ڤەدگەری مال و چێ دبوو. ئەز نەگیشتمێ لێ هانا مەزنێن مە دبێـژن. هنەكـان ژی نەخوەش دبرن هافا گوندێ شیێ، كەڤرەكی قول هەبوو، ئەو تێ رە دەرباس دكرن، دگـۆتن

رهەت دبە. هنەکان ژی قادووسەك بۆش یان کەشکوورەك ڤالا ددان دەست نەخوێش و وی ئەو ل هەفت مالان دگەراند، و ب خوە بێیی کو کەسەك ژێ رە بێژێ، زەرکەك ئاڤ ژ ساتلێ ئاڤا وان هەفت مالان دبر بێیی کو دەنگ بکێ و باخڤێ و ل سەر ستوو ڤەدگەری مال و ئەو ساتل هەفت شەڤان دیدنا بەر هێڤێ و پشت رە نەخوێش ئەو ئاڤا ڤەدخوار، رهەت دبوو.

٩۶) **کووک** (ئینگ: hordeolum)

ئەڤ لۆپك ئان پزرکن مینا تەنێ نیسکانە، رەنگ سۆرە، ل قەباخا چاڤێن مرۆڤان تێن دەر. بەرێ، ئەگەر مرۆڤەکی ب دەرگستی هەبا، چ کەچەك ئان خۆرتەك بێ، دچوون قولپکا وانا زێری تینان، و ئەو قولپك تم تێ رە دخوشاندن و مسددان ئەو کووك پشتی هەفتیەکێ ئان دەمەکە کن دە چێدبوو. (ئۆهـ) هنەك ژ کووکێ رە دبێژن بووکێ چاڤان. دبێژن: بووك ل چەڤێ من هاتی. ێ کو کووك ل چاڤان وەرە، سێ جاران قولپکێ دەرگستێ د سەر رە دبن، تینن، چێدبە!

٩٧) **کووتبوون**

زەمانەکی خەلا بوو، خەلکێ جۆلبان خوارن. گشت پێ کووت بوون، ئانکو ژ خوارنا جۆلبانێن پر کووت کەتن. دبێژن کو خوینا وان ژی دبوو ئاڤ. هنەك باوەریا خوە ب زیارەتان تینن بۆ شارەکرنا کووتبوونێ. گۆ: ل هێڤارا ئینێ، یەکی کووتەك ل پشتا خوە کر، و بر د زارەتا شێخ جەمالدین دا دینا. وی د ور دا خەوکرن، رۆیا دن رابوو، ب مەشێ چوو مال!

٩٨) **لالبوون**

پر زارۆك دگهێشتن ۶ ـ ٧ سالیێ لێ هین نکانین دەنگبکرانا، دگۆتن کو زمانێ وان کلیتە. دچوون زارۆك سبەیەکە زوو، بەری گ خۆجە هەرە قاپیێ جامیێ ڤەکێ، ل بەر قێپ دسەکنین و کلیتا مزگەفتێ جارەکێ ل دەڤێ قچك دخستن، و پشت رە دەری ڤەدکرن. گۆت : مە قیزا خوە هلگرت و مە هوونا بەر زارەتێ، رۆ چارشەم بوو، ل شفاقا. نە دەیندکر، و نە دلڤی، و نە دمەشی. مە مریشکك خوە ژەرژێکر، و دێکا وێ ئاخ راکر تەڤ وا خوینێ کر، و د گوڤدی وێ دا. قیزك ب سەر دا د خەو ڤا چوو، پاشێ ڤەجنقی و ژ خەو رابوو، و گۆ: من مەعری رەش دی! و بێ خودێ، دەربکێ زمان ڤەبوو. ژ وان هەنە باوەر دکن کو زارۆکێ ب شیر هەگەر تە شیرە (شەکر، لۆقمە..) دایێ لالکی دبە، و کەکەج دەرتێ.

**٩٩) لێخستنا جنا**

بەربەژن، کاخەتە، ب قاسی سێ پێچیان پاهنە، ل بەژنێ نەخوێش دگرتن، ژ سەری دە تا بەر لنگان ئێکێ دریژ بە. ب دەرزیێ چێدکرن، دریژ دکرن. ل سەر دوعە دنڤیسین، ل گۆر نەخوەشیێ، دگۆتن کو جن هاتنە تە،یا تە ئاڤێ گەرم رژاندی و تە قچکێ پێریا پێ شەوتاندنە، یا تە قالقێ پیڤازا شەوتاندنە! ئەو بەربەژنا دبرن جەم کۆشکێر، چەرمك سێکۆشەیی دگرت سەر، و دکرن ستوویێ خوە. دگۆتن هەمیلە. هنەکان ژی ئاڤ ب سەرە ڤەدخوار.

**١٠٠) لێخستنا دلا زێدە**

دلێ یەکی کو لێخستا، رادبوون مووژێ سۆر ددانێ و دەندقێ سێڤان و هەژیرێن هشك. دە بەرێ وە دکرن.

١٠١) **گلکەتن** (ئینگ: Tonsillitis)

دچوون جەم ژنەك ل تیێ خوە فتلییە، داوا خوە دکر قرتکێ نەخوێش و هەفت جاران ڤەدچەنگاند، و نەخوەش ئخ (توو) دکە. ب سەر دە خوین تێ، رەهەت دبە. پیرەك ل گوندێ مە شیێ هەبوو وها دکر و پێچیا خوە گشت دکر گەوریێ و دگوڤاشت. دەما گەوریا زارۆکان ئان مەزنان دوەرمیا، د گەوریێ دە وەك دو گولەیان چێ دبوون، پاچەك گەرم دکرن و ددان بن چەنگێ، سەر قرتکێ. گاڤا کو گلیێن یەکی دێشین و مرۆڤ نکاری خوارن بخوارا، دگۆتن کو سووراڤکێ تێ وەردن یان بابۆنجێ بکەلینن بلا ڤەخوێ و هنی تێ وەردێ. لێ کو سوود نەگرت و پر وەرمین و نکاری ت تشتی داقرتینە، دبرن گوندێ مووسکێ، یەك ل ور هەبوو دپەقاندن و نێم و خوین ژێ دهەرکی و پاشێ چێدبوو.

**١٠٢) مانگ (شانکێن رەش و مۆر ل بەدەنا مرۆڤان)**

مانگ دو جورەیێن وان هەنە:

١. مانگا مێ: کو هەرتم مەزن دبە و هاویردۆرا وێ نە دووز و راستەراستە لێ بازنگی و فرکەفرکی و رەنگەرەنگییە. گاڤا مرۆڤ وان ژێبکن، بەلاڤ دبن، و پرانی پێ دمرن ژ بەر کو دبوو پەنچەشێرا چەرمی (ئینگ: مەلانۆمە).

٢. مانگا نێر: ئەو تم یەکرەنگی و یەکفۆرمە. مرۆڤان ئەو ب دو رێیان ژێدکرن:یا یەکێ دەزیەك پەعت تێ گرێ ددان، و ولۆ دهێشتن هەفتیەکێ و دیسا بەنك لێ جارەکە دن پەعت دکرن، و هن ب هن هەیانی پووچ دبوو و هەما پێ دگرتن و هلدقەتاندن یا دووێ ب کێرەکە تووژ یان ب شەفرێ قوت دکرن و چیچك تانترۆت لێ دکرن.

### ۱۰۳) مەشا د خەو دا (و پیرهەبۆک)

پـر زارۆك هەنە كـو ئەو د خەو دە دمەشــن. ئەو ژی نە باشــە، پـر مەترسـیدارە. لۆمـا دایيكێن بەرێ گاڤا چ ل هوندریا دەر ڤە خەو عكرنا بەنكەك ل لنگێ قچك و خوە ڤە گـرێ ددان ژ بەر كو ب شەڤ نەچە و خوە د سیڤلەكێ خانیان وەر نەكە، یان ژ مـال دەرنەكەڤە چۆلێ. گۆ: مستێ مەهمێ ب مەزنیا خوە، نیڤشەڤ، دهات سەر كانیا گونـدێ شـیێ، خـوە دكرێ و دچوو ناڤ ج، و سبەدا تە ڤێ را بگۆتا، پەرچە ژ خوە دكرن و دگـۆت: نـا! هـنەك ژی هەبوون پیرهەبۆك ل سەر سینگێ وان روودنشت! پیرهەبـۆك، یـانێ جـنە. دگـۆتن ئەو وەك ژنایە لێ پۆزێ خوا قوتە، گۆر فەهمـێ وێ زەمـانی. مـن ژی جارنـا د خەونـێ دە ئەو ددی. ئەز بچووك بووم من نەوێـری ب تەنـێ خەو بكـرا. د خەوێ دە یەك دهـات ل سـەر سینگێ من روودنشت و من بانگ دكر، كەسی نەدبهیسـت. دەرمانـا پیرهەبـۆكێ ژی یـان هجێبا شێخان بوو، یـان ژی عەیـار (چەرم)ێ قوونـا گـوران بـوو ب تـۆپلیێ ب نەخـوێش دخستن. د سالا ۱۹۹٤ ان دە ئەز ل بەندا مەیدانكێ دخەبتیم. پێنج كاركەر د بـن دەسـتێ مـن دە ژی دخەبتـین. مـووچەیێ وان ٤٥٠٠ لیـرەیێن سـووری بـوون. كـو رۆژێ هنـدك بخەبتینا، هەردوویان ۵۰۰ تـوورێن چیمەنتـۆ ژ كەمیـۆنێ دیـدنان و ل عەردێ ددان هەڤ. دلێ هورچان پێ دشەوتین. جا من بهیسـت كـو شـێخەكی ب كەرامەت هەیە هجێـبەك ژ یەكی رە كری و ۱۵۰۰ لیرە ژێ ئستاندی. رۆكێ ئالەت خەرابوو، ئەمی ل بن دارا زەیتـوونێ روونشتنە، من دی شێخ دبۆرێ. من بانگ لێ كر، هات، من گۆت: هەی زالم! تو فەد نـاكی تو ۱۵۰۰ وەراق ژ ڤا فقاری دستینی؟ گۆ: هەقی دەرمـێن بهـایە. مـن گـۆ: تـو ڤـرا دكـی و دەرمانێ تە و خواندنێ تە و هجێبێ تە تەڤ ڤرن! گۆ: تو رازی دبی گ ئەز هیرۆ دو جنـان ب تە را بشینم مال وێ ل مالا تە خەوعكـن و سـبێێ ب تە را وەرن ڤـر؟ مـن گـۆ: جـن هنەكی چۆ نە؟ گۆ: وەك مەریا نە و ب پرچن، و پرچێ خـوە وەكـێ هێشـترا نە. مـن گـۆ: هەلەب نە ل ڤرە، ما گاز ژی نە ل ڤرە؟ گۆ: چۆ؟ من گـۆ: تـێ جـووجكێ (هەیـێ) مسـتۆ گرێدی ب رێكێ جنێن خوە و تێ خوە تۆمپەل عكـی. گ مسـتۆ نكـانی د تە نـا، ئەزێ ژ جنێن تە و هجێبێ تە ئینانعكم. رابوو رەڤیا و گشت كەنیان و ت جار دن كەسی ژ كـاركرا را هجێب نەكرن.

### ۱۰۴) مێرستان (ئینگ: Eczema)

هنەك كەس هەبوون، دگۆتن دەستێ خوە هەنە، ب هـوبرێ ئـایەتەك قورعـانێ ل سـەر دنڤیساندن، مەرج ژی ئەوە كو رۆژ ئێكێ چارشەم بە، و رۆژ ئێكێ ل بانی بە. ب وا نڤیسـێ

رهەت دبوو. هنەكان هەرفێن ئايەتا قورعانێ بێ نوختـك دنڤيسـاندن، و هنەكـان ژى هەرف نەدنڤيساندن، لێ ل سەر مێرستانێ گشت هوبر دكرن. هنەك مێرستانان خازيێ لێ دهـێلن و پێ دەرمان دكن. خوازيا هنەكـان مەنەيە. هنەكـان بـاوەر دكـرن كـو رۆژێ چارشـەمێ كەسێ كو دەستێ خوە بێ، بلا ب سبێ ل ئێخرينى تف سەر مێرستێن بكێ و ب دەرزيـێ لێ بەلا بكێ د چەند چارشەمان دەێ چێببێ. دگۆتن هەرن مالا فلانكەسى بلا خوزيا خـوە تێ بدێ. ل گوندێ شيتكا دەستێ مالا تەمۆ هەبوو. جارنان سێ - چـار نەخـواش ب هەڤ رە دچوون جەم خوداندێست، خوازى د دێڤ دە نەدما، رادبوو ئـاڤ د دەڤـێ خـوە وەردا! من ب خوە ل سـەر مێرسـتانان نڤيسـيە. مێرسـتانێ نێـر و مـێ هەيە.يـا مـێ زوو ب زوو چێنابە. ئايەت ژى ئەڤ ئايەتا ٧٩ سۆرەتا زەخـرەفە. ژ سـۆرەتا زەخـرەفە. دڤـێ ئەڤ ئـايەت سێ جاران وەرە نڤيساندن. من ژ خۆجە پرس كر، گۆت كو كيژان ئايەتا بوويە، مرۆڤ كـانە ل سەر مێرستانێ بنڤيسە. يەكى ژى گۆت كو سۆرەتا ئەننەمل دنڤيسن.

١٠٥) **مێخێ لنگان، ميخێ گۆشت** (ئينگ: Corn)

كەركەك باجانا سۆر دهانين، د ئۆرتێ رە دبرِين، و ب شەڤ نيڤەك ديدنان سـەر مێخـێ و پـاچەك لـێ دپێچـان هەتـا ب سـبێ. ب سـبێ رە وا شـوونا تەزە و پـر نەرم دبـوو، ب منچووكێ ب سەرێ مێخ دگرتن و هێدى هێدى باددان و دكشاندن، و ب تـووم هلـدكرن. ل گوندێ شيێ دگۆتن كو ئاڤا باجانێن سۆر دەرمانە ژ مێخێ لنگـان رە. پـر دەرمـانێن دن ژى ژێ رە ددين. ب راستى ژى ل گۆر مە ديتێ هەر يەكى ب ئاوايەكى رادبوو. هـنەك ب بەنيشتێ مەرخێ، هنەك ب سيران، هنەكان ژى قوت دكرن.

١٠٦) **مت و سترى**

دەما كو متەك ئان ستريەك دكەت دەست و گوڤدێ يەكـى، هەمـا خـوازى تـێ ددان و دەرزيەك ب بەر دخستن، دەر دخستن.

١٠٧) **مۆربوونا دۆر چاڤان**

هنەك هەنە، تو دبينێ قەباقێ چاڤان، دەردۆر و بنێ چاڤێن وان مۆر بـوويە، دبێـژن كـو ئەو ب چايا تير ب پەمبوويێ تێ دە بكە و لێ هێلە، باش دبە.

١٠٨) **ناڤگرتن، زكگرتن، قەبز، قەڤز، قەڤز** (ئينگ: Constipation)

هنەك ئەگەر زارۆكێن خوە ناڤ نەچوونا، چيچك زێتا زەيتوونان نيڤ گەرمى دكـرن و ب قوونا زارۆك ڤەددان ب شرينقێ. لێ پرانـى، ئاڤـا گەرم دخسـتن شـرينقێ و بەرددان قوونـا زارۆك هەيانى كو نەرم دبوو و ناڤ دچوو. ئەڤ من ژ جينارێ خوە گرت مەمەدێ كـووتيێ

نەڤیێن خوە وە دکرن. هنەکان فەتیلەك سابوون دکرن قوونێ، ساەتەك نەدچوو ب خوە دە بەردداَ. هن زێتێ قرنیێ وەك دەرمانێ قەڤزێ بکار دهانین. تەهما وێ پر تەهلە. پر کەسان ژی هەژیرێ هشك و مووژ بۆ زك نەرمکرنێ دخوارن. هنەکان سابوون دهانین، فتیل ژێ چێدکرن، و دکرنێ، پێ زك نەرم دبوو. هنەکان پرپار بکار دهانین. پرپار بەرێ ل مالا هشککری هەبوو، ل زڤستانان بکار دهانین، و ل هاڤینانێ تەزە بکار دهانین. دکەلاندن، وەکی هێڤیر دبوو و چارشەفەك دیدنان سەر زکێ تازیکری، قرارا کو زك نەشەوتە، گەرمە، و ئەو هەڤیرا بۆشدکرن سەر. جووق - جووق ب زکێ نەخوێش دکەت، دکر جووق جووق جووق جووق.. ژ گەرما وا هەڤیری زار! زك پێ نەرم دبوو. تەنەیێن دارا قەتلەبێ دەما کو دبهورن، رەنگێ وان وەك خوینێ سۆر دبن، ژێ رە دبێژن سۆرسۆریك. دبێژن کو چەند تەنەیان ژ وان بخوە، تشتەك د زکێ مرۆڤ دە نامینە. هنەك تەهلیێ ڤەدخون، پێ ناڤ دەرێ. هنەك ژی بابۆنێجێ سەر خانیان ب تەنێ دکەلاندن و ڤەدخوارن، پێ ناڤ دچوو. دبێژن کو ئەو مەرا زەهیف دکە! هنان ژی هنداخ بکار دهانین. ئەو زێتا قرنیێیەێ کو زك نارە، شیشەیەك هنداخ دکرِە و ڤەدخوە، پرِەك ژی بەریا کو خوە ئەمەلەت بکن ددنێ. خالێ من ل گوندێ ئەرەندێ دچوو چۆلێ، کەلەمك ب ناڤێ تەوریێ تێتە ناسین، بەلێن وێ مینا بەلێن زەیتوونانە، و چیچەکێن وێ یان گولگولی یان ژی سپی نە. ئەو چیچەك پر و پر بیهن خوەشە. ب خودێ من بیهن د ژیانا خوە دە وەك وێ خوەش بیهننەکریە. وی ئەڤ بەل هشك دکرن و وەك هەبان دکرن، و جارێ یەك دخوار. زوو - زوو دەه دەقە دچوون، زکێ مرۆڤ هلدوەشیا. لێ پر ژ ژێر ڤە دشەوتی، مینا ئیسۆتێن تووژ. من دو جاران ب خوە خواریە. لێ من جارەکێ بر ژ توخترێ خوە رە ل زانینگەها شامێ. من خوەست ئەو لێکۆلینەکێ ل سەر چێبکە، لێ ژ من رە گۆت کو ئەو گیایەکە ژەهرییە و قەت ت جار دن نەخوم. هنەکان رێت ددان سەر زك. رێت ژێ، پرپار دکەلاندن و هنەك ئارد تەڤ لێ دکرن و ل سەر چارشەفەکێ رێدخستن و ددان سەر زك و لێ دپێچان. پشتی ساعەتەکێ ڤەدکرن و زك دمەشی. قەڤزبوونەك بێش و جەرسی هەیە. ئەو ژی دقەومێ ل یەکی گاڤێ کو قۆرق یان هەناران پر بخوێ و دران نەساخ بن، یان دەندکان نەهێرێ ژ بەر کو هنەکی تەعلن. دەرمان ژی تونەیە ژ بلی خەرتوومێ هەنەفیێ. تێ وێ د پاشیێ عکی و ئاڤێ بەردیێ، و فێدە نەکر سە تێ ئاڤێ گەرم بکی و شرینقێ بەردیێ و زکێ بمەشێ.

**١٠٩) ناڤك کەتن**

ژ راکرنا بارێن گران پەیدا دبێ و لاشە سست دبێ و مەعدە نارێ خوارنێ. دا کو

نەخواشیێ دەستنیشان بكن، ئەو نەخوێش ل سەر پشتێ درێژ دكنك و تليا خوه دكن ناڤكێ. هەگەر تامارا خوینێ د بن تلیێ ده هلدێ و بلڤێ، ناڤك نە كەتی. و هەگەر ل كێلەكێ بلڤێ، ناڤك كەتی. كەسن تايبەت هەنە، ئەو ناڤكان تینن جهـ كلۆرەكێ ژ پاچان چێدكن و ل سەر پشتا زەركەكێ داتینن و ناڤكێ داتینن ئۆرتا كلۆرێ، یان ژی نەخواش خوه ل سەر زك درێژ دكێ و زەرك د بن زك دەیە، و ب مسدانا پشتێ و كشاندنا تاماران ناڤكێ تینن جهـ پشتی كو ناڤك تێ جهـ نەخواش برچی دبە ژ بەر كو وی ژ بەر ئێشا خوه چەند رۆژان خوارن نەخواریە. ناڤكا من شەش جاران هانین جهـ هنەك ژ بۆ ناڤكێ دەستمالەكێ دكن كەعكۆل و دیدنان عەردێ و نەخوەش خوه ب زك بەردده سەر ژ ئالیێ ناڤكێ ڤە، و وە دما تا نیڤ ساەتەكێ كو وەرێ ج. نها ژی ژ بۆ ناڤكێ هنەك مسینەك تژی ئاڤ تینن و دەڤێ زراڤ ب پاچەكی دخەتمینن و دەڤێ مەزن دیدنن سەر ناڤكا خوە. وێ گاڤێ مرۆڤ گەرەك ل سەر پشتێ بێ، تا كو تێ ج. (ئۆهـ) هەلبەت كەتنا ناڤكێ ژی ب ئیچێ زك دە و نە ب دەرڤە دەیە. هنەكان زكێ نەخوێش مسددان و پاشێ ژی كووزەك، یان زەركەكێن بەرێێن مەزن، ئان مسینەك باقری دەڤفەرەهـ تینان و دیدنان سەر زك و دكشاندن ناڤ. ب وا كشاندنێ ئان تێڤەدانێ رە ناڤك تینان جهێ بەرێ. ئێتمانا خوە ژی هەر كەسەكی نزانی. گۆ: ل هادا بەرژۆر، ناڤ ئامكیا، ژنكێ ناڤك كەتبوو. رابوو هنا ئێكێ ژێ را هوونن ج. دە ڤانا ب هەوالدانا كووزكی ئاڤێ هانین و زكێ ژنكێ مسدان، مسدان و كووز دینان سەر زك. ڤێ جارێ رابوو زك پەڤدا كەت ئیچێ كووز! ئێێێ؟! نە بوو بەعر بەعرێ ژنكێ. هەی وەخ مە چ كر! وەلهاستێل دبێن: ئێرمەنیكی ل بلبلێ داس چێدكرن، بانێكرن، هات، دیت، گۆ: كا چاكووچكی بدن من. چاكووچ هانین هاتن، دان دەس مووسەك. دە گۆ مووسەك راكر و ڤا د كووز دا، كووز شكی و ژنك ڤەهەسی، ل چەعڤێ هەڤ نرین، گۆتن: دێ مە شك نەبر ئەم بشكینن! ئێ پر ب كووزێ ناڤك دهانین جهـ هەگەر تنە با ب مسینێ ئاڤێ. پاچەك دكرن دەڤێ بچووك، و مسین نیڤچە ئاڤ دكرن، و ل روونشت دەڤێ مەزن دیدنان سەر جیێ كو تامار لێ هلددە، و وەرگی نەخوێش خوە درێژ دكر، دا كو ئاڤ نەرژێ. سێ - چار رۆژان وە دكرن، ناڤك دهات ج. گۆ: دە بەرێ ب بێبەختیا عەشیرا شەری هەڤدو دكر. دبێن رۆكێ یەكی ئامكی چوو جەم پیركێ ناڤكا خوە هلینێ. پیرێ كووز دا سەر ناڤكێ، ڤێ جارێ عوور گی كەت ئێچی كووز، و تێ دا مەكنی و دەرناتێ. گۆ راكن هەلەب. ل هەلەب مێرك گۆ وینێ هاقا پەرە بدن ها! چ ڤێ را بوو دایێ. گۆ هەلە چاكووچكی ژ من را وینن. چاكووچ راكر و ڤا ئۆرتێ كووز. كووز كر بولخور و عوور دەركەت.

**١١٠) نەبیران ببوون**

ژنا بهال، بینێ تشتەكی كو چوویێ، گەرەكە ئلەمێ وا تشتی بخوە. هەگەر نەخوە وێ ل سەر روو ئان گوڤدەیێ قچكێ وێ وەك عودر چێببە.

**١١١) نەفەس تەنگ بوون، ئێلپكی، رەبۆ** (ئینگ: Asthma)

كەسێ كو نەفەس لێ تەنگ دبوو، ڤێ رە دگۆتن: ئێلپكیـیە. ژ ڤـێ نەخوەشـیێ رە پـر دەرمان چێ دكرن، یەك ژێ، دگۆتن كـو بـاهتۆڤكێ ژێ رە بكەلیـنن و بـلا سـبە ب سـبە زەركەكێ ڤەخوە. هن ژی دبێژن كو كەرگەزكێ بكەلین و ڤەخوە. پران فێدە ژێ دیتیە. لـێ دڤێ ئەو كەسێ ئێلپكی كارێ كو تۆز تێ دە هەبە نەكە، جگارێ ڤەنەخوە، سەرمێ نەبیـنە، جیێ لهێمی لێ خەو نەكە. روونێ بەهتی و هونگوڤێ ساخ ژی لێ تێ. جارەكێ من كـالەك دیت ل سەر كانیا گوندێ شیێ، ئەز بچووك بووم، من دیتـی هێكـێ دشـكینێ و چەدكـێ دێڤ ب خاڤی، من گۆت: خالێ هەجی، ئەڤ چما تو ب خاڤی ڤەدخوی؟ گـۆت: نەفەس ل من تەنگ دبە! هنەكان ژی كوندر و پیڤازەكێ و سێ شقن بەختەنیز ل سـەر ئێـر دیـدنان هەتا كو دهەلیان و دبەهتین، دبوو مەلهەم، پاشێ دیدنان سەر سینگێ نەخـوێش. هنەكـان شەكرێ پۆلات دخوارن دەما كو نەفەسـا وان تەنـگ دبـوو. هنـان ژی بەرێ بـزرێ تـۆلكێ دخوارن ژ بۆ نەفەسڤەكرنێ، و ئەو كوخكێ ژی دكـوژە! مـن رۆژەكـێ دیـت كـو دیـا مـن پەنچەك بزرێ تۆلكێ،ێ ڤێلچق ژ سـەر رادكە و دخـوە. كۆكـا بەلانـێ ژی ژ بـۆ نەخواشـیا نەفەسێ دكەلینن و ڤەدخون. سینگێ مرۆڤ فەرەه دكە. هـنەك ژی زەهـتەرێ دكەلیـنن و وەك چای ڤەدخون. ئەو نەفەسێ مرۆڤ ڤەدكە.

**١١٢) نەخوەشیا گورچكێ**

هنەك باوەر دكن كو نەخوەشیا گورچكێ ب لخوەكرنا كنجـێن رەنـگ پورتەقـالی سـڤك دبە!

**١١٣) نەخوەشیا پێز** (ئینگ: Brucellosis)

ئەگەر كەسەك خوەدی دەوار و پەز با، و رۆژانە شیر و ماست ڤەخوارا، جارنا ئەو مـرۆڤ پووچ دبوو، دكولی، ئێش دكەت هەستیان، و لنگ لێ گـران دبـوون نكـانی بمەشـیا، و تـا دهات سەر وی هن جاران، و ب تایبەت گاڤا پشتی كو تشتێن ژ پێـز دخـوارن. وێ گـاڤێ پارزیا هەر تشتەكی كو ژ شیر چێدبوو دكر هەیا سالەكێ دا كو چێ ببە.

**١١٤) نەخوەشیا رەش، گەرگەرینە** (ئینگ: Gangrene)

لنگ تەڤ دە رەش دبە. دەرمانێ خـوە بـرین بـوو. لنـگ د هـافێ رەشـبوونێ رە قـوت

دكرن. بنر گەرگەرینە.

## ١١٥) نەخوەشیا زستانیێ

گۆ: ژن جارنا دوو زاندنێ را نەخوەش دبن، د زستانیێ دا. د وێ وەختێ دا دگۆتن پیرهەبۆك ب كەڤچی خوارنێ دكەڤێ زك. بەرێ هەسیدە چێدكرن. ژنێ ب دوهالا هەتا فقارە با ژی، شیر ـ ماستی خوە تنە بوو، بزنك خوە تەنێ هەبا مهاوەلە دكر گ ژ وا بزنێ هەسیداك روون ژ خوە را چێكێ، مەعنێ گ زا، ژند وا گوندی گی دهاتن. گەرەكە گشتك وێ هەسیدێ بخون. پاشێ، مەعنێ وا پیرهەبۆكا نەكەڤێ زك مەشكك دهانین (پاشێ فیشەك دەركەتن). سێ كەڤچ ب هەسیدێ دخستن دبرن بەر دەڤی ژنێ گ قچكی خوە بوویە. د بەر دیڤ دا، یا د بن چەنگێ دا دەڤی مەشكێ ڤەكرییە. ئەو هەسیدا بۆشدكرن وێ مەشكێ. دەڤی مەشكێ یەكێ پێ گرتی. وەختێ دكر ئێچ، دەڤی مەشكێ دگرت. دو كەڤچ، سێ كەڤچ وەنا دكرن. دەڤی مەشكێ ژی پاشێ مەكن گرێ ددان، دیدنان وێ دەرێ. دە پیرهەبۆك نە شەرتە وەرێ. مالك هەیە ژ شێخۆرزێ وان دەرنایە، ژێ را دبێن مالا چیكێە نزانم، وانا ب ڤێ رێكێ پیرهەبوك گرتی. دە وەختا وا مەشكا دەڤ گرێددان و دیدنان وێ دەرێ، عەباك دهانین. عەبە دو تۆن هەبوون: عەباك گەور بوو، و عەباك كزنی بوو. عەبێ كزنی ژ موو چێدكرن. عەبێ گەور ژی ژ هرییێ چێدكرن. موو ژ هرییێ بهاترە. یەكی قیزێ خوە وەخت د سەر را دەرباس ببا، دگۆت هەڤ قیزكا تە خێر هێشتی؟ ژنا د ناڤ هەڤ دا وە دگۆ. دگۆ: نە مە نەدا، عەبە سۆر ب مە رازی نەبوون، عەبە گەور ئەم پێ رازی نەبوون. عەبە سۆر یانێ عەبێ كزنی. هاااا.. دە وەختێ وا مەشكا بوەرمیا، زانین پیرهەبۆكی تێدا. عەباك ژ وا عەبەیانێ بهانینا، چێ موویی چ گەور چ سۆر. شووژنكێ د بەر را عكرانا، و مەشك ژیێ د ئێچی وێ عەبێ عكرانا، پاشێ دەڤی مەشكێێ ڤەكرانا. وەختێ پیرهەبۆك ژ مەشكێ دەردكەت، عەبە لێ دبوو. گ عەبە لێ بوو، نكێ هندا ببێ. هەو عەبا ل سەر چێدكرن، و وا پیرهەبۆكا د ناڤ وان دا دما، پێ كاری خوە دكرن، پێ دەری خوە.. دە وە دبێن. مالێ ئێخجەر، مالێ خەجەر، ل دۆر شێخۆرزێ وان دەرنا دگۆتن یەك گرتیە. پێ گ كار كرنە، دەر كرنە، پاشێ ژنكێ گۆتی مـن بەردن ئەزێ تشتكی ب وە دم، هەتا وین ساخن بلا خەلاس نەبێ. تو عكێ چ ب مە دێ؟ گۆتی: ئەزێ تۆپك جاو ب وە دم، بەس ژێ تووركی فسا، چێر دەرپیا دكە، چێمەكن. سۆز؟ سۆز! دبێ ژنك بەردان. رۆكێ، رابوون تۆپك جاوی ل وێ دەرێ. وانا پێ پرت چێدكرن، دەر دكرن، دو سال.. سێ سال.. چار سال. دە یەكێ چۆ كر سە، دەرپ ژێ چێكر. هەو تۆپا خەلاس بوو، و ت تۆپ دن

نەهاتن. دە هنك هەوال ددن، دبێن: وێ پیرهەبۆکێ گۆتی وینێ من ببن ل فلان دەرێ گۆلێ ئاڤێ هەیە، من چەکنێ، عەبێ ژ من ژێ عکن، و من د وێ گۆلێ وەر عکن. دبێ برن سەر وێ گۆلێ، عەبە ژێ کرن، و د گۆلێ وەرکرن. پر نەما، خوینا سۆر ب سەر ئاڤێ کەت. دە خەلکێ گۆت: هەڤالا کوشت، تو یارەمیش نابێ ئارتاق . یانێ بەنی ئادەم تە ڤێرا دا ـ ئستاند، تو یارەمیش مە نابێ، کوشتن. وا مالێ گ پیرهەبۆك گرتنە، دچوون وێ مالێ، تشتکی وێ مالێ دهانین بقچکا دخستن، وا قچکد دترسن ب شەڤێ، فلان بێڤان، نەخوەش مەخوەش. دە پاچك ژ جەم وانا دهانین، چێدکرن، دکرن قۆچ، دکرن ئوستی قچکا، ئوستی دەرا و بەرا. وێ مالکێ هەڤیر چێدکر. ئی گ دز کریە، تێ هەرێ هەڤیری وانا وینێ، و پێدێ.ێ گ دز کری، نکێ وی هەڤیری داقرتینێ! دجوو و نکێ داقرتینە، دە وە دگۆتن. کەڤنەشۆپیەك نەقەنج ژی هەبوو، کو ئاڤ ژ سەر ژنا نووزایی تا رۆکێ قوت دکرن، و نەدهیشتن کو ڤەخوە. باوەر دکرن کو ب وا رەنگی وێ ژ پیرهەبۆکان دپارێزن. باوەریەك گەلێریا دن ژی هەیە، دبێژە کو ل قچکبووندنا سفتەهە دە ژنك پشتی زایینێ نکانە یەکسەر میز بکە، و هەگەر میزکر ژی، میزا خوە ب شەواتە! دە بەرێ وە دگۆتن. پتا من ل بەر زایینێ بوو، بیرك ل دۆرێ بوون، گۆ: ئەز رابووم، من گێجەلکێ خوە کۆم هەڤ کر، و من کۆفیا هەر هەفت پیرکان ژ سێر کرن، و من کرن داوا خوە و دەرکەتم دەرڤا. پیرك ژی ئەجێب مانە، و بەس دبێن: وەخ.. وەخ.. وەخ، هەڤ عکێ چ بکە؟! گۆ ئەز چووم دەرڤا، و من داوا خوە داوشاند! هەی مال نەکەتنۆ، هەفت پیرکا خوە دانە هەمبەر من و ئەڤقاس سانج تێن من، و قچك د من دا کووت بوویە، و یەك ببێ کا ئەز تشتکی بکم، تۆبە هەرام! ب شووندا قچکێ من بوو. قچکێ یەکێ بوو. زەمانێ بەرێ دگۆتن قچکێ سفتەهە ببە، مەرا نکانە میزعکە. ئەز رابووم، چووم دەرڤا، و ڤەگەریم و من گۆت: بێن ماشەلا! گۆتن: ل سەر چ؟ من گۆت: من ئاڤك رژاند، میزا بێ شەوات!

### ١١٦) نەزەری بوون، چاڤنی بوون، چەعڤنی بوون

زارۆکێ کو ب ڤا نەخوەشیێ دکەت، قورشین د سەر رە دهەلاندن،یا ژی خۆیێ د سەر رە دشەوتاندن ئان پێ وەر دکرن. گاڤا زارۆکەك چاڤنی ببایا مۆریەك هشین پێ دخستنیا تەناك فندق پێ دخستن. ئێگەر مرۆڤ مەزن با،یا نڤێشکەك ژێ رە دکرن و دخستن ستوویێ وی، یان ژی قوربانەك ژێ رە نێت دکرن. دچوون بن زیارەتەکێ سەرێ وی دەواری ژێدکرن و ل ور دخوارن و گۆشتێ ژ بەر مایی ڤەنەدگراندن مال، هەموو ل جیناران و هەڤال و دۆستان بەلاڤ دکرن. ئەگەر مالەك چاڤنی ببایا، دیسا یان شەکالەك

یان کێسۆیەك یان ژی پەپکك قچکان یان قافێ کەرەکی یـان چـاڤەکی هشـین مەزن یـان دەرزیلانك ب دار دخستن ل پێشیا دەری. هنان ژی دەرزیلانك ب سـەر زارۆکـێن خـوەیێن چاڤنیبوونە دە دشەوتاند. ل دژ چاڤنیبوونێ، ئوورزەلکێ د تایـان رە دەربـاس دکـن و مینـا تـۆرەك خەملـێ ژێ چـێ دکـن، و ب مـالێ خـوە ڤە دخـن. هـنەك ژی وێ تەڤ خـۆیێ دشەوتینن و د سەر کەسێ دخوازن کو نەیێ چاڤنیکرن رە دگەرینن.

١١٧) **نقاندنا چاڤان**

ئەگەر چاڤێن یەکی بزورقوتیان و تم بلجمیـان و قابـاخێن چێـڤ بلیسـتانا، د جیـهـ دە زلکەك یان قرشکەك ب قەباخا چاڤێ خوە دخستن و ب خوەزیێ پێ ڤە دزەمرانـدن و د دو دەقەیان دە لجماندن دسەکنی و کێم دبوو.

١١٨) **ئۆق، ئاوق، میزنەکرن** (ئینگ: Urinary retention)

دبێژن کو میز لێ ئاوقیە. هەڤ نەخواشیا پر چێدبێ بێ کو ژ ڤـان سـێ جـورەیێن گیـا بخوێ: سوورك، خەردەل، تووزك. ژ بەر وێ یەکێ، کـو یەك ژ سسـیان بخـوارێ دن ژێ رە دگۆت کو پر مەخوە، میزێ ل تە باوقێ. (ێ)یێ نکارە میز بکە تا کـو مەزن بە ژی، دبێـژن کو ملا سوورکێ بخوە! (لێ نەخوە؟)

١١٩) **پەهنپەڤین**

کەسێ کو پەهنیا خوەا بنێ لنگان دپەڤە، داهنقوتێ تێددە.

١٢٠) **پەڤرمە** (**ئا دەستان و لنگان**)

کەسێ کو کارێ تەڤر، تەڤشۆ، بێر و مەرێ.. دکە، پر جـاران پەقـرمە ل دەسـتان تـێن. ئیجار کو پەقرمە چێبوون ژی نە دکارە کارا بکە نە ژی سەبر تێ، وان پەقرمەنان ب سەرێ دەرزیەکێ دەردکن و دەستێن خوە زێت دکن، و دسەکنن چەند رۆژان تا کو دمچقن.

١٢١) **پەرچاڤ، پەرچفین**

دەما کو زکێ یەکی دپەرچفە، با دکەڤیێ، سۆدە ددانـێ. ب خوارنـا سـۆدێ رە پەرچاڤـا خوە دادهات. ژ مەعدە رە پرانیا ملەت دگۆتن کو ئاڤا هەناران ڤەخون. دبێژن کو هەنار عین کازۆزە. گاکی بخوە، و ب سەر دا هەنـارەکێ بخـوە، ئـێ بهەلیـنە! هەگەر زارۆك بپەرچفـێ، یاناسوونێ ددنێ دا کو پەرچاڤێ دینێ.

١٢٢) **پێدادانا دووپشکا**

کەڤرەك پەهن ل سەر کانیێ گوندێ شیێ هەیە، نزانم ب چ زمانی ل سـەر نڤیسـاندیە. ب هەرفێ عەرەبییە. ژ سەردەما ئۆسمانیان دە هاتی کشـاندن. وەك ئـایەتکێیە، دبێـژە: کـێ

دووپشك پێ دادایی، ژ ڤێ ئاڤێ ڤەخوێ، ئێ چێ دبێ! دبێژن کو ئەو ئاڤا دەرمانە. ئاپەکێ باڤێ من هەبوو، رۆباری بوو، مەخسووس دووپشك دگرتن و بەردان خوە. ل سەر کەڤرەکی روودنشت و دووپشك دیدنا بەر خوە و ڤیتێن خوە تازی دکرن. دووپشکێ د ڤیتا رە هلکشیا، و چاخا کو پێ داددا، هەما ب چۆیەکێ ب دەست دە لێ ددا و گێڕ دکر. خوە ب وا رەنگی ئاشلە دکر ژ گەزێن وان. سالێ جارەکێ خوە ئاشلە دکر. ل دەردۆرا سالێن ١٩٤٠ ـ ٥٠ دە. (ڤا) نها ژی هنەك بەنزینێ لێ دکن و چێدبە.

١٢٣) **پێدادانا ماران**

ئێ کو مێعر پێ دادایی دبرن سەر شێخەکی، و وی شوونا گەزێ تیش تیشی دکر ب کێرەکێ، و خوینا وی دمێت، و توو دکر، دمێت و توو دکر. هەتا کو خوین پاك دکر، و پاشێ شوونا گەزێ دپەچنا. چەند رۆژان وە دهێشتن، رەهەت دبوو. هنەکان، خودان دەست، ب سەر زەرکەك ئاڤ دە دخواندن، و ب سەر جیێ کو مێعر پێ دادایی دە دکرن. ل گوندێن چێ، پشتی شەفرەکرنا جیێ گەزێ، گیایك هەیە ناڤ گوونەیە، وەك بەلانایە، ئستریيە، وەکی گۆشیا پرمووت تێ دە هەیە، کۆکا وا گیایێ دهانین، دشوشتن، و دکوتان دکوتان، و پاشێ دکەلاندن و د ئێلەکێ رە دەرباس دکرن، و هنەك ئارد تەڤلێ دکرنێ، ریت ژێ چێدکرن، وەکی پەلوولێ دبوو. ئەو ریتیا دکرن ناڤ پاچەکی و دیدنان سەر جیێ شەفرەکری. ب سبێ رە ڤەدکرن، شوونا وێ سپی بوویە. دیسا شەفرە دکرن، و ریت دوبارە دکرن. هەتا چەند رۆژان وە دکرن. ل گوندێ باسووفانێ شێخ مەنانی عەلێ نەبێ هەبوو، پێدادانا مار و دووپشکان دەستێ خوە بوو. ل ژۆرێ گەزێ، دەردۆرا دو بۆستان، ب نەخەکی دقز گرێددان و شوونا وێ ب کێرەکێ دبرین و خوین ژێ دهەرکاندن، و یەکی نەنەخواش دەڤێ خوە دکر برینێ و ئەو ژەهر دمژت و توو دکر. (ئەب) دبێژن کو مرۆڤ سالێ سێ جاران کێردیێ بخوە، مار ب وی دادە تشت نابە. ئەو ژی زهێر تێ دەیە.

١٢٤) **پێدادانا رتلعانان**

رتلعان، پلندورە، مەزنە و ب پرچە. ب یەکی دادێ، دبێن هەتا ب قرتکێ ئێکێ د زبل کەڤێ، رەهەت دبێ.

١٢٥) **پێدادانا سێمسۆران (مێشەسۆر)**

دەما کو ئەو سێمسۆر ب یەکی داددە، شوونێ دوەرمە و سۆر دبە. دەرمان ئەڤ بوو، یان شیرکێ کەرکێن هەژیران ل شوونێ دهێشتن، یان ژی کەڤرەکی گەرمکری پێ ڤەدنان و هەو بوو، چێ دبوو.

١٢٦) **پديوەرمين**

هنەك ب خوارنەك ئان ڤەخوارنەك گەرم، گەر ب چ سەدەمێ دبە بلا ببە، پديێن خوە كولدبن و دوەرمن. ئيجار دەما پديا كەسەكى وها دبوو، دگۆتن كو سووراڤكێ د دەڤێ خوە وەردە، ئان ژى هنەكان دمسێ هەناران تێوەرددان.

١٢٧) **پرچێ هەراميێ**

هنەك ژ قچكێن نوو دبن، زەند و قيت و سەرچاڤێن وان ب پرچێ هوورن، ژ وێ رە دبێژن پرچێ هەراميێ. دايكێ شيرێ خوە دگوڤاشت سەر پاچەكى، و پێ جيێ ب پرچ، ئەنى و جێنيكێ قچكێ خوە مستددا، ڤێ رە دوەشيا.

١٢٨) **پرچێ ژنان**

ژنا كو پرچ پر لێ هەبە، دەرمانێ خوە ئاقيتە. ئاقيت ژى ژ شێكر و ئاڤێ و ملهلێموونێ د تەوكێ دە گەرم دكرن هەتا بەرى كو تير دبە رادكن، پاشێ وەكى بێنيشت دبە و د قيتان ددن، هەما ب پرچێ ڤە دزەمر. هەگەر هلكرن، پرچێ گشت ب خوە رە هلدكە.

١٢٩) **پرك** (ئينگ: Cholera)

يەك نفرا ل يەكى دكێ دبێژە: وەى پرك ب تە كەڤێ!

١٣٠) **پركێ مريشكا**

مەرا نەخواشيێ ژ مريشكد نەخوەش وەردگرە. مريشكێ نەخوەش دەڤ شل دبە. بەرف ژ سەرێ چاێێ گوندێ بێكێ دهانين و ددان نەخوێش، پێ چێدبوو. چاێێ گوندێ بێكێ بەرف ل چەلێ هاڤينێ ل سەر هەبوو. بەرف دهانين، كۆم دكرن، ب تۆماقد سيڤلەكان دكوتان، تۆماقك پەهن بوو، و كايێ پێ درەشاندن، ب قاسى دو پێچيان بلند، و پاشێ ئاخ بەرددان سەر، وەنا دما د بن كايێ دە. ل هاڤينێ دەرخستانا، و ب بيچخيێ ببرينا. ل شوونا بووزێ بكاردهانين. كورم ژى دكەت وا بەرفێ، كورمێ خوە هەبوو.

١٣١) **پێچ خوينبوون، پيچ خوينبوون**

ئاردكێ قەهوێ ددان سەر، برين دمچقاند.

١٣٢) **پۆروەشين**

دبێژن كوێ كو ژ بچووكيا خوە دە تم سەر سەرێ خوە بگرە، رۆ نەديێ، پۆر زوو دوەشە! ژن دەما كو پير دبن و پۆرێ وان ب بەر شێ دكەڤە و هلدبە پۆرێ خوە هەنە دكن. دبێژن كو ئەو ژ بۆ كو سەرى نەخورە و پۆر نەوەشەيە. مێر ژى هەنە پۆرێ خوە هەنە دكن.

### ۱۳۳) قچک د زک دا تێدەرخستن

دیا ب ناڤێ خەجا هسێنەك ل زکێ ژنا دنری، دزانی کو قچك لاوە لێ قیزە. سەدی سەد تێدەردخست و دگۆت: یاورم، مەرن خوە ل موعەیەنێ مەخن ل جەم توختورا. م گۆت: ئانێ، تو چۆ زانێ؟ گۆت: یاورم، ئەگەر وە دی زکێ ژنکێ تووژە، پێش دایە، زانبە کو قچك لاوە، و ئەگەر زکێ ژنکێ داکەتی بە و ل سەر نەوقا وێ تمبلکێ زانبە قچك قیزە، تەما هەگەر قیز بە دکەڤێ کێلەکا مالکێ قچك. و مە ل پرا تەجریبە کر و ژ سەدی سەد راستە. وێ دگۆت کو من ئەڤ ژ بزنا بری، ئەز زانم کارك مێ لێ نێرە. هسێ دێخل، ل گوندێ شیێ، ل چاڤێ کەچەکێ دنری، دزانی کو ئەوێ قچکا پر هوونێ لێ نا، و دزانی کو ئەوێ لاوا ئان کەچان وینە. ب هەوالدانا، د زەمانێ خوە دا جیرانی باڤکی م بوو، ب کێ را گۆتی هەڤێ قچکا پر هوونێ، و قچکێ خوە قیزن، لێ لاون راست دەرکەتیە و شۆرا خوە ب ج هاتیە!

### ۱۳۴) قچک ژبەرخومکرن

دبێژن کو ژنا کو بخوازە ڤەرنیکێ خوە چەکە، ئانکو ڤەرنیکێ یەك ـ دو مەهەکی د زکێ دێکێ دە، و خوەستن وی ڤەرنیکی باڤێژن و ژێ خەلاس ببن، دبێژن کو بلا پیبازەکێ ببرێژن و تێخن هەیایێ خوە، دو ـ سێ جاران وها بکە زارۆك دادکەڤە!

### ۱۳۵) قچک نەبوون، لاونەبوون

ژنا کو قچك نەدبوون، دچوون سەر شێخان و مسددان. بەنەکی سۆر ژی ل ناڤێ گرێددان، دگۆتن کو نابە تو ڤێ بەنکی ڤەکی هەتا قچکێ تە دبە. بەرێ، هەر کەسێ کو لاوێن خوە نەدبوون، مریشکەك قیل رەش دبرن ل قەرەجورنێ ژەرژێدکرن، مەهنێ لاوك ببن. هنەکان سنگەك دکوتان بەر زارەتا، وەك زارەتا شێخ جەمالدین، ئا کو د ناڤ گوندێن کۆکانێ، جۆقێ و دارگرێ دە، و وەکا کەرسانێ ل جەم گومدێ مەرسا و شیلتەتێ ڤە، و ب سەر دە خوینەك ژی درژاندن، و خێرات بەلاڤدکرن. کوتانا سنگ ژی جارەك تەنێ ب کەڤرەکی دکوتن، هەگەر کەت ئەردێ باشە، و هەگەر نەکەتێ، شکیا! هن ژنان ژی پشتی کوتانا سنگ، هێلکەك ژی دادان، و قچککی ژ دارك و پاچکان چێدکرن، و دکرنێ و دشداندن، دچوون مال، پێ ب قەنعەت دبوون، و ب هال دبوون. پر جاران هەگەر قچك ببوویا و لاو بایا، قچك ب ناڤێ شێخێ زارەتێ بناڤدکرن. ل وا تۆپراقێ جەمالدین پرن! هنەك دچوون بەر زارەتا مەهمە عەلی هافا گوندێ هەج خەلیل، بنێ گوندێ کوورا. پاچك ب زیارەتێ ڤە گرێ ددان، و سنگ دکوتان عەردێ، و دگۆتن: یا رەببی، خودێ مرازێ دلی

من بكیَ، خودێ لاوكی ب من دێ، ئە هاتم بەر تەیا مهمە عەلـی! دچـوون زیارەتـا شـێخ عەڤدرهمێن ژیا ل سەر رێكا باژارۆكا جندرێسێ كێلەك گوندێ كەعنی گەوركێ ژی. كـالكۆ هەبوو ل دەردۆرا باژارۆكا جندرێسێ، خورمەیەك یان هەژیرەك دهانی، ددا بەر دەڤـێ خـوە، و پێ دە دكر پس پس، دخواند، و ددا ژنكێ كو بخـوە. ژنكـێ دخـوار، قچـك دبـوون! ئەڤ مەسەلا ل بەر گوندێن مەیدانێ ژی هەیە.

۱۳۶) **قلباش**

پزكەێ پر ل دەستێن مرۆڤ تـێ، د كۆكـا نەینووكـان دە. پـر ب ئێشـە. دەرمـان ژی كۆمرێ دارا هێڤرزێ بوو. هنەكان ژی گوویێ مرۆڤان تێ ددان!

۱۳۷) **قنداقا قچكا**

زارۆكێن كو نوهـ دبن، گرێددن، دگۆتن كو ژ بۆ زارۆك نە سست بە! لێین پر باوەر دكـن و دبێژن دا كو هەستیێن خوە دۆخر دەرێن!

۱۳۸) **قرپكفسی**

گاڤا كو قرپكێ یەكی هلتێن و بینا فسان د دێڤ رە چەدكێ، دبێـژن قرپكفسـێ بـوویە. ئەو ژی گاڤا كو یەك پر تشتان تەڤ ل هەڤ دخوێ، وەك كوفتا و شـیرە و دۆن و فسـتقا، ب تایبەتی د رۆژێن جەژنا دە، چێدبێ. دەرمان ژی پەنچەك نیسك چەدكـن دەڤـێ خـوە و دهێرن.

۱۳۹) **قسر**

ئەو تێ واتەیا كو ئەو ژنا كو زارۆكێن خوە نابن. ژنا قسر دبـرن جەم ژنەك شـێخ و نـاڤ گرێددان. رەوشا گرێدانا وێ ژی ئەڤە: ب بەنكەك كەسك د سەر زك و پشتێ رە دبـرن و دو گرێك لێ دخستن، ئەگەر ب هال بیایا، هەر زك مەزن دبوو گرێكك ڤەدكرن!

۱۴۰) **قزرباشە**

سەرێ پێچیان، و هەری پرێ ژنان وە دبە، ژ بەر تەزەبوونا وان ژ بەر شوشـتنا كنجـان. ل سەرێ پێچیان، ژ گۆشت دە دەست پێدكە، وەكی هەبلووسكان تێ و سـۆر دبە، پـێ رە دەرە، دەرە هەتا نەینۆكێ خوە ژێدكەڤە، پاشێ ب خوە چێ دبە.

۱۴۱) **قودوز، هاربوون (ئا مرۆڤان مینا كووچكان)** (ئینگ: Rabies)

بەرێ، ئەگەر مرۆڤەكی كووچكەكی (سەگ) پێ بگرتا و ئەو كووچك هار با، ژ ترسـا كـو ئەو مرۆڤ قودوزی نەبێ (هار نەبە) د جـی دە ئەو مـرۆڤ دكـرن ئـۆدەیەكە تـاری رەش و چێل رۆژی كەسەك نێزیكێ وی نەدبوو ژ بلی كەسێ كو نان و خوارن دبر ژێ رە. پێویست

بوو کو نەخویش ئاف د پیالێن جامی یان ڤەبرقۆکی دە ڤەنەخوارا، و نینك د هونـدر ئۆدەیـا وی دە تونە بانا. پر گرینگ بوو کو نەخوەش خوە نەبینیێ. ژێ هن باوەر دکن کو نەخوەشیا قودوزێ ب لخوەکرنا کنجێن رەنگەرەش سڤك دبە. ل داویێ، گاڤا کو نەخواشی خۆرت بـوو و هێڤی ژ نەخویش برین و نێزیك مرنێ بوو، ئاری یان خـوالی ب سـەر دە دبێـتن و دمـر. گاڤا کو یەك ب یەکی رە دبێژێ: خوال ل سەرێ تە بێ! ئەو تێ وێ واتەیێ کـو مرنـا تە ژ خوەشبوونا تە باشترە، یان تو هاربوویە و هێڤیا خوەشبوونێ ل تە تونەیە. دەستێ خوە مـالا شێخ هەمیت، ژ گوندێ تنبێ بوو.

**١٤٢) ڤوژمرین، ڤوژمۆرەک و ڤەرمچۆکێن روو**

ژن، کەچا کو روویێ خـوە دقەرمچـی، ئـان ژی بەریـا کـو بقـوژمرە و بقەرمـچە، زێتـا زەیتوونان و لێموون تێددان. هن ژی خەیاران ددن سەر روویێن خـوە. دبێـژن کـو ژ هەڤ ڤەدکە و سپی دبە.

**١٤٣) قوون کورم** (ئینگ: Pinworm infection)

نەخوەشیێ قوون کورم، قوونا وی تم دخورێ و ل ناڤ گونـد دمەشـێ و فەدیـێ ژ بیـر دکێ و تم دێست داڤێ پاشیێ خوە و دخورینێ. گەر نەخوەش قچك بێ، گلێز ژی ب سـەر دەڤێ قچك دکەڤـێ و دەهرکـێ، و بالیفـا وی هەرتـم ب گلێـز دبـێ، و ئەو درانـێن خـوە دچکینێ و دەنگ ڤێ دکەڤن گاڤا کو خەو دکێ. جهێ هێکـێن وان کورمـان ل بەر دەڤـێ قوونـا زارۆکە. ئەگەر زارۆك پـر خورانـد، ئەو زوو گەرم دبـن و دبـن کورمـك یـان ب لەز دەردکەڤن دەرڤە و دیسا گەرا خوە دەست پێ دکن.

**١٤٤) ربک، روبک، رووبک**

نەخوەشیەکە ب زارۆکان تێ گاڤا کو گوهـ دەهرکن و لێم (کێم) ژێ تێ دەر و گلێـز ب دیڤـێ وان دکەڤە و بهنـا وان ساسـی و نەخـوەش دبە مینـا بێهنـا مریـان. ژ بەرژەنگـێن نەخوەشیێ ئەوە کو پاش گوهـ دقەلشە و کێرت کێرتی دبە و شل دبە، تو دبێژی قەی ئـاف ژێ دەهرکێ. دەرمانێ وێ هنەك زێتا زەیتوونان نیف گەرمی دخستن دەڤێ خـوە دە و پـرِ دکرنێ، و پشت رە پاشگوهێ زارۆك ب شـەفرێ کێـرت کێرتـی دکـرن و خوینـا قریـژ ژێ بەرددان تا رادوەستیا. گیایا روبکێ هەیە وەك پەرپارێیە، کۆکا خوە سۆرە. ئەڤ نەخواشیا کو ل چێرم دخینە، هنەك خودان دەست خوازیا خوە لێ دهێلان، چێ دبوو.

**١٤٥) سانجیا مالکێ ڤچک**

شێخەکی ل بەر پیێ چـێ، فشـقولێ کەرام د زەرکەك ئـاف دە دهەلانـد، و تشـتەك ب

دزى تەڤلىَ دكرىَ، ددا ژنا نەخواش، و وىَ ڤەدخوار بێيى كو زانبە كـو چ ڤەدخـوە، رهەت دكر!

١٤٦) **سانجيا زك**

كەسىَ كو زكىَ خوە سانجى دبە، دبێژن كو بلا كەموونا و نەهنەنـا بكەليـنە و ڤەخـوە. هنەك ژى دبێژن كو كەموون، لێموون و پچەك خۆ بكەلينن و ڤەخـون. ژنـا كـو نـوو زارۆك ئانيە و شير ددىَ ژى، دبێژن كو بلا كەڤچيەك كەموون د ناڤ رە بخوە، دا كو زارۆكىَ وىَ سانجى نەبە و نەپەرچفە.

١٤٧) **سەر بنى مها كەتن**

زارۆك خوارنەك لىَ نەدهات، نەخواش دكەت، دگۆتن كـو سـەربنى مهـا كەتـى. سـەرىَ مهىَ دبوو نەخوەش دكەت، بنىَ مهىَ دبوو نەخوەش دكەت. قەدەهەك تژى ئـاڤ دكـرن، و بێيى كو زارۆك پىَ بهەسيا، ژ نشكا ڤە درەشاندن سەر روويىَ وى. وا ڤەجنقينـىَ ئەو رهەت دكر. هنەكان ب تەنيا بنىَ برۆشىَ خاچەك ل ئەنى و يەك ل سەر زكىَ قچـك چێـدكرن، و گەرەك بوو كو هەتا وى خەوبكرا و رابايا، كەسى وا قچكا ماچ نەكربايا.ىَ تەنى تـىَ ددا ژى، گەرەك بوو كو دەستىَ خوە هەبايا. هن جاران بەرى كو زارۆك نەخوەش ژى ببايا وە دكـرن، دا كو رىَ ل بەر نەخوەشيىَ بشكينن. ژىَ رە دگۆتن ڤەگرتن. قچكىَ سـەربنى مهـا كەتـى ڤەدرشە، و ناڤ دەرە، و بينا ساسى ژ ديڤ تىَ، و چاڤ زەلال دبـن، و بژانـگ دبـن زۆ (ل هەڤ سوار دبن). هنەكان قچكىَ نەخـوەش دبـرن مـالا بەرەكێـت، مـالبەتەك ئێـزدى نە ل گوندىَ ئيسكا، دەستىَ وان هەيە.ىَ خودان دەست كەڤرى سيبا دكر ناڤ هـنەك ئـاڤ (ئـىَ پر ئاڤ ژ چالاڤىَ مريشـكا بـوو)، د زەركەكـىَ دە، و چيچـك شـەكر ژى تـىَ دە دهەلانـد. گەرەكە كو دايك و قچك ژ وا ئاڤىَ ڤەخون. پاشىَ رادهشت برۆشـەك بنـى ب تەنـى، و ب خوازيا خوە خاچەك ل سـەر ئەنيـا قچـك، و يەك ل سـەر زك، و بـازنگەك ژ تەنيـىَ ل دۆر زەندكىَ دەستان و ل دۆر زەندكىَ لنگان چێدكر. مەرج ژى ئەو بوو كو ئەو قچكا خەو بكە، و هەتا كو رابە، نابە كو تو كەس وى ماچ بكە. و قۆندراك چەرمى ژيا كـو ل وان دەران ژىَ رە تەيار تىَ گۆتن دهانين، و چيچك چەرم ژىَ دبرين، و ئەو ژى ب خوازيىَ ب تەنى دكر، و ب بن كنجىَ قچك دخستن،ىَ پر ب سەر پيـا ڤە دخسـتن. گەرەك بـوو كـو ئەو چەرمـا نەتىَ خويان، و نە ژى وەرە شلكرن. هن جاران كنجىَ قچك دشوشتن و ژ بير دكرن كـو وا چەرمكى ژىَ ڤەبكن، ڤێجا شل دبوو، و قچك ژ نوو ڤە نەخوەش دكەت! خـودانىَ دێسـت ژ نوو ڤە وە دكر. هەقى دێست ژى، ڤێجا تە چ دايىَ: ٢٥ وەراق، ٥٠ وەراق با. زێـدە نەدبـرن.

دگۆتن گەرەکە ببە، دا کو قچکێ وی نەخوەش نەبن! پاشێ داییکا ب خوە ژی قچکێ خوەێ سەربنی مها دکەت دەرمان دکر، ئەو ژی هانا بوو: وەختا کو هێڤ نوو دەرتێ، یان ژی دەرە، رۆژ گەرەکە چارشەم بە، دەم ئێکێ بەر رۆاڤا بە، قچکێ خوەێ نەخوەش دەست خوە دکە، و سێ گاڤا بەر هێڤێ دەرە، و پاشێ سێ گاڤا ب شوون دە ڤەدگەرە، و دبێژە: هێڤێ، عەجەرێ مە، هێڤێ، کەڤنێ وە! و پاشێ ب تەنیێ برۆشێ (گەرەکە برۆشەك کەلێ بە) ب خوە قیچکێ خوە تەنی دکە. چۆیەکی خوە ژی هەبوو، د سەر زك و پشتا نەخوەشان رە دبرن و گولمەك ئاڤ ددانێ، دگۆتن کوێ چێ ببە!

١٤٨) **سەرێشی** (ئینگ: Headache)

گاڤا مرۆڤ ب سەرێشێ دکەتن، دەسمالەك ئان ژی پاچەك د سووراڤکەك گەرمك دە دکرن و ل دۆر سەرێ نەخوێش دگەراندن و گرێددان، پێ رهەت دبوو. (ئەب) هنەکان ل با مە دچوون کوندرەکی گلۆك مەزن تینان و دقۆقلاندن و ژ هوندر ڤە پاك رێش دکرن و وەك کوما یام کووڤکا دکشاندن سەرێ نەخوێش، رهەت دبوو. هنەکان، ئاڤا قالچقێ گووزێ، رۆژەکێ دهێشتن و پاشێ ب هەنێ و سیرکەیێ و پیڤازێ ڤە دستران، ل سەر سەرێ نەخوێش رۆژەکێ دهێشتن هەتا ڤەدهەسیا. هنەکان ژی باوەر دکر کو هەگەر ژنا جێوی ئانیبە، دو جاران دۆلەمەیا خوە د سەر سەرێ نەخوێش رە ببە هوونە، چێدبە. هن جاران ژ بەر بلندبوونا زەرپا خوینێ، سەرێ مرۆڤان ب سەر هەڤ دە دێشیا. وا هنگێ کورمکەك هەیە ژێ رە دبێژن زەری، ئەو تەنێ د کانیان دە، د ناڤ ئاڤا زەلال دە تێ دیتن. زەری ب جێنیکێن نەخواشان ڤەدنان، ڤێجا زەریان خوە هەما ب جێنیکێ ڤە دزەمراند و خوین دمێت. دمێت .. دمێت.. مرۆڤ ددیت چۆ ئەو کورما تژی خوین دبوو و دوەرمی، هەتا کو دەرفەتا مێتنێ نەمایا، تەێ بدیا، پەت! ئەو زەری ژ جێنیکێ وەشیا و کەت خوارێ. خەلکێ باژارۆکا عەزازێ زەری ل ناڤ بازارا عێفرین د ساتلان دە دگەراندن. هنەکان ژی دگۆتن کو کلیتێ ل سێر خن! دەسمالەك دهانین وەك عەگالان دکرن و کلیتەك تێ رە دکرن، و ئەو کلیت بادان و پێ دەسمالا ل دۆر سەرێ نەخوێش دشداندن، رهەت دبوو. هنەکان ژی سێ دەق ل سەر جێنیکان وەك نوختکان، سێکۆشەیی دکوتان. سەرێشیا قچکان ژی زەلقێ مریشکا وەك لەسقەیان ل جێنیکێم قچك دخستن.

١٤٩) **سەرگێژی** (ئینگ: Dizziness)

کەسپك وەك دەرمان ب خوە دخستن.

١٥٠) **سەرشکین، برینا سێر**

هەگەر سەرێ یەکی بشکیا و پر خوین ببوویا، هەما پیڤـازەك دگوڤاشـتنێ و رادهشـتن زەلقا مریشکان و هنەك خۆ تەڤێ دکرنـێ و د برینـێ ددان و سـەری گـرێ ددان و دبـوو دەرمان و چێ دبوو. پیڤاز دکرن ناڤ شاشیەکێ و دکوتان و پاشێ چەند دلـۆپ دگوڤاشـتن برینێ وێ دن ددان سەر برینێ و گرێددان. گـۆ: ئەز چووچـك بـووم، ئەز ژ سـەر خـێن دا کەتم، و ئەز ل سەر سەری خوە هاتم خوار. سەری مـن د ج دا پەقـی. پتـێ مـن گـۆ: کـا قومریکێ ژ من را بگـرن. قـومر شـەرژێکر ـ عەیبۆلمەسـن ـ زکـی وێ ڤەکـر و کشـاند سەری من، و ب شەملکێ ل سەری من گرێدا. ب سـەر دا مـن خەو کـر، و سـەری مـن خوین د ج دا سەکنی.

(١٥١) **سەرما** (ئینگ: common cold)

سماقێ نەرم دکن، دپارزنینن، چەند سەری سیر و چیچك خۆ تەڤلێ دکن، و ڤەدخـون. ئەو دەرمانێ سەرمێیە. باوەر دکرن کو هەگەر نەخواشیا کو ب سەرمێ کەتی دەردێ سەرما خوە ژ یەکی رە هەوالدە، سـەرما خـوە ژێ ڤەدگـرە. بـۆ سەرێشـا درێـژ و پۆزهەرکانـدنێ، سیرکەیێ، بابۆنێجێ و زەهنتەرێ چێ ددن نەخوێش. هنەك ژێ تتوونا جگارێ دکن پـۆزێ خوە و ب نەفەسا خوە د پۆز رە دکشـینن، د ج دە فێـدە لـێ دکە، و ب دەربکـێ دە پـۆز دهەرکە و پاك دبە.

(١٥٢) **سنەتکرنا قچکا** (ئینگ: Circumcision)

پشتی کو زارۆك دبە، هنەك زوو و هنەك ژی دەرەنگ دهێلن کو وان سنەت بکن.

سـنەتکرن، ئـانکو برینـا چەرمـێ سـەر جـووجکێ کـو زێـدە، پاشـێ ژی پەمبـوونی و ئیسپرتۆنی و چیچك تانترۆت تێ ددن و دپێچن. بەرێ سـنەتجی چەنـتە دگەرانـد. ل نـاڤ گوندان دگەری. یەك دهات گوندێن جوومێ، نە ژ چك بوو، لێ ب کورمانجی دەنگ دکـر. ژ شەرقێ دهات. نەدهات ئلە ل پۆزێ بوهارێ، دەما کو چیچەکێ بەهیڤان بپەقینا. ل پـاییزان خەلکێ قچکێ خوە سنەت نەدکرن. سنەتجیێ بهاتـا گونـد، چ قچـك نەسـنەتکری هەبانـا، سنەت دکرن، وێ ل گونـد خەو بکـرا، و ب سـبێ رەێ دیسـا برینـێ قچکـا یەك ب یەك ساخی عکرا، و پاشـێ لێخسـتا، بچوویـا. هـن جـاران، چاخـا سـنەتجی ب گونـد دکەت، زارۆکەکیێ بانگ عکرا: سنەتجی! هەموو زارۆکێن سنەتنەکری ژ گونـد درەڤـین و ب چـۆلا دکەتن.

(١٥٣) **سپ** (ئینگ: Head louse)

ێ سپ دکەتن سێر، سەرێ خوە ب قایزاقێ دشوشت. و رشك ژی، پۆر تەڤـددان و لـێ

دگەرین و یەك ب یەك د ناڤ دو نەینۆکان دە دپەقاندن، قچ.. قچ.. دمرن. جارەکێ کەتن سەرییێن مالا کخێ، ل ناڤ گوند گەریان و قازیخە (قایزاق) دخواستن دگۆتن: ئەم کێ پێ سەری خوە بشۆن، سپ کەتنە مە. گۆ: جارکێ ژی، رەشید هەمۆ، رهمەتی، سەعەت چارا بەر دەستی سبێ، ئەمی ل هەلەب، د ئۆدێ دا ب تەنێ گول جانی خوە دنن. دیت گ ئەزی سەری خوە دخورینم! ل من نری و گۆت: مهەمە، تو سەری خوە دخورینێ. ئاقل تێ هلنەتێ، لێ ب گەمارە؟! ئەز کەنیام، کەنیام.. د من دا گرت و گوت: ئەهبابکی مە ل گوندی عەتمانا هەیە، خوە پر دبینن. تۆنی هەوالددن کەسك ژێ فەهمانتر تونەیە. دە رۆکێ گۆت: ئلّە تو کێ وەرێ با مە. ئیجا رەشید هەمۆ ژی ژ گوندی هۆپکا بوویە، هەما گوندی خوە ل هەمبەرێیە، گۆت: وەلە ئەز رۆکێ هاتم، تو تونە بووا گۆت: نابە، قەی تە مال شاش کربوو؟ گۆت: نا نا، نە وێ مالێ سجك ل بنا وەیە، ل دەستپێکێ گوند؟ گوت: ئەرێ.ی گۆت: ئەز هاتم، ئەز گیشتم دەستپێکێ گوند، زات، من دیت یەکی سەرمەزنی سەر دینایی سەر کابێ ژنێ، نزانمێ دێکە! د ج دا هەسەن گۆت: ئێوە، هەوا براکی منە. وێ ژێ را سپیا سەدکە و من وەنا دیت، رەشید دبێژە. لێ بەلێ هەسەن سار بوو، رەش هشینی بوو، ل خوە خجلی. رەشید گۆت: تە خێر چێر پیس کر؟ هەسەن گوت: لاو براکی من تم مەسقەریا دکە و دبێ ناڤ پۆری من سەعکە! رەشید گۆت:ێ مە سە ئەم مەسقەریا دکن ئەم ب ژنکێ خوە را دبێن: ناڤ هێلکێ مە سەکە، خێرە ێ وە ناڤ پۆر سەدکن؟

۱۵۴) **سینگ خەتمین، سۆلخانی**

هەگەر سینگێ یەکی بهاتا گرتن دکر خرخیز و زووزوو بهنا مرۆڤ تەنگ دبوو. باستق چیچکی گەرم دکرن و دیدنان سەر سینگێ نەخوێش. هنەکان ژی کوزستار دکەلاندن و هنەك هونگوف تەڤلێ دکرن و هەر سبەهێ ڤەدخوارن.

۱۵۵) **سۆرک** (ئینگ: Measles)

زارۆکێ کو ب سۆرکان دکەت، دگۆتن کو ئامان وی گەرم بکن بلا سۆرك د زك دە نەمینن، ئانکو ب سەر کو گەرمیا وی ٤٠ دەرەجەیە، هین ئۆرخان و بەتانی ژی دگرتنێ! دەما کو یەکی سۆرك دەردخستن، تم دبرن جهێ هێنك و تم سەری دوشوشتن و کەس بەرنەددان جەم ژ بەر کو ڤەددە. ئێ کو دەستێ خوە هەیە، دەرزی ئان ژی شیشەك گەرم دکر و ب زەندا نەخوێش، د ناڤبەرا لەپ و ئەنیشکێ دە، ب دو ـ سێ جیا ڤەدنا.

۱۵۶) **شەعنکی، ئاخر** (ئینگ: Epilepsy)

ئاخر، ئاخری، چەهنك، چەهنکی، سز، ئەڤ ب تەڤایی ناڤێ نەخوەشیێ نە، هەمی ژی

هەمواتەیەکن. کەسێ کو ئاخر تێیێ، ئێقل لهەڤ دخینە، ئان ئەم دبێژن کو دین دبە!

ب راستی ئەو نەخوەشیەك کۆك بێدەرمانە. هنەك دبێژن کـو ئەو ژ خـودێ دەیە، ئـانکو زکماکییە، لێیا راست پر کەس هەنە ب مەزنی شووندە ب وی دەردی دکەڤـن. ل گـۆریێن من ئەو دیتنە کو ب وێ نەخوەشیێ کەتنە، هنەك ژێ هەڤـالێن منـێن دبسـتانێ بـوونە، ژ پچووکیا خوە دە پر باقل بوونە، و ژیهاتی و ژیر بوونە ژی، لێیـا ئەز تێگهیشـتمە ئەوە، کـو ئەو کەسێن ئاخر تـێ وان، سـەدی سـەد ژ تەنگاسـیەکە ئـاوارتە وهـا دبـن، ئـانکو.. ئەگەر شـەواتیەك ژ نشـکاڤە تـێکەڤە وێ مـالا کـو ئەو تـێ دە، ئـان ترسـەکێ ببیـنن، ئـان ژی لێخسـتەنەکە دژوار، دەربەك ل سـەرێ وان بـکەڤە، قەهـرا گـران و درێـژ.. ئـووود. ژ هـن دەرمانێ کو هەوالـددان ژ وا نەخوەشـیێ رە، دبـرن جەم شـێخان، ژێ رە وەراق دکـرن، و هەبەیێن هێرسێ ددان وان، و دڤێت کو ت کەس رازك وان نەچوویـا و ئەو تەڤ نەدانـا، و نەخوەش لەلە دکرن ل خێتر نەدکەتن!ا هەری گرینگ ژی دڤێت کو وان ل ئەینێ نەنریانا. نەخوەش ل عەردێ درێژ دبە و هشك دبە، و دبە چرچرێ درانان. گۆ: قیزێ خوە نەخـوەش بوو، ئاخر دهاتن قیزکێ، برن جەم شێخکی. شێخ گۆ: ژێ را هجێب کـری، جـن کەتنیـێ. گۆ بترسیننێ چێ ببە. دونیا ژڤستان بـوو. گـۆتی وینعکـێ بەن، تـێکن جیکـی گەرم، مـلا نەلڤێ. بۆخ دانیێ، ئاڤ کەلاندنە، کرنە تەشتێ، و دار د سەر را دینـانە، جیـی وێ ل سـەر چێکرنە، و ئۆرخان چەکرنە سەر، و هەر یەکی ب گـوچلکی گرتـی، بـلا هەو بۆخـا پـێ دا هەرێ. و ڤێ تمی کری بەعربەعر، گۆە فەتسیم، فەتسیم. لێ! گۆتی بلا دامیش بێ! ئا قیزك فەتساندن. بنر دینبوون

۱۵۷) **شەکر** (ئینگ: Diabetes mellitus)

بـاتۆڤکێ دکەلیـنن و ڤەدخـون وەك دەرمـانکێ دژی نەخوەشـیا شـێکر رە. هـنەك ژێ نەخوەشیا شێکر لێ رە دبێـژن، کـو ل ئێخرینـی بـلا رۆ ب رۆ سـێ زەرك ئـاڤ ڤەخـوە، و کەڤچیەکێ ژ هوورکێ سماقێ ڤە و پاشێ ب خوارنا خوە رە بلا پیبازان زێدە بخوە.

۱۵۸) **شەلقاندن** (ئینگ: Intertrigo)

کەسێ کو ناڤبەرا پێچیان دپەقە و دشەلقە، ئاڤا خـوێێ دکەلیـنن و ب پێمـب تێـدن، چێ دبە. بنچەنگێ مرۆڤ، بەروور و هەر دەرەك گۆشـتێ خـوە تەر و نەرم، دەمـا دشـەلقە، سۆر دبە، بۆدرە تێددان،یا ژی ئیسپرتۆ ب پەمبوویەکێ، بەس پر دشەوتینە. بەری کو بۆدرە دەرێن ژی، ئاخا هوور یان ژی سیرێن جەلقی تێددان.

۱۵۹) **شەلۆقی بوون، شەلقی بوون** (ئینگ: Irritant diaper dermatitis)

زارۆکێ کو ناڤ شەقان شەلۆقی دبوو و ناڤ شەقان سۆر دبوو، قوونا وی ب ئاخێ دشداندن. ئاخن هوور دهانین، جهێ خوە مەخسووس هەیە، و ئاخ دبێتن، و دکرن ناڤ پاچەکی و پێ قچك دشداندن. هین هنەکان زێت ژی تێددان. مرۆڤێ مەزن ژی شەلۆقی دبێ و ناڤ شەقێن نەخوێش سۆر و شل دبێ و دخورێ و دشەوتێ، ب تایبەتی ژی د گەرمێ دە و ئێد قەلەو. دەرمان ژی ئاخێ هوور تێ ددان یان سیر دکوتان و تێ ددان.

### ۱۶۰) شەواتا بنێ لنگان

مرۆڤن هەنە تم بنێ لگێن وان دشەوتن. ژ خوە ئەو شەوتاندنا ژ هوندرێ لنگ دەیە، ئانکو تێکلدارێ تامارێن خوینێیە. دەما کو یەك لنگێن خوە دشەوتن دەرە ل سەر ئاخێ دمەشە، ناڤ عەردێ ئاژۆتی، ئاخا گژنیتی، پێخاس، هەفتێ دو ـ سێ جاران دمەشە، ڤەدهەسە. (مچ) هنەك پیڤازێ ل تەلاش تەنك تەنکی هوور دکن و دیدنن سەر و گرێ ددن. هنەك ژی ترپان تەنك هووردکن و دیدنن سەر. ئاڤ، شورر! هەتا ب دەرێ هانا ژێ دهەرکە.

### ۱۶۱) شەوتین

دەما کو دەرەك یەکی بشەوتە و گاڤا کو شەوات هین تەزە بە، هنەك دمسێ باجاننا، هنەك ژی مازۆتێ تێ ددن. پتا من ژ گوندێ کەفرسەفرێ، قالچخێ بەدەنا دارا مەرخێ دهێرا و دکوتا، دکر ئاردك، د شاشیەکێ رە دەرباس دکر و ب سەر جیێ شەوتی دە هەر کو شل دبوو، پێ وەر دکر و دپێچا. وێ شەوات زیا دکر و چێدکر. هنەك ژی جهەیێ قەوراندی، رەش دکن وەکی قەهوێ، پاشێ دکوتن و د شاشیەکێ رە دەرباس دکن، و ب جهێ شەوتی وەر دکن. هنەك ئاڤا کرێجێ و زێتا مالان تەڤ ل هەڤ دکن و دکن مەلهەم و تێددن. هەلبەت تێدان ژی ب پەرێ مریشکێ ئێکێ لێهێلن! و وەختا مەعجوونا درانان دەرکەتی، ئەو لێ دهێشتن، هێنك دکر. هنەك ئاڤا عەتوونانێ بێخوێ ب پێمب تێددن. (مچ) لنگێ من ب شەتمانێ ماتۆرێ شەوتی و من پر کشاند و هەر دو رۆوا توختر ل جهم من بوو. پاشێ دۆستکی ژ گودێ ماراتێ ژ من را چاوێرن هشك هانی، هوور وەك بۆدرێ بوو، من دینا سەر جیێ شەوتی، ژ ئیسپرتۆ پرتر شەوتاند و وەك چیمەنتۆ پێڤا هشك بوو و بەرنەدا هەتا گ چێبوو.

### ۱۶۲) شکین (شکەستن) و ژجچووینا هەستیان

گاڤا مرۆڤەك ل چك دەست یان لنگ یان دەرەکە خوە بشکیا، ئەو ب چاردارێ رادکرن، و دچوون چیچك هەورە و دو ـ سێ هێك تەڤ هەڤ دکرن و ل سەر پاچەکێ رێدخستن

و دیدنان سەر دەرا کو شکەستی، و د سـەر وی پـاچی رە پەرچەیەك کـولاڤ تینـان، رنـد گەرم دکرن و دیدنان سەر، و پشت رە دو تەختك - یەك ل سـەر و یەك ژی ل بـن وێ هەستی - دیدنان و مەکن دشداندن هەیانی سێ هەفتیان دیسا جارەکە دن دوبارە دکرن تا هەستی بجەبریا و جیێ خوە بگرتا و ب هەڤدو ڤە بزەمریا و چێ ببایا. (ئۆهـ) باڤێ من ڤـا کارا کریە. دەما پی، لنگ، دەست..ێ یەکی بشکیا، ئان ژ جـی بچوویـا، دهـاتن جەم بـاڤێ من. هەمای ژێ رە بکشاندا، خورینی ڤێکەتـا و تێکەتـا ج، پاشـێ هێلیـنەك مـالا ب زۆرێ دشکاندن و ئاڤا ویا سپی ژ زەرتکا زەر دەردخست، دادرڤاند سـەر سـابوونەکە مـالا، ئەو ژی ب کێرەك تووژ رێش دکر و ب دارکەکێ تم لـهەڤ دخسـت، هەتـا کـو وەك شـما هەڤـدو دگرت. بەریا وێ ژی، چ لنگ با چ دەست با سە، ب ئاڤا گەرم و سـابوونێ رنـد دشوشـتن، پاشێ ئەو نسقا دیدنا سەر خاساکێ رێدخست و ددا سەر دەرا کو شکیە ئان جهێ هەسـتی ژ ج چوویە و گرێددا، هەتا هەفتەیەکێ، پاشێ سست دکر. هنەکی دوەرمیا هەلبەت، پاشـێ سێ رۆژ دچوون، ڤەدکرن. ژێ رە دگۆتن: نسقێ هلینا، و ژ کەسێ کو ب ڤا کـاری رادبـوو رە دگۆتن: جەبارجی. کەمێـل ژی ددان سـەر دەسـتێ شـکیی ل شـوون نسـقا جەبارجیـا. هێلینێ خاڤی و شیر ددان نەخـوێش هەتـا کـو رهەت دبـوو. پرانیـا جەبارجیـان ل دەوێـر ئەلمین جەبارجیێ، پاشێ فتلین مەریا. هن جەبارجییێن چکێن ناڤـدار: عەڤـدی هوسـکێ ژ گوندێ مسکێ، هەمی تۆپۆ ژ گوندێ ئاقیبێ، شێخێ خفشی ژ گوندێ بورجەبدەلا، مهەمەد بەکرۆ ژ گوندێ بێنێ (ڤی زەلقا مریشکان ژی تەڤ هلـین و سـابوونێ دکـر و دیـدنا سـەر جیێ شکیایی)، و کەمال ژ گوندێ خالتان. ل گوندد چێ،ێ پـر لـنـگ د گـووزکێ دە ژ ج دچوون ژ بەر کو کەڤر و زنار ل سەر رێکان پرن. گۆ: یەکـی جەبـارجی ل گونـدێ خلالکـا هەبوو ناڤ مەهموود بوو. سنگکی داریی مەزن کوتابوو ئۆرتا هەوشا خوە ل جیەکی هشـك، بەنەك ژی پێ ڤا بوو. نەخوەش ل بەر سنگ دسەکناند و پاچك دکر ناڤبەرێ لنگ و سـنگ دا، وێ سنگ مەکن ب لنگێ وی ڤا بشداندا. نالڤێ. سەرێ سنگ ئۆرتا خوە قەلشییە. چڤی هەسنی ب قاسی دەستێ مەرا دهانی و ئـالیێ ویـێ زراڤ دکـر قەلیشـتەکێ سـنگ، و ب دەبوور ل وی چڤی دخست. چڤێ داکەتـا ئێچـی سـنگ. هەر گ چـڤ دادکەڤـێ، بەن ل لنگێ نەخوێش دشدێ. دە بەعر بەعرێ نەخوێش بەر ئەزمانا دچوو.ێ بگۆتا: هات ج! (ڤا) ل گوندێ جۆقێ مـهەمەدێ عەلێـوی، و ل گونـدێ خەلنێـرێ سـمعەلێ ئیبـی هەسـێ، و ل ئێفرینێ کەمال هەبوو. ل گۆر ئاگاهیێن من، نسقێ زەلقێ جـودایە و پـێ لنگـێ هەیوانـا و مریشکا دجەبراندن، و زەلق تەڤ ت تشتی دن نەدکرن، ژ بەر کـو گاڤـا کـو ل سـەر پـێچ

هشك دبێ، ژا هێلنێ و سابوونێ مەکنترە. (ێ) دەما کو هەستیێ شکیی شاش جەبری با ژی، خورمە دهانین، دستران، و چەند رۆژان دیدنان سەر، دا کو ژ هەڤدو بشەلێ، پاشێ جارەك دن دشکاندن و ژ نوو ڤە دهانین جهـ ئووهەگەر هەستیەك یەکی بپەقیا ژی، موویێ بزنان دهانین، و تەڤ چیچەك خۆ د ئاڤێ دە دکەلینن، و شەڤ ب شەڤ دیدنن سەر هەستیێ پەقیایی، و گرێ ددن. ئێشەك هەما ڤێ رە دسەکنی.

### ۱۶۳) شیڤین و شەڕدین

زارۆکێ کو پر دشەڕدە و ددێگری و تەباتی ناکەڤیێ، دگۆتن کو ئەڤ تم و پر دشیقە، هەرن بشەوتینن! ئەو ژی ب فەتیلەك گلۆڤەر ل سەر ئێر گەرم دکرن و ب زۆرێ دگاندن بەر ئووریێ ویهنەکا تەعلی و ئانیسۆن دکەلاندن و بەرددان دەڤێ قچك. هنەکان ژی کەعکەیەك مەزن ژ هەڤیرێ نێن چێدکرن، و قچکێ نەخواش (نە تەنێ شەڕدین، وەکی دن ژی، وەك نەخوەشیێ زەرکێ، و سەربنیمهاکەتنێ..)ێ کو هین روونانە، جارەکێ د وا کەعکێ رە دەرباس دکرن، و دگۆتن: خودێیۆ، ڤا نەخواشیێ ژ سەر ڤا قچکی راکە! هنەکان دگۆتن کو قورشینێ ب سەر دە بهەلینن، دا کو چاڤد هەسوودان برژێن و بپەقن. پاریەك قورشین دهانین، د کەڤچیکێ دە ل سەر ئێر دهەلاندن، و د جهـ دە کەڤچ ب سەر ئاڤەکێ دە دقولافتن د هافێ قچك رە، قورشین هەما ڤێ رە دجەمدی و فیگۆرەك چێدبوو. ڤێجا د وا فیگۆرێ دفکرین، و وەك چ با، دگۆتن ئەو سەبەبا نەخوەشییێیە. و هین ژی هنەك وە دکن. وا دەمنا ل گوندێ کۆمرەشێ ژنەکێ وە کر.

### ۱۶۴) تا و قزرمە (ئینگ: Malarya)

نەخواشێ تا و قزرمێ، بێیی کو های ژ خوە هەبە، پتکەك ب دەرەك وی ڤەدنان، ب سەر دە ڤەدهەسی. پتك ژی فتیلەك پاچییە، سەری دشەوتینن و پوفێ دکنێ، سۆر کزۆتی دکن. ئەینی دبە وەك سەرێ جخارەیان. پتا من جارکێ، ل دەردۆرا ۱۹۵۰ ان دە، پاشگوهێ باڤێ من وە کر. هنەکان بەنکەك هشین ژ دەزیێ مالان دکرن دەستێ خوە دژی نەخواشیا مالاریایێ، وەك خوەژێپاراستنێ. هنەکان ژی دەزیەك هەفت گرێك لێ دخستن، و دکرن بازنگ، دکرن دەستێ نەخوێش. دگۆتن کو بلا تا ـ قزرمە ژێ بقەتە. هەگەرێ دەزی گرێدایا ئێرمان بایا، وێ هین چێتر بایا. قەلانجیێن ئێرمانی دهاتن گوندان، وان گرێ ددان. ئاپێ من دگۆت کو وێ فێدە دکر، وێ هنەکان نەخوەشی ژێ دقەتی. کالکی من رهمەتی شەش مها کشاند، برن چقاس توختر، شەش مها ژێ نەقەتی و نەقەتی و نەقەتی! هەتا ب خوە ژێ قەتی. رۆیێ سفتەهێ سار ببا، هوگ هوگ.. هوگ هوگ.. هوگ هووووگێ بچوویا.

و پاشىَ ژيىَ گەرم ببا و بگۆتا ئۆرخانىَ ژ سەر من چەكن. چەكن، چەكن. دگـۆت ئـاڤىَ ل سەرى من عكن. هانا دمر دمر. چتل ئيش بوو نزام؟!

١٦٥) **تـاولبوون** (**قەلەوبوون**) **و عوورفلتين** (ئينگ: Obesity)

دەما كو يەك زێدە تاول دبە، دبێژن كو بلا ئەو ل سەر عەردىَ خەو بكە، ل سەر جلـىَ، و نە ل سەر دۆشەكىَ. هەروها دبێژن كو بلا ل سەر تەختەكى خەو بكە، و ب ئيڤارىَ نێن نەخوە و خورنا وى گەرەك سڤك بە. عوور فلتين ژى هەيە. هنەك ژ مرۆڤان عـوور دفلـتن و ئاڤس دبن، نە ب واتەيا ژنا كو بزك بە! ئاڤسيا مێـران ژى هەيە، ئەو ژى دەمـا كـو عـوورىَ يەكى دفلتە و قەلەو دبە. پرانيا ژنان پشتى زارۆكان تينن وها دبن، لىَ گەلـۆ مێـر ژ بـۆ چ ئاڤس دبن!؟يا راست ئەو نەخوەشيەكە، دەرمانىَ خوە ژى كێمە. هنەك دبێژن كو بەريـا كـو مرۆڤ وها ببە، ئانكو دەما كو پىَ هيس كر كو عوورىَ وى دفلتە، گەرەكە پشتەكىَ گرێـدە، و هەروها گەرەكە بخەبتە، بلڤە و پر خەو نەكە.يا راسـت ژى ئەوە، ژ بەر كـو عـوورفلتين د زەمانىَ بەرىَ دە تونە بوو، ژ بەر كو بەرىَ كار، لڤ و خەبات پر بـوويە و هەروهـا ژى ژن و مێران پشت گرێدان و تەڤى وىَ ژى كارىَ ژيانىَ زۆر بوو و مرۆڤ خى درژانـد، ژ بەر وىَ ئەوقاسى تـونە بـوويە. هـنەك بـاوەر دكـن، كـو كەرگەزك قەلەوبـوونىَ داتيـنە. كەرگەزكـىَ دكەلينن، و ئاڤا وىَ هلتيـنن و دپـارزنينن. دەربـىَ هنەكـى ژىَ ڤەدخـون. دبێـژن كـو ئەو دۆهنىَ مرۆڤ دهەلينە. زەنجەفيلن هەيە وەك تۆزێيە. هنەك وىَ دكەلين و ڤەدخـون، خـوە پىَ زەعيف دكن.

١٦٦) **تـايا ڤچكا، ڤزلەمكىَ ڤچكا**

دەما كو زارۆك گەرم دبوون، ماست لىَ دهێشتن.

١٦٧) **تەلاق، تەلاق هاتن**

د زكىَ مەريان دە چێدبوو، تەڤى كو نزانين ئەو چيە، لىَ دبێـژن كـو وەك تەلاقەكـىَ د هوندر زك دە دێشيا. دەرمانىَ وىَ ژى، نەخوەش دبرن جەم يەكى خوديشوور، و وى شـوور ب سەر زك ڤەدنا. ب پەهنبوونىَ شوور ج ب ج دگاند زك و چێدبوو. دگۆتن فلانـى تەلاقـىَ خوە هاتى. تە دى جارنا مەرا دبەزىَ، بن پارسيىَ مەراىَ چەپىَ دێشىَ، دبێـژن تەلاقـا مـن هەلى. ئەو ب دو تۆنا دەرمان دكرن. يەك، ڤەدشەوتاندن. شاشيەك دپێچان و دكـرن فەتيـل و ڤێدخستن و پىَ ڤەدنان. ئا دوديىَ، نەخواش درێژ دكرن، و ژنشكا ڤە دەست لىَ رادكرن، و دترساندن، چىَ دبوو!

١٦٨) **تەرگين** (**ئا ليڤ و دەستان**) (ئينگ: Xeroderma)

دوعن قوت تێ ددن، نەرم دکە.

١٦٩) **تەڤزاندنا لنگ** (**ئێن مرۆڤان**)

گاڤا کو یەك لنگێ خوە دتەڤزی، دگۆتن کو لنگێ خوە تم ل عەردێ خینە و بێژە: تەڤز.. تەڤز د (فلانکەسی) دا! و (فلانکەس) ئێ کو مرۆڤ ب زمان دکە، دڤێ مێرێ دو ژنان بە، ئێ رهەت ببە! (ئۆهـ) جارەکێ ئەز ل مالەکێ بووم، و لنگێ من تەڤزی. دە ژنکا مالکێ - هەنێ - دو مێر کربوون. من رابوو لنگێ خوە ل عەردێ خست و گۆت: تەڤز.. تەڤز د خالتیکا هەن دا!

١٧٠) **ترسبوون، بسایێکەتن** (ئینگ: Phobia)

ئەگەر مرۆڤەك بترسیا، ب لەز دگۆتن کو هەرن زەرکێ هەجێ وینن ژ مالا فلان کەسی، و سێ - چار زەرك ئاڤ ب زۆرێ ب وا زەرکێ پێ ددان ڤەخوارن، هەتا هێدی ببا.

١٧١) **ترشبوونا سەردل** (ئینگ: Gastroesophageal reflux disease)

دەما کو سەردلێ یەکی ترش دبە، هنەك کەڤچیەك کەموون دخون، هنەك ژی نیسکان چەدکن دیڤ و هن ژی ئاڤا گەرم ڤەدخون. هنەك ژی کۆکا سووسێ دجوون، رهەت دکە.

١٧٢) **ترتری**

هێلك دوەرمن. گۆ: بەرێ جینارکی مە هەبی ترتری بی . برن سەر توخترکی. وی ژێ را چخارە کشاندن چارە دیت! رۆوێ دو پاکێت ڤەدخوارن، لێ دوو بەر نەددا سینگێ خوە.

١٧٣) **ڤەرشیا د ماکینا دا**

کەسێ کو ل ماکینا، ترامبێلان دنە و ڤەدرەشە، دبێژن کو بەریا کو سوار دبە بلا کاسەك ئاڤا شێکر بهەلینە و ل ئێخرینێ ڤەخوە، ڤەنارەشە. هنەك ژی دبێژن کو ئەو ل پێشیا ماکینێ نە و پێشا خوە ببینە ڤەنارەشە.

١٧٤) **ڤێقولبوون**

زارۆکن هەبوون، بووندا کو دبوون، بێقول بوون. ڤێجا زکێ وان دنەپخی. پیرەك هەبوو، شیشکەك د ناڤ ئێر دە سۆۆۆر دکر، و د شوونا قولا قوونێ رە دەرباس دکر، و قول لێ ڤەدکر، و زارۆك و بەختا خوە.یا دما، ویا دمرا!

١٧٥) **ڤرکیبوون** (**ناڤچوویینا ب لەز**) (ئینگ: Diarrhoea)

بەرێ دگۆتن ئەگەر هوون ب نافێ کەتن، بۆییکەکێ بخون یان پەنچەك چایا هشك یان قەهوەنن هشك داقورتینن.

١٧٦) **وەرما سەرهەستیا** (**شوونا دەربەیان**)

دەما كو يەك ژ دەوارەكی بكەتا، ئان ژی كەڤرەك ل دەرەك وی بكەتـا، د ج دە دگـۆتن: ئاڤن سار لێ بكن. و دەمـا كـو بـووز دەركەت ژی دگـۆتن كـو بـووزێ دیـنن سـەر، ژ بـۆ نەوەرمە. و دەما كو مـرۆڤ دەرب ل پیـێ وی بكەتـا، ئـان ژی پێچیـێن خـوە بكەتانـا بەر كەڤران ئان هەسنان دە، ئان تشتەكی گران لێ بهاتا هەڤ، پشتی دەمەكـێ خـوین تـێ دە رەش دبوو، هینگێ دگۆتن كو ب سەرێ دەرزیێ دەر بكە، بلا ئەو خوینا تـێ دە رەشـبوویە دەركەڤە. سـەرێ دەرزیـێ گەرم دكـن و شـوونا وێ دەربـێ دەردكـن. خوینرەشـبوونا بـن نەینۆكان ژی ب سـەرێ دەرزیـا گەرمكـری دەردكـن. ژ شـوونا دەربەیـان رە دبێـژن رەش هشین. هنەكان پاتەتە تەنك قوت دكرن و دیدنان سەر جیێ ژ دەربەیان هشین بـوویەیە. ژ بۆ هلپەكینا ئەنیێ ژ بەر دەربەیان ژی، وان وەراقەك نگل دیدنان سەر و ددەوساندن.

١٧٧) **وێران** (ئینگ: Tuberculosis)

دەردێ زراڤ، ئان ژی وێران د دەستپێكا چەرخا بیستان دە و هەتا پشتی نیڤیا وێ پـر د ناڤ خەلكێ چك دە بەلاڤ ببوو. هنەك ژ شێنی چێ دبێژن ڤێران. هنەكان ب نەخوەشـیا شێرپەنچێ رە ژی دگۆت وێران. ب كۆزستارێ دەرمان دكرن. هنەك ژی هەنارێ دقەشێرن، و گشتی دخون، تەڤ كولكی دیك ب تەڤ پەردەیان ڤا. رۆژێ سـێ هێكـان ژی ب خـاڤی ڤەدخون، و زۆرێ ددن خوارنا مریشكان و قۆشـت. كـالەكی ل گونـدێ بلبلـێ گـۆ: جەورك شەرژێكن، و ببریژن، و ب نەخوێش دن، پێ رهەت دبە، لێ گەرەكە كـو نەخـوەش نـزانبە ئەو گۆشـتێ چـیە. ژ نەخوەشـێ وێرانـی نێزیـك نەدبـوون. هەگەر هـاڤین بـا، ئەو ژ گونـد دەردخستن، و هۆلكەك ژێ رە ل دەرڤەیی گوند چێدكرن. هنەكـان ژ نەخـوێش رە چـادر، دو كم ژ گوند دوور ڤەدگرتن. نەخوێش هاڤینا خوە ل بن وێ دەربـاس دكـر. ل زڤسـتانان ژی ئۆدەیەك وی جهێ هەبوو. نەخوەشێن ب وێرانێ كەتـی ئەڤ گـۆتنێن ل خـوارێ ددان پێ هەڤ وەك تەمبیەكێ، دا كو خەلك نەخوەشیێ ژ وان ڤەنەگرن:

دەردێ زراڤ كەت هناڤـا مە / كەزەب برینكـر ل هاڤـا سـینگێ مە / د مە دا هشـككر خویناڤا مە / خەراكر قوەت و ناڤێ مە. / بلا كەس قەت نەخوە ب كەڤچیێ مە / قچـك ژی ڤەنەخون ب تاسا مە / تم بلا دوور بن ژ دۆرا مە / خودێ بخەفرینـێ ژ دەرد و كـولا مە. / ژنكان نفر دكرن، دگۆتن: وەی وێران ب كەزەبێ تە كەڤە!

١٧٨) **خەمەرێ**

نەخوشیەك قچكایە. مەخسووس خوە ل یەكی دگـرتن و دچـوون سـەر. وی خـاچەك ب تەنیا بنێ تەوكێ ل ئەنیا قچكێ نەخـواش چێـدكر، چـێ دبـوو. گاڤـا كـو ئەم زارۆك بـوون و

خەمەری دبوون دیا من دچوو سەر تەعتان چاویرەك ب ناڤێ پوونگا سەر تەعتـانێ پەل هـوور و بێهن خـوەش بـرەف دکـر و تەڤ تەعلیـێ دکـر و تینـا مـال و ئـاڤن دکەلانـد ب قاسـەر بەرۆشەکێ و ئەو پوونگ دخستیێ و نیڤ ساەتەکێ دهێشت دا کو پێ دە ڤەدێ، و پشـت رە دیا من سەرێ مە دشوشت و ل داوییێ ئەو ئاڤا ب بهنا پوونگێیـا پـر خـوەش ب سـەر مە دە دکر و ئەم رادبـوون. پشـتی وێ ب دو سـاەتان ئەم چـێ دبـوون ژ خەمەریـێ و رەنگـێ مە ڤەدبوو و مەعدێ مە ژی ڤێ رە ڤەدبوو.

١٧٩) **خەرفین** (ئینگ: Dementia)

دبێژن کو کالەمێرەك چوو سەر توختر، توختر گۆت: کو دەر تە دێشە ئاپۆ؟ کالێ گـۆت: وەلە پشتا من ئێکێ بقورفە، پر دێشە. توختر گۆت: ئەڤ ژ سالایە. گـۆت: چـاڤێ مـن رنـد نابینن. توختر دیسا گۆت: ژ سالایە ئاپۆ. گوهێ من نابیسن. گۆت: ژ سالایە. زکێ من دێشە. ژ سالایە. ئەشتارا مـن نەمـایە. گـۆت: ژ سـالایە. ل تـالیێ کـالێ زمـانێ خـوە ژ تـوختر را دەرخست و گۆت: یە..یە..یە.. توختر گۆت: ئەو ژی ژ سالایە ئاپۆ!

١٨٠) **خەتمینا پۆز**

دەما کو پۆزێ یەکی ژ سەرمێ دخەتمیا، توتـوون دکشـاند. و هنەکـان ژی هەر قـولەك پۆز تەناك سیر کێر دکر و دکر بێڤلان، پاشێ دهەرکی.

١٨١) **خەتمینا تامارێن دل**

باتۆڤکێ دکەلیـنن و ڤەدخـون وەك دەرمـانکێ ژ خەتمینـا تامـارێن دل و ژ نەخوەشـیا شێکر رە ژی. دبێژن کو ئەو تامارێن دل هەموویان ڤەدکە.

١٨٢) **خەورەڤین** (ئینگ: Insomnia)

کەسێ کو خەوا خوە ب شەڤ نەهاتبا، زەرکەك دەو ئان چەناقەك ماست دخوار ڤەدخوار و بیبازەك د بەر رە، کو خوارنا خوە چ دبا بلا ببا، وەکی بەنجێ پشتی روب ساەتێ دکەت.

١٨٣) **خلام** (ئینگ: Whitlow)

د کێلەك نەینۆکێ دە دەرتێ. گۆشتێ سەرێ پێچیا دخوە. دەر دکن، رەهەت دبە.

١٨٤) **خلبە**

ئێ کو خوین ڤێ رە پر دبوو، گەرەك بوو کو خوینێ بدی. خوین ژ تامـارەك ئەنیـێ ئـان لنگـان ئـان بنکابـان بەردان. خوینـا تیـر دەردکەت، ڤەدهەسـیا. هنەکـان ژی دەمـا کـو خوینتیربوون و خلبەبوونـا خـوینێ ل وان دهـات، زێـری بەردن سـەر. بـاڤکی مـن خـوە عەلماندبوو وەختلوەختسز، دوەساند پێ عەزیزێ کوڵەك ژ گوندێ سەنارێ، دهـات خـوین ژ

پاشبنێ كابێ بەرددا. شەفراك خوە كربوو ناڤ دارككى، وەك چۆ كێردووسك د دەستكێ كێرێ دا، ب زۆرێ سەر دەردخست و دیدنا سەر تامارێ خوینێ. ناڤكی وێ تامارێ هەیە ژ بیرا م چوویە. (خێرا خوە ناڤێ تامارێ پرس كە.) هەما ب شڤككێ؟ لێدخست و خوینێ دكر ڤیستنی! لاو تلبلك خوین ژێ دچوو، مە گۆت: باڤۆ هانا ناب، ئێ تویێ بمرێ، دگۆت: ئاۆۆۆۆواخ ئەز ڤەهەسیم!

١٨٥) **خرِ ڤورفین، كیرشكین**

هەگەر زۆر زێدە ل كیر وەرە كرن،ێ بقورفە و خوینێ تێ دە كۆم ببە. دەرمانێ وێ بێستق ل خرِ دپێچن هەتا كو چێ ببە. یەكی ژ گوندێ بێنێ گۆت كو رۆژەكێ وی خەو كربوو، گایەكی پێ لێ كر، خرِ شكاند!

١٨٦) **خولام** (ئینگ: Leprosy)

نەخوەش دبرن مالا شێخ ل گوندێ قەسرێئەلێ. ئەو دەستی وان بوو، خولام ب رەنگ گیایەكێ دبرِین، چێدبوو.

١٨٧) **خور** (ئینگ: Smallpox)

سەرچاڤێن نەخوێش نقر ـ نقری دبەێ كو ب خوریان نەكەتبوو، دچوو داركەك دهانی، و د خوریێ ڤێكەتی ددا، و سەرێ دێرك د ناڤ خورمەیەكێ ددا و ئەو دخوار. خوە ئاشلە دكر ب ڤا یەكێ!

١٨٨) **خوریێ ئاڤی** (ئینگ: Chickenpox)

دو جورەیێن وێ هەنە:

١. خوریێن ئاڤییێن رەش: ئەو پزرك سۆر بوون و سەرێ وان پەقرمە دبوو، و ئاڤێن زەر تێ دە هەبوو. مخابن ئەڤ جورەیا شوونا وان هەبلیسكان قول دمان و نەدچوون میناا پزركێن خۆرتەنیێ. دەرمان ژی ئەو بوو كو سەرێ قچك زوو ـ زوو نەدشوشتن، و ئەگەر بشوشتنا ژی ئەو بێ سابوون و هنەك كیل نەرم دكرن و پێ سەرێ وی دشوشتن. ئەڤ جورەیا ئەگەر تێكەتا زك، و هناڤان خوری بگرتا، ئەو زارۆك زووتر دمر، و ئەگەر زارۆك ب سەر ڤان خوریێن رەش دە ب سەرمێ بكەتا، دگۆتن كو زارۆك هەسپەر بوویە، و پشت رە ساتلجانی دبوو و دمر.

٢. خوریێن ئاڤییێن سۆر: رەنگ و گەود و قەوارەیا وان وەك یاێن رەشن، لێ شوونا وان قول نەدبوو و زارۆك نەدمر. دەرمانێ وێ ژی كیل و ئاڤا بێ سابوون بوو، و پێویست بوو كو زوو زوو سەرێ زارۆكێ نەخوەش نەتێ شوشتن، و وان هەبان نەجەلقینن و پێ نەلیزن.

(ئۆھ) نقتك نقتكی دبە و نابێ کو نەخوەش خوە بخورینە. ھەر کو خوە خوراند، لێ پر دبن.

١٨٩) **خورخورا د خەو دا** (ئینگ: Snoring)

کەسێ کو د خەو دە دکە خورخور، دبژن کـو بـلا بـالگیێ خـوە بلنـد بـکە، و ل سـەر کێلەکێ خەو بکە. ھنەك ژی دبێژن کو سۆلێن وی دینن بەر دێڤ! لـێ بێھتـر دبێـژن کـو وی بھەزینن بلا ب خوە بھەسە، کو رابە.

١٩٠) **خورخورا سینگێ قچکا**

دەما کو سینگێ زارۆکان بێشیا و نەفەسا وان تەنگ ببا، دچوون بەزێ کەھرکان تینـان، هوور هوور دکوتان، و د وەراقـێ دهێشـتن، و ئەو وەراقـا قولقـولی دکـرن و دیـدنان سـەر سینگێ لێوك، چێ دبوو. ژنەکێ ژ گوندێ بێکێ، ھەگەر سینگێ قچکەکی ب خورخور کـرا، زێتن گەرم دکـر و ل سـینگ دھـێلا و پاشـێ جەریـداك دھـانی و ب دەرزیـێ قـول لـێ ڤەدکرن، و دیـدنا سـەر سـینگێ قچـك، و کـنج ب سـەر دە لێـدکرن. ھەتـا ب سـبێ وە دهێشت، قچك رھەت دبوو.

١٩١) **خوینبوون**

ھنەکا دەزیێن مالکێ پلندر دیدنان سەر برینێ، د جی دە خوین دسەکناند و خوین تیر دکر. **خوونبوونا پۆز (رسکینا بڤّل)** (ئینگ: Epistaxis)

ئەگەر مرۆڤەك ژ نشکا ڤە خوین ژ پۆز بھەرکیا، دەرمانێ وێ قالقێن ھێگا ل بەر تاڤەکێ رنـد ھشـك دکـرن و پشـت رە دکوتـان، رنـد ھـوور دکـرن و دبـوو بـۆدرە. ھـنەك بـۆدرە ھلدکشاندن یان د ئیچێ پۆز وەر ددان. ھەما ڤێ رە وا خوینـا دسـکنیا و قـوت دبـوو. ئەڤ گوندێن مەعملا و عومەرا و دەردۆرا وان وە دکرن. (ئۆھ) ل ناڤ شـێرەویان مـۆرکەك خـوە مەخسووز ھەیە، ب نەخوێش دخینن، ژێ رە دبێژن „مۆرکا خوینێ" ئان „کەڤرێ خوینێ".

١٩٢) **زەعلەتان (پەنچەشێر)** (ئینگ: Cancer)

ھنەکا تەنێ کێردێ ژ بۆیی نەخوەشیا پێنچەشێرێ بکاردانین.

١٩٣) **زەرکا رەش**

ژ بـۆ زەرکـا رەش ل جەم مە عەنجـووریێ کەرا بکـاردانین. دو سـێ دلـۆپ ژ ئاڤـا وێ عەنجووریێ دکرن بێڤلان، دگۆتن کو پاشێ ئاڤا زەر ژ پـۆز دھەرکە ھەتـا کـو ئەو زەرك رھەت دبە.

١٩٤) **زەرکێ، زەرکینێ، زەرتکێ، زەرکێ** (ئینگ: Jaundice)

دەما زارەك زەرتکی دبوو، گوڤدێ خـوە تەڤ زەر دبـوو، رادبـوون دیـدنان بـن یـان بەر

چرێ. تمی چراك سپی لێ دگرتن و سێ تەنە سیر ژی ب سینگ ڤە دختن هەتا دفتلـی . هنەكـان سـێ چلپـك خـوین ژ بنكەركـا بەردان و سـێ رۆژان پـارزی دگـرتن و بلخـور نەدخوارن. هنەكان ژی زارۆك تازی دكرن و هەسـنەك رنـد گەرم دكـرن و ب سـەر زكـێ زارۆك ڤەدنان، یان ژی ئالیێ كەزەبا رەش ب هەسنەكی گەرم دشەوتاندن، و پشـت رە رۆژ ب رۆژ شیرینی، مینا هونگوف، هەلاوێ، و دمسێ شێرینێ رەزان هەیا سالەكێ ددان زارۆك تا كو زارۆك چێ ببوویا و تایا زەركێ ژ سەر بچوویا. چارەكرنا ب رەنگان ژی هەیە: كنجـێن رەنگ سۆری ل خوە دكن! هنەكان ژی هەفت تەنە سیر، مـۆركەك هشـین و زێرەكـێ ڤە، دكرن بن بالگییێ نەخوێش، رەهەت دبوو! هنەكان ژی هەفت تەنە سیر ب سـەر پیـێ قچـك دخستن. ئەمینێ هەج كەسكۆ ژ گوندێ گەمرووكێ، تەعل تەڤ ئاڤێ دكـر و گەرم دكـر و پێ سەرێ قچكێ كو زەركی بوویە دشوشت و وەنا دپێچـا، دگـۆت كـو بـلا وا ئاڤـا پـێ دە ڤەدە. سبێ دن دیسا وە دكر، و قچك چێ دبوو. هنەكا ژی پاش گوهان دبڕی. پتا من فاتـا ـ شێخ پاش گوهێ باڤكێ من بەری ڤێ ب شێست سالی بڕی. هنەكان ژی زارێ نەخوەش دبرن بەر قووچەكێ ل دەشتا گوندێ گەمرووكێیە، ل ور ئاشەك هەیە ژێ رە دبێژن „ئاشی هەسەن سـەیدێ". ئـاڤ ژ ئـێش دپـژقە. نەخـوەش ددان بەر وا ئـاڤێ. گەرەك بـوو كـو رۆ چارشـەم بـا، و بەری كـو رۆ هلهاتبـا. ل گونـدێ عەنـابێ، نـاڤ تـاتلقێ ژی، جـیەك هەیە نەخوەشان دبن ور. زەركەك ژی هەبوو ل جەم یەكـی ئێـزدی، هنەكـان ئەو دهـانین، پـێ سەرێ قچك دشوشـتن، رەهەت دبـوو. هنەكـان ژی ئێچـی كێفجـارانێ وەك ئاڤكـا هێكـانە، بەردن دەڤێ قچكێ كو زەركی بوویە دە. هنەكان قاپاخا پشـتا كێفجێـر ڤەدكـرن، زەركـێ وێ ب خاڤی، دكرن كەڤچیكێ و ددان قچكێ زەركـی بـوویە. ل گونـدێ كۆكـانێ پـرا ئەو خواری. یەك ل عێفرین هەبوو پاش گوهێ نەخوێش ب شەفرێ دبـڕی و خوازیـا خـوە تـێ ددا.

**١٩٥) زهێـر لەمیشـی بـوون (ژەهرگـرتن، ژەهـری بـوون، ژەهـراوی بـوون)**(ئینـگ: Foodborne illness)

ئەگەر یەكی تشتەك بخوارا و لێ نەهاتا و ڤەرشیا و ناڤ بچوویا و ئاقل ژ سێر بچوویـا و رەنگ باڤێتا و بخەنقیا، زانین كو ئەڤ زهێرلەمیش بوویە. هەما هنەك شـیر ددانـێ و د دەهـ دەقەیان دە ئەو وەك پەنێر پەنێری ڤەدرشی، و دگۆتن: ڤەرشە هەتا توێ تەعـل دكـێ دەر، وێ گاڤێ ئەو رەهەت دبوو. ئەگەر شیر تونە با، سیراڤكا خۆیێ ددانێ ژ بـۆ ڤەرشـێ. كەسـێ كو زهێرلەمیش دبە، كو سەدەم چ بە، د جی دە لێ بێلی دكە. گەرەكە وێ خـوارنێ بەردە

و قەت تشتەکی دن نەخوە و تەنێ پێچیا خوە د ئاڤێ دە عکە و ل لێڤێن خوە (ب) هـێلە. زهێرلەمیشبوون تم ناڤ دەرێ و ڤەدرشێ.

١٩٦) **زکێش**

چاخا ب زکێشـێ دکەتـن، قەرمیـتەك دکـرن نـاڤ ئێـر، گەرم دکـرن، و ئـاڤ پـێ دە درەشاندن، ڤێرمیت دگۆت ڤژژژژ! و دوو ژێ رادبوو، قوون تازی خوە د هافێ رە دگرتن. ب نەخوێش رە دگۆتن: بلا وا بۆخا ب تە دە هەرێ. هەگەر نەخوەش مرۆڤێ مەزن بـا، نکـانی قوونا خوە تازی بکرا، پاچەك دیدنان سەر قەرمیتـێ گەرم، و ل سـەر روودنشـت. قەرمیـت گەرمیێ دامیش دبە. ژ چۆلێ دهانین.

١٩٧) **زمان کۆستەکی**

کەسێ کـو هەرفـا „س" وەك „TH"ا ئنگلیـزی بلێـڤ دکە، ئەم ژ وی رە دبێـژن زمـان کۆسەتەکی. سەدەم ژی، د کۆکا زمێن دە ئەیارەکی وەك وایی کو ب باسکێ پێرچەمکـێ ڤە پەهن هەیە، ئی کەسێ کۆستەکی زێدە پەهنە. هنەك ژێ شەفرە دکـرن، زمـان ب رهەتـی دلڤیا. کو قوت نەکن ئەو زمێن دگرە، پێ ڤە گرێدابییە ساینکێ . هنەکان تامارا بـن زمـێن ب دەرزیێ ژ هەڤدو دکرن یان ب شەفرێ ئەو تامار قوت دکرن، ژ بەر کو ئەو د بـن کۆکـا زمێن دەیە و نەدهێشت کو زمان بلڤە و قچك باخڤە.

١٩٨) **زیوان**

ئەو رەشکێن کو ل سەر روو و گوڤـدێ مرۆڤـان وەك دەقـان دەرتێـنە. دەمـا کـو تـو وان بگوڤێشی ئەو دەردبن، لێ پر هشـکن. ل سـەر رووچکـێ مـن پـر دەرکەتـن، دەمـا مـن ئەو دگوڤاشتن، دەردکەتن و شوونا وان قول دما، و تا نها ژی شوونا وان بێلییە. هنەك زێت دکـن کو نەرم ببن و پاشـێ مسـددن، دەردکەڤـن. ئەگەر ئەو تەزە بە و دەرکەڤە، شـوونا وێ بێلـی ناکە، لێ کو قەرت بوو، ئەو کۆرت دمینە. هن ژی ناکا ئیچـێ قەلەمـێ „یـگ" ژێ دەردخـن، ئەو نەیلۆنێ وەك خەرتوومانێ کو بۆیە تێ دە، و ب قوونا وی ددن سەر رەشـکێ و تـێڤەددن، ئەو زیوان دەردکەڤە.

## نەخوەشیێن ئـاژالان

١٩٩) **باوبوونا پێز**

پەز نەخوەش دبوو، نکانی بمەشیا، تینان د دۆر زیارەتەکێ رە (وەکا کەرسانێ، ل نێزیکا گوندێ مەرسا و شیلتەعتێ ڤە) چەند جاران دگەرانـدن، و کەهـرەك خـوە ژی وەك قوربـان

سەرژێدکرن، پەز چێ دبوو.

**٢٠٠) برێخێکەتن (ا دەوێر)**

دەما کو دەوار ب رێخێ کەت، چاویرێ ژ سەر قوت دکن، ئێم کێم دکن و دەرمـانەکی ژێ رە چێ دکن، وەك چلۆیێ رەزا، یا چلۆیێ دارا بۆییکێ دکەلاندن و ددانێ. هنەکـان ژی ملهلێموون و چایێ ددان دەورێ کو ب رێخێ کەتی، دسەکنی. میـا کـو ب رێخــێ دکەت ژی، ژێ رە نێزیك ـ نێزیك دووڤ و بندووڤ دشوشتن تا کو ژێ ڤەدبوو

**٢٠١) بریندارییا چووکا**

هەمامۆکەك رۆژەکێ دمەشیا و نکاری بفریا. دێ.. دێ، مە زانی کـو ب بـرینە. مە چـوو گرت، من دیت کو پشت شکیە، کەڤر ل تالیا پشتێ کەتیە، و باسکەك خوە شکیە. دیا مـن گۆت: زێتێ زەیتوونا و خۆیێنێ تێ بدە بـلا هنەکـی نەرم ببە، بکەویـنە و هێـدی هێـدی برینێ بمچقە. دە وەك دبێژن: دەست ژ مە، سەبەب ژ خودێ.

**٢٠٢) ب تێنە کەتن، تەنە لێکەتن، ئێم لێکەتن**

ژ نەخوەشیێن پێزە. میێ پر ژ تەنە هەز دکە، پاشێ ژ جهێ. ژ کایێ پـر هەز نـاکە. کـو تشت نەما، کـایێ دوخە. تێـنە ژی پـر بخـوە، ئـێ بمـرە. دگـۆتن ب تێـنە کەتـی. تـاڤلێ سەرژێدکرن، دگـۆتن بـلا فەتـیس نەرە. سـالێ ٥ ـ ٦ مێێـد کـالکێ مـن وە دبـوون. مـی دپەرچفە، زك را هانا دبە، نەخوەش دکەڤە، کـابێ خـوە دشـکێن و دکەڤە عەردێ و نکـانە بمەشە و گلێز ژ دێڤ دهەرکە. ئێ پێز تو کێ ل بەر بی. ل ڤر چێری، بلا تمـی ل ڤـر بە، بلا وێدە نەرە. پەز تێر نابە. شڤانێ تەمبەل ژی، پەز بەرددا پرێزەیان و روودنشـت، و پێـزێ بخوارا و بخوارا وێ ب تێنە کەتا. ئەم دبێـژن „تەنە لێـدکەڤە"، „ئـێم لێکەتـیە". دەمـا کـو دەوارەك ب سەر جهێ، گێنم دکەڤە، زك ددە بەر، لێدکەڤە، لۆما دبێژن کو قـرارەك خـارنێ هەیە. ژ بەر وێ، گەرەکە کو ئێم ب هەساب رۆ ب رۆ وەك هەڤ بدن دەوێر. جارەکێ، دێ و باڤێ من چوون گوندێ کەفرسەفرێ، دەوات هەبوو، ئیجا برایێ منێ بچـووك ل مـال مـا. دیا من گۆت: رەشید، قوربان، گاڤێ ئێمنی بدە چێلێ لێ نێن پر نەدیـێ! (مە بەرێ نـان د ئاڤێ دە نەرم دکر و تەڤ ل کسپێ دکـر و ددا چـێلان). دە رەشـیدێ مە هەر دعەجـزی، دچوو تەشت دادگرت و لۆش ئێڤر دکر، هەتا ئێڤارێ. بـاڤکێ مـن گـۆت: ئەم هـاتن مـال، چێل ئێکێ بمرە! وەلە درێژ نەکر و مر. د وی هالی دە، ئەگەر دەوار ب سـەر تێـنە دکەڤە، د جه دە ب رێخێ دکەڤە. تەنەلێکەتن، پەرچافەکێ چێدکە و کەف ب دێـڤ دکەڤە و نـاڤ تم دەرە. کو پر زێدە خواربە ژی دمرە، کو فلتی ژی، هەتا بیسـت رۆژان تـم رێخــێ دکە و

رند ناخوە. ئەرێ نە نەخوەشییە، لێ د جھ دە دکوژە کو پر خواربە، و بێھتر نێری و بەرانان ڤە! (مچ) ل گۆر ئاگاھییێن من ئەو نە نەخواشییە، لێ گاڤا تێنە پر دخوێ و ئاڤێ ڤەدخوێ تەنە دپەرچفێ و د زك هلناتێ، ژ بەر وێ تەڤگەرا زراڤان دسەکنێ و دمرێ. سالا ١٩٨۴ ان ئەز چووم گوندێ عەلبیسکێ مالا مەھمەدێ ئیبش، رەھمەتی. وا دەمێ تەمەنێ وی نێزی نۆدی بوو. من ئەو ب شۆرا خست، گۆ: براز! ئەزی ل سەر خوە بووم، کێ وێری شۆرێ من بشکاندا! رۆکێ مالا مە تەنە رێخستبوو، من گۆت: ھاژ بزنا عکن بەرمەدن سەر تێنە. پشتی دەماکی، من جارکێ سەکر بزنێ د سەر تێنە دانە! ئەز خول بووم و من چیفتە ژ دار دینا و من ھەر پێنج بزن ل سەر تێنە کوشتن. پشت را گۆتن: ئەمێ گۆشت بخون. من گۆ: وینێ عەکێ من بخون! من خوشاندن سەر سێرگۆ و من ل ور گەمراندن و من نەھیشتن بخون. (ژ بەر کو شۆرا وی شکاندن و ھای ژ بزنا نەکرن و بەردان سەر تێنە). یەك دن؛ گۆ: میڤانکی سەیدێ دیکێ ب قەدر ھاتبوو، و وێ رۆیێ ژی بەران ب سەر تێنە کەتبوو. دە سفرە دینان و سەرێ بەرێن دانین پێشا میڤێن، ئێکێ عبێ بوورم! لێو گۆ: قران ڤێکەتی، ھینگی تەنە خوار.. خوار، بھەجی و مر! سەیدێ گۆ: تە شەقاند! و دەست ئاڤێت بەریکێ، کێر دەرخست، چەکر لێو و گۆ: راکن ڤێ سفرێ و بەرانی دن شەرژێك. وەکی دن، ژ بۆ ھەمی نەخوەشیێن دەوارێن قەبە، ل با مە دبێژن کو ئەگەر تو کاربێ قەسیلێ گێنم و جھەیێ تەزە د سالێ دە سێ جاران پێدیێ، ئەو دەوار ژ بنی ڤە نەخوەش نابە.

### ٢٠٣) بتربوون

خوینا بنکەرکا، ئەز باوەرم کو ژ بنێ گوھێ دەوارێ قەبە و بتر بەرددان دا کو بسەکنە. ئانکو قاسی بتر دبوون، خودانان پێ نکانین، نکانین زمپ بکرانا، خوین ژ بنکەرکا بەرددان. ب سەر دە دەوار دتەپسی و تمی گول خوە دنا! ئەگەر مرۆڤەك ژی بێھن قوت بە، فەھم نەکە، ژێ رە دبێژن: ما خوین ژ بنکەرکێ تە بەردانە؟

### ٢٠۴) چۆر، چوور

چۆر ب مریشکان ژی دکەڤێ و ڤەدگرێ و کێم ژێ دفلتن. ب باوەریا من، ھەر قرکرنەك ئاژالا ڤێ رە دبێژن چۆر. چاخا کو چۆر ب مریشکێ دکەڤێ، ل دەسپێکێ گولخوە دنێ، و ھێدی ھێدی تەڤگەرا وێ کێمدبێ ھەتا کو کووت دبێ و ئاف ژ نکل دھەرکێ و دمرێ. ئێ جا کو گولخوەدنا، مە سەرژێ دکر. مریشکێن مە چەند جاران چۆر ڤێکەتن، و مە سەرژێدکرن و مە دخوارن، لێ ئەم نەخوەش نەکەتن. چقاس مریشکێن تە ھەبن و چۆر ڤێکەت، ھەفتەیەکێ قرکرنا وان درێژناکێ، لێ ھەگەر تەك ـ تووك ژێ فلتین، ئەو ت

جاري دن چۆر پێنكانێ. گەر ژنەك ژ مالباتەكێ بخەيديا، دەست ڤەدكرن و نفر دكرن و دگۆت: وەی چۆرێ مريشكا ب وە كەڤێ! ئانكو تو كەس ژ وە نەمينێ. دبێژن چۆر (چوور، جوير) ڤێكەت. كلامەك فۆلكلۆری هەيە، ديا من جارەكێ گۆت، دبێژە: بريس، بريس. ڤێ دۆلابێ، چۆر ڤێكەڤێ خلاس نابێ! ئانكو پەز پرە، تا كو جۆر ژی ڤێكەڤە، داويا خوە نەتێ و خەلاس نابێ. گۆتنەك كەڤن هەيە ل چك دبێژە: چۆر كەت گا، رێ كەت سا! ئانكو گا نەخوەش بوو (چۆر كەتێ)، ڤێجا دەولەتا كووچك (سا)ئە. گاێ بمرە، و كووژك ژێ گۆشتێ وی بخوە.

**٢٠٥) دەرنە**

ل گوندێ شيێ ب ئەو كونێرا مەزنا دەوێر رە وە دبێژن. هنەكان بەنيشتێ سماقێ ددان سەر، دەردكر.

**٢٠٦) گورەپی**

دبێژن: كەرێ مە گورەپی بوويە، نكانە ميزعكە. كەر گورەپی دبن، يانێ دوەرمن و گور دبن، يانێ توويێ خوە ژێ دوەشە و سۆلخانی دبن و دكن خرخيز، و تەپەگۆزی دبن، يانێ لنگ ب بەر هەڤ دكەڤن و ل سەر دێڤ دەرن عەردێ، و هار ژی دبن، وەك قاترێ چاميش، يانێ مەرا پێ نكانێ!

**٢٠٧) گوربوون**

گاڤا كو كووچك، ئان هەيوانەكی دن، گور دبوون، چەرم و عەيارێ وان دپەقين و دخورين، خوە دگەڤزاندن. هنەكان ئاڤ و خالی ل ناڤ هەڤ دخستن و تێ ددان، هنەكان ژی زێتا شەوتی تێ ددان.

**٢٠٨) كەڤرێ گورچكێن دەوێر**

گۆ: قاترەك مە هەبوو، شەڨا فەرە دكێ. ئەم نزانن ئێكێ ميز كێ، ئەم نزانن ئێكێ تەرسێ بكێ. ئێكێ بمرێ! من ب چۆلێ دا قەوتاند. خوە ل عەردێ تۆلدكێ. من گۆ ئەز ڤی هەيوانی سەكم، چ سەببە. ـ عەيبۆلمەسن ـ خوە بەرددێ و ميز ناكێ. من سەكر، د سەری بۆريێ دا تشتكی زەر دكێ. من گۆت ئەز ژێ را دەرخم، خەتميە نكانێ ميز كێ. لا هانا وەك چۆ تو بزنكێ بدۆشێ، من گرت، و من ب داركێ وا قەشماقێ ب سێر ڤا من راكر، و گوڤاشت. من دی گۆ: پەرت! وەكی كەڤراا هانا درێژ ـ عەيبۆلمەسن ـ ژ بۆريێ ميزێ پەكيا. پەكيا، من دی گۆ: گوششش! گوشنی ڤێكەت و ميز بەردا. تەنەكاك ميز بەردا. و هەو بوو، تو جار دن وە نەبوو.

**٢٠٩) کێچ**

دەما کو کێچ دکەڤن دەوێر، دەرن قادووسەك ئاڤ ل کۆزێ درەشینن و سەمادنی چەدکنێ، پێ کێچ دمرن.

**٢١٠) کولبوونا چچکێن (گهان) دەوێر**

چچکێ دەوێر کو کول دبوون، زێت تێددان.

**٢١١) کولبوونا کەزەبا دەوێرا رەش**

دەما کو بزن تم دکوخە و ژێ رە دبە تەهبەت، دبێژن: کەزەب کولە! دەرمانێ کولبوونا کەزەبێ بەرێ مە دمسێ هەنارا، دۆندرمە ددایێ، بەسێ پر چێنەدبوون. نها توخترەك تێ، دو سێ دەرزیان ددە مە دبێژە کوت ڤرکنوو!

**٢١٢) کورم**

زێتن بەرددان پۆزێ دەوێر، و چەدکرن. دەڤ ژی دبە، لێ پۆز ژ بۆ فتکێ پۆز پاك بکەیە، و گەر ب پیسیێ رە نەرە،ێ د پۆز رە چەکە.

**٢١٣) نەمووس**

دبێژن „نەمووز" ژی. نەمووس دکەتن مریشکان، سەر پشت و سینگ و ستوویێ وان دلووتکین، لێ هەری زێدە هافێ پشتا وان دلووتکێ.

**٢١٤) پێور لێخستن**

ژ نەخوەشیێن پێزە. ناڤێ نەخوەشیێ ژ ناڤێ ئستێرکا پێورێ هاتیە، ژ بەر کو ئەو ئستێرك د دەستپێکا بهارێ دە خوویا دکێ و ئەو نەخواشیا ژی د دەستپێکا بهارێ دە ل پێز دخێ. کالێن مە باوەر دکرن کو ئستێرکا پێورێ پێز نەخوەش دکێ. گاڤا کو پێورێ ل پێز دخست، پەز دکوخی. ناڤێ دەرمانێ وێ ژی ئارنگە. پەز سال ب سال، پشتێ قوساندنا وان ب هەڤرنگێ، ئارنگ دکرن. ئارنگ د سەر پشتا پێز ل هافا دووڤ، ددان دا کو پێور لێ نەخینە و دەوار نەخوەش نەکەڤە. کەسێ کو وە دکر، چیچك هری ب دەست خوە دکر و د ئارنگێ دە دکر و تێ ددا. جارجاران ژی ب سەر پیێ قچکان ڤە ژی ددا، ب تەڤ کنجان ڤە، دگۆت داکو ئەو نەخوەش نەبن!

**٢١٥) پد هاتن، داماق (داماخ) هاتن**

گۆ: بەرگیرك مە هەبوو، داخێ مە یێم دکر، جهە شل دکر. نکانی بجوویا. بەر درانا تژ خوین دبوو. یەکیێ ب سێر بگرتا و مەیێ شووژن بهانیا، هوتێ عکرا، هوتێ عکرا.. و ڤور..ڤور.. ڤور.. دیێیێهـ خوین دهەرکێ هەتا پاك دبوو. وێ بخوارا، چ جهە چ کا.. چ بایێ

بخوارا، نە ئەرێ نە نا! دەوێر خوە كۆك نەدلڤاند. ل هەزێ دهات. هنكا دار وەكی ليوانا دكـر ديڤ. دبێن داماقێ خوە تێن. گ داماق هاتن، پد خوين دكەڤێ، و گۆشتێ پـديا ب سـەر درانا دكەڤێ، ژ درانا بلندتر دبێ، دەوار نكانێ بهێرێ. هەرهال داماخ گۆتنەك تركييە. يەكـی ئەرمەن دهات دەوار نالدكرن، وی وە دكر، و ئەم ژ وی عەلمین.

٢١٦) **پركا مريشكا**

ئەو نەخوەشيەك ڤەگوهێزە، مريشكان ژ هەڤ ڤەدگرتن، و تالانا وان دهات. گەرەكە كـو لاشێ وان يان بناخ بكرانا يان بشەوتاندانا. دەولەتێ هەر سال دهاتن مريشكێ گونـدان تەڤ ئاشله دكرن. (ژا) بەرێ، هەگەر خەلكێ بـدينا كـو مريشـك دمـرن، هەمـا مريشـكێن خـوە دخستن شكەتێ و دەری ل سەر دگرتن و كـزيەك پـێ دە بەرددان و ڤەنەدكـرن. دگـۆتن پركا مريشكا هاتی. دەرمانا خوە تنە بوو.

٢١٧) **ڤەڤزبوونا كووچكا**

دەما كو كووچك قەڤز دبە، و عەكا وی گرێك گرێكـی دبە، نكـانە ب هێسـانی عەكـبكە. ڤێجا دەرە چاويرێ دخوە دا كو گوويێ وی هنەكی نەرم ببە، و زۆتكا وی نەێشە دەمـا كـو عەكدكەيە. ل چك ژ تشتێ ئالۆز و هەڤگرتی رە دبێژن: وەك عەكێ كووچكايە! ئـانكو گرێـك گرێكييە، و زوو زوو ژ هەڤدو ناكەڤە. و يەك جاران ئەو چاويرێ دخوە ژ بەر كو جانێ خـوە ڤيتەمينا ج و هن كانێن كو د گۆشت دە كێمن، دخـوازەيە. جارجـاران ژی، كووچـك دەرە چـاويرێ دخــوە دەمــا كــو خــوارنەك لێنەهــاتبە و بەرنەخواشــی كەتــبەيە. ڤێجــا دەرە رەنگچاويرەكێ دخوە، و ب سەر دە ڤەدرشە، و زك ڤەدهەسە.

٢١٨) **قوتكرنا درناڤێن دەوێر**

نالبەندجی هەبوون دكانەك خوە ڤەدكرن، ئان ژی بێ دكان، ل نـاڤ گونـدان دگەريـان. ل گوندێ شێ ئيبۆێ عەشكەشێ، د پەی رە كورێ وی ئووسب (ئەبۆ عەنـتەر)، ئەو كـارا دكرن. درناڤێن دەوێر دەما كو درێژ دبوون، ژ بەر كو دەوار نكاری بمەشيا، قـوت دكـرن، و پشتی قوتكرنێ نالەك ب چار مێخان ل بن دخستن.

٢١٩) **رووجی، رۆژێ**

نەخوەشيەك پێژە، دەما كو دەوار رووجی دبوو، دگۆتن كو رۆێ پر لێخسـتيە، رادبـوون ئارنگ لێ دهێشتن. پۆزێ پێزێ نەخوەش ب چلم دبێ.

٢٢٠) **سانجيا دەوارێ ڤەبە**

دەوار دەما كو سانجی دبە، خوە تۆل دكە، و لنگان ل عەردێ دخينە، ئێكێ بمـرە. گـۆ:

رۆکێ عەرەبکی چۆلێ ب سەر بەرگیرکی سانجبوویی دا ل چك هات، ئۆمد ژێ برپبوون، گیا گۆت ئێکێ بمرە. چوو د قولپیککێ دا ـ عەیبۆلمەسن ـ میز کر، و هانی بەردا قولاقا. پێنج دەقە نەمان، بەرگیر بوو قرد و رابوو سەر خوە، بوو ئار.

٢٢١) **سۆلخانی**

ئەڤ نەخەوشیەك دەویرە، نەفەس تەنگ دبە و دکوخە (هـم)، سـینگ کـول دبە و دکە هیسك هیسك. ئێ پر دەوارێ قەبە وە دبە.

٢٢٢) **تەبەک**

دەوار د ڤـان دەمـێن بوهـارێ دە ب تەبەکـێ دکەڤە. تەبەك ژی وەك لێنەهـاتنەکێیە، خورکە. هـنەك ب لنگـان دکەڤە، هـنەك ب دێـڤ، دەڤ کەف ددە. تەبەك نەخوەشـیەکە ژا ڤسکێ گرناترە. دەما کو دەوار ب تەبەکێ بکەتا، جارنا ل دێـڤ دخسـت، دەڤ کـول دبـوو، دمسێ هەناران،یا ترشا قۆرق تێ ددان.ێ پر ل لنگان دخست و کووت دبوو. دیا من دبێژە: د ناڤبەرا هەردو سمێن می و بەرخان دە وەك متەکێ ژ گۆشت هەیە، دبێـژە: مە ئەو متـێ گۆشتی قول دکر، سەری قوت دکر و مە سمێن دەویر ب چار پێچیان دکـر مـازۆتێ، چـێ دبوو. (مچ) کو پەز ب تەبەکێ بکەڤێ، کووت دبێ. دەرمان ژی، خۆیێ د ترشێ سـماقێ دە دهەلینن و لنگان دکنیێ.

٢٢٣) **ڤسکی، ڤزکی**

نەخوەشیەك دەویرە. دەما دبێـژن کـو دەوار ڤسـکییە، ئـانکو ب سـەرمێ کەتـیە، و پـر دکوخە و دکە خر خیز، بڤلێن وان پر دهەرکە و وەکیێ ئێلپکی سـینگ تەنـگ دبە. و کـو دەوارەکی ڤرنی بە، پێ دمرە. ل جزیرێ ژێ رە دبێژن „خونان".

٢٢٤) **یانقەرە**

یانقەرەیێ ل دێویر دخست، و وێ دەوارێ قەبە د جی دە دکوشـت. خـودێ زانـێ ژی ئەڤ جەلتـایێ دێـویرە! گاڤـا یەك ژ یەکـی/ ئـێ ل چـك هێـرس دبـێ ژ بەر پێکنەانینـا خواستەکەکێ ڤە، ژێ رە دبێژێ: یان یان ل قەرەیێریێ تو وە بکی!

٢٢٥) **خەساندنا دەوارێ نێر**

عەلووشێ بەکرۆ، عمکێلێ کال، کەرێن نێر ل گوندێ شیێ دخەسـاندن دا کـو هنەکـی هێمن ببن و تم هلنەپەکن سەر مانکەران، و ژ بۆ کو پێ کانبن و کارێ خوە، جـۆتێ خـوە پێ بکن و تم بتر نەبن. ئیجار خەساندنا وان ژی، ئەو هین کوری بوو، ئەو تینان، گرێـددان و وەك عەمەلەتەکێ ژێ رە دکرن، و کیرێ کەرێ ئان کوریێ د بن عەیێر دە گرێ ددان دا

كو لێ مەزن نەبە و رانەبە.

٢٢٦) **خۆكێمبوون**

دەوارن هەنە، دیوێر هنجاران دالێسن. چێلەك مە هەبوون باڤكێ من ژێ رە „كۆسرە" دكریا و ب دار دخست دا كو بالێسێ. ئەو كۆسرەیا هەو ژی كەڤرەك بوو، دگۆتن كو ژ بۆ كێمبوونا خۆیا وان ئەو وێ دالێسن!

## نەخوەشیێن روەكان

٢٢٧) **دەباش**

كورمێ توولد قاوینایە. زەرە. سەرێ توولەیان و كولیلكان دخوە. خەلكێ ئەو یەك ب یەك ب دەستان دكوشتن. پەلچم لێ دهانین هەڤ و ب گوڤاشتنێ دپەرچقانن. توولە ب توولە، ئلەمێ ئێكێ هەبانا.

٢٢٨) **گورك**

جورەیەك ژ گیایێن ئاسێیە. ئەو د بەر كۆكێن توولەیان و تایێن كەسكایی دە هشین تێ و خوە لێ دگەرینە و تامارێن هوور دخە ناڤ بەدەنا وێ دە و ل سەر دژی، و ژێ دمێ. ئەو وان دمچقینە و هشك دكە. وەك گوران خوینمژ و هارە، لەورە ژێ رە دبێژن گورك. پر زەهمەتە كو تو چارە ژێ رە وەرە دیندن. دڤێ كو دەما چاندنیێ شتلێن پاقژ بكاربینن یان ئاخەكە نەنەخوەش بە.

٢٢٩) **كورمێ بیرەجیكێ**

ژ نەخوەشیێن مێوانە. كورمەك پر بچووكە، د بن قالقێ كۆكێن مێوان دە دژی. چاخا كو بوهار گەرم بوو و گوپك د سەرێ شڤان دە لڤین، ئەو ژی ژ كۆكێ بەرژۆر هلدكشە سەرێ شڤان و د هوندر گوپكێن تەزە دە كولیلكێن تری دخوە. دا كو رێ ل بەر وان وەرە برین، دەرمانەك، ئینجا منێ زەلقۆكییە، ژێ رە دبێژن قوفر، د كۆكا مێوان ژ ژۆر ڤە، دۆرچێورمە وەك بازنەكێ، ددان، و بیرەجیكێ ئەو دەرباس نەدكر، و گوپك دبشكڤین. گۆتنەك چك هەیە، دبێژە: چاخا قوفرێ دەرباس بوو، د كۆكا كیرێ خوە بدە! (ئانكو ژ نوو ڤە مفا و سوودا وێ تونەیە).

٢٣٠) **كورمێ دارا زەیتوونێ**

بوهار قەرت ببە ب شوون دە ئەو تێ دیتن. ئەو دكەڤە بن قالقێ كۆك و پیكان دە و دكۆلە و دخوە، و پێ رە پێ رە پیك هشك دكە. ئەو ل شوون خوە قولەك بچووك دهێلە، و

وەك لەکەیەك ژ زێتێ ل دۆرێ چێدبە. جۆتاری سالێ دو - سێ قۆری ل ناڤ زەیتوونێن خوە دگەرە، و وان یەك ب یەك دکوژە. ڤێجا جۆتاری دکەڤە رێچا گوویێ وان. ئەو ب قاسی تەنەیێن کونجیانە، رەنگێ وان ژی بەرزەری نە، دوەشن سەر عەردێ بنێ پیکێ کو کورم لێ خستیە، و ب وا رەنگی وان ب جی دکە، و ب تەفشۆ قالقێ پیك، ئان کۆکێ، هلووس دکە، و دارکەك درێژ هوت قولێ دکە، و پێشدە پاشدە دبە و تینە، کورم دمرە. دەنگەك خوە بالکێش هەیە، دکە: خولچ - خولچ - خولچ! سالەکێ، ژ سالێن نۆدی دە بوو، لێ نزانم کیژان سالا بوو، هوکمەتێ ب بالافران دەرمان ل داران خست دا کو کورم بمرن. رابوو بەرەڤاژی وێ، هەر کو چوو کورم پر کرن. ژ کورمەکی بوو ٣٠٠! چ ٣٠٠، بێژە هەزار. خشما خودێ بوو. پر جۆتاریان دارێن خوە ئد وەك هەشارەت د بەر رە قوت کرن وا سالێ ژ بەر پربوونا کورمان تێ دە. کورم ل کۆکێ ژ پیکان پرتر دخینە، و ئەو د ڤێلق رە دەرباس کۆکێ دبێ و جیێ کورم د هوندر کۆکێ دەیە. ئەم دچوون کورما، کورمێن دارێن زەیتوونێ، مەیێ ل بن دارێ، ل دۆر کۆکێ بنریا. کو مە بدیتا گوویێ کورم هەیە - ئەو ژی وەك شەهیریا هوورکە - کو مە بدیتا هەیە، مە ل هافێ ور دنریا، مە ددیت کو ل سەر قالقێ دارێ، یان ل کۆکێ ئان ژی ل بەدەنا دارێ، قالقی رەش بوویە، مە دزانی کوی د ور دەیە. مەێ دێلیەك دارێ ژ ئمبۆستەکێ قوت بکرا و مەیێ ب کێرێ تووژ بکرا، پاشێ مە ب کێرێ هنەك ژ قالقێ دارێ ژی، ئەو جیێ تەڤ رەش بوویە، دقەوراند، مە سەهدکر کوێ قول کریە. ئیجا ژ سەدی نۆد و نهە دەردکەت راست ورە. مە دێلیێ خوە دکر قولێ، دو - سێ جاران مە لێدخست، ئانکو تێڤەددا، دکر ڤرچ ڤرچ، وا چاخێ مە دزانی کو کورم مر. بەری کو نەخوەشیا کورمێ زەیتوونان ب ریا دەرمانێ سەختە ژ ئالیێ دەولەتێ ڤە ژ سالا ١٩٩٠ی دە و شووندە وەرێ بەلاڤکرن، دارکوتکان پرانیا کورمێ زەیتوونان دخوەرن. لێ مخابن ژ سەدەما کو زەرار ددە دارێن گووز و بەهیڤان ب ئاوایەکی بێسینۆر ژێ هاتن کوشتن، و دەرمانێ ل داران دهاتە خستن پر ژ وان قرکرن. (ژا) دارکوتك دەڤێ قولا کورم ب نکلێ خوە هنەکی فەرە دکێ و زمانێ خوەیێ درێژ و وەك راسۆرا کاهرەباڤانان دکێ قولێ و کورم پێ ڤە دلەزقێ و دکشینێ دەر ڤە و دخوێ.

(٢٣١) **کورمێ مێخلی**

ئەو بەرێ نەخوەشیا هەری ب زیان و زرار ژ پەتیخ، زەبەش، ختی، کەلەك و عەنجووران رە بوو. ئەو مێشەکە کو ب زختێ ل مێویان دخە هین کو مێوە کەلەکە. ئەو ب زرخا خوەا وەك دەرزیان کورمان دخە ناڤ کەلەکان دە و کورمی دکە. دەما کو ئەو مێوە

دکەملە، شوونا وان مینا مێخان دیار دبە.

## ٢٣٢) کوڤارکێ ڤالچقێ داران

نەخوشیەکە کو ب داران دکەڤەیە. وەکی کەڤزێ ل کۆکا وان دگرە، و وەك چاویرێ ل سەر بەدەنا داران دەردکەڤە و پاشێ ژی ڤالقێ وان ژێ رادبە. وا هنگێ جۆتاری کرێجێ چێدکە و ب فرچەیەکێ ژ عەردێ دە هەتا بەر پیکان ڤە گشتکی کرێج دکە، وەك کو بۆیاخ دکن. دەما کو کرێج لێدبە، نەما پێشك تێنێ و گەشبوونا کەڤزێ دسەکنینە و باندۆرا نەخوەشیێ دکوژە. ئەڤ بێهتر ل دارێن فێکیان تێن، هەری زێدە ژی دارێن نازك و هەر هەیامەکێ تەهمول ناکن تێن. ئیجار کەسێ کو دارێن فێکیان دچینە، هەر چەند سالان کۆکێن دارێن وێ کرێج دکە. ل گۆری کو ئەز تێ دگهینم، سەدەما نەخوەشیێ ئاڤدانا دارانا زێدەا کو نە د وەختا خوە دەیە. مە گۆت کەڤز ژ بەر کو کەسکە، لێ ب خوە تەنەتەنەیی دبە و دەستپێکا خوە وەکی بالووکانە، پێرە ـ پێرە کۆك تەڤدە وها دبە، و مینا گەمارەکێ ل سەر دگرە کو تو ب دەستێ خوە رێش بکی، دوەشە لێ پاك نابە. ژ بەر وێ جۆتاری پێش دە و بەری کو ئەو بگهینە وێ پلەیێ وێ کرێج دکە. ژ خوە کرێجکرنا داران ژی نە تەنێ بۆ ڤا دەردی تەنێیە. ئەو کۆك و بەدەنا دارێن خوە دژی کەڤزا کۆکا داران، زەنگێ، کورم و گێرەیان ژی کرێج دکن. و نەتەنێ دار کرێج دکرن، لێ وان خانیێن خوە ژی ژ هوندر ڤە ب بلندیا ١،٥ مەترێ دژی کێزك و کورمکان کرێج دکرن.

## ٢٣٣) سوونێ، سوونی

کێزەکە. ژ گێرێ مەسترە. قابێ خوە رەقە. بینا گەمری ژێ تێ. دفرە. تەنێ گەنمێ تەزەێ هین فریك دمژە، تەنە فچ دبە. ئەو ب تەنێ قەرتبوویی نکانە. بەرێ یەك ب یەك جۆتاریان ئەو بەرهەڤ دکرن، دکرن شیشەیان. هوکمەتێ هەر یەك ب قورشەکی ژ گوندیان دکرین. هوکمەتێ ژی لەشکەرێن خوە د سالێن ٥٠ ـ ٥١ دە چەند جاران شاندن بەرهەڤکرن وان کێزکان. گەلەك جورەیێن وێ هەنە. ئێن کەسك بێزرارن، وێن زەر خەراپن.

## ٢٣٤) وێران (ێ رەزا و زەیتوونا)

ژ نەخوەشیێن رەز و مێو و دارێن زەیتوونانە. وەك کال و باڤێ مە دگۆتن کو بەرێ ل چەك کۆك زەیتوون کێم بوون و پرانیا ئاخا نها بوویە دارا زەیتوونان بەرێ ئەو تەڤ مێو و رەز بوون. مخابن کو ئەو وێرانا دەرکەت، و ل تامارێن مێوەیان خست و هشککرن. لەوما خەلکێ رەزێن خوە هلکرن و ژ بەر ڤە زەیتوون چاندن. نەخوەشیا وێرانا زەیتوونان ژی هەی. دڤێ تەڤر و نەجاقێ کو ب دارا نەخوشکەڤە لیا ساخ نەکەڤە هەیانی کو ب ئێگر وەرێ شووشتن!

**٢٣٥) وێرانل**

ئەڤ ژى نەخوەشــيەك دارانە، د عەكــوورا مە دە هەر ســال هەيە. ئەو وێـران شــقنەكى، دودووان ژ دارێ، د دەما كو دار تێ دە دشوخلە، وەختا ئاڤدانێ، و شقن تژى بەرە، د جى دە هشك دكە! من پر پسپۆر ئانين سەر فێدە تنە بوو، پێ نزانين. باڤێ من گۆت: شقنێ كـو وهـا دبە ئەو وێرانە، تويێ وى پيكى د بەر رە قوت كە. سالا بێ يەكى نوه و ساخێ د بەر وى رە چەكە. ئەڤ نەخوەشيا ژ ئاخا نەباشــە، وا پــر، ئــاخ نە ســۆرە و عەردێ خــوە نە كــوورە، ئـاخ تەڤلهەڤە و ئەو دار نەئا وێ ئاخێيە. و خودێ زانە وهايە، ژ بەر كو ب من رە دەرباس بوويە.

**٢٣٦) زەنگ**

نەخوەشيەكە ل داران دخينە. كو سالا باران پر بە، ئەو ژى پر دبە. دەرمانێ هەرى رنـد بۆ وێ رۆژە، كو رۆژ ب تەهن بە وێ نەخوەشيێ دكـوژە. هەلـبەت نهـا د ڤـى زەمـانى دە دەرمــان ژێ رە چێكــرنە، لــێ رۆ باشــتر و زووتــر پــاك دكە. كركــووت، ئەڤ دەرمانـا وەك بۆدرەيەك زەر بوو، ئەز سەدى سەد نزانم ژ چ چــێ بــوويە، لــێ دەمـا مە فرەنـگ (بەنەدۆر) دچاندن و زەنگێ لێ دخست، ئان بەرى كو لێخستا، مە دكر گۆرەيەك ژنان و هەما ب سەر تێ دە مە دادوەشاند و زەنگ دكوشت و تا دپاراست. زەنگ ژى كێـزكن پــر چــووچكن. ل توولا و دارا ژى دخينە. دو رەنگ خــوە هەنە: گەور: پرانــى دەمســالا پــاييزێ دەردكەڤە، وا سۆر. ژ بۆ پاراستنێ، دڤێ پەلێن نەخوەش وەرن ژێكرن و شەوتاندن، ئان ژى دەرمانێ تەڤ ئاڤێ لێ وەرە خستن. زەنــگ ل پەلان دخە دەمــا كــو بــاران و خونــاڤ پــر بە. ئەو دهێلــێ رەنگێ پەلان سۆر ببە و زوو هشك ببن.

**٢٣٧) زەربوونا داران**

هن جاران پەلێن داران زەر دبن، و دچەلمسن، وەك دارێن سێڤ و چەفتەليان. جۆتارى ميخەك هەسنى دكوتە بەدەنا وان، ب سەر دە دار گەش دبە. سالا پار، چەنـد دار مــن وهـا دبوون و بەر ژى نەدگرت. من هەر كۆكەكێ دو مێخ لێخستن، ڤەگەريان. ئەو مەسەلا ژ بـۆ كو ئاخا خوە نە قاواتلييە، و هێسنێ خوە كێمە، دار لبەردكەڤە. كوتانـدنا مێخـا كۆكـا دارێ وەك چاوا تو ئاخن سۆر لێدكێيە! دەما جۆتكار وە دكن، ئەو زانن كـو هەســن ئــان زنگــار ژ ئاخا وا دارێ كێمە، لەورا وەك دەرمان ژێ رە هازر دكن. لێ سەدەمێن زەربوونا داران نە تم وەيە، دڤێ جارنان ژ دەست گێرەيـان بە، دەمـا كـو مێرســتانا خــوە د بــن كۆكـا داران دە چێدكە و تاماران دمچقينە.

## پێشینەی پزیشکان و گیاناسانی کورد لەگەڵ پێڕستی کتێب و بەرهەمەکانیان

بەگوێرەی سەرچاوە مێژووییەکان، خەڵکی ناوچەی ناوچۆمـان یەکەم چینـی شارسـتانیەتی مرۆڤی ئێستەیان بنیات ناوە. لەو کاتەوە کورد وەك نەتەوەیەك لەو شـوێنە گیرسـاوەتەوە تـا وەکـوو ئێسـتە، پەیوەنـدی چڕوپـڕ بەسـتراوە لە نێـوان خەڵـکەکەی و ئەو خـاکەدا. ئەگەر سەیرێکی گەنجینەی وشەدان و پەند و قسە و پەیڤی شـێوەزارەکانی کـوردی بکەیـن، دەر ئەکەوێت کە چەندە ڕەگ و بنەوانی ئەو گەنجینەیە پەیوەستە بە سروشت و گیا و گـوڵ و ژینگەوە. وەك دەگوترێت زمانی ڕەسەن و کۆنی کوردی، زمانێکی سروشـتی و کشـتوکاڵییە. کەواتە دیارە گەلێك هێندە لەگەڵ سروشت و ژینگەکەی پێوەندی بووە چین لە دوای چین ئەزموونی سەرخستووە و بەرهەمی خولقاندووە. ئەو بەرهەمانە دەتـوانن هەم زارەکـی بـن و هەم نووسراوە.

لەم وتارە هەوڵ ئەدەین ئەوەی ڕەخسابێت و دەستمان پـێ گەیشـتبێت، سـەرجەم ئەو سەرچاوە و نووسینانەی زانا و توێژەرانی کورد، کە چاپ بوون یا لە سۆنگەی چاپکردندان یا وەکوو هێشتا وەك دەستنووس ماونەتەوە، لە کۆنەوە تا ئێستا بخەینە ڕوو و پێڕستیان لێـرە نیشان بدەین.

١. **کتێبە کوردیەکانی سەردەمی هەرمکۆن**: ابوبکر احمد کوڕی عەلی نبطـی ناسـراو بە ابـن وحشیە، کەسـایەتیەکی نـاوداری کەلـدانییە کە لە نێـوان سـەدەی ٢ و ٣ کۆچیـدا ژیـاوە. کەسێك بـووە چەنـدین کتێبـی نووسـیوە. بەشـێك لەو کتێبـانە چـاپ بـووە و ئەویتـر وەك دەستنووس لە کتێبخانەکان هێشتا ماوەتەوە. یەکێـك لە کتێبەکـانی "شـوق المسـتهام فـی

معرفة رموز الاقلام"[١] باسی لە ئەلفوبێی زمانە کۆنەکانی وەکوو عێبری، عەرەبی، کەلدانی، فارسی، نەبتی، فینیقی و کوردی کردووە. لە لاپەڕەی ٢٠٥ ئەو کتێبە لە سێ شوێندا ئاماژەی بە پێگەی کورد کردووە. یەکەم: سەبارەت بە ئەزموونداری کوردەکان لە بواری کشتوکاڵ و گیاناسیدا. نووسیویە: کوردەکان پیشەی کشتوکاڵی لە کەلدانیەکان فێر بوون. دووهەم: ئاماژەی بە ئەلفوبێی هیرۆگلیفی کوردی کردووە. سێهەم: ناوی ئەو کتێب و نامیلکانە کە بە زمانی کوردی نووسراوە کە هی سەردەمی پێش لەدایکبوونی مەسیحە. هەروەها نووسیویە: کوردەکان لەو سەردمە کتێبەکانیان بە زمانی هیرۆگلیفی کوردی نووسیوە. دواتر بۆ سەلماندنی قسەکەی دەڵێت کە بۆخۆم نزیکەی ٣٠ کتێب کە بەو ئەلفوبێ کوردیە نووسراوە لە بەغداد دیتووە. ابن وحشیە نووسیویە: بۆخۆم کتێبەکانی "افلاح الکرم و النخل" سەبارەت بە کشتوکاڵی ترێ و خورما و "علل المیاه" کە سەبارەت بە ئاو و دەرهێنانی ئاوی ژێرزەمینە، لە کوردیەوە کردوومە بە عەرەبی.[٢]

٢. **ئسیۆس ئامێدی**: ئەو پیاوە بە ڕەچەڵەك خەڵکی یۆنان بووە، بەڵام لە شاری ئامەدی باکووری کوردستان لەدایك بووە. سەردەمی فەرمانڕەوایی جستنیان (٥٢٧ ـ ٥٦٥ ز.) کاری پزیشکی کردووە. دواتر توانیویەتی مەوسووعەیەکی پزیشکی لەسەر بابەتی پزیشکی یۆنانی لە ١٥ بەرگدا بنووسێت، هەروەها بابەتەکانی ڕۆفس، سۆرانس و جالینۆس لەسەر نەخۆشیەکانی خانمان و بواری نەشتەرگەری نووسیوەتەوە.[٣]

٣. **سەرگیس سەرێکانی**: ئەو پیاوە لە کتێبە عەرەبیەکاندا بە "سرجیس الراسی و سرجیس راس العینی" ناسراوە. وەکوو زۆربەی ناوە کوردییەکان کە لە عەرەبیدا گۆڕاوە، ئەو ناوەش گۆڕدراوی سەرگیس سەرێکانییە. شاری سەرێکانی لە ڕۆژاوای کوردستانە. فەرهەنگی دێهخودا لە ژێر وشەی "سرجیس الراسی" نووسیویە: *خەڵکی راس‌العین [سەرێکانی]ـیە و هاوچەرخی حونەین کوڕی ئیسحاق ژیاوە. پسپۆڕییەکەی لە بواری وەرگێڕانی کتێبە پزیشکیەکاندا بووە. یەکێك لە وەرگێڕانەکانی کتێبی "طبیعة الجنین ابقراط"ـە.* هەروەها *کتێبی "استسقاء"* نووسیوە و موحەمەد زەکریای ڕازی لە *کتێبی الحاوی* هەندێ لە قسە و

١. ئەم کتێبە یەکەم جار ساڵی ١٨٠٦ لەلایەن جۆزف هوممەر لە لەندەن چاپ بووە.

٢. دکتور موحەممەد عەبدولی، "الفبای کوردی بە روایت ابن‌وحشیە"، گۆڤاری مەهاباد، ژمارە ١٢، ساڵ، ١٣٨٠

٣. جیهاد نووری تەوفیق، "پزیشك و پزیشکێتی لە شارستانیەتی ئیسلامدا"، پەخشانگای تەفسیر، هەولێر، ٢٠١٧، لاپەڕە ٤٥ [وەرگیراو لە کتێبی المایرهوف: تراث الاسلام، لاپەڕە ٤٥١]

*بۆچوونەکانی هێناوە.*[١] ویکیپیدیای فارسی لە بابەتی "سرجیس راس العینی" کە بابەتەکەی لە کتێبی "تاریخ دستخطهای عربی، فواد سزگین، وەرگێڕان: موسسە نشر فهرستگان، لاپەڕە: ٢٤٣ــ٢٤٨" وەرگرتووە، نووسیویە: *سرگیوس ریشعینا کە لای عەرەبەکان بە سرجیس راس العینی ناسراوە، زانا، پزیشك و وەرگێڕێکی گەورەی سەدەی ٦ کۆچی بووە. زۆربەی بەرهەمەکانی جالینووسی لە یۆنانیەوە کردووە بە عەرەبی.*

٤. **ئەبوویەکری دینەوەری** (٢٦٤٢٨٠ کۆچی): ئەو پیاوە بە زانای بواری فەرموودە (محدث) دەناسرێت. گەشتی زۆری کردووە بۆ وڵاتانی حەڕان، جزیر، بەغداد، دەمشق، عومان، کووفە و میسر. پاشان گەڕاوەتەوە و لە دینەوەر نیشتەجێ بووە و لەوێ کۆچی دوایی کردووە. لە بوارەکانی فەرمووده چەندین کتێبی نووسیوە. یەکێك لە کتێبەکانی "طب النبوی"ـیە. دەستنووسی ئەم کتێبە لە کتێبخانەی فاتح لە ئەستانبۆڵدا هەیە. سیوطی بەشێك لە فەرموودەکانی ناو ئەو کتێبە بە لاواز و هەڵبەستراو دەزانێت.[٢]

٥. **ابوحنیفە احمد کوری داوود کوڕی وەنەندی دینەوەری** لە سەدەی ٢ تا سەرەتای ٣ کۆچیدا ژیاوە. زانایەکی پایەبەرز بووە و چەندین کتێبی مێژوویی، ئایینی و گیاناسی بە عەرەبی نووسیوە. یەکێك لە کتێبەکانی "کتاب النبات"ـە. ابن بیطار (مردن کۆتایی سەدەی ٦ کۆچی) گەورە گیاناس و دەرمانسازی ئەندەلۆسی ناوی ٥٠ ڕوەك کە پێشینیانی ئەوان ئاگەداری نەبوون لە کتاب النبات وەرگرتووە.[٣] لە وتاری (ابوحنیفە احمد کوڕی داوود کوڕی وەنەندی دینەوەری نووسەری "کتاب النبات") کتێبی بەردەست بەتەسەل باسی کتێبی "النبات" کراوە.

٦. **ایوب ڕۆهایی**[٤]: فەرهەنگی دێهخودا سەبارەت بەم کەسایەتیە نووسیویە: وەرگێڕێکی توانا بووە چەند کتێبی لە *زمانەکانی دیکە کردووە بە عەرەبی.* کتێبی "دانشنامە بزرگ اسلامی، برگی ١٥، لاپەڕە ٥٩٤١" نووسیویە: *جالینووس بۆ ڕەتکردنەوەی بۆچوونەکانی ئەراسیستراتووس [لەسەر توێکاری = تشریح] زانیاریەکانی بوقراتی لەو بارەوە کۆ کردووە و لە کتێبێکی پێنج وتاریدا نووسییەوە. ئەو کتێبە سەرەتا ئەیوب ڕۆهاوی و دواتر حونەین*

١. وتاری دکتۆر نادر کەریمیان سەردەشتی، کۆنفرانسی ٣٠ ساڵەی گیادەرمانی شەفا، زانکۆی کوردستان، بەهاری ١٣٩٧

٢. دانشنامەی اسلامی بزرگ، بەرگی ٣، لاپەڕە ١٣٤٠

٣. لاپەڕە ٩، بەرگی ١، کتێبی مشاهیر کورد

٤. تورکەکان ناوی کوردی "ڕۆها"یان کردووە بە ئۆرفا.

*کوڕی ئیسحاق لە یۆنانیەوە کردوویانە بە سوریانی. ئەیۆب ڕۆهاوی چەندین کتێبی دیکەی هەیە. یەکێك لەوانە "کتاب البیان"ـە. ئەو پیاوە سەدەی ٣ کۆچی لە ڕۆهای باکووری کوردستاندا ژیاوە.*[1]

٧. **ئیسحاق کوڕی عەلی ڕۆهایی**: یەکێك لە پزیشکانی کۆنە. زانیاری ئەوتۆ سەبارەت بە ژیانی لەبەردەستدا نییە. تەنیا ابن ابی صبیعە لە کتێبی "عیون النباء" هەندێ زانیاری دەرخستووە. ئەو پزیشکە لەسەر ڕێچکەی پزیشکی کۆنی یۆنان بووە و تەنیا پەرژاوەتە سەر بواری پزیشکی و خۆی نەخستووەتە ناو بازنەی زانستەکانی دیکە. ئیسحاق ڕۆهایی سێ بەرهەمی بۆ دوای خۆی بەجێ هێشتووە. *"کتاب کناش": ئەو کتێبە وتارەکانی جالینووس کە بە "میامر" ناسراون، وەریگێڕاوەتەوە. ناوەرۆکی ئەو کتێبە دەرمانە تێکەڵاوەکانە بەپێی نەخۆشی ئەندامی جەستەی لە سەرەوە تا نووکی پێ، باس کردووە. کتێبی "ادب الطبیب": [یەکێك لە گرینگترین و سەرەکیترین کتێبەکانی پزیشکیە کە سەبارەت بە ئەخلاقی پزشکییە.*[2]*] هەروەها کتێبێکی دیکەی هەیە کە کتێبەکانی "الصناعة الصغیرة، النبض و کتاب جالینوس الی غلوقن" تێدا کۆ کردووەتەوە.*[3] کتێبی ادب الطبیب لەلایەن مریم پوتی و مینو عەلی میرزایی لە عەرەبیەوە کراوە بە فارسی و پەخشانگای طب سنتی ایران ساڵی ١٣٩١ لە تاران چاپی کردووە.

٨. **ابومظفر موحەمەد فەرزی شارەزووری** (٤٩٧ـ٥٥٥ کۆچی): باوکی ئەو پیاوە کاتی خۆی لە شارەزوورەوە کۆچی کردووە بۆ بەغداد. خوێندنی ئایینی و زانستەکانی باوی ئەو سەردەمە بەتایبەت زانستی بیرکاری و ئەحکام و بابەتی میرات لە حوجرە خوێندووە و گەیشتووەتە پلە و پێگەی مامۆستایی. ئەو پیاوە بە ڕەنجی شان و عارەقی ناوچاوانی بژیوی خۆی بەدەست هێناوە و لە بازاڕی ڕێحانیۆنی بەغداد دووکانێکی بووە کە بەهارات و گیای دەرمانی فرۆشتووە. هاوکات خوێندەواران بۆ فێربوونی زانستی بیرکاری و ئەحکامی ئایینی هاتوونەتە لای.[4]

٩. **ابوعبدالله شەمسەدین جەزەری** (٦٧٣ـ٧١١ کۆچی) خەڵکی ناوچەی جزیری باکووری

---

١. وتاری دکتۆر نادر کەریمیان سەردەشتی، کۆنفرانسی ٣٠ ساڵەی گیادەرمانی شەفا، زانکۆی کوردستان، بەهاری ١٣٩٧

٢. هەمان سەرچاوەی پێشوو

٣. ماڵپەڕی ویکی فقه، وەگیراو لە کتێبی "عیون النباء فی طبقات الاطباء" لاپەڕەکانی ٢٠٧، ٢١٥ و ٣٤٢

٤. لاپەڕە ٤٣-٤٤، بەرگی ١، کتێبی مشاهیر کورد، وەرگیراو لە کتێبی (طبقات الشافعیة، بەرگی ٤، لاپەڕە ٨٧)

کوردستانە. کەسێك بووە لە قاهیرە خوێندوویە و لە بوارەکانی زانستە ئیسلامیەکان و پزیشکیدا مامۆستا بووە و کتێبی نووسیوە.[١]

١٠. **بەدرەدین حەسەنی هەولێری** (٦٦٣ـ٧٣٦ کۆچی) خەڵکی هەولێر بووە و بۆ فێربوونی زانست گەلێك شار و وڵات گەڕاوە و سەرنجام لە دەمشق گیرساوەتەوە. لە بوارەکانی وێژە، مێژوو و پزیشکیدا پسپۆڕێکی لێهاتوو بووە و چەند کتێبی نووسیوە.[٢]

١١. **ابوالفدا مورخ ایوبی** (٦٧٢ـ٧٣٢ کۆچی) کەسایەتیەکی نووسەر، مێژوونووس و پیاوچاکی کوردانی دەمشق بووە. لە بواری مێژوو، جوغرافیا، ئەحکام، وێژە و پزیشکیدا دەستێکی باڵا و ناسراوی بووە و کتێبی داناوە. کتێبی بەناوبانگی "المختصر فی تاریخ البشر" کە ٤ بەرگە و بە چەندین زمانی بیانی وەرگێڕدراوەتەوە یەکێك لە سەرچاوە گرینگەکانی مێژووی جیهانە، هەروەها کتێبی "تقویم البلدان" کە لە بواری جوغرافیا نووسراوە، ئەو کەسایەتیە نووسیویە.[٣]

١٢. **شەمسەدین موحەمەد ناسراو بە ابن الاکفانی** (؟ـ٧٤٩ کۆچی) خەڵکی ناوچەی شەنگال بووە. بۆ فێربوونی زانست زۆر شار و وڵاتان گەڕاوە و لە هەر شوێنێك شتێك فێر بووە. سەرنجام لە قاهیرە گیرساوەتەوە و دەستی کردووە بە وانەگوتنەوە و چارەسەر کردنی نەخۆشی دەردەداران. ئەو کوردە شەنگالییە پزیشکێکی لێکۆڵەر و هاوکات کەسێکی جێی-باوڕی ناو خەڵکی بووە. چەندین بەرهەمی پزیشکی نووسیوە، وەکوو: ارشاد القاصد الی اسنی المقاصد (بابەتەکەی سەبارەت بە هەموو زاستێکە)، غنیة اللبیب فیما یستعمل عند غیبة الطبیب، کشف الین فی امراض العین (بابەتەکەی لەسەر ماك و گەوهەری مەدەنی، حەیوانی و ئەجناسە)، نهایة القصد فی الصناعة الفصد (بابەتەکەی لەسەر پیشەی خوێنبەردانە بۆ چارەسەری) و روصة الاولیاء فی اخبار الاطباء.[٤]

١٣. **ابوعبدالله شەمس ناسراو بە ابن الکردی** (٧٨١ـ٨٤٣ کۆچی) خەڵکی شارەزوور بووە و لەگەڵ بنەماڵەکەی بۆ خوێندن چووەتە شام و فلستین. پاش کۆچی دوایی باوکی، لەگەڵ دایکی بەرەو مەککە بەڕێ دەکەوێت و لەوێ دەمێنێتەوە و زۆر بەتۆکمەیی دەستی

---

١. لاپەڕە ١٠٠-١٠١، بەرگی ١، کتێبی مشاهیر کورد، وەرگیراو لە کتێبی (الاعلام زرکلی، بەرگی ٨، لاپەڕە ٣٥)

٢. لاپەڕە ١٠٤-١٠٥، بەرگی ١، کتێبی مشاهیر کورد، وەرگیراو لە کتێبی (الاعلام زرکلی، بەرگی ١، لاپەڕە ٥٨١)

٣. لاپەڕە ١٠٥-١٠٦، بەرگی ١، کتێبی مشاهیر کورد، وەرگیراو لە کتێبی (طبقات الشافعیة، بەرگی ٦، لاپەڕە ٨٤)

٤. لاپەڕە ١٠٧-١٠٨، بەرگی ١، کتێبی مشاهیر کورد، وەرگیراو لە کتێبی (الاعلام زرکلی، بەرگی ٦، لاپەڕە ١٨٩)

کردووە بە خوێندنی کتێبەکانی پزیشکی، گیاناسی و تشریح الابدان. پاش ماوەیەك بووەتە پسپۆڕ و ئەزموونداریکی بێوێنە و ناسراو، بەتایبەت لە بواری شکستەبەندیدا دڵسۆزی و شارەزاییەکەی دەنگی داوەتەوە. بەجۆرێك لە دوور و نزیك خەڵکی نەخۆش و لێکەوتە و دەردەدار هاتوونەتە نۆرینگەکەی و ئەویش بەیارمەتی دەرمانە گیاییەکانی چارەسەری کردووە.[١]

۱۴. **عەلائەدین طبیب هەولێری** (؟ـ۹۲٦ کۆچی) کەسایەتیەك بووە کە لە زانستە ئیسلامیەکان و هەروەها بواری پزیشکی و دەرمانسازی پسپۆڕیکی لێهاتوو و ناسراوی بووە. ئەو پیاوە خەڵکی هەولێر بووە و دواتر لە شاری حەڵەب ژیاوە. لەوێ هاوکات لەگەڵ وانەگوتنەوە، نەخۆشان و دەردەداران سەردانیان کردووە و چارەسەری سروشتی و گیایی پێشکەشیان کردووە.[٢]

۱۵. **مامۆستا سەیدی هەورامی یەکەم** (؟ـ۹۲۱ کۆچی) خەڵکی هەورامانە و زیارەتانی لە ئاوایی ڕەزاوە. ئەو پیاوە جیا لە شاعێری، کەسێك بووە لە بواری گیاناسی و پزیشکیدا ناسراو بووە و گەلێك دەرمانی گیایی زانیوە و نەخۆشانی پێ چاك کردووەتەوە.[٣] لە بەشی پاشکۆی ڕۆژمێری چیا کە شێخ موحەمەد سەراجەدینی ساڵی ۱۳٦۱ لە سنە چاپی کردووە، سەبارەت بە سەیدی یەکەم هاتووە: *سەیدی هەورامی کوڕی سەید موحەمەد سادق کوڕی سەید عەلییە. مامۆستاکەی مەلا جەلال خورماڵی بووە.* شێعرەکانی لەسەر شێوازی کۆنی هەورامی و فارسییە. ئەو شاعێرە لەگەڵ سەیدی دووهەم کە لە کۆتایی سەدەی ۱۳ کۆچی ژیاوە، شێعرەکانیان تێکەڵ بووە. سەیدی دووهەم شێعرەکانی لەسەر شێوازی هۆنراوەی تازەی هەورامییە.[٤]

۱۶. **مەلا ئیدریس بدلیسی** (؟ـ۹۲٦ کۆچی): کەسایەتیەکی ناسراو و خۆشەویستی خەڵکی بدلیس لە باکووری کوردستان بووە. ئەو کەڵەپیاوە توانی بە ڕاوێژ و داناییەکانی خۆی پاش شەڕی شا ئیسماعیلی سەفەوی و سوڵتان سەلیمی عوسمانی، ئاسایش و هێمنایەتیەك بگەڕێنێتەوە ناوچە کوردنشینەکانی ژێر دەسەڵاتی عوسمانیەکان. چەندین بەرهەمی هەیە.

---

١. لاپەڕە ١٣٦، بەرگی ١، کتێبی مشاهیر کورد، وەرگیراو لە کتێبی (مشاهیر الکرد، بەرگی ٢، لاپەڕە ١٥٢)

٢. لاپەڕە ١٣٦، بەرگی ١، کتێبی مشاهیر کورد، وەرگیراو لە کتێبی (مشاهیر الکرد، بەرگی ٢، لاپەڕە ١٤٨)

٣. ڕۆژنامە ژین، ژمارە ١٣٨١، ڕێکەوتی ١٩٥٨/٠٢/١٣، بابەتی: شێعر و شاعیرەکانمان

٤. لاپەڕە ١٥٠-١٥٤، بەرگی ١، کتێبی مشاهیر کورد، وەرگیراو لە کتێبی (دیوانی صیدی، چاپی سلێمانی، ١٩٧١، و چەند کەشکۆڵی دەستنووس)

کتێبی "هشت بهشت" ناسراوترین بەرهەمی مەلا ئیدریسە کە باس لە ژیان و مێژووی سوڵتانەکانی عوسمانی دەکات.[١] گوایە کتێبێکی لەسەر نەخۆشی تاعوون نووسیوە.[٢]

١٧. **مەولانا ڕەسووڵ زەکی ئەفەندی سۆرانی** کە ١٠٥٠ کۆچی لە ژیاندا بووە، خەڵکی یەکێک لە ئاواییەکانی ناوچەی کەڵوێ سەردەشت بووە. لەسەر دەستی زانای گەورە حەیدەری یەکەمی ماوەرانی ئیجازەی مەلایەتی وەرگرتووە. لە گوندەکەی خۆی تا کۆتایی ژیانی وانەی گوتووەتەوە و خوێندوویە و لێکۆڵینەوەی کردووە. لە بوارە جیاجیاکاندا کتێبی نووسیوە. عەلی زەکی نەوەی ئەو پیاوە بووە کە کتێبی "مختصر قانون ابن‌سینا" داناوە.[٣]

١٨. **مەلا حوسێن (ئەحمەد) باتەیی** (١٠٩٦ـ١١٨١ کۆچی) خەڵکی گوندی باتە سەر بە ناوچەی جۆلەمێرگی پارێزگای هەکارییە. کەڵەپیاوێکی نووسەر و شاعێری کلاسیکی کوردی بووە. یەکێك لە دیوانە هۆنراوەکانی مەولوونامەی پێغەمبەرە بە کرمانجی، کە یەکەم جار ساڵی ١٩٠٥ لە میسر چاپ بووە.[٤] گوایە یەکەم مەولوودنامەیە بە کوردی نووسراوە. دکتۆر قەدری یەڵدرم مامۆستای زانکۆی ماردین کە هاوکات یەکێك لە نووسەران و چالاکانی بواری بەڵگە و دەستنووسی کوردییە لە باکووری کوردستان، بەرواری ١٣٩٧/٠٥/١٨ پێی ڕاگەیاندم کە چەند ساڵ پێش ئێستا لە سەردانێك بۆ گوندی باتە، لە کتێبخانەی یەکێك لە مامۆستاکانی بنەماڵەی باتەیی دەستنووسێکی کۆنی "الحمایل"ی[٥] مەلای باتەیی وەرگرتووە. کۆپییەك لەو دەستنووسە ئێستا لای ئەو بەڕێزەیە. ناوەرۆکی حەمایلەکە باسی

١. کتێبی (تاریخ معاصر کرد: دیوید مك داول)، وەرگێڕان: ئیبراهیم یۆنسی، پەخشانگای اپنیز، ١٣٨٣: لاپەڕە ٧٨، و کتێبی (هشت بهشت و دیگر آثار او)، مهری پاکزاد، پژوهشنامه فرهنگ و ادب پاییز و زمستان، ١٣٨٩: لاپەڕە ٦ (١٠)

٢. وتاری دکتۆر نادر کەریمیان سەردەشتی، کۆنفرانسی ٣٠ ساڵەی گیادەرمانی شەفا، زانکۆی کوردستان، بەهاری ١٣٩٧

٣. لاپەڕە ١٩٧-١٩٨، بەرگی ١، کتێبی مشاهیر کورد، وەرگیراو لە کتێبی (خلاصة الاثر، بەرگی ٢، لاپەڕە ٦٣)

٤. مارف خەزنەدار، مێژووی ئەدەبی کورد، بەرگی دووەم، پەخشانگای ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٢

٥. لای بەشێکی زۆر لە حەکیمانی کۆنی کوردەواری کتێبی حەمایل ناسراوە. ئەڵبەت ناوەرۆکی حەمایلەکان جیاوازە و بەپێی زانایی و ڕوانگەی ئایینی حەکیم دەقی حەمایلەکە جیاواز بووە. ناوەرۆکی حەمایلەکان باسی نووشتە و دۆعای چاکبوونەوە و بواری شەفای نەخۆش و دەردەدارانە. لە سەردانێك بۆ لای بنەماڵەی سەید موحەمەد حوسەینی خەڵکی ئاوایی سوێرۆێ سەردەشت، کتێبێك لە قەبارەیەکی بچووکیان هەبوو کە بە حەمایل دەناسرا. گوایە کەسانێك وا نەخۆش بوون یا دایکان لە کاتی منداڵبووندا، حەمایلەکەیان لەسەر شوێنی ژانەکە داناوە تا ئارام بێتەوە.

دەرمان و دۆعا و نووشتەی کۆنی ناوچەی هەکارییە کە مەلا باتەیی سەدەی ١٧ زایینـی بە عەرەبی و فارسی نووسیویە و تا ئێستەش ماوەتەوە.

١٩. **مەلا موحەممەد ئەرواسی وانی**: زانا و عارفی نـاوداری کـورد شـێخ مـوحەممەد (مـردن کۆتایی سەدەی ١٧) باپیرە گەورەی شـێخانی گونـدی ئەرواس سـەر بە نـاوچەی مەکسـی باژێڕی وانە. ئەو شێخ موحەممەدە لەگەڵ مەلا یۆنس ئەرقەتینـی (؟ــ١٧٨٥) شـوێنکەوتووی ڕێبـازی نەتەوەیـی مەلا عەلـی تەرەمـاخی[١] (١٥٩١ــ١٦٥٣) بـووە کە خوێنـدن و نووسـینی حوجرەی بۆ یەکەم جار لە مێژووی ئیسلامی کوردەواریدا لە عەرەبیەوە کردووە بە کـوردی. بـابەتی کتێـبەکە پزیشـکیە و وەرگێـراو و وەرگێـڕاوێکە لە کتێبـی پزیشـکی جالینووسـی حەکیم، هەروەها چەندین ڕەچەتە و دەرمان و چارەسەری کوردەواریشی تێدایە. باسـی ئەو کتێبە یەکەم جار ساڵی ١٨٩٢ لە کتێبـی (الهدیـة الحمیدیـة فـی اللغـة الکردیـة) هـاتووە. مامۆستا تەحسین دۆسکی ساڵی ٢٠٠٠ سەرجەم ناوەرۆکی کتێبی (تبیا مەلایـا ئەرواسـی) لە کتێبی "ل دۆر ئەدەبێ کرمـانجی ل سـەد سـالا نـۆزدێ و بیسـتێ زایینیـدا" بە ڕێنووسـی کوردی ئارامی و ساڵی ٢٠١٣ دکتۆر قەدری یەڵدرم بە ڕێنووسی کوردی لاتین چاپیان کـرد. کـۆپی دوو دەسـتنووس لەو کتێـبە ئێسـتا لای بەنـدەیە. یەکیـان هـی کتێبخـانەی مەلا مەحفووز وانیە و ئەوی تر هی مەلا زەینەلعابدین کوڕی مەلا ڕەمەزان ئامەدییە.

٢٠. **مەلا فەخرەدین ڕواری کوڕی مەلا ئەحمەد**: ئەو پیاوە یەکێك لە زاناکـانی هەورامـان لە سەردەمی دەسەڵاتی ئەردەڵانەکاندا بووە. دوو کتێبی پزیشکی دانـاوە و دیـاری کـردووە بە والیەکانی ئەردەڵان: کتێبی (عرفان الخیول) و (کنز الهدایة)[٢]. لە ناو ئەو دوو کتێـبە گەلێـك زانیاری سەبارەت بە بنەماکانی ڕاگرتن و بەخێوکردن و نەخۆشیەکانی ئەسـپ بـاس کـراوە. زانیاریەکانی ئەو دوو کتێبە لە کتێبی (اسب‌نامه‌های پارسی، نووسەر: دکتۆر نـادر کریمیـان سەردەشتی)دا هاتووە.

٢١. **مەلا خدر ڕواری** (١١٣٨ـ١٢٠٥ کۆچی)، کوڕی مەلا ئەحـمەد بـووە و لە گونـدی ڕوار سەر بە ناوچەی هەورامان ژیاوە. کەسایەتیەکی زانا و دانا و شـاعیرێکی تەواو بـووە. گەلێـك

---

١. خەڵکی گوندی تەرەماخی ناوچەی مکسی وانە. کاتی خۆی چەندین کتێبی ئایینی بە کوردی نووسیوە و یەکەم کەس بووە کە ڕێزمانی کوردی کرمانجی نووسیوە. [مەلا عەلی تەرەماخی، سەرفا کورمانجی، وەشانخانەیا چاندا کوردی، ستۆکهۆلم، ١٩٩٧]

٢. ناونیشانی دەستنووسێکی ئەم کتێبە لە فایلی (فهرستواره نسخه‌های عکسی مشاهیر کرد، موجود در کتابخانه، آرشیو و مجموعه شخصی محمد عبدلی)، بەشی پزیشکی، لاپەڕە ١٣ هەیە.

شوێن بۆ خوێندن گەڕاوە. سەرنجام لە قەڵاچوالان لای مەلا موحەممەد بیارەیی و دواتـر لای شێخ وەسیمی یەکەمی تەختەیی لە سنە ئیجازەی مەلایەتی وەرگرتووە. چەندین بەرهەمـی بە زمانی عەرەبی و کوردی نووسـیوە. دوان لەوانە "ڕۆڵە بزانـی و دەوڵەتنـامە"یە. ڕۆڵەبزانـی سەبارەت بە باوڕ و ئەحکامی ئیسلامییە کە بۆ فێرخوازان و گەنجانی داناوە. هەروەها کتێبی دەوڵەتنـــامە کە ســاڵی ١١٩٧ کــۆچی نووســیویە ســەبارەت بە داب و نەریتــی ژیــان و ئامۆژگاریەکانی تەندروستی بەپێی لقی پزیشکی پـارێز (طـب وقـایە) نووسـیوە. ئەو کتێـبە گەلێك بابەتی پزیشکی و تەندروستی داناوە تا خەڵك فێری ببن و ڕەوت و ناوەرۆکی ژیانیان بەرەو خۆشی و تەندروستی بڕوات.[1] مامۆستا عەبدولکەریم مـودەڕس (١٣٢٣ـــ١٤٢٦ کـۆچی) ئەو کتێبەی لە هەورامییەوە کردووە بە سۆرانی، لە ژێر ناوی "ئیقباڵنامە" و چاپ کراوە.

٢٢. **فەقێ ئەحمەد حەکیم کوڕی سۆفی موحەممەد سوارە:** زانـا و حەکیمێکـی بەناوبـانگی ناوچەی ساراڵ بووە. لە دەوری ساڵی ١٢٤٥ کۆچی لە ئـاوایی دۆزەغەرە لەدایـك بـووە و تـا ساڵی ١٣٣٥ ژیاوە. بنەماڵەی فەقێ ئەحمەد لە ساراڵ بە سـوارە ناسـراون و سـەر بە هـۆزی گۆرانەکــانن. نەوەکــانی ئەو پیــاوە ئێســتە لە دۆزەغەرە و مەریــوان نیشــتەجێن. وەك لە گێڕانەوەی دەماودەمـدا هـاتووە و هەروەهـا لە ڕووی دەسـتنووس و بەڵـگە بەجێماوەکـان، فەقێ ئەحمەد کەسێکی زانا، مامۆستایەکی ئـایینی، دادوەر و پزیشـکێکی لێـزان و دەردزان بووە. کاتی خۆی گەلێك نەخۆش لەسەر دەستی چارەسـەر بـوون. لە نـاو بەڵگەکـان چەنـد یاداشتی ڕێژنـامە و دەستخۆشـانە لەلایەن نـاوداران و کەسـایەتیە ناسـراوەکانی مەریـوان، هەورامان، سنە و گەڕووسی ئەو سەردەمە بـۆ فەقـێ ئەحـمەد بەرچـاو دەکەوێت. جیـا لە دەستنووسی پزیشکی بە ناوی "طب الزمان" و چەند بەڵگە و پەڕاوی پزیشـکی تـر، کتێبـی دەستنووسی دیکە لە بوارەکانی قورئان، دۆعا، شێعری شاعێران و بابەتە ئایینیەکان یادگاری ئەو پیــاوە بە جــێ مــاوە. ئەو دەستنووســانە ئێســتە لای نەوەزادەکــانی، دکتــۆر عەلــی موستەفازادە و کاك خالید پەناهی لە مەریـوان پـارێزراوە. بـۆ بەرگـی ٢ کتێبـی بەردەسـت وتارێکی چڕوپڕ لەسەر ئەو حەکیمە ئامادە دەکەین.

٢٣. **ئیسماعیل حەکیم سلێڤانی** (١٨١٠ـ١٨٩٨): حەکیمــی گەورەی نـاوچەی بادینـان لە گوندی ئەرمشتی ناوچەی زاخۆ لەدایك بووە. کەسایەتیەکی ناسراو و زانا و پزیشـکێکی بـێ-وێنەی سەردەمی خۆی بووە. وەك پزیشکی میرنشینی بادینان لە دەربـاری سـمایل پاشـای

---

١. لاپەڕە ٢٧٤-٢٧٥، بەرگی ١، کتێبی مشاهیر کورد

ئامێدیدا بووە. بۆ چارەسەری کچی یەکێك لە حاکمەکانی قاجارِ سەردانی ئێرانی کردووە و پاش چارەسەریی، شای قاجارِ خەڵاتی کردووە و کتێبێکی پزیشکی پێ داوە. لەلایەن عوسمانیەکان و میری ئامێدی نازناوی حەکیمباشی پێ بەخشراوە. چەند دەستنووسێکی پزیشکی، ئایینی و شێعر لەو حەکیمە بە جێ ماوە. یەکێك لە دەستنووسەکان کتێبێکی پزیشکی فارسییە کە یەکێك لە هاورێکانی لە گوندی کێستەی ناوچەی مزووری باڵا لە بادینان پێشکەشی کردووە و ئەویش چەند پەراوێزێکی لەسەری نووسیوە. ئەسڵی ئەو دەستنووسە ٧٠٠ لاپەرەیە و ئێستە لای دکتۆر سالم حەکیم نەوەی ئێسماعیل حەکیم لە دهۆك پارێزراوە. ئەو کتێبە لەلایەن ناوەندی گیادەرمانی شەفای کوردستان لە شاری سنە وەرگێردراوەتەوە سەر کوردی و ناوی نراوە "**گیابەند**". هاوینی ١٣٩٧ لە رێورەسمێکی باشکۆدا لە زانکۆی کوردستان و بە ئامادەبوونی خەڵکێکی زۆر و بەتایبەت ئەندامانی کۆمەڵەی گیادەرمانی هەرێمی کوردستان گیابەند رادەستی بنەماڵەی نەوەکانی ئێسماعیل حەکیم کرایەوە. نووسەر و توێژەری توانا کاك موحەمەد ئوسمانا ٢٠١٤ سەرجەم ژیان و باسی بەرهەمەکانی و یادەوەری و هەروەها گەلێك رەچەتەی پزیشکی ئێسماعیل حەکیمی لە کتێبی "سماییلێ حەکیم: ژیاننامە و نوژداری" لەلایەن پەخشانگای هاوار لە دهۆك چاپ کردووە. بەهاری ٢٠١٨ لە کۆنفرانسی جیهانی زانایانی زاب لە زانکۆی جۆلەمێرگی باکووری کوردستان، بەندە لەسەر ژیان و بەرهەمەکانی ئەو کەڵەپیاوە وتارێکم پێشکەش کرد.

٢٤. **حوسەین حوزنی موکریانی**[1] (١٢٩٦ـ١٣٦٦ کۆچی) ناسراو بە داماو لە مەهاباد بە دنیا هاتووە. هەر لە منداڵییەوە خوێندوویە و لە تەمەنی گەنجیدا دەستی کردووە بە توێژینەوە لە بواری فەرهەنگ و زمان و مێژووی کوردەوە. ماوەیەك پیشەی مۆرسازی و بەردتاشی و وێنەگری بووە. دواتر کەوتووەتە بیری کرِینی ئامێری چاپی کتێب و رۆژنامە. ساڵی ١٩١٥ ئامێرێکی چاپی لە ئاڵمان کریوە و یەکەم جار بە ناوی چاپخانەی کوردستان لە شاری حەڵەب دەستی بە چاپی کتێب کردووە. ساڵی ١٩٢٥ چووەتە رەواندز و لەوێ چاپخانەیەکی بە ناوی زاری کرمانجی داناوە. یەکەم کەس بووە کاری رۆژنامەوانی کردووە لە ناو کورددا و هەروەها کتێب و نووسراوەی بە کوردی چاپ و بلاو کردووەتەوە. مینۆرسکی کوردناسی رووسی دەڵێت: *بەراستی حوزنی بۆ ناساندنی فەرهەنگ و مێژووی گەلەکەی هەموو*

---

١. ئەگەرچی مامۆستا حوزنی موکریانی لە بواری گیاناسی و گیادەرمانی کاری بەرچاوی نەکردووە، بەڵام یەکەم کەس بووە لە مێژووی کوردستان کە لەسەر کرمی هاورێشم بابەتی نووسیوە.

*هەوڵێکی خۆی داوە.* حوزنی موکریانی ١٢ کتێبی نووسیوە کە زیاترینیان لەسەر زمان و فەرهەنگی کوردە، هەروەها گۆڤاری ڕووناکی و ڕۆژنامەی زاری کرمانجیشی بووە کە لە ڕەواندز چاپی کردووە. یەکێك لەو کتێبانە کە لە ئینگلیسیەوە وەریگێڕاوەتە سەر فارسی لەسەر کرمی هاوریشمە بە ناوی "پرورش کرم ابریشم".[١]

٢٥. **شێخ عەبدوڵای مەردۆخی** (؟_١٣٥١ کۆچی) خەڵکی ئاوایی هەزارکانیان لە ناوچەی ساڵاڵی دیواندەرە بووە. پزیشکێکی دڵسۆز و پسپۆڕ بووە. شارەزایی تەواوی بووە لەسەر هەر دوو ڕێچکەی پزیشکی کۆن و تازە. [ئەوساکە کە وەرگێڕانی فارسی یا عەرەبی ڕەوانی کتێبی ابن‌سینا لەبەردەستیشدا نەبووە] ئەو کتێبەی خوێندووەتەوە و بەکاری هێناوە. شاگردی دکتۆر سەعید خانی کوردستانی کردووە کە یەکێك لە پزیشکانی ناسراوی کوردە کە ئەوساکە لە ئەمریکا و ئەورووپا خوێندوویە. شێخ عەبدوڵا شارەزایی زۆری بووە لەسەر گیاناسی و گیادەرمانی. لەسەر ناسینی نەخۆشیەکان و ڕێگەچارەیان بەیارمەتی گیا و گوڵی دەرمانی کتێبێکی نووسیووە. ئەڵبەتە پاش ماوەیەك دەستنووسی ئەو کتێبە دیار نەماوە و جارێ نادیارە. [دکتۆر سەباح حوسەینی خەڵکی شاری سەقز، ساڵی ١٣٩٦ کۆنفرانسێکی بۆ ناسینی زیاتر و کۆکردنەوەی بەرهەمەکانی سەید ئەحمەد زەلکە لە دیواندەرە ڕێك خست. پاش ئەو کۆنفرانسە هەواڵی بە بەندە دا کە یەکێك لە ئامادەبووانی کۆنفرانسەکە سەرەداوێکی دەرخستووە لە کتێبە دەستنووسەکەی شێخ عەبدوڵای هەزارکانیانی. تا وەکوو ئێستا هێشتا لەمە زیاتر هەواڵی دیکەم دەست نەکەوتووە. بەو هیوایە چاومان ڕوون بێتەوە بەو کتێبە.] ئەم پیاوە جیا لە ئەزموونی پزیشکی، هەستی هۆنینەوە و دانانی هۆنراوەشی هەبووە.

خوالێخۆشبوو شێخ عەبدوڵا هەموو ساڵێك بەگوێرەی داواکاری خەڵك چەند جارێك سەردانی شاری سنەی کردووە و نەخۆش و دەردەداران چوونەتە لای بۆ چارەسەری ژان و نەخۆشینەکانیان. ڕێکەوتی ٦ مانگی شەواڵی ١٣٥١ لە یەکێك لەو سەفەرانە بۆ شاری سنە، بۆخۆی نەخۆش کەوتووە و مەرگ مەودای دیکەی بڕیوە و کۆچی دوایی کردووە. گڵکۆی ئەو پزیشکە لە زیارەتانی تەپەی شێخ حەمە سادقی شاری سنەیە. بەندە [= بابە مەردۆخ ڕۆحانی] بۆ ئەو سەفەرە دواییەی تەمەنم لە دەوری ١٢ ساڵاندا بوو. لە بیرم دێت. چونکە

١. لاپەڕە ٣١٤-٣١٥، بەرگی ٢، کتێبی مشاهیر کورد، وەرگیراو لە کتێبی (وەرگیراو لە کتێبی روزنامەنگاری در کردستان، چاپی مەهاباد، لاپەڕەی ٦٢-٦٤)

ئەوکـاتە لە نزیـك مـاڵی ئـێمە لە حـوجرەی مزگەوتـی شـەریعەتمەدار دیـویێکی گرتبـوو. پیاوێکیشی لەگەڵ خۆی هێنابوو کە کاروبـاری ناومـاڵ و میوانـداری بکـات. خوالیخۆشـبوو باوکم زۆر خۆشی لە شێخ عەبدوڵا دەهـات. زۆرتـر بانگێشـتی دەکـرد بـۆ مـاڵی خۆمـان و هەندێ جار خۆیشی دەچووە حوجرەکەی و سەردانی دەکرد.[1]

٢٦. **دکتۆر سەعید خان کوردستانی ناسراو بە پیروز،** ساڵی ١٢٤٢ هەتاوی لە شـاری سـنە بە دنیا هاتووە و ساڵی ١٣٢١ هەتاوی (١٣٦١ کۆچی) لە هەمەدان کۆچی دوایی کردووە. زانـا و پزیشکێکی ناوداری کوردستان و گشت ئێران بووە. لە شارەکانی هەمەدان، سـنە و تـاران کاری پزیشکی کردووە. چەندین وتار و کتێب و بەرهەمی بە دوای خۆیدا بە جێ هێشتووە. لە وتاری "دکتۆر سەعید کوردستانی" لە کتێبی بەردەست باس لە ژیاننامە و بەرهەمەکـانی کراوە.

٢٧. **شێخ عەلائەدینی نەقشبەندی** (١٢٨١ـ١٣٧٢ کۆچی) کوڕی شێخ عـومەری ضـیاءالدین کوڕی شێخ عوسمانی سەراجەدین خەلیفەی مەولانا خالیدی شـارەزووری بـووە. لە ئـاوایی تەوێڵێ ناوچەی هەورامان لەدایـك بـووە و لای شـێخ مـوحەمەد قەرەداغـی خوێنـدوویە و هاوکات لەگەڵ خوێندن، لە ڕێبازی باب و باپیرانیدا چـلە و شـەونوێژ و کاروبـاری ڕێبـازی تصـوفی ئەنجـام داوە. سـاڵی ١٣١٨ کـۆچی کە بـاوکی کـۆچی دوایـی دەکـات و شـێخ نەجمەدینی برای دەبێتە جێنشین، شێخ عەلائەدین بـۆ بـڵاوەی زیـاتری ئەو ڕێبـازە ڕوو لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان دەکات و لە ئاوایی دووڕۆ دەگیرسێتەوە. لەوێ خانەقا و حوجرەیەکی گەورە دەکـاتەوە. سـۆفی و فەقێیەکـی زۆر ڕووی تـێ دەکەن. سـاڵی ١٣٧٧ کە شـێخ نەجمەدین کۆچی دوایی دەکات ئەویش دەگەڕێتەوە و حوجرەی بیارە ئاوەدانتـر دەکـاتەوە و سیمایەکی تازەتر بە بیارە دەبەخشێت. شێخ عەلائەدیـن کـاتی خـۆی جیـا لە کاروبـاری خانەقـا و حوجرەکـانی، کتێبەکـانی پزیشـکی، گیاناسـی، دەرمـانسـازی و دەروونناسـی خوێندووەتەوە و لەگەڵ ئەزموونەکانی خۆی خستووە و بەکـاری هێنـاوە. هەر بـۆیە هەمـوو ئەو نەخۆشانەی چە لە بـاری جەسـتەیی و ڕەوانیـیەوە سـەردانیان کـردووە، چارەسـەریان وەرگرتووە.[2] میرزا سدیق ئەحمەد چنگیانی لە پێشەکی کتێبی "گژوگیا و ئاژەڵ" بـاس لەوە دەکات کە یەکێك لەو سـەرچاوانە کـە ئەزمـوونی پزیشـکی لـێ وەرگرتـووە، ڕەچـاوکردنی

١. لاپەڕە ٢٠٢-٢٠٣، بەرگی ٢، کتێبی مشاهیر کورد

٢. لاپەڕە ٣٥٠-٣٥١، بەرگی ٢، کتێبی مشاهیر کورد

ئامۆژگاری و سەردان کردنی شێخ عەلائەدین و شێخ عوسمانی کوڕی بووە.

٢٨. **مەلا کاکە حەمە کوڕی حاجی سەیفوڵا**: ئەو پیاوە خەڵکی گەرمیان لە باشووری کوردستانە. کەسایەتیەکی زانا و مامۆستا بووە. چەندین کتێبی داناوە کە دوو لەو کتێبانە ئێستە دەستنووسەکانیان لە ئەرشیفی بنکەی ژین لە سلێمانی پارێزراوە. بابەتی ئەو دەستنووسانە ئاژەڵ، گژوگیا و بوونەوەرانی دیکەیە.

**دەستنووسی یەکەم**: ناوی ئەم کتێبە "تاریخی طبیعی"ـە و بە زمانی کوردییە. ڕێکەوتی ١٩٤٠/٠٧/٠٦ لە گوندی سەرقەڵای شاری کفری لە دیواخانی موحەمەد ئاغای زەنگەنە نووسراوە. بابەتەکەی سروشت و ناسین و تایبەتمەندی زیندەوەرانە.[١]

**دەستنووسی دووهەم**: ناوی ئەم کتێبە "الاشیاء التی تتناول عن الحیوان"ـە و بە زمانی کوردییە. بابەتەکەی گیا و بوونەوەرانی زیندی و مردییە.[٢]

٢٩. **سەید موحەمەد ئەلیاسی ناسراو بە اشرف الحکمای کوردستان** (١٢٨٩ـ١٣٥٢ کۆچی)، بەپێی پەراوێزی یەکێك لە دەستنووسە پزیشکیەکانی کتێبخانەی ئەو کەڵەپیاوە، باب و باپیرانی لە بواری پزیشکی و بەتایبەت شکستەبەندی پسپۆڕ و شارەزا بوون. کەواتە لێزانی پزیشکی لەو بنەماڵەیە تا ئێستەش وەك میرات ماوەتەوە. لە وتاری فارسی "سید محمد الیاسی پزشکی از دیار گروس" کتێبی بەردەست بەتەسەل باسی هاتووە. ئەو وتارە نێردراوە بۆ کۆنفرانسی "گروس شناسی" لە بیجاڕ کە بڕیارە بەهاری ٩٨ بەڕێوە بچێت. لە خوارەوە کورتەیەك لە ژیان و بەرهەم و بەسەرهاتی ئەو حەکیمە هاتووە.

سەید موحەمەد لە ئاوایی سیاسەرانی ناوچەی دیواندەرە لەدایك بووە. پاشان بۆ خوێندن ڕووی لە حوجرەی مزگەوتەکانی سنە و هەورامان کردووە و سەرنجام لە خانەقای بیارە ئیجازەی مەلایەتی وەرگرتووە. خوێندن لە بیارە هەلێکی ڕەخساو بووە بۆ سەید موحەمەد. لەوێ جیا لە دەرسی حوجرە، کتێبە پزیشکیەکانیشی خوێندووەتەوە و ئەزموونی خۆی سەر خستووە. کاتێ گەڕاوەتەوە، سەرەتا لە ئاوایی شێخ وەجیم بووەتە مامۆستا. خەڵك بۆ چارەسەری نەخۆشی و بەتایبەت بابەتی شکستەبەندی سەردانی دەکەن. هەر بۆیە ناگونجێت درێژە بە مەلایەتی بدات. پاش ماوەیەك دەگەڕێتەوە سیاسەران و لەوێ هاوکات

١. الفهرس الوصفی لمخطوطات، موسس ژین لاحیاء التراث الوثاقی و الصحفی الکردی، حسین حسن کریم، چاپی یەکەم، بەرگی ١، چاپخانەی پەیوەند، بلاوکراوەکانی بنکەی ژین، ٢٠١٤: لاپەرە ٣٦٠-٣٦١

٢. الفهرس الوصفی لمخطوطات، موسس ژین لاحیاء التراث الوثاقی و الصحفی الکردی، حسین حسن کریم، چاپی یەکەم، بەرگی ١، چاپخانەی پەیوەند، بلاوکراوەکانی بنکەی ژین، ٢٠١٤: لاپەرە ٢٧٠-٢٧٢

لەگەڵ کشتوکاڵی و ئاژەڵداری، تا ئەتوانێت خزمەتی دەرمانگەری و چارەسەری خۆی پێشکەش بە خەڵکی دوور و نزیك دەکات. دەگێرنەوە کە ناوبانگی پسپۆڕی و شارەزایی پزیشکی سەید موحەمەد بە تەواوی ئێراندا بڵاو دەبێتەوە. دەرباری شای قاجار داوای لە دارالایالەی کوردستان دەکا ئەو پیاوە بنێرن بۆ تاران. گوایە سەید موحەمەد ڕازی نەبووە بەو داواکاریە. ئەو کاتە بووە کە کەسایەتی و مامۆستایانی ئایینی شاری سنە نازناوی "اشرف الحکمای کوردستان"ـی پێ ئەدەن.

لە پشت لاپەڕەی یەکەمی کتێبی "جراحی" دکتۆر پۆلاك نەمسەوی کە سەید ئەحمەد پشتەنگ[1] لە تاران بۆ سەید موحەمەدی کڕیوە، نووسراوە: "*بسمه تعالی اشتریت هذا الکتاب المسمی بجراحی من تصانیف استاذ الکامل دکتر پولاك نمسوی بثمن بخس دراهم معدودات الجل اخ الامجد السید محمد الملقب باشرف الحکما فی دارالخلافه الطهران. و ارجو من الله تعالی ان یحفظ صاحبه من جمیع البلیات اله مجیب الدعوات. فی سنه ١٣٣٤ [مطابق با ١٢٩٣* شمسی*] اخس ما خلق الیه محمد*". کەواتە نازناوی "اشرف الحکما" پێش ساڵی ١٢٩٣ هەتاوی بەو پیاوە بەخشراوە. دواتر بەفەرمی مامۆستایانی ئایینی و پیاوماقووڵانی شار بانگێشتی دەکەن کە بچێتە سنە و لەوێ نۆرینگەیەك بکاتەوە. ئەڵبەت هاتوچۆی سەید موحەمەد بۆ سنە پێشتر بەرچاو بووە و بەردەوام سەفەری کردووە. لەو بارەوە دەگێڕنەوە کە: *ئاوایی سیاسەران ڕۆژەڕێگەیەك بە ئەسپ دوور بووە بە شاری سنەوە. سەید موحەمەد جارێك بۆ کڕینی هەندێ پێداویستی دەرمان و کاروباری ناوماڵ و هەروەها سەردانی نەخۆشان، چووە بۆ سنە. لە گەڕانەوە، نزیك ئاوایی قڵیچیان تووشی شەڕێك هاتووە. گوایە چەند کەسی ڕێگر و چەتە پەلاماری گەوڕ و دیواخانی کوێخا عەبدولکەریم تەختەیی ئەدەن لە قڵیچیان. کوێخا و چەند کەس لە پیاوەکانی بەسەختی برینداردەبن. هاوسەری کوێخا داوا لە سەید موحەمەد حەکیم دەکات کە چارەسەریان بکات. بەڵێنی پێ ئەدات کە ئەگەر ئەمجارە کوێخا لە مەرگ ڕزگاری بێت لە دارای دنیا هەرچی بخوازێت بۆی دابین دەکات. چەند ڕۆژ خەریکی تیمار و سارێژی برینە قووڵەکانی کوێخا و پیاوەکانی دەبێت. سەرنجام کوێخا چاك دەبێتەوە. حەکیم لە بەرامبەردا خوازبێنی ڕابێعە خانم کچی کوێخا دەکات. ئەوانیش لە خوایان بووە بەو خزمایەتیە. قەبووڵی دەکەن و زەماوەنیان بۆ دەکەن. هەروەها دیواخانی کوێخا کتێبخانەیەکی بووە زۆر دەوڵەمەند. گەلێك لەو کتێبانە وا*

---

١. ئاواییەکە لە ناوچەی گەڕووسی بیجاڕ

*حەکیم ویستوویە کوێخا پێی بەخشیوە. پاشان حەکیم لە سنە ماڵێك دەگرێت و ڕابێعە خانم لەوێ دەبێت و دوو هاوسەری دیکەی لە حسین خان گەڕووس بوون. ناوبەناو هاتوچۆی سنە و گەڕووس دەکات و هەمیشە وەك دوو هەوارە ژیاوە و خزمەتی بە نەخۆشانی هەر دوو لا کردووە.*

لە نێوان ساڵەکانی ١٢٩٠ تا ١٣٠٠ هەتاوی سەید موحەمەد و براکەی ئاوایی حسێن خانی گەڕووس دەکڕن و لەوێ دەمێننەوە. دەگێڕنەوە کە سەید موحەمەد باوڕی وابووە کە دەرمان کەرەستەیەکە لەو سروشتە دابین دەبێت. ئەوەی کە دەبێتە هۆی چاکبوونەوەی نەخۆش، ودم و شەفای ناو دەرمانەکەیە کە نابینرێت و خوا دایناوە. جا ئەگەر ئەو دەرمانە لە شوێنێك و لە ڕێگەیەکی حەرام و خراپەوە دابین بکرێت، شەفای پێوە نابێت. جا بۆیە ئەگەر پیاوی ناردووە گیای بۆ کۆ بکەنەوە یا خۆی کۆی کردووەتەوە هەمیشە ئاگای لەوە بووە کە دەرمانەکە حەرام نەبێت. گوایە کاتێ ملکی حسێن خان دەکڕیت، گوتوویە: *ئەوە ئیتر بەدڵنیاییەوە بە ناو ملك و ماڵی خۆمدا دەگەڕم و گیا و گوڵ کۆ ئەکەمەوە و نەخۆشەکانی پێ چارەسەر دەکەم.* کاتی خۆی نامەیەك بۆ شێخ عەلائەدین بیارە ئەنووسێت و دەڵێت ماوەیەکە هەندێ لە نەخۆشەکانم چاك نابنەوە و شەفای دەستم کەم بووەتەوە. ئەویش وڵام ئەداتەوە کە لەوانەیە ماوەیەکە تەماعی دنیاییت زۆر بووبێت و ئەمە بووبێتە پەردەیەك بۆ نەگەیشتنی شەفای نەخۆشەکانت.

کاتێ سپای ڕووس هێرش دەکاتە سەر کوردستان و سنجر خان نەڕانی سپایەکی خۆجێیی پێك دەهێنێت، سەید موحەمەد حەکیم پزیشك و تیمارکەری سپای سنجر خان دەبێت. ساڵی ١٣١٠ هەتاوی کۆمەڵێك لە مامۆستایان و مالك و کەسایەتیەکانی ناوشاری سنە نامەیەك دەنووسن بۆ ئیدارەکانی مەعارف، تەندروستی و نظمیەی ئەوکاتەی سنە و حەکیمی و پسپۆڕی سەید موحەمەد حەکیم پەسەند دەکەن و دیسانەوە نازناوی "اشرف الحکما" دووپات دەکەنەوە. ئینجا بەفەرمی نۆرینگەی پزیشکی بۆ خەڵك دەکاتەوە و بەیانی تا نیوەڕۆ لە پادگانی سنە وەك پزیشك دەمێنێتەوە.

چەندین کاری ناوازە و نموونە و داهێنانی ئەو پزیشکە هەیە کە دەکرێت وەك توێژینەوەیەکی گەورە بخرێتە بەرباس و کاری لەسەر بکرێت. بۆ نموونە: کوتانی مایەی نەخۆشی هاوڵە بۆ پێشگری کەسی تەندروست لەو نەخۆشییە، تەقەڵی نەشتەرگەری و برین دووریـنەوە کە لە ڕەگی گوێرەکە سازی کردووە، گرتنەوەی تۆزێکی تایبەت لە تاڵی جاڵجاڵۆلە و ناوکی سێوەترشە بۆ بێهۆش کردنی نەخۆش و هەروەها بەکارهێنانی هاڕاوەی

سیر بۆ سەر هۆش هێنانەوە.

سەید موحەممەد حەکیم کۆمەڵێك کتێبی چاپی، دەستنووس، ناميلكە و بەڵگە و قەواڵەی هەیە کە لە کتێبخانەکەیدا بووە و ئێستە لای کوڕەزاکانیە. یەکێك لەو کتێبە دەستنووسانە کە پێویستە توێژینەوەی زیاتری لەسەر بکرێت، دەستنووسێکی ٥٠٠ لاپەڕەیە و پوختەیەکە لە کتێبە پزیشکیەکانی کۆنی فارسی، هەروەها چەندین پەراوێز و ڕەچەتەی دەرمانی بنەماڵەیی خۆیانی تێدایە. ساڵی ١٣٩٣ لە سێهەمین کۆنگرەی گیادەرمانی ئێران، نازناوی "ابن سینای کوردستان" بەخشراوە بە ڕۆحی خوالێخۆشبوو سەید موحەممەد حەکیم. هەروەها پاییزی ١٣٩٣ لە کتێبی "مستند ویژه دومین جشنواره و نمایشگاه ملی گیاهان دارویی، فرآوردەهای طبیعی و طب سنتی ایران"، کە لە لایەن نووسینگەی سەرۆك کۆماری ئێرانەوە چاپ بوو لە لاپەڕە ٨١ ژیاننامەی سەید موحەممەد ئەلیاسی چاپ کراوە. یا لە کتێبی "احیاگران طب سنتی صد سال اخیر ایران" کە ساڵی ١٣٩٦ زانکۆی شاهیدی تاران چاپی کردووە لە بەرگی ٢ بەتەسەل باسی ژیان و بەرهەمەکانی ئەم پیاوە کراوە.[1] کۆپی بەڵگە و دەستنووسەکانی کتێبخانەی ئەو حەکیمە گەورەیە لای بەندە پارێزراوە.

٣٠. **شێخ موحەممەد مەردۆخ کوردستانی** (١٢٥٦ـ ١٣٥٤ هەتاوی) ناسراو بە آیت‌الله مەردۆخ، لە شاری سنە لەدایك بووە و لەوێش کۆچی دوایی کردووە. کەسایەتیەکی ناودار و زانای سەردەمی خۆی بووە. پتر لە ٨٠ کتێب و ناميلكەی چاپکراو و چاپنەکراوی هەیە. یەکێك لەو کتێبانە کتێبی "*طب الخواص*"ـە کە سەبارەت بە گیادەرمانی و پزیشکییە. ساڵی ١٣٣٠ چاپخانەی ئەرتەش لە سنە چاپی کردووە و جاری دووهەم ١٣٩٦ هەتاوی بە شێوازێکی ڕێکوپێك و پەراوێزدار کاك جەماڵ ئەحمەدی ئایین لە پەخشانگای گوتار لە سەقز چاپی کردووە. عەلی ئەکبەر دێهخودا لە قامووسە گەورەکەی "فرهنگ دهخدا" چەند جار بۆ ڕاڤە و ڕوونکردنەوەی وشەکانی گیادەرمانی و پزیشکی ئاماژەی بەو کتێبە کردووە. یەکێکی تر لە کتێبەکانی، "*طب جدید آلمانی*"ـە کە سەردەمی ژیانی خۆی چاپ کراوە. ئەو کتێبە بریتیە لە سەرجەم دەرمان و مادە کیمیاوییە دەرمانیەکان کە لە پزیشکی تازەدا بەکار هاتووە.

٣١. **شێخ عوسمانی نەقشبەندی** (١٣١٤ــ١٤١٧ کۆچی): ئەو کەسایەتیە کوڕی گەورەی

---

١. مورادی ئیرەج، "حکیم نامی دیار گروس: سید محمد الیاسی ملقب به اشرف الحکمای کردستان"، همایش گروس شناسی، بیجار، شهریور ١٣٩٧، وەرگیراو لە (بەرگی ٢، کتێبی مشاهیر کرد، لاپەڕە: ١٩٧-١٩٩، هەروەها سەرچاوەکانی دیکە و وتووێژ لەگەڵ نەوەکانی و هەڵدانەوە و خوێندنەوەی دەستنووس و کتێبەکانی کتێبخانەی ئەم کەڵەپیاوە)

شێخ عەلائەدینە و یەکێك لە ناودارانی تەریقەتی نەقشبەندی بووە. هەر بە منداڵی لەگەڵ براکەی شێخ خالید (ناسراو بە شێخ مەولانای قەڵاشێخان) دەستی بە خوێندن کردووە. لە حوجرەکانی بیارە و دوورۆ خوێندنی ئایینی و وێژەی عەرەبی و فارسی تەواو کردووە. لەسەر ڕێنوێنی باوکی بووە بە سەرپەرشتیاری خانەقاکان. ماوەیەك لە دوورۆ و دواتر بیارە و سەرنجام ئەستانبۆڵ ماوەتەوە. ١٩٥٨ لە دوورۆ نیشتەجێ دەبێت و بۆخۆی لە ئاوایی مەحموودئاوا خانەقا و حوجرە و باخێك پێکەوە دەنێت و تا ئێستەش ماونەتەوە. لای هەموو ئەو کەسانەی لە نزیك و دوورەوە ئەو پیاوەیان ناسیوە، باری حەکیمی و پزیشکی شێخ عوسمان لە ئاستێکی بەرزدا بووە. گەلێك نەخۆش و دەردەدار بە ڕەچەتە و دەرمانە ساکارەکانی چاك بوونەتەوە. ئەوەی بەرچاوە شێخ بۆ چارەسەری نەخۆشیەکان پشتی بە گیا و گوڵ و دەرمانی ناو سروشتی کوردەواری بەستووە و لەڕێگەی ئەوانەوە دەرمانی داناوە بۆ خەڵك. ئێستاکەش گەلێك ڕەچەتەی ئەو پیاوە لای خەڵك ماوەتەوە و بەکاری دەبەن. هیوادارم هەوڵێکی بەرفراوان بدرێت بۆ کۆکردنەوەی ئەو گەنجینە نایابە. ئەو کەسایەتیە چەند بەرهەمێکی نووسینی هەیە: تفسیر سورە تین، سراج القلوب و دوو دیوانە شێعر. وا باس دەکرێت کە کتێبێ گیادەرمانی بووە بە ناوی *"گژوگیا"*. چارەنووسی ئەو کتێبە تا ئێستەش نادیارە. لە داهاتوودا لە بەرگی ٢ "بەشی دووهەم" کەشکۆڵی کەلاتەرزان (١) لە وتارێك باس لە ژیان و بەرهەم و ڕەچەتەکانی ئەو بەڕێزە دەکەین.

٣٢. **حەکیم خاوەری**: ئەو پیاوە مامۆستای کاك بورهان حوسەینی بووە و نۆرینگە و دەرمانخانەکەی لە کرماشان بووە. بنەمای کاری لەسەر پزیشکی کۆنی کوردەواری بووە. ناوەندی گیادەرمانی شەفا لە شاری سنە بە سەرپەرستی کاك بورهان حوسەینی ساڵی ١٣٧٨ کتێبی *"مجربات خاوری شفا"*یان بە زمانی فارسی لە ٢٣٠ لاپەڕەدا چاپ کردووە. ئەو کتێبە سەرجەم ئەزموون و زانیاریەکانی گیادەرمانی، پزیشکی خۆماڵی و بابەتەکانی دەرمانسازی و دەرمانگەری حەکیم خاوەرییە کە کۆ کراوەتەوە و بەشێوەیەکی ڕێکوپێك ڕێك خراوە و چاپ کراوە. کتێبەکە تەنیا بۆ نوێنەرانی گیادەرمانی شەفا لە شارەکانی کوردستان ناردراوە کە ئەوان بیخوێننەوە و کەڵکی لێ وەرگرن. ئەم کتێبە دەکرێت وەك یەکێك لە سەرچاوە ڕەسەنەکانی پزیشکی خۆماڵی کوردەواری لێکۆڵینەوەی لەسەر بکرێت. ئەم کتێبە یەکەم سەرچاوەیە کە باس لە پزیشکی خۆماڵی کوردەواری دەکات.

٣٣. **میرزا سدیق ئەحمەد چنگیانی** (١٩٢٠ـ٢٠٠٦): ئەو پیاوە لە ئاوایی هەوارەخۆڵی بانە لەدایك بووە و لە سلێمانی کۆچی دوایی کردووە. لەبنەڕەتدا خەڵکی گوندی چنگیانی

ناوچەی شارباژێڕ بووە. سەردەمی کۆماری مەهاباد لەگەڵ هێزەکەی حەمە ڕەشید خانی بانە بووە. لە سەروبەندی کۆمار چاوی کەوتووە بە پێشەوا قازی. پاش کۆمار بەرەو باشوور گەڕاوەتەوە. ماوەیەك لە ترسی هەر دوو حکوومەتی ئێران و عێراق لەسەر سنوور بە قاچاخ گەڕاوە تا ئەوەیکە نامەیەك بۆ شێخ عەلائەدینی بیارە ناردووە و داوای ئازادی کردووە. ئەویش وڵامی داوەتەوە کە بگەڕێتەوە بۆ پێنجوێن. لە شاری پێنجوێن دەست بە کار و کاسبی ئاسایی دەکات. پاشان بەنهێنی دەبێتە پێشمەرگەی بارزانی. نێوانی لەگەڵ مەلا مستەفا و شێخ عوسمانی دووڕۆ زۆر خۆش بووە. هەر زوو دەبێتە بەرپرسی لقی پارتی لە ناوچەکە و لەوکاتەوە تا دوای پێك هێنانی هەرێمی کوردستان، چەندین پلەی حزبی و حکوومی وەرگرتووە. ماوەیەك شارەداری سەرچناری سلێمانی بووە. هاتوچۆی بۆ لای شێخانی بیارە و دووڕۆ وای لێ دەکات ڕوو لە پزیشکی و گیادەرمانی بکات. ماوەیەك دەستبەسەر دەکرێت و دوور ئەخرێتەوە بۆ خوارووی عێراق. لەوێ ساڵی ١٩٧٦ دەست بە نووسینی کتێبی *"گژوگیا و ئاژەڵ"* دەکات و ١٩٩٠ لە چاپخانەی ئاشتی سلێمانی چاپی دەکات. دواتر ١٩٩١ دەست بە نووسینی کتێبی *"گەنجینەی دارستان"* دەکات و ١٩٩٥ لە چاپخانەی زانکۆی سەلاحەدین چاپ کراوە. ناوەرۆکی ئەو دوو کتێبە باسی گژوگیا و ئاژەڵانی کوردەوارییە و تایبەتمەندییە خۆراکی و دەرمانیەکانیان. میرزا سدیق لە لاپەڕە ١١ "گژوگیا و ئاژەڵ" باس لەوە دەکات: *...ئەم تۆزە شارەزایەم لە ٤ ڕێگاوە وەرگرتووە. یەکەم: لە ئاموشۆکردن و گوێگرتن لە بەرێزان و خاوەن پلەکانی شێخانی بیارە... دووهەم: هەندێکی لە کتێبی (طب الکبیر [حەکیم موحەمەد ئەرزانی شا]) وەرمگرتووە و کردوومە بە کوردی. سێهەم: برێکی لە باب و باپیران بیستوومە و سوودی لێ وەرگیراوە. چوارەم: ڕێکەوتی ژیانی خۆم وا بووە بە زۆری بە ناو گژوگیا و کوێستان زەمینەکانی کوردستاندا گەڕاوم...*

وەك خۆی لە پێشەکی گژوگیا و ئاژەڵ باسی دەکات چەندین نامەی پێشەوا و بارزانی و دەستنووسی دیکەی لا بووە لە کۆڕەوەکەی خەڵکی سلێمانی لە ڕێگەی شارەزوور بەهۆی خراپبوونی ماشێنەکەی، دزراوە و تا وەکوو ئێستە بنەماڵەکەی چاوەڕوانی ئەو گەنجینە نایابەن. لە هەماهەنگیەك کە لەگەڵ بنەماڵەی ئەو پیاوە کراوە، بڕیارە بەندە و کاك جەلال ڕەئووفی بەرهەمە چاپکراو و چاپنەکراوەکانی لە توێی کتێبێك بە ناوی "بۆژانە" چاپ بکەین. گەلێك توێژینەوەی مەیدانیمان لە بانە و سلێمانی ئەنجام داوە بۆ نووسینی ژیاننامەی. هەروەها کۆپی چەند بەڵگە و یاداشتی کە لای کاك سامان، کوڕەکەی بووە بە دەستمان گەیشتووە و ئەویش لە توێی ئەو کتێبە دەخەین. پاییزی ١٣٩٧ لە کۆنفرانسی مەولانا

خالید شارەزووری لە زانکۆی کوردستان بە خزمەت شێخ موحسێن موفتی هەولێری گەیشتم. بەیاریدەی ئەو پیاوە بووە کە کتێبەکانی میرزا سدیق چاپ بووە. ئەو بەڕێزە باسی لەوە دەکرد کە *بەڕاستی میرزا سدیق کەسێکی نەگۆڕ و نەدۆڕ و پیاوی سەردەمی خۆی بوو. کوردێکی دڵسۆز و نەتەوەیی و شارەزایی پزیشکی بوو.*

٣٤. **دکتۆر هیوا عومەر ئەحمەد**: ئەو پیاوە ساڵی ١٩٨٣ کتێبێکی بە ناوی "*دەرمانگەری کوردی*" لەسەر بابەتەکانی چارەسەری و دەرمانی گیایی کوردەواری لە وزارەتی ڕۆشنبیری عێراق چاپ کردووە.

٣٥. **دکتۆر عەبدوڕەحمان عەبدوڵا**: ساڵی ١٩٩٢ کتێبی "*فەرهەنگی پزیشکی*" نووسیوە و ٢٠٠٨ کاک جەمال عەبدول کاری پێداچوونەوە و ساقکردنەوەی بۆی کردووە و لەلایەن پەخشانگای ئاراس لە هەولێر چاپ کراوە. ئەو کتێبە پەرژاوەتە سەر نووسینی وشە و دەستەواژە پزیشکی و دەرمانی و چارەسەرییەکان بە زمانەکانی ئینگلیزی و عەرەبی و کوردی.

٣٦. **کەمال جەلال غەریب**: کەسایەتیەکی ناسراوی بواری سروشت و گیادەرمانی و گیاناسی باشووری کوردستانە. "فرهنگ" یەکێك لە کتێبەکانی ساڵی ١٩٩٤ لەلایەن پەخشانگای ژیار و بەهاوکاری بانکی سادراتی کوردستان لە سنە چاپ کراوە. ئەو کتێبە کۆمەڵێك ناو و باسی ڕوەك و ئاژەڵی بە زمانی کوردی و ئینگلیزی و عەرەبی نووسیوە. ساڵی ٢٠١٢ پەخشانگای ئاراس لە هەولێر کتێبی "*کەڵەفەرهەنگی ڕوەکە ئابوورییەکان بەتایبەتی لە کوردستاندا*" و "*فەرهەنگی وێنەداری گیانداران بەتایبەتی لە کوردستاندا: کوردی، عەرەبی و ئینگلیسی*" چاپ کردووە. ئەو کتێبە پەرژاوەتە سەر بەشێکی زۆر لە ڕوەکە خۆڕسك و کشتوکاڵیەکانی کوردستان هەم لە بواری گیاناسی، گیادەرمانی و کشتوکاڵی. بەشێوەیەکی زانستیانە ناوەڕۆك و مادە دەرمانی و ژەهراوی و خۆراکیەکانی ناو ڕوەکەکانی باس کردووە و هەروەها گەلێك بابەتی پەیوەست بە پزیشکی خۆماڵی کوردەواری لەسەر گژوگیاکان هێناوەتە گۆڕێ.

٣٧. **فایەق موحەمەد نادری**: ئەو پیاوە خەڵکی ئاوایی سەردۆش سەر بە شارستانی مەریوانە و ساڵانێکە لە سلێمانی نیشتەجێیە و دووکانی گیادەرمانی هەیە. ساڵی ١٩٩٩ لە شاری سلێمانی کتێبی "*چارەسەر کردنی نەخۆشی بە گوڵ و گیا*" چاپ کردووە. وەك خۆی لە پێشەکی کتێبەکەدا دەنووسێت، ئەزموونی گیادەرمانی و چارەسەر کردنی سروشتی و خۆماڵی لە باب و باپیرانیەوە پێی گەیشتووە و بۆ فێربوونی ئەو ئەزموونە ڕووی کردووەتە

لای پیران و پسپۆڕانی ئەو بوارە لە ناوچەکە. پاش ئەوەی کەسانێك لە سلێمانی سەردانی دەکەن و چارەسەر وەردەگرن داوای لێ دەکەن کە کتێبێك بنووسێت و ئەزموونەکانی تێدا کۆ بکاتەوە. وەك لە ناوەڕۆکی کتێبەکەیدا دیارە ئەزموون و لێزانینەکانی پزیشکی کوردەواری لەسەر نەخۆشینەکان ئاوێتەی زانیاریە تازەکان کردووە و بۆ هەر نەخۆشیەك دەرمان و ئامۆژگاری پێویستی داناوە.

٣٨. **حاجی موحەممەد ڕەفاعی (١٢٩٩ـ١٣٨٨ هەتاوی)**: ئەو پیاوە یەکێك لە کەڵەپیاوانی بنەماڵەی حەکیمانی ئاوایی سەبەتڵووی بانە بووە. نەریتی پزیشکی و دەرمانگەری لای ئەو بنەماڵەیە بۆ چەند پشتی پێشوویان دەگەڕێتەوە. ناسراوی و ناوداری ئەو بنەماڵەیە کاتی خۆی تا دەرەوەی سنوورەکانی کوردستان چووە و لە شارە دوورەکانی ئێران و تەنانەت تورکیە و عێراق سەردانیان کردووە. شارەزایی لە چارەسەر کردن و دەرمانگەری بە زۆربەی کوڕ و کچەکانی ئەم بنەماڵە گەیشتووە. بۆ نموونە خات زینەت لە ئاوایی شوێ بانە و خات بەنەوش[1] لە شارۆچکەی ڕەبەتی سەردەشت چەشنی حاجی موحەممەد و کەسانی دیکەی ئەو بنەماڵەیە، خەڵك بۆ چارەسەریی سەردانیان کردووە. دکتۆر دیار ڕەفاعی سەرجەم ئەزموون و یادەوەرییە پزیشکیەکانی حاجی موحەممەدی باپیری کۆ کردووەتەوە و لە کتێبێك بە ناوی "*درمان با گل و گیاه*" چاپی کردووە و تا ئێستە دوو جار چاپ بووە. لە پێوەندیەك لەگەڵ دکتۆر دیار، بەڕێزیان باسیان لەوە کرد کە لەسەر حەکیمانی سەبەتڵوو کتێبێکیان بەدەستەوەیە کە ئامادەی چاپ کراوە. حاجی موحەممەد کۆمەڵە هۆنراوەیەکی کوردی هەیە کە بنەماڵەکەی سپاردوویانە هەڵەگری و ڕێکوپێك بکرێت تا لە داهاتوودا ئەویش چاپ بکەن. باوکی حاجی موحەممەد لەگەڵ مینە حەکیم خەڵکی سوورەبانی شارباژێڕ پێوەندی بووە و نەخۆشیان بۆ لای یەك ناردووە. مینە حەکیم کەسێکی شارەزا بووە لە ناوچەی خۆیان و کاتی خۆی بریندارانی سپای شێخ مەحموودی نەمری لە ناوچەکەی دەرمان کردووە.

٣٩. **دکتۆر مەسعود کتانی**: خەڵکی شاری ئامێدییە لە پارێزگای دهۆك. ئێستە تەمەنی لە ٧٣ ساڵاندایە و هێشتا دەستی لە نووسین و توێژینەوە و دەرمانگەری هەڵنەگرتووە. لە بوارەکانی شێعر و فەرهەنگی کوردی، گیاناسی و گیادەرمانی، کشتوکاڵ و دارستان چەندین

---

١. بەهاری ١٣٩٧ لەگەڵ موحەممەد سدیق نادری کوڕی خات بەنەوش وتوویژێکم ڕێك خست. یەکێك لە دەرمانەکانی ئەو خانمە بە "دەرمانە سەوزە" ناسراو بووە. لە بەرگی ٢ باسی ئەو خانمە دەکەین.

کتێبی ئاکادمی نووسیوە. کتێبەکانی بە عەرەبی و کوردی داناوە و تا ئێستە ٧٢ کتێبی چاپ بووە. بەشێکی بەرچاو لە کتێبەکانی بەتایبەت ئەوانەی لەسەر چاندن، پاراستن و باخەوانی و دارستان و گیادەرمانی و گیاناسیە سەرچاوەی خوێندکارانە لە زانکۆکانی عێراق. بە یەکەم شارەزای بواری ڕوەك لە باشووری کوردستان و تەنانەت عێراق دەناسرێتەوە. وەك خۆی لە بەرنامەیەك باسی دەکا چارەسەری زیاتر لە ٢٥٠ خانمی کردووە کە منداڵیان نەبووە بەیارمەتی چارەسەری گیایی.[١]

٤٠. **بورهان حوسەینی**: ئەو کەسایەتیە دامەزرێنەر و حەکیمی ناوەندی گیادەرمانی شەفایە لە شاری سنە. ساڵی ١٣٣٥ هەتاوی لە ئاوایی لۆنی کامیەران لەدایك بووە و ئێستە لە سنە نیشتەجێیە. ساڵی ١٣٦٥ هەتاوی دەستی کردووە بە کاری گیادەرمانی و تا ئێستە درێژەی هەیە. کاك بورهان سەرەتا لای حەکیم خاوەری لە شاری کرماشان فێری ڕەوتی گیادەرمانی و پزیشکی خۆماڵی کوردەواری بووە و ڕێچکەی ئەزموون و زانستی ئەو پیاوەی گرتووەتە بەر. ناوەندی گیادەرمانی شەفا هاوکات کارگەیەکی بەرهەمهێنانی ئاوتك و دەرمانی گیایی هەیە لە سنە داناوە، هەروەها لە زۆربەی شارە کوردنشینەکانی ڕۆژهەڵاتی کوردستان نوێنەرایەتی فرۆشی بەرهەمەکانیان هەیە. شەفا یەکێك لەو شوێنانەیە کە بەشێکی بە ناوی تاد داناوە کە توێژینەوەی گیاناسی و گیادەرمانی و پزیشکی خۆماڵی کوردستان دەکات. بۆ زۆربەی نەخۆشینەکانی مرۆڤ ڕەچەتەی تایبەتیان نووسیوە و جیاجیا ئەو ڕەچەتانە دانراون و کاتێ نەخۆش سەردانیان دەکات لەگەڵ دەرمان و ئاوتکە گیاییەکان ڕەچەتەی نووسراوی تایبەت بە خۆی پێشکەش دەکەن. ئەو ڕەچەتانە و کۆمەڵێك بابەتی گیادەرمانی و پزیشکی خۆماڵی لە ڕووی کتێبە پزیشکیە کۆنەکان و هەروەها ئەزموونی پێشینیانی کوردەواری وەرگیراوە و ئامادە کراوە. ساڵی ١٣٨٧ ئەو ڕەچەتە و بابەتانە لە پەرتووکێك بە ناوی "*مجربات شفای کوردستان*" لە ژمارەیەکی سنووردار چاپ کراوە و لە-بەردەستی نوێنەرەکانی شەفا دانراوە. ئەو کتێبە گەلێك بابەتی پزیشکی خۆماڵی کوردەواری، گیادەرمانی، زانستی خۆراك و دەرمان و چێشت و گژوگیای تێدایە کە زۆربەیان لەسەر بنەمای هەگبە و گەنجینەی ئەزمووونی پێشینیانی کوردەوارییە. پاش کتێبی "مجربات خاوری شفا" ئەو کتێبە دەکرێت وەك دووهەمین سەرچاوەی ئەزموون و زانستی پزیشکی خۆماڵی کوردەواری لەبەرچاو بگیرێت. بەشی "تاد" لە ناوەندی گیادەرمانی شەفا چەندین

١. بەرنامەی "دێکۆمێنتاری" کەناڵی ڕووداو، ١٥ کانوونی دووەمی ٢٠١٧

نامیلکە و کتێبیان چاپ کردووە کە تێیدا باس لە پزیشکی خۆماڵی کوردەواری کراوە، بۆ نموونە: *نسخ مجرب شفای کوردستان، تقویم کردی ١٣٩٣ بر مبنای پنج تار، درمانگری شفای کوردستان، گیابەند* و هتد.

٤١. **هەردەوێڵ کاکەیی**: ئەو پیاوە یەکێك لە توێژەران و نووسەرانی ناوچەی گەرمیانە. بۆخۆی چونکە کاکەییە و سەر بە ئایینی یارسانە، گەلێك کاری لەسەر فەرهەنگ و وێژە و پەیام و نەریتی کاکەیی و شەبەکەکان کردووە. چەندین کتێبی چاپ بووە و بەردەوام خەریکی توێژینەوەیە. نموونەی چەند لە کتێبە چاپکراوەکانی ئەمانەن: پەیامی کاکەیی، پیر و موریدی هەفتەوانە، پەندی پێشینان و قسەی نەستەقی شەبەك، پەند و قسەی نەستەقی ماچۆ، فەرهەنگی شەبەك، مەتەڵ لەناو شەبەکدا، کۆمەڵێك شێعری مەلا عەباس حلیمی کاکەیی، و هتد. یەکێك لە کتێبە چاپکراوەکانی "*دەرمانسازی فۆلکلۆری لە دەڤەری کەرکووک*"ـە کە لەلایەن پەخشانگای ئاراس لە هەولێر ساڵی ٢٠٠٩ چاپ کراوە. وەك خۆی لە پێشەکیەکەیدا باسی کردووە ئەو کتێبە هەوڵێکی بەربڵاوە کە سالانێك بەهۆی رادیۆی کەرکووکەوە هەندێ لە زانیاریەکانی کۆ کراوەتەوە و دواتر سەردانی حەکیمان و شارەزایانی بواری گیادەرمانی ناوشاری کەرکووك کراوە و سەرجەم ئەزموون و لێزانییەکانی ئەو کەسانە کۆ کراوەتەوە. ناوەرۆکی ئەو کتێبە بریتیە لە گەلێك بابەتی دەرمانی و چارەسەری و ناوی نەخۆشی و ڕەچەتە کە لەناو خەڵکی کەرکووکدا پشتاوپشت بەکار هاتووە و ئێستە گەیشتووە بەوان.

٤٢. **ئاواز ئەحمەد حەمەدەمین دزەیی**: ئەم پیاوە سەرجەم خۆراك و چێشتە خۆماڵیەکانی کوردەواری لە توێی ٧٣ لاپەڕەدا بە ناوی "*خواردەمەنی کوردەواری*" ساڵی ١٩٩٨ بەیارمەتی وەزارەتی ڕۆشنبیری هەرێمی کوردستان چاپ کراوە. گەلێك زانیاری ناوەرۆك و ناوی چێشت و نانەکانی ناوچەکانی کوردستان بەتایبەت دەڤەری هەولێری تێدایە.

٤٣. **ئەمیر ئەمینی**: ئەو توێژەرە ١٣٣٦ هەتاوی لە پاوە لەدایك بووە و ئێستە لە شاری قائمشەهر نیشتەجێیە. کتێبێکی لە ژێر ناوی "*فرهنگ گیاهان دارویی: فارسی، کوردی، عەرەبی، ئینگلیسی و لاتین*" نووسیوە. ساڵی ١٣٧٦ یەکەم چاپی لە پەخشانگای تاقەوسانی کرماشان بڵاو بووەتەوە. تا وەکوو ئێستا ١٩ جار چاپ کراوە. کۆمەڵێك ڕووەك لەگەڵ تایبەتمەندی دەرمانی و پێشینەیان لە فەرهەنگی کۆنی کوردەواری و ئێران لەو کتێبە باس کراوە. بەشێکی بەرچاوی ئەو کتێبە مێژووی کۆنی ڕووەك و دەرمانە ڕووەکیەکانە لە سەردەمانی کۆنی کوردستان. جێی ئاماژەیە کە ئەگەر نووسەر ئەو بابەتە مێژووییانە وا لەو

کتێبەدا باسی کردووە، ناونیشانی ژێدەر و سەرچاوەکانی بهێنایە ئەو کتێبە دەبووە کتێبێکی هەرەگرینگ لە مێژووی گیاناسی و گیادەرمانی کوردستاندا. گەلێك بابەت و باسی ئاماژە پێ کردووە کە پێویستە سەرچاوەکەی بهێنرێت تا بسەلمێنرێت و بە درۆ نەخرێتەوە. بۆ نموونە باسی لە حەکیمانی کۆنی سەردەمی مادەکان کردووە لە ناوچەکانی حەڵوان و ئالان کە ناویان "حەکیم نەمری و حەکیم نیشان" بووە و خاوەنی خەستەخانە و دەرمانخانە بوون.

٤٤. **شەهاب خزری**: ئەو توێژەرە ساڵی ١٣٣٠ هەتاوی لە ئاوایی ڕەشنەش سەر بە ناوچەی کەڵاتەرزانی سنە لەدایك بووە و ئێستە لە سنە نیشتەجێیە و خانەنشینی دادگای ئەو شارەیە. وەك باس دەکرێت زیاتر لە ١٠ ساڵان گەڕاوە و هەموو کێو و ئاواییەکانی پارێزگای سنە و کرماشان و مەهابادی پشکنیوە و ناوی کوردی و نموونەی گیاکانی کۆ کردووەتەوە و هەمبەری فارسی و لاتینیی ئەو گیایانەی دۆزیوەتەوە و نووسیویە. زۆربەی ڕووەکەکانی فلۆرای پارێزگای سنەی لەو کتێبەدا هێناوە، و تا نزیك پیرانشار و مەهاباد و پاوە و جوانرۆیش ڕۆیشتووە. ئەگەرچی بۆخۆی گیاناسی و گیادەرمانی نەخوێندووە، بەڵام بەڕاستی کارێکی بێوێنەی ئەنجام داوە و لە ئاستی خۆیدا لە کوردستان کارەکەی دەگمەنە، (*فرهنگ گیاهان دارویی کوردستان*). ئەو کتێبە بە کوردی و فارسی نووسراوە. وەك بۆخۆی لە پێشەکی کتێبەکە گێڕاویەتیەوە، بۆ ناساندنی گیاکان سەردانی ڕووەکناسی سنە ئەندازیار حوسێن مەعرووفی و هەروەها دکتۆر موزەفەریان لە زانکۆی تارانی کردووە. جیا لەو کتێبە، کتێبی "*فرهنگ گیاهان دارویی: خواص میوەها، گیاهان و سبزیها*" داناوە کە ئەویش بەشێکی بەرچاو لە سوودە دەرمانی و خۆراکیەکانی گژوگیا و میوە و سەوزی کوردستانی تێدا بە فارسی باس کردووە. ئەو دوو کتێبە ساڵی ١٣٨١ لەلایەن پەخشانگای زانکۆی سنە چاپ کراوە.

٤٥. **سەدرەدین نوورەدین ئەبووبەکر**: ئەو توێژەرە هەوڵی داوە بە کوردی لەسەر نەخۆشی و ئافەتە کشتوکاڵیەکان کتێبی "*دەردەکانی بەروبوومی کشتوکاڵی داکراو*" نووسیوە و ساڵی ٢٠٠٠ چاپ کراوە. ئەو توێژەرە هەروەها ساڵی ٢٠٠٣ لە هەولێر کتێبی "*ڕێبەری بەرهەمهێنان و پەینکردنی بەروبوومە کشتوکاڵیەکان*"ی چاپ کردووە. ئەو کتێبە پەرژاوەتە سەر خاڵ و تێبینیەکانی کشتوکاڵی بۆ ڕووەکەکان و هەروەها شێوازەکانی بەکارهێنانی پەینی ئاژەڵ و کیمیاوی.

٤٦. **قادر عبدالعزیز ڕەشید ناسراو بە قەچاخ**: ئەو شاعیرە لەدایکبووی ١٩٦٢ لە گوندی کورێمێ پارێزگای دهۆك. تا وەکوو ئێستا پێنج کۆمەڵە هۆنراوەی چاپ کردووە. دوابەرهەمی

ناوی *"گوڵدان"*ـە كە ٢٠٠٤ لەلایەن چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە چاپ كراوە. گوڵدان سەرجەم ناوی گژوگیا و گوڵ و داری كوردەوارییە بە شێوەزاری كرمانجییە و بە شێوەی هۆنراوە.

٤٧. **ساڵح عەبدوڵا ئەشكەنەیی ناسراو بە ساڵحی سروشت:** كەسایەتیەكی ناسراوی باشووری كوردستانە لە بواری سروشت و گیادەرمانیدا. كتێبی *"سروشت و تەندروستی"* تا وەكوو ئێستە ٣ جار چاپ بووە و چاپی دووهەمی ٢٠١٠ و سێهەمی ٢٠١٣ هاتووەتە بازاڕەوە. بەرپرسی كۆمەڵەی گیادەرمانانی هەرێمی كوردستان كاك ئیسماعیل موشیر پێشەكی لەسەر چاپی یەكەمی نووسیوە. كتێبەكە پڕاوپڕ زانیاری كۆن و تازە لەسەر بابەتی سروشت، گیادەرمانی و گیاناسییە. بابەتە بنەماییەكانی پزیشكی كۆن وەكوو مەزاج و سروشت و ڕەهەند و ئامانجەكانی بەوردی باس كردووە. بەگشتی ئەوەی پێویستە لەسەر ئەو زانستە لەو كتێبەدا هەیە و سەرچاوەیەكی گرینگ و سەرەكییە لە بواری گیادەرمانی و گیاناسی كوردیدا.

٤٨. **قادر باوەجان:** كەسایەتیەكی دیاری باشووری كوردستانە لە بواری لێزانی لەسەر سروشت، كوێستانەكانی كوردستان، كشتوكاڵ و گیادەرمانی. ساڵی ٢٠٠٤ بەیارمەتی وەزارەتی ڕۆشنبیری كتێبێكی بە ناوی *"گوڵشەنی كەژەكان"* چاپ كردووە. ئەو كتێبە گەلێك زانیاری باشی تێدایە لەسەر كێو و دەشت و ناوچەكانی كوردەواری، زانیاری گیادەرمانی و كشتوكاڵ و سروشتی دەشت و كێو و گیا و گوڵەكان. بۆ بابەتی زانینی فۆلكلۆر و كەلتووری كۆنی ئەو بوارە زۆر بەنرخە. ساڵی ٢٠١٢ لە دوو بەرگدا كتێبی *"گیا و گوڵ"* بەیارمەتی وەزارەتی ڕۆشنبیری چاپ كردووە كە هاوشێوەی گوڵشەنی كەژەكانە، بەڵام لێرە زۆرتر پەرژاوەتە سەر گیاكان و تایبەتمەندیەكانی باس كردووە. بەگشتی ئەو دوو كتێبە سەرچاوەیەكی بەنرخە بۆ زانیاریەكانی پزیشكی كوردەواری و گەنجینەی گیادەرمانی حەكیمانی كۆنی خۆمان. وەك خۆی لە پێشەكی گوڵشەنی كەژەكاندا باسی دەكات باوكی گیادەرمان و پزیشكێكی ناسراو بووە و گەلێك زانیاری لەسەر گژوگیا و دەرمانی سروشتی كوردی زانیوە. ئەویش لە باوكی فێر بووە و دواتر بۆخۆی هەوڵی داوە بە كێو و شاخەكانی كوردستاندا بگەڕێت و زانیاری كۆ بكاتەوە.

٤٩. **حەمە ساڵح فەرهادی:** ئەو توێژەرە ساڵی ٢٠٠٧ لە لایەن چاپخانەی ئاراس لە هەولێر كتێبی "*چەپكێك لە زاراوەگەلی كشتوكاڵی*: كوردی، عەرەبی و ئینگلیزی" چاپ كردووە. ئەو كتێبە پێك هاتووە لە واتای وشە كشتوكاڵیەكان، لەگەڵ ناوی ڕووەك و گوڵ و میوە و

سـەوزەواتەکان. هەروەهـا کتێبـی *"خەرمان: فەرهەنگێکـی کشتوکاڵی تایبەتمەندە: کـوردی و عەرەبی"* چاپ کردووە. ئەو کتێبەش بابەتەکەی وشە و دەستەواژە کشتوکاڵیەکانە بە کوردی و عەرەبی و لە ئەسڵدا ساڵی ۱۹۹۱ نووسراوە و ساڵی ۲۰۰۹ لە دەزگای ئاراس چاپی کردووە.

۵۰. **هێرش مەحموود**: ئەو بەڕێزە خەڵکـی شـارۆچکەی سەنگەسـەرە سـەر بە شارسـتانی چۆمان. ساڵی ۲۰۰۳ کتێبی "هەگـبەی کـوردەواری بـۆ چارەسـەری نەخۆشـی بە خـۆراك و گژوگیـا" نووسـیوە و ۲۰۰۷ لەلایەن پەخشـانگای تەفسـیر لە هەولێـر چـاپ کـراوە. بەشـی سەرەتای کتێبەکە باسی سەرەکی چۆنیەتی بەدەست هێنانی گیادەرمانیەکان و وشك کـردن و کۆکردنەوەیە. پاشـان پەرژاوەتە سـەر یەکە یەکەی گیاکـان بـۆ چارەسـەری نەخۆشـی و گرفت و ئازارەکانی مرۆڤ.

۵۱. **لەیـلا کـوردبەچە**: ئەو خـانمە سـاڵی ۱۳۸۷ کتێبـی *"هنر آشپزی کـوردی"* لە ۲۰۸ لاپەڕەدا لەلایەن پەخشانگای صوراسرافیل چاپ کردووە. ئەو کتێـبە شـێوازی دروسـتکردنی کۆمەڵێك چێشت و پێخۆری تایبەت بە ناوچەکانی کـوردەواری تێـدایە، وەکـوو: جۆرەکـانی شۆرباو، پلاو، دۆڵمە، کفتە، کووکوو، شلە، خۆرشت، ئاوگۆشت، کەباب، نان، کولێرە، زەڵاتە، بەرکوڵ و شیرینی.

۵۲. **جەلال کەریم ئۆمەر**: ئەو پیاوە خاوەنی بڕوانامەی بەکالۆریۆسـی بـایۆلۆژییە و ئێسـتە کارمەنـدی نەخۆشـخانەی سـلێمانییە. هاوکـات یەکێـك لە دامەزرێنەرانـی کـۆمەڵەی گیادەرمانانی هەرێمی کوردستانە. کاك جەلال چەند ساڵێکە بەرپرسی بەشی ڕاگەیانـدنی ئەو کۆمەڵەیە بە ئەستۆیە. لە گەرەکـی ڕاپەڕینـی شـاری سـلێمانی نووسـینگەی گیادەرمـانی و کەڵەشاخی ژیاری داناوە. تا وەکوو ئێستە چەنـد کتێـب و نـامیلکەیەکی لەسـەر کەڵەشـاخ، بابەتەکانی چارەسەری، پزیشکی خۆماڵی و حەکیمانی کوردەواری چاپ کردووە. بۆ نمـوونە: کەڵەشاخ لە نێوان زانست و ئەفسانەدا، کەڵەشاخ و پزیشکی نوێ، ڕێگەکانی بەرهەمهێنـانی ڕوەکی پزیشکی و دروستکردنی دەرمانی گیایی، دەوای دەردان (چارەسەری نەخۆشـییەکان بە ڕوەکی پزیشکی) و چارەسەر بە دەرمانی گیایی لە نێـوان مێـژووی دوێنـێ و پێویسـتی ئەمڕۆدا.

۵۳. **دکتـۆر سـالم ئیسماعیل شەهباز**: ئەو تـوێژەرە سـاڵی ۲۰۱۳ لەلایەن ناوەنـدی چـاپەمەنی پارێزگـای‌دهـۆك کتێبـی ڕوەکەپزیشـکیەکانی باشـووری‌کوردسـتانی لە قەبـارەیەکی گەورەدا چاپ‌کردووە. ئەم کتێـبە بە زمـانی ئینگلیـزی نووسـراوە لە ژێـر نـاوی " Medicinal Plants of Kurdistan Iraq". کۆمەڵێـك گیـای پزیشـکی باشـووری کوردسـتانی بە هەمـوو زانیاریەکـانی

گیاناسی، کشتوکاڵ و سوودی پزیشکییەوە باس کـردووە. وێـنەی ڕەنگـی ڕووەکەکانیشـی لەنـاو دەقی کتێبەکەدا هێناوە.

٥٤. **دکتۆر مەحمەت فیرات**: ساڵی ١٩٧٧ لە گوندی کووجەخا سەر بە شاری سەمسـوور لە باکووری کوردستان هاتووەتە دنیا. خوێندنی لە بواری کشتوکاڵ و گیاناسـیدا بـووە. ئێسـتە یەکێك لە گیاناسانی ناسراوی تورکیە و کوردستانە و مامۆستای گیاناسی زانکۆی وانە. سـاڵی ٢٠١٣ لەلایەن پەخشانگای سیتاڤ لە وان کتێبی "*فەرهەنگا ناڤێن ڕووەکێن ب کوردی*" چـاپ کردووە. ئەو کتێبە سـەرجەم نـاوی ڕووەکـی بـاکووری کوردسـتانی بە زمانەکـانی کـوردی، تورکی و لاتین هێناوە. لە کۆتایی کتێبەکەیـدا وێـنەی ڕەنگـی زۆربەی ڕووەکەکـانی دانـاوە. بەدڵنیاییەوە ئەو کتێبە سەرچاوەیەکی بەپێزی بواری گیاناسی کوردستان ئەژمار دەکرێت.

٥٥. **ئەحمەد درهی ناسراو بە ئەحمەت قاسم ئۆغلۆو**: ئەو توێژەرە بۆخۆی ئێستە لە شـاری ئامەد دائەنیشێت. ساڵی ٢٠١٣ لەلایەن پەخشانگای زانکۆی ماردین لە بـاکووری کوردسـتان فەرهەنگێکی بێوێنە و بەپێزی ناوی گژوگیـای کوردسـتانی لە ژێـر نـاوی "*فەرهەنگا ناڤێن نەباتان ئە کوردی*"چـاپ کـردووە. ئەو کتێـبە سـەرجەم گژوگیـا و دار و گـوڵی خۆڕسـك و کشتوکاڵی کوردستانی بە زمانی کوردی، تورکی و لاتین هێناوە. لە جۆری خۆیدا یەکێـك لە سەرچاوە بێوێنەکانی بواری سروشت و کشتوکاڵ و گیاناسییە لە کوردستان.

٥٦. **ئیرەج موڕادی**: [نووسەری کتێبی بەردەست]. پاش دە ساڵ تـوێژینەوەی مەیـدانی و خوێندنەوەی سەرچاوەکان، ساڵی ١٣٩٤ بە هاوکاری کۆمەڵەی ڕووەکناسـانی کوردسـتان دوو کتێبـی "*فەرهەنگـی ڕووەکناسـی کوردسـتان*" و "*پێشـەکیەک لەسـەر ڕووەکناسـی، گیادەرمـانی و پزیشکی خۆماڵی کوردەواری*" چاپ کردووە. کتێبـی فەرهەنگـی ڕووەکناسـی بـریتیە لە نـاوی سەرجەم گیاکانی کوردستان بە پێنج زمانی کوردی، فارسی، عەرەبـی، ئینگلیـزی و لاتـین. کتێبی دیکە پێشەکیەکە لەسەر زانیاریەکـانی زانسـتی گیاناسـی و گیادەرمـانی و پزیشـکی خۆماڵی کوردەواری لە کوردستان.

٥٧. **عارف تەبەد**: خاوەنی بڕوانامەی ماستەڕی ڕووەکە پزیشکیەکانە لە کرماشان. هاوکات بەشێوەی مەیدانی چەند ساڵە لە هێرباریۆمی (پووشگە) ناوەنـدی تـوێژینەوەی کشـتوکاڵ و ژینگەی کرماشان نموونەی ئەو ڕووەکانەی لە شاخ و دەشتەکانی کوردستان کۆی دەکـاتەوە، زانیاری پێویستیان بۆ دەنووسێت. تا وەکوو ئێستە چەند جۆر گیای تـازەی کوردسـتانی بـۆ یەکەم جار لە جیهانـدا تۆمـار کـردووە. خەریکـی نووسـینی دوو کتێـبە: "*گیاهان خودروی خوراکی کردستان*" و "*گیاهان خودروی درمانی کردستان*". بـابەتی ئەو کتێبـانە گیاناسـی و

گیادەرمانییە. زانیاریەکانی ڕواڵەتی ناسینی گیاکان و بابەتی سوود و تایبەتمەندییە خـۆراکی و دەرمانیەکانی لە فەرهەنگی خەڵکی کورد، تایبەتمەندی ئەو دوو کتێـبەیە. ئەو کتێبـانە بە زمـانی فارسـی نووسـراون. لە داهـاتوویەکی نزیکـدا دەکەوێـتە بەردەسـتی خـوێنەران و خوازیارانی هێژا.

٥٨. **عەلیڕەزا پیران**: کەسـایەتیەکی ناسـراوی بـواری ژیـنگە و سروشـت و پزیشـکی خۆماڵی کوردەوارییە. ساڵی ١٣٣٩ هەتـاوی لە بیجـاڕ لەدایـك بـووە. بەشـێکی زۆری ژیـانی داناوە بۆ پاراستن و بووژانەوەی ژیـنگەی نـاوچەکە. وەك خـۆی باسـی دەکـات هەمـوو ئەو ڕووەکانەی لە دەشت و کوێستانەکان کـۆی دەکەمەوە زانیاریەکانیـان دەنووسـمەوە. ئەوانەش وا نایزانم سەردانی ئەندازیار حوسـێن مەعرووفـی [نووسـەری کتێبـی فلـۆرای کوردسـتان] دەکەم و زانیاری پێویست لەوان وەردەگرم. ساڵی ١٣٨٩ هەتاوی لەلایەن زانکـۆی پزیشـکی بەهەشـتی تـاران دکتـۆرای فەخـری پـێ بەخشـراوە. هەروەهـا سـاڵی ١٣٩٧ هەتـاوی لە دووهەمین ڕێوڕەسمی ساڵانەی پارێزەرانی دارسـتان لە ئێـران، وەك جەنگەڵبـانی نمـوونەی ئێران خەڵات کـراوە. بەردەوام بە ئاواییەکانـدا دەگەڕێـت و زانیـاری کـۆ دەکـاتەوە لەسـەر گژوگیا و دەرمانی خۆماڵی کوردەواری. بەر لە هەموو کەسێك هەوڵی داوە بـۆ کـۆکردنەوە و ناساندنی سەید مـوحەمەد ئەلیاسـی ناسـراو بە اشـرف الحکمـای کوردسـتان. هەمیشـە لە پێشانگا و شوێنە گشتیەکان کە کارەکانی خـۆی نیشـان داوە یـادی ئەو حەکـیمە گەورەی کوردستانی کردووەتەوە. ساڵانێکە دەستی داوەتە نووسـینی کتێبـی "*گیاه درمانی بیجار*" و ئێستە بۆ چاپ ئامادەی کردووە. لە داهاتوویەکی نزیکدا ئەو کتێبە چاپ دەبێت و بەشـێکی بەرچـاوی ئەزمـوونی گیادەرمـانی و پزیشـکی خۆمـاڵی کوردسـتان لەو کتێـبە ئەکەوێـتە بەردەست خوێنەر و داخوازی خۆی.

ئەوسا لە کوردەواری مەلا و میرزای مزگەوت و دیواخانەکان کتێب و بابەتە نووسراوەکانیان لە کەشکۆڵ[1] و کتێبە دەستنووسەکاندا دەنووسییەوە و تۆماریان دەکرد. ئەو کەشکۆڵانە پڕ بوون لە شێعر و یاداشت و مێژوو و بابەتی هەمەجۆرە. نووسەرانی ئەو کەشکۆڵانە دەقی نووسینەکەیان لە ڕووی کتێبەکانی دیکە وەرگرتووە و نووسیوە، یا لە زمانی مامۆستاکەیان نووسیوەتەوە، یا گوڵبژێر لە هەموو لایەك یاداشتیان هەڵگرتووە و زارەکی وەریانگرتووە و نووسیویانەتەوە. بەشی گژوگیا و دەرمان و چارەسەری لەو کەشکۆڵانە جارجارە بەرچاو کەوتووە و دیارە کە لایەنی پزیشکی و چارەسەری لای پێشینیانی کورد گرینگ بووە. ئەوەی لە کەشکۆڵی زانایانی کورد بەرچاو دەکەوێت بریتیە لە نووسینی ڕەچەتە و داودەرمانی حەکیمانی کوردەواری، یا یاداشتی ڕەچەتەی ناو کتێبە پزیشکیەکانی حەکیمانی کۆنی فارس و عەرەب و دیکە، یا ئەوەیکە نووسەر ئەزموونی خۆی و کەسانی دیکەی نووسیوەتەوە.

بە گەواهی مێژوونووس و نویسیارانی کۆن، کورد هەر لە کۆنەوە خاوەنی پێگە و جێگەی زانستی و ئەزموونی باش بووە لە بواری سروشت و کشتوکاڵەوە. گەلێ کە هەر لە بنەماوە گرینگایەتی بە سروشت و کشتوکاڵی دابێ، بەدڵنیاییەوە چووەتە ناو باسی سوودوەرگرتن لەو گژوگیا و ژینگەوە و کردوویە بە دەستەچیلە بۆ ڕەوانەوەی خەم و ئازار و دەردەکانی ڕۆح و جەستەی. ابن وحشیە (ئەبووبەکر ئەحمەد کوڕی عەلی کەلدانی) کە لە نێوان سەدەکانی ٢ و ٣ کۆچیدا ژیاوە [و خەڵکی ولاتی کەلدانەکان بووە لە ناوچەی ناوچۆمان و عێراقی ئێستا]. گەلێك بەرهەمی نووسین لەو پیاوە بە دەستی خوێنەری ئەوڕۆ

---

١. بیاض

گەیشتووە. وەکوو الفلاحه النبطیه، کنز الحکمه، شوق المستهام فی معرفه رموز الاقلام و هتد. لە کتێبی شوق المستهام باسی ٨٩ جۆر ئەلفوبێی هیرۆگلیف دەکات. لە بەشی حەوتەمی ئەو کتێبە باسی وێنە و ئەلفوبێی کۆنی پاشایانی سوریانی، فرعەونەکان، کەنعانیەکان، کەلدانی، کوردەکان، فارس و قبتیەکان کردووە. ابن وحشیه هەر بابەتێکی کە لە شوێنێ و لە کتێبێ وەرگرتووە، ئاماژەی پێ کردووە. ئەو پیاوە سەبارەت بە کوردەکان چەند جار باسی لێزانی و پسپۆڕی کوردەکانی کردووە لەسەر کشتوکاڵ و گیاناسی و ئاوناسی.[1] دۆزینەوە و خستنە بەردەستی کتێب و دەستنووسەکانی زانایانی کورد وا لەسەر پزیشکی و بابەتی چارەسەری کاریان کردووە ئەرکێکی گرینگە و پێویستە زیاتر خێ پێ بدەین. تا وەکوو کاروانی پێشکەوتنی گەلی ئێمەش وەك گەلانی تر وزە و ورەیەکی شیاو و شایستەی پێ بێت. بەڕاستی کاتێ نەوەکانی گەلێك بەوە بگەن کە پێشینانیان خاوەنی گەنجینە و هەگبەیەکی دەوڵەمەندن ئەوانیش هەوڵ ئەدەن گەوهەری خۆیان دەربخەن و نیشانی مرۆڤایەتی بدەن.

بەهەرحاڵ هەوڵی ئێمە لەم وتارە ئەوەیە کە شوێنەواری پزیشکی و دەرمانگەری و هەتوان و چارەسەری پێشینیانی کوردەواری بدۆزینەوە و لێرە نیشانی بدەین. هەر چەند کوردەکان هەر لە سەدەکانی کۆنەوە چوونەتە ناو بواری پزیشکی و بەرهەمیان داناوە، وەکوو: زانا و بیرمەند و مێژوونووسی گەورە، ابوحنیفه دنیەوەری کە لە سەدەی ٣ کۆچی کتێبی تایبەتی (کتاب النبات) داناوە[2] و بەشێك لەو کتێبە لە فەوتان و سووتان و فڕێدان ڕزگاری بووە و بە ئێمە گەیشتووە. نموونەی کتاب النبات لە چارەنووسی کەلەپووری کورددا زۆرە. لە کتێبی ٩ بەرگی "بووژانەوەی مێژووی زانایانی کورد لەڕێگەی دەستخەتەکانیانەوە" مامۆستا عەلی قەرەداغی گەلێك ناوەرۆك و سەرەداوی دەستنووس و بەڵگە پیشانمان ئەدات. هەروەها هەوڵێکی تر گەنجینەی ئەرشیفی کتێبخانەکانی تاران، بەغدا، تورکیە و وڵاتانی دیکەیە کە پێویستە بگەڕین و بابەت و بەشەپارەی خۆمان بدۆزینەوە. جیا لەمانە هێشتاکە لە کتێبخانەکانی ماڵان و مزگەوت و دیواخانەکانی

---

١. کتێبی شوق المستهام ابن وحشیه چەند دەستنووسی لە کتێبخانەکانی دنیا هەیە، وەکوو: ژمارە ٦٨٠٥ کتێبخانەی نەتەوەیی پاریس، ژمارە ٦٨ کتێبخانەی نەتەوەیی ئوتریش، کتێبخانەی سپەهسالاری تاران و هتد. [وتاری: الفبای زبان کردی به روایت ابن وحشیه، دکتۆر موحەممەد عەبدولی، گۆڤاری مەهاباد، ژمارە ١٢، ١٣٨٠]

٢. وتاری: پزیشکی قەدیمی کوردی: ابوحنیفه دینەوەری و کتێبی کتاب النبات، ئیرەج مورادی، گۆڤاری هەگبەی سروشت (تایبەتی کۆمەڵەی گیادەرمانانی باشووری کوردستان)، یەکەم ژمارە، سلێمانی، ٢٠١٧

کوردەواری گەلێك دەستنووسی پزیشکی هەیە کە هێشتا تۆزیان لەسەرە و ئەوانیش دەبێ بناسرێنەوە. لە سۆنگەی هەوڵ و توێژینەوەکانم چەندین دەستنووسی ئەو ئەرشیڤەم دەست کەوتووە کە لە خوارەوە ئاماژەیان پێ دەکەین.

ئەڵبەت بۆ بابەتی دەستنووسەکانی کتێبخانەکانی ماڵان لە کوردەواری پێویستە باسی ئەوە بکەم کە چۆن ئاشنا بووم بە بواری دەستنووسە کۆنەکان. ساڵی ١٣٩٥ بەهۆی ئاشنابوون لەگەڵ گۆڤاری کەشکۆڵ[١]، دەروازەیەکی تازە بە ڕوومدا کرایەوە و چوومە ناو دنیای بەڵگە و دەستنووسەکانی کوردستان. تا وەکوو ئێستە سەردانی زیاتر لە ٤٠ بنەماڵەی مامۆستا و میرزا و دیواخاندارم کردووە. لە کتێخانەی ئەو ماڵانە ئەگەر کتێبی دەستنووس یا بەڵگەیەك بووە بە ئەمانەت وەرگیراوە و ئێسکەن کراوە و پاشان لە کتێبخانەی دیجیتاڵی باقلاوا بە کۆد و پێناسەی تایبەتەوە ئەرشیف کراوە. ئەڵبەت ئەسڵی دەستنووسەکە لەگەڵ فایلی دیجیتاڵیەکەی ڕادەستی ئەو بنەماڵانە کراوەتەوە.

ئەگەرچی بەشی زۆری ئارشیڤی دەستنووسەکانی کتێبخانە شەخسیەکانی کوردەواری بابەتی فیقهی و ئایینی و هۆنراوە و نامەگۆڕینەوەی دۆستانەیە، بەڵام هەندێ جار بابەتی دیکە وەکوو پزیشکی، مێژوو، ئەستێرەناسی، بیرکاری، ژیاننامە و کشتوکاڵیش بەرچاو دەکەون. بابەتی پزیشکیەکە کە لێرە مەبەستی ئێمەیە، تا وەکوو ئێستە توانیومە سەرەداوی چەند دەستنووس بدۆزمەوە. ئەم دەستنووسانە زۆرتر کتابەت کراون و ڕوونووسی کتێبی پزیشکی حەکیمان و زانایانی کۆنە کە مامۆستایان و حەکیمانی کوردیش ئەوسا ویستوویانە سوودیان لێ وەربگرن. بەشێکیان هاوکات لەگەڵ نووسینی دەقی کتێبەکە، ڕەچەتە و ڕێنمایی پزیشکی حەکیمانی کوردیشی لە پەراوێزەوە تێدایە. بەداخەوە ئەگەرچی نموونەی چاپکراو و چاپنەکراوی زۆربەی ئەو دەستنووسانە لە بازاڕەکانی ولاتانی عەرەب و فارسدا هەیە، بەڵام پارێزەرانی ئەو دەستنووسانە لای خۆمان زیاتر بە چاوێکی ئەنتیکە و ژێرخاکی سەیریان دەکەن و هەندێ جار تەنانەت ڕێگە نادەن وێنەیەك لە سەرەتا و کۆتای دەستنووسەکە بگرین یا یاداشتێك لە زانیاریەکانی بنووسین.

---

١. ئەم گۆڤارە ساڵی ١٣٩٥ لە مەهاباد بە سەرپەرستی کاك عەبدوڵا سەمەدی و دکتۆر موحەممەد عەبدولی دامەزراوە و تا ئێستە ٩ ژمارەی لێ چاپ بووە. کاری گۆڤاری کەشکۆڵ، توێژینەوە، ناساندن، فهارست نووسین و ئاشکراکردنی بەڵگە و دەستنووسەکانی زانایانی کوردستانە لە کتێبخانە شەخسیەکان و ناوەندەکانی فەرمی کتێبخانە و دەستنووسخانەی حکوومەتی.

**گەڕان بە ناوەرۆکی کتێبی** بووژانەوەی مێژووی زانایانی کورد لەڕێگەی دەستخەتەکانیانەوە لە نووسینی مامۆستا عەلی قەرەداغی:

**بەرگی ۱: چاپی یەکەم، چاپخانەی ومیض، بەغداد، ۱۹۹۸**

* لاپەڕە ۱۳۵ـ ۱۳۸ کەشکۆڵی قادری سەڵەسی کە بە ژمارە ۸۲۸۱ لە کتێبخانەی دار صدام للمخطوطات پارێزراوە. ئەم کەشکۆڵە ساڵی ۱۳۲۲ کۆچی بە دەستی قادری کوڕی شێخ سەمەدی سەڵەسی لە ئاوایی ئەسراوای [مەریوان] نووسراوەتەوە. ناوەڕۆکەکەی هۆنراوەی شاعیرانی کوردە. هەندێ جار لە کۆتایی پارچە هۆنراوەکانیدا باسی وەبا و نەخۆشی دیکەی کردووە و دۆعای پاراستنی لە وەبای هێناوە.

* لاپەڕە ١٥٦ــ ١٥٩ کەشکۆڵی موحەممەد ئەمین هەولێری کە بە ژمارە ١٣٦١٩ لە کتێبخانەی دار صدام للمخطوطات پارێزراوە. ئەم کەشکۆڵە مەلا موحەممەد ئەمینی هەولێری ناسراو بە "خاکی یا بەننا" دەوروبەری ۱۳۰۵ تا ۱۳۱۳ کۆچی نووسیویەتیەوە و کۆی کردووەتەوە. ناوەڕۆکەکەی هۆنراوەی شاعیران و بابەتی هەمەجۆرە و هەروەها باسی نەخۆشی و داودەرمان و ڕەچەتەی حەکیم و نوژدارانە. بەشی پزیشکیەکەی لە کەشکۆڵەکەدا بەم شێوە نووسیوە: کۆمەڵێك داودەرمانی لە زمانی مەعرووفی شنۆیی و شەعبانی ئاکرێیی و ئایشێ خانمەوە، زمان بەستن، سوود و تایبەتمەندی هەندێك شتی [خواردن و خواردنەوە]، دەرمان لە زمانی موحەممەدی جەڕاحەوە، ڕێبازی خواردن، دۆعا، پیاو بەستن[؟]، دەرمان، مزگەریی و مس سپیکردنەوە، داودەرمانی [کوردی]. هەندێ جار ئاماژەی بە خاوەنی ڕەچەتە و دەرمانەکە بەم شیوە کردووە: من لسان صوفی عبدالقادر، من لسان جراح محمد، من لسان خانم، من لسان زتو، من لسان فقی حسین، من لسان عبدالوهاب اشنوی و تاد.[1]

* لاپەڕە ٢٨٣ـ ٢٨٦ کەشکۆڵێکی ناوازەیە کە بە ژمارە ٣٣١٦٢ لە کتێبخانەی دار صدام للمخطوطات پارێزراوە. چەندین مێژووی نووسینی دەستنووسەکە و ڕێکەوتی دیکەی وەکوو ساڵەکانی ١١٨٥، ١٢٧٤، ١٢٩٠، ١٣٠١، ١٣٠٥، ١١٨٧، ١٣٦٨ و ١٢٧٨ کۆچی پێوەیە. ئەم کەشکۆڵە لە ئاوایی دەگاشێخان [لای مەریوان] نووسراوە و ناوەڕۆکەکەی ئەمانەیە: ورقات امام الحرمین، اذکار امام نەوەوی و چەندین یاداشت و زانیاری لەسەر بنەماڵەی مەردۆخیەکان.

---

١. بەختەوەرانە کۆپی سەرجەم لاپەڕەی ئەو کەشکۆڵە لای مامۆستا عەلی قەرەداغیە. پاییزی ٩٦ داوام لە بەڕێزیان کرد و سەرجەم لاپەڕەکانی ڕەوانە کرد. لە بەرگی دوو سەرجەم ناوەڕۆکی پزیشکی ئەو کەشکۆڵە دەهێنین.

[لەم دەستنووسە باسی مەولانا گوشایشی مەردۆخـی دەکـات و بەپـێچەوانەی شـەجەرەنامەی باوی مەردۆخیەکان کە ئەورۆ باس دەکرێت، باوك و بـاپیرانی مەردۆخیەکـان جـۆرێکی دیـکە نیشان ئەدات]. لەم کەشکۆڵە لە دوو پەراوێزەوە باسی هاتنی نەخۆشی تـاعوون لە کوردسـتاندا کردووە: وقع الوباء فی سنندج فی شهر صفر المظفر سنه ١٢٦٨ و وقع الوباء ثانیـا فـی الشـهر المذکور سنه ١٢٧٨.

**بەرگی ٢: چاپی یەکەم، بەغداد، ١٩٩٩**

* لاپەڕە ١٠٦ـ١١١ کەشکۆڵی مەلا حسەین ئەخلاتی کە بە ژمارە ٣٧٣٧٧ لە کتێبخـانەی دار صدام للمخطوطات پارێزراوە. ئەم کەشکۆڵە بریتیە لە کۆمەڵێك دانراوی جەفـر و تسـخیر افلاك و بابەتی دیکە. لاپەڕەی ١٤٧ تا ١٤٩ی کەشـکۆڵەکە باسـی هەنـدێ دۆعـا و دەرمـان دەکات و هەروەها باسی برێـك گژوگیـا و گـوڵی هێنـاوە و بە هەڵبەسـت باسـی گیـایەکی کردووە کە بە قسـەی ئەفلاتـوون نـاوی اکسـیر اعظـم بـووە. سـاڵی ١٩٩٣ لە ژمـارە ١٨٤٩ ڕۆژنامەی هاوکاری باسی ئەم کەشکۆڵە کراوە. [ئەم دەستنووسە مێژووی نووسینەوەی پێـوە نییە، بەڵام دیارە کەلەپووریکی کۆنە].

* لاپەڕە ٢٠٢ـ٢٠٥ کەشکۆڵێکە بە ژمارە ٥٢٢٣ لە کتێبخـانەی دار صـدام للمخطوطـات پارێزراوە. ئەم کەشـکۆڵە ١٣٢٦ کـۆچی لە کـۆیە و کەرکـووك نووسـراوەوە و نـاوەڕۆکەکەی بریتیە لە شەرحی کتێبی "دوانی" لەسەر تهذیب المنطـق. لە پەراوێـزەوە گەلێـك مێـژووی ڕووداو و بەسەرهاتی ناوچەکەی پێـوە نووسـراوە، بـۆ نمـوونە: تـاعوونی گەورە سـاڵی ١١٠٠، تاعوونی دووهەم ١١٧١، تاعوونی سێهەم ١١٨٧، تـاعوونی چـوارەم ١٢١٤ و تـاعوونی پێـنجەم ساڵی ١٢٤٦ [کۆچی].

* لاپەڕە ٢٠٥ـ٢٠٨ کەشکۆڵێکە کە بە ژمارە ٥٦٨٩ لە کتێبخانەی دار صـدام للمخطوطـات پـارێزراوە. ئەم کەشـکۆڵە سـاڵی ١٢٣٣ کـۆچی نووسـراوەتەوە. نـاوەڕۆکەکەی بـریتیە لە قەسیدەیەکی عەرەبی (بانت سعاد) و لێکدانەوەی بە فارسی، چەند فەرمایشێکی امـام عەلـی و چەندین پەراوێزی مێژوویـی پێـوەیە، وەکـوو: تـاعوونی یەکەم لە کـاتی سـلێمان پاشـا ١١٧١، تاعوونی دووهەم ١١٨٧ کۆچی، تاعوونی سێهەم کاتی ئیبراهیم پاشـا لە سـلێمانی سـاڵی ١٢١٣ کۆچی.

* لاپەڕە ٣١٥ـــ٣٢١ کەشـکۆڵی دەردیـن کە بە ژمـارە ٩٤٨٠ لە کتێبخـانەی دار صـدام للمخطوطات پارێزراوە. ئەم کەشکۆڵە پاشـماوەی چەنـد دەسـتخەتێکی جیاجیـایە و لە چەنـد ساڵی جیاوازدا نووسراوەتەوە. ناوەڕۆکەکەی بـریتیە لەمـانە: لە لاپەڕەی یەکەوە تـا ١٦٠ باسـی

پزیشکی و بەیتاڵی ئاژەڵی کردووە. ئەم بەشەی دیار نییە کێ و کەی نووسراوە، دواتر پەخشان و شیعرە لەسەر مەولانا خالیدی شارەزووری، هەروەها چەند بابەتێکی دیکەی تێدایە وەکوو هۆنراوەی گۆرانی و شیعری مامۆستا دەردین. لە پەراوێزی شیعرە کوردیەکانەوە مێژووی ١٢٥١ کۆچی نووسراوە.

* لاپەڕە ٣٦٤ـ٣٦٧ کەشکۆڵی موحەمەد پاشای بابان کە بە ژمارە ١٢٠٥٧ لە کتێبخانەی دار صدام للمخطوطات پارێزراوە. ئەم کەشکۆڵە پڕە لە بابەتی مێژوویی و شیعری شاعیرانی کورد و فارس، و باسی ڕۆژانەی ئەو کاتە، هەروەها لە لاپەڕەی ٢٥ بەولا باسی پزیشکی و داودەرمان دەکات. ئەم کەشکۆڵە لە سەردەمی بابانەکاندا نووسراوە و لە شوێنێك مێژووی ١٢٧٤ کۆچی پێوەیە.

**بەرگی ٣: چاپی یەکەم، بەغداد، ٢٠٠٠**

* لاپەڕە ٧ـ ٨ لە باسی حوجرە و مەدرەسە و مەکتەب مامۆستا عەلی قەرەداغی لە زمانی ئەولیا چەلەبی مێژوونووسەوە باس لە کتێبخانەی عەبداڵ خانی میری بدلیس دەکات کە ئەم میرە باری حەوت وشتری کتێبی نایابی بووە و کتێبخانە تایبەتیەکەی ٤٠٠٠ کتێبی نایاب لە هەموو بابەتێك وەکوو کشتوکاڵ، ئاژەڵناسی، پزیشکی، هۆنراوە، مێژوو، ئایینی، زمانەوانی و دەیان تابلۆی ڕەنگی و وێنە و نەخشە تێدا بووە. میر بۆخۆی ٧٦ کتێب و ١٠٥ نامە و نامیلکەی عەرەبی و فارسی بووە. ئەم دەستخەتانە تا ئێستە هیچ قوڵاخێکیان دەرنەکەوتووە و نازانین لە کوێن و تەنانەت هەواڵ و سەرژمێری ناو و ناوەرۆکیشیان نازانین. ئەم بابەتە لە کتێبی تاریخ الکرد و کردستان، محمد امین زکی، بەرگی یەك، لاپەڕە: ٢٠٦ وەرگیراوە.

* لاپەڕە ٥٨ـ٦٣ کەشکۆڵی تسکین القلوب مەلا عومەری ڕەنجووری کە بە ژمارە ٢٦٠٥١ لە کتێبخانەی دار صدام للمخطوطات پارێزراوە. ئەم کەشکۆڵە فارسییە و دانراوی خودی ڕەنجوورییە و بەم شێوە دەست پێ دەکات: با لای خوێنەران ئەم چەند لاپەڕەیە ئاشکرا بێت کە هەژاری بێچارە و گوناهبار و داماوی دووریی و ئاوارەیی، خاکی بەرپێی زانایان، عومەری کوڕی خالید بەگی ناسراو بە ڕەنجووری دەڵێت چونکە لە دۆعا و دەرمانزانیدا چەند شتێکم لە کتێب و گوتەی شارەزایان وەرگرتووە و بەشی زۆریشیانم تاقی کردووەتەوە. گەلێ جار ویستم ئەو ڕەچەتانە لە چەند پەڕەیەکدا کۆ بکەمەوە تا بێ‌سوود نەبن و بۆخۆم بارسووکی و بۆ خەڵکیش سوودمەند بن، بەڵام هەر دواکەوتن و بۆم نەدەگونجا و لەسەر داوای ڕۆڵەی خۆشەویستم ئیسماعیل خوا سەرکەوتووی بکات و

بەگـوێرەی فەرمـوودەی پێغەمـبەر کە هەر شـتێ بەسـتراوە بە کـاتی خـۆیەوە، هەر دوا دەکەوت. تا ساڵی ١٢١٤ لە ١٠ مانگی سەفەر بڕیارمـدا و پشـتم بە خـوا بەسـت و بەهیـوای ئەوەی بە ئەنجام بگەم دەستم دایێ و ئەم چەند پەڕەیەم لە کتێبە [پزیشـکیە]کـانی طـب الرحمە، شمس المعارف، تحفە المومن [حکیم تنکابنی]، اختیارات بدیعی، نفـایس الفنـون، شمس العواید، علاج الاسقام و طب یوسفی کۆ کردەوە و چەند دۆعا و دەرمـانێکیش کە لە چەند دەروێشێکەوە دەستم کەوتبـوون و لەبەر ئەوەی بـۆ نەخۆشـان دەبـێ بـۆ دەرمـان و ئارامبەخشی دڵ، [ئەوە ئەم کتێبەم] ناو ناوە تسکین القلـوب و سـاڵی دانانەکەشـی وشـەی "دریغ" کە دەکاتە ١٢١٤ [کۆچی].

* لاپەڕە ١٣٥ــ١٣٧ کەشـکۆڵێکی کـۆنە کە بە ژمـارە ١٦١٤٧ لە کتێبخـانەی دار صـدام للمخطوطات پارێزراوە. ئەم کەشکۆڵە کە بەشێکە لە کتێبـی تـوحفە و نووسـەرەکەی نـاوی ئیبراهیم کوڕی جامییە و دەوروبەری ساڵی ١١٤٠ کۆچی لە گوندی شاوریك [شـاولیك] زاخـۆ نووسراوە. گەلێك پەراوێزی مێژوویی وەکوو گرانیی، قاتوقڕی، تاعوون (چاوەقووڵە) و بـابەتی دیکەی پێوەیە. دیسان لەم کەشکۆڵە مێژووی هاتنی تاعوونی یەکەم ساڵی ١١٢٣، و تاعوونی چوارەم کە ساڵی ١١٩٣ سەردەمی ئیسماعیل پاشای زاخۆ دەکات.

* لاپەڕە ١٧٤ـ ١٧٨ دەستنووسێکی شێخی بریفکـی کە چەنـدین لاپەڕەی جیاجیـایە و سـەر بە دەستنووسـەکانی بنەمـاڵەی بریفیکیەکـانی بادینـانە و لە کتێبخـانەی دار صـدام للمخطوطـات پـارێزراوە و ژمـارە نەکـراوە. ئەم لاپەڕانە دەیـان مێـژووی ڕووداو و مـردن و هێرش و نەخۆشی ناوچەی بادینان و هەکاری و بایزیدی پێوەیە، وەکوو: هاتنی تـاعوونی و ڕۆیشتنی بەهرام پاشا بۆ گوندی ناڤیلان ١١٥٢، هاتنی تاعوون ١١٧١، هاتنی تـاعوونی گەورە پاش قاتیساڵیەکی توند و بـارینی تەرزەیەکـی مەزن و ترسـناك لە سـەردەمی مووسـا پاشـا ١٢٤٣، هـاتنی نەخۆشـی وەبـا واتـا لەرزك کە نەخـۆش دەرشـایەوە و دەمـرد سـاڵی ١٢٨٣ [کۆچی].

* لاپەڕە ٣١١ـ ٣١٨ کەشکۆڵی حاجی مەولوود بە ژمارە ٣٩١٣٦ لە کتێبخانەی دار صدام للمخطوطات پارێزراوە. ئەم کەشکۆڵە هەموو بابەتێکی تێدایە و کورد گوتەنی: سـەری مـار و مێـرووری تێـدا دەسـت ئەکەوێـت. ئەم کەشـکۆڵە یەکێکـە لە نـاوازەترین و بـێوێنەتـرین کەشکۆڵەکانی کوردییە. نووسەرەوەکەی لە شوێنێ باسی ڕۆیشتنی بۆ حەج دەکات لە ساڵی ١٢٨٤ و دەڵێت کە ساڵی ١٢٦٠ کـۆچی لە مووسـڵ ڕێ کەوتـین. لە لاپەڕەی ٢٣٥ تـا ٢٤٩ باسی داودەرمان و دۆعا دەکات.

**بەرگی ٤: چاپی یەكەم، چاپخانەی الخنساء، بەغداد، ٢٠٠٢**

* لاپەڕە ٧١ لە پەراوێزی دەستنووسێك بە ژمارە ١٦٥٩٢ لە كتێبخانەی دار صدام للمخطوطات پارێزراوە، نووسراوە: [نەخۆشی] چاوەقووڵكە لە سلێمانی داكەوت لە كاتی ڕۆیشتنی مەحموود پاشا و هاتنی سلێمان پاشای [بابان] لە سلێمانی ١٢٤٦ كۆچی.

* لاپەڕە ١٨٣ـ١٩٥ كەشكۆڵی شێخ حیسامەدین بە ژمارە ٤١٢١٩ لە كتێبخانەی دار صدام للمخطوطات پارێزراوە. ئەم كەشكۆڵە چەند كەس نووسیویانەتەوە و یەكیان ناوی خۆی نووسیوە. سەعید خەڵكی سنە ناسراو بە حەسرەت كە شاعیریش بووە. ساڵی ١٣٣٨ كۆچی لە باخەكۆنی [لای هەڵەبجە] ئەم كەشكۆڵە پڕ بەرهەمەی نووسیوەتەوە بۆ شێخ عەلی حسامەدین. ئەوەی پەیوەستە بە پزیشكی ئەمەیە: لاپەڕەی یەكەم "دعای كیسە و تب بالوك"، لاپەڕە ٣٥٥ "دفع هوام زراعت"، لاپەڕە ٤٢٦ "دعای قولنج".

* لاپەڕە ٢١٠ـ ٢١٦ دەستنووسێك بە ناوی طب الرحمەیە و بە ژمارە ٦٢٧٨ لە كتێبخانەی دار صدام للمخطوطات پارێزراوە. [طب الرحمە كتێبێكی پزیشكییە كە جلال الدین عبدالرحمن سیوطی ٨٤٩ـ٩١١ كۆچی نووسیویە]. ئەم دەستنووسە ئەبووبەكر كوڕی موحەمەد خەڵكی كۆیە ناسراو بە "الكویی الخوشی" ساڵی ١٢٤٥ كۆچی نووسیویەتیەوە. ئەم كتێبە پزیشكیە یەكێك لەو دەستنووسانەیە كە لە كتێبخانەی مەلا ڕەسووڵ كوڕی عەزیز خەڵكی دەوزانی ناوچەی پشدەر بووە. ئەم مەلا ڕەسووڵە ساڵی ١٢٦٨ كۆچی لە مزگەوتی گەناوەی پشدەر فەقێ بووە.

* لە لاپەڕەی ٢٥٠ـ ٢٥٥ مامۆستا عەلی قەرەداغی باسی بنەماڵەی حەیدەری سیبغەتوڵای ماوەران لای شەقڵاوا دەكات. سیبغەتوڵای یەكەم كە كوڕی ئیبراهیم كوڕی حەیدەر بووە و ساڵی ١١١٠ كۆچی لە ماوەران هاتووەتە دنیا و ساڵی ١١٨٨ لە بەغدا كۆچی دوایی كردووە. ئەم زانایە لە بەغدا پیشەی وانەگوتنەوە و مامۆستایی بووە و گەلێك كتێبی نووسیوە. یەكێك لەو كتێبانەی نامیلكەیەكە لەسەر نەخۆشی تاعوون. ئەم نامیلكەیە ساڵی ١١٨٦ كۆچی لە بەغداد نووسیویە و نەخۆشی تاعوونی بە چاوەقووڵە داناوە.

**بەرگی ٥: چاپی یەكەم، بڵاوكراوەی ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٣**

* لاپەڕە ٣٠٦ـ٣٢٤ كەشكۆڵی سەیید موحەمەد كە لە ئەرشیفی كتێبخانەی مامۆستا عەلی قەرەداغی لە سلێمانی پارێزراوە. ئەم كەشكۆڵە هۆنراوەی زۆربەی شاعیرانی كورد (كرمانجی، سۆرانی و گۆرانی) و فارس لەگەڵ گەلێك بابەتی دیكەی تێدایە. ئەوەندە دیارە كە ئەم سەیید موحەمەدە ساڵی ١٣٥٠ كۆچی لە گوندی هەرتەلی شارباژێر فەقێ بووە. لە

لاپەڕەی ٢٦٧ ئەم کەشکۆڵە باسێك بە ناونیشانی "فائده فی اکل الجراد و الدود الزراعه" هاتووە.

* لاپەڕە ٣٥٠ــ٣٦٢ کەشکۆڵێك کە بە ژمارە ٤٣٣٦١ لە کتێبخانەی دار صدام للمخطوطات پارێزراوە. ئەو کەشکۆڵە چەندین بابەتی فیقهی مەلا حەسەنی کۆیی و ابن حاج سەردەشتی کە ساڵی ١٢٨٩ کۆچی نووسیویە لەخۆ گرتووە. باسێکی شیرخواردن و حوکمی شیرخواردنی منداڵی تێدایە.

**بەرگی ٦: چاپی یەکەم، بڵاوکراوەی ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٤**

* لاپەڕە ١٣٧ــ١٣٨ دەستنووسێك کە بە ژمارە ١٩٣١٩ لە کتێبخانەی دار العراق للمخطوطات پارێزراوە و بە "ترجمه طب الرحمه" نووسراوە. ئەم دەستنووسە ئیمام غەزاڵی دایناوە و ئەحمەد کوڕی سلێمانی کوڕی سۆفی چراغی پاوەیی لە پشتکۆ لە عەرەبییەوە کردوویە بە فارسی[1] و پاشان دیاری کردووە بە میری ئەوکاتە. ئەم دەستخەتە مێژوویەکی کۆنی هەیە. [هەر چەند ساڵ و شوێنی وەرگێڕانەکە دیار نییە]. ناوەڕۆکی ئەم کتێبە گژوگیا، ئاژەڵ و گیانەوەرە کە بۆ چی دەبن و دەشێن.

* لە لاپەڕەی ٣٨٥ـ٣٨٦ سەبارەت بە کەشکۆڵێك کە تەنیا چەند لاپەڕەی ماوە، هاتووە کە چەند شێعری فارسی و کوردی هەورامی و چەند مێژووی ڕووداو و بەسەرهاتی تێدایە. ئەم کەشکۆڵە دەوروبەری ساڵی ١٢٦٠ کۆچی نووسراوە. بۆ بابەتی پزیشکی هاتووە: چاوەقووڵەی دوایی ١١٨٧، چاوەقووڵەی بچووك ١١٧١، چاوەقووڵەی گەورە ١١٠٠، چاوەقووڵەی یەکەم ١٢٤٣ و دووهەم لە هەولێر ساڵی ١٢٤٦ کۆچی.

**بەرگی ٧: چاپی یەکەم، بڵاوکراوەی ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٧**

* لاپەڕە ٣٥٦ دەستنووسێکی دەوڵەتنامەی مەلا خدری ڕوارییە کە بە ژمارە ١٨٣٠٠ لە کتێبخانەی دار العراق للمخطوطات پارێزراوە. مەلا خدر ئەو کتێبەی ساڵی ١١٩٧ نووسیوە، بەڵام ئەم دەستنووسە ١٢٦٢ نووسراوەتەوە. ئەو کتێبە سەبارەت بە پزیشکی و تەندروستیە و مەلا عبدالکریم مودەڕس لە هەورامیەوە کردوویە بە سۆرانی. [مەلا خدر ساڵی ١١٣٨ کۆچی لە ئاوایی ڕواری هەورامان لەدایك بووە و ١٢٠٥ کۆچی دوایی کردووە.]

**بەرگی ٨: چاپی یەکەم، بڵاوکراوەی ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٨**

---

١. مامۆستا عەلی قەرەداغی نووسیویە کە لە عەرەبییەوە کردوویە بە کوردی، بەڵام دیسان دواتر نووسیویە کە کتێبەکە فارسییە. کەواتە وێدەچێت هەمان عەرەبی بە فارسی دروست بێت.

* مامۆستا عەلی لە لاپەڕەی ٢١٧ـــ٢٢٤ بـابەتێکی دانـاوە و بە پشـت بەسـتن بە چەنـد لاپەڕەیەك لە دەستنووسێك کە چەندین ڕووداوی مێژوویی کۆنی ناوچەکەی تۆمار کـردووە، ئاماژە بە دەستەواژەی نانی با (خبز الهواء) ئەکات کە کاتی خۆی لە سـاڵەکانی بـێ‌بـارانی و قاتیساڵیدا خەڵك باوڕیان پێ بووە. گوایە ئەو ساڵانە وا باران نەبووە جارجارە هەوایەکی فێنك و تەڕ هاتووە و خەلە و گیای پێ ڕواوە و گەیشتووە بە ئاستێك کە گەنم و جۆ گـوڵ بکـات و بەکەڵکی ڕنینەوە بێت. جا بەو فێنکایی و بایە گوتراوە بای نان. جـا ئەم باسـە زۆرتـر بـۆ ئەوە بووە کە خەڵك لە ترسی برسـیەتی و تینـوەتی ورەیـان لە دەسـت نەدەن [و هیـوابڕاو نەبن. چونکا ئەگەر بارانیش نەبێت ئەوە شیلەی ناو زەوی و شێی ئاسمان ئەتوانێت هەنـدێ لە توونیەتی گیا بشکێنێت و سەوزی بکات.] لەو لاپەڕەیە باسی دەستنووسـێك دەکـات کـە مامۆستا عوسمان خورمەڵەیی کە ساڵی ١٩٥٠ کۆچی مـردووە، نووسـیویە. لەم دەستنووسـە ئەوەی پێوەندی بە بابەتی ئێمەوە هەیە، ئەمانەیە: ساڵی ژەنگی یەکەم ١٣١٠، ژەنگـی دووەم ١٣٣٤، نانی با ساڵی ١٣١١، چاوەقووڵەی یەکەم [لە کفری] ١٣٠٧، چاوەقووڵەی دووەم ١٣٣٤، هەروەها مامۆستا باسی لاپەڕەیەکـی دیـکە دەکـات کە بەم شـێوە لەو لاپەڕەیەش هەنـدێ زانیاری بەم شێوە هـاتووە: چـاوەقووڵە ١٢٤٧، ڕشـانەوەی گەورە ١٣٠٧، ڕشـانەوەی بچـووك ١٣٢٢ کۆچی.

* لاپەڕە ٢٩٩ـ٣٠٦ لە دەستنووسێکی الوضوح مەلا ئەبـووبەکر مصـنیف چـۆڕی کە ئەم دەستنووسە کەسێك بە ناوی حسـەین کـوڕی مەلا یـۆنس چـولاخ لە سـاڵی ١٠٦٢ کـۆچی نووسیوەیەتیەوە، سەبارەت بە بابەتی ئـێمە لەم وتـارە وا نووسـراوە: طـاعون فـی ولایـت ... خصوصا در هاله سیاه شهر رجب ١٠٣٤. [ئەم دەستنووسە بە تۆمار کردنی مێـژووی بابـان و ئەردەڵانەکاندا دیارە لەو ناوچانە نووسراوە].

**بەرگی ٩: چاپی یەکەم، بڵاوکراوەی ئاراس، هەولێر، ٢٠١١**

* لاپەڕە ٣٤٦ـــ٣٤٨ مامۆسـتا عەلـی قەرەداغـی لە باسـی کەشـکۆڵی شـێخ ئەحـمەدی سـنەیی گۆرانیـدا دەڵێـت ئەم شـێخ ئەحـمەدە یەکەم پیـاوی مەردۆخیەکـان بـووە کە لە ناوچەی ئەردەڵانەوە چووەتە بەغداد و لەوێ نیشتەجێ بـووە. ئەم کەشـکۆڵە کە بـە خەتـی شێخ نووسراوە مێژووی ١٢٣٠ تا ١٢٥٣ کۆچی تێدایە و بەشێوەی بەیـازە و بە ژمـارە ٩٥/٤٤ لە کتێبخانەی مامۆستا عەلی قەرەداغی لە سلێمانی پارێزراوە. چەندین هۆنراوەی شـاعێرانی فارس و کورد و بابەتی دیکەی تێـدایە. لاپەڕەی ٩٢ تـا ٩٥ نـامیلکەیەکە بە نـاوی (رسـاله

صحت و مرض محمد فضولی بغدادی [۸۸٥ـ۹٦۳ کۆچی)[1]. [ئەم کتێبە بەشێوەیەکی فەلسەفی و لە قاڵبی چیرۆك باسی گەشتی ڕۆحی مرۆڤەکان دەکات بەرەو ئەندامەکانی جەستە. تێکەڵاوی ڕۆح لەگەڵ مەزاج و ڕەوانی ئینسان دەبێتە هۆی دروستبوونی هێزەکانی ماسکە، دافعە، ڕافعە، هاضمە و هتد. هەروەها باسی نەخۆشی و خۆشی جەستەیی و ڕۆحی مرۆڤ دەکات بەشێوەیەکی تەواو فەلسەفی].

## دەستنووسەکانی بنکەی ژین

بنکەی ژین ناوەندێکی بەڵگەنامەیی و ڕۆژنامەوانی گەورەیە لە شاری سلێمانی. ئەو ناوەندە ساڵی ۲۰۰٤ لە لایەن شارەزایانی بواری ئەرشیف و بەڵگەنامەکانەوە دامەزراوە و جگە لە کۆکردنەوەی سەدان دەستنووس و بەڵگەنامە و وێنەی مێژوویی کوردستان و ناوچەکە، هاوکات زیاتر لە ۱۷۰ ڕۆژنامە و گۆڤاریی لەناوچوونیان پاراستووە و بانتر لە ۱۰۰ کتێبی ناوازەی نووسەران و زانایانی کوردی بە چاپ گەیاندووە. بەڕێوەبەری ئەو ناوەندە کەسایەتی شارەزا و دڵسۆز و ماندوونەناس، مامۆستا ڕەفیق ساڵحە. باڵەخانەی بنکەی ژین کۆمەڵگەیەکی ڕۆشنبیری هەمەلایەنەیە کە پێك هاتووە لە پێنج نهۆم و چەندین ژوور و تەلاری جیاواز وەك کتێبخانە، دەستنووخانە، نۆژەنخانە و دەرمانگەی دەستنووس و بەڵگە، هۆڵی کۆبوونەوە و شانۆ و سینەما، هۆڵی فێرکردنی زمان، شوێنی کردنەوەی پێشانگا و چالاکی هونەری، و هەروەها خواردنگە و میوانخانە.[2] بەگشتی تاکوو ئێستە ۱۸۱ کتێبیان چاپ کردووە. هەروەها ٤۲۰۰۰ ناونیشان کتێبیان لە ئەرشیڤی کتێبخانەکەیان پاراستووە. ۱٥۰۰ ناونیشان ڕۆژنامە و گۆڤاری کوردی و فارسی و عەرەبی و تورکییان لە گەنجینەدا هەیە و بەشی هەرەزۆری دەستنووس و بەڵگە و ڕۆژنامە و گۆڤار و وێنە کۆنەکان دیجیتاڵی کراوە لەو بنکەیە.

لە خوارەوە بەڕیزەوە ناونیشانی ئەو دەستنووسانەی بنکەی ژین وا پێوەندییان وە باسی پزیشکی و خواردن و سروشتەوە هەیە باسیان دەکەین. بەشی یەکەمی کە لە بەرگی یەك

---

١. لە کتێبخانەی الهیات زانکۆی فردەوسی مەشهەد بە ژمارە ٦۷۷ دەستنووسێکی فارسی ئەم کتێبە هەیە و چاپیش کراوە.

٢. ویکیپیدیای کوردی، بابەتی: بنکەی ژین. بەرواری: ۱۳۹۷/۰۳/۲۰، هەروەها لە نزیکەوە بەهاری ۱۳۹٥ بۆخۆم سەردانی ئەم بنکەیەم کرد و لەگەڵ مامۆستا ڕەفێق ئاشنا بووم و تا وەکوو ئێستە پێوەندیمان چڕوپڕە، و زەحمەتی ناردنی دەیان بابەت و ناونیشانی دەگمەن و نایابی بۆ توێژینەوە و خویندنەوەکانم کێشاوە.

فهارستی دەستنووسەکانی بنکەی ژین وەرگیراوە. ئەو فهارستە سالّی ١٣٩٥ کە چوومە بنکەی ژین دەستم کەوتووە. بابەتەکانی بەرگی ٢ کە هێشتا چاپ نەکراون، مامۆستا ڕەفیق سالّح بەرواری ١٣٩٧/٠٣/١٨ زەحمەتی کێشا و بۆ نووسینی ئەم وتارە ڕەوانەیانی کرد. [لەگەڵ ڕێزی فراوان بۆ مامۆستا ڕەفیق]

**١. لاپەڕە ٢٦١،٢٦٠ بەرگی ١[١]، کۆدی پێناسەی بنکەی ژین لە پۆلێنبەندی ئەرشیڤەکەیان: س٥٠٨/٤٤**

کتێبی *تاریخی طبیعی*، مەلا کاکە حەمە کوڕی حاجی سەیفوڵا لە ڕێکەوتی ١٩٤٠/٠٧/٠٦ لە گوندی سەرقەڵای شارستانی کفری لە پارێزگای کەرکووك لە دیواخانی موحەممەد ئاغای زەنگەنە دایناوە و نووسیویە بە زمانی کوردی، ١٥ لاپەڕەیە لە ئەندازەی ٢٠*١٢.٥ سم. بابەتی ئەم کتێبە وەك خۆی دەڵێت: *ئەمە عیلمێکە باسی هەموو مەوجوداتێکی سەر ئەرز ئەکا لە خسووسی شکڵی خاریجی وە تەرکیباتیانەوە. هەموو مەخلووقاتی سەر ئەرز ئەکرێتە دوو بەشی زیندوو، و بێ ڕۆح. هەموو نەوعە زیندوویەك لەم شتانەدا کە ئەیڵێین شەریکن.* بابەتەکەی سروشتە و هەروەها ناسین و تایبەتمەندی هەموو زیندەوەرەکانی دنیایە. لە کۆتایی دەستنووسەکەدا ئاوا باس دەکات: *چوارەم تەناسوبی تەزەریەکە ئەغڵەب لە حەیواناتی ئیبتیدایا ئەبێ کە ئەو حەیوانە ئەئاوسێ وردە وردە زل ئەبێ. لە ئاخریا هەڵئەوەشێ. ئەما خۆی نامێنێ وەك دووپشك مەسەلەن.*

**٢. لاپەڕە ٢٧٠ـ٢٧١ بەرگی ١، کۆدی پێناسەی بنکەی ژین لە پۆلێنبەندی ئەرشیڤەکەیان: س٥٩٠،٩١/٤٤٧**

کتێبی ئەشیای باسی حەیوان (*الاشیاء التی تتناول عن الحیوان*)، مەلا کاکە حەمە کوڕی حاجی سەیفوڵا لە ڕێکەوتی [نادیار] لە [شوێنی نادیار] دایناوە و نووسیویە، ٢٣ لاپەڕەیە لە ئەندازەی ١٥*١٩ سم.، بابەتی ئەم کتێبە گیا و بوونەوەری زیندە و مردووە وەکوو دار و بەرد و حەیوانات. وەك خۆی دەڵێت: *چی خوا دروستی کردووە ٣ نەوعە: حەیوانات، نەباتات و جەمادات. چی ڕۆحی لەبەرا بێ حەیواناتە. چی لە [؟] ئەبێتە دەرەوە و زیاد ئەکا نەباتاتە و باوی تر جەماداتە. لە کۆتایی دەستنووسەکەدا ئاوا باس دەکات: تیا هەیە پێی ئەڵێن*

١. کتێبی: الفهرس الوصفی لمخطوطات، موسس ژین لاحیاء التراث الوثاقی و الصحفی الکردی، حسین حسن کریم (مامۆستای کۆلیژی علوم انسانی زانکۆی سلێمانی)، چاپی یەکەم، چاپخانەی پەیوەند، بڵاوکراوەکانی بنکەی ژین، ٢٠١٤

*شەبەکیە. نەوات کورەوییە لە جەبلیە سفت‌ترە و لە عەسارەی نەوات وە غەستای نەوات.*

**٣. لاپەڕە ٢٧١ـ٢٧٢ بەرگی ١، کۆدی پێناسەی بنکەی ژین لە پۆلێنبەندی ئەرشیفەکەیان: س٥٩٠،٩١/٤٤٧** [بەشێکی ترە لە دەستنووسی ژمارە ٢]

کتێبی ئەشیای باسی حەیوان (*الاشیاء التی تتناول عن الحیوان*)، مەلا کاکە حەمە کوڕی حاجی سەیفوڵا لە ڕێکەوتی [نادیار] لە [شوێنی نادیار] دایناوە و نووسیویە، ١٥ لاپەڕەیە لە ئەندازەی ١٥* ١٩ سم. بابەتی ئەم کتێبە گیا و بوونەوەری زیندە و مردووە وەکوو دار و بەرد و حەیوانات. وەك خۆی دەڵێت: *چی خوا* دروستی کردووە ٣ *نەوعە: یەکێکی پێی ئەڵین جامد، یەکێکی پێی ئەڵێن مایع و یەکێکی [تری] پێی ئەڵێن غاز. جا جامد ئەوەیە شکڵەکەی بگیری ببینرێ تا بە زۆر نەیگۆڕی نەگۆڕێ وەك بەرد مەسەلەن.* لە کۆتایی دەستنووسەکەدا ئاوا باس دەکات: *وە ئەم مادانە هەمووی لەیەك نەوع خواردنا دەس ناکەوێ مەسەلەن هەر برێنج خواردن تەنها غەڵەتە. لە هەموو باشتر بۆ ساغی بەدەن خواردنی میوەیە، حەب وەك نان [و] برێنج مەسەلەن. وە کاکلە وەك گوێز [و] بادام مەسەلەن. لە میوەدا لە هەمووان باشتر پرتەقاڵ، مۆز، سێو، قۆخ و ترێ نەحوی ئەمانەیە.*

**٤. [لە دەقی ئامادەکراو بۆ بەرگی ٢ فهارسی بنکەی ژین لە بەشی الطب ژمارە ١ (ئەلف) دانراوە]. ئەم دەستنووسە هی بنەماڵەی مامۆستا عبداللطیف دانساز بووە.**[١]

کتێبەکە بە زمانی فارسی و عەرەبی نووسراوە و سەرەتا و کۆتاکەی داکەوتووە. ناوی نووسەر، کاتب و شوێن و کاتی نووسینەکەی پێوە نییە. بابەتی دەستنووسەکە *چارەسەری و پزیشکی بە گژوگیایە* [واتا گیادەرمانییە]. ٨١ لاپەڕەیە لە ئەندازەی ١٤.٥*٢٠ سم. ئەم کتێبە تایبەتمەندی و سوودی هەموو گیاکانی بۆ چارەسەری نەخۆشییەکان باس کردووە.

**٥. [لە دەقی ئامادەکراو بۆ بەرگی ٢ فهارسی بنکەی ژین لە بەشی الطب ژمارە ١ (ب) دانراوە]. ئەم دەستنووسە هی بنەماڵەی مامۆستا عبداللطیف دانساز بووە.**

کتێبەکە بە فارسی و عەرەبی نووسراوە و سەرەتا و کۆتاکەی داکەوتووە. ناوی نووسەر، کاتب و شوێن و کاتی نووسینەکەی پێوە نییە. بابەتی دەستنووسەکە *چارەسەری و پزیشکی*

---

١. شێخ عبداللطیف دانساز کوڕی شێخ عبدالکریم کوڕی شێخ عبدالقادر مهاجر لە بنەماڵەی مەردۆخیەکانی سنەیە. ئەو دانسازە حەکیمە مرۆڤێکی دەسترەنگین و خاوەن بەهرە بووە. خەتخۆش و سەنعەتکارێکی بێوێنە بووە. پووڵەکەی سەردەمی شێخ مەحموودی نەمر دەستسازی ئەو بووە. هەروەها دوو تفەنگی بەدەستی خۆی دروست کردووە کە یەکێکیان ئێستە لە بنکەی ژین پارێزراوە. نزیکەی سەد دەستنووسی تایبەت بە کتێبخانەی ئەو پیاوە لە بنکەی ژینە. [وەرگرتنی زانیاریەکان لە مامۆستا ڕەفیق ٩٧/٠٣/٣١]

*بە گژوگیایە* لەگەڵ هەندێ بەروبوومی دارەکان و بەرهەمی ئاژەڵ و شتی دیکە. ١٣ لاپەڕەیە لە ئەندازەی ١٤.٥*٢٠ سم. ناوی دار و ڕووەکەکانی بە عەرەبی نووسیوە و لە ژێریانەوە ناوی فارسیەکەیشی داناوە.

**٦. [لە دەقی ئامادەکراو بۆ بەرگی ٢ فهارسی بنکەی ژین لە بەشی الطب ژمارە ١ (ج) دانراوە]. ئەم دەستنووسە هی بنەماڵەی مامۆستا عبداللطیف دانساز بووە.**

کتێبەکە وەرگێڕاوی کتێبی پزیشکی "*اختیارات بدیعی*"یە لە فارسیەوە بۆ عەرەبی. [اختیارات بدیعی عەلی کوڕی حسەین ئەنساری شیرازی: ٧٢٩ـ٨٠٦ کۆچی ناسراو بە حاج زین العطار نووسیویە.] ئەم دەستنووسە ناوی کاتب و وەرگێڕ و شوێن و کاتی نووسینەکەی پێوە نییە. [بابەتی دەستنووسەکە دەرمانە تاکەکانی (ادویە مفردە) گیایی، ئاژەڵ و سروشتییە کە تایبەتمەندی و سوودی هەموویانی باس کردووە. هەروەها شێوازی دەرمانەکان وەکوو شیاف، مەڵهەم، هەنوون، تۆز، هاڕاوە، حەب و کوڵاندنی (چایی) هێناوە.]، دەستنووسەکە ٨٠ لاپەڕەیە لە ئەندازەی ١٤.٥*٢٠ سم.

**٧. [لە دەقی ئامادەکراو بۆ بەرگی ٢ فهارسی بنکەی ژین لە بەشی الطب بەشی دەستنووسەکانی مامۆستا عبداللطیف دانساز دانراوە].**

ئەم کتێبە وەك مامۆستا ڕەفیق دەڵێت دەستنووسێکی هەتیوە و تەنیا ئەم دانەی تا ئێستە بەرچاو کەوتووە و دەستنووسی تر لەمە ڕوونووسی نەکراوە. شێخ عبدالطیف ساڵی ١٣٤٣ کۆچی بە خەتی خۆی نووسیویەتیەوە. دەستنووسەکە بە زمانی فارسییە و ناوی کتێبەکە و نووسەرەکەی پێوە نییە. بابەتەکەی لەسەر *چارەسەری نەخۆشیەکان بە گژوگیا*، دەرمان و چێژەمەنیە شەفابەخشەکان، گیراوە و ماجوومە تێکەڵاوەکان، بابەتە تایبەتیەکان بۆ بواری ددان، پاڵاوتنی ئاو، و هەندێ پەراوێزی دیکە وەك دۆعا و نووشتە و هۆنراوەی فارسی و عەرەبییە. دەستنووسەکە ٥٩ لاپەڕەیە لە ئەندازەی ١٥.٥*١٨ سم. سەرەتای دەستنووسەکە ئەمە نووسراوە: *گرمی انەوت برار نگون و حبی دندان روغنیت رب مورشید گوگر زور.* و لە کۆتایی دەستنووسەکەیش: *ولی خوردن روغن است هر نفور کە بخواهر بتوفیق خدا موفق میشود.*

**٨. [لە دەقی ئامادەکراو بۆ بەرگی ٢ فهارسی بنکەی ژین لە بەشی الطب ژمارە ٢ دانراوە].**

**ئەم دەستنووسە هی بنەماڵەی بەدیع بابەجانی سلێمانی[1] بووە.**

ئەم کتێبە ناوی "*جامع الحکمتین و مجمع الطبین*"یە کە بە زمانی فارسییە و نووسەرەکەی نووسراوە: میرزا بدیع حکیم باشی. ڕێکەوتی نووسینەکەی نادیارە و پێوەی نییە. ناوی کاتبەکەی مەلا عبدالرحمن نۆدشەیە کە ئەوکاتە لە شاری سنە مامۆستا و وانەبێژی مزگەوت بووە و ساڵی ۱۲٦۲ کۆچی کتابەت کراوە. بابەتی کتێبەکە لەسەر چارەسەری نەخۆشیەکان بە یارمەتی دەرمانە تاك و تێکەڵەکانە کە لە گژوگیا گیراونەتەوە. سەردەمی نووسینی ئەم کتێبە هاوکاتە لەگەڵ هاتنی ڕێبازی پزیشکی هاوچەرخ واتا پزیشکی فەرەنگی بۆ وڵاتی ئێران. کەواتە لێرە نەخۆشی و چارەسەریەکانی لە هەر دوو پزیشکیەکە (کۆنی ئێرانی و فەرەنگی) باس کردووە. دەستنووسەکە ٤١٦ لاپەڕەیە لە ئەندازەی ۲۲*۳۲ سم. سەرەتای دەستنووسەکە پاش بەشی پێڕست و سەڵوات و ناوی خوا ئەمەیە: "*نسخه دواي اول عين السرطان هست حبه شوره شسته وحبه مخلوط كرده سفوف بسيار نرم مسازند بيكبار بكاربرند، دوم مشوره شسته بك درم شربت ريباس هشت درم آب بشوقه چهل درم...*" و لە کۆتایی دەستنووسەکەیش هاتووە: "*...بسيار نافع باشند بشرط اينكه قدري خوراك اينرا نسبت بسنهاتي ايشان بدهند، در محل حاجب حجامته لوهارا نيز بكاربرند و سايرند برآنها را انجويكه در بزرگان كفتهايم معمول دارند. الحمدلله الذي هدنا لهذا وماكنا لنهتدي لولا أن هدانا الله*".

باپیرە گەورەی بنەماڵەی بەدیع بابەجانی سلێمانی نۆژدار و حەکیمباشی دەرباری بابانەکان بووە. لەم دەستنووسە نووسراوە کە ئەم کتێبە لە سەردەمی دەسەڵاتداری فتحعلی شاه قاجاردا [۱۲۲۱ـ۱۲٥۰ کۆچی] نووسراوە.

**۹. [لە دەقی ئامادەکراو بۆ بەرگی ۲ فهارسی بنکەی ژین لە بەشی الطب ژمارە۳ دانراوە].**

**ئەم دەستنووسە هی بنەماڵەی بەدیع بابەجانی سلێمانی بووە.**

ئەم کتێبە ناوی "*جامع الحکمتین و مجمع الطبین*"یە کە بە زمانی فارسییە و نووسەرەکەی نووسراوە: میرزا بدیع حکیم باشی. ڕێکەوتی نووسینەکەی نادیارە و پێوەی نییە. ناوی کاتبەکەی پێوە نییە و ۲۳ جمادی الاولی ساڵی ۱۲٥۳ کۆچی کتابەت کراوە. بابەتی کتێبەکە لەسەر چارەسەری نەخۆشیەکان بە یارمەتی دەرمانە تاك و تێکەڵەکانە کە لە

---

۱. نزیکەی دە دەستنووسی بنەماڵەی بەدیع بابەجانی ئێستە لە بنکەی ژین پارێزراوە کە هەندێکیان دیوانی شێعری شاعێرانی ئێرانە.

گژوگیا گیراونەتەوە. سەردەمی نووسینی ئەم کتێبە هاوکاتە لەگەڵ هاتنی ڕێبازی پزیشکی هاوچەرخ واتا پزیشکی فەرەنگی بۆ وڵاتی ئێران.[1] کەواتە لێرە نەخۆشی و چارەسەریەکانی لە هەر دوو پزیشکیەکە (کۆنی ئێرانی و فەرەنگی) باس کردووە. دەستنووسەکە ٥٩٠ لاپەڕەیە لە ئەندازەی ٢٠*٢٨.٥ سم. سەرەتای دەستنووسەکە پاش بەشی پێڕست و سەڵوات و ناو خوای ئەمەیە: "لحمد الحکیم المطلق الذي خلق، خلق الانسان من علق، والعلیم الاعظم الاکرم الذي علم بالقلم، علم الانسان ما الم یعلم بنام خداوند جهان آخرین. نظم. حکیم سخن در زبان آخرین، خدواند بخشنده دستگیر، کریم خطا بخش کوزش حذیر.." و لە کۆتایی دەستنووسەکەیش هاتووە:"... در محل حاجت حجامت دز الوهانیز بکاربرند وسایر تدابیر آنهارا به نحوي که در برزان کفة ریم معمول دارند. تمت الکتاب بعون الملك الوهاب بتاریخ ٢٣ شهر جمادي الاولی ١٢٠٣هـ". لە لاپەڕەی ٥٩٠ بەم شێوە ئەم بابەتە کۆتایی هاتووە:"....جوهر مصطکي بجهة تقویت معدة و قوت باه و تفریح قلب و دماغ و تقویت اعصاب و رفع نفخ مؤثر است با قند شربت استعمال میشود" آب جوزق تازة را بانواع مالیدن از مجربات است".

**١٠. [لە دەقی ئامادەکراو بۆ بەرگی ٢ فهارسی بنکەی ژین لە بەشی الطب ژمارە ٤ دانراوە].**

ئەم کتێبە ناوی "**خزانه الحکمه و کنز الفکر**"یە کە بە زمانی عەرەبییە و نووسەرەکەی نووسراوە: محمود ضیاءالدین الصاحب الخالدي النقشبندي العثماني حفید شفیق مولانا خالد. ڕێکەوتی نووسین و کتابەت و شوێنی کتابەتی نادیارە و پێوەی نییە. بابەتی کتێبەکە لەسەر چارەسەری نەخۆشیەکان بە گژوگیا و هەروەها باسی دەرمانسازی، و چارەسەریەکانی دیکە لە سەردەمانی کۆن لە کۆمەڵگا، وەکوو سەردەمانی کۆنی کوردەواری و کۆمەڵگەی کوردی. هەندێك باسی پزیشکی نەبەوی و باسی حەکیمانی کۆن و بابەتی کیمیاوی و زیندەوەرانیشی تێدایە. دەستنووسەکە ٩٨ لاپەڕەیە لە ئەندازەی ١٦*١٠.٥ سم. ئەم دەستنووسە بە نووسین و خەتی کۆن نووسراوە. سەرەتای دەستنووسەکە پاش بەشی پێڕست و سەڵوات و ناوی خوا ئەمەیە: "الحمد لله المنعم الجواد، والصلاة والسلام علی

---

١. ئاشنابوون و کردنەوەی دەروازەی ئێرانیەکان بۆ ئەرووپا دەگەڕێتەوە بۆ دامەزراندنی یەکەم قوتابخانەی هاوچەرخ بە ناوی دارالفنون کە میرزا تەقی خان ئەمیرکەبیر ساڵی ١٢٣٠ کۆچی (١٨٥١) کردیەوە و یاکووب ئەدوارد پۆلاکی نەمسایی کردە وانەبێژی پزیشکی و نەشتەرگەری و زانستی حێکمەتی قوتابخانەکە، دواتر سەردان کردنی ناسردەین شای قاجار یەکەم پاشای ئێران بۆ فەرەنگ لە ساڵی ١٢٨٩ کۆچی (١٨٧٣). کەواتە پزیشکی هاوچەرخ ساڵەکانی سەرەتای سەدەی ١٢ کۆچی هاوتووەتە وڵاتی ئێران و تەنانەت ناوچەکە بەگشتی.

محمد اكسير الحقيقة وشفيع الخلق يوم المعاد، وعلى آله واصحابه وسلم تسليما. اما بعد: فيقول العبد الحقير الفاني محمود ضياء الدين الصاحب الخالدي النقشبندي العثماني حفيد شقيق مولانا خالد: اني جمعت هذه المجريات من اقوال الحكماء والمجربين والمشتغلين في هذه الصناعة امثال جابر بن حيان وابن وحشية والرازي... و لە کۆتایی دەستنووسەکەیش هاتووە: "... وينتهي اخرها بالفائدة (۴۰۲) على وجه الورقة الثالثة وهي (۴۰۲) تكليس الزجاج وهو ان يحمى ويطفأ في محلول الغلي الحاد مرارا حتى يصير مثل الهباء".

**١١. [لە دەقی ئامادەکراو بۆ بەرگی ٢ فهارسی بنکەی ژین لە بەشی الطب ژمارە ٥ دانراوە].**

ئەم کتێبە ناوی "*تحفه حکیم*"[١]یە کە بە زمانی فارسییە و نووسەرەکەی محمد مومن حوسەینی [دەیلەمی تونەکابۆنییە کە پزیشکی سەردەمی شا سولەیمانی سەفەوی بووە. ئەم کتێبە ساڵی ١٠٨٠ کۆچی نووسراوەتەوە.] ڕێکەوتی کتابەت و شوێنی کتابەتی نادیارە و پێوەی نییە. ئەم کتێبە گوشراو و پوختەیەکە لە کتێبە پزیشکیەکانی پێش سەردەمی سەفەویە. [بە گشتی ناوەرۆکی ئەم کتێبە بریتیە لە: جیاوازی بۆچوونی حەکیمانی کۆن لەسەر گرتنەوە، ڕێژە، تایبەتمەندی و پێکهاتەی دەرمانەکان، تایبەتمەندی و سوودی دەرمانە تاك و تێکەڵەکان، ناوەرۆك و کواڵێتی و ناواخنی دەرمانەکان و چاکسازی باری خراپی دەرمانەکان، چارەسەرکردنی ژەهراویەکان، و بابەتی کۆتایی لەسەر کێش و سەنگە.] دەستنووسەکە ٣٦٤ لاپەڕەیە لە ئەندازەی ١٧*٢٦.٥ سم. سەرەتای دەستنووسەکە پاش بەشی پێڕست و سەڵوات و ناو خوای ئەمەیە: "سبحانك اللهم ياقدوس وياطيب النفوس، اتمم لنا انوار معرفتك وارزقنا حلاوة مغفرتك، شكر مشيرين شربت حيلات حكيمي را جل شأنه كه بة بى نصيبان ذاتي عرضه امكان مايده وجوبش".

**دەستنووسەکانی کتێبخانە شەخسیەکان: ئەوانەی کۆپی و فایلی ئێسکەنکراویان لە ئەرشیڤی نووسەردا هەیە.**

*** دەستنووسی زاد المسافر**

ئەم دەستنووسە لە کتێبخانەی شێخ عەبدوڵای هەزارکانیانی حەکیمی ناوداری ناوچەی ساراڵ بە جێ ماوە. کۆپییەك لەو دەستنووسە لای دکتۆر نەوید نەقشبەندی مامۆستای زانکۆی کوردستانە و بەهاری ١٣٩٧ ئەو بەڕێزە بە بەندەی داوە. ئەو دەستنووسە ٣٢٤

١. بە "تحفه المومنين يا تحفه حەكيم موئمن تونەكابونی"یش دەناسرێتەوە.

لاپەڕەیە. بەشێك لە پەڕەکانی دڕاوە و نەماوە. لە سەرەتای دەستنووسەکە کە نووسراوە: *هـذا الکتاب زاد المسافر*، مێژووی ١٢٨٦ کـۆچی پێوەیە. دیـارە کە خەتـی چەنـد کەسـە و لە پەراوێزەوە جارێك ناوی عبدالقادر ناوێك هاتووە. لە وتاری "حەکیمانی بنەمـاڵەی مەولەوی و دەستنووسـێکی کتێبخانەیـان" هـاتووە کە یەکێـك لە کتێبەکـانی کتێبخـانەی مامۆسـتا عبدالقادر کۆیی باپیرە گەورەی بنەماڵەی حەکیمانی مەولەوی بانە و مەهاباد کاتی خـۆی لە سنە خوێندوویە، زاد لامسافر بووە. جا لەوانەیە ئەو دەستنووسەی کتێبخانەی شێخ عبـدالله هەزارکانیانی هەمان بێ کە ئاماژەی پێ کـراوە و لە بنەمـاڵەی مەولەوی بە جۆرێـك بە وی گەیشتووە.

*** دەستنووسی تحفه مومن تنکابنی**

ئەم دەستنووسە و چەند لاپەڕە و پەڕاوی جیاجیای دیکەی پزیشـکی لە کتێبخـانەی کـاك هومایۆن نیك ڕەفتار خەڵکی ئاوایی دزاوەری هەورامان کە ئێستە نیشتەجێ شاری مەریـوانە پارێزراوە. دەستنووسەکەی تحفه تونەکابۆنی نیوە و ناتەواوە و تێکەڵی پەڕە جیاکـانی دیـکە بووە. بابەتی پەڕاوە جیاجیاکانیش لەسەر پزیشکی و بابەتی فیقهـی و زانسـتەکانی دیـکەیە. کاك همایۆن باس لەوە دەکات کە چەنـد سـاڵ پـێش ئێسـتا هەواڵـم پـێ گەیشـت کە لە هەوارەکەی سەیدی هەورامی لە هەورامان لە کەوێـڵ و باخێـك سـندۆقێکی کـۆن هەیە و چەندین کتێب و دەستنووسی کۆنی تێدایە. خەڵك وا باس دەکەن کە ئەو سـندۆقە میراتـی مامۆستا صیدی هەورامی شاعێری هەورامانە. ئەگەرچی گوایە سەیدی هەورامـی دوو کەس بوون و ئەوەی یەکەمیان کە زووتر ژیـاوە و حەکـیم و پزیشـکێکی شـارەزا بـووە. بەهـاری ١٣٩٧ سەردانی کاك همایۆنمان کرد و بەشێك لە بەڵـگە و دەستنووسـەکانم ئێسـکەن کـرد. ئەو بەڕێـزە بۆخـۆی کەسـێکی چـالاك و شـارەزایە لە بـواری بەڵـگە و دەستنووسـەکانی کوردەواری.

*** دەستنووسەکانی اشرف الحکمای کوردستانی (٧ دەستنووس)**

لە کتێبخانەی نەوەکانی سەید موحەمەد حەکیم ئەلیاسی ناسـراو بە اشـرف الحکمـا چەنـد دەستنووسێکی پزیشـکی پـارێزراوە. ئەو دەستنووسـانە بەشـێکیان دانـراوی خـودی سـەید موحەمەدن و ئەوانی دیـکە سـەرچاوەی فارسـی و عەرەبـیە و لە کتێبخانەکەیـدا بـووە. لە وتاری (حکیمی نـامی از دیـار گـروس: سـید محمـد الیاسـی معـروف بـه اشـرف الحکمـا کردستان) کە بۆ کۆنفرانسی (گروس شناسی دانشگاه آزاد سـنه: بەهـاری ١٣٩٨) نـاردوومە باسی هەموو دەستنووسەکانی ئەم گەورەپیاوە کراوە:

* دەستنووسێکی ٢٨ لاپەڕەیی کە بە زمانی فارسییە و بابەتەکەی (ناساندن و چارەسەری کێشەکانی ئەندامی زاوزێ و نزیکی کردن و ڕەحەتبوونی پیاوە)یە. ئەم دەستنووسە لە کتێخانەی کاك زاهێد ئەلیاسی لە مەریوان پارێزراوە.

* کتێبێکی کۆنی چاپی سەنگی ١٥٠ لاپەڕەیی کە بە زمانی فارسییە و ناوی (کتاب الصحه)یە و وادیارە لە ڕووسیا چاپ بووە. ئەم کتێبە لە کتێخانەی کاك عوبەید ئەلیاسی لە ئاوایی حسێن خانی بیجاڕ پارێزراوە. گوایە سەردەمێك وا ڕووسەکان هێرشیان هێناوەتە سەر کوردستان، ئەم دەستنووسە گەیشتووە بە سەید موحەمەد ئەلیاسی.

* دەستنووسێکی ٥٠٠ لاپەڕەیی کە پوختە و گوشراوێکە لە کتێبە پزیشکیەکانی کۆن. بە زمانی فارسی نووسراوە و پشتاوپشت سەید موحەمەد حەکیم و باب و باپیرانی نووسیویانەتەوە. هەروەها چەندین ڕەچەتە و ڕینمایی دەرمانی و چارەسەری تایبەت بەو بنەماڵە لە پەراوێزیەوە هاتووە. ئەسڵی ئەم دەستنووسە لە کتێبخانەی کاك عابێد ئەلیاسی لە سنە پارێزراوە.

* کتێبێکی کۆنی چاپی سەنگی ٢٠٠ لاپەڕەیی کە بە زمانی فارسییە و ناوی (کتاب جراحی)یە و نووسەرەکەی دکتۆر یاکووب ئەدوارد پۆلاك نەمسەوی، پزیشکی سەردەمی ناسرەدین شای قاجارە کە ساڵی ١٢٧٣ کۆچی ئەم کتێبە نووسراوە. ساڵی ١٣٣٤ کۆچی بۆ سەید موحەمەد کڕدراوە. ئەم کتێبە لە کتێخانەی کاك عابید ئەلیاسی لە سنە پارێزراوە.

* کتێبێکی کۆنی چاپی سەنگی ٢٠٠ لاپەڕەیی کە بە زمانی عەرەبییە. کتێبێکە وێنەی هەموو نەخۆشی و چارەسەرکانی تێدایە. ئەو کتێبە ساڵی ١٨٧٣ لە بەیرووت چاپ بووە و یەکێك لە شاگردەکانی دیاری کردووە بە سەید موحەمەد. لە کتێخانەی کاك ڕاشد ئەلیاسی لە سنە پارێزراوە.

* کتێبێکی کۆنی چاپی سەنگی ١٥٠ لاپەڕەیی کە بە زمانی فارسییە و ناوی (دستور العلاج)یە. ئەم کتێبە لە سەمەرقەند چاپ بووە و یەکێك لە نەخۆشەکانی کە چاك بووەتەوە دیاری کردووە بە سەید موحەمەد. لە کتێخانەی کاك ڕاشد ئەلیاسی لە سنە پارێزراوە.

* کتێبێکی دەستنووس بە ناوی (کتاب شرح الاسباب فی علم طب) کە پوختەیەکە لە کتێبە پزیشکیەکانی کۆنە. ئەو کتێبە کاتی خۆی مەلا مەحموود موفتی حاکم شەرعی کوردستان دیاری کردووە بە سەید موحەمەد حەکیم. لە کتێبخانەی کاك ڕاشد ئەلیاسی لە سنە پارێزراوە. لە کۆتایی کتێبەکە ئەم یاداشتەی پێوەیە: *این کتاب را محض یادگاری خدمت جناب مستطاب سعادت آقا سید محمد جراح دامت سعادته تقدیم نمودم و بایشان*

*بطریق هبه شرعیه بخشیدم. انشاالله مبارك باد. محرم ١٣٥١ الفقیر الی اللـه محمـود مفتـی کردستانی [محل مهر]*

*** دەستنووسی قرابادین کبیر**

ئەو دەستنووسە لە کتێبخـانەی کـاك ئەمیـر (یەحیـا) مـوحەمەدی لە سـنە پـارێزراوە. ئەو بنەماڵەیە خەڵکی ناوچەی لەیلاخن و ساڵانێکە هاتوونەتە سنە. کاك ئەمیر بۆخۆی چەنـدین ساڵە بە ئاوایییەکانی دەوروبەری سنە و کولیایی و هەورامان و کامیەراندا دەگەڕێت و بەڵـگە و دەستنووسـە کۆنەکـان ئەدۆزێـتەوە و ئەمـانەت وەریـدەگرێت و ئێسـکەنیان دەکـات و ناسنامەی دەستنووسیان بۆ ڕێك دەخات. کتێبخانەیەکی دیجیتاڵی هەیە بە ناوی "هەرەس". زۆر شارەزایانە دەستنووسەکان ئێسکەن دەکات و زانیاریەکانی بـاری دەستنووسـەکە تۆمـار دەکات و لە ئەرشیڤی خۆی دەیانپارێزێـت. بڕیـارە بەڕێزیـان وردە وردە ناسـنامەکان بخـاتە توێی فایلێك و لە کتێبێکدا بە ناوی "فهارستی دەستنووسەکانی کتێبخانەی هەرەس" چـاپی بکات تا بکەوێتە بەردەست خوێنەران، و هەروەها ناونیشانی ئەو گەنجینە نایابە ئاشکرا بێـت و توێژەران بتوانن سوودی لێ وەربگـرن. ئەم دەستنووسـە سـەرەتا و کۆتـاکەی نەمـاوە. بە خەتێکی خۆش نووسراوە. لە ڕووی جۆری کاغەز و نووسینەکەوە دیـارە کە زیـاتر لە سـەد ساڵ پێشتر نووسراوە. چەندین پەراوێزی دەرمانی پێوەیە. ١٥٦ لاپەڕەیە و بە خەتـی ڕەش و سوور نووسراوە. ئەو دەستنووسە خوالێخۆشبوو باوکی کاك ئەمیر کـاتی خـۆی کڕیـویەتی و بۆ خوێندنەوەی خۆی بووە. پێشتر لای کەسێك بووە بە ناوی سەید سادق عـومرانی کـوڕی سەید یەحیا لە ساڵی ١٣٣٥ هەتاوی.

*** دەستنووسی طب جالینووس (٢ دەستنووس)**

شێخ موحەمەد ئەرواسی وانی لە سەدی ١٧ زایینی کـردوویە بە کـوردی. دوو دەسـتنووس لەو کتێبە لە ئەرشیڤی نووسەردا هەیە کە لە وان و ئامەد دەستم کەوتووە. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە وتاری " کتێبی پزیشکی شێخ موحەمەد ئەرواسی وانی کۆنترین سەرچاوەی کـوردیی پزیشکی".

*** دەستنووسی کفایة الطب**

ئەو دەستنووسە پزیشـکیە سـاڵی ١٢٩٠ کـۆچی لە ئـاوایی کێسـتەی نـاوچەی بەرواری بادینان نووسراوە. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە وتاری "دەستنڤیسی پزیشـکی کفایـة الطـب لە کتێبخانەی سمایل حەکیمی سلێڤانی".

*** دەستنووسی طب الزمان**

ئەو دەستنووسە پزیشکییە و چەند بەڵگەی تر پەیوەست بە فەقێ ئەحمەد حەکیم دۆزەغەرەییە. ئێستە لای نەوەزادەکانی دکتۆر عەلی موستەفازادە و کاك خالید پەناهی لە مەریوان پارێزراوە.

*** دەستنووسە پزیشکیەکانی زانایانی کورد [تا ئێستە گوزارش کراون] لە کتێبخانەکانی ئێران**[1]

* دەستنووسی کتێبی (**تشريح الابدان**)

دانەری ئەو کتێبە منصور بن محمد بن الياس شيرازييە کە ساڵی ٧٩٨ کۆچی نووسیویە. میرزا نەسروڵا کوڕی میرزا موحەمەد شەفێعی خۆشنووس لە دیە؟ شاری شنۆ مانگی ربيع الثانی ١٢٦١ کۆچی نووسیویەتیەوە بۆ کەسێك بە ناوی عبدالغفور خان. ئەو دەستنووسە بە ژمارە ٤٥٠ [ئەلف] لە ئەرشیڤی کتێبخانەی (مرکزی دانشگاه تهران) پارێزراوە. ئەو کتێبە فارسییە و بەشێکە لە پاشکۆی کتێبی تشريح الابدان. بابەتەکەی ئەمانەیە: بەشی یەکەم کە ١٨ بڕگەیە نەخۆشیەکانی ژنان، گورچیلە، سەر، گوێ، چاو، و تاد باس دەکات، بەشی دووهەم یاو و هاوڵە و کەوتوویی و برین و هەوکردن، هەروەها لە بەشی کۆتایی باسی هێزی جنسی و زاوزێ کردووە.

*** دەستنووسی درمان بيماريها**

نووسەرەکەی دیار نییە و لەوانەیە هەمان کاتبەکەی بێت. میرزا نەسروڵا کوڕی میرزا موحەمەد شەفێعی خۆشنووس لە دیە؟ شاری شنۆ ساڵی ١٢٦١ کۆچی نووسیویەتیەوە بۆ کەسێك بە ناوی عبدالغفور خان. ئەو دەستنووسە بە ژمارە ٤٥٠ [ب] لە ئەرشیڤی کتێبخانەی (مرکزی دانشگاه تهران) پارێزراوە. ئەم کتێبە فارسییە و ٣٤٦ لاپەڕەیە و بابەتەکەی توێکاری و شیکردنەوەی ئەندامەکانی بەدەنی مرۆڤ بە وێنەوە و هەروەها باسی زەیستانی و زایین.

ئەمانەی خوارەوە هەواڵی ئەو دەستنووسە پزیشکیانەن کە بە جۆرێك ئاگەداری و زانیاریم دەست کەوتووە کە سەردەمانێك بوونیان بووە یا ئێستاکە لە ئەرشیڤی ماڵاندا پارێزراوە. هیوادارم ئەم وتارە ببێتە هۆی ئەوە کە ئەم دەستنووسانە و نموونەکانی دیکە بکەونە بەر توێژینەوە و چاپ کردن و سەرنجام لە فهارستی کتێبە دەستنووسەکانی کوردستاندا دەربکەون.

١) لە کتێبخانەی بنەماڵەی طیبزادە لە ئاوایی دزاوەری ناوچەی هەورامان کتێبێکی

[1]. سپاس بۆ کاك موحەمەد عەبدولی لە مەهاباد کە زانیاریەکانی ئەم بەشەی بۆ ڕەوانە کردم.

پزیشکی هەیە. هەواڵی ئەم دەستنووسەم لە مامۆستا موحەمەد ڕەشید ئەمینی لە پاوە و کاك همایۆن موحەمەد نژاد لە مەریوان بە دەست گەیشتووە. ئەم دوو بەڕێزە توێژەر و نووسەری ناوداری هەورامانن و لە بواری بەڵگە و دەستنووسدا لێکۆڵینەوە دەکەن.

٢) لە کتێبخانەی مامۆستا حەمید خەڵکی ژیواری هەورامان، خاوەنی دووکانی "سوغات و صنایع دستی هورامان" لە مەریوان (سەرووتر لە چوار ڕای ئەسڵی پاڵ مەدرەسەی تاڵەقانی) کتێبێکی پزیشکی هەیە. ئەم دەستنووسە چەند بەشە: بەشی یەکەمی عەرەبیە و ناوی اخبار الدقائقە و دوو بەشی دیکەی هەیە کە فارسی و عەرەبیە و باسی *طبایع و ڕەچەتە دەرمانیەکان* ئەکات. کەسێك بە ناوی شێخ عبدالقادر کوڕی شێخ عبدالرحمان کوڕی مەلا ئەحمەد ساڵی ١٣٠٦ کۆچی نووسیویەتیەوە. مامۆستا دەیگوت لە یەکێك لە ئاواییەکانی دەوروبەری مەریوان نووسراوە. ئەڵبەت لە سەردانێك کە بەپەلە چاوم بە دەستنووسەکە کەوت و پەلەپڕووسقێ لاپەڕەکانیم هەڵدایەوە ئەو زانیاریانەم دەست کەوت. کاك موحەمەد خاکی خاوەنی گیادەرمانی شەفا لە مەریوان کە هەواڵی ئەو کتێبەی پێم دا، فەرمووی مامۆستا گوتوویەتی کە کتێبەکە کوردێکی باکووری کوردستان نووسیوە و ئێمە لە زاخۆ کڕیومانەتەوە و ئێستە لای خۆمان دەیپارێزین. لە سەردانێکدا کە ١٣٩٧/٠٣/١٥ ئەو دەستنووسەمان بۆ ماوەی ٢٠ خولەك چاو پێ کەوت، مامۆستا زانیاری سەبارەت بەو دەستنووسە کە ئایا ڕاستە یا نە، ئاشکرا نەکرد.

٣) کتێبخانەیەك لە مەریوان، *بەشی پزیشکی لە کتێبی مەکتووباتی کاک ئەحمەدی شێخ.* هەواڵی ئەم دەستنووسە، لە کاك سەباح نیکخواه بە دەست گەیشتووە. کاك سەباح یەکێك لە دامەزرێنەرانی ناوەندی کەلەپووری بنکەی ڤەژینی مەریوانە کە ئێستە لە دەرەوەی وڵاتە. ڤەژین ئەرشیڤێکی دەوڵەمەندی بەڵگە و دەستنووسی ناوچەی هەورامان و مەریوانی هەیە. گوایە چەند ساڵ پێش ڤەژین هەوڵی داوە کە ئەو دەستنووسە ئێسکەن بکەن، بەڵام خاوەنەکەی ڕێگەی نەداوە و تەنیا ئێسکەنێکی لای کاك سەباحە. کاك سەباح چەند لاپەڕەیەکی لەو دەستنووسەی بۆ بەندە هەناردووە. بەداخەوە زانیاری زیاترم دەست نەکەوت.

٤) کتێبخانەی دکتۆر سەباح حوسەینی مامۆستای زانکۆی ئازادی ئیسلامی لە سەقز چەند **دەستنووسێکی پزیشکی** هەیە. ١٣٩٧/٠٣/٢٠ لە پێوەندیەکی تەلەفۆنیدا دکتۆر ئەو هەواڵەی بە بەندە دا و بڕیار وایە کە خۆیان لەسەر ئەو دەستنووسانە کار بکەن.

٥) کتێبخانەی دکتۆر نادر کەریمیان سەردەشتی لە تاران. زستانی ١٣٩٦ هەواڵی کتێبی

*طب الرحمە* کە مامۆستا واعێزی سەردەشتی کتابەتی کردووە و گوایە ئێستە لای کاك نادر دەپارێزرێت. لەلایەن چەند کەسێکەوە لە سەردەشت و هەروەها کاك موحسێن واعێزی کوڕی مامۆستا، هەواڵم پێ گەیشت. لە پێوەندیەك لەگەڵ کاك نادر سەبارەت بەو دەستنووسە، بەڕێزیان باسیان لەوە کرد کە بۆخۆیان خەریکی نووسینەوە و چاپی ئەو کتێبەن.

٦) دەستنووسی *قەرابادین* پشتاوپشت لە ناو بنەماڵەی سەمەد خانی زەرزایی شنۆدا هەبووە. کاك شەفێع خزری کوڕی کەڵەزانای گەورەی کورد مامۆستا قازی شەفێع شنۆیی بەرواری ١٣٩٧/٠٣/١٩ لە سەردانێك بۆ ئاوایی هێ ناوچەی شنۆ و پرسینی باسی بنەماڵەی سەمەد خان ئەو هەواڵەی دەست کەوتووە. گوایە ئەو کتێبە تا سەردەمی سەمەد خان بووە، بەڵام ئێستە دیار نییە لای کام لە کوڕ و کوڕەزاکانییە. کاك موتەلب ئەشجەعی زەرزایی کوڕی سەمەد خان باسی ئەوەی کردووە کە ئەو کتێبە لای بنەماڵەی ئێمە بووە، بەڵام ئێستە هەواڵی نازانین کەوتووەتە لای کێ.

٧) ئەنوەر مائی لە کتێبی اکراد و بهدینان (چاپی یەکەم، پەخشانگای الحصان، ١٩٦٠) لاپەڕە ١٨٦ باس لەوە دەکات لە کۆندا ناوچەی بادینان چەندین حەکیم و نوژداری پسپۆڕ هەبوون وەکوو حەکیم عبدالرحمن دەرگەڵکی بەرواری، سمایل حەکیم سلێڤانی دهۆکی، حەکیم عبدالکریم و مەلا ئەسعەد موفتی لە ئامێدییە. [سمایل حەکیم سلێڤانی دوو کتێبی پزیشکی فارسی هەبووە کە ئێستاکە یەکیان ماوەتەوە و لای کوڕەزاکەیە لە دهۆك دکتۆر سالم حەکیم، ئەویتر تا ئێستە نادیارە و یا نەماوە یا لای نەوەکانی دیکەیە و دەریناخەن.] مائی بۆ حەکیم دەرگەڵکی باس لەوە دەکات ئەم پیاوە حەکیمێکی دڵسۆز بووە و کتێبێکی *پزیشکی فارسی* هەیە. [بەرواری ١٣٩٧/٠٣/٢٤ پێوەندیم کرد بە کاك هێرش کەماڵ ڕێکانی لە شیلادزێ ئامێدی بۆ وەرگرتنی هەواڵ و زانیاری ئەو کتێبە. بەڕێزیان بەرپرسی گۆڤاری نیژەنن و لە بواری بەڵگە و دەستنووسەکانی ناوچەی هەکاری و بادیناندا گۆڤارەکەیان دەخەنە بازاڕەوە، باسی لەوە کرد بەداخەوە تا ئێستە کەس هیچ سەرەداوێك لەو کتێبە نازانێت و نەوەکانی حەکیم دەرگەڵکی هاوکاری ناکەن بۆ دۆزینەوە و ئاشکراکردنی.]

٨) دەستنووسی (الرحمە *فی الطب و الحکمە*) کە شێخ حەسەنی مەولاناوایی نووسیویەتیەوە لە ساڵی ١١٠٢ کۆچیدا. کتێبی (الرحمە فی الطب و الحکمە) ٨١٥ کۆچی لەلایەن جەلالەدین سیووتیەوە نووسراوە. وەك دەزانین شێخ حەسەن کەسایەتیکەی پایەبەرزی ئەو سەردەمە بووە لە ناوچەی سەقز و چەندین دەستنووس و بەڵگەی نایابی بە

شوێندا بە جێ ماوە، وەکوو دەستنووسی قورئانی پیرۆز، بابەتی ئایینی، هۆنراوەی فارسی و کوردی. لە پێوەندیەك لەگەڵ کاك ماجد ئیمام بەرواری ١٣٩٧/٠٣/٢٣ باسی ئەو دەستنووسە پزیشکیەم پێ گەیشت. لە پەراوێزی دەستنووسەکە نووسراوە: حسن *البستی بن شیخ محمود بن شیخ محمد بن شیخ ابراهیم الصادق*. دەستنووسەکە لە کتێبخانەی مامۆستایەك لە سەقز بە دەست هاتووە. بەشی سەرەتای داکەوتووە و بەشێك لە پەڕەکانی پەرپووت بوون. گەلێك پەراوێزی فارسی پێوەیە کە شێخ حەسەن بۆخۆی نووسیویەتیەوە. کاتبی ئەو دەستنووسە وەك لە کۆتاییەکەیدا دیارە خودی شێخ حەسەن بووە کە لە تەمەنی دەوروبەری ٣٠ ساڵانیدا نووسیویە. تایبەتمەندیەکی دیکەی ئەم دەستنووسە ئەوەیە کە شێخ حەسەن هۆنراوەیەکی هەورامی خۆی کە ٢٠ دێڕە لە پەراوێزیدا داناوە. ئەم دەستنووسە پاشکۆیەکی هەیە کە وێدەچێ هەمان کتێبی تەعبیر خەوەکەی شێخ حەسەن مەولاناوا بێ.

٩) کاك موحەمەد عەبدولی بەرپرسی گۆڤاری کەشکۆڵ (بەڵگە و دەستنووسەکانی کوردستان) لە مەهاباد ڕێکەوتی ١٣٩٧/٠٣/٣٠ باسی لەوە کرد کە بنەماڵەی مەولەوی (مەلا عبدالسلام مولوی طبیب ساوجبلاغی) لە مەهاباد کە هەر لە کۆنەوە بە حەکیم و دەرمانگەری ناوچەکە ناسراون چەند دەستنووسێکی پزیشکیان هەیە، وەکوو: *جامع الفواید در طب و تحفه حکیم مومن تونەکابۆنی*. گەلێك لە دەستنووسەکانی ئەو بنەماڵەیە لە کتێبخانەکانی تاران و مەشهەد و قۆم هەڵگیراوە.

١٠) کاك یۆنس ئەمینپوور خەڵکی ئاوایی ڕەحیم خانی بۆکان کە یەکێك لە توێژەرانی بواری بەڵگە و دەستنووسەکانی کوردەوارییە، لە پێوەندیەکدا ڕێکەوتی ١٣٩٦/٠٩/٢٥ لەسەر عەبدوڵا بەگ ناسراو بە مصباح الدیوان هەندێ زانیاری ئاشکرا کرد کە لە ئەرشیڤی ئەواندا گەلێك نامە و *بەرهەمی پزیشکی* و نەقاشی و بابەتی جۆراجۆری ئەو پیاوە هەیە. عەبدوڵا بەگ ساڵی ١٢٧٧ هەتاوی لە ئەرمەنیبلاغی بۆکان لەدایك بووە. شاعێر، خۆشنووس و نەقاشێکی بلیمەت بووە و سەردەمی موحەمەد عەلی شای قاجار مونشی باڵوێزخانەی فەڕەنسە بووە لە تەبریز. [ئەم بابەتە دیسانەوە لە وتووێژێکی نێوان کاك موحەمەد عەبدولی و کاك یۆنس لە ژووری گرووهی تلێگرامی (دوستداران مجله کشکول) لە زستانی ١٣٩٦ باس کرایەوە.] باسی ژیان و بەرهەمەکانی عەبدوڵا بەگ لە ژمارە ١ گۆڤاری کەشکۆڵدا هاتووە.

١١) کتێبخانەی بنەماڵەی شێخ بابا سەعید غەوساباتی مەهاباد. لە پێوەندیەکدا بەرواری ١٣٩٧/٠٣/٢٠ کاك مەسعوود سەعیدی نووسەری کتێبی "زندگی نامه عارف شهید حضرت

شیخ بابا سعید برزنجی غوث‌آبادی" خەڵکی مەهاباد هەواڵی چەند دەستنووسێکی پزیشکی (کتێبی *طب گیاهی و سنتی، ترجمه طب فرنگی و ترجمه بخشی از قانون ابن‌سینا*) بنەماڵەی بەرزنجیەکانی مەهابادی ئاشکرا کرد. گوایە بەشێك لەو دەستنووسانە لە ئەرشیڤی بەڕێزیان و هەروەها کتێبخانە شەخسیەکانی باقی ئەو بنەماڵەیەدا پارێزراون. لە پێشەکی ئەو کتێبە باسی ئەم دەستنووسانەی کردووە.

١٢) کتێبخانەی دکتۆر قەدی یەڵدرم: بەرواری ١٣٩٧/٠٥/١٨ بەڕێز دکتۆر قەدری هەواڵی دۆزینەوەی کتێبێکی دەستنووسی مەلای باتەیی [١٧٥٥ـ١٦٨٩] پێدام. گوایە چەند ساڵ پێش ئێستا لە ناوچەی هەکاری لای مامۆستایەکی بنەماڵەی باتەیی دەستنووسێکی دەست کەوتووە. ئەم دەستووسە لە ژێر ناوی "الحمایل" لە سەدەی ١٧ بە زمانی عەرەبی و فارسی نووسراوە. بابەتەکەی پزیشکی و دەرمانگەریی ناوچەیی سەردەمی مامۆستا باتەییە. ئەم دەستنووسە ئێستا لای دکتۆر قەدری پارێزراوە و بڕیار وایە بۆ کۆنفرانسی "طب سنتی زانکۆی پزیشکی سنە" وتارێك لەسەری بنووسێ.

١٣) کتێبخانەی بنەماڵەی مەلا ڕەسووڵ ئەدیب: لە توێژینەوەکانم بۆ دۆزینەوەی پاشماوەی شێعرەکانی ئەو شاعێرە گەورەی ناوچەی لاجانی پیرانشار نەوەکانی باسیان لەوە کرد کە لە خێزانی مەلا ڕەسووڵیان بیستووە کە مامۆستا بە دەستی خۆی کتێبێکی نووسیوە و هەمیشە لەگەڵی بووە. شێوەی وەك بەیاز بووە و پەڕەکانی شین بووە. هەر بۆیە هەمیشە لای ئەوان بە "*پەڕشین*" ناسراوە. ساڵەکانی ١٣٥٨ و ١٣٥٩ لە ئاژاوەکانی کوردستان ئەو دەستنووسە و کۆمەڵێك بەڵگەی دیکەی ئەو بنەماڵە لەناو دەچن. وەك لە ژیان‌نامەی مەلا ڕەسووڵدا دیارە کەسێك بووە لە بواری شێعر، خۆشنووسی، ئاش‌وەستایی و پزیشکی دەستێکی باڵای بووە. گوایە پەڕشین بابەت و ڕەچەتە پزیشکیەکانی مەلا ڕەسووڵ بووە.[١]

١٤) کتێبخانەی دکتۆر : کتێبێکی پزیشکی دەستنووس بە ناوی "طب الزمان" کە کاتی خۆی فەقێ ئەحمەد دۆزەغەرەی ساراڵ نووسیویەتیەوە. ئەسڵی ئەو دەستنووسە ئێستە کەوتووەتە لای توێژەری چالاك لە دیواندەرە، کاك سەیفوڵا کەرەمی. دەوری ١٥٠ ساڵ پێش ئێستا نووسراوەتەوە. بڕیارە بۆ چاپی بەشی دووهەم زانیاری تەواوی بە دەست بهێنین.

---

١. دیوانی ئەدیب، ئامادەکردن: م. گیوی موکریانی، هەولێر، ١٩٦٠. هەروەها وتوویژ لەگەڵ کاك کەماڵ ئەدیب نەوەی مەلا ڕەسووڵ لە پیرانشار [پاییزی ١٣٩٧]

ئەگەر سەیری مێژووی زانایانی کورد بکەین ئەم گەلە تا توانیویە ئەسپی خۆی لە هەموو بوارەکاندا تاو داوە و بەرهەمی خۆی پێ گەیاندووە. کۆتایی سەدەی ٢ کۆچی ئەبووحەنیفەی دینەوەری وەك یەکەم کەس لە مێژووی ئیسلام دەستی داوەتە نووسینی کتێبێك لەسەر گیاناسی و گیادەرمانی و باسی سروشت و کشتوکاڵ بە ناوی (کتاب النبات). پاش وی کەسانێکی زۆر هاتوون و بەرهەمیان خولقاندووە و گەنجینەی زانست و ئەزموونی پزیشکییان دەوڵەمەند کردووە. وەك مامۆستا هەژار لە پێشەکی وەرگێڕانی کتێبی (قانون فی الطب) ئەفەرمێ: بێ هۆ نەبووە ئەبوو عەلی سینا ماوەیەکی زۆر لە هەمەدان ماوەتەوە. شارێك کە کورد و فارس تێیدا دەژین و هاوسنووری کوردەواری بووە. یەك لەو خاڵانەی کە تەنیا مامۆستا هەژار سەرکەوتووانە توانی (قانون فی الطب) بکاتە فارسی، هەمان شوێنەوار و کاریگەری زمانی و فەرهەنگی کوردەواری بووە لەسەر نووسین و ناوەرۆکی ئەو کتێبە. لە نووسین بتەکینەوە و ئاورێك لە ئەزموونی زارەکی حەکیمانی خوێندەوار و نەخوێندەواری کورد بدەینەوە ئەویش بۆخۆی گەنجینەیەکی دیکەیە لە باخچەی کەلەپووری کورد بۆ کاروانی زانستی پزیشکی. بەڵگەی ڕوون و ڕاستی ئەم کەلەپوورە ڕەچەتە و ڕێچکەی بنەماڵەیی حەکیمانی کوردەوارییە کە تا ئێستەش ماوەتەوە. وەکوو بنەماڵەی عەبداڵ خانی بتلیسی، ئیسماعیل حەکیم سلێڤانی، حەکیمانی گوندی کۆییلێ قەندیل، شێخانی بیارە، حەکیمانی سەبەتلووی بانە، سەید موحەمەد حەکیم سیاسەرانی ناسراو بە اشرف الحکمای کوردستان، حەکیمە کۆڵەی لاجان، مینە حەکیمی سوورەبانی و دەیان بنەماڵە و ناوداری دیکە.

هەر دوو ڕێبازی کەلەپووری نووسراو و زارەکی پێویستە هەرچی زووتر کۆ بکرێنەوە و نەوەی ئێستەی کورد بە شانازیەکانی پێشینیانی خۆی بناسرێنەوە تا لەسەر ڕێبازی ئەوان درێژە بە کاروانی زانست بدەن. کتێبخانە شەخسی و دەوڵەتیەکان هێشتا دەیان و سەدان

بەرهەمی دەستنووس و بەڵگەیی زانایانی کوردییان تێدایە کە هێشتا کەس ئاگاداریان نییە[١] یا تەنیا ناوێکیان لێ دەبیسترێ. یەکێك لەو کەلەپوورانە کە پاش دوو سەدە تەنیا ناوی کتێبەکە و نووسەرەکەی هەبوو کتێبە کوردیە پزیشکیەکەی شێخ موحەمەد ئەرواسی وانیە.ساڵی ٢٠٠٠ یەکەم جار دەستنووسێکی لە کتێبخانەی شەخسی مامۆستایەك لە شاری دیاربەکر دەرکەوتووە و ساڵی ٢٠٠٥ ناوەرۆکی کتێبەکە و باسی ژیانی نووسەرەکەی هاتە چاپ کردن.[٢]

## باسی شێخ موحەمەد ئەرواسی و کتێبەکەی بە پێی سەرچاوەکان

١) کتێبی (*الهدیة الحمیدیة فی اللغة الکردیة*): *یۆسف ضیاءالدین پاشا (١٨٣٥ـ١٩٠٤) کوڕی حاجی موحەمەد کوڕی عەلی خالێدی موقەدەسی ئەم کتێبەی نووسیوە. کاتی خۆی باوکی یۆسف میری ئەرزەڕۆم بووە. یۆسف بۆخۆیشی لە ماوەی ژیانیدا چەندین پلە و پێگەی ئیداری و دیوانی لە ناو دەسەڵاتی عوسمانیەکاندا پێ بووە. چەندین زمانی زانیوە و هەر بۆیە لە قوتابخانەی زمانە ڕۆژهەڵاتیەکان لە وڵاتی گینە مامۆستای زمانی عەرەبی بووە و یەکەم کەس بووە دیوانی هۆنراوەکانی لەبید (مردن ٦٦١ ز.) کوڕی ڕەبیعەی ١٨٨٠ لە گینە چاپ کردووە. دواتر Hueber ساڵی ١٨٩١ لە ڕووی ئەو چاپە دیوانی لەبیدی وەرگێڕاوەتەوە سەر ئاڵمانی. یۆسف لە بتلیس فێری کوردی بووە و هەر لەو کاتەدا (الهدیة الحمیدیة فی اللغة الکردیة) نووسیوە*[٣] و ساڵی ١٨٩٢ لە ئەستانبوڵ بۆ یەکەم جار لە لایەن نووسەرەوە چاپ کراوە.[٤] لە لاپەڕە ٢٦٧ ئەم کتێبەدا هاتووە:

*...کتاب الظروف فی النحو لملا یونس الارقطینی و معرب عوامل الجرجانی لملا یونس المذکور و هذه الکتب الثلثه هی الان متداوله بین طلبه الکراد تقرا بالدرس و تحفظ عن*

---

١. بۆ نموونە دۆزینەوەی چەند دەستنووسێك لە کتێبخانەکانی تورکیە کە ناوەرۆکی لیێلی ژیانی مامۆستا نالییان پاش ١٠٠ ساڵ ڕوون کردەوە. [دکتۆر هێمن خۆشناو، نالی لە بەڵگەنامەکانی عوسمانیدا، چاپی یەکەم، بڵاوکراوەکانی دەستنووسخانەی زانکۆی سۆران، ٢٠١٧]

٢. ئەوەی زیاتر لەسەر ئەم کتێبە زیاتر دەنگی دایەوە هەواڵی "کۆنترین دەستنووسی کوردیی پزیشکی" بوو کە هەواڵنێری ڕووداو ماشەڵا دەکاك لە باکووری کوردستان ساڵی ١٣٩١ (٢٠١٢/٠٥/٠٧) چووە زانکۆی ماردین و هەواڵەکەی پەخش کرد. بۆ هەموو کوردێك جێی خۆشحاڵی بوو.

٣. فەرهەنگی فارسی دێهخدا، وشەی: یوسف ضیاءالدین پاشا، ئینترنێت (*Online*)

٤. لە نوسخەی چاپی ساڵی ١٨٩٢ کتێبەکە لە لاپەڕەی یەکەم یاداشتێك لە ڕێکەوتی ١٥ جمادی الاخر ١٣١٥ (١٨٩٧/١١/١١) هاتووە کە یۆسف ضیاء الدین پاشا کتێبەکەی دیاری کردووە بە شاعێری گەورە پیرەمێرد. ئەو کتێبە لە بنکەی ژین پارێزراوە. [سپاس بۆ مامۆستا ڕەفیق ساڵح بۆ ناردنی زانیاری و وێنەکان]

*ظهر القلب و كرساله ملا محمد الارڤاسي في علم الطب و غير ذلك...*[١]

٢) **گۆڤاری هاوار:** یەکەم ژمارەی هاوار ١٩٣٢ لە شاری شام چاپ کراوە. لە ژمارە ٣٣ ساڵی ١٩٤١ جەلادەت عالی بەدرخان بە ناویی نهێنی "هەرەکۆل ئازیزان" بابەتێکیی بە ناونیشانی (*کلاسیکێن مە: ئەن شەهیر و ئەدیبێن مە ئێن کەڤن*) نووسیوە کە باسی ژیان و بەرهەمی کۆمەڵێك زانا و شاعێری کوردی کردووە. لاپەڕەی کۆتایی وتارەکە بەم شێوە باسی شێخ موحەمەد ئەرواسی دەکات:[٢]

*"مەلایێ ئەرواسیێ: کتێبەکە کچك لێ هێژا نڤیساندیە. کتێبا وی ل سەر نەخوەشی و دەرمانێن وانە. مەلا تێ دە ڤالا نەخوەشیان دکە و دەرمانێ هەر نەخوەشیێ و چێکرنا دەرمانان ژی دبێژە. من ب خوە کتێب نە دیتیە. ئەز ب ساخلوخدانێ دبێژم. دیسان راوییان گۆتە من کو مەلایێ ئەرواسیێ د وەختێ ئەڤدال خانێ [= عبدالخان] باڤێ بەدرخان دە رابوویە. ل گۆرا ڤێ و ب تەخمین مەلا بەریا نهۆ ب ١٥٠ سالی ئەمر کریە. ژ کتێبا وی رە تبا مەلایێ ئەرواسیێ دبێژن".*[٣]

٣) کتێبی (*ل دۆر ئەدمێ کرمانجی*): یەکەم جار مەلا زەینەلعابدین لە دیاربەکر ساڵی ٢٠٠٠ لە ڕووی دەستنووسێکی کۆنی کتێبخانەکەی بە خەتی خۆی ڕوونووسی دەستنووسی کتێبەکەی شێخ موحەمەد ئەرواسی کردووە. کۆپیەك لەو ڕوونووسە کەوتووەتە لای توێژەر و نووسەری دەڤەری بادینان مامۆستا تەحسین ئیبراهیم دۆسکی. بەڕێزیان ساڵی ٢٠٠٥ سەرجەم باسی ژیانی نووسەر و ناوەرۆکی ئەو کتێبەی لە لاپەڕە ١٦ تا ٣٩ کتێبی (ل دۆر ئەدەبێن کرمانجی) چاپ کردووە و چەند وێنە لە لاپەڕەکانی دەستنووسەکەی لەو کتێبە داناوە. دکتۆر هێمن خۆشناو چووەتە مزگەوتی ئەو مامۆستایە و کۆپیەك لەو دەستنووسەی وەرگرتووە و نوسخەیەکیشی بۆ بەندە ناردووە.

---

١. دکتۆر یڵدرم لە لاپەڕە ١١ و ١٢ بەشی کوردی چاپی کتێبەکەی نووسیویە: *Rîsaletu Mula Muhemmed el-Erqetînî fî îlmit- Tibb (pirtûkçeya Mela Mihemedê Erqetînî)*. ئەگەر سەیری دەقی کتێبەکەی یۆسف ضیاء الدین بکەین ڕاشکاوانە ناوی کتێبی پزیشکی مەلا موحەمەد ئەرواسی و کتێبی تصریف و نحوی مەلا یۆنس ئەرقەتینی هاتووە. ئەو هەڵەیە لە لایەن دکتۆر یڵدرم ڕووی داوە و نووسراوە.

٢. ئەم باسە لە لاپەڕە ٨١٠ تا ٨١٨ هاتووە. سەرجەم ژمارەکانی ئەو گۆڤارە لەلایەن بنکەی ژین لە سلێمانی چاپ کراوە. جا ئەو باسە بەپێی ڕیزبەندی کتێبەکەیە نەك ژمارەی گۆڤارەکە.

٣. هاوار، ژ ٣٣، ل ٨١٨

٤) کتێبی (Tibba Melayê Arwasî): ئەو کتێبە بەڕێز دکتۆر قەدری یلدرم[١] ساڵی ٢٠١٣ لە زانکۆی ماردین چاپی کردووە. سەرچاوەکەی هەمان دەستنووسی مامۆستا تەحسین دۆسکییە و هیچ جیاوازیەك لە نێوان دەق و دەستنووسەکەدا نییە. دکتۆر یەڵدرم ڕێنووسەکەی لە ئارامیەوە کردووە بە لاتین و هەموو بابەتەکانی بە کوردی و تورکی لە دوو بەشی جیادا داناوە. لە کۆتایی بەشی تورکیەکە کۆپی هەموو ١٨ لاپەڕەی دەستنووسەکەی هێناوە، واتا لاپەڕەی ٥١ تا ٦٧ چاپی کتێبەکە. دکتۆر یلدرم لە "پێشگوتنێ" کتێبەکەی نووسیویە:

*"پرتووکا تبا مەلایێ ئەرواسی، ژ پەخشانا کوردییا کلاسیك نموویەکە بالکێشە و ب قاسی کو تێزانین د وارێ نووژداریێ دە میناکا یەکەمینا نفیسکییە. ژ بەر ڤی قاسی ژ گرینگیەکە وێیا دیرۆکی هەیە. نفیسکارێ وی شێخ مهەمەد ئەرواسی، کو د نیڤێ داوینێ سەد سالا ١٨ و دەسپێکا سەد سالا ١٩ دە ژیایە. یەك ژ مەزنێن بنەمالا ئەرواسیانە و یەکەمین ئەندامێ ڤێ بنەماڵێیە کو ل گوندێ ئەرواسێ ب جە بوویە. مەلایێ ئەرواسی ژ خوە رە تبا جالینووس (مرن: ٢٠٠ زایینی) وەکی ئەساس گرتیە. ئەساسێ ڤێ تبێ ل سەر تەجربەیانە. ئانگۆ د دەمانکرنا نەخوەشان د جارنان ئەنجامێن ئارێنی، جارنان ژ یێن نەرێنی دەرکەتنە هۆلێ. ب ڤی ئاوایی تەجرەبەیێن کو ئەنجامێن ئارێنی دانە هاتنە هلبژاردن، یێن کو نەدانە هاتنە تەرككرن. یەك ژ تایبەیێن ڤێ تبێ ژ تێکلیێن ناڤبەرا تەندورستی و ستێرناسییێنە. هەتا نیڤێ سەد سالا ٢٠ ل وەلاتێن کوردان هەژمارا نووژداران بژیشکان کێم بوو. گەلەك نەخوەشی ب ریا نووژداریا گەلی دهاتن دەرمانکرن و هێ ژ ئەڤ نووژداری دەوام دکە. ژ بۆ دەرمانکرنا گەلەك نەخوەشیان ژ نەباتان میفا دهات وەگرتن و هێن ژ رەوش وسایە. د ئاسلێ خوە دە بنگەهێ گەلەك دەرمانێن کو ئیرۆ نووژداریا نووژەن ب کار تینە ل سەر نەباتانە. دەڤەرێن کوردنشین ژ ئالیێ نەباتان ڤە پر دەولەمەندن. نووژدارێن گەلێ ب سایا ڤێ دەولەمەدنیێ د سازکرنا دەرمانان دە ب ئاستەنگی و زەهمەتیان رووبروو نەمانە. دەما کوو ئەم ل دیرۆکا خەباتێن ترکی، ئەرەبی و فارسی دنێرن. ئەم دبینن کو جارنان قەسیەدەیەکە تەنێ ژ ب سەرێ خوە بوویە مژارا لێگەین و لێکۆلینان، بوویە مژارا تەزێن ئاکادەمیك، ژ هەر ئاوایی ڤە هاتنە داهووراندن کو ژ خوە دڤێ وسا بە ژی. مە ژی ل*

---

١. یەکێك لە نووسەران و توێژەرانی ناسراوی باکووری کوردستانە کە چەندین کتێبی کوردی چاپ کردووە. پێشتر سەرۆکی زانکۆی ماردین بووە و بەشی کوردی ئەو زانکۆیە بەڕێزیان کردوویانەتەوە. ئێستا نوێنەری پارلەمانە لەسەر پارتی سەلاحەدین دەمیرتاش.

*تبا مەلایێ ئەرواسی ب ڤی چاڤی نەری و مە دیت کو هێژایە خەباتەکە داهوورینی ل سەر بێ کرن و رایا گشتییا نووژداریێ وێ ناس بکە. مە ئەڤ پرتووکا هێژا هەم ب کوردی هەم ب ترکی د بن دەسپێکەك، چار بەش و پێڤەکەك دە نرخاند و داهووراند. مە د دەستپێکێ دە گوندێ ئەرواسێ، مەلایێ ئەرواسی و پرتووکا وی ناساندن. بەشا یەکەمین ژ بۆ داهوورینا پرتووکە، بەشا دوویەمین ژ بۆ ناڤێ نەخوەشیێن تێ دە، بەشا سێیەمین ژ بۆ ناڤێ دەرمانێن تێ دە، بەشا چارەمین ژی ژ بۆ تۆمارکرنا وێ ب لاتینی هاتیە جوداکرن. ئەڤ پۆلاندن ود قسمێ خەباتێیێ ترکی دە ژی خوە نیشان ددە. د بەشا چارەمینا ترکی دە مە جە دایە وەرگەرا پرتووکێ. د پێڤەکێ دە دەستنڤیسا پرتووکێ هاتیە تۆمارکرن. پرۆفیسۆر دکتۆر قەدری یڵدرم، ئادار ٢٠١٣"*

**بابەتی** دەستنووسەکەی مەلای ئەرواسی وەك دکتۆر قەدری لە لاپەڕە ١٥ تا ٢٠ بەشی کوردی کتێبەکەی دەڵێت، ئەمەیە:

*د پرتووکێ دە بەهسا نەخوەشی، دەرمان، نیشانێن نەخوەشیان، ئالیێن دەرمانێن نەرێی، پارێز، شیرۆڤەیا هن ناڤان، مژارێن بایتاریێ، مژارێن جنسی تێ کرن. د پرتووکێ دە ل سەر نەخوەشیا با، بایێ چەرخان، بایێ سۆر، باوەسیر، بەلخەم، برین، برینا خوین تێ، برینا گۆشترزی، بەرنەگرتنا داران، بێهنا دەڤی ژی تێ سەکناندن و رێبازا وانا باشبوونێ تێ ڤەگۆتن. د پرتووکێ دە ناڤ رێبازا باشبکرنا ڤان نەخوەشیان ژی دەرباس دبە: برینێن هوندرین، کەوا برینان، برینا خەنجەرێ، برینێن تیر و تفەنگان، بیرۆڤ، چاڤێش، چاڤێ شکەستی، چاڤی وەرمی و ب خوین، ئێشا پشتێ، ئێشا دانان، ئێشا سنگ، گەرمیا بەدەنێ، گەزکرنا دووپشکێ، گەزتنا ماری، قۆلنج، قەوراندنا هەیوانێن گەزتنێ، گرێ و ریشێن سەر هەستیان، نەخوەشیا کوو چاڤ گۆشت و خوین دگرە، گوهێش، گوهێ گران،* هەملا ژنێ، هەرارەت، ئیلانجوخ، ناڤچوون (ئیشال)، ناڤچوون و زکێش، ژەهر، ژەهرخوارن، کورم، کورمێ زك، کەتنا دەنگ، مار بکەڤە زك، میزنەهاتن، موویێن چاڤان، درێژکرنا موویان، ماد و بز، نەخوەشیا خەوێ، نەزلە، هاتنا ئاڤێ ژ چاڤان، چاڤتاریبوون، رۆناهیا چاڤان، رەڤاندنا مووریان. د پرتووکێ دە ب دەهان نەخوەشیێن دنێن جور بە جور هەنە و مەلایێ ئەرواسی ریا باشبوونا ڤان نەخوەشیان و دەرمانێن کو دڤێ ژ بۆ ڤان نەخوەشیان بێن چێکرن نیشان ددە. د پرتووکێ دە کیتەکیت بەهسا هن گیا و نەباتێن کو دەرمانن و دڤێ ناڤا هەڤ دە بێن کوتاندن ژی دکە. ئەرواسی تەنێ نەخوەشیان تەشهیس ناکە، هەر وها کیژان گیا و نەبات ژ کیژان نەخوەشیێ رە باشە و دڤێ چقاس بێن کوتاندن، چقاس بێن ڤەخوارن ئان ژی چقاس بێن تەڤل هەڤکرن، یەك ب یەك ڤەدبێژە.

**ژیان و مردنی شێخ موحەمەد ئەرواسی**

وەك دەزانـین یەکەم کەس کە نـاوی ئەو پیـاوە و کتێـبە پزیشـکیەکەی لە سـەرچاوە و کتێبەکاندا نووسیوە، ساڵی ١٨٩٢ یۆسف ضیاء الدین پاشا بووە. زانیـاریەکی تەواو سـەبارەت بەو زانا کوردە لەبەردەستدا نییە. جەلادەت بەدرخـان لە وتـارەکەی هـاواردا وەك خـۆی لە لاپەڕە ٨١٧ نووسیوە: *"هەتا نهـۆ مە بەهسـا وان جـامێران کـر کـۆ ب نەزمـێ نڤیسـاندن و خودیێ دیوانێنە. ژ ڤان پێ ڤە چەند مرۆڤێن دن هەنە کۆ ب شهیرێ مێژووینە بوونە لێ د وارێن دن دە ب کوردمانجی نڤیساندنە. ئەمێ نهۆ ڤالا وان بکن. کوردیزان ئەلەکساندر ژابـا[1] ژێ د کتێبا خوە دە ڤـالا وان دکە و وەلـێ دخـویە کـۆ ئەڤ تشـت ژابـا ... ئەوی مەلایـێ کوردمانج ب دەڤکی گوتنە و ژابا ئەو ب فرەنسزی نڤیساندنە".*

لە وتارەکەی هاوار باس و ناوی شاعێرەکانی بەپێـی مێـژووی ژیـان و مردنیـان بە ڕیـز هێنـاوە: *عەلـی هەریـری [١٤٢٥ــ١٤٩٠]، مەلایـێ جزیـری [١٥٧٠ــ١٦٤٠]، فەقـێ تەیـران [١٥٩٠ـ١٦٦٠]، مەلایـێ بـاتە [١٦٨٩ــ١٧٥٥]، ئەحـمەدێ خـانی [١٦٥١ــ١٧٠٧]، سـیاهپووش [سەدەی ١٨ زایینی]، مەولانا خالید [١٧٧٧ـ١٨٢٦]، مەلا یەحیا مزووری [١٧٧٢ـ١٨٣٨]، مەلا خەلیلێ سێرتی [١٨٣٥ـ؟]، نـالی [١٧٩٥ــ١٨٥٥]، شـێخ رەزا [١٨٣١ـ١٩١٠]، حـاجی قـادرێ کۆیی [١٨١٦ـ١٨٩٧] و شێخ نـوورەدین بریفکـی [١٧٩٨ــ١٨٥٢].* دواتـر ئامـاژە بەوە دەکـات کەسانێکی دیکە هەیە کە سەرچاوەکانی پێشوو باس لەوە دەکەن ئەوانیش خـاوەنی کتێـب و نووسین بوون و جەلادەت بەدرخان خۆیشی دەڵێت خۆیشـم بیستوومە کە ئەوانە کتێبـی پزیشکی و شەرعیان نووسیوە، بەڵام کتێبەکەیان تا ئێستە بەرچاو نەکەوتـووە. وەکـوو: *مەلا عەلی تەرەماخی [١٥٩١ـ١٦٥٣[2]]، مەلا یۆنس ئەرقەتینی [؟ـ١٧٨٥]، مەلا موحەمەد ئەرواسـی و دەستنووسێکی حەسابی زانایەکی نەناسراو.*

*ژابا دبێژە کۆ کوردمانجان هەتا [ساڵی] ١٠٠٠ هجرەیێ ئیلمان دین و شـەریئەتێ ب زمـانێ ئەرەبی دخوەندن. پشـتـی ١٠٠٠ مەلایەك ب نـاڤێ ئەلـی ژ گونـدە تەرەمـاخێ[3] ژ قەزا مکسـێ[1]*

---

١. ئەلکساندر ژابا باڵوێزی رووس بووە لە ئەرزەڕۆم. ساڵی ١٨٥٨ لەگەڵ مەلا مەحموود ئەفەندی بایزیدی کتێبێك لەسەر فەرهەنگ و نەریتی کوردان دەنووسێت. ئەم کتێبە ساڵی ١٣٦٩ هەتاوی بە ناوی (آداب و رسوم کردان) وەرگێڕدراوەتەوە سەر فارسی و چاپ کراوە.

٢. موحەمەد شێخۆ، ٢٠١٥، هەروەها مەلا عەلی تەرەماخی، سەرفا کورمانجی، وەشانخانەیا چاندا کوردی، سوید/ ستۆکهۆلم، ١٩٩٧

٣. ناوی تورکی و ئیداری گوندی ترەماخ یا تارماخ، دەبێتە: *Yaylakonak*

*رابوویە و ژ بەر خوەندنێ چوو هەتا بەغدایێ. ئەلی د مەدرەسێن بەخدا، مووسل، بادینان و سۆران د خوەند و د ناڤ ئالمێن هەیاما خوە دە بوو بوو زاناکی سەردەستە. ئەڤی ئەلیێ تەرماخی پشتی کۆ ڤەگەریا وەلاتێ خوە رابوو د گوندێ خوە د مەدرەسەیەك ئاڤا کر و ب زمانێ کوردمانجی کتێبەك تەسرفێ ژ چێکر و دەرسا فەقەهێن خوە ب کوردمانجی گۆت. هێدی هێدی ئەو کتێب ل کوردستانێ بەلاڤ بوو. مەلا ئوونیسێ [= یۆنس] ئەرقەتینی: ژێ رە مەلایێ هەلقەتینی ژ دبێژن. خویا یە کۆ ئەرقەتینێن هەلقەتین گوندێ وی یە. ڤی مەلایێ دایە پەی ئەلی تەرەماخی و کتێبێن تەسریف، زرووف و تەرکیبێ ب زمانێ کوردمانجی نڤیساندنە. من نە ئەسەرێن ئەلی نە ژ یێن ئوونس دیتنە ژ لەورە من نکار بوو ئەز هن تشتان ژ وان بەلاڤ بکم".*[٢]

بەپێی زانیاریەکانی سەرەوە کوردەکان تا ساڵەکانی ١٠٠٠ کۆچی [سەدەی ١٦ ز.] دەرسی حوجرەیان بە عەرەبی خوێندووە و نووسیوە. پاش ئەوەی کە مەلا عەلی تەرەماخی ئیجازەنامەی مەلایەتی وەردەگرێ و دەگەڕێتەوە بۆ گوندی تەرەماخ لە ناوچەی مکس، نەریتی مامۆستاکانی پێشووی دەشکێنێت و خوێندن و نووسینی کوردی لە حوجرە دەست پێ ئەکات و کتێبی تصریف بە کرمانجی دەنووسێت و هێدی هێدی ئەو کتێبە بە کوردستاندا بڵاو دەبێتەوە. مەلا عەلی یەکەم کەس بووە ڕێزمانی کوردی نووسیوە. دواتر مەلا یۆنس ئەرقەتینی دێت و کاریگەری لەو ڕێبازە وەردەگرێت و لەسەر ئەو نەریتە مامۆستایی دەکات و کتێبی کوردی دەنووسێت. وەك سەرچاوەکان ئاماژەی پێ دەکەن مەلا یۆنس خەڵکی گوندی ئەرقەتینی (هەلقەتین/ هەڵکاتین) ناوچەی خیزان لە پارێزگای بتلیس بووە.[٣] ئەگەر سەیری نەخشەی باکووری کوردستان بکەین شارۆچکە و ناوچەی مکس (مەکس/ موسکی/ موسك) هاوسنوورە لەهەڵ شارۆچکەی خیزان. عارف و شاعێری

---

١. ناوی تورکی و ئیداری ناوچە و شارۆچکەی مکس، دەبێتە: *Bahçesaray*

٢. لە لاپەڕە ٣٦٧ کتێبی الهدیه الحمیدیه هاتووە: (*و مما يناسب معرفتنا لمن اراد الاطلاع على لغت الاكراد ما للخواص و الاجله من التصانيف و المنشات بلغتهم و قد يوجد اليوم والشكر لله منها ما هى منثوره كشرح العزى لملا حسين الشيڤكى و كتاب الظروف فى النحو لملا يونس الارقطينى و معرب عوامل الجرجانى لملا يونس المذكور و هذه الكتب الثلثه هى الان متداوله بين طلبه الكراد تقرا بالدرس و تحفظ عن ظهر القلب...*)

٣. عەلائەدین سەجادی، لاپەڕە ٥٨٤ [وەگیراو لە: کتێبی دەستنووسە کوردیەکان، دکتۆر کەمال فوئاد، ١٩٧٠، ئاڵمانیا.] لە پێڕستی ناوی گوندەکانی هەر دوو ناوچەی خیزان و مکس کە لە ئینتەرنێتدا هەیە ناوی ئەرقەتین، هەلقەتین و هەلکاتینی تێدا نییە. جا لەوانەیە گوندێکی چۆڵکراو بێ.

پـایەبەرز فەقــێ تەیـران ئەویــش ســاڵی ١٥٩٠ لە جـۆلەمێرگ لەدایـك بـووە و ١٦٦٠ لە شارۆچکەی مکس کۆچی دوایی کردووە. فەقێ تەیران لە گەنجیدا نزیکـایەتی بـووە لەگەڵ مەلای جزیری. لە هۆنراوەکانیدا نازناوی بە فەقێی گەروك، مەکسی، میرمحێ، مـیم و حـێ هاتووە. کەواتە هەمـوو ئەمـانە بەسـتێنێکی فـراوان و ئامـادە بـووە کەسـێك بە نـاوی مەلا موحەممەد ئەرواسی قەڵەم هەڵبگرێت و کتێبێکی پزیشکی کۆن بکـاتە کـوردی کرمـانجی و بیکاتە یەکەم سەرچاوەی کوردیی پزشکی.

بەداخەوە جگە لەو ئاماژە سەرپێییانەی سەرچاوەکان زانیاریەکی دیکە سەبارەت بە شێخ مـوحەممەد ئەرواســی لە بەردەســتماندا نیـیە. جەلادەت بەدرخـان لیسـت و باسـی زانـا و شاعێرەکانی ناو وتارەکەی بەپێی ساڵی ژیان و مەرگیـان هێنـاوە. مەلا مـوحەممەد ئەرواسـی پاش مەلا عەلی تەرەمـاخی و مەلا یـۆنس ئەرقەتینـی هـاتووە. هەروەهـا بەدرخـان بەپێـی نووسینەکەی کە دەڵێت: "*راوییان گۆتە من کۆ مەلایێ ئەرواسـێ د وەختـێ ئەڤـدال خـانێ باقێ بەدرخان دە رابوویە*" بەراوردی کردووە کە تا سـاڵی ١٩٤١ شـێخ مـوحەممەد ئەرواسـی زیاتر لە ١٥٠ ساڵە مردووە. کەواتە تا وەکوو ٢٠١٨ لەو ساڵەوە بە سەرخستنی ٧٧ ساڵ زیاتر لە ٢٣٠ ساڵە شێخ موحەممەد کۆچی دوایی کردووە. واتا ساڵی ١٧٨٨ مردووە. بەگشتی ژیانی دەکەوێتە ناو سـەدەی ١٧ زایینـی. مامۆسـتا تەحسـین دۆسـکیش بـۆ سـاڵی ژیـانی شـێخ موحەممەد ئەرواسی هەمـان بۆچـوونی جەلادەت بەدرخـانی هێنـاوە،[1] بەڵام دکتـۆر یەڵـدرم مەودای ژیانی سەدەی ١٨ و ١٩ داناوە، کە ئەمە خۆی لە خۆیدا هەڵەیە. چونکە یەکەم جـار ١٨٩١ ناوی ئەو کەسایەتیە هاتووە و بێ بەڵگە ئەم ڕێکەوتەی داناوە.[2]

بەپێی یاداشتی کۆتـایی دەستنووسـی (A) لاپەڕە ١٨ کـە کاتـب نووسـیویەتی: "*کتـاب الطب باللسان الکردی لجالینوس الحکیم. المترجم: الشـیخ محمـد قطـب جـد الارقاسـیین قدس الله اسرارهم*"، شـێخ مـوحەممەد ئەرواسـی دەبێـتە بـاپیرە گەورەی شـێخانی گونـدی ئەرواس. هەروەهـا لاپەڕە ٩٢ کتێبـی (المنتخبـات مـن رسـائل عبـدالحکیم الارواسـی: ١٨٦٥ـ١٩٤٣)[3] یەکەم کەس لە شەجەرەی بنەماڵەی شێخانی ئەرواسی ناوی مەلا مـوحەممەد

١. دۆسکی، لاپەڕە ٢١

٢. سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە ٩

٣. ئەم کتێبە ساڵی ١٩٩٢ یەکەم جار لە ئەستانبۆڵ چاپ بووە. "سید عبدالحکیم ارواسی" شاگردی سەید ئەحمەد ئەرواسی بووە و ساڵی ١٨٦٥ لە ئەرواس لەدایك بووە و ١٩٤٣ لە ئانکارا کۆچی دوایی کردووە.

نووسراوە. دۆسکی ئەم مەلا موحەمەدە بە هەمان شێخ موحەمەد ئەرواسی داناوە.[١] ئەم شێخ عەبدولکەریم ئەرواسیە کوڕی شێخ تەهای ئەرواسییە کە پێش شەڕی یەکەم جیهانی خاوەنی خانەقایەکی گەورەی قادریەکان بووە لە باکووری کوردستان.[٢]

تا وەکوو ئێستا دوو دەستنووس لە (طب جالینوس) مەلا موحەمەد ئەرواس بەردەست کەوتووە:

**دەستنووسی** (A)

**نووسەر:** جالینووسی حەکیم (مردن: ٢٠٠ زایینی)

**وەرگێڕ:** شێخ / مەلا موحەمەد ئەرواسی

**کاتب:** مەلا زەینەلعابدین کوڕی مەلا ڕەمەزان ئامەدی[٣]

**شوێنی نووسینەوە:** شاری ئامەد

**ڕێکەوتی نووسینەوە:** ٢١ صفر ١٤٢١ (٢٥/مەی/٢٠٠٠)

**ژمارەی لاپەڕە:** ١٨ لاپەڕە (٩ پەڕە)

**ژمارەی هێڵ لە یەک لاپەڕە:** ١٨

**ژمارەی مامناوەندی وشە لە یەک هێڵ:** ١٣

**هەڵگری ئەسڵی دەستنووسەکە:** مەلا زەینەلعابدین ئامەدی

**تێبینی زیادە:** ئەم دەستنووسە هەموو نیشانەکانی سەرە، ژێرە و بۆرەی هەموو پیتەکانی بۆ دانراوە. هەر بۆیە بەئاسانی دەخوێنرێتەوە. خەتی نووسینەکەی جوانی ئاسایە. دەقی نووسینەکە خراوەتە ناو لاکێشەیەکی دوو خەتی.

---

کەسایەتیەکی ناسراو و پیرێکی مۆرشێد بووە لەسەر ڕێبازی نەقشبەندی. [سەرچاوە: ویکیپیدیای کوردی، بابەتی: *Evdilhekîmê Arwasî*، ١٣٩٧/٠٤/١٢]

١. دۆسکی، لاپەڕە ١٦

٢. تەوەکولی، لاپەڕە ٨١

٣. لە پێوەندیەکی ١٣٩٧/٠٥/١٣ لەگەڵ دکتۆر قەدری یلدرم سەبارەت بە دەستنووسەکەی مەلا زەینەلعابدین و چاپی کتێبەکەی مەلا ئەرواسی قسەمان کرد. مەلا زەینەلعابدین ٤٠ ساڵ زیاترە مەلای مزگەوتی ناڤەندی شاری دیاربەکر بووە و وانەی بە فەقێیان گوتووە و چەند ساڵێکە خانەنشین کراوە. ئەم پیاوە بەشێك لە ڕەوتی ژیانی ئەوە بووە کە دەستنووسە ئایینی و کوردیەکانی مامۆستایانی کۆنی باکووری کوردستانی بە ئەلفوبێی عەرەبی ڕوونووسی کردووەتەوە. ئەو دەستنووسە پزیشکیە کە مەلا زەینەلعابدین لە ڕووی نووسیوەتەوە. بەداخەوە مامۆستایەك بەئەمانەت بردوویە و لێی ون بووە. یەکێك لە خوێندکارانی بەشی کوردی زانکۆی ماردین تێزی ماستەریەکەی لەسەر مەلا زەینەلعابدین بووە.

**سەرەتای دەستنووسەکە دەست پێ کراوە بە:** *"کتاب الطب باللسان الکردی لجالینوس الحکیم المترجم: الشیخ محمد القطب جد الارڤاسیین قدس الله اسرارهم آمین"*

**لاپەڕەی یەکەمی دەقەکە دەست پێ کراوە بە:** *"جالینوس حکیم گوتیە هر چە نخوش طاما دڤ وی شور بت ژ علتا سودائیە. هر چە شیرین بت خونە. طرش بت بلغمە. طحل بت صفرایە. علتا خون بت علامت وی گرمایا بدنیە. و گران بونا بدنیە. و زحف رازانە و شیرینیا دڤە و ایشا سرە و ایشا پشتیە و باوسیرە و گرمیا دلە و ایشا گوهە و ایشا چاڤانە. انواع علتان: علامت علت صفرا اڤن ایشا سرە و زو سپی بونا مویانە و سست بونا دست و پیانە و هشکا هیادڤە و زراهیا رویانە و طاری بونا چاڤانە و سستیا بدنیە، و کلینا معدیە و دژوایا بولیە و نقصانیا اشتهایا خوارنیە و ایشا پارسویانە..."* [بەشی سەرەتای لاپەڕە ٢]

**لاپەڕەی پێش ئەنجامە کۆتایی هاتووە بە:** *"..اما روژ جمعە پادشاە وی روژی زهرەیە تدبیر روژە دوی روژیدە لائقە چونا حمامان و ورگرتنا جل تازە و سر تراش کرن و بهن کرنا اشیان و بهن خوش عالم د روژا اینی و شڤا ویدا کیف خوش دبن اگر ولد دوی روژیدا تولد بکن و یان د شڤا ویدا انشاالله صالح دبن دوی روژیدا سفرا لتک احبابان گلک لائقە. والله اعلم، و هو المدبر و الحکیم و الشافی."* [بەشی کۆتایی لاپەڕە ١٧]

**ئەنجامە:** *"تمت الکتاب بعون الله الملك الوهاب علی ید زین‌العابدین الآمدی یوم الخمیس ٢١ صفر ١٤٢١ هجری، ٢٥ مایو ٢٠٠٠ م. صلی الله علی سیدنا محمد و علی آله محمد"*

**دەستنووسی (B)**

**نووسەر:** جالینووسی حەکیم (مردن: ٢٠٠ زایینی)

**وەرگێڕ:** شێخ / مەلا موحەمەد ئەرواسی

**کاتب:** باپیری مەحفووز کوڕی ؟

**شوێنی نووسینەوە:** شاری وان

**ڕێکەوتی نووسینەوە:** زیاتر لە سەد ساڵ پێش ئێستا

**ژمارەی لاپەڕە:** ٦٦ لاپەڕە (٣٣ پەڕە)

**ژمارەی هێڵ لە یەک لاپەڕە:** ٨

**ژمارەی مامناوەندی وشە لە یەک هێڵ:** ٦

**هەڵگری ئەسڵی دەستنووسەکە:** مەلا مەحفووز وانی

**هەڵگری کۆپی دەستنووسەکە:** دکتۆر ئەرگین ئۆپێنگین مامۆستای بەشی کوردی زانکۆی ئۆپسالا

**تێبینی زیادە:** ئەم دەستنووسە هەموو نیشانەکانی سەرە، ژێرە و بۆرەی هەموو پیتەکانی بۆ دانراوە. خەتی نووسینەکەی جوان نییە و لە ئاسایی خوارترە. دەقی نووسینەکە تەواو ڕووپەڕەکەی گرتووە و ڕێگە بۆ پەراوێز نەماوەتەوە.

**سەرەتای دەستنووسەکە دەست پێ کراوە بە:** پێش دەقی سەرەکی تەنیا نووسراوە: *بسم الله الرحمن الرحیم*

**لاپەڕەی یەکەمی دەقەکە دەست پێ کراوە بە:** " *جالینوس حکیم گوتیە هر چە نخوش طاما دڤ وی شور بت ژ علتا سودائیە. هر چە شیرین بت خونە. طرش بت بلغمە. طحل بت صفرایە. علتا خون بت علامت وی گرمایا بدن یە. و گران بونا بدن یە. و زحف رازانە و شیرینیا دڤە و ایشا سرە و ایشا پشتیە و باوسیرە و گرمیا دلە و ایشا گوهە*" [تەواوی لاپەڕە ١]

**لاپەڕەی پێش ئەنجامە کۆتایی هاتووە بە:** "*تن و بهن کرنا اشیان و بهن خوش عالم د روژا اینی و یان د شڤا ویدا کیف خوش دبن اگر ولد دوی روژی دا بین و یان د شڤا وبید انشاالله صالح دبن دوی روژیدا سفرا لنک احبابان کلك لائقە والله اعلم، بالمدبر و کل شیء عندە بمقدار تمت علی کاتبە رحمت و علی شیطانی لعنت و قد تمیت*." [تەواوی لاپەڕە ٦٤]

**ئەنجامە:** '*فی شهر رمضان فی مابین ظهر و العصر فی باغچە محمد انیشتەی [= زاڤا] سلیمان افندی ترکی الحنفی*" الخط ببقی زمانا بعد کاتبە و کاتب الخط تحت الارض مدفون.

سەرەوەی لاپەڕەی ٦٦ نووسراوە: بە لدفع لبلاء: "فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمُ الطُّوفَانَ وَالْجَرَادَ وَالْقُمَّلَ وَالضَّفَادِعَ وَالدَّمَ آيَاتٍ مُفَصَّلَاتٍ فَاسْتَكْبَرُوا وَكَانُوا قَوْمًا مُجْرِمِينَ" [آیە ١٣٣ سوورەی اعراف]

**تێبینی کۆتایی هەر دوو دەستنووسەکە:** دیارە کە دەستنووسی (A) تازەتر نووسراوە و دەستنووسێکی کۆنتر لەبەردەستدا بووە بۆ نووسینەوەی. وەك پارێزەری دەستنووسی (B) گوتوویەتی زیاتر لە سەد ساڵ پێش ئێستا ئەم دەستنووسە باب یا باپیری نووسیویەتیەوە. کەواتە دەستنووسی (B) تا وەکوو ئێستا کۆنترین دەستنووسی کتێبی پزیشکی شێخ موحەممەد ئەرواسی وانییە کە ئەوە یەکەم جارە بەشێوەی فەرمی باسی دەکرێت.

**سەرچاوە:**


١) تەحسین ئیبراهیم دۆسکی، کتێبی: ل دۆر ئەدەبێ کرمانجی ل سەد ساڵا نۆزدێ و بیستێ زایینیدا، چاپی یەکەم، لە بڵاوکراوەکانی کۆڕی زانیاری کوردستان، هەولێر، ٢٠٠٥

٢) جەلادەت عالی بەدرخان، گۆڤاری هاوار، ژمارە ٣٣، دەمشق، ١٩٤٢ [سەرجەم ژمارەکانی هاوار لە یەك کتێب بنکەی ژین چاپی کردووە.]

٣) عەلائەدینی سەجادی، مێژووی ئەدەبی کوردی، پێداچوونەوە: سەعید کەرەمی، پەخشانگای کوردستان، سنە، ١٣٨٩

٤) قەدری یڵدرم، تبا مەلایێ ئەرواسی، چاپی یەکەم، زانکۆی ماردین، ٢٠١٣

٥) موحەمەد شێخۆ، وتاری: *Eliyê Teremaxî... rûpelek Ronîdayî ji dîroka toreya kurdî*، ماڵپەڕی *www.buyerpress.com*، ژمارە ٢٩ تایبەت، ٢٠١٥/١٠/١٥

٦) موحەمەد ڕەئووف تەوەکوللی، تاریخ تصوف در کردستان و جغرافیا و تاریخ بانە، چاپی یەکەم، پەخشانگای فاروس، تاران، ١٣٥٤

٧) مەلا عەلی تەرەماخی، سەرفا کورمانجی، وەشانخانەیا چاندا کوردی، سوید/ ستۆکهۆلم، ١٩٩٧: ١٤٠ لاپەڕەیە

٨) یۆسف ضیاء الدین پاشا خالدی، الهدیة الحمیدیة فی اللغة الکردیة، چاپی یەکەم، ئەستانبۆڵ، ١٣١٠ کۆچی (١٨٩٢)


-١٧-

ودی مریضه و تدبیر نظریه پاکه ژ نوم صبدی و کلوقی و شامیان وشر
بت قمار ژنان و جمام کرنان و نکاح کرنان اگر دوی روژی جماع بکت
ولد چیبن اهل فساد و خون دبن. اما روژا چهارشنبی پادشاه
وی عطارده ژ بو نقیسینا [illegible] و نقیسینا فنج بون پاکه ژ دانه
[illegible] نانه ژ ضربه کو صفرا و سودا دوی روژیدا متمایلن ژ بلغم
تعان انسان پیدکفت اگر دوی روژیدا ظلاند نوند ببن معلول
دبن ابلیس لعین د روژا چارشنبیدا خلق بوبه و قبیلت د صفت
شیرلدا بوبه موی دی صردکی ماهری دریژ بوبه و پیی دی صردکی دوقه
[illegible] بوبه چینا کوا دوی روژیدا بوبه جماع کرن شیطان ژی
پیدا دبن. اما روژا پنجشنبه پادشاه وی مشتریه تدبیر صیفه [illegible]
[illegible] دبینا ریت ن دست پیرنا عیشان سفر کرن حاجت خوس[illegible]
جماع کرن ژ تماما نه لاینه اگر ولد دوی روژی ببن د گهنه درجه ک
بلند دا و باب دوان ژ وان راضی دبت. اما روژا جمعه پادشاه وی
روژی زهره یه تدبیر روژه دوی روژیدا لاینه چونا حمامان [illegible]
کرنا جل تازه و سرتراش کرن و بهن کرنا اشیاد بهن خوش عالم
د روژا اینی و شفا وبدا کینخوش دبن اگر ولد دوی روژیدا تولد
ببن وبان د شفا وبدا انشاء الله صالح دبن دوی روژیدا سفر [illegible]
احبابان [illegible] لاینه. والله اعلم. تم [illegible] والحکم والشافی.

وێنەی ژمارە ٣: لاپەڕەی کۆتایی دەقی دەستنووسی (A)

تم الكتاب. بعون الله الملك الوهاب. على يد زين العابدين الأمدي
يوم الخميس. ٢١-صفر- ١٤٢١هـ. ٢٥-مايو-٢٠٠٠ م وصلى الله على
سيدنا محمد وعلى آله وصحبه
وأتباعه اجمعين
أمين
م م م

وێنەی ژمارە ٤: لاپەڕەی ئەنجامەی دەستنووسی (A)



وێنە ژمارە ٥: لاپەڕەی سەرەتای دەقی دەستنووسی (B)



وێنە ژمارە ٦: لاپەڕەی کۆتایی دەقی دەستنووسی (B)



وێنە ژمارە ٧: لاپەڕەی ئەنجامە دەستنووسی (B)

# دەستنقیسی پزیشکی (کفایە الطب) لە کتێبخانەی سمایل حەکیمی سلێڤانی

## پوختەی وتار

ئێسماعیل کوڕی مەحموود کوڕی عبدالکریم کوڕی موحەمەد حەکیم سەر بە هۆزی سلێڤانی دهۆکە. ساڵی ١٨١٠ زایینی (١٢٢٥ کۆچی) لە گوندی ئەرمشت سەر بە قەزای زاخۆ لەدایك بووە و ١٨٩٨ لە گوندی سمایلاڤا کۆچی دوایی کردووە. باب و باپیرانی سمایل حەکیم نوژداری ناوبانگی دهۆك بوون. ئەم کەڵەپیاوە بە حەکیمباشی، ئێسماعیل ئەفەندی، مەلا ئێسماعیل و سمایل حەکیم ناسراو بووە و هاوکات لەگەڵ مەلایەتی کاری نوژداری و پزشکی کردووە. لە کتێبخانەی چەندین دەستنقیسی کوردی، فارسی و عەرەبی بە جێ ماوە، وەکی: قورئانێکی دەستنقیس، شەریعەت و ئەحکام، مەولوودنامە و مەدحی پێغەمبەر و کفایە الطب. هەرچەند باس لەوە دەکرێت چەندین بەڵگە و دەستنقیسی تریش بووە، بەڵام بەهۆی شەڕ و سووتان و ئاوارەیی گەلێك لە پەرتووکەکان نەماون. سمایل حەکیم ماوەیەك پزیشکی دیواخانی ئێسماعیل پاشا (١٨٣٦ــ١٨٤٢ ز.) والی عوسمانی لە قەڵای ئامێدی بووە. سەردەمێك ناوبانگی ئەم پیاوە تا دەرەوەی سنوورەکانی دەسەڵاتی عوسمانی چووە. بۆ نموونە بۆ چارەسەری کچی یەکێك لە حاکمەکانی قاجاڕ چووەتە دەرباری دەسەڵاتی ئەوکاتەی ئێران و لەم چارەسەریە سەرکەوتووانە گەڕاوەتەوە بۆ بادینان.

بۆ زیاتر ناساندنی سمایل حەکیم، لێکۆڵینەوەم لەسەر دەستنووسی کفایە الطب (نووسەر، ابوالفضل حەبیشی تفلیسی: ٥٢٠ــ٦٠٠ کۆچی) ئەنجام داوە کە لە کتێبخانەی ئەم حەکیمە بە جێ ماوە بۆمان. ئەم دەستنووسە ساڵی ١٢٩٠ کۆچی لە گوندی کێستە لە دەڤەری بەرواری باڵای ئامێدی نووسراوە و لە سەردەمی تەتەر خان بەگ سەرۆکی هۆزی بەرواری دراوە بە ئێسماعیل حەکیم. نموونەی ئەم دەستنووسە لە کتێبخانەکانی ئێران و تورکیە بەرچاو دەکەوێت. ساڵی ٢٠١١ لە تاران یەکەم جار بەیارمەتی چەند دەستنووسی کفایە الطب بە شێوەی سەردەمیانە چاپ کراوە. ئەڵبەت لە پەراوێزی ئەم دەستنووسە هەمبەری کوردی نەخۆشی و ڕوەکەکان هاتووە و بە (بالکردی) ئاماژەی پێ کراوە، هەروەها

لە کۆتاییدا یەك لاپەڕە قاموسی کوردی بە عەرەبی و فارسی هاتووە. خاڵی گرینگ لەم قاموسە هەبوونی پیتی (ڤ)یە کە ئەوکاتە بۆ نووسینی وشەی کوردی بەکار هێنراوە. ئەسڵی ئەم دەستنووسە ئێستە لای دکتۆر سالم حەکیم نەوەی سمایل حەکیمە لە شاری دهۆکە و ٧١٢ لاپەڕەی ماوە.

**پەیڤینکی خۆمانە**

ئاشناییەتی بەندە بە ناوی سمایل حەکیم دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ٢٠١٣ کە ئەوکاتە چەند مانگێك کارمەندی ناوەندی گیادەرمانی شەفا سنە بووم. بەرپرسی ئەم ناوەندە، کاك بورهان حوسەینی لەگەڵ چەند کەس لە هاوڕێیەکانی خەریکی وەرگێڕانی فارسی بە کوردی دەستنووسێك پزیشکی کۆنی فارسی بوون. سێ مانگ هاوشانی ئەو هاوڕێیانە لەو وەرگێڕانە بەشدار بووم. ئەو دەستنووسە ساڵی ٢٠١١ دکتۆر موختار موحەمەدی پێشنیاری دەکات بە وەرگێڕی توانا کاك موحەمەد ژیان ئەمینی. بەڕێزیان بە دەقێکی پسپۆڕی دەزانن و پێشنیاری دەکەن بە گیادەرمانی شەفا. ساڵی ٢٠١٢ کاك بورهان بە سەفەرێك دەڕواتە هەرێمی کوردستان و لەگەڵ پارێزەر و هەڵگری ئەسڵی ئەم دەستنووسە، دکتۆر سالم حەکیم و هەروەها کاك جەماڵ مەولوود لە وەزارەتی تەندروستی هەرێمی کوردستان و کاك بەدران لە پەخشانگای ئاراس گرێبەستی وەرگێڕانی ئەم دەستنووسە واژۆ دەکەن کە بکرێت بە دەقێکی کوردی سۆرانی. لەو ساڵەوە تا ئێستە ئەم وەرگێڕانە درێژەی هەیە و ناوەندی شەفا بەیارمەتی کاك فەخرەدین ئامێدیان[1] کاری وەرگێڕان و پەراوێزنووسی دەکەن. پاییزی ٢٠١٦ سەفەرێك ڕۆیشتین بۆ دهۆك و کاك بورهان پێشنووسی وەرگێڕانەکەی ڕادەستی دکتۆر سالم کرد. ئەڵبەت هەر دوو لا قسەیان لەسەر ئەوە کرد کە پێویستە زیاتر لەسەر ئەم وەرگێڕانە خۆ ماندوو بکرێت تا دەقێکی کوردی پوخت لەم پەرتووکە بکەوێتە بەردەست خوێنەری کورد. لەم سەفەرە سەرۆکی کۆمەڵەی ڕوەکناسانی باشووری کوردستان، کاك ئێسماعیل موشیر عوسمان لە شاری هەولیر دوو بەرنامەی تەلەڤزوێنی ڕێك خست. تێکرا لەگەڵ کاك بورهان و کاك ئێسماعیل لە بەرنامەی خۆراك و تەندروستی کاناڵی لۆکاڵی یەکگرتوو سەبارەت بە ڕێچکەی پزیشکی کوردەواری[2] و حەکیمانی ناوداری ئەم

١. وەرگێڕی کتێبی کیمیای بەختەوەری ئیمام موحەمەدغەزالی لە فارسی بە کوردی

٢. لە ژێر ناوی یەکێك لە لقەکانی پزیشکی نەتەوەیی و کۆنی ئێرانی چەند ساڵێکە ناوەندی گیادەرمانی شەفا و فەرمانگەی میراس فەرهەنگی سنە هەوڵ ئەدەن لقی پزیشکی نەتەوەیی و کۆنی کوردستان ( *Traditional Medicine of Kurdistan: KTM*) تۆمار بکەن. ساڵی ٢٠١٤ بە پێشنیاری کۆمەڵەی گیادەرمانان لە باشووری

ڕێبازە بەتایبەت ئیسماعیل حەکیم چەندین بابەتی گرینـگ و ڕەنگاوڕەنـگ قسـەمان کـرد. ئەڵبەت لە ڕێگای تەلەفۆنیشەوە دکتۆر سالم حەکیم لە دهۆك بەشـداری بەرنـامەکەی کـرد. دیسان کاك بورهـان و کـاك ئیسـماعیل لە کانـاڵی ئاسـمانی سـپێدە بەشـێوازێکی دیـکە و تۆکمەتر باسی پزیشکی کوردەواری و نـوژداریی ئیسـماعیل حەکـیم بەرنامەیـان پێشـکەش کرد.

شایەنی باسە چەند تێبینی و ڕەخنە لەسەر وەرگێـڕان و چـاپی ئەم دەستنووسـە هەیە کە باشتر وایە ماڵباتی حەکیم لە دهۆك ئاوڕی لێ بدەنەوە:

١. پێویستە سـەرەتا دەقە فارسـیەکە چـاپ بکرێـت ئینجـا هەوڵ بـۆ چـاپی وەرگێـڕانە کوردیەکە بدرێت. ئەم دەستنووسە بەرهەمێکی کتێبخـانەی ئیسـماعیل حەکـیمە و گەلێـك پەراوێز و یاداشتی کوردی و فارسی پێوەیە.

٢. ئەم دەستنووسە بۆ ئیسماعیل حەکیم نووسراوە و لە کتێبخانەی ئەو پسپۆڕە و دواتر کوڕ و نەوەکانی هەڵگیراوە و بە کتێبەکەی سمایل حەکـیم ناسراوە. هەرچەند لە ئەنجـامەی دەستنووسەکە و چەند پەراوێزی تر ڕاشـکاوانە ئامـاژە کـراوە ئەمە ڕوونووسـێکە لە کتێبـی (کفایە الطب). کەوابـوو سـمایل حەکـیم سـوودی لەم دەستنووسـە وەرگرتـووە و هەنـدێ پەراوێزی لەسەر نووسیوە.

**کتێبی کفایە الطب**[١]

ابوالفضل حەبیشی تفلیسی لە نێوان ساڵەکانی ٥٢٠ تا ٦٠٠ کۆچیدا ژیـاوە و جیـا لە کتێبـی کفایە الطب چەندین بەرهەمی دیکە وەکوو بیان الطب، تقـویم الادویە، قـانون الادب، بیـان النجوم، بیان التصریف، کامل التغیر، ترجمان القـوافی و هتـد، نووسـیوە. ئەم پیـاوە سـاڵی ٥٨٨ کۆچی (ترجمان القوافی) دیاری دەکات بە قطب الـدین مەلەکشـا حـاکمی سـیواس[٢].

کوردستان بەرنامەی سەرەکی و پێڕەونامەی پزیشکی نەتەوەیی ئێران (اساسنامه طب سنتی ایران) وەرمگێرایەوە سەر کوردی و لەگەڵ هەندێ پەراوێزی گیاناسی و بابەتەکانی گیادەرمانی و شێوازەکانی چارەسەری لە کوردستان وەك پرۆژەیاسایەك ئامادە کرا کە پێشکەشی پارلەمانی کوردستان بکرێت تا لانیکەم بەفەرمی لە باشووری کوردستان KTM تۆمار بکرێت. هەرچەند تا وەکوو ئێستە ئەم پرۆژەیە نەکەوتووەتە بەرباس لە لیژنە و کۆبوونەوەکانی پارلەمان، بەڵام ئەم پرۆژەیە بە شێوەی کتێب چاپ کراوە. (پێشەکیەك لەسەر ڕووەکناسی، گیادەرمانی و پزیشکی خۆماڵی کوردەواری، سلێمانی، ٢٠١٤)

١. زانیاریەکانی ئەم بەشە وەرگیراوە لە کتێبی کفایە الطب، ئامادەکردن: دکتۆر زەهرا پارساپوور، تاران، ٢٠١١.

٢. یەکێك لە پارێزگاکانی باکووری کوردستان

ئەم پیاوە زۆربەی ژیانی لە وڵاتی ئێستەی تورکیەدا بووە، بەڵام هەموو بەرهەمەکانی بە فارسی و عەرەبی نووسیوە. کتێبی کفایە الطب پوختەیەکی ڕێکوپێکە لە سەرجەم کتێب و ڕەچەتەی حەکیمانی یۆنانی و ئیسلامی وەکوو: دیسقوریدۆس، بوقرات، جالینووس، ئەربیاسووس، ڕۆفێس، تیازۆق، دیوجانێس، ئەرجیانووس، ماسەرجوویە، سەرابیۆن، ئێبن ماسوویە، سابت قەرە، مەدائینی، دەمشقی، عەبدووس، شێرکی هێندی، ئێبن سینا، موحەمەد زەکریای ڕازی، حونەین کوڕی ئێسحاق و کەسانی دیکە. تا ١٥٠ ساڵ پێش ئێستا یەکێك لە سەرچاوە گرینگەکانی بواری پزشکی و نوژداری بووە لە وڵاتانی ئیسلامی و تەنانەت ئاسیایی.

ئەم کتێبە لە سێ بەش پێك هاتووە:

* کتێبی یەکەم: سەبارەت بە بابەتەکانی گشتی پزیشکی، جۆرەکانی تریەی دڵ، ناساندنی نەخۆشی و شێوازەکانی دەرمان و چارەسەرکردن

* کتێبی دووهەم: سەبارەت بە جۆرەکانی خۆراك، چێشت و دەرمانە تاکەکان (ادویه المفرده)

* کتێبی سێهەم: سەبارەت بە دەرمانە تێکەڵەکان (ادویه مرکب)

بەگشتی لە زۆربەی نموونە دەستنووسەکانی ئەم کتێبە کە لەبەردەستدایە بۆ هەر نەخۆشیەك لە خشتەیەکی سوور، هۆکار و نیشانە و چارەسەری نەخۆشی جیاجیا هاتووە و هەر نەخۆشی بە دوو بەشی، ساردی و گەرمی جیا کراوەتەوە. ژمارەی ٣٦٦ جۆر نەخۆشی باسی کردووە کە لە تەپڵی سەرەوە تا قامکی پێ دەگرێتەوە.

کفایە الطب ساڵی ٢٠١١، بە هەوڵ و تێکۆشانی زەهرا پارساپوور[١] لە ناوەندی توێژینەوەی (علوم انسانی و مطالعات فرهنگی) تاران لە دوو بەرگ هاوشێوەی جوانکاری و نەخشاندنی دەستنووسە کۆنەکانی چاپ کراوە. گوایە پارساپوور کاتی خۆی بە پێشنیاری ئیرەج ئەفشار[٢] دەستی داوەتە ئامادەکردن و ڕاستکردنەوە و بەراوردکاری دەستنووسەکانی ئەو کتێبە و دەقێکی یەکگرتووی بۆ کفایە الطب کۆ کردووەتەوە.

---

١. دکتۆرای زمان و وێژەی فارسی و بەرپرسی سەرەکی کۆڕبەندنی سەرتاسەری ابوالفضل حەبیشی تفلیسی لە تاران ساڵی ٢٠١٣

٢. لە نێوان ساڵەکانی (١٩٢٥-٢٠١١) ژیاوە و دکتۆرای زمان و وێژەی فارسی و مامۆستا زمانی فارسی و دامەزرێنەری کتێبخانەی زانکۆی تاران بووە و یەکێك لە توێژەرانی سەرەکی بواری کۆکردنەوە و ناساندنی بەڵگە و دەستنووسەکانی ئێران ناسراوە.

ئەو دەستنووسانەی بۆ ئامادەکردن و چاپی ئەو کتێبە بەکار هاتوون:

١. دەستنووسی ژمارە ٢٢٢ لە کتێبخانەی ناوەندی زانکۆی تاران، ساڵی ٧٢٢ کۆچی نووسراوە.

٢. دەستنووسی ژمارە ٦٣٣٢ لە کتێبخانەی پارلەمانی ئێران، سەدەی ١٢ کۆچی نووسراوە.

٣. دەستنووسی ژمارە YY BP A٣٠ لە کتێبخانەی بادلیانی برلین، ساڵی ٩١١ کۆچی نووسراوە.

٤. دەستنووسی ژمارە ٤٧٧٦ کتێبخانەی ئاستانی قودس مەشهەد، سەدەی ١١ کۆچی نووسراوە.

٥. دەستنووسی ژمارە ٨٦١٠ لە کتێبخانەی زانکۆی تاران، سەدەی ١٣ کۆچی نووسراوە.

٦. دەستنووسی ژمارە ٨٦٠٩ لە کتێبخانەی زانکۆی تاران، ساڵی ١٢٧١ کۆچی نووسراوە.

٧. دەستنووسی ژمارە ٥٢١٥ لە کتێبخانەی ئاستانی قودس مەشهەد، ساڵی ١٣١١ کۆچی نووسراوە.

**ناسینی ئیسماعیل حەکیم**[١]

لە چەند ڕێگەوە زانیاریمان سەبارەت بە سمایل حەکیم بە دەست هێناوە: سەرچاوە مێژووییەکانی نووسراوی دەڤەری بادینان، قسە و باسی سەرزاری خەڵکی دهۆك، یادەوەریەکانی دکتۆر سالم کە لە باب و باپیری بیستووە، هەوڵی توێژەران و هەروەها پەراوێزەکانی بەڵگە و دەستنووسەکانی بەجێماو لەو حەکیمە.

ئیسماعیل حەکیم یەکێك لە کەسایەتیە ناسراوەکانی هۆزی سلێڤانییە کە لە پێرستی گەنجینەی زانایانی کۆنی باشووری کوردستان و تەنانەت وڵاتی عێراقدا ئەژمار کراوە. سلێڤانی هۆزێکی ڕەسەنی کوردە کە چەندین سەدەیە لە دەڤەری بادینان و هەکاری نیشتەجێن. ئەم هۆزە لەگەڵ هۆزەکانی سندی و کللی لە ناوچەی شەمزینان و زاخۆدا

١. زۆربەی زانیاریەکانی ئەم بەشە وەرگیراوە لە کتێبی (سماییلی حەکیم، نووسین: موحەمەد ئۆسمانا، پەرتووکخانەی بەدرخانیان، دهۆك، ٢٠١٤)، هەروەها وتوویژەکانی ناوبەناوی بەندە و کاك بورهان حوسەینی لەگەڵ دکتۆر سالم حەکیم (لە نێوان ساڵی ٢٠١١ تا ٢٠١٥)، هەم وەرگرتنی زانیاری لە سەرنووسەری گۆڤاری نیژەن کاك هێرش کەمال ڕێکانی خەڵکی شیلادزێ لە قەزای ئامێدی (زستانی ٢٠١٨) و کاك ئیسماعیل تاها شاهین فەرمانبەری ناوەندی کوردۆلۆژی دهۆك (زستانی ٢٠١٨) و جەلال کەریم ئۆمەر بەرپرسی بەشی ڕاگەیاندنی کۆمەڵەی گیادەرمانانی باشووری کوردستان لە سلێمانی.

دەژین.[1] وەك لە شەجەرەنامەی بنەماڵەی حەکیمدا دیارە موحەمەد حەکیم ناسراو بە محۆ باپیرە گەورەی ئیسماعیل حەکیم یەکەم کەسی بنەماڵەی گەورەی سلیڤانییە. لە پێش سمایل حەکیم و دواتریش پیشەی نۆژداری لەو بنەماڵەیەدا باو بووە. هەر بۆیە ئەو ماڵباتە بە حەکیم ناسراون. ئەورۆکە هۆزی سلیڤانی لە ناوچەکانی بادینان بەتایبەت دهۆك، سێمێل[2] و زاخۆ نیشتەجێن و هۆزێکی دیار و خاوەن ژیار و نۆژدار و خوێندەوارن.

بەپێی ئەو بەڵگە و تاپۆ نووسراوانە لای نەوە و نەوەزادەکانی حەکیم بەردەستی توێژەران کەوتووە، ئێسماعیل حەکیم کوڕی مەحموود کوڕی عبدالکریم کوڕی موحەمەد حەکیم (محۆ) بەرواری ١٨١٠/٠٣/٢٣ (١٦ سەفەری ١٢٢٥) لە ئەرمشت لەدایك بووە و ١٨٩٨/١٢/٢٥ (١١ شەعبانی ١٣١٦) لە سمایلاڤا کۆچی دوایی کردووە. گڵکۆی پیرۆزی لەسەر گردی مەڕوونێیە و خزنێکی بۆ چێ کراوە. محۆ حەکیم کۆتایی سەدەی ١٠ و سەرەتای سەدەی ١١ کۆچی ژیاوە و ڕێچکەی حەکیمی و نۆژداری لەناو هۆزی سلیڤانی و ماڵباتەکەیدا داهێناوە. لەوکاتەوە تا ئێستێ واتا نزیك بە ٤٠٠ ساڵە ئەو بنەماڵەیە کاری نۆژداری و چارەسەری مرۆڤەکانیان کردووە. هەر بۆیە پاش ١١٩ ساڵ پاش مردنی ئێسماعیل حەکیم هێشتا ڕەچەتە و نووسراوەکانی بەها و نرخی بەرزیان هەیە و ڕەچەتەی نووسراو و سەرزارەکی هێشتا وەك یادگاری ماوەتەوە و حەکیمانی ئەورۆ بەکاری دەهێنن.

ئێسماعیل حەکیم هەر بە منداڵی دەستی بە خوێندنی ئایینی کردووە و لە حوجرەکانی ئەرمشت، کێستە[3] و گوند و شارەکانی دیکەی بادینان خوێندووە. گوایە لە هەمان مزگەوتی ئەرمشت ئیجازەی مەلایەتی وەرگرتووە. پاش وەرگرتنی بڕوانامەی مەلایەتی ڕوو لە

---

١. لاپەڕەی ٢٣٦، بەرگی ٤، موسوعە العشائر العراق

٢. وەکوو گوندەکانی کولێبنێ، ئەرمشت، سمایلاڤا و مەڕوونێ

٣. کێستە یەکێك لە گوندە کۆنەکانی ناوچەی بەرواری بالا لە قەزای زاخۆیە کە خوێندنگەیەکی هەرەکۆنی هەیە و بە مزگەوتی کێستەڕەش بەناوبانگە و مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی سوڵتان حسێن وەلی (١٥٣٣-١٥٧٣ ز.) میری بادینان. هەمیشە یەکێك لە شوێنە گرینگەکانی بادینان بووە کە فەقێ و مامۆستای زۆر لەوێ پێ گەیشتوون و خزمەتیان کردووە. ئەو مزگەوتە خاوەنی دەستنووسخانەیەکی گەورە بووە کە تا ئەو دواییانە خەڵك سوودیان لێ وەرگرتووە. بەداخەوە دەستنووسەکانی بڵاو بوونەتەوە و پێویستە هەوڵی کۆکردنەوە و دیجیتاڵیان بۆ بدرێت (بەشێك لە توێژینەوەی کاك هێرش کەماڵ ڕێکانی و لاپەڕەی ١٢٢ کتێبی الاکراد فی بهدینان). بۆ نموونە دوو لەو دەستنووسانە (دەستنڤیسی مەلا حسێن شیفکی و مەلا یەحیا مزووری) لای کاك ئێسماعیل تاها شاهین لە دهۆکە (وتووێژی نووسەر لەگەڵ کاك ئێسماعیل تاها، لە ڕێگەی تەلەفوون، زستانی ١٣٩٧).

ڕۆژهەڵاتی کوردستان و بەتایبەت بازاڕی ورمێ دەکات و لە بەردەست حەکیمان و پزیشکانی ناوداری کورد و ئازەری و ئەرمەنی ئەزموونی زیاتر لەسەر پزشکی کۆ دەکاتەوە. گوایە ماوەی ١٠ ساڵان لە ورمێ ژیانی بەسەر بردووە. ئینجا گەڕاوەتەوە بۆ سلێڤانی و لە گوندی ئەرمشت نیشتەجێ بووە و ڕۆژانە خەڵکی دوور و نزیک سەردانی دەکەن. هەر زوو ناوبانگی تا ناوچەکانی هەکاری، ئامەد، گەوەڕ، بادینان و ورمێ دەڕوات و ڕۆژبەڕۆژ پێگەی کۆمەڵایەتی و کەسایەتی پتەوتر دەبێت.

ئەوکاتەی سمایل حەکیم لە ئەرمشت نەخۆشان چارەسەر دەکات سەردەمی دەسەڵاتداری سمایل پاشا[1] (١٨٣٦ـ١٨٤٢) والی عوسمانی میرنشینی بادینان لە قەڵای ئامێدی بووە. سمایل پاشا تووشی نەخۆشیەکی گران و کوشندە دەبێت. دەنێرن کە سمایل حەکیم سەردانی پاشای نەخۆش بکات و چارەسەری بۆ بدۆزێتەوە. پاشا دەکەوێتە ژێر چاوەدێری ڕاستەوخۆی حەکیم و بەیارمەتی دەرمان و ڕێکارە پزیشکیەکانی چارەسەری دەکات. ئینجا پاشا بەفەرمی نازناوی حەکیمباشی و خەڵاتی تایبەتی میرنشینی پێ ئەبەخشێت. ئێسماعیل پاشا داوا لە حەکیمباشی دەکات لە قەڵاکەی بمێنێتەوە. گوایە سمایل حەکیم پێشنیاری پاشا قەبووڵ دەکات و ماوەیەك دەبێتە پزیشکی میر وماڵباتی پاشا و وەزیرەکان. حەکیمباشی بەرنامەیەکی تەندروستی، پارێز و خواردن دائەڕێژێت بۆ پاشا. بەتایبەت پاشا ئاگادار دەکاتەوە لە فێڵ و تەڵەکەکانی نەیار و دوژمنانی بۆ ژەهراوی کردنی خۆراك و خواردنەوەی.

حەکیمباشی پاش ماوەیەك کەشی میرنشینی بە لایەوە ناخۆش دەبێت و دەگەڕێتەوە بۆ دەشتی سلێڤانی و گوندی سمایلاڤا ئاوەدان دەکاتەوە و لەگەڵ ماڵباتەکەی لەوێ دەمێنێتەوە. هەرچەند ماوەیەك جارێ سەردانی میری ئامێدی دەکات و چاوەدێری تەندروستی دەکات. دەگێڕنەوە جارێك کچی یەکێك لە پاشا یا والیەکانی قاجارِ نەخۆشیەکی کوشندە دەگرێت. لای پزیشکانی ئێرانی چارەسەر نابێت. والی قاجارِ بەفەرمی نامە ئەنێرێت

---

[1] ١. بناغەی میرنشینی ئامێدی دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٢٦٢ زایینی کە شێخ بەهائەدین کوڕی شێخ شەمسەدین لە لە قەڵای ئامێدی دایمەزراندووە و سنووری دەسەڵاتی تا ناوچەکانی زاخۆ، دهۆك، ئاکرێ، گەوەڕ و هەکاری ڕۆیشتووە. پاش شەڕی چاڵدێران، ساڵی ١٥١٤ زایینی بادینان بووە بەشێك لە خاکی عوسمانی و بە فەرمانی سوڵتان سەلیمی یەکەم (١٥١٢-١٥١٢ ز.) خرایە ژێر دەسەڵاتی میرنشینی بادینان. ئەو میرنشینە کوردییە پاش پەیماننامەی ئەرزەڕۆمی دووهەم لە نێوان قاجارِ و عوسمانی لە ساڵی ١٨٤٨، بایەخی کەوت و قەڵا و دیواخانی بادینان پێچرایەوە. سمایل پاشا ١٨٣٦ تا ١٨٤٢ میری قەڵا و میرنشینی ئامێدی بووە.

بۆ ئیسماعیل پاشای ئامێدی کە حەکیمباشیەکەی بنێرێت بۆ ئێران. ئیسماعیل پاشا بانگی ئیسماعیل حەکیم دەکات و ڕایدەسپێرێت کە ئەگەر ڕەچەتە و دەرمانەکانت کاریگەر بوون و کچەکە چاك بووەوە هیچ خەڵات و ڕێزانەیەك لە والی قاجار وەرمەگرە. بۆخۆم زیاتر لە خەڵاتی قاجار پێت ئەبەخشم. ئەو گێرانەوەیە لە کتێبی بیرەوەریەکانی مەلا قاسمی کوچەردا[1] (لاپەڕەی ١٥٤ تا ١٦٠)[2] هاتووە. گوایە کچی والی قاجار چاك دەبێتەوە و سمایل حەکیم سەرکەوتوانە دەگەڕێتەوە بۆ سلێڤانی. مەلا قاسم کوچەر، شاهەنشا یا والی قاجاری بە شای عەجەم ناو بردووە و لە کتێبی بەسەرهاتەکانی (ل: ١٥٨) ئاماژەی بە نموونەی دەستنووسێکی عەرەبی پزیشکی ـ جیا لە دەستنووسەکەی کفایە الطب ـ کردووە کە شای عەجەم خستوویەتیە جانتاکەی سمایل حەکیم.

ئەوەی تا ئێستا تۆمار کراوە و بینراوە، کەسانێك وەکوو کوڕی خۆی (محۆ ئیسماعیل سلێڤانی: ١٨٥٥ـ١٩١٩) و مەلا طیب عبدالعزیز بالقوسی سلێڤانی شاگردی سمایل حەکیم بوون و پاش خۆی ڕێچکەکەیان درێژە پێداوە. دەگێڕنەوە کە حەکیم لە کۆتایی ژیانیدا تووشی نەخۆشیەکی گران بووە و هەموو دەرمانەکانی دەواخانەکەی ڕەچەتە دەکات بۆ جەستەی خۆی، بەڵام کاریگەر نابێت. دواجار بە محۆ دبێژێت کە فلان دەرمان بهێنە و لە ناو ئاو تێکەڵی بکە و داینێ. پاشان بە کوڕەکەی دەڵێت: چی لێ هات؟ محۆ دەڵێت: دەرمانەکە چەشنی ماست مەیوە. حەکیم بە کوڕەکەی دبێژێت: کوڕم مردنی من نزیکە و ئەوە نیشانی ئەدات ئیدی ئەو دەرمانانە کاریگەر نین و کاتی مردنم هاتووە. بەم شێوە بانگ لە کەس و کاری حەکیم دەکەن و هەمی کۆ دەبنەوە و دوادیداریان لەگەڵ نوژداری سلێڤانی دەبێت. ڕۆژی دواتر حەکیم گیان کەنشت دەکات و بەرەو قاپی خواگیان دەگەڕێتەوە.

موحەمەد ئۆسمانا نووسەری کتێبی سمایلێ حەکیم (ل: ٤٥) باس لەوە دەکات کە ساڵی ١٩٨٨ لە حسۆ محۆ حمۆ بێژیهی بیستووە: پیاوێکی جوولەکە لە دهۆك بە ناوی

---

١. مەلا قاسم کوچەر (١٨٩٧-١٩٩٥) پیاوێکی بەئەزموونی بەتەمەن و ناسراوی ناوچەی بادینان بووە. بەشێك لە گێڕانەوە و بەسەرهاتەکانی سمایل حەکیم لەم پیاوە وەرگیراوە. باپیری مەلا قاسم لە سەردەمی سمایل حەکیمدا ژیاوە. پێش ١٩٩٥ دکتۆر سالم حەکیم داوای لێ دەکات کە شوێنی گۆڕی سمایل حەکیم لە گردی مەرووێ ڕوون بکاتەوە. هەر بۆیە لە ڕێورەسمێکی شکۆمەنددا شوێنەکە ئەدۆزنەوە و مەزارگاکەی بۆ ئاوەدان دەکەنەوە.

٢. ژ بیرهاتنێن مەلا قاسمێ کوچەر، بەرهەڤکرن: بلند موحەمەد، دهۆك، ١٩٩٨

موشێ جوهی کاتی خۆی بەشێك لە کتێبەکانی سمایل حەکیمی دەست کەوتووە و لەگەڵ خۆی بردوویە بۆ ئیسرائیل. ئەوەی کە دیارە بەرهەمە بەجێماوەکان لە ئێسماعیل حەکیم وە بەر دوو بنەماڵە کەوتوون:

**یەکەم**: پەرتووکی پزیشکی. ئەو دەستنووسەی لەم وتارە باسی دەکەین و لای خەڵکی بە کتێبەکەی سمایل حەکیم دەناسرێت. ئەم دەستنووسە ئێستە لای دکتۆر سالم حەکیمە لە شاری دهۆك. دکتۆر سالم کوڕی سەعدی کوڕی مەحۆ کوڕی سمایل حەکیمی سلێڤانیە و ساڵی ١٩٦١ لە گوندی کولێبنێ دەڤەری سلێڤانی سەر بە قەزای زاخۆ لەدایك بووە و ئێستە مامۆستایە لە کۆلێژی پزیشکی دهۆك و پسپۆڕی دەروونزانی نەخۆشخانەی ئازادی ئەو شارەیە.

**دووهەم**: دەستنووسەکانی دیکە وەکوو: قورئانێکی دەستنقیس، مەدح و مەلوودنامەی پێغەمبەر، ئەحکام و شەریعەت، و دەستنووسێك عەرەبی پزیشکی (دەستنڤیسەکەی شاهی عەجەم) لای حاجی عەلی (١٩١٩ـ٢٠٠٨) کوڕی ئیبو کوڕی موحەمەد کوڕی سلێمان کوڕی ئێسماعیل حەکیمە. ئەڵبەت ئەو دەستنووسانە ئێستە کەوتوونەتە لای کوڕەکانی یۆسف کوڕی حاجی عەلی لە گوندی کولێبنێ.

یەکەم جار ساڵی ١٩٦٠ ئەنوەر مائی نووسەری کتێبی (اکراد فی بهدینان)، لە لاپەڕەی ١٨٦ بە شێوەی خوارەوە ئاماژەی بە ناوی ئێسماعیل حەکیم و کتێبە پزشکیەکەی کردووە:

*"... و کان الاطباء قلیلین فی کردستان فی اغلب ادوار التاریخ و مع ذلك فقد ظهر فیها فی بعض الاحیان اطباء حاذقون اکتسبوا شهره اقلیمیه لائقه و من الاطباء المشهورین الذین برزوا فی بادینان علی ما توصلت الیه ابحاثنا السید عبدالرحمن الدرگلکی البرواری، فقد کان المذکور طبیبا حاذقا له کتاب فی الطب باللغه الفارسیه و کذلك ملا اسماعیل السلیفانی ..."*

دواتر موحەمەد ئۆسمانا ساڵی ١٩٨٨ لە گۆڤاری (تەندروستی کۆمەڵ، ژمارە ١٠، هەولێر) بابەتێکی لە ژێر ناوی "نۆژدار اسماعیل عبدالکریم حکیم سلێڤانی" نووسیوە. لەو وتارە باس لەوە کراوە کە سمایل حەکیم پسپۆڕیی لە هەموو نەخۆشیەکانی مرۆڤدا هەبووە، بەڵام لە نەخۆشیەکانی چاودا پسپۆڕیی تایبەتی بووە. هەروەها باسی لە خاڵێکی دیکە کردووە کە حەکیم بەهارانە بۆخۆی و شاگردەکانی ڕووی لە کوێستان و پێدەشتەکانی بادینان کردووە و توورەکەی پڕ کردووە لە گژوگیای جۆراوجۆر و دەرمان و مادەی چارەسەری ڕەنگاوڕەنگ و جیاوازی گرتووەتەوە و بەکاری هێناوە. ئەڵبەت پاش ئەم دوو سەرچاوەیە، بەردەوام

کتێب و ڕۆژنامەکانی باشووری کوردستان و عێراق ئاماژەیـان بە ژیـان و بەرهەمەکـانی ئەم کەڵەپیاوەی سلیڤانی کردووە. وەکوو: کتێبەکانی (ژ بیرهـاتنێن مەلا قاسـمێ کـوچەر، بلنـد موحەمەد، دهۆك، ١٩٩٨) و (بهـدینان و عشـائرها: نووسـینی بەشـیر سـەعید عبـدالرحمن، چاپخانەی خانێ دهۆك، ساڵی ٢٠٠٦) و دوو وتاری موحەمەد عبدالله ئامێدی لە گۆڤارەکـانی (سیلاڤ، ژمـارە ٤٢، دهـۆك، ٢٠٠٩، بـابەت: مەلا ئێسـماعیل حەکـیم)، (هیـزل، ژمـارە ١٤، دهۆك، ٢٠٠٩، بابەت: حەکیمیا کورمانجی) و کتێبی چارەسەر بە دەرمـانی گیـایی لە نێـوان مێژووی دوێنێ و پێویستی ئەمڕۆدا (جەلال کەریم ئۆمەر، سلێمانی، ٢٠١٤، ل: ٩ تا ١٢).

شایانی باسە وەك لە ڕووی ناوەرۆك و پێشـەکی کتێـبەکەی مـوحەمەد ئۆسـمانا دیـارە، سەرجەم توێژینەوەکانی ئەم توێژەرە لەسـەر ئەم حەکـیمە گەورەیە سـاڵی ٢٠١٤ لە کتێبـی سماییلی حەکیم چاپ کراوە. ئەو کتێبە بابەتەکانی خوارەوەی تێدایە:

* پێشگوتن: پێشەکیەك کە چۆن یەکەم جار ناوی ئەم کەسـایەتیەی لە گونـدی کـولێبنێ دهۆك بیستووە.

* ئێسماعیل حەکیم کێیە؟: مێژووی لەدایکبوون، مردن، ماڵبات و باپیرانی

* دەرمان و حەکـیم: لەو بەشـەدا تـوێژەر چەنـدین بـابەتی جۆراوجـۆر لە چارەسـەری و ڕەچەتەی نوژداری حەکیم باس کردووە، وەکی: کۆکردنەوەی دەرمان و گژوگیای پزیشکی بۆ چارەسەری، باسی دیاریکردن و پەرژین کردنی دەوری هەندێ کۆمەڵە گیـای پزیشـکی لە کوێسـتانەکان تـا کـاتی کۆکردنەوەیـان، گێـڕانەوەیەك لە نێـوان حەکـیم و یەکێـك لە شوانەکانی بادینان کە پەرژینی گیاکانی خراپ کردووە، چارەسـەری شـێرپەنجە بە قرژاڵـی نێر، چەندین ڕەچەتە و شێوازی چارەسەری بەیارمەتی گیا و ماکی کوردەواری

* بە کورتی ناڤێن گیـا و فیقیـێ ب مفـا: لێـرە چەنـد گیـایەکی سـەرەکی دەرمانخـانەی حەکیمی ناساندووە.

* حەکیم و شەهرەزایی: گوایە حەکیم لە ڕووی ڕەقی و نەرمی مەمکی خـانمی دووگیـان زانیـویە منـداڵەکەی کـوڕە یـا کـچ، هەروەهـا باسـی ئەوە کـرا حەکـیم بە تەشـریحەوە ئەندامەکانی جەستەی مرۆڤی ئەزموون کردووە و ناسیوە و وێدەچێ قەڵاشتوویە و سەیری کردوون.

* حەکیم و پەرتووك یا نڤێسینێن وی: لێـرە سـەرجەم کتێبەکـانی بەردەسـت و ئەوانەی نەماون یا دیار نیین، باس کراوە.

* چارەسەریا نەساخی وەك ڕویدان: بەسەرهاتی چاككردنەوەی نەخۆشی کچەکەی سـمایل

پاشای ئامێدی، و چەند گێڕانەوەی تر سەبارەت بە نوژداری حەکیم لە ناوچەی خۆیدا
* حەکیم و شیرەت لێکردن: چەند باس و ڕەچەتەی تایبەتی حەکیم
* شەجەرە بنەمالێ: ئەو شەجەرەنامەیە لە باپیرەگەورەی سمایل حەکیمەوە هاتووە تا وەچەی سەردەمی ئێستا.
* بەشێ وێنەیان و بەلگەنامان: وێنەی کێشراوی سمایل حەکیم، سەعدی محۆ سمایل حەکیم، ئامۆزاکانی سمایل حەکیم و عەلی ئیبوێ حەکیم
* حەکیم و دەستخەتێ وی: كفایه الطب، مـدیح المولـود النبـوی الشـریف، هەلبەستێن سمایل حەکیم، قورئانێ پیرۆز و پەرتووکا شەریعەتێ
* نڤیسێن دەربارەی سماییل حەکیمدا هاتینە نڤیسین: ژ بیرهاتنێن مەلا قاسم کوچەر، پەرتووکا شاهێ عەجەم دایە سماییلێ حەکیم، کتێبی اکـراد فـی بهـدینان، بهـدینان و عشائرها، پێشەکی بورهان حوسەینی لەسەر سمایل حەکیم، گۆڤاری هیزل، سیلاڤ، تەندروستی کۆمەڵ
* ژ نوژدارێن بنەمالێ: لێرە وتاری هەندێك لە کەسایەتیەکانی بنەماڵەی حەکیم نووسراوە، وەکوو: دکتۆر سالم حەکیم، یۆنس محمد ئیبۆ سلێڤانی، نەوزاد عبـدالعزیز عەلـی، دکتۆر سەمەر ساڵح سەعدی حەکیم
* وێنە: دکتۆر سالم و چەند هاوڕێیەك، وێنەی بنەماڵەی سلێڤانی لەسەر مەزاری حەکیم، موحەمەد ئۆسمانا و دکتۆر سالم لەسەر مەزاری حەکیم
* ژێدەر: سەرجەم ئەو کتێب و کەسانەی بە کاری هێناوە بۆ ئەو کتێبە.
* پاشگوتن: داواکاری نووسەر لە خوێنەران و هەروەها باسی سپاس و پیزانین لەوانەی هاوکاریان کردووە.

**تایبەتمەندیەکانی ئەو دەستنووسە**

* ئەسڵی ئەو دەستنووسە لای دکتۆر سالم حەکیمە لە باژاڕی دهۆك
* فایلی دیجیتاڵی ئەو دەستنووسە بە ناونیشانی پێناسەی (Fa.Ku.X.80) لە کتێبخانەی دیجیتاڵی دەستنووسخانەی باقلاوا[1] پارێزراوە.
* ٣٥٦ پەڕەیە واتا ٧١٢ لاپەڕەیە

١. کتێبخانەی دیجیتاڵی باقلاوا سەرناوێکە بۆ ئەرشیف کردنی ڕۆژانەی فایلی بەڵگە و دەستنووسە کۆکراوە دیجیتاڵکراوەکانی کتێبخانەی شەخسی خەڵکی کوردەوارییە کە نووسەری ئەم وتارە چەند ساڵە ڕێکی خستووە.

* بەڕوونی چەند جار لەو دەستنووسە ئاماژە کراوە بە نـاوی کتێـبەکە، واتـا کفـایە الطـب (وێنەی ١)

* بەشێك لە کەناری پەڕەکانی دڕاون و شکاون و کاریگەری شـێ و کەڕووی پێـوە دیـارە (وێنەی ٢)

* سەردێڕ و بەشێك لە ناوی کەسایەتیەکان و بابەتە گرینگەکانی ناو دەقـی نووسـینەکە بە قەڵەمی سوور و بەنەوش نووسراوە و ئەوی دیکەی بە قەڵەمی ڕەش.

* ئەو دەستنووسـە موسـتەفا کـوڕی عبـدالرحمن لە ئـاوایی کێسـتەی دەڤەری بەرواری ئامێدی نووسیویە. هەر چەند لە ئەنجامەکە ئاماژە نەکراوە بە ناوی باوکی مستەفا، بەڵام لە پەراوێزێکی دیکە بەم شێوە ئاماژە بە ناوی کاتب کراوە: *تمت شد بدست مصطفی محـزون والده عبدالرحمن مرحوم آه.*

* مصطفی عبدالرحمن نیشتەجێ کێستە بـووە و لەگەڵ منـداڵەکانی لەوێ ژیـاوە. بەپێـی نەریتی ئەوسای کوردەواری کە فەقێ دوای وەرگرتنی ئیجازەنامە، هاوسەرگیری کـردووە و منداڵی بووە. لە پەراوێزێك مصطفی بە جۆرێك ئاماژەی بە بەسـەرهاتێك کـردووە کە لەگەڵ ژن و منداڵەکانی لە دەشت و دەر بوونە و ئەوکاتە خەریکی کتابەتی ئەو دەستنووسە بووە. کەواتە وێدەچێت ئەو کاتبە یا مامۆستای کێستە بووە یـا خەڵکـی نیشـتەجێ ئەو ئـاواییە. پەراوێزەکە بەم جۆرەیە:

*تمام شد در روز سەشنبە کە در کنار آب نشستە بودیم و اولاد در اطراف گرد آمـدە و [ناخوێنرێتەوە] ایشان [ناخوێنرێتەوە] گشتە سبق قلم گشتە باشـد معـزورم دارنـد و مـرا از فاتحە فراموش نفرمائید. زیرا محتاج و گناه کارم. خداونـدا بحـق شـاه مـردان مـرا محتـاج نامردان مگردان.*

* دیـارە کە کاتـب کەسـێك بـووە هـۆگرێتی بە لایەنـی ئـایینی زۆر بـووە و لە زۆربەی پەراوێزەکان خۆشەویستی خۆی بەرامبەر خوا و حضرت رسول نیشان داوە. لە پەراوێزێکدا دیارە ئامۆژگاری حەکیم دەکات کە لە پیناو دەرمانگەری ئاگەداری [خوا و] ڕەسـووڵ بیـت و سـەڵوات لە دیـاری پێغەمـبەر بـدات. لەوانەیە ئامۆژگـاریەکی برایـانە و دڵسـۆزانانەی ئێسماعیل حەکیمی کردووە:

*هشیار باش ای حکیم هر دردی را کە علاجش بینی باید و بر خـود لازم شـمرد سـە بار صلوات بر روح رسول برسان تا ابد مددکاری کند. و بالخیر تمت روز فیروز دوشنبە بعد اذان الظهر قبل صلوتها. آە ز دست فلك [کەلیمەکانی سڕاوەتەوە و نـاخوێنرێتەوە] / نوشـتم*

*ندانم ز حالم خبر چه مانده ز عمرم چه آید بسر.*

* لە لاپەڕەی کۆتایی دەستنووسەکەدا نووسراوە:

*تمت الکتاب المسمی بکفایت الطب علی ید اضعف العباد مصطفی ١٢٩٠ یوم الاربعا فی قریه کیسته.* کەواتە ئەم دەستنووسە ٣٦ پێش مردنی ئێسماعیل حەکیم نووسراوە. (وێنەی ٣)

* دکتۆر سالم باس لەوە دەکات کە بە گێڕانەوە لە باب و باپیرانی و خەڵکی کێستە، بیستوویە کە ئێسماعیل حەکیم چەند ساڵێك لە مزگەوتی کێستە مەلایەتی و وانەبێژی کردووە و وانە و خوێندنی ئایینی و نوژداری بە فەقێ و داخوازەکان گوتووە. لەوانەیە دەوروبەری هەمان ساڵەکانی ١٢٩٠ تا ١٢٩٨ کۆچی بێت.

* هەروەها لە پەراوێزی لاپەڕەیەکی دیکەدا هاتووە (وێنەی ٤):

*"ذکر حسین افندی الضافن[؟] من خصائص قهوه الیمن ان شجرتها شبیهه بشجره الکراس و طبیعتها کطبیعه هندباء. رطب فی درجه الاولی و لها فرح و نشاط و موافق لمزاج المخنبط و زیاده تحمیصها مضر و یذهب فضلات المعده اذا تعید[؟] شربها بعد الطعام بساعه و کذا یذهب رطوبات المعده و مفیده للصداع و الزکام و موافق من استیقاظ من النوم قعد ثم باشتهاء شربها. ترجمه کلام [وشەکە داپۆشراوە] حرره الفقیر [وشەکە داپۆشراوە][1] عبدالرحمن [وشەکە داپۆشراوە] لاجل حکیم باشی اسماعیل افندی السلیوانی فی فصل[؟] میر البرواری تاتار خان بك سنه ١٢٩٨"*[2]

کەواتە ئەم دەستنووسە لەم ساڵەدا دراوە بە سمایل حەکیم و تا کاتی مردنی حەکیم ١٨ ساڵ سوودی لێ وەرگرتووە.

**تێبینی:**

- دیارە کە پاڵپشت بەم پەراوێزە موستەفا کوڕی عبدالرحمن کە کاتبێکی خۆشخەت بووە ئەو دەستنووسەی نووسیویە بۆ ئێسماعیل حەکیم سلێڤانی.
- نازناوی حەکیمباشی و ئەفەندی بۆ مەلا ئێسماعیل لەو پەراوێزەدا دیارە.
- ئەو کاتەی کە ئەم پەراوێزە نووسراوە (١٢٩٠ کۆچی: ١٨٨٠ ز.) سەردەمێك بووە کە

---

١. بەپێی لاپەڕەی ئەنجامە و هەروەها چەندین پەراوێزی دیکە کە نووسراوە (*کتبه مصطفی یا کتبه مصطفی والده عبدالرحمن مرحوم*) شوێنی یەکێك لە وشە داپۆشراوەکان، موستەفایە کە هەمان کاتبی سەرەکی ئەم دەستنووسەیە.

٢. ئەم پەراوێزە لەو لاپەڕەیە نووسراوە کە سەردێڕی بابەتە (آماس قضیب کە از گرمی باشد یا سردی)یە.

میرنشینی ئامێدی نەماوە و دەسەڵاتی خۆجێیی ناوچەکە بە دەست تەتەرخان[1] بەگ سەرۆکی بەرواریەکانی ئامێدی بووە. خەڵکی بادینان تاتار بەگ بە تەتەر خان دەناسن کە تا ١٨٨٠ میری بەرواریەکان بووە. تەتەرخان بەگ کوڕی ڕەحیم کوڕی سەعید بەگ بووە. حاجی ڕەشید بەگ کوڕی تەتەرخان دوایین میری ئەو هۆزە بووە و پاش باوکی تا ساڵی ١٩٢٨ سەرۆکی بەرواریەکان بووە لە ئاوایی دێرشیش. ساڵی ١٩٠٠ شەڕێك لە ناوچەکە دێتە ئاراوە و موحەمەد بەگ کوڕی تەتەرخان ئەکوژرێ. ڕەشید بەگ گومانی دەچێتە سەر مالك یۆسف سەرۆکی هۆزی تیاری مەسیحی و لە تۆڵەی کوشتنی براکەی ئەم کابرا مەسیحیە دەکوژێت.[2]

ـ هەر چەند لە کۆتایی لاپەڕەیەکی دەستنووسەکە نووسراوە: *کتبه لاجل ملا صمد مهدی*: واتا نووسراوە بۆ مەلا سەمەد مەهدی. هیچ دیار نییە و نازانرێت کە ئەم مەلا سەمەد مەهدیە کێیە و چۆن بووە کە دیسان ساڵی ١٢٩٨ دەستنووسەکە دراوە بە سمایل حەکیم. (وێنەی ژمارە ٥)

* مۆرێکی کوتراو لە پشت لاپەڕەی کۆتاییەوە هەیە و ناوەکەی نووسراوە: *اثر جدید عهد همایون*. لەوانەیە ئاماژە بێت بە سەردەمی پاشای عوسمانی. (وێنەی ٦)

* لە کۆتایی ئەو دەستنووسە دیارە کە فەرهەنگۆکێك بۆ ناوی نەخۆشی و ڕووەکان لە فارسی و عەرەبی بۆ کوردی بادینی هاتووە، بەڵام تەنیا یەك لاپەڕەی ماوە و ئەوی دیکە داکەوتووە. (وێنەی ٧)

* لە پەراوێزی دەقەکە هەندێ جار هاوواتای کوردیی نەخۆشی و ڕووەکان نووسراوە. (وێنەی ٨)

* جوانکاری و جۆری نووسین و خشتەی ناو دەقی لاپەڕەکانی ئەم دەستنووسە، ڕێك هاوشێوەی نموونەی دەستنووسەکانی دیکەی کتێبی کفایە الطبە کە لە کتێبخانەکانی ئێران و تورکیە ئەرشیف کراوە و تەنانەت نموونە چاپکراوەکەی ساڵی ٢٠١١ لە دوو بەرگدا لە ئێران چاپ کراوە. لە وێنەی (٩ و ١٠) بەراوردی نێوان دەقی ئەم دەستنووسە و دەقی چاپکراوی کفایە الطب دەبیندرێت.

---

١. خەڵکی ناوچەی بادینان تاتار خان بەگ کە لەم دەستنووسەدا نووسراوە بە تەتەرخان بەگ دەناسن.

٢. وێنە و دیرۆك، گۆڤاری نیژەن، ژمارە ٤، شیلادزێ (سەر بە قەزای ئامێدی)، ٢٠١٤، هەروەها وەرگرتنی وتووێژی کاك ئیسماعیل تاها لەگەڵ عادل بەگ کوڕەزای حاجی ڕەشید بەگ دانشتووی شاری دهۆك (١٧ ڕێبەندانی ٩٦)

**ژێدەر**

١. بێ ناو، وتاری: وێنە و دیرۆك، گۆڤاری نیژەن، ژمارە ٤، ئامێدی، ٢٠١٤

٢. بەشیر سەعید عبدالرحمن، کتێبی: بهدینان و عشائرها، چاپخانەی خانێ، دهـۆك، ٢٠٠٦

٣. بولەند موحەمەد، کتێبی: ژ بیرهاتنێن مەلا قاسمێ کوچەر، دهۆك، ١٩٩٨

۴. پارساپوور زەهرا، کتێبی: کفایە الطب، ناوەندی توێژینەوەی (علوم انسانی و مطالعات فرهنگی)، چاپی یەکەم، تاران، ٢٠١١

۵. جەلال کەریم ئۆمەر، کتێبی: چارەسەر بە دەرمانی گیایی لە نێوان مێژووی دوێنێ و پێویستی ئەمڕۆدا، چاپخانەی چوارچرا، سلێمانی، ٢٠١٤

۶. عەباس ئەلعەزاوی، کتێبی: موسوعە العشائر العراق، بەرگی ٤، پەخشانگای شریف الرضی، قوم، ١٣٧٥ هەتاوی (١٩٩٦)

٧. فرسەت مەرعی، کتێبی: کورنولوجیە دهوك (نبذە من الاحداث التاریخیە لمدینە دهوك و اطرافها)، پەخشانگای هەوار، دهۆك، ٢٠١٧

٨. مائی ئەنوەر، کتێبی: اکراد و بهدینان، پەخشانگای الحصان، مووسڵ، ١٩٦٠

٩. موحەمەد ئۆسمانا، وتاری: نوژدار اسماعیل عبدالکریم حکیم سلێڤانی، گۆڤاری تەندروستی کۆمەڵ، ژمارە ١٠، هەولیر، ١٩٨٨

١٠. موحەمەد ئۆسمانا، کتێبی: سمایلی حەکیم، پەرتووکخانەی بەدرخانیان، چاپی یەکەم، دهۆك، ٢٠١٤

١١. موحەمەد عەبدوڵا ئامێدی، وتاری: مەلا ئیسماعیل حەکیم، گۆڤاری سیلاڤ، ژمارە ٤٢، دهۆك، ٢٠٠٩

١٢. موحەمەد عەبدوڵا ئامیدی، وتاری: حەکیمیا کورمانجی، گۆڤاری هیزل، ژمارە ١٤، دهۆك، ٢٠٠٩



وێنەی ژمارە ١: ناماژە بە ناوی کفایە الطب لە دەستنووسەکە



وێنەی ژمارە ٢: وێنەی ڕواڵەتی دەستنووسەکە

وێنەی ژمارە ٣: ئەنجامەی دەستنووسی سمایل حەکیم (٢٠ حوزەیرانی ١٢٩٠) و پەراوێزی دیکە کە ناوی کاتبی دەستنووسەکە مصطفی کوڕی عبدالرحمن هاتووە



وێنەی ژمارە ٤: پەراوێزی دەستنووسەکە کە کاتب دەستنووسەکە ڕادەستی سمایل حەکیم کردووە




وێنەی ژمارە ٥: لە خوارەوەی لاپەڕەی سەرەوە (کتبه مصطفی فی قریه کیسته) و لای چەپ

نووسراوە (کتبه لاجل ملا صمد مهدی)



وێنەی ژمارە ٦: مۆری کوتراو بە پشت لاپەڕەی کۆتایی دەستنووسەکە

وێنەی ژمارە ٧: فەرهەنگۆکی فارسی و عەرەبی بە کوردی بادینی کۆتایی دەستنووسەکە





وێنەی ژمارە ٨: نموونەی پەراوێزی لاپەڕەی دەستنووسەکە کە هەمبەری کوردی وشەکانی نووسیوە

## تب هر روز کز گرمای سخت باشد یا از سرمای سخت — بیست و نهم

### سببش کز گرمای سخت بود

یوحنا گوید سبب این حال از گرمی هوا بود که مزاج تن را گرم کند یا از آن باشد که در گرمابه گرم یا در آفتاب بسیار نشسته بود.

### علامتش کز گرمای سخت بود

نشانش آن است که اندامش گرانی کند وز بسودن گرم بود و سرش درد کند و گونهاش سرخ شود و مجس باریک بود و زود جهد.

### سببش کز سرمای سخت بود

جالینوس گوید سببش از سرمای سخت باشد که در تن شده باشد و مزاجش را از حال اعتدال گردانیده بود یا از نشستن بسیار در آب سرد باشد.

### علامتش کز سرمای سخت بود

نشانش آن است که پوست تن درکشیده بود و چون دست بر اندامش نهند گرمی کم باشد و مجس او زود برجهد و بود که آب قاختن سپید بود.

### علاج آن چه از گرمای سخت باشد

یوحنا گوید علاج تبی کز گرمای آفتاب گیرد آن است که به آب روشن خوش در نشیند و سرکه و گلاب و روغن گل سرد کرده به سر برنهد و پست و شکر سپید بکار دارد یا در گرمابه شود و آب نیم گرم بر اندامها ریزد و زود بیرون آید و گر سببش از گرمی هوا بود یا از آن که در گرمابه بسیار نشسته باشد علاجش آن است که اندکی سرکه با گلاب و روغن گل بیامیزند و هر وقتی بر سر مالد و گر رکوی کتان در این چه گفتیم تر کند و به سر برنهد منفعت دارد و چون تب به آخر آید به گرمابه شود و سر بدین آب بشوید. صفت: بنفشه و نیلوفر و بابونج از هر یکی برابر بستانند و همه به آب خوش بجوشانند تا آب قوت داروها به خود کشد و در گرمابه سر بدو بشوید منفعت کند.

ابن ماسویه گوید علاجش آن است که اندامها به آب نیم گرم بشوید و چون از گرمابه بیرون آید کشکاب خورد با شکر سپید و مزوره ماش یا مزوره ماش که به کدو و روغن بادام پخته باشند بکار دارد و بعد آن به خواب مشغول گردد و گر روغن [گل] به یخ سرد کند و بر سر نهد و نیز بر سینه مالد منفعت کند و آب سرد کرده خورد و گر در گرمابه به آبزن نیم گرم درنشیند و زود بیرون آید و اندامها به روغن گل و روغن نیلوفر سرد کرده بمالد منفعت کند وز غذاهای گرم و خشک پرهیز کند.

### علاج آن چه از سرمای سخت باشد

جالینوس گوید تبی کز سرمای سخت یا از [نشستن در] آب سرد گیرد علاجش آن است که اندامها را نیک بمالد تا تب بنشیند و باز به گرمابه شود و خوی کند و تن به روغن نسرین و خوش بمالد و زان پس آب گرم بر اندامها ریزد و چادری به خود در گیرد و بیرون آید و بخسبد و چون برخیزد طعامهای سبک و لطیف خورد چون فروجه که به ابزارهای گرم پخته باشند و گوشت دراج و تیهو و آن چه بدین ماند و سیکی خوش بوی خورد و گر بهتر نشود همین علاجها دیگر بار بکند تا شفا یابد. ماسرجویه گوید علاجش آن است که نخست تن به جامههای گرم نیک بپوشد تا خوی از اندامهایش بیرون آید و بعد آن به گرمابه شود و تن به آب گرم بشوید و گر مرزنگوش و شبت و سیسنبر به آب بپزد و تن بدو نیک بشوید منفعت کند و چون از گرمابه بیرون آید روغن شبت و روغن خیری یا روغن بابونج بر سر مالد سود دارد و بویهای خوش انبویه و سیکی سپید بکار دارد و گر سبب این علت از آن بود که به آب سرد نشسته باشد علاجش آن است که به آبزن گرم درنشیند و چون تب بیرون آید تن به جامههای گرم نیک بپوشد و بخسبد تا خوی از اندامهایش بیرون آید و بعد آن تن را به روغنهای گرم نیک بمالد وز خوردنیهای سرد پرهیز کند تا شفا و راحت یابد.

<A ٢٥٠>

وێنەی ژمارە ٩: وێنەی چاپی کتێبی کفایه الطب (پارساپوور، ٢٠١١)

وێنەی ژمارە ١٠: وێنەی هەمان لاپەڕەی ژمارە ٩ لە دەستنووسی سمایل حەکیم




وێنەی دکتۆر سالم حەکیم




ساڵی ٢٠١٥ دهۆک: لە ڕاستەوە: کەریم بەیان (بەڕێوبەری چاپ و بڵاوکردنەوەی دهۆک)، ئیرەج موورادی،

هزرڤانی شاعێر، کەیفی تاهێر، بورهان حوسەینی، سالم حەکیم، ئێسماعیل موشیر (سەرۆکی کۆمەڵەی ڕووەکناسانی باشووری کوردستان)



وێنەی کێشراوی خەیاڵی لە سمایل حەکیم



وێنەی حاجی ڕەشید بەگ کوڕی تەتەرخان بەگ بەرواری



وێنەی مەزارگەی سمایل حەکیم سلیڤانی لەسەر گردی مەڕوونێ لە نیوان سێمێل و زاخۆ



وێنەی گۆڕستانی میران لە ئامێدی: ئەم گۆڕستان و گومبەزە سەرەتا بۆ سوڵتان حسێن وەلی میری بادینان دروست کراوە، دواتر بووەتە شوێنی گۆڕستانی میرانی بادینان و ئامێدی.

## بەشی پزیشکی لە کەشکۆڵی مەلا مەحەمەد ئەمین هەولێری

ئەم گوزارشە ڕێك هەمان بابەتی کەشکۆڵی موحەمەد ئەمین [هەولێری]یە کە مامۆستا عەلی قەرەداغی لە بەرگی یەك لاپەڕە ١٥٦ـ١٥٩ کتێبی "بووژانەوەی مێژووی زانایانی کورد لەڕێگەی دەستخەتەکانیانەوە"[1] دایناوە.[2] ئەم کەشکۆڵە بە ژمارە و ناونیشانی ١٣٦١٩ لە کتێبخانەی (دار صدام للمخطوطات) شاری بەغداد پارێزراوە. هەروەها ڕێکەوتی ١٩٩٢/٠٥/١٢ ژمارە ١٤٥٠ ڕۆژنامەی هاوکاری لە شاری هەولێر بابەت و ناونیشانی ئەو کەشکۆڵە و خاوەنەکەی بڵاو بووەتەوە. ئەو کەشکۆڵە مەلا موحەمەد ئەمینی هەولێری ناسراو بە "خاکی یا بەننا" دەوروبەری ١٣٠٥ تا ١٣١٣ کۆچی نووسیویەتیەوە و کۆی کردووەتەوە. بەشی زۆری دەستخەتەکە خەتی خۆیەتی و ناوبەناو لە چەند جێگەدا خەتی یەك دوو هاوڕێی مامۆستای تێدایە کە دیارە یا ئەم بە دیدەنیی چووە بۆ لایان یان ئەوان ڕێگەیان کەوتۆتە حوجرە و شوێنی خوێندنی یا زێدی مامۆستا لە هەولێر. خاڵێکی تر ئەوەیە کە مامۆستا موحەمەد ئەمین هاتووە ڕێبازێکی تایبەتی بۆ تۆمارکردنی ڕاچێتەی[3] چەند جۆر نەخۆشی و شکستەی گرتووەتە بەر و شێوەی کردن و گرتنەوە و بەکارهێنانی دەرمانەکانی لە دەمی خودی حەکیمانەوە وەرگرتووە و لەم بەیازەدا بۆی تۆمار کردووین و لە دوای هەر یەکێك لەو بابەتانە ناوی حەکیمەکەی هێناوە، وەك دەڵێت: من لسان صوفي عبدالقادر، من لسان جراح محمد، من لسان خانم، من لسان زتو، من لسان فقي حسين، من لسان عبدالوهاب اشنوی و تاد.

---

١. بووژانەوەی مێژووی زانایانی کورد لەڕێگەی دەستخەتەکانیانەوە، موحەمەد عەلی قەرەداغی، بەرگی ١، چاپخانەی بەغداد، ١٩٩٨

٢. نووسەری ئەم گوزارشە دەقی بابەتەکەی مامۆستا عەلی قەرەداغی بەپێی فۆرمەتی نووسینی گوزارش بۆ ئەم هەمایشە بان و خوار و ڕێکوپێك کردووە.

٣. ڕاچێتە هەمان 'ڕەچەتە و ڕەچێتە'یە کە لە کوردەواری بەو ڕێنمایی و دەرمان نواندنە دەگوترێت. بەرامبەرەکەی لە فارسیدا "نسخە"یە.

بابەت و شێعر بە زمانەکانی کوردی (زاراوەی سۆرانی و بادینی و هەورامی)، عەرەبی، فارسی و تورکی لە کەشکۆڵەکەی مامۆستادا هەیە و ڕەنگینەیەکە لە بەرهەمی شاعێران، نووسەران، حەکیمان، مەلایان، نووشتەنووسان، نوکتەزانان، فەتاحفالآن و هتد. لە هەموو بابەتێکی تێدایە و وەك کورد دەڵێت: سەری ماری کوێریشی تێدایە. ئەو کەشکۆڵە تەنیا بابەت و بەرهەمی ناوچەی هەولێری تێدا نییە و مامۆستا بەهۆی شارەزای لە ناوچەکانی دیکەی کوردستان و ناسینی کەسایەتی و کەڵەزانایانی ناوچەکانی دیکە وەکوو موکریان، سلێمانی، هەورامان، ئەردەڵان، کرماشان، گەرمیان، باتە، جزیرە، بۆتان و تاد، کەشکۆڵەکەی زەنگین و ڕەنگین و سەنگین‌تر کردووە. ناوەرۆکی کەشکۆڵەکەی مەلا موحەمەد ئەمین ئەمانەی خوارەوەی تێدایە:

کۆمەڵێك داودەرمانی لە زمانی مەعرووفی شنۆیی و شەعبانی ئاکرێیی و ئایشێ خانمەوە، زمان بەستن، سوود و تایبەتمەندی هەندێك شتی [خواردن و خواردنەوە]، دەرمان لە زمانی موحەمەدی جەڕاحەوە، ڕێبازی خواردن، دۆعا، پیاو بەستن، دەرمان، مزگەریی و مس سپیکردنەوە، داودەرمانی [کوردی] و دەیان پارچە هۆنراوەی شاعێران وەکوو بابا تاهێری عوریان، میرزا شەفێع، کوردی، فیکری، نالی، خان ئەحمەد خان، زەهاوی، مەولانا خالید، شنۆیی، شێخ ئەحمەدی جزیری، موستەفا بەگی کوردی، ئەحمەدی کۆر، شێخ عەلی ئاکۆ، شێعری تورکی و باسی ئایینی و چەندین بابەتی جۆراجۆری دیکە.

دیسان لەم کتێبی بووژانەوەیە بەرگی یەك لاپەڕەی ١٤٩ــ١٥٥ نووسەر ناوەرۆك و ناونیشانی کەشکۆڵێکی دیکەی باس کردووە کە ئەم مامۆستا موحەمەد ئەمینە کۆی کردووەتەوە و نووسەر لە ژمارە ١٤٤٢ ڕۆژنامەی هاوکاری بەرواری ١٩٩٢/٠٥/٠٣ چاپی کردووە. ئەم کەشکۆڵە بە ژمارەی ١٥٥٧٢ لە کتێبخانەی "دار صدام للمخطوطات" بەغدا هەڵگیراوە و پڕە لە پەخشان و هۆنراوەی کوردی و عەرەبی و تورکی عەقیدەی ئیسلامی.

**[بابەتێکی پزیشکی لە نووسینی مامۆستا عەلی قەرەداغی لە پێشەکی ناساندنی ئەم کەشکۆڵە]**

لە سەردەمی کۆنی ناو کوردەواری کەسانێکی زیرەك و بلیمەت و وریا هەبوون یان بە بنەچە و بنەماڵە بۆیان مابووەوە یا خۆیان بە تێکۆشان و پشکنین و بەراوردی گژوگیا و داودەرمان و کارکردنی سەروەر لە بواری شکستەبەندی، و دەغەزاز و نەخۆشاندا زانیاری زۆر و ئەزموونیکی فراوانیان سەر یەك خستبوو. کات و وزەی خۆیان – بەزۆری بێ مز و ماف – بەهاناوە چوون و چارەسەرکردنی داماوان و دەردەداران تەرخان کردبوو. بەو جۆرە

کەسانە کە مەرج نەبوو تەنها لە پیاواندا بێ و بەڵکوو ئافرەتانیش بەشی خۆیان تێدا هەبـوو،[١] دەگوترا: حەکیم و جەڕاح. لە هەر ناوچەیەکدا چەند کەسێك لەمانە بوون و ماڵەکانیـان وەك خەستەخانە وابوو. ئەمانە بەزۆریی تاقەکەس بـوون و لەگەڵ ئەوەشـدا [زۆربەی زۆریـان] نە خوێندەوار بوون و نە سکرتێر [و مونشیان] بوو، نە بەردەست و برینپێچ و نە کەسیش بـوو کە ئەو ئەزمـــوون و تـــاقیکردنەوە و زانیـــاری و نـــاو [و نـــاوەرۆکی] داودەرمانەیـــان لە دەم وەربگرێت و تۆماریان بکات و دوایی سوودیان لێ وەربگیردرێت. بەڵکوو بەزۆریی ئەو سامانە کەموێنەیە چووەتە ژێر خاك. من بەش بە حاڵی خۆم کەشکۆڵی کوردیی شاعێران و زانایانی کوردستانم زۆر دیـوە و خۆیشـــ بە بەخـــتەوەر دەزانـــم کە توانیـــومە ژمـــارەیەکی باشـــیان بە خوێنەران بناسێنم. لەناو ئەو کەشکۆڵانەدا ناوبەناو دۆعـا و دەرمـان و چارەسـەری هەنـدێ [نەخۆشی]م دیوە، بەڵام ئەوەی لە کەشکۆڵی مەلا موحەمەد ئەمینی خاکیدا دیومە شـتێکی تـــایبەتی و کەموێـــنەیە. ئەو مامۆســـتا کە یەکـــێکە لە ســـەربازە نەناســـراوەکانی مەیـــدانی کۆکردنەوەی سامانی کەلەپووری نەتەوایەتیمان، ئەو کەشکۆڵەی بەرهەمی ڕەنجی کۆڵنەدان و ماندووبوونی نزیکەی دە ساڵانە.

---

١. مامۆستا عەلی قەرەداغی سەبارەت بە زێدی خۆیان، گوندی تەکیە لە ناوچەی سلێمانی بۆ ناونیشانی ئافرەتانی حەکیمی ئەوێ نووسیویەتی: لە تەکیە دوو ئافرەتی کارامە هەبوون کە ئەرکی دەرمانکردنی برینداران و گرتنەوەی دەست و قاچی شکستەکان لە ئەستۆی ئەواندا بوو. یەکێکیان ناوی باجی ڕەعنا بوو کە لە ئەسڵدا خەڵکی بانە بوو جێگەی کەوتبووە تەکیە. دووەمیان پووری نووسەر بوو. پوورە عاسم کە لە بەهاری ١٩٩١ دا کۆچی دوایی کرد. خوا لێیان خۆش بێت.

## بەشی پزیشکی لە کەشکۆڵی ئاشوکروڵای تێژتێژ

چیرۆکی ئەم کەشکۆڵە (بیاض) لە کاك فەرزاد ئەسەدپوور[1] خەڵکی ئاوایی تێژتێژ[2] و دانشتووی دانشتووی شاری سنە دەست پێ ئەکەین. ڕێکەوتی ١٣٩٦/٠١/٠٦ سەردانی کتێبخانەی ئەو بەڕێزەم کرد لە گەڕەکی بادینانی شارەکی بەهارانی سنە. کاك فەرزاد دەیگێڕێتەوە کە بیستوومە بنەماڵەی باب و باپیرانی ئێمە خاوەنی دەفتەر و دەستەکی دیوانی و خوێندن و نووسین بوون. چەند قورئانی دەستنووس و بەیاز و کتێبی تر لە یەغان و تاقچەی ئەمانەدا بووە، بەڵام هەر کام بە چیرۆکێ لەناو چوون یا دەستاودەست بوون و چارەنووسیان کەوتە دەرەوەی بنەماڵەی ئێمەوە. بنەماڵەی خانەکانی تێژتێژ بە بەشێك لە گەورە ماڵباتی وەزیریەکانی سنە ئەژمار دەکرێن. میرزا فەرەجولا خان وەزیری کە یەکێك لە ناوداران و دەوڵەمەندەکانی کاتی خۆی بووە لە ناوشاری سنە، کۆتایی سەردەمی زەندییەکان و سەرەتای دەسەڵاتی قاجار (١٢٢٠ کۆچی) مزگەوتێکی بێوێنەی لە شاری سنەدا دروست کردووە و تا ئێستەش ماوەتەوە. ئەو مزگەوتە لە گەڕەکی جەوراوایە و بە مزگەوتی میرزا فەرەجولا دەناسرێت. ساڵی ١٣٧٩ ئیدارەی میراث فەرهەنگی بە ژمارە ٢٨٣٨ تۆماری کردووە.[3] لە لاپەڕەی ٢٥١ دەستنووسی بەردەستدا هاتووە: *تاریخ مرحوم مبرور جنت جاه میرزا اسد اللـه در شب شش شهر شوال المکرم برحمت ایزدی پیوست فی ١٢٨٥* [میرزا ئەسەدولا باوکی میرزا فەرەجولایە]، هەروەها لە لاپەڕەی ٢٤١ یشدا هاتووە: *فرج‌اله خان [ناخوێنرێتەوە]* مسجد

---

١. فەرزاد کوڕی موحەمەد کوڕی عەبدولا کوڕی میرزا شوکرولا کوڕی میرزا فەرەجولا کوڕی ئەسەدولایە و مامۆستای دەبیرستانە

٢. تێژتێژ دەکەوێتە سەر ڕێگای کۆنی سنە بۆ مەریوان لە نزیك شارۆچکەی شوێشە. دەگێڕنەوە کە کەریم خان زەند پێش ئەوەی ببێتە شای حکوومەت هاتووەتە ناوچەی کوردستان و یەکێ لەو شوێنانەی تێیدا ماوەتەوە، تێژتێژ بووە. هەروەها لە شەڕی ڕووسەکان ئوردووگایەکی ئەو هێزە لە نزیك تێژتێژ بووە.

٣. وەرگیراو لە ماڵپەڕی ویکیپێدیای فارسی، بابەتی: مسجد میرزا فرج الله خان وزیری. ڕێکەوتی: ١٣٩٧/٠٣/٢٧

*[ناخوێنرێتەوە]* سوختە بود. گوایە ئەوکاتە مزگەوتەکە جارێك سووتاوە.

ملکــی ئاواییەکـانی تێژتێـژ، ئـالکە، شوێشــە و بەشـێکی دیـکەی نـاوچەی کەلاتەرزان[١] لەلایەن والی ئەردەڵان ئەدرێـت بە میـرزا شـوکرولا کـوڕی میـرزا فەرەجـولا. بەو شـێوەیە بنکەی لقێکی گەورەی بنەماڵەی وەزیریەکانی سنە بۆ بەڕێـوەبردن و کـۆکردنەوەی داهـاتی دیوانی ناوچەی بەربلاوی کەلاتەرزان لە ئـاوایی تێژتێـژ نیشــتەجێ ئەبـێ و تێژتێـژ دەبێـتە بنکەیەکی دیوانی گرینگ لە ناوچەکە. هەر لەو کاتەوە تا ئەم دواییـانەش شـوێنی تـایبەتی خانی گەورەی تێژتێژ بە عمارەت ناسـراوە و ئێســتەش مـاڵە عمـارەتەکە هێشـتا لە تێژتێـژ ماوەتەوە.[٢] یەکێـك لە شـوێنەوارەکانی میـرزا شـوکرولا کەشـکۆڵێکە کە بە کتێـبەکەی "ئـا شوکرولا یا میرزا شوکرۆلا" دەناسرێت، تەنانەت هەنـدێك بە قورئـانەکەی ئاشـوکرولا ناویـان هێنـاوە. بـابەتی ئەم کەشـکۆڵە شـێعری شـاعێرانی هەورامــی و سـۆرانی (شـێخ شــەهابی کاکۆزەکریایی، بێسارانی، سەیدی هەورامی، مەولانا خالید شـارەزووری، مەولەوی، ئەحــمەد بەگی کۆماسی، موحەمەد عیسا بەگ و تاد) و فـارس (سـەعدی، نزامــی، مەولانـا، و تـاد)، بابەتی پزیشکی، حەدیس و بابەتی ئایینی، ڕێکەوتی ژیان و مردنـی بنەمـاڵەیی و هەروەهـا بابەتی هەمەجۆرەی دیکە.

## باسی پزیشکی ناو دەستنووسەکە

* لە لاپەڕە ١٣٦ تا ١٤٨ باسی گێڕانەوەیەك دەکات کە لە کتێبی قصـص الانبیـاء ڕاوەنـدی وەرگیراوە. ئەم باسە بە "محرم نامە"[٣] ناسراوە. محرم نامە کە کتێبێکی شـێعەکانە و باســی ئەوە دەکات کە ئەگەر ساڵێك سەرەتای مـانگی محـرم بکەوێـتە شـەنبە، یـا یەکشــەنبە و کۆتایی تا هەینی، ئەوە پێش‌بینی باری تەندروســتی خەڵـك، نەخۆشــی، تـاعوون، مەرگــی

١. ناوچەی کەلاتەرزان لە کۆندا بریتی بووە لە بەشی نێوان سنە هەتا سنووری شامیان و ژاوەرۆ و سەرشیو و سالاڵ، واتا بەشەکانی ئێستەی کۆماسی، کەلاتەرزان (بەخشداری شوێشە)، ئاواییەکانی بەرپلەی سالاڵ (ناوەندی ئیداری جانەورە) و ئاواییەکانی نزیك شاری سنە

٢. وەرگیراو لە نامیلکەی چاپنەکراوی مهندس فەریدوون غەفاری دانشتووی شاری سنە کە لەسەر مێژووی ئاوایی تێژتێژ و بنەماڵەی وەزیریەکانی ئەم ئاواییە هەندێك لێکۆڵینەوەی کردووە و شەجەرەنامەیانی ڕێك خستووە. (ڕێکەوتی وەرگرتن: ١٣٩٦/١١/٣٠)

٣. نموونەیەك هاوشێوەی ئەم بابەتە لە ژێر ناونیشانی محرم‌نامە لە کتێبخانەی مجلس شورای اسلامی هەیە بەم ناونیشانە: ژمارە ٧٨٣٦٦ (زمانی فارسییە و ١٦ لاپەڕەیە)

منداڵان، ژیانی پاوشاکان، قاتوقڕی، نەخۆشی ئاژەڵ و لێرەوار و خەلە، زاڵبوون و دابەزینی خەڵت و سروشتی مرۆڤەکان لەم چەند لاپەڕەدا هێناوە. بۆ نموونە:

*"ئەگەر سەرەتای محرم شەنبە بێت ساڵەکە زستانی سارد دەبێت، باران زۆر دەبارێت، سەهۆڵبەندان دەبێت، گرانی گەنم دائەکەوێت و نەخۆشی تاعوون و مەرگی منداڵان زۆر دەبێت، برێ لە میوە و ڕەزەکان مێملیان تووش دەبێت، ... مردارەوبوون و تۆپینی ئاژەڵەکان زۆر دەبێت و زۆربەیان تووشی کۆلنج دەبن... کوڕ و ژنێکی زۆر دەمرن بەتایبەت لە عێراق... گیا لە لەوەڕگاکانی عەرەب زۆر دەبێ... و لەو ساڵە کولله و هاوڵە زۆر دەبێ و ڕۆن و گۆشت و هەنگوین و کەتان گران دەبێ و خورما بە دارەوە ئەگەنێت... .*

* بۆ هۆنینەوەی تەزبێح لە لاپەڕەی ١٥٩، بەم شێوە باسی کردووە: [شێوەکاری یەکەم:] *سندوس ٧ درم، شنجرف ١ [و] نفط سفید ٧ قطره [:] خوب باهم [ناخوێنرێتەوە] کرد در قالب خوب ریخته محکم بکوبد پس در آتش نهد تا دود منقطع شود بیرون آورد چون سرد شود تراشیده سوراخ نماید و از پشت [ناخوێنرێتەوە] جلا دهد.* [دووەم:] *شنجرف ١٥ [و] قدح حموم؟ که گوش ماهی باشد با شیر بز تازه زائیده که شیر را [ناخوێنرێتەوە] باشد خوب صلایه کرده در میان قلم گوسفند کذارده [= گذارده] زبر جلوه میکنند بعد درآورده سوراخ کرده تسبیح دورست [= درست] کند.*

* دیسان لە لاپەڕەی ١٥٩ هاتووە: *اکر [= اگر] زهره کاو [= گاو] با انار ترش طلا کند در قضیب مالد ذکر بزرگ کرده و با هر زنی مجامعت کند او را دوست دارد و نیز آبدار می-شود. اکر زهره کوسفند [= گوسفند] در ذکر مالد و با زن جماع کند بغیر از او کسی نخواهد. اکر زهره کوساله [= گوساله] در خانه نهد و یا ریزد کیك [= کك] همگی جمع شوند و اگر [آیه] اذا زلزلت بخواند بر آب و شب بنهد در بالین، کیك همگی جمع شوند.*

* لاپەڕە ٢٢٤ بۆ زەڕکوت کردنی ڕووپەڕی کانزای ئاسن و پۆڵا نووسیویە: *زرافشان کردن که محتاج به دست نباشد باید سطح آهن یا فولاد و امثال آن اول صیقل کردن و باینها که مذکور شود بقلم نقاشی هر نقش که خواهد بکند بعد از آن خشك کند در بتابد یعنی به آتش سرخ کند تا اجزا درو نفوذ کند. پس جلا دهد [ناخوێنرێتەوە] ورق طلا و زنگار و زعفران الحدید (براده آهن در میان سفال گلی در زمین نمداده) بسویه سحق نموده به آب صمغ بقدری که تواند استعمال نماید سه رشته بکار برد بسیار مجرب است. نقش حدید و فولاد و امثال آن به پی بز نویشته [= نوشته] بعد از آن موم به اطرافش نهاده و آب بر سری نویشته ریخته بعد از آن نوشادر و توتیای کبود بسویه سحق نموده بر سری*

*آب ریخته و جلوی آفتاب نهاده بعد از آن جلا دهند. آب در عقیق نویسند نقش شود.*

* لاپەڕە ٢٢٥ هۆنراوەیەکی هێناوە کە باسێکی پزیشکی گرینگی تێدایە و نووسیویە، در طب *فرماید: چون شوی بیدار از خواب سحر/ پیشتر طعم دهان خود نگر. تلخ صفرا و ترش سودا شناس/ شور بلغم و آن شیرین دم شهر. پس به دفع آنچه غالب یافتی/ مشتغل شو تا نیابی زآن ضرر.*

لە تەنیشت دێڕی هۆنراوەکان بۆ چوار خەڵتی سەودا، سەفرا، بەڵغەم و خوێن ئەم دێرە شێعرانەی داناوە: [بۆ تلخ صفرا و ترش سودا شناس:] *به شیرینی و ترشی ز معتدل/ شفا یابد او را از آن جان و دل.* [بۆ ترش سودا:] *علاجش تو چربی و شیرین نما/ که افزون بگردد ازو دردها.* [بۆ شور بلغم:] *خورد چیزی بعد از آن قی کند/ که تا رنج از خود بیرون کند.* [بۆ دم نهر:] *بخونش دلیلست گشته زیاد/ چو بگشاد از تن همه گشت شاد*

* لاپەڕە ٢٢٦ تا ٢٢٩چەند ڕەچەتەی دەرمانی جیاجیای نووسراوە.

ـ *برای حال آمدن شرابخور سزد سرکه روغن، بنفشه و تخم آبی [بەدانە] سه اجزا را به دماغ زند تا حال آید.*

ـ *ریشه[؟] هلیله زرد هر روز سه مثقال با قند خورد که تا هفت روز خورد زردی را ببرد.*

ـ *سرمه تا چهل روز در میان انگبین نهاده بعد از آن خرد[؟] کرده در چشم نافع است.*

ـ *آب دملان نوعیست از قارچك با سرمه آمیخته در چشم كند مجربست.* [لێرە نووسینی دومەڵان و قارچك بۆخۆی نیشانەی ئەوەیە کە ئەم ڕەچەتانە کەسێکی کورد نووسیویە. دومەڵان هەمان جۆری قارچکی ناوچەکانی شەنگال، چەمچەماڵ، خۆی و ئەیوانە کە سەلکێکی ڕەش و زەردە و نایەتە سەر خاك و لە ژێر زەوییەوە هەڵدەتۆقێ و وەك قارچکی لاسکی نییە. بە فارسی دەبێتە قارچ کوهی یا دنبلان]

ـ [لێرە بە دواوە چەند قسەیەکی خورافاتی و نووشتەی نووسیوە. وەکوو:] *اگر زنی حیض داشته باشد علت از دیو است. اگر دل او درد کند از پریست. اگر حیض او مختلف است از بنی آدم است.* [نووشتەیەك بۆ:] *باد نزله.* [چەند نووشتەی ماڵ وێرانکەری داناوە. وەکوو:] کەسێك تووشی بەڵایەکی سەخت کردن. بۆ مردنی کەسێك. بۆ جیایی و نێوان شێواندن. کاول کردنی ئاوەدانی ماڵی کەسێك.

ـ [بۆ ئازارشکێنی ژانی ددان چەند پیتی داناوە و ئایەتێکی قورئانی هێناوە و نووسیویە:] *جهت درد دندان این حرفها را بنویسد و مسمار بر حرفها یکی یکی بزند.*

ـ بۆ ڕەشکردنی مووی سەر: *آب و سماق و آملە و وسمە و حنا. موی سفید بە دو ساعت کند سیاە.*

ـ بۆ نەخۆشی گەڕی پێست: *باب مرهم جرب برای تر و خشك بسیار نافع است. زاج* [= زاخ] *سفید، مازوی بی سوراخ* [مازوویەك کە کرمۆڵ نەبێت و ساق بێت] *و گوگرد فارس و جوز با پوست تخم مرغ [و] اشنان کوفتە و پختە بر روغن کامل تازە سریشتە بمالد. نافع است. اگر مردارسنگ و سفیداب و زرنیخ [ناخوێنرێتەوە] کند بهتر بود. اگر بسیار تر بورد جوز سوختە و زاج سفید و سیاە و مردارسنگ و سفیداب نافع بود.*

ـ [بۆ کوشتن و فڕێدانی کرمی ناوسکی منداڵ:] *اگر طفل کرم در شکم داشتە باشد برگ شفتالو را کوفتە در شکم طلا کند برطرف شود* [لاپەڕە ٢٢٨]

ـ [بۆ چارەسەری کۆخە: قۆزە، نووسیویە:] *جهت سرفە مغز تخم خیار، مغز تخم کدو، نشاستە، کتیرە گون، بەدانە، خشخاش، صمغ عربی، تریاك، رب سوس* [واتا گوشراوی ڕەگی مێکووك]، *کوبیدە و با لعاب بەدانە خمیر سازد حب نمایند هر شب سە دانە حب بخورد و یك عدد در دهان نهد تا آب شود و آب آنرا فرو ریزد بە شود.*

ـ لاپەڕە ٢٣٧ شێوەکاری ئەندازە گرتن و پێوانەیی ترپەی (نبض) کردووە: *دستور نبض افتن باید انگشت برگ بنهد یعنی چهار انگشت نە سخت و نە نرم یعنی میانە و انگشت برگ نهد باید کە بی علت بود و سر انگشتان آسودە بود کە کاری با اعتدال نکردە باشد و نیك تامل کند و خشمناك و اندوهناك نباشد. اگر مقام نبض گرم و خشك چون مشك پر آب دیر دیر جهد و سست بود دلیل غلب بلغم بود و زود زود جهد یا حرارت و باریك بود دلیل غلبە سفرا بود و اگر دیر دیر جهد چندانکە حرکت کند انگشت را واکوبد دلیل غلبە خون بود و اگر مقام نبض سرد بود و چون مشك پر آب دیردیر جهد چون زە کمان کشیدە باشد و باریك و خشك بود و سخت جهد هم چنان جهد کە انگشت را واکوبد دلیل سودا بود و اگر چهار انگشت بیشتر جهد پیدا شود دلیل قوت بدن بود و تند درست بود و بیخود بنمود شك ندارد. والله اعلم بالصواب.*

ـ لە لاپەڕەی ٢٢٦ تا ٢٣٥ باسێکی تەواوی پزیشکی و کۆمەڵێك ڕەچەتەی دەرمانی هێناوە. [لەوانەیە وەگیراوە لە چەند کتێبی پزیشکی کۆن.]:

ـ سەرەتای ئەم بەشە وا دەست پێ دەکات[لاپەڕە ٢٣٥]: بسم اللە الرحمن الرحیم بدانکە این عالمرا خدای تعالی بر دوازدە رکن بیافرید و چهار طبع و هفت قائمە و سال نیز دوازدە ماهست. چنانکە مشهور است ...

ـ [لاپەڕە ٢٣٤:] ... تلخ شدن دهان و سرگشتن و تاریکی چشم و سفیدی چشم، ریختن موی، سفید شدن بی وقت و ترقیدن دست و پا و تب لرزه و از پس گرم شدن دست، جوشش معده و درشتی زبان و درد سپرز و بعضی قولنج... سوختن قضیب و درد پهلوی راست و آرزوی طعام و گرمی و خشکی یرقان و کاهلی تن همی از صفراست...

ـ [لاپەڕە ٢٣٣:]... اگر خواهی خون را ساکن کنی و صاف گردانی بگیر خرمای هندی که تمرهندی باشد و آلوی سیاه و سنجد کرمانی بگلاب ترکی و ٣ روز بناشتا بخور خون ساکن شود و صاف گردد... لقمان حکیم گوید هرکس پیاز خورد معدەاش تباه شود و ضعف در جگر آرد و درد شکم و گرده و سستی اعضاء بیخته و عروق پدید آید و هر کس بسیار سخن گوید درد شقیقه آرد صرفه پیدا کند و هر کس با زنان بسیار صحبت کند گردەاش ضعیف گردد...

ـ [لاپەڕە ٢٣٢:]... ابی‌طاهر گوید هر که بول و غائط را نگاه دارد سنگ مثانه پیدا کند و گرده را ضعیف کند و معده را سرد کند... هر که کنده کورگ با روغن بپزد و بخورد خونی که از بواسیر است قطع کند. و هر کس کنده نارا؟ بجاید و بر زخم نهد خونش قطع شود... [لێرە کاتب ناوی کوردی کەورگی هێناوە].

ـ [لاپەڕە ٢٣١:] ... عیسی حکیم گوید هر که آب لاله را در سر مالد درد شقیقه را ببرد و شبکوری را برطرف کند و اگر لاله را بکوبد بر پیشانی ببندد خون را از بینی بازدارد. بوعلی گوید هر که پیاز در آتش پخته کند چند نوبت بخورد و با روغن گاو ممزوج سازد با عسل بجوشاند و بخورد شهوت را زیاد کند. هر کس زن حامله را شیر دوشد و بر آب ریزد اگر بر زیر آب رود دختر است و اگر بر آب ایستد پسر است...

ـ [لاپەڕە ٢٣٠:] ... پودینه دشتی هرکه بسیار خورد بلغم را زائل کند و بادها را بکشد و معده قوی کند و هرکه پودینه را خشك کند با شکر بخورد اندوه دلبر ببرد. اگر پودینه در خانه نهد دیو از آن خانه بگریزد و هر کس بیخ دندان آماس کرده باشد کتیره گون با سوخته نان ممزوج سازد و بر دندان نهد به شود...

ـ سەرەتای لاپەڕەی ٢٣٥ هاتووە:

*دوای [ناخوێنریتەوە] سپرز ناخونك و [ناخوێنریتەوە] و علتهای گوناگون [ناخوێنریتەوە] ١ [واحد]، روح توتیا ١، کف دریای پوست کنده ١ [ناخوێنریتەوە] نیم، نوشادر ١ و کافور ١.*

*دوای درد دندان: نمك ١ [واحد]، تماکو [= تنباکو] ١، زاخ، فلفل ١، طلا کند بر سر*

*دندان نهد به است.* لێرە کاتب گیای تەماکۆی بە هەمان ناوە کوردیەکەی نووسیوە.

**ناونیشانی ناوەرۆک و ڕواڵەتی دەستنووسەکە**

* قەبارەی ئەم بەیازە (کەشکۆڵ) ١/٥*٧*١۶ سانتیمترە
* ٣٣٦ لاپەڕەیە (١٦٨ پەڕە)
* دیارە کە لە سەرەتا و کۆتای بەیازەکە پەڕەی داکەوتووە.
* لە چەند شوێن مۆرێکی ڕەشی پێدا کوتراوە. [ناو مۆرەکە: عبد حکیم حسینی ١٢٢٩]
* ئەم بەیازە بەرگێکی ڕەشی چەرمی پێوەیە و چەند پەڕەیەکی کۆتایی لە جزوبەند و بەرگەکەی جیا بووەتەوە.
* سەرەتای بەم هۆنراوەی (قصیده) سەعدی شیرازی دەستی پێ کردووە: *"... اقرار می‌کند دو جهان بر یگانگیش / یکتا و پشت عالمیان بر درش دو تا / گوهر ز سنگ خاره کند لولو از صدف / فرزند آدم از گل و برگ گل از گیا ...* "و بەم هۆنراوەی مەلا مستەفا بێسارانی کۆتایی هاتووە: *"بە وێنەی مەجنوون ڕوو کەرۆ وە بەر / زەمین بە هووناو [وشەکانی نارِوونە و کەناری ڕووشاوە، بەڵام ئەمەیە:] دیدەم کەرۆ تەر]".*
* فایلی ئێسکەنکراوی ئەم کەشکۆڵە بەداخەوە ژمارەی لاپەڕەکانی لە کۆتاییەوە بووە بە سەرەتا. ئەوەیکە لە فایلەکە سەرەتا شێعری سەعدی شیرازییە لە ئەسڵدا لە شێعرەکانی مامۆستا بێسارانی دەستی پێ کراوە و دیارە لە ڕووی *[ولە، ولە دام ظلە و معدومی دام ظلە]* کە ئەو کاتبە ئەم بەشەی کەشکۆڵەکەی لە سەردەمی ژیانی مەولەویدا نووسیوە. یەکەم مێژوو کە لە دەستپێکی ئەم کەشکۆڵەدا هاتووە لە لاپەڕە ٢٤٠ پاش پێڕستی ناوی ئەندامەکانی جەستەی مرۆڤ، ساڵی ١٢٧١ کۆچی نووسراوە. هەروەها دوای شێعرەکانی مەولەوی و پاش شێعرێکی فارسی کە سەبارەت بە یوسف و زلێخایە لە لاپەڕەی ٢٥٣ مێژووی ساڵی ١٢٨٧ [کۆچی] پێوەیە. کەواتە ئەم بەشەی کەشکۆڵەکە کە باسی بێسارانی، ئەحمەد بەگ و مەولەوی کردووە لەم ڕۆژگارەدا نووسراوە. هەر ئەم کاتبە لە لاپەڕەی ١٥١ نووسیویە: *[تاریخ مرحوم مبرور جنت جاه میرزا اسدالله در شب شش شهر شوال المکرم برحمت ایزدی پیوست فی سنه ١٢٨٥. بە خەتێکی تر دوای ئەم لاپەڕەیە نووسراوە: تمت شد از حالت [ناخوێنرێتەوە] ١٢٨٤.]* خەتەکە دیارە کاتبێ ترە. کەواتە ئەم بەشەی کەشکۆڵەکە تا ساڵی ١٢٨٤ کۆچی نووسراوە. ئەوکاتە ئەحمەد بەگ و مەولەوی لە ژیاندا بوون.
* چەند تێبینی وردی ناو کەشکۆڵەکە:

ـ لە پەراوێزی لاپەڕەی ٤٢ نووسراوە: *کلام میرزا محمد صادق است [ناخوێنرێتەوە] ١٣٢٠*
ـ لاپەڕە ٤٤ نووسـراوە: یکشـنبه *[نـاخوینرێتەوە] ١٣٢٢ [: هـۆنراوەی هەورامـی] هەر چێـوم کەردن جە نافەرمانی*
ـ لاپەڕە ١٥٥ نووسراوە: *محمد امین الحسینی فی ٨ شوال ١٣٤٤*
ـ لاپەڕە ١٥٧ شێعرێکی هێناوە نووسیویە: *کلام شـهزاده فرهـاد اسـت: بـرای عبـرت مـردم بحکم شهزاده / به بیلك انـدر مقتـول شـد حسـن سـلطان....* لەو شـێعرە باسـی کوشـتنی حەسەن سوڵتانی هەورامان دەکـات بە دەسـتی فەرهـاد میـرزا والـی ئەردەڵان لە دەشـتی بەیەڵەی مەریوان.
ـ چەند مێـژووی مردنـی کەسـانێك لە سـاڵەکانی: ١٢٨٨، ١٣٠٧، ١٣١٠، ١٣١١، ١٣١٢ و ١٣٢٢ [کۆچی] پێوەیە.
ـ لاپەڕە ١٦٠ یەکێك لە کاتبەکان ناوی خۆی نووسیوە: *بخط عبـدالرحمن* [ئەم کـاتبە دیـارە کۆنترە و دەگەڕێتەوە بۆ پێش سەرهەڵدانی تەریقەتەکەی مەولانا خالید واتا پێش سـاڵەکانی ١٢٢٤ کۆچی، و یەکێ تر لە کاتبەکان چەند شـێعری هەورامـی خـۆی دانـاوە و نـاوەرۆکی شێعرەکانی زیاتر باسی تەریقەتی نەقشبەندی کردووە و لەسەرەوەی شـێعرەکان نووسـیویە: لراقمە. کەواتە ساڵەکانی کۆتایی سەدەی ١٢ و لە ناو سـەدەی ١٣ کتـابەتی بەشـی دیـکەی بەیازەکەی کردووە.]
ـ لاپەڕە ١٦١ تا ١٨٦ هۆنراوەی فارسی مەولانا خالید شارەزووری هاتووە.
ـ کاتب لە سەرەوەی لاپەڕەی ١٨٧ نووسیویە: *لراقمە*، و چەند هـۆنراوەیەکی هەورامـی دانـاوە.
سەرەتاکەی ئەمەیە: *نادانیم کەردەن نادانیم کەردەن / یا ڕەب جە درگات نادانیم کەردەن.*
ـ لاپەڕە ١٨٩ هاتووە کە: *بجواب ملا صیدی.* واتا کاتبی بەشێك لەم کەشکۆڵە بۆخـۆی لەسـەر شێعری سەیدی وڵامی داناوە. لە لاپەڕەکانی تر دیسان کاتب شـێعری خـۆی دانـاوە و باسـی پیر و پیاوانی تەریقەتی نەقشبەندی کردووە. کەواتە کاتب هـاوچەرخ نەبـووە لەگەڵ سـەیدی هەورامی.
ـ لاپەڕە ٢٠١ دوو میژووی پێوەیە: کلیم [= گلیم] هفت توب [= توپ] ١٢٩٦، قـالی مسـجد دە توب رجب ١٢٩٨
ـ لاپەڕە ٢٠٢ خطبەی نیکاح کردنی هێناوە و ئەوکاتە مارەییی ژن بەرابەر بە ٦ تـمەن بـووە و ئاماژەی بە ڕستە کوردیەکان ناو خطبەکە کردووە: *قول الولی بکردی* [: هێنانە سەر ڕێنووسـی ئەوڕۆ] *فاطمە کەنیشکم ئیزن داگە بە من، دام بە تۆ ژنی بە حەڵاڵی بە هامخەوی شـەرعی لە*

*سەر دە تمەن رایج دارالخلافە تاران ریال ناسرەدین شاهی بیست و هەشت نخودی پەنج عەباسی ڕەواج. قول الزوج بە کوردی: قەبووڵم کرد فاتمە کەنیشك تۆ ئیزن داگە بە تۆ بۆخۆم بێژنی ...*

ـ لە لاپەڕە ٢٠٥ شێعری هەورامی شاعێرێکی نەناسراوی هێناوە[1] و نووسیویە: *محمد عیسی بیگ فرمود.*

ـ لاپەڕە ٢٣٧ نووسراوە: *ای علم فهم، ای خشم الکافر، اسم مادر ابابکر صدیق رضی الله عنه سلما، اسم مادر عمر رضی الله عنه حنتمه، اسم مادر عثمان رضی الله عنه اروی، [و] اسم مادر مرتضی علی کرم الله وجهه فاطمه.* [ئەم کەشکۆڵە سەرەتاکەی وادیارە کەسێکی شێعە نووسیویە چونکا باسی ئیمام جەعفەر سادق و شێخی صدوق و بیر باوڕی شێعە لەسەر محرم (لاپەڕە ١٣٥) و چەند بابەتێکی دیکە وەکوو لە هۆنراوەکانی مەولانا خالێد نووسراوە (کلام مولانا خالد در نعت امام جعفر صادق و امام رضا) کردووە، پاشان کە چەند هۆنراوەیەکی هەورامی و سۆرانی و ئەم ناوهێنانەی چوار خەلیفەی بەڕێزەوە هاتووە و خطبەی مارەبڕین بەپێی باوی کوردەواری هاتووە، دیارە کاتب سوننی بووە.]

ـ لاپەڕە ٢٤٠ شێعرێکی شەفێع ناوێکی (لەوانەیە مەبەست میرزا شەفێع پاوەیی یا کولیایی بێت) هێناوە و لە ٢٤١ شێخ وەسیمی گەورە وڵامی داوەتەوە.

ـ لاپەڕە ٢٤١ شێعرێکی شێخ شەهابی کاکۆزەکریایی هێناوە و باسی لە سووتانی مزگەوتی میرزا فەرەجوڵا کردووە [ڕستەیەکی ناڕوونە: *فرج الە خان [ناخوێنرێتەوە] مسجد [ناخوێنرێتەوە] سوخته بود*].

ـ لاپەڕە ٢٤٦ ئاماژەی بە مردنی سێ شای ئێران کردووە و دیارە هەر کام کاتبێ نووسیویە. *تاریخ فوت محمد شاه قاجاری. آنروز فلك راند کجك[2] بر سر اوباش/ عباس جهان خسروی و شاه قزلباش. جمعی بنشتند که تاریخ ببندند/ ترکی ز میان خواست که من قارقیه برداش. وفات شاه عباس. وفات نادرشاه. نادر بدرك رفت.*

ـ لاپەڕە ٢٥٠ کاتب دیسان چەند دێڕە شێعری خۆی بە هەورامی هێناوە و نووسیویە: *تمت شد از حالت [ناخوێنرێتەوە] ١٢٨٤.*

---

١. لە لاپەڕە ٧٧ کەشکۆڵەکەی کتێبخانەی برلین (Hs.Or 9878) ناوی ئەم شاعێرە و هەر ئەم شێعرەی هاتووە. (سپاس بۆ کاك عەبدوڵا حەبیبی لە نۆتشە کە ئەم زانیاریە و ڕاستکردنەوەی چەند زانیاری دیکە بۆ ئەم وتارە خستە بەردەستم.)

٢. لەوانەیە مەبەست لە بەرد و کوچك بێت. لەم دەستنووسە پیتی (چ) بە (ج) و (گ) بە (ك) نووسراوە.

ــ لاپەڕە ٢٥٨ کۆتـایی شـێعرێکی مەولەویـیە لە وڵامـی نـامەیەکی خـاڵۆی کۆماسـی [کە نووسراوە:] *وقتیکە خالوی احمد بیگ دو کلیمە نویشتە کە چرا تدبیری برای من نمی‌کنـد و او نویشتە بود کە بدرد بی وفایی [ناخوێنرێتەوە] گرفتار شدەام این گورانی [= گۆرانی واتا شێعر] فوق نویشتە.* [سەرەتای وڵامەکەی مەولەوی لەم کەشکۆڵە لە لاپەڕەی ٢٦٠ هـاتووە:] *نامەکەت پەی چێش؟ پەرێ دەوای دەرد / یاواو خاس وانـام موتـاڵەعەم کەرد. ئـاخ داخـان نەشات جە بێخکەندە وێم / ڕای تەدبیر کەس پێ نەمەندە وێم... هـاوار یـانێ هـای خـاڵۆم نەشنەفتەن / جە تۆ کەسێ تەر خاستەرم کەفتەن...*

ـ لاپەڕە ٢٨٦ شێعرێکی ئەحمەد بەگی کۆماسی هێناوە: *نویشتە احمد بیگ بنـزد معـدوم[:] ئەر بۆ پڕووزێ وە مەڵاڵەوە / یاوان وە لای تۆ جە شەماڵەوە. ئەوە [= ئانە] بۆپڕووز سـفتەی جەرگمەن / مەعلوومەن مەعـدووم وادەی مەرگـمەن. در جـواب معـدومی اسـت دام ظلـە* [ئارەزووی ئامای مەرگ وێت کەردەن / گۆیا خەلاصیت وە دڵ ئـاوەردەن. هەی پەی وێـت نەوۆ دۆسەکەی گیانی / صەد بۆپڕووز بۆ تۆ هەر بمانی. ئەم وڵامە لەم کەشـکۆڵە نەهـاتووە. لاپەڕەی ٩٣٣ دیوانی مەولەوی، مامۆستا عەلـی قەرەداغـی و چاپەکـانی دیـکەش هـاتووە.]. دیسان لە ڕووی دەستەواژەی دام ظلە دیارە کاتێ ئەم کەشکۆڵە نووسراوە مەولەوی زیندوو بووە.

*ـ لاپەڕە ٣٠٢ی ئەم کەشکۆڵە شێعرەکەی مەولەوی هاتووە کە کاتی خـۆی بـۆ ڕۆحیـانەتی شێخ حەسەن مەولاناوای داناوە. [لاپەڕە ٥٩٨ دیوانی مەولەوی، مامۆسـتا عەلـی قەرەداغـی نووسیویە: ئەم شێعرە کاتێ پەریزاد خانم کچی موحەمەد پاشای جاف شێت بووە و چووەتە سەر گڵکۆی شێخ حەسەن لە مەولانـاوای سـەقز کە چـاك بێـتەوە و مەولەوی لە تەمەنـی پیری و کەنەفتیدا بووە، [نەواچی: من پیر ئوفتادەی دڵـڕێش...] نووسـیویە. لەم کەشـکۆڵەی بەردەست نووسراوە: ولە [واتا معدومی] خطاب بە شیخ حسن مولانابادی قدس سرە العزیـز [:] بوڵبوڵ گوڵشەن بێ نام و نەنگی / تەزەروو سەر سەرو باغچەی بێڕەنگی...*

ـ لاپەڕە ٣١٦ کە شێعری مەولەوی تاوگۆزی هێناوە، ناوەکەی بە (*معـدومی دام ظلـە*) دانـاوە، واتا نازناوە سـەرەکیەکەی. خـاڵی گرینـگ ئەوەیە کە دام ظلـە بە واتـای هەبـوونی سـێبەری بەردەوام بێت، دێت ئەوەیە کە ئەوکاتە ئەمە کتابەت کراوە مەولەوی زیندوو بـووە واتـا پـێش ١٣٠٠ کۆچی.

## تێبینی کۆتایی

* ئەسڵی ئەم کەشکۆڵە ئێستە لای کاک فەرزاد ئەسەدپوور لە سنە دەپارێزرێت و لە کتێبخانەی دیجیتاڵی بەندە (پەرتووکخانەی باقلاوا) بە پێناسەی (Ku(hor.sor).Fa.Ar.x) فایلی ئێسکەنکراوی هەڵگیراوە.

* دەسپێکی نووسینی دەوروبەری ساڵەکانی ١٢٨٠ تا ١٢٩٠ کۆچی بووە و دواتر کەسانیتر دەستیان داوەتە نووسینی و تا ساڵەکانی ١٣٢٢ کۆچیش هەر کتابەتی درێژەی هەبووە. ڕێك ئەوکاتە بووە کە کەسانێك وەکوو ئەحمەد بەگی کۆماسی و مەولەوی تاوگۆزی لە ژیاندا بوون.

* بەشی پزیشکیەکەی دیارە کە کاتب هەندێك کەڵکەڵەی بواری پزیشکی و بەتایبەت گیادەرمانی بووە و ڕەنگ و بۆنی کوردی ڕەچەتە دەرمانیەکانی دیارە.

* کۆپی فایلی ئێسکەنکراوی ئەم کەشکۆڵەم داوە تویژەرانی بواری بەڵگە و دەستنووسەکانی کوردستان، وەکوو:

* کاك موحەممەد ڕەشید ئەمینی لە پاوە کە لە بواری کۆکردنەوەی گەنجینەی هۆنراوە هەورامیەکاندا چەندین بەرهەمی وەکوو کەشکۆڵی هەورامان خستووەتە بازاڕ و دیسان بۆ داهاتوویش بەردەوامە.

* کاك عەبدوڵا حەبیبی لە نۆتشە کە ئێستاکە خەریکی نووسینەوەی دیوانی سەیدی هەورامییە.

* کاك کاروان عوسمان خەیات لە کەلار کە لەسەر دیوانی ئەحمەد بەگی کۆماسی تویژینەوەی کردووە و دیوانێکی چاپ کردووە و چەندین کاری دیکەی لەبەردەستدایە.

وێنەی ڕواڵەتی کەشکۆڵەکە



**لاپەڕەی سەرەتای کەشکۆڵەکە (هۆنراوەی مامۆستا بێسارانی)**



وێنەی هۆنراوەیەك لە كاتبی یەكەم (نادانیم کەردەن، یا ڕەب جە درگات نادانیم کەردەن) و مۆری واقف یا کاتب





## نموونەی چەند لە بابەتە پزیشکیەکانی ناو دەستنووسەکە

**(وێنە ١)**



## چەند هۆنراوەیەکی مەولەوی تاوگۆزی و ئەحمەد بەگی کۆماسی







## ڕێکەوتەکانی کاتبی یەکەم کە بە پەراوێزی لاپەڕەکانەوەیە







## هۆنراوەی شێخ شەهابی کاکۆزەکریا و میرزا شەفێع



## بابەتی لاوەکی ناو دەستنووسەکە



## دەستنووسێکی پزیشکی موحەممەد زەکریای ڕازی (٣١٣-٢٥١ کۆچی) لە ئاکرێ

کورد گوتەنی: قسە قسە دێنێت یا باس باس ڕائەکێشێت. مانگی گولانی ١٣٩٧ لە کونفرانسی ناودەوڵەتی زاب لە زانکۆی جۆلەمێرگ بەشدار بووم و وتارێکم لەسەر گەورە پزیشکی بادینان لە سەردەمی عوسمانیەکان، ئێسماعیل حەکیمی سلێڤانی پێشکەش کرد. لەگەڵ گەلێک دۆست و هاوڕێی توێژەر و نووسەری باکوور و باشووری کوردستان ئاشنا بووم و ڕێگەی پێوەندیمان بۆ ئەورۆ و داهاتوو کردەوە.

ڕۆژی یەکەم نۆرەی پێشکەش کردنی وتارەکەی بەندە بوو. لە خوێندنەوەی وتارەکەدا ئاماژەم بەوە کرد کە بریا ئێمە توێژەرانی هەموو پارچەکانی کوردستان ڕێگەیەکی پێوەندی هاوبەشمان هەبوایە کە ئاگەداری ئەرشیف و بەرهەمی یەکتر بوایەین. چونکە بۆ نموونە لەسەر بواری پێشینەی پزیشکی لە کوردستان گەلێك دەستنووس و بەڵگەی کۆن هەیە کە بەداخەوە تا وەکوو ئێستە زۆربەیان لە کون و قوژبنی ماڵاندا شاردراونەتەوە و نیشان نادرێن. پاش وتارەکە خۆشبەختانە چەند هاوڕێیەکی خۆشەویست هەواڵی تازەیان لە دەستنووسی پزیشکی پێدام. یەکەمیان ئەندازیار بلەند شوکری مزووری باسی لە دەستنووسێکی کۆنی پزیشکی کرد لە ئاکرێیە. کاك بلند شوکری وەچەی کەڵەزانای گەورەی کوردستان مەلا یەحیای مزوورییە (مردن: ١٨٣٩) و تەمەنی ٦٢ ساڵە و سەرپەرشتی پرۆژەی سایلۆی شارۆچکەی ڕۆڤیایە لە ئاکرێ و توێژەرێکی توانایە لەسەر بەرهەم و نووسینی باب و باپیرانی. ئەم بەڕێزە وتارێکی تێروتەسەلی لەسەر بەرهەم و نووسینەکانی مەلا یەحیا پێشکەش کرد. کاك بلند هەواڵی دەستنووسی پزیشکی ڕازی دا لە ئاکرێ. دووهەم دکتۆر هێمن خۆشناو مامۆستای بەشی کوردی زانکۆی ماردین باسی لە پرۆژە و تێزی دکتۆرای کوڕێکی کورد بە ناوی دکتۆر تەکین کرد کە لە زانکۆی ماردین کار لەسەر کۆکردنەوە و تۆماری ڕەچەتە و شێوازە دەرمانیەکانی کوردەواری ناوچەی کوردنشینی سەمسوور لە پارێزگای ئادیامان دەکات. سێهەم دکتۆر ئەرگین خەڵکی ناوچەی شەمزینان و مامۆستای زمانناسی زانکۆی ئۆپسالای سوید، باسی لە کتێبی پزیشکی شێخ موحەممەد ئەرواسی وانی کرد کە دەستنووسێکی لای بەرێزیان پارێزراوە.

**باسی دەستنووسەکەی ڕازی**

لە جۆلەمێرگ هەندێ زانیاری پێویستم لە کاك بلەند وەرگرت. هەروەها مامۆستا هێرش کەماڵ ڕێکانی کە ئەویش خەڵکی شیلادزێ ئامێدییە و بەرپرسی گۆڤاری نیژەنە[1]، باسی ئەو

---

١. نیژەن گۆڤارێکە و بابەتی مێژوو، بەڵگە و دەستنووسەکانی ناوچەی بادینان و هەکاری و ئامەد چاپ دەکات.

دەستنووسەی کرد کە بەڵێ ئەویش ئاگەدارە ئەو دەستنووسە لە کتێبخانەی بنەماڵەی ئیمام هەڵدەگیردرێت لە ئاکرێ. دیسانەوە ڕێکەوتی ١٣٩٧/٠٣/١٣ پێوەندیم بە کاك بلەند گرتەوە و هەندێ زانیاری دیکەم بە دەست هێنا. ئەڵبەت ئەمجارە قۆناغێ تازە چووینە پێشەوە کە بتوانین لەگەڵ بنەماڵەی ئیمام لە ئاکرێ پێوەندی بگرین تا دەستنووسەکە لە نزیکەوە ببینین یا لانیکەم وێنەی چەند لاپەڕەی بە دەستمان بگات.

کاك بلند و چەند کەسێکی دیکە ساڵی ٢٠١٣ لە زانکۆی پەروەردەی ئاکرێ پێشانگای بەڵگە و دەستنووسە کۆنەکانی بنەماڵەیی خۆیان نمایشت ئەکەن. لە بنەماڵەی ئیمام دکتۆر عبدالحق بەشدار دەبێت و چەند کتێب و بەڵگە لە بنەماڵەی خۆیان نیشان ئەدات. ئەم دکتۆرە خوشکەزای مەلا موحەمەد، ئیمامی ئێستەی مزگەوتی گەورەی ئاکرێیە و دکتۆرای شەریعەی ئیسلامی هەیە. یەکێك لەوانەی کە دکتۆر عبدالحق پەردەی لەسەر لا دەبات، دەستنووسێکی کتێبی پزیشکی ئەبووبەکر موحەمەد ڕازیی بووە. هەر ئەوەندە لە ناوی ئەو کتێبە تا ئێستە بە ئێمە گەیشتووە کە دەستنووسێکی کۆن و پەڕەزەرد و دڕاوە کە دەوری ٦٠٠ لاپەڕە دەبێت و پڕە لە وێنەی گیا و کەرەستەی پزیشکی و ئەندامی نەخۆش و بابەتی دیکە. بە بۆچوونی کاك بلەند و قسەی بنەماڵەی ئیمام ئەم دەستنووسە ٣٠٠ ساڵ لەمەوبەر نووسراوە و دەست بە دەست هاتووە.

بنەماڵەی ئیمام یەکێك لە ناسراوترین بنەماڵەکانی ناوچەی بادینان و دەڤەری ئاکرێن. پاش مردنی مامۆستا هەیبەتوڵای مزووری ئیمامی مزگەوتی گەورەی ئاکرێ لە ساڵی ١٩٥٥، میراتی ئیمامەت و پێشنوێژی ئەو مزگەوتە لە مزووریەکانەوە بە بنەماڵەی مەلا موحەمەد ئیمام گەیشتووە و کتیبخانەی مزگەوتی ئاکرێ ئەچێتە ژێر سەرپەرستی و چاوەدێری ئەو بنەماڵەیە. ئێستاکە مەلا موحەمەدی کوڕی مەلا ئەحمەد کوڕی مەلا ئەحمەدی گەورە لەو مزگەوتەیە ئیمام و پێشنوێژی دەکات. ئەو مەلا موحەمەدە ئێستە تەمەنی ٧٥ ساڵە و تا ساڵی ٢٠١٣ سەرۆکی زانایانی ئیسلامی هەرێمی کوردستان بووە و ئەو دەستنووسە پزیشکییە لە کتێبخانەی ئەواندا پارێزراوە.

بەهەرحاڵ دەبێ یەکێ لە کتێبە پزیشکیەکانی ڕازی بێت کە هیوادارم بە زووترین کات بزانین کام لەو کتێبانەیە کە سەردەمانێك پێشینیانی ئێمە بۆ کاری پزیشکی و دەرمانگەری خۆیان سوودیان لێ وەرگرتووە. ڕازی ٩٨ کتێب و نامیلکەی پزیشکی نووسیوە، وەکوو: الحاوی، طب المنصوریه، الفصول فی الطب، طب الفقراء، القرابادین کبیر و صغیر، طب الملوك، القولنج، منافع السکنجبین و ...

## کۆنترین دەستنووسی (طب میزان)[1] لە بانە دۆزرایەوە

بەهاری ١٣٩٥ لەگەڵ کاك جەلال ڕەئووفی سەردانی نووسینگەی گۆڤاری کەشکۆڵمان کـرد لە مەهاباد. وەك لە پێشدا هەماهەنگیمان کردبوو، کـاك مـوحەمەد عەبـدولی بەرپرسـی ئەو گۆڤـارە هەنـدێك سـەبارەت بە بـواری بەڵـگە و دەستنووسـەکانی کـوردەواری و چـۆنیەتی دیجیتاڵی، ناسنامە و ڕێکخستنەکانی ئەو کەلەپوورە گرینگە کە لە کتێبخانە شەخسـیەکانی ئاوایی و شارەکانی کوردستان هەڵگیراون، زانیاری پێداین. پاش ماوەیەك ڕۆژێك لە دووکـانی گیادەرمانی کاك جەلال لە بانە بەتەسەل دەستمان بە خوێندنەوەی دەستنووسێکی پزیشکی کتێبخانەی بەڕێزیان کرد. ئەوەی دیار بـوو لە ئەنجامەکەیـدا نـاوی ئەو دەستنووسـە (طـب میزان) نووسراوە. دواتر لە کتێبخانەی گیادەرمانی شەفا لە سنە کتێبـی چـاپکراوی (میـزان الطب)ـم وەرگرت. دیسـانەوە لەگەڵ کـاك جەلال ڕۆژێـك دانشـتینەوە و دەستنووسـەکە و کتێبەکەمـان پـێکەوە بەراورد کـرد. ئەو دەستنووسـە کـاتی خـۆی لە ئـاوایی بێلـوێ بانـە دەرکەوتووە و ئەسڵەکەی ئێستە لای مامۆستا سەعید کانیسکانییە لە سلێمانی.

پاییزی ١٣٩٥ لەگەڵ کاك جەلال سەفەرێکی باشـووری کوردسـتانمان کـرد. یەکێـك لە بەرنامەکانمان بەدەست هێنانی هەواڵی ئەسڵی دەستنووسی ناوبراو بـوو. سـەرەتا گومانمـان ئەوە بوو کە لەوانەیە دەستنووسەکە بە بنکەی ژین فرۆشراوە. کـاك جەلال هەوڵێکـی زۆری دا کە بتوانین لە نزیکەوە مامۆستا سـەعید ببینـین، بەڵام وادیـار بـوو کە بەهـۆی پیـری و نەخۆشییەوە هەلی قسە کـردن و بینینـی دەستنووسـەکە نەدەرەخسـا. بەیـانیەك بە تێـر و تەسەلی لەگەڵ کاك جەلال ڕەئووفی و کـاك جەلال سـەید کەریـم (بەرپرسـی ڕاگەیانـدنی کۆمەڵەی گیادەرمانانی سلێمانی) چووینە بنکەی ژین. ڕێکەوتێکی چاك بوو. لەگەڵ بـنکەی ژین و مامۆستا ڕەفیق سـاڵح ئاشـنا بـووین. دیـار بـوو کە دەستنووسـەکە بە بـنکەی ژیـن نەفرۆشرابوو و چارەنووسی هێشتا لای مەلا سەعید گیرساوەتەوە.

---

١. بە "میزان الطب"ـیش دەناسرێت.

## ئاوایی بێلوێ

بێلوێ یەکێك لە ئاواییەکانی شارستانی بانەیە سەر بە بەشی کانیسوورە. لە نزیك ئاواییەکانی زێویە، نجنێ و سیوچ هەڵکەوتووە. نزیکەی ٧٠ماڵێك لەو ئاواییە نیشتەجێیە. ساڵی ١٣٨٨ هەواڵی دەستنووسێکی پزیشکی نایاب لە کتێبخانەی بنەماڵەی شێخ سەمیعی بێلوێ بڵاو دەبێتەوە. دواتر مامۆستا سەعید کانیسکانی لە سلێمانی لەگەڵیان ڕێك دەکەوێت و بە نرخی ١٠٠ دۆلار دەستنووسەکە دەکرێت. کاك جەلال ڕەئووفی دەستنووسەکە بەئەمانەت وەردەگرێ و کۆپییەکی لەبەر دەگرێتەوە.

### ناسنامەی دەستنووسەکە

* کاتی خۆی زانیاری قەبارەکەی تۆمار نەکراوە، بەڵام وەك دەستنووسێکی ئاسایی ئەندازەی ٢١*١٥*٢ سانتیمتردا بووە.
* جۆری قاقەزەکەی کۆن و زەرد بووە.
* ئەسڵی دەستنووسەکە بەرگی پێوە نەبووە.
* کەناری پەڕە سەرەتایی و کۆتاییەکانی هەندێك دڕاوە.
* هەر لاپەڕە ١٥ هێڵی تێدایە و هەر هێڵ مامناوەند پێك هاتووە لە ١١ وشە.
* بە خەتێکی نەسخ نووسراوە. ئەندازەی خەتەکە مامناوەند وردە و جوان دەخوێنرێتەوە.
* وەك دەستنووسە کۆنەکانی تر لەبری ژمارەی لاپەڕە وشەی ئاوزەنگی (پاسەری: رکابە) دانراوە. ئەگەرچی دیارە دواتر لە گۆشەی سەرەوەی لاپەڕەکان ژمارەی لێ دراوە.
* ١١٥ پەڕەیە (٢٣٠ لاپەڕە). پێش دەسپێك ٧ لاپەڕە، یەك لاپەڕە لە ناوەڕاست و پاش ئەنجامەکە یەك لاپەڕە هاتووە کە جیایە لە دەقی سەرەکی دەستنووسەکە. ئەو چەند لاپەڕەیە بابەتی جۆراجۆری دەرمانی و پزیشکی و دۆعایە. کاتی خۆی کاتبی دەستنووسەکە و دواتر کەسانێ تر نووسیویانەتەوە.
* پەراوێزی دەقی دەستنووسەکە هەندێ یاداشت و ڕوونکردنەوەی نەخۆشی و گیا و وشەکانی دیکەی تێدایە. ئەمانە خەتی دوای کاتبی دەستنووسەکەیە. ئەو پەراوێزانە کاتێ دەستنووسەکە هاتووەتە کوردستان، نووسراون. چونکا هەندێ پەراوێز (بە ئاماژەی بلفظ کردی و بکردی) وشەی کوردی نووسراوە. [بۆ نموونە: دموکانە، قنچکە سلاو، تف، پازار، و تاد]
* لە چەند شوێنی پەراوێزەکاندا، ناو و ناونیشانی (محمود کور/ کویر، میرزا عبدالوهاب، حکیمی و فقر الاطبا) هاتووە. کۆتایی زۆربەی ڕستە و دەقی پەراوێزەکان (آە من محمود کور) نووسراوە.

* پەراوێزەکان جیا لە هەمبەر و ڕوونکردنەوەی هەندێ لە وشەکان، یاداشتی کتێبە پزیشکیەکانی دیکە وەکوو (تقویم الابدان، مخزن الادویه، طب الاکبر، تحفه مومن تنکابنی و قرابادین)ـیە.

* لاپەڕە ٨ دەستپێکی دەقەکەیە: "*بسم الله الرحمن الرحیم الحمد لله رب العالمین و الصلوات و السلام علی سید المرسلین و اله الطاهرین و اصحابه الطاهرین، اما بعد العبد الجانی محمد ارزانی المسمی محمد اکبر میگوید که چون اطفال فقیر و دیکر اعزه در صدد خواندن علم طب بودند مختصری که صبیانرا تعلم آن آسان بود و بعبارتی موجز که مشتمل بر فواید بسیار است تالیف نمودم و بمیزان طب موسوم ساختم حکیم مطلق بر سایر متعلمان مبارك مفید گرداند...*"

* لاپەڕە ٢٢٩ ئەنجامەی دەستنووسەکە: "*بعون الله تعالی لا اله الا الله محمد رسول الله تمام شد کتاب طب میزآن که از تالیف مسیحی نفس حکیم ارزانی شاه مرقوم بتاریخ دوم شهر رجب المرجب ١٢٠٧ هجری مقدس کاتب الحروف فقر حقیر احقر الناس عبدالرسول ساکن و مالك موصع[؟] شفیع پورداود عرف پندی حضرت کاکا صاحب*"[1]

## باسی نووسەر[2]

ساڵی ١٣٨٠ هادی نەسیری لە شاری قۆم لە ڕووی دوو دەستنووسی بەردەست، کتێبی (میزان الطب)ـی بەم ناونیشانە چاپ کردووە: *میزان الطب حکیم محمد ارزانی، چاپ اول، آبان ماه ١٣٨٠، قم، انتشارات موسسه فرهنگی سماء، ٣٢٦ لاپەڕە (گشت کتێبەکە)، ٢٢٣ لاپەڕە (دەقی سەرەکی میزان الطب)*

بەڕێز هادی نەسیری کتێبی (میزان الطب)ـی لە ڕووی دوو دەستنووس بەم ناونیشانانە چاپ کردووە:

* دەستنووسێك کە ١٨٤ لاپەڕەیە و ساڵی ١٢٦٦ کۆچی لە لاهووری پاکستان چاپ بووە. دەستنووسی بنەما و جێ متمانە ئەو نوسخەیە بووە.

* دەستنووسێك کە ١٩٠ لاپەڕەیە و ساڵی ١٢٦٦ کۆچی بە خەتی نەستەعلیقی موحەمەد حوسێن تێهرانی لە بەمبەیی هێند چاپ بووە.

---

١. ناونیشانی شوێنی کتابەتی ئەم دەستنووسە کە نووسراوە (*موصع شفیع پورداود عرف پندی حضرت کاکا صاحب*)، پێویستە توێژینەوەی زیاتری بۆ بکرێت تاکوو بزانین کوێ وڵاتی هێند یا ئێران دەکەوێت.

٢ زانیاریەکانی ئەم بەشە جگە لەوانەی لە ناو [ ]دایە، لە پێشەکی چاپی کتێبی میزان الطب (ئامادەکردن: هادی نەسیری) وەرگیراوە.

حەکیم موحەممەد ئەکبەر ئەرزانی یەکێك لە کۆتا حەکیمانی ڕێبازی پزیشکی کۆن ئەژمار دەکرێت. زانیاری زۆر سەبارەت بە ژیانی ئەو حەکیمە لەبەردەستدا نییە. ئەگەرچی زۆربەی سەرچاوەکان ئاماژە بەوە دەکەن لە سەدەی ١١ و ١٢ کۆچیدا ژیاوە.[١] حەکیم بۆخۆی لە سەرەتای کتێبەکانی بەو شێوە ناوی خۆی هێناوە: "*موحەممەد ئەکبەر کوڕی میر حاجی موحەممەد موقیم، ناسراو بە شاهـ موحەممەد ئەرزانی دێهلەوی*". ئەم کەڵەپیاوە چەندین کتێبی پزیشکی نووسیوە و سەردەمی خۆی سەرچاوەی گرینگ و سەرەکی حەکیمان و خوێندکارانی پزیشکی بووە. [موحەممەد ئەرزانی شاهـ کاتی خۆی لە شیراز هەستاوە و چووەتە دەرباری پاشایەتی ئەورەنگ زیب (١٠٦٧ـ١١١٨) لە هێند و باقی ژیانی لەوێ درێژە پێداوە.][٢]

کتێبەکانی حەکیم موحەممەد بەپێی مێژووی نووسینیان بەڕیزەوە ئەمانەن: *پوختەیەك لە کتێبی (طب النبوی) جەلالەدین سیووتی، طب الاکبر (طب اکبری)، تعاریف المراض (حدود الامراض)، میزان الطب (ساڵی ١١١٣ کۆچی نووسراوە)، مفرح القلوب، مجربات اکبری، مجربات هندیە، قرابادین قادری (ساڵی ١١٢٦ کۆچی نووسراوە) و علاج مفت.*

طب میزان چونکە کتێبێکە دەقیکی کورتکراوە و بە زمانێکی ساکاری پزیشکی نووسراوە. کاتی خۆی لە هێند و پاکستان وەك یەکەم کتێبی پزیشکی بۆ قوتابخانەکان دانراوە. ئەڵبەتە پێشتر لە وڵاتانی ئێران و هێند و پاکستان کتێبی (قانونچە چغمینی)[٣] وەك یەکەم کتێبی خوێندن بۆ قوتابخانەکان لە بواری پزیشکیدا لەبەرچاو گیراوە. بەپێی فهرستی کتێبە چاپیکراوەکانی فارسی، خانبابا مشار[٤] ئەم کتێبە ١٨ جار چاپ کراوە. یەکەم چاپی ساڵی ١٢٦٦ کۆچی بووە. بەشێکی زۆر لەو ١٨ چاپە، کتێبی طب میزان لەگەڵ نامیلکەکانی دلائل النبض، دلائل البول و مختصر البیان فی ضروریان البحران کە دانراوی حەکیم ئەرزانی شاهـ نیین، چاپ کراوە.

---

١. بەپێی ساڵی نووسینی میزان الطب و قرابادین قادری وێدەچێ کە حەکیم ئەرزانی شاهـ لە کۆتایی سەدەی ١٠ و سەرەتای سەدەی ١١ ژیاوە، نەك سەدەی ١٢

٢. حەکیم نیر واسطی، تاریخ روابط پزشکی ایران و پاکستان، چاپی یەکەم، پەخشانگای مرکز تحقیقات فارسی ایران و پاکستان، ١٣٥٣: لاپەڕە ٦٤٣

٣. کتێبی مفرح القلوب موحەممەد ئەرزانی شەرحێکە لەسەر پێنج وتاری سەرەتای کتێبی قانونچە چغمینی (نووسەر: حەکیم مەحموود چەغمینی، مردن ٧٤٥ کۆچی)

٤. خانبابا مشار، فهرست کتابهای چاپی فارسی، چاپی یەکەم، بنگاه ترجمه و نشر کتاب، تاران، بەرگی ١ ١٣٣٧) و ٢ (چاپ ١٣٤٢)

## ئەنجام

هیچ زانیاریەك سەبارەت بە گواستنەوەی ئەو دەستنووسە لە وڵاتی هێند بۆ کوردستان لەبەردەستدا نییە. گوایە ساڵانێکە دەستاودەست لە بنەماڵەی شێخ سەمیعی بێلوێ سوودی پزیشکی لێ وەرگیراوە و خوێندراوەتەوە. بەپێی ساڵی ڕوونووسی دەستنووسەکە کە ساڵی ١٢٠٧ کۆچییە، ئەم ڕێکەوتە دەبێتە نزیکترین کات لە سەردەمی ژیانی موحەمەد ئەرزانی شاهـ چونکە تا وەکوو ئێستە کۆنتر لەو ڕێکەوتە بۆ کتێبی طب میزان، دەستنووسێکی تر لەبەردەستدا نییە یا ئاشکرا نەبووە.

**وێنەی ١: لاپەڕەی سەرەتای دەستنووسەکە**



**وێنەی ٣: دەسپێکی دەقی دەستنووسەکە**



**وێنەی ٤: لاپەڕەی ناوەڕاستی دەستنووسەکە و ڕەچەتەیکی جیاواز لە دەقی کتێبەکە**



**وێنەی ٥: وێنەی پەراوێزەکان کە ئاماژەی بە کوردی کوردووە**



**وێنەی ٧: ئەنجامەی دەستنووسەکە**



بۆ توێژینەوەی ئەمجارە ڕێمان کەوتووەتە ئـاوایی شیواشـان. ئەم گونـدە کەوتـووەتە نێـوان دەشتی شۆربێ[1] لە پشتی چۆمی کەڵوێ[2] و داوێنی لێرەواری شاری سەردەشـت. وەك دیـارە باراناو و ئاوەڕەوی شاری سەردەشت دەڕژێتە چۆمی شیواشـان و خـۆی دەگەیـنێـتە چـۆمی کەڵوێ. سەردەمانی کۆن تا ئەم دواییانە ئەو چۆمـاوە چەنـد ئاشـی گەورە و بچـووکی پـێ گەڕاوە. هەر بۆیە بە شیواشان ناسراوە، واتا دۆڵی ئاشەکان.

یەکێك لە بنەماڵە ناسراوەکانی شیواشان، بە خێڵی ناسری یا مەلا قادر دەناسـرێ. گـوایە چەند پشتی ئەم بنەماڵەیە مەلا و میرزا بووە و خوێندەواری نەریتێکی باو بـووە لە ناویانـدا. مەلا عبدالقادر ناسری دەوروبەری ساڵەکانی ١٢٨٠ هەتـاوی بە دنیـا هـاتووە و سـاڵی ١٣٦٥ هەر لەو ئـاواییە کـۆچی دوایـی کـردووە. بەپێـی گێڕانەوەکـان و شـوێنەواری تەکـیەی قادریەکان، کاتی خۆی کاك ئەحمەدی شێخ لە سەردانێك بۆ ناوچەکە سـەردانی شیواشـانی کردووە.[3] گومان لەوەدایە کە سەردەمێك شیواشـان پێگەیەکـی گرینگـی تەریقەتـی قـادریە بووە. ئەم ئاواییە لە کۆندا حوجرەی فەقێ و خوێندەواری تێـدا بـووە. بـاب و بـاپیرانی مەلا عبدالقادر مامۆستای ئەو حوجرە و مزگەوتەیە بوون. دەگێڕنەوە گەلێك کتێب و دەسـتنووس

---

١. گوایە سەرەتا شار لە دەشتی شۆربێ بووە. ناوبەناو لە کەنار و ناو ئەم دەشتە شوێنەواری گۆڕستان و تەندوور و ڕەژی دۆزراوەتەوە.

٢. لە سەرچاوە فارسیەکاندا کەڵوێ بە (زاب کوچك) ناسراوە. سەرچاوەی کوێستانەکانی قەندیلە و دواجار دەڕژێتە بەنداوی دووکان

٣. تا ئەم دواییانە بینای تەکیەیەك لەم شیواشانە بووە. لە شێوەزاری خەڵکەکەدا "تەکە" بێژە دەکرێت. گوایە سەردەمانی زوو کاك ئەحمەدی شێخ [و هەندێك دەڵێن مەلا مارفی نۆدێیی] بە سەفەرێك هاتووەتە ئەم ناوچەیە و سەفەرێکیشی بۆ ئەم ئاواییە و لای مەلا و حوجرەی ئاوایی کردووە و بینای تەکیەی بۆیان دامەزراندووە.

لە تاقچە و ڕەفەی ماڵی مەلا عبدالقادردا هەبووە. بەداخەوە لە سەروبەندی پیری مامۆستا و پاشان بەدوای کۆچی دواییدا کتێبەکان پەرژ و بڵاو بوونەوە یا فەوتان.

یەکێك لەو دەستنووسانە کەوتووەتە لای کاك یۆسف ناسری کوڕی کاك جەلیل کوڕی مەلا عبدالقادر. پاییزی ١٣٩٦ سەردانی ئەو بنەماڵەیەمان کرد لە شاری ڕەبەت. دەستنووسەکە لە قەبارەی ١٠*١٣ سانتیمترە و ١٠٠ لاپەڕە دەبێت. بابەتی دەستنووسەکە دۆعا و نووشتە و حەدیس و گێڕانەوەی کۆنە.

یەکێکی تر لەو دەستنووسانە پاش مەلا عبدالقادر دەکەوێتە لای کوڕە گەورەکەی، مەلا خەلیل[1] مامۆستای مزگەوتی ئاوایی نیسکاوێ. دەستنووسێکی کتێبی پزیشکی توحفەی حەکیم مۆئمن تونەکابونی بووە. لە زمانی نەوەکانی مەلا عبدالقادر چەند جار باسی ئەو دەستنووسەم بیستووە. بۆ دۆزینەوەی سەرەداوێك لەو دەستنووسە سێ جار سەردانی مەلا خەلیلم کردووە. ئەو زانیاریەی لەسەر ئەو کتێبە بە دەستم هێناوە ئەمانەی خوارەوەیە:

دەمێکە باب و باپیرانی ئێمە سەرەڕای مەلایەتی پیشەی دیکەیان بووە وەکوو دارتاشی، بەننایی و پزیشکی. بەتایبەت مەلا عبدالقادر زۆر جاران خەڵك بۆ پرس و ڕاوێژ لەسەر کێشە و گرفتی ڕۆژانە و کۆمەڵایەتی ڕوویان تێ کردووە. نووشتەی نووسیوە و تایبەت دۆعای کردووە بۆ دەردەدار و گرفتاران. دەیان جار نەخۆشی لێوە و شێتیان هێناوەتە لای مەلا عبدالقادر و دەستی بە سەریدا کێشاوە و دەرمانی بۆ داناوە و نەخۆش هێور بووەتەوە یا چارەسەر بووە. هەروەها خەڵك بۆ چاکبوونەوەی نەخۆشییان داوای ڕەچەتە و دەرمانیان لێ کردووە و ئەویش هەرچی بە بیریدا هاتووە پێی گوتوون. مەلا قادر لە بواری سپڵ کوتاندا شارەزا بووە. واتا ئەوانەی نەخۆشی سپڵیان بووە هاتوونەتە لای ئەو پیاوە و ئەویش تا سێ ڕۆژان بەیانیانە بە نەخوریتی نەخۆشی ڕاکشاندووە و بە دەم قورئان و دۆعا خوێندنەوە باری کولیی خەنجەرەکەی کوتاوەتە سەر ورگ و سپڵی نەخۆشەکە.[2]

یەکێك لە دەستنووسەکانی تاقچەی کتێبەکانی مەلا عبدالقادر دەستنووسێکی قەبارە گەورەی پزیشکی توحفەی حەکیم بووە. هەمیشە بە کتێبە پزیشکیەکەی مەلا قادر ناسیویانە. گوایە جارجارە خوێندوویەتیەوە و پارێزگاریشی لێ کردووە. مەلا خەلیل دەیگێڕێتەوە کە من هەر ئەوەندەم لەو دەستنووسە دەزانی کە ناوەرۆکەکەی پزیشکیە و

---

١. مەلا خەلیل تەمەنی سەرووی ٧٠ ساڵ دەبێت و ئێستە لە شاری ڕەبەت نیشتەجێیە.

٢. لە ناوچەی سەردەشت پیشەی سپڵ کوتان لەکۆندا بووە. سید محمد حوسەینی خەڵکی گوندی سوێرێ ئەویش ئەم کارەی کردووە و لە باب و باپیرانیدا فێر بووە. لەوێ بە سپڵ ئەنجنین ناسراو بووە.

ناوی توحفەی حەكیم تونەكابۆنییە. هەمیشە وەك دەستنووسێكی نایاب و دەگمەن هەڵسوكەوتم لەگەڵی كردووە و چەندین كەس هاتوونەتە ماڵمان بیكڕن، لە مامەڵەدا نەسازاوین. مەلا خەلیل دواجار ساڵی ۱۳۸۷ بۆخۆی دەستنووسەكە هەڵدەگرێت و لە بازاڕی ورمێ بە كتێبفرۆشێكی دەفرۆشێت بە پارەیەكی سەد هەزار تمەنی. بەداخەوە ئەو دەستنووسە بەو شێوەیە لە دەست ئەو بنەماڵەیە دەبێتەوە و ئیدی هیچ سەرەداوێك لە چارەنووسی دەستنووسەكە تا وەكوو ئێستە بەرگوێ نەكەوتووە.

ئەو جۆرەی مەلا خەلیل باسی دەكا قەبارەی دەستنووسەكە گەورە و درێژ بووە و بە خەتێكی خۆش و سەرنجڕاكێش نووسرابوو، هەروەها گەلێك پەراوێزی بە دەورەی دەقەكەیەوە بووە. لە ماڵپەڕی ویكیپیدیای فارسی لە باسی كتێبی توحفەی حەكیم تونەكابۆنیدا هاتووە كە: لە سەردەمی سەنعەتی چاپی سەنگی ئەم كتێبە لە ئەندازەی قطع رەحلی لە تاران چاپ دەكرا [كە دیارە ئەندازەیەكی گەورەیە.]

نموونەی كتێبی توحفەی حەكیم لە ناو حەكیمانی كۆنی كوردەواری زۆر بووە و بەشێكی بەرچاو لەو دەستنووسانە ئێستاكە لە ئەرشیڤی ماڵاندا بەرچاو دەكەون. تەنانەت حەكیمی گەورە شێخ عوسمانی دۆڕۆ یەكێك لە كتێبەكانی وا كەڵكی لێ وەرگرتووە كتێبی توحفەی حەكیمە بووە.[1]

۱. لە وتاری "هەندێك لە رەچەتە دەرمانیەكانی شێخ عوسمانی دووڕۆ" كە بۆ ئەم هەمایشە ئامادەم كردووە، باسی ئەم كتێبە و هەندێك زانیاری دیكە لەسەر ئەم حەكیمە گەورەی كوردستان كردووە.

## حەکیمانی بنەماڵەی مەولەوی و دەستنووسێکی کتێبخانەیان

کۆتایی مانگی گەلاوێژی ١٣٩٧ ئیدارەی میراث فەرهەنگی سنە دانشتنێکی ڕێك خست بۆ توێژەران و چالاکانی بواری مێژوو لە ژێر ناوی "حافظه ثبت جهانی". نوێنەرایەتی یۆنسکۆ لە تاران مامۆستا و وانەبێژی دانشتنەکە بوون. گەلێك ئەزموون و زانستی پێویست بۆ کاری بەڵگە و دەستنووس و بابەتە مێژوویەکانی کوردەواری فێر بووین. کاك ئێقباڵ عەزیزی یەکێك لە کارمەندانی دڵسۆزی ئەو ئیدارەیە هەواڵی دۆزینەوەی دەستنووسێکی پزیشکی پێمدا. ڕۆژی دووهەمی دانشتنەکە دەستنووسەکەم لە بەرێزیان وەرگرت و لەگەڵ کاك ئەمیر موحەممەدی[1] چاومان پێیدا خشاند و ئەوەی بەو چاوخشاندنە بەرچاو کەوت یاداشتمان کرد. وەك لە ناو و مۆری "عبدالقادر طبيب" کە لەسەر لاپەڕەکانی دەستنووسەکەدا بەرچاو کەوت، و هەروەها دۆزینەوەی ئەو دەستنووسە لە ناوچەی بانە، زانیمان کە کتێبێکە هی بنەماڵەی حەکیمانی مەولەوی بانە و مەهابادە.

### بنەماڵەی مەولەوی و حەکیمەکانی

ئەو خانەدانە لە بواری پزیشکی خۆماڵیدا کەسانێکی پسپۆڕ و شارەزایان تێدا بووە. بنچینەیان دەگەڕێتەوە بۆ کەسێك بە ناوی مەلا ئەبووبەکری کۆیی. مەلا عەبدولقادر مەولەوی ١٢٩٧ کۆچی مردووە[2] و کۆتایی ژیانی نیشتەجێی مەهاباد بووە. سێ کوڕی بووە: حاجی مەلا عەبدوڵا، حاجی موحەممەد شەریف و حاجی موحەممەد ئەمین. ئەو کوڕانە

---

١. یەکێك لە چالاکانی بواری بەڵگە و دەستنووسەکانی کوردستانە. مامۆستای قوتابخانەیە و نیشتەجێی سنەیە. بەتایبەت بە ئاواییەکانی ناوچەی لەیلاخ و کولیایی و کامیەران و سنە دەگەڕێت و کاری تۆماری بەڵگە و دەستنووسەکانی کتێبخانە شەخسیەکان دەکات.

٢. موحەممەد عەبدولی، "فهرست خودنوشت کتابهای کتابخانه شخصی ملا عبدالقادر کويی"، گۆڤاری مەهاباد، ژمارە ١٤٠، گەلاڕێزانی ١٣٩١

هاوشێوەی باوکیان لە پیشەی پزیشکیدا شارەزا بوون. عەبدوڵا چووەتە مەهاباد و موحەممەد شەریف لە سەقز گیرساوەتەوە. پێش شەڕی یەکەمی جیهانی (١٩١٤ــ ١٩١٨) حاجی موحەممەد ئەمین لە بانە دانیشتووە و بەرەی حەکیمانی مەولەوی لەو شارە دەگەڕێتەوە بۆ ئەو پیاوە. کۆتا کوڕی حاجی موحەممەد ئەمین کە لە بانە کاری پزیشکی خۆماڵی وەك پیشەیەکی پسپۆڕانە کردووە، مەلا ڕەحمان بووە (مردن: ١٣٥٩ هەتاوی).

[لەو دەستنووسەی بەردەستدا مەلا عەبدولقادر وەك "طبیب و کحال" ناوی هاتووە. "کحال" واتا پزیشکی بواری چاو.] لە نامەیەك کە لە ١٠ مانگی موحەڕەمی ١٢٨٥ عەزیز خان موکری بۆ مەلا قادری نووسیویە، داوای کردووە کە فریای کچەکەی بکەوێت و بچێتە بۆکان و چارەسەری چاوی تاج خانم بکات. چونکا هەر دوو چاوی بەهۆی نەخۆشی هاوڵە عەیبدار بووە. هەروەها وەلیعەهدی حکوومەتی قاجاڕ کاتی خۆی لە ذی‌الحجه ١٣٢٢ نامەی بۆ ئیدارەی سابلاغ نووسیوە کە ئاغا و موباشێرەکان باج و مالکانە لەو چەند ئاواییەی لای مەهاباد کە بنەماڵەی مەولەوییان تێدایە وەرنەگرن تا بتوانن بەئاسوودەیی خزمەتی پزیشکی خۆیان بکەن بە خەڵکی. هەروەها لە نامەیەکی دیکەدا شجاع الدوله لە ربیع الاول ١٣٣٠ بۆ عەزیز خانی موکری جەختی کردووە کە باج و مالکانەی ئەو چەند ئاواییە بگەڕێتەوە بۆ بنەماڵەی مەلا عەبدوڵا و حاجی موحەممەد ئەمین و باقی کوڕەکانی. لەو نامەیەدا دەستەواژەی "حکیم‌باشی حافظ الصحه ساوجبلاغ موکری" بەکاری هاتووە بۆ مەلا عەبدوڵا. ئەو پیاوە کەسێکی حەکیم بووە بۆ خەڵك و پیاوان و سەربازانی حکوومەت.[1] بنەماڵەی مەولەوی تا وەکوو ئێستاش پزیشك و حەکیمیان لێ نەبڕاوە.

لە وتارەکەی کاك موحەممەد عەبدولی کە پێڕستی کتێبەکانی مەلا قادر مەولەوی هێناوە، لە ٢٢ کتێب چەند کتێبی پزیشکی تێدایە: توحفه مؤمن تونەکابۆنی و بیان الطب تفلیسی لە یەك دەستنووسدا، دستور العلاج گۆنابادی، زاد المسافر[2] و چەند نامیلکەی دیکە لە یەك دەستنووسدا، خلاصة التجارب (بۆخۆی نووسیویە: مقبول الطب است)، درع الصحه، قرابادین کبیر و اسرار قاسمی (لە زانستی کیمیا).[3] دیارە کە کتێبخانەی ئەو بنەماڵەیە

١. موحەممەد ڕەئووف تەوەکولی، "جغرافیا و تاریخ بانه"، پەخشانگای تەوەکولی، ١٣٨٧، لاپەڕە: ٩٨-١٠٣

٢. ئەو دەستنووسە کەوتووەتە لای حەکیمی ناوچەی سارال، شێخ عەبدوڵا هەزارکانیانی. کۆپییەك لەو دەستنووسە ئێستە لای دکتۆر نەوید نەقشبەندیە لە سنە.

٣. موحەممەد عەبدولی، "فهرست خودنوشت کتابهای کتابخانه شخصی ملا عبدالقادر کویی"، گۆڤاری مەهاباد، ژماره ١٤٠، گەلاڕێزانی ١٣٩١

بەردەوام دەستنووس و نامیلکەی پزیشکی و زانستەکانی دیکەی پێ زیاد بووە. دەستنووسی "جامع الفواید: رساله علاج الامراض" کە لە بانە دۆزراوەتەوە، کتێبێکی پزیشکی کتێبخانەی مەلا قادر مەولەوییە. ئەو کتێبە لە پێرستی کتێبەکانی ئەو پزیشکەدا نەهاتووە کە ئەوکاتە بۆخۆی نووسیویە. وێدەچێ پاش نووسینی ئەو پێرستە هاتووەتە کتێبخانەکەی و لە ڕێگەی حاجی موحەمەد ئەمینی کوڕی کەوتووەتە دەڤەری بانە.

## ناونیشانی دەستنووسەکە

- ئەو دەستنووسە لە سووریتی بانە دۆزراوەتەوە. کاتی خۆی لە سندۆقێکی کۆندا بووە و کەوتووەتە لای کاك عومەر ئیسافی خەڵکی ئاوایی سوورێن.
- ئەسڵی دەستنووسەکە ئێستە لای کاك عومور ئیسافی لە بانە پارێزراوە. بەرواری ١٣٩٧/٠٥/٠١ سپێردراوە بە کاك ئێقباڵ عەزیزی کە لە ئیدارەی میراث فەرهەنگی سنە کاری ناسنامە و تۆماری بکات. ئێسکەنێك لەو دەستنووسە لە دەستنووسخانەی دیجیتاڵی هەرەس [کتێبخانەی کاك ئەمیر موحەمەدی لە سنە] و باقلاوا [کتێبخانەی نووسەری ئەم وتارە] هەڵگیراوە.
- دەستنووسێکە لە کتێبی "جامع الفواید: رساله علاج الامراض" کە "یوسف بن محمد بن یوسف هروی طبیب" ساڵی ٩١٧ کۆچی نووسیویە.
- ئەو کتێبە بە "طب یوسفی"یش ناسراوە. سەرجەم نەخۆشینەکانی مرۆڤی تێدایە و دەرمان و چارەسەرەکانی هێناوە. تا وەکوو ئێستە چوار جار چاپ کراوە. بۆ نموونە چاپی "طب یوسفی موسوم به جامع الفوائد، پەخشانگای چوگان، ١٣٩٣: ١٨٤ لاپەڕە". زیاتر لە سەد دەستنووس لەو کتێبە لە کتێبخانەکانی ئێراندا هەیە.[١]
- زوانی دەستنووسەکە فارسییە بە شێوەی هۆنراوە لە ٢٨٩ دێڕ، لەسەر کێشی "لا حول و لا قوة الا بالله".[٢]
- ئەم دەستنووسە ٧٢ پەڕەیە (١٤٤ لاپەڕە)
- قەبارەی دەستنووسەکە" ٢٢*١٥*٢ سانتیمەترە
- ڕەنگی قاقەزی دەستنووسەکە زەرد هەڵگەڕاوە و چەند لاپەڕەی سەرەتای ڕەنگی

١. الهام عمارتکار و زەهرا کەریمی، "معرفی منظومه طبی جامع الفوائد"، فصلنامه تاریخ پزشکی، ژماره ٢٤، ١٣٩٤

٢. هەمان سەرچاوەی پێشوو

شینە.

• دەستنووسەکە بەرگی پێوە نەماوە و شوێنەواری دڕان و لەتبوون و تەڕبوونی پێوەیە.

• سەرەتا و کۆتـایی دەقەکە و لە چەنـد شـوێنی نـاو دەستنووسـەکە نووسـراوە: *العبـد المذنب [ناو مۆرەکە: عبدالقادر] طبیب*

• شوێنی کتابەت و نـاوی کـاتبی پێـوە نیـیە، بەڵام خەت و شـێوەی "العبـد المـذنب عبدالقادر طبیـب و کحـال" لە دەقـی دەستنووسـەکە دەچێـت. ئەگەر ئەمە لەگەڵ خەتـی دیکەی ئەم پیاوە لە دەستنوسەکانی تر یەك بگرێتەوە، کەواتە ئەم دەستنووسـە بە دەسـتی عبدالقادر طبیب خۆی نووسراوە. ئەڵبەت لە پەراوێزی یەکێك لە لاپەڕەکان باسـی دەرمانێـك کراوە و لە کۆتاییەوە نووسـراوە: "... *نوشـتـه شـد در روز چهارشـنبه تمـت محمـد صـالح*". شێوەی خەتی ئەم پەراوێزە تەواو لە خەتی دەستنووسەکە ئەچێـت. کەوابـوو ئەگەر "العبـد المذنب عبدالقادر طبیب" خەتی عبدالقادر کۆیی نەبێت و دەستنووسەکە بۆ ئەو نووسرابێ و مۆری لێ درابێت، ئەوە کاتبی ئەم دەستنووسە کەسێك بووە بە ناوی "محمد صالح".

• دەقی دەستنووسەکە بە "*العبد المذنب [ناو مۆرەکە: عبدالقادر] طبیب و کحال. بسـم الله الرحمن الرحیم و به نستعین. حمد نامحدود حکیمی را کـه بقـانون حکمـت و کامـل الصناعه رحمت نافع انواع امراض و دافع اصناف اعراض است جلت آلاؤه و عمـت نعمـاؤه و درود نامعدود رسولی را که بهادی رسالت و زبده نبوت طبیب غیوب امـت و شـفاء صـدور ملت است صلی الله علیه و آلی اجمعین الی یوم الدین و بعد چنین کوید بنـده ضـعیف و کمینه المستشفی بشفاء النافع المحب یوسفی ابن محمـد ابـن یوسـف الطبیـب سـتر اللـه عیوبه و غفر ذنوبه که چون بتوفیق حضرت فیاض رساله علاج الامراض که علاج هر مـرض و دوای هر عرض در وی مذکور است...*" دەستی پێ کردووە.

• دەقی دەستنووسەکە بە "*کافی بود از مخلصه یك مثقـالی شـربت یعنـی آشـامیدن و سیم یعنی زهر است و مخلصه تخم است شبیه بتخم کشنیز و طریق اختیـار کـردنش آن است که یکمثقال [یەك وشە ناخوێنرێتەوە] نیمکوب ریختـن در نیم پیالـه آب خوشـانید تـا به نیمه آید صاف کنند و بده مثقال قند سـفید شـیرین کـرده و دو درم روغـن زیـت یـا روغن کاو اضافه نمایند و نیمکرم بیاشامند و غذا [یەك کەلـیمە نـاخوێنرێتەوە] بشـیر کـاو خورند نافع باشد. انشا الله تعالی. تم تم تم. العبد المذنب [ناو مـۆرەکە: عبـدالقادر] طبیـب*" کۆتایی هاتووە.

**وێنەی ١: ئەرشیڤی کتێبخانەی مەجلسی شۆرای ئیسلامی لە تاران، کۆدی کتێبخانە ٨٩٣١/١**

**[وەرگیراو لە وتاری موحەممەد عەبدولی، گۆڤاری مەهاباد، ژمارە ١٤٠]**


کتابهای حقیر عبدالقادر کوی طبیب

موصل الطلاب قواعد الاعراب

**وێنەی ٣: لاپەڕەی کۆتایی دەستنووسی "جامع الفواید: رساله علاج الامراض"**



## نووسەر و حەکیم میرزا سدیق چنگیانی

لەو کاتەوە کە دەستم بە خوێندنەوەی سەرچاوە کشتوکاڵییەکان کردووە کتێبەکانی گەنجینەی دارستان و گژوگیا و ئاژەڵی میرزا سدیق چنگیانیم هەبووە. ماوەیەك کە ژیانم لە سلێمانی بوو لەگەڵ کۆمەڵەی گیادەرمانانی باشووری کوردستان ئاشنا بووم. زۆر جار پەیجۆری ئەوە دەبووم و لە ئەندامان پرسیارم دەکرد کە خاڵی دەسپێك و بنیاتنەری ئەو کۆمەڵەیە پێش ساڵەکانی ٢٠٠٤ کێ بووە. بەدڵنیاییەوە یەکێك لە دامەزرێنەرانی بیرۆکەی "کۆمەڵەی ڕوەکناسانی کوردستان"[1] خوالێخۆشبوو میرزا سدیق چنگیانی بووە. پاییزی ١٣٩٤ بە سەردانێك بۆ سلێمانی لەگەڵ کاك بورهان حوسەینی سەبارەت بە هاوکاریەکی ناوەندی گیادەرمانی شەفا و کۆمەڵەی گیادەرمانانی باشووری کوردستان شەوێك میوانی کاك سامان کوڕی میرزا سدیق چنگیانی بووین. ئێوارەکەی تاوێك لە دەرمانخانەی هەورامان لای کاك سامان دانشتین. گەلێك یادەوەری نووسین و وێنە، هەروەها ڕەچەتەی میرزا سدیق هێشتا لە دووکانەکەی – دەرمانخانەی هەورامان- لەبەردەستدا بوون. شەوەکەی دیسان چاومان بە چەند ڕەچەتەیەکی دەستنووسی میرزا سدیق کەوت لە ئەرشیڤی بنەماڵەکەیان. پێشنیاری ئەوەم خستە بەردەست بنەماڵەی میرزا سدیق، کە ئێوە ڕێگە بدەن و هاوکاری بکەن دەتوانین سەرجەم یادگاری و یادەوەری و وێنە و ڕەچەتە ئاشکرانەکراوەکانی میرزا

---

١. هەر چەند لە "کۆمەڵەی ڕوەکناسانی کوردستان" مەبەست لە ڕوەکناسان هەمان کەسانی پیشەوەر و پسپۆڕی گیادەرمانی و کەڵەشاخ و پزیشکی خۆماڵی کوردەوارییە لە باشووری کوردستان، بەڵام لەبەر چەند هۆکار بۆ ئەم قۆناغە وشەی ڕوەکناسان دانراوە. کەواتە پێویستە کاتێك ئەم کۆمەڵە بە فەرمی لە لایەن وزارەتی تەندروستی باشووری کوردستان ناسێندرا، ناوەکە بکرێتە "کۆمەڵەی ڕوەكدەرمانانی کوردستان" یا "کۆمەڵەی گیادەرمانانی کوردستان"، کە دروستەکەی ئەمەیە.

بکەینە پاشکۆی بەرهەمە چاپکراوەکانی. بە خۆشحاڵییەوە پێشنیارەکەیان قەبووڵ کرد.

پاش ماوەیەك لە لایەن کاك سامانەوە ئەوەی لەبەردەستدا بوو لە نووسین و ڕەچەتەکان گەیشت بە دەستم. لەولاوە هەر دوو کتێبی گەنجینەی دارستان و گژوگیا و ئاژەڵ دیسانەوە تایپمان کردەوە[1] و دەستمان بە کارەکانی کرد. لەگەڵ کاك سامان باسی ئەوەمان کرد کە ئەم پرۆژەیە کە دەبێتە کتێبێك و سەرجەم بەرهەمە چاپکراو و ژیاننامە و ڕەچەتە و دەستنووس و وێنەکانی میرزا سدیقی تێدایە بە ناوێکی دیکەوە چاپی بکەین. سەرنجام ڕای هەر دوو لا هاتە سەر ئەوە ناوی کتێبەکە ببێتە "بۆژانە".[2] [تا وەکوو ئێستە هەندێك لە خشتەی کارکردن و کاتی بەڕێوەبردنی ئەو پرۆژەیە دوا کەوتووە. لەسەر خێران بەزووترین کات درێژەی کارەکە دەست پێ دەکەینەوە.] پاشان پێشنیاری ئەم پرۆژەیەم خستە بەردەست هاوڕێی خۆشەویست کاك جەلال ڕەئووفی[3] لە بانە. بەڕێزیان بە دڵکراوەییەوە پێشنیارەکەیان وەرگرت کە پێکەوە کاری ژیاننامەی پوختی میرزا سدیق، هەروەها ڕاستکردنەوە و پەراوێزنووسی بەرهەمەکانی بکەین.

## چگنی و چنگیان

خەڵکی ناوچەکە وشەی چنگیان وەك شێوەزاری ئەردەڵانی و هەورامی (نگ) لە وشەکە دەخەنە لووت و بە مینگە بێژەی دەکەن، بەڵام لە کوردی یەکگرتوو وشەکە ئاشکرا و لە ناودەم بە چنگیان بێژە دەکرێت. بە کەسێك خەڵکی ئەم ئاواییە بێت دەگوترێت: چنگنی و

---

١. کاك سەلام (موحەمەد) مورادی برام ئەم دوو کتێبەی تایپ کردووە بۆمان.

٢. لە شێوەزاری ئەردەڵانی و شارەزووریدا گیای اخیلیا لە عەرەبی و بومادران لە فارسی دەبێتە بۆژانە. لە سۆرانیش دەبێتە بێژان. هەر دوو وشەی بۆژان و بێژان، پڕ بە پێستی باری دەرمانی ئەم گیایە دێتە ئەژمار. چونکە گەلێك سوودی پزیشکی هەیە. ئەوەیکە ئێمە ئەم کۆبەرهەمە بە ناوی بۆژانە چاپ دەکەین هەم لە ڕووی ناوەکە و هەم واتاکەی تەواو دروستە. بۆژانە: یەکەم ناوی گیایە، دووهەم: ئەگەر بە بۆ ژانە بیخوێنەوە دەبێتە (بۆ ژان و دەرد دەبێت). کەواتە ناوی بۆژانە بۆ ئەم کۆبەرهەمە ناوێك پڕ بە پێستی واتای پزیشکی و گیایە.

٣. دەرمانگەری گیادەرمانی ڕەئووفی لە بانە و هەروەها نووسەری چەند کتێبی کوردی. کاك جەلال کوڕی مامۆستا و شاعیری پایەبەرز مەلا شێخ موحەمەد ساوانە کە مامۆستا هاوکات دەستێکی باڵایشی هەبووە لە بابەتی پزیشکی و دەرمانگەری کوردەواریدا. هەروەها کاتی خۆی کە شێخ مەحموودی نەمر دێتە ناوچەی بانە و لە کوێستانی ساوان دەمێنێتەوە یەکێك لە لایەنگران و پشتیوانانی بووە. ئەو شوێنە شێخ مەحموود و یارانی تێیدا بوون لەو کوێستانە ئێستە بە هەواری نەمران دەناسرێت و هەموو ساڵێك لە سەرەتای زستان شاخەوان و نیشتمانپەروەران شەوێك لەوێ دەمێننەوە و یادی ئەو بەرزەپیاوە دەکەنەوە.

چنگیانی. وشەی چنگیان لە "چگنیان"ـەوە هاتووە، واتا چگنیەکان. ئەم ئـاواییە کەوتـووەتە ناحیەی سیتەك، شارۆچکەی چوارتا، قەزای شارباژێر لە پارێزگای سـلێمانی. لای بـاکوورەوە هاوسنوورە لەگەڵ گوندی دۆڵەتوو، لە باشوور گوندی کانی درکە، ڕۆژهەڵات گوندی باراو و لای ڕۆژاوا لەگەڵ گوندی نۆدێ. پێشتر ئەم ئاواییە لە قەدپـاڵی سـەرەوەتردا بـووە و دواتـر هاتوونەتە شوێنی ئێستاکە. چنگیان لای بزووتنەوەی کوردی نـاوچەکە گونـدێکی ناسـراوە. چونکا هەمیشە پەناگە و داڵدەی شۆڕشگێڕانی شاخ بـووە. تەنـانەت لە مێـژووی ئەدەبیـاتی کوردیشدا جێی خۆی کردووەتەوە. بۆ نموونە نووسەری پایەبەرز عبدالرحمن موفتی[1] ناسـراو بە شێرۆ (١٩٢١ـ١٩٩٥) یەکەم بەرهەمی بە "دیمەنی دوای نیوەڕۆ لە گوندی چنگیان" داناوە کەساڵی ١٩٣٦ لە ڕۆژنامەکەی پیرەمێردی شاعێر، ژین، بڵاوی کردەوە.

### هۆزی کوردی چگنی لە چنگیان

● یەکێك لە کوڕەکانی شێخ زەکریا پیـر و ڕێـبەری یەکەمـی تەریقەتـی شـازلیەکان لە کوردستان، ناوی ئەمیر تاهێر بووە کە لە سەدەی ٩ کۆچیـدا لە ئـاوایی گـولانی کـوڕەوێژدا (کەڵاتەرزانی ئەورۆ) ژیاوە. کتێبی نورالانوار کە لە سـەدەی ١٠ کـۆچی نووسـراوە، لە لاپەڕە ١١٢ بەم جۆرە باسی خێڵی چگنی و ئەمیر تاهێر دەکات: *ئەمیـر تـاهێر لەگەڵ مۆریـدەکانی خەریکی ڕاکێشانی جۆگەی ئاو بوون بـۆ نـاو زەویەکـانی گـولان، چگنیەکـانی کـوڕەوێز [و ئاوایی گولان] ئەو کارەیان پێ ناخۆش بووە و هەوڵیان داوە لەسەر ئەم کـارە ئەمیـر تـاهێر بکوژن.*

● شەرەفنامە باس لەوە دەکات سەردەمی شا تەهماسبی سەفەوی (٩٨٤ـــ٩٣٠ کـۆچی) بەشێکی زۆر لە هۆزی چگنی لە لوڕستان بڵاو بوونەوە بە ناوچەکانی ئازربایجـان و عێراقـی عەجەم.[2]

● دانشنامە ایرانیکا[3] چگنیەکان بە تیرەیەك سەر بە هۆزی بالاگریوی لوڕستان داناوە کە

---

١. ئەم کەسایەتیە دەبێتە وەچەی زانای پایەبەرز مەلا ئەحمەد موفتی چاوەمار کە لە بنەڕەتدا سەر بە بنەماڵەی پیرخزری شاهۆن، هەروەها دەبێتە برازای شاعێری پایەبەرز مامۆستا بێخود. لە چاپدان و کۆکردنەوەی دیوانی مامۆستا بێخود زۆر دەوری هەبووە.

٢. شەرەفنامەی بدلیسی، لاپەڕەی ٤٢٩ و ٤٣٠

٣. ئەم کتێبە تا ئێستە بە ئینگلیسی ١٦ بەرگی چاپ بووە. ساڵی ١٣٤٧ لە ئێران دەستی پێ کراوە و ئێستە لە زانکۆی کولۆمبیای شاری نیۆیۆرك بەردەوامە و پەخشانگای (Bilbliotheca Persica Press) بڵاوی دەکاتەوە.

بەشێكیان بە شارەكانی دیكەی ئێـران و دەشـتی شـارەزووردا بـڵاو بـوونەتەوە. ئاواییەكـانی كۆماس و مینە لە لوڕستان كە بە لوڕی قسە ئەكەن خۆیان بە هـۆزی بـالاگریوە و تیـرەی كۆماسـی دەزانـن. زۆربەی دانیشـتوانی ئەم دوو ئـاواییە شـۆرەتی بنەماڵەیـان كۆماسـی و كۆماسیوەندە. لە شارستانی هەرسین ئاوایی كۆماسی بان و كۆماسی خـوار هەیە. ئەمـانیش بە لەكی قسە ئەكەن و خۆیان بە تیرەی كۆماسی ئەزانن. لە شارستانی سـونقوری كولیـایی ئاواییەكانی مەرزاڵە و مارانگاز كە بە كەلهوڕی قسە ئەكەن، خۆیان سەر بە تیرەی كۆماسـی ئەزانن و شۆرەتیان كۆماسییە.[١]

● لە ناوچەی كەلاتەرزان كە دەكەوێتە نێوان سنە و مەریـوان چەنـد ئـاواییەك هەیە بە خێڵ كۆماسی ئەناسرێن و ئێستە بووە بە ناوچەی كۆماسـی (ئاواییەكـانی گـولان، شـاییەر، لاوێسان، و تاد). ئەمانە سەردەمی نادرشای ئەفشار هاتوونەتە ئێرە.[٢] لە كۆندا بە كەلهوڕی یا لەكی قسەیان كـردووە و ئێسـتاكەش هێشـتا هەنـدێك شـوێنەواری لەكـی و كەلهـوڕی بە زمانەكەیانەوە ماوە. شاعێری گەورە ئەحمەد بەگی كۆماسی (١٢١٠ــ١٢٩٤ كـۆچی) سـەر بەو خێڵە بووە.[٣] هەروەها ئاوایی گوێزان لە كەلاتەرزان كە ئێستە چـۆڵ كـراوە، هەروەهـا خێـڵ مچەفەرزاڵی[٤] لە ئاوایی كەڵەوێتجەی مەریـوان ئەوانـیش بنەڕەتیـان لـوڕ بـووە. شـوێنەواری دیكەی مچە فەرزاڵی كانیاوێكە لە نێوان ئاواییەكانی باخان و كۆڵێت كە بە كانیەكەی مـچە فەرزاڵی دەناسـرێت.[٥] كۆماسـیەكانی كەلاتەرزان دەگێـڕنەوە كە بـاپیرانی ئەوان كە سـەرەتا هاتوونەتە ئەم ناوچەیە هاوین و بەهار لە كوێستانەكانی كەلاتەرزان بـوون و وەرزی سـەرما وەك جافەكان داگەڕاون و لە شارەزوور نیشتەجێ بـوون. جـا بەپێـی ئەم بۆچـوونە لەوانەیە چگنیەكانی چنگیان پێوەندیان ڕیشەییان بە كۆماسیەكانەوە بێت.

● خەڵكی چنگیان خۆیان دەگەڕێننەوە بۆ سەر تیرەكانی زەند و زەنـگەنە و چگنـی كە

---

١. توێژینەوەی مەیدانی نووسەر: لە وتاری هۆزی كۆماسی لە ناوچەی كورەوێژ بەتەسەل باس كراوە.

٢. لە سەردەمی نادرشای ئەفشار بەشێك لە هۆزەكانی كەلهوڕ لە ناوچەی كرماشان كۆچ دران بەرەو ناوچەی سالاڵ و هەوەوتوو. ئێستاكەش لە سنووری دیواندەرە و سەقز بەشێك لە ئاواییەكان بە هۆزی كەلهوڕ بەناوبانگن.

٣. شەهین موحەممەدی و هاوكارانی، كوماسی دیاری از فرهنگ و تنوع، پەخشانگای ڕێباز، چاپی یەكەم، مەریوان، ١٣٩٥

٤. كورتكراو و كوردیتراوی ناوی (مصطفی فرضعلی)یە

٥. ئاواییەكانی كەڵەوێتجە، كۆڵێت و باخان لە داوێنی كێوی ناوتاق گاڕانی مەریوان نزیك بە كۆماسی هەڵكەوتوون.

لە دیوی ئێران و ڕۆژهەڵاتی کوردستاندا نیشتەجێن و سەردەمانی زوو بەشێك لەو هۆزە پەرتەوازە بوون و هاتوونەتە ئەم ناوچەیە. میرزا سدیق لە پێشەکی کتێبی گەنجینەی دارستان لاپەڕە ٢ دەفەرمێ: *بەڵێ من لە بارەی ڕەگەزایەتیەوە لە هۆزی چگنیم واتا چنگینانی. ... ئێمە لەگەڵ هۆزەکانی سیامەنسووری و زەنگەنە یەك بنەماڵەیین وە لەگەڵ کەریم خانی زەند دەبینەوە یەك.* [میرزا ئەم باسەی لە شەرەفنامە و کتێبی العشائر الکوردیە وەرگرتووە.]

● زەنگەنەکانی کەرکووك و گەرمیان باس لەوە دەکەن پاش تێکشانی دەسەڵاتی زەندەکان لە لایەن قاجارەکانەوە ساڵی ١٧٩٤ زەندەکان ئاوارە دەبن و بەشێکیان ڕوو لە ناوچەکانی دیکەی ڕۆژهەڵات[1] و باشووری کوردستان دەکەن و سەرەتا دەڕۆنە ناوچەی زەندئاباد لای کوڵەجۆیی کفری و کەلار. پاشان بەشێك لەم زەندانە بەرەو کەرکووك و شارباژێر دەڕۆن. ئەوانەی ڕوو لە شارباژێر دەکەن سەر بە تیرەی چگنیەکانی هۆزی زەند بوون کە گوندی چنگیان ئاوەدان دەکەنەوە.[2]

خاڵێکی تر کە خەڵکی چنگیان باسی دەکەن ئەوەیە کە سنووری ئەم ئاواییە ئەوسا ڕێڕەوی کۆچی مەڕدارانی جاف و خێڵەکانی دیکە بووە کە لە دەشتەکانی هەولیر، کەرکووك، شارەزوور و گەرمیانەوە هەڵکشاون و بەرەو کوێستانەکانی ڕۆژهەڵاتی کوردستان ڕۆیشتوون. فەرهاد میرزا بووە والی حکوومەتی ئەردەڵان، ساڵی ١٨٧٠ پابرانی کرد بە جافەکان لە باشوورەوە بۆ ڕۆژهەڵات.[3] کەواتە چنگیان چەندین سەدەیە ئاوەدانە و ژیان لەوێ ئاژینە.

---

١. هەندێك لە ئاواییەکانی ناوچەی لەیلاخ و سنە، هەروەها موکریان خێڵی زەندییان تێدا دەژیت. بۆ نموونە سەرۆکی بزووتنەوەی کەڵبەشان مەلا ڕەسووڵ ئەدیب خەڵکی گوندی شاولێ دەشتی لاجانی پیرانشارە و سەر بە خێڵی زەندەکانی موکریانە. [سەرچاوە: دیوانی ئەدیب]

٢. تیشکۆ زەند، بابەتی: کەریم زەند و وەڵامێك بۆ ئاکام دەرگەزێنی، ماڵپەڕی: www.kurdistanpost.nu، ڕێکەوتی: ٢٠١٧/١١/٠

٣. لەو ساڵانەدا دەبێت کە فەرهاد میرزا بڕیار ئەدات کە ئیدی نەهێڵێت جافەکان باشووری کوردستان بێنە دیوی ڕۆژهەڵات. سەرۆك هۆزەکانی جاف مەولەوی تاوگۆزی ئەکەنە تکاکار تا بەشکوو بچێتە دیواخانی والی لە سنە. لە نامەیەك کە مەولەوی لە ڕێگەدا لای هاوڕێ و شاعیری هاوچەرخی شێخ عەزیز لە ئاوایی جانەوەرەی مەریوان لا ئەدات و نامەیەك بۆ فەرهاد میرزا ئەنووسێت و پێش خۆی نامەکە ئەنێرێت بۆ سنە. [هەر چەند توێژینەوەکان و گوزارشە مێژووییەکان وای دەرئەخەن فەرهاد میرزا دەستی بە ڕووی تکاکاریەکەی مەولەویشەوە نا و بۆ هەمیشە جافەکانی لە گەرمیان و شارەزوور هێشتەوە.] سەرچاوە: دیوانی مەولەوی، ئامادەکردن مامۆستا عەلی قەرەداغی، لاپەڕە: ٩٨٩

## ژیانی میرزا سدیق

باوکی ناوی فەقێ مەحموود کوڕی ئەحمەد کوڕی مەلا موحەمەد ئەمین کـوڕی مـوحەمەد ناسراو بە سۆفی مـوحەمەدی پیاوچـاك بـووە. پـێش شـەڕی یەکەمـی جیهـانی نـاکۆکیەك دەکەوێتە ناو بنەماڵەکانی دێـی چنگیـان و ئەحـمەد بـاپیری میـرزا سـدیق ناچـار دەبێـت چنگیـان بە جـێ بهێڵێـت و بەرەو سەرشـیوی سـەقز کـۆچ بکـات. چەرمەسـەریەکی زۆر دەکێشێت و لە زۆر هەوار و دێی سەرشیو و شلێر دەمێنێتەوە. سەرنجام ڕێگەیان دەکەوێتە ئاوایی بەیاندەرە لە سەر سنووری بانە و ناوچەی شلێر. سەرتیپ پیاوێکی بەڕێـز و خـانەدان لە بەیاندەرە پێشوازی دەکات لە بنەماڵەی ئەحمەد چنگیانی. پیـاوە هەڵاتووەکـانی چنگیـان دەبن بە چەکدار و پیاوی دیواخانی سەرتیپ. سـاڵی ١٩١٩ فەقـێ مەحمـوود بـاوکی میـرزا سدیق لەگەڵ بنەماڵەی ئەحمەد بەگ لە هەوارەخۆڵی بانە خزمـایەتی دەبەسـتێت و ژیـانی هاوسەرگیری پێك دەهێنێت و مـاڵەکەی دەگـوازێتەوە بـۆ هەوارەخـۆڵ. سـاڵی ١٩٢٠ میـرزا سدیق لە هەوارەخۆڵ لەدایك دەبێت و تا پێنج ساڵان لەوێ دەمێننەوە. ساڵی ١٩٢٥ دیسـان ماڵەکەیان دێتەوە بۆ بەیاندەرە و تا ساڵی ١٩٤٥ پـێش دامەزرانـدنی کۆمـاری کوردسـتان لە مەهاباد هەر لە بەیاندەرە نیشتەجێ دەبن.

میرزا سدیق لە تەمەنی ٢٥ ساڵاندا دەبێتە چەکداری هێزی حەمە ڕەشید خـانی بـانە و بۆ پاڵپشتی کۆمار بەرەو مەهاباد بەڕێ دەکەون. لە ڕێـی گەیشـتن بە مەهابـاد یەکەم جـار چاوی بە مەلا مستەفا بارزانی و هێزەکەی دەکەوێت. میـرزا سـدیق بەرپرسـی تەدارۆکـاتی هێزەکەی حەمە ڕەشید خان بووە و تا تێکچوونی کۆمار لەگەڵ ئەم هێزە لە ئاوایی سەرا لە سـەقز پارێزگـاری لە سـنووری کۆمـار دەکەن. هێـزی حەمە ڕەشـید خـان ٣٢ ئەفسـەر و جەماوەرێکی زۆر چەکداری ئاسایی بووە. میرزا سدیق سەرەتا پلەی ئەفسەری یەکەمی پـێ دراوە و پاشان بووەتە بەڕێوەبەری گشتی خواردەمەنی و تەقەمەنی هێزەکە. لە چەند شەڕ و تێکهەڵچوونی هێزەکانی کۆمار و سپای ڕەزاخاندا وەکوو خـاکوخۆڵ، تەمـووتە، مەلقەرنـێ و قادراوا لەگەڵ هێزەکانی بارزانی و شکاك بەشداریان کردووە.

میرزا سدیق پاش کۆماری مەهاباد لەگەڵ هێزەکەی حەمە ڕەشید خان دەگەڕێـنەوە بـۆ ناوچەی بانە، بەڵام ئەمجارە لە هەر دوو سەری ئێران و عێراق دەرکەوتنـی ئەم چەکـدارانە سزای زیندان و سێدارەیان بۆ دەرچووە. بـۆیە ناچـار دەبێـت کەمتـر دەربکەوێـت و خـۆی بشارێتەوە. ماوەی پێنج ساڵ لە ئەشکەوتەکانی سەفەرەکوردە، قۆخی کانی ژاژکـی، هەوار و

گوندەکانی ویتە و داڕووخان و حەمەموورادی سەر سنووری پێنجوێن و بانە[١] بەردەوام لە ترسی هێزی هەر دوو لا خۆی دەشاریتەوە.[٢] لە ڕستەیەکی تەواودا: ماوەی پێنج ساڵان ژیانی پڕ لە کوللەمەرگی و چەرمەسەری بووە. وەك خۆی دەڵێت: *ڕۆژێك لەوپەڕی دڵتەنگی و پەشێوی وا هاتە دڵمەوە کە پەنا بۆ شێخ عەلادینی بیارە ببەم. نامەیەك دەنووسێت و پەنامەکی بۆ بیارەی دەنێرێت. پاش ماوەیەك شێخ وڵامی دەنێرێتەوە و بە فارسی دەنووسێت: مبارکست به پینجوین بیا و اقامت کن. انشالله برای دین و دنیایت خیر خواهد بود.*[٣]

سەرەتای ساڵی ١٩٥٠ نامەکەی شێخ عەلادین هەڵدەگرێت و ڕاست بەرەو فەرمانگەی ئیداری پێنجوێن دەچێت و خۆی ئەداتە دەستەوە. بەڕێوەبەری ناحیە کاتێ نیازی گەڕانەوە و گیرسانەوەی میرزا سدیق هەست دەکات و نامەکەی شێخ دەبینێت ئاسانکاری بۆ دەکات و لە ئیدارەی نفووس ناوەکەی لە سدیق مەحموود دەگۆڕێت بە سدیق ئەحمەد. پاشان ماڵ و منداڵەکەی لە دارۆخان دەهێنێت و لە پێنجوێن دەست بە کاسبی و ژیانی ئاسایی دەکات. ڕێکەوتی ١٩٥٠/٠٥/٢٠ لایەنگرانی بارزانی لە پێنجوێن کۆبوونەوەیەکی نهێنی دەبەستن و میرزا سدیق بە حاکمی لیژنەی پارتی لە پینجوێن هەڵدەبژێرن. ساڵی ١٩٥٤ دەیکەنە لێپرسراوی پارتی لە ناوچەکە و هەر ئەوساڵە عبدالکریم قاسم دەبێتە سەرۆك کۆماری عێراق و لەگەڵ مەلا مستەفا ڕێکەوتن دەکەن. میرزا سدیق و ئیبراهیم ئەحمەد لەگەڵ وەفدێك بۆ پیرۆزبایی لە سەرۆك کۆمار ئەڕۆنە بەغداد. ساڵی ١٩٧١ دەکرێتە بەرپرسی یەکیەتی لاوانی کوردستان و هەروەها بەڕێوەبەری شارەوانی سەرچنار لە سلێمانی. لە ماوەی بەرپرسیارەتیەکەی لە سلێمانی گەلێك خزمەتی نواندووە. یەکێك لەوانە لابردنی نەریتی چا و جگەرە کێشان بووە لە پرسە و سەرەخۆشی ناو مزگەوتەکانی سلێمانی. ساڵی

---

١. حاجی ئەحمەد نەیەری دەیگێڕێتەوە کە کاتێ هێزەکەی حەمە ڕەشید خان لە کۆمار گەڕایەوە ماوەیەك لە سنووری ئاوایی نەیەر بوون. هەروەها چەند جار میرزا سدیق لەو کاتانە سەردانی نەیەری کردووە. چونکە ماڵە خزمانی لەوێ بوون.

٢. سۆفی عومەر پێنجوێنی دەیگێڕێتەوە گەلێك بەڵگە و نامەی بە دەستی خۆم لە نێوان مەلا مستەفا بارزانی و شێخ عوسمانی دووڕۆ ئاڵوێر کراوە. کاتی خۆی لە تەنەکەیکم خستووە و لە کەڵەکە بەردێك لە کێوێکی ئاوایی دارۆخانی چەم شلێر شاردوومەیەوە. بەدڵنیاییەوە ئەم کەمتەرخەمیە گەلێك بەڵگەی مێژووی کوردی فەوتاندووە و ئێستە ئەو ئاسەوارە فەوتاون.

٣. گەنجینەی دارستان، لاپەڕە ٤

١٩٧٣ وەك نوێنەری یەکیەتی لاوانی کوردستان بەشداری دەهەمین فستیڤاڵی لاوانی جیهانی کردووە لە ئاڵمان.

پاش تێکشانی شۆڕشی کورد لەو ساڵانە و ڕۆیشتنی مەلا مستەفا بۆ ڕووسیە، میرزا سدیق وەك باقی خەڵك هاوشێوە کە لە بەغداد دەگەڕێتەوە بۆ سلێمانی، پاش چەند ڕۆژ دەستبەسەر دەکرێت و زیندانی دەکەن. پاشان ماوەی ٤ ساڵ دووری دەخەنەوە وەك (موظف منقول) بۆ سەر سنووری عێراق و عەرەبستان بۆ شاری حلـلە. لەوێ تووشی نەخۆشی شەکرە و فشار و هەناسەسواری دەبێت. دواتر کە دەگەڕێتەوە بۆ سلێمانی لە ڕاپەڕینەکەی ساڵی ١٩٩١ باشووری کوردستان دیسان بەشداری دەکات و کۆساری کوڕی و پێشڕەوی برازای لەو ڕاپەڕینە شەهید دەبن.

لە ژیانی سیاسی میرزا سدیق سەرکەوتنێکی بەرچاو و زەحمەتێکی نەتەوایەتی تەواو دەبینرێت. بەڕادەیەك کە کەسێکی نزیك بووە لە خودی مەلا مستەفا بارزانی و هەروەها کاك مەسعوود. سەبارەت بە ژیانی ئاسایی و گیادەرمانی و ئاشنایەتی لەگەڵ شێخانی بیارە، شایانی باسە لە خوارەوە ئەم باسەیش ڕوون بکەینەوە.

میرزا سدیق وەك خۆی دەیگێڕێتەوە باپیرە گەورەی ناوی سۆفی موحەمەدی پیاوچاك بووە. ئەگەر تەمەنی باب و باپیرانی تا ئەم سۆفییە بەراورد بکەین سۆفی موحەمەد دەوروبەری ساڵەکانی ١٨٣٠ ژیاوە. ئەوکاتە لە سنووری سلێمانی هەر دوو تەریقەتی قادریە و نەقشبەندی لە ئارادا بوون. هەروەها ساڵی ١٩٥٠ پەنای بردووەتە بەر شێخی بیارە و دواتر وەك سۆفییەکی دڵپاك تا کۆتایی ژیانی لەسەر ڕێبازی نەقشبەندی ماوەتەوە. زۆر نزیکایەتی بووە لەگەڵ شێخ عوسمانی دووڕۆ. سۆفی عومەر پێنجوێنی و سۆفی عەلی خاکی هەر دوو دەیگێڕنەوە کە میرزا سدیق ئەو کاتانە سەردانی بیارە و دووڕۆی دەکرد چەند ڕۆژ لە خانەقا دەمایەوە و شێخ وەك کەسە تایبەتیەکان میوانداری دەکرد. گوایە لە خۆشەویستیدا شێخ عوسمان، میرزا سدیقی بە خاڵۆ فەتاح بەگ بانگ کردووە.

لە لاپەڕە ١٣ـ١٤ گەنجینەی دارستان باس لە ناوی خاڵۆ فەتاح بەگ دەکات کە ساڵی ١٩٨٦ شێخ عوسمان نامەیەك بۆ میرزا سدیق دەنێرێت و لەوێدا بەپێی حسابی ئەبجەد باسی وشەی فەتاح و سدیق دەکات کە دەبێتە: هو الفتح المبین. میرزا بۆخۆی هۆنراوەیەکی داناوە بۆ ئەم بابەتە:

*سایەی صدیقە بادەت یاوەر و یاری مەتین*
*شاهی عوسمان و عەلاو و نەجمی دینت هەم قەرین*

*زیکری قەلب و ئیسمی فەتائت بووە میفتاحی کار*

*سیرِ و ئەخفایەت بە یاهو بێ هو الفتح المبین*

پاییزی ١٣٩٧ لە کونگرەی مەولانا خالید شارەزووری لە زانکۆی کوردستان بە خزمەت شێخ حوسەین موفتی هەولێری گەیشتم. سەبارەت بە میرزا سدیق چنگیانی پرسیارم کرد، فەرموویان: *بەڕاستی میرزا سدیق پیاوێکی نەگۆڕ و نەدوڕ و مەردی زەمانە بوو.*

## میرزا سدیق چۆن چووەتە ناو دنیای پزیشکی و گیادەرمانی

وەك لە کەشی ژیانی ئەو کەڵەپیاوەدا دەرئەکەوێت ژیانی هەوار و کوێستان و دێ لای میرزا سدیق خۆش بووە و حەزی لە گەڕان کردووە بە شاخ و کێوەکانی کوردستاندا. بارودۆخی گوزەرانی لە ئاوایییەکانی بەیاندەرە، هەوارەخۆڵ، وێنە، دارۆخان، شاری پێنجوێن و شارەوانی سلێمانی ئەمانە هەموو دەتوانن نیشاندەری ڕاستی ئەو قسەیە بن. لەلایەکی ترەوە میرزا سدیق زۆر حەزی لە خوێندنەوەی سەرچاوە پزیشکیەکان کردووە. ناوەرۆکی هەر دوو کتێبی گژوگیا و ئاژەڵ و گەنجینەی دارستان دەریدەخەن کە نووسەر بۆ دانانی ئەم دوو دەقە خوێندوویەتیەوە ئینجا لەگەڵ ئەزموونی خۆی ئاوێتەی کردووە و نووسیویەتیەوە. خاڵێکی تر کە لە هەموو نووسین و قسەکانی میرزا خۆی نیشان ئەدات ئاشنایەتی لەگەڵ بنەماڵەی شێخ عەلائەدین بیارە و شێخ عوسمانی دوورۆیە. ئەو دوو کەسایەتیە جیا لە باری ئایینی، پزیشکێکی بێوێنە بوون لە سەردەمی خۆیاندا. میرزا خۆی دەڵێت کە بە نامە و ڕاسپاردە و تەلەفوون هەمیشە ئاگاداری ڕەچەتەکانیان بووم و خۆم نزیك کردووەتەوە.

میرزا سدیق لە لاپەڕە ١١ پێشەکی کتێبی "گژوگیا و ئاژەڵ" باس لەوە دەکات: *..ئەم تۆزە شارەزایەم لە ٤ ڕێگاوە وەرگرتووە. یەکەم: لە ئاموشۆکردن و گوێگرترتن لە بەرێزان و خاوەن پلەکانی شێخانی بیارە کە ئامۆژگاری نەخۆش و هەژارانیان ئەکرد بۆ خواردنی ئەو جۆرە گژوگیا، وە ئەیشمدی پێی چاك ئەبوونەوە... ئەمانەم بەزۆری لە پایەبەرزی بەهەشتی خوالێخۆشبوو شێخ عەلائەدین بیستووە. لە دوای بەڕەحمەت چوونی لە شێخ عوسمانی کوڕی بیستووە و وە ئەبیستم. هەر بە گژوگیا زۆر کەسیان لە ناسوڕ و سزای نەخۆشی و ئازاری برینداری جۆربەجۆر ڕزگار کردووە و نەیان هێشتووە تووشی ورگ هەڵدڕین و بڕێك عەمەلیات ببن بەتایبەت گەدە و گورچیلە و جگەر و گولی و پێست و ئەعساب. وە زۆریان لەمانە بە چاوی خۆم دیومە... دووهەم: هەندێکی لە کتێبی (طب الکبیر) وەرگرتووە و*

*کردوومە بە کوردی. سێهەم: برێکی لە باب و باپیران بیستوومە و سوودی لێ وەرگیراوە. چوارەم: ڕێکەوتی ژیانی خۆم وا بووە بە زۆری بە ناو گژوگیا و کوێستان زەمینەکانی کوردستاندا گەڕاوم. هەر چەپکە لە بایەرێ و هەر گوڵە لە جارێ کۆم کردۆتەوە. بۆیە زیاتر لە ناوی ٢٧٠ گیام بە شێوە هەڵبەست یا نیوە هەڵبەست نووسیوەتەوە.* لە پێشەکی کتێبی "گەنجینەی دارستان" لاپەڕە ٦ بەم جۆرە باس دەکات: *..ئێستا کە ساڵی ١٩٩٤ و لە تەمەنی ٧٤ ساڵیدام، دۆستایەتی و وەفاداری خۆمم بۆ کوردایەتی پاك و وڵاتپەروەری و ڕێبازی نەقشبەندی هەرگیز نەپچڕاندووە. بەڵام لە بارەی ئایین و چڵ و پۆیەوە ساڵی ١٩٥٠ چوومەتە بیارەی شەریف و تەمەسوکم کردووە بە حەزرەتی شێخ عەلادین ـ ڕەحمەتی خوای لەسەر بێ. پاش وەفاتی ئەو زاتە لەسەر دەستی حەزرەتی شێخ عوسمان سەراجەدینی نەقشبەندی تەمەسوکم تازە کردووەتەوە. واتە تا کاتی نووسینەوەی ئەم پەرتووکە کە ساڵی ١٩٩٥ ئەکاتە ٤٥ ساڵی ڕەبەق من تاکە نیو کاتژمێر گۆڕان و دڵگۆڕان ڕووی تێ نەکردووم. بگرە ساڵ بە ساڵ بڕوام زیاتر و پتەوتر بووە بە کشوفات و کەرامات و ڕابەرایەتیان. بەتایبەتی بە باری پزیشکایەتیان چ پزیشکی ڕۆحی و چ پزیشکی ئەندامی.* هەروەها لە لاپەڕەی ٧ دەنووسێت: *لەبەر ئەوەی من هەر جۆرە زانیاریەکم هەبێت لە هەموو بارێکەوە سەرچاوەکەی خانەدان و بنەماڵەی بیارەیە بەتایبەت حەزرەتی شێخ عەلائەدین و حەزرەتی شێخ موحەمەد عوسمانی سەراجەدینە.*[1]

میرزا سدیق پاش هەڵبژاردنەکەی ١٩٩٢ پارلەمانی باشووری کوردستان، تەنیا وەك لایەنگرێکی پارتەکەی کار دەکات و زۆرتر کاری دەبێتە ژیانی ئاسایی و چارەسەر کردنی دەرد و نەخۆشی خەڵك لە دووکانەکەی دەرمانخانەی هەورامان، واتا نزیك بە ١٤ ساڵان. لە ڕووداوێکدا ٢٠٠٣ لاقی دەشکێت و دواتر بەهۆی نەشتەرگەریەکی ناسەرکەوتووی شکانەکەی گردەنشینی ماڵەوە دەبێت و ساڵی ٢٠٠٦ لە تەمەنی ٨٦ ساڵی ژیانی ئەم دنیایە بەجێ دەهێڵێت و دەگەڕێتەوە بۆ باخچەی باقیات الصالحاتی.

**بەرهەمەکانی میرزا سدیق**

• **ژیان و پەراوێزەکانی**: بۆخۆی لە پێشەکی گژوگیا و ئاژەڵ لاپەڕە ١٠ دەنووسێ: *ساڵی*

١. میرزا سدیق وەك شاگردێکی تەریقەت و پزیشکی شێخانی بیارە دەناسرێت. ئەگەرچی زیرەکی و بلیمەتی خۆیان توانیویە ئاستی ئەم شاگردیە سەر بخات و میرزا سدیق بەڕاستی وەك حەکیم و پزیشکێکی بێ وێنە دەربکەوێت.

*١٩٧٦ وەکوو مووچەخۆرێکی گوێزراوە لە پارێزگای بابل لە شاری حلـلە بـووم. لە لایەکەوە کەس نەناسی. لە لایەکیشەوە بێ ئیش و دەس‌بەتاڵ بووم. کەوتـمە بیرکـردنەوە کە مـرۆڤ نابێ وەکوو داری بی بێ‌بەر بێ. با بەرهەمەکەشی لای برێ کەس ترش و تاڵ بـێ. بـۆیە بە باشم زانی بۆ سوود و خزمەتی نەتەوەی کوردی بەڕێز و خوێنـدەوارە خۆشەویسـتەکان لەم دەسبەتاڵیەدا ئەم چەند نامیلکانـە بنووسـم. یەکەم: ژیـان و پەراوێزەکـانی، دووهەم: خەو و خەواریق و سێهەم: گژوگیا و ئاژەڵ.* هەروەها دوایی لە ژیان‌نامەیدا و یادەوەری بنەماڵەکەی باسی ئەوە هەیە کە میرزا سدیق گەلێك وێنە و نامە و دەستنووسی سـەردەمی بەیانـدەرە و هەوارەخۆڵ و کۆماری پاراستووە. یەکێك لەوانە کتێبی "ژیان و پەراوێزەکانی" بووە کە تێیـدا بەسەرهاتی خـۆی و بنەمـاڵەکەی بـووە تـا کۆمـار و وردەکـاری کەش و ڕووداوەکـانی نـاو کۆماری مەهابادی نووسیوە. بەشێك لەو ئاسەوارانە لە زەبـر و زەنـگ حکـوومەتی بەعـس و ئاوارەییەکەی ساڵەکانی ١٩٨٤ تا ١٩٨٦ لەناو چوون و دیار نەماون. هەروەها بەشـی دیـکەی لە هەڵات هەڵات و ئـاوارەییەکەی سـاڵی ١٩٩١ کاتێـك لە سـلێمانی بەرەو شـارەزوور بەڕێ دەکەون ماشێنەکەیان لە ڕێگە خـراپ دەبێـت. لەگەڵ بـڕێ شـمەکی دیـکە دەستنووسـی کتێبی ژیان و پەراوێزەکانی و هەندێ پەڕە و نووسینی دیکە ئەدزرێن و نامێنن. کەواتە ئەم کتێبە یەکەم دانەری میرزا سدیق بووە کە بەداخەوە تا کۆتایی ژیـانی چـاوەڕوانی ئەوە بـوو کە کەسێك ئەو دەستنووسەی بۆ بهێنێتەوە.

- **خەو و خەواریق**: ئەم کتێبە ساڵی ١٩٧٧ دەست بە نووسینی کـراوە و سـاڵی ١٩٩٨ لە سلێمانی چاپ کراوە. ناوەرۆکی ئەم کتێبە داستانی گێڕانەوەی خەون و کەشە سۆفیانەکەی میرزا سدیقە لەگەڵ شێخانی نەقشـبەندی. سـاڵی ١٩٩٥ بـردوویەتیە ئەسـتانبۆڵ و نیشـانی شێخ عوسمانی ئەدات و ئەویش پەسەندی دەکات و دواتر لە هەولێر لەسەر ئەرکی مامۆستا شێخ موحسین موفتی چاپ دەکرێت.
- **گژوگیا و ئاژەڵ**: ئەو کتێبە ساڵی ١٩٧٦ دەست بە نووسینی کراوە. کاك بورهان کـوڕی مامۆستا قانع و بەڕێز حاجی موحەمەد ڕەشید عبدالرحمن کاری هەڵەبڕی و ڕاستکردنەوەی دەقەکەیان کردووە و ساڵی ١٩٩٠ لە چاپخانەی ئاشتی سلێمانی چـاپ کـراوە. ٢١٦ لاپەڕەیە لە سێ بەشدا: بەشی یەکەم گژوگیای کوردستانی بە هۆنراوە هێنـاوە، بەشـی دووهەم ٢٩٥ گیای خۆڕسکی کوردستان و ڕوەکـی بـاوی تـر بە ناونیشـانی گیـاکە لە کـوێ دەڕوێـت و سوودی خواردن و دەرمانی چییە. بەشی سێهەم باسـی ئـاژەڵە ناسـراوەکانی کـوردەواریە و باسی بەکارهێنان و سوودەکانی کردووە.

لە لاپەڕە ١٤ دەگێڕێتەوە: *لە دوای ئەوە نووسەری ناوبراو کاك بورهان [قانع] کۆچی دوایی کرد. نووسراوەکانیش بە لای منەوە مانەوە تا کۆتایی ساڵی ١٩٨٦-١٩٨٧. بەهۆی ئاڵوگویزی ماڵ و هەندێ تەنگ و چەڵەمە لێمان ون بوو. کەوتە ژێر بەفرەوە لەگەڵ هەندێ کەلەپووری زۆر بەنرخ. لە ئاکاما کە دۆزرایەوە نیوە ڕزیو و نیوە پۆلکاو بوو بوون.* میرزا هۆی نووسینی ئەو کتێبە بەم شێوە لە لاپەڕەی ١٠ باس دەکات: *جا ئێستا لەبەر ڕووناکی ئایەتەکانی قورئانی پیرۆزا کە لەبارەی خوانی بێ حەیف و درێغی خۆیەوە دواوە و ئەفەرموێ: "...فاختلط به نبات الارض مما یاکل الناس و الانعام..."[1] منیش حەزم کرد بە پێی ئەو کەمە شارەزاییەی کە هەمە باسی هەندێ گژوگیاتان بۆ ئەکەم کە بەزۆری لە کوێ هەیە و خۆڕسکە یا خۆماڵییە. ڕەنگی گوڵ و گیا و قەد و باڵا و تامی چییە و بۆنی چۆنە، سوودە دەرمانیەکانی چییە. ناتوانم بڵێم لە سەداسەد سوودی دەرمانیەکانیان وە یا ناوی هەموویان پێشکەش ئەکەم. چونکە گژوگیا و ڕوەکەکانی خواکرد نووسینیان یان ژمارەیان لە توانای ئێمەدا نییە.* وەك لەسەرە باسمان کرد ئەم کتێبە بەیارمەتی چوار سەرچاوە (شێخانی بیارە، طب الکبیر، باب و باپیران، و ئەزموونی خۆیان) نووسراوە.

● **گەنجینەی دارستان بۆ داو و دەرمان:** ئەم کتێبە لە نێوان ساڵەکانی ١٩٩١ تا ١٩٩٥ نووسراوە و شێخ موحەمەد عەبابەیلێ کاری نووسینەوە و هەڵەبڕی کردووە. مامۆستا شێخ موحسین موفتی هەولێری پێیدا چووەتەوە و پێشەکی بۆ نووسیوە و ساڵی ١٩٩٩ لە چاپخانەی زانکۆی سەلاحەدین چاپ کراوە. میرزا سدیق لە لاپەڕە ٧ دەنووسێت: *ساڵی ١٩٩٥ هەر دوو کتێبەکەم [خەو و خەواریق و گەنجینەی دارستان] بردە ئاستانەی حەزرەتی شێخ سەراجەدین مورشیدی ڕێبازی نەقشبەندی پیرۆز لە ئەستانبۆڵ. چاوی کەرەم و ڕەحم و لوتفی پیا خشاندن و فەرمووی: زۆر پیرۆزن و بەدڵی بوو. فەرمووی لێرە بۆ ماوەی سێ مانگ بمێنەرەوە من لەسەر ئەرکی خۆم چاپیان ئەکەم.* لە لاپەڕە ١٤ دەنووسێت: *لە کتێبی گژوگیا و ئاژەڵدا باسی هەندێ گژوگیا کراوە، بەڵام مافی ڕەوای خۆیان نەدراوەتێ. بۆیە خۆم بە قەرزار زانی بەرامبەر ئەوانیش و ئێوەی بەرێزیش. بۆیە بە پێویستم زانی باسی هەندێکیانتان بۆ بکەم لەگەڵ سەرچاوەکانیشیانا.* لە لاپەڕە ١٥٠ ناوی ئەو سەرچاوانە سوودی لێ وەرگرتوون نووسیویە: *ئامۆژگاری و بەراورد کردنی باوباپیران،*

---

١. ناوەڕاستی ئایە ٢٤ سوورەتی یونس: *کەواتە ڕوەکەکانی زەوی لەوەیکە مرۆڤ و ئاژەڵەکان دەیخۆن، بە باراناو تێکەڵ [و شین] دەبن.*

*شێخانی بیارە، طب النبوی، طب الکبیر، طب الرحمە، طب المفید، سەد گیا و هەزار دەرمان، توحفەی حەکیمباشی، زمان خوراکی، قانون فی الطب، التداوی بالاعشاب طریقت العلمیە، پزیشکی خانوادە و الحلبە و النسوە.* لەم کتێبە باسی ٨٨ گیای کردووە لەسەر هەمان نووسینی گیاکان لە گژوگیا و ئاژەڵ، بەڵام هەندێ تۆکمە و تەواوتر. هەروەها لە بەشی دووهەم پێڕستی نەخۆشیەکانی هێناوە و لە بەرامبەردا گیا دەرمانیەکانی. لە بەشی سێهەمدا سوودە دەرمانیەکانی ئەو ٨٨ گیایە بە کورتی هێناوە.

**تێبینی:** لە بەشی پێش پێشەکیدا شێخ موحسین موفتی ساڵی ١٩٩٩ باسێکی نووسیوە لەسەر نرخی هەوڵەکانی میرزا سدیق بۆ بواری پزیشکی و هەروەها پەیوەستدانی بە ڕێچکەی پزیشکی بنەماڵەی شێخانی بیارەوە. دواتر میرزا سدیق سەرجەم باسی ژیاننامەی خۆی و بنەماڵەکەی و ئاوایی چنگیانی نووسیوە. ئەم بابەتە ساڵی ١٩٩٥ نووسراوە و لێرە دانراوە. دوایی بەشێکی پاشکۆی لەسەر شێخانی بیارە و مەلا مستەفا بارزانی نووسیوە.

• **هەڵبەستوێژ:** لە لاپەڕە ١٤٩ کتێبی "گەنجینەی دارستان" باسی ئەم کتێبە دەکات وەك دوابەرهەم. دیارە ئەم باسەی ساڵی ١٩٩٥ نووسیوە و هەواڵی ئەم کتێبەی داناوە. ئەگەرچی تا وەکوو ئێستە کارێك لەم بارەوە نەکراوە کە هەڵبەستەکانی میرزا سدیق چاپ بکرێن. لای بنەماڵەکەی چەندین فایلی دەنگ و ڤیدیۆ هەیە کە میرزا سدیق هۆنراوەکانی خۆی دەخوێنێتەوە. ئەم هۆنراوانە زۆرتر لەسەر ژیاننامەی خۆی و بنچینەی باب و باپیران و گوندی چنگیان، باسی هێزی حەمە ڕەشید خانی بانە و کۆماری کوردستان و دواتر پێوەندی لەگەڵ مەلا مستەفا بارزانی، باسی تەریقەت و شێخانی بیارە، ئامۆژگاری، و بابەتی سروشت و نیشتمانپەروەرییە. [هیوادارم بنەماڵەی بەڕێزی حەکیم میرزا سدیق ئەم ئەرکە وە ئەستۆ بگرن و ئەم خەرمانە جەز بکەن و پێشکەشی کتێبخانەی کوردی بکەن.]

• **بەشی نامە و پەڕەی دەستنووس و ڕەچەتەی دەرمانی:** وەك لە باسەکانی پێشوودا وتمان ئەم بەشە لە کەلەپووری ئەم بنەماڵە کە پێوەندی بە سەردەمی کۆنەوە بووە سەردەمی حکوومەتی بەعس پێش ڕاپەڕین و سەرەتای ڕاپەڕین تیاچوون. بنەماڵەکەی لە زمانی میرزا سدیقەوە باس لەوە دەکەن کە دەیان نامە و دەستنووسی پێشەوا قازی، مەلا مستەفا بارزانی و یادگاری کەسانی دیکە لای بووە کە بەداخەوە کاتی خۆی دزران یا فەوتان و بوونە داخێکی گران لەسەر دڵی میرزا. ئەڵبەت کۆپی بەشێك لە لاپەڕە جۆراوجۆرەکانی ڕەچەتە و ڕێنمایی میرزا سدیق هی سەردەمی دەرمانخانەی هەورامان گەیشتووە بە بەندە کە بەتەمای خوا لە کتێبی "بۆژانە" دەیخەنە بەرچاوی خوێنەران.

## سەرچاوەکان


● تـووداری سـید عبدالصـمد تـوداری، نورالانـوار در سلسـله آل اطهـار، پەخشـانگای حوسەینی نەسەب، چاپی یەکەم، سنە، ١٣٦٩

● تیشـکۆ زەنـد، بـابەتی: کەریـم زەنـد و وەڵامێـك بـۆ ئاکـام دەرگەزێنـی، مـاڵپەڕی: *www.kurdistanpost.nu*، ڕێکەوتی: ٢٠١٧/١١/٠

● شەهین موحەممەدی و هاوکارانی، کوماسی دیـاری از فرهنـگ و تنـوع، پەخشـانگای ڕێباز، چاپی یەکەم، مەریوان، ١٣٩٥

● موحەممەد عەلی قەرەداغی، دیوانی مەولەوی، ئامادە کردن، بەرگـی ٢، چـاپی یەکەم، پەخشانگای ئاراس، هەولیر، ٢٠١٥: لاپەڕە ٩٨٩

● میر شەرەفخان بدلیسی، شەرەفنامە، وەرگێڕانی: مامۆستا هەژار، پەخشـانگای ئـاراس، هەولێر، ٢٠٠٦

● میرزا سـدیق ئەحـمەد چنگیـانی، خەو و خەواریـق، چـاپی یەکەم، پەخشـانگای ...، سلێمانی، ١٩٩٨

● میرزا سدیق ئەحمەد چنگیانی، گژوگیا و ئاژەڵ، چـاپی یەکەم، پەخشـانگای ئاشـتی، سلێمانی ١٩٩٠

● میرزا سدیق ئەحمەد چنگیانی، گەنجینەی دارستان بۆ داو و دەرمـان، چـاپی یەکەم، پەخشانگای زانکۆی سەلاحەدین، هەولێر، ١٩٩٩

● مەلا ڕەسوول ئەدیب، دیوانی ئەدیـب، کـۆکردنەوە: گیـوی موکریـانی، چـاپی یەکەم، هەولێر، ١٩٦٠

• وتوویژەکان:

○ سۆفی عومەر پێنجوێنی: تەمەن ١١٠ ساڵ، دانشتووی شاری سلێمانی. وەك خۆی باسی دەکرد زیاتر لە ٣٠ ساڵ نامەبەری نێوان شێخ عوسمان دوورۆ و مەلا مستەفا بارزانی بووە. ڕێکەوتی دیمانە: ١٣٩٥/٠٣/١٥

○ سۆفی عەلی خاکی: تەمەن ٨٥ ساڵ، دانشتووی شاری مەریوان. چەند ساڵێك لە خانەقای دوورۆ بووە و ئاشنایەتی باشی لەگەڵ خوالێخۆشبوو میرزا سدیق هەیە. ڕێکەوتی دیمانە: ١٣٩٧/٠٣/١٢

○ حاجی ئەحمەد نەیەری: تەمەن ٨٥ ساڵ، دانشتووی ئاوایی نەیەر لای بانە. خێزانەکەی خوشکەزای میرزا سدیقە. ڕێکەوتی دیمانە: ١٣٩٦/٠٤/٢٠

○ عەلیرەزا کوڕی میرزا سدیق: تەمەن ٦٥ ساڵ، دانشتووی شاری سلێمانی. ڕێکەوتی دیمانە: ١٣٩٥/٠٣/١٥

○ شێخ مەحموود کوڕی شێخ سدیق: تەمەن ٦٠ ساڵ، دانشتووی سلێمانی. کاتی خۆی ئەم پیاوە بۆ لەچاپدانی گزۆگیا و ئاژەڵ یارمەتی میرزا سدیقی داوە. بنەماڵەکەی لەگەڵ ماڵی میرزا سدیق چاك یەکتر دەناسن. ڕێکەوتی دیمانە: ١٣٩٥/٠٣/١٥

○ سامان کوڕی میرزا سدیق: تەمەن ٤٥ ساڵ، دانشتووی شاری سلێمانی. ڕێکەوتی دیمانە: چەندین دیمانە لە ساڵەکانی ١٣٩٥ تا وەکوو ئێستە.

## عارف و حەكیمی گەورە شێخ بابا سەعیدی غەوساباتی

ئەم وتارە تەنیا كورتەیەكە لە باس و ژیانی یەكێك لە بنەماڵە گەورەكانی خاندانی بەرزەنجی ناوچەی موكریان. غەوسابات یەكێك لە ئاواییەكانی شارستانی بۆكانە كە بنەماڵەی بەرزەنجی شێخ بابا سەعید بە خەڵكی ئەم ئاواییە دەناسرێن. بابا سەعید بەرزنجی ناسراو بە شێخ بابا سەعید (لەدایكبوون ١٢٣٥ لە غەوسابات، مردن ١٢٩٣ كۆچی لە بۆكان) پزیشك، مامۆستا، شاعێر و عارفێكی گەورەی كورد بووە لە سەردەمی قاجارەكاندا. لای بنەماڵەكەی و خەڵكی ناوچەكە شێخ بابا سەعید بە شەهید ناسراوە.[1] لە كتێبی "ضمیمه نگاهی به تاریخ مهاباد، لاپەڕە ٨٤، ١٣٨١" بە وەرگیراو لە كتێبی "ایرانی كه من شناختم" نیكیتین دەڵێت: شێخەكانی [كوردستان] و كەسانی دەوروبەریان بەخێرایی باسی جەهاد و خەباتیان بڵاو كردەوە و تەنیا یەكێك لەو شێخانە بە ناوی شێخ بابا كە لە ناوچەی سابلاخی موكری ژیانێكی پارێزكارانەی هەبوو و لای كوردەكان كەسێكی بەڕێز و خۆشەویست بوو بەرامبەر بەم شەڕ و جەهادە هەڵوێستی گرت. ئینجا توركەكان [واتا عوسمانیەكان] بەهۆی هەڵوێستەكەی و هەروەها هەڵسوكەوتی میهرەبانانەی لەگەڵ مەسیحیەكان، لە زستانی ١٩١٥ لە سێدارەیان دا.

لە شەڕی ڕووس و عوسمانیەكان تەنیا شێخ بابا سەعید نەبوو كە پێوە بوو. كاتێ خەڵكی كوردستان زانییان شەڕەكە سیاسییە نەك ئایینی، بڕێك لە حاكم و مامۆستاكان نهێنی هەڵوێستی بێلایەنیان گرت و پەنامەكی پێوەندییان بە ڕووسەكانەوە گرت.

---

١. بابەتی: شێخ بابا، نووسینی: سید نجم الدین انیسی، گۆڤاری مەهاباد، ژمارە ١٢٧، ١٣٩٠ هەتاو، هەروەها ویكیپیدیای فارسی: بابەتی بابا سعید برزنجی. بەرواری: ١٣٩٧/٠٣/٢٠

عوسمانیەکان کاتێ بەم هەڵوێستەیان زانی دەستیان بە کوشتن و سێدارەدانیان کـرد. لە ٢٩ مـانگی مـوحەڕەمی ١٣٣٣ (١٩١٥ ز.) بە فەرمـانی ئیبـراهیم بەتلیسـی فەرمانـدەی گەورەی عوسـمانیەکان مـوحەمەد خـان کـوڕی یـۆنس خـان حـاکمی بانـە دەسـتگیر دەکرێـت و بەیانیەکەی تیربارانی دەکەن. دەگێڕنەوە کە موحەمەد خان کوڕی یۆنس خـانی بانـە ئیـزن وەردەگرێـت لە عوسـمانیەکان و سـوورەی یاسـین دەخوێنێـت بە سـەر خۆیـدا. هەروەهـا سەیفەدین خانی ئەردەڵان حاکمی سەقز و موحەمەد حوسێن خان حاکمی بۆکـان دەگـرن و لە مەراغە لە سێدارەیان ئەدەن. لە ئاوایی کارێزەی مەهاباد شێخ بابـا سـەعید غەوسـاباتی کە یەکێك لە شێخانی قادری بووە، دەیگرن و ئەویش لە سێدارە ئەدەن.[1]

بەرواری ١٣٩٦/٠١/٣١ لە مەهاباد ڕوونمایی لە کتێبی "زندگی نامە عارف شـهید حضـرت شیخ بابا سعید برزنجی غوثآباد"[2] لە نووسینی سـەیید مەسـعوود سـەعیدی کـرا. زیـاتر لە باسی سەرەوە بە کورتی ئەم کەسـایەتیە گەورەیە بەپێـی نـاوەڕۆکی ئەو کتێـبە بەم جـۆرە دەناسرێت: شاعێر و عارفی شەهید شێخ بابـا سـەعید بەرزنجـی ناسـراو بە صـدار السـادات کوڕی شێخ اسـماعیل [ناسـراو بە کلاوقـووچ] سـاڵی ١٢٧٥ کـۆچی لە غەوسـاباتی مەهابـاد هاتووەتە دنیاوە. دەرسە سەرەتاییەکانی حـوجرە لە خـزمەت باوکیـدا دەسـت پـێ کـردووە. پاشان لە بەردەستی کەسانێك وەکوو مەلا عەبـدوڵا پیرەبـاب [مزگەوتـی ئـاوایی ئـۆتمیش]، مەلا سەلیمی شاعێر و مەلا عەلی قزڵجـی [مزگەوتـی تورجـان] درێـژە بە خوێنـدن ئەدات. دواتر بەرەو باب الشیخ بەغداد و الازهر میسر بارگە و بنە دەپێچێتەوە. شـێخ بـۆ فێربـوونی پزیشکی و دەرمانگەری دوو ساڵان لە کشمیری هێندوسـتانیش ئەمێنێـتەوە. هەروەهـا بـۆ وەرگرتنی ڕێبازی عێرفـانی و تەریقەتـی قـادریە لەسـەر دەسـتی حـاجی کـاك ئەحـمەدی بەرزنجی ناسراو بە کاك ئەحـمەدی شـێخ مـاوەیەك لە سـلێمانیش دەبێـت و ئیجازەنـامەی ئیرشادی ئەو تەریقەتە وەردەگرێت و دەگەڕێتەوە بۆ غەوسابات.

ئەگەر کەشـی ژیـان و بەسـەرهاتی ئەو پیـاوە دەخـوێنیتەوە هەسـت بەوە دەکەیـت لە سەردەمی قاجارِ کەسایەتیەکی بیرکراوە و ئازاد بـووە کـە لە موکریانـدا ژیـاوە. شـێخ کـاتێ دەگەڕێتەوە بۆ زێد و نیشتمانەکەی، هەر زوو بازنەی پەیوولەکانی دەوری فراوان و فراوانتـر دەبێت و دەتوانێت چەندین کاری نـاوازە و مرۆڤدۆسـتانە بخـاتە ڕێ، وەکـوو: دامەزرانـدنی

١. موحەمەد ڕەئووف تەوەکولی، جغرافیا و تاریخ بانه، پەخشانگای تەوەکولی، چاپی یەکەم، ١٣٨٧

٢. کتێبی: "زندگی نامه عارف شهید حضرت شیخ بابا سعید برزنجی غوثآباد"، نووسینی: سید مسعود سعید، ....، ١٣٩٥

یەکەم دەرمانگـای نـاوچەکە بە نـاوی "دارالشـفا"، دامەزرانـدنی شـوێنێك بـۆ پارێزگـاری لە نەخۆشانی گولی بە ناوی "گولخانە"، دانانی شوێنێك بۆ بێسەرپەرست و بەسـاڵاچووەکان بە ناوی "قەلەندەرخانە"، پەروەردە کردنی پزیشك و دەرمانگەر، هەروەها خوێنـدن بە کچـان و ژنان. کەواتە نموونەی ئەم کارانە و هەڵوێستەکانی دیکەی غەوسـابات دەکـاتە شـوێنێك بـۆ ڕێچکەیەکـی تـایبەتیی پەروەردە و بارهێنـانی خەڵکـی نـاوچەکە. لە هێـرش و هەڵکوتـانە سەرێکی ناجوانمێرانە و نامرۆڤانەدا کتێبخانەکەی غەوسـاوا تـاڵان دەکرێـت و لە یەکێـك لە هێرشەکاندا بەیەکجاری ٢٥٠٠ بەرگی کتێب دەسووتێنرێت.

لە پـاش شـێخ ئەو دەسـتنووس و کتێبـانەی کە بە میـرات گەیشـتوون بە نەوە و نەوەزادەکانی و تا ئێستە پارێزراون، بریتین لەمانەی خوارەوە:

- کتێبی "طب گیاهی و سنتی": ئەم کتێبە پڕە لە ڕێنمایی و ئامۆژگاریەکانی پزیشـکی و هەروەها سوود و تایبەتمەندی گیاکانی ناوچەکە کە بۆ چارەسەری نەخۆشەکانی داناوە.
- کتێبی "ترجمه طب فرنگی"
- کتێبی "ترجمه بخشی از کتاب قانون ابن‌سینا"
- دیوانی سەعیدیە: شێخ بابا نووسینی ئەم کتێـبەی ٢٥ جمـادی الاخـر ١٣٢٤ کـۆچی دەست پێ کردووە. بەشێوەی شێعر دەیان هۆنراوەی لەسەر شـەریعەت و تەریـقەت دانـاوە. [هۆنراوەکانی ئەو کتێبە بە زمانەکانی کوردی و فارسی و تورکیە.[1]]
- دیوانی مثنوی معنوی: لەسەر ڕێبازی مەولانای بەلخی و هاوشـێوەی مەسـنەویەکەی مەولانا، شێخ بابا باسی ئەوین و عێرفان و پارێزگاری کردووە و دیوانەکەی بە "مشنو از نی" دەست پێ کردووە. ئەم کتێبە ساڵی ١٢٩٢ کۆچی نووسراوەتەوە، واتا ساڵێك پـێش شـەهید بوونی.
- کتێبـی سـیر و سـلوك عرفـانی: ئەو کتێـبە سـاڵی ١٢٩٢ کـۆچی نووسـیویەتیەوە و بابەتەکەی پلە و ئاستی شوێنکەوتوانی ڕێبازی تەریقەتی قادریەیە.
- کتێبی "زندگی نامه و کرامات شیخ عبدالقادر گیلانی"
- کتێبی "منشات": بەرهەمێکـی نـاوازەیە و بـریتیە لە نـامە و پەیـامی نێـوان شـێخ و هاوڕێ و مۆرید و کەسانی دیکە، کە دەیان و سەدان بابەتی لێکۆڵینەوەی ناوچەی موکریان و گشت کوردستانی تێدایە.

---

١. بابەتی: شێخ بابا، نووسینی: سید نجم الدین انیسی، گۆڤاری مەهاباد، ژمارە ١٢٧، ١٣٩٠ هەتاوی

## دکتۆر سەعید خان کوردستانی

دکتۆر سەعید خان کوردستانی ناسراو بە پیروز، ساڵی ١٢٤٢ هەتاوی لە شاری سنە بە دنیا هاتووە و ساڵی ١٣٢١ هەتاوی (١٣٦١ کۆچی) لە هەمەدان کۆچی دوایی کردووە. زانا و پزیشکێکی ناوداری کوردستان و گشت ئێران بووە. لە شارەکانی هەمەدان، سنە و تاران کاری پزیشکی کردووە. چەندین وتار و کتێب و بەرهەمی بە دوای خۆی بە جێ هێشتووە.

مەلا ڕەسوولی باوکی پیاوێکی دیندار و خوێندەوار بووە و لە ناوشاری سنە پیشەی مامۆستایی و مەکتەبداری کردووە. سەعید کەسێکی زۆر زیرەك و وریا بووە. بە چاوەدێری باوکی دەخوێنێت. پاش ئەوەی لە ١٣ ساڵاندا باوکی دەمرێت، ناچار دەبێت هەوڵی دابین کردنی بژیوی ژیانی خۆی بدات. ساڵی ١٢٥٨ هەتاوی قەشەیەکی مەسیّحی بە ناوی یۆحەننا لە ورمێ دێتە سنە و لە کلیسای ئەو شارە نیشتەجێ دەبێ. فارسی چاك نەزانیوە و بە شوێن کەسێکدا گەڕاوە کە بیکاتە وەرگێڕی خۆی. خەڵك سەعیدی پێ دەناسێنن. پاش ماوەیەك نێوانیان زۆر خۆش دەبێت. یۆحەننا کتێبی زۆر لەبەردەستی سەعید داناوە کە بیخوێنێتەوە، بەتایبەت ئەو کتێبانەی پەیوەست بوون بە ئایینی مەسیّحیەتەوە. سەعید کە ئەو کتێبانە دەخوێنێتەوە هۆگری فێربوونی زمانی سوریانی دەبێت و دوای دەکەوێت.

ساڵی ١٢٦٠ هەتاوی بانگخوازێکی مەسیّحی لە شاری هەمەدان بە ناوی جیمز هاکس کە مامۆستای زمانی فارسی بووە، دەمرێت. بانگ لە سەعید دەکەن کە بچێت بۆ هەمەدان. لەوێ دەست بە مامۆستایی دەکات. پاش ماوەیەکی کورت دەچێتە سەر ئایینی مەسیّحیەت [و ئیتر ناوێرێت لەترسی حوکمی هەڵگەڕانەوە لە دینی ئیسلام بگەڕێتەوە بۆ سنە]. لەوێ ئینگلیسی فێر دەبێت و هاوکات دەبێتە دەستیار و وەرگێڕی دکتۆر ئەلکساندر. وردە وردە لە دەرمانگای ئەلکساندر دەچێتە ناو دڵی ئەزموون و فێربوونی پزیشکییەوە. زۆر بەجوانی و

تۆکمەیی فێری دەبێت و گۆرانی داهاتووی مسۆگەر دەکات. سەعید پاش ماوەیەك بەرەو تاران دەچێت و دەکەوێتە بەردڵی مسیۆنرە مەسیحیەکانی ئەو شارە. زۆر خۆشیان ویستووە و ئەویش زۆرتر مەسیحیەت دەچێتە دڵیەوە. بەهاری ساڵی ١٢٦٦ هەتاوی لەگەڵ ڕبکا کچی سیمۆن لە تاران هاوسەرگیری دەکات و تا کۆتایی ژیان پێکەوە دەبن. سەعید وردەوردە بەهۆی شاگردی کردنی دکتۆر ئەلکساندر فێری پیشەی پزیشکی دەبێت و دەست بە چارەسەری و سەردانی نەخۆشان دەکات. سەرەڕای خوێندنەوەی کتێبە پزیشکیەکانی کۆن، ڕوو لە خوێندنی سەرچاوە و وتارەکانی پزیشکی تازە دەکات. ساڵی ١٢٧٢ دکتۆر ئەلکساندر لە کاری دەرمانگەکەی دەکشێتەوە و خەڵك داوا لە سەعید دەکەن تا هاتنی دکتۆرێکی دیکە لە جێگەی ئەم دکتۆر ئەلکساندر دابنیشێت. هەر بۆیە سەرجەم کارەکانی دەرمانگاکە وەکوو دەرمانگەری، دەرمانسازی، پەرستاری و چاوەدێری شەوانە بەئەستۆ دەگرێت. نەورۆزی ١٢٧٢ دکتۆر هاڵمزی ئەمریکایی دێتە جێی دکتۆر ئەلکساندر. پاش ماوەیەك کە ئەو دکتۆرە ئامریکاییە دێتە هەمەدان، سەعید بڕیار ئەدات سەردانی دەرەوەی وڵات بکات. هەندێ پارەی کەم دەبێت لە دۆستانی قەرز دەکات و زۆر بە قەناعەت و دەست پێگرتنەوە ساڵی ١٨٩٣ لە وڵاتی سوید دەمێنێتەوە و دواتر بەرەو بریتانیا دەچێت. لەوێ لەگەڵ دکتۆر وارن ئاشنا دەبێت. ئەم دکتۆرە یەکێك لە پزیشکانی ناسراوی ئەوکاتەی لەندەن بووە. ڕێگە و جێگەی خوێندن بۆ سەعید دابین دەکات.

سەرنجام پاش ماوەیەك سەعید لە بەشی نەشتەرگەری و فیزیۆلۆژی لە زانکۆی کۆکی لەندەن دکتۆرا وەر دەگیرێت. ئەگەر کاتێکی زیادی دەست کەوتووە بەتامەزرۆییەوە چووە و توێژینەوەی کردووە لەسەر دەرمانسازی و میکرۆبناسی و ئەو زانستانەش فێر بووە. هەروەها چووەتە ناو دنیای لقی پزیشکی نەخۆشینەکانی چاو. هەر بۆیە بووەتە پسپۆڕێکی لێهاتووی چاویش. ساڵی ١٢٧٤ هەتاوی دەگەڕێتەوە بۆ ئێران و لە هەمەدان دەست بە کاری دەرمانگەری و چارەسەری دەکات. بەهاری ١٢٨١ دیسان بەرەو لەندەن دەڕوات. ئەمجارە دەبێتە ئەندامی ناوەندی پۆلی کلینیکی لەندەن. لە بوارەکانی ناسینی جۆری نەخۆشیەکان، میکرۆبناسی و نەخۆشیەکانی بواری چاو، ئەزموونی تۆکمەتر دەکات. بەهۆی دۆستی دێرینیەوە دکتۆر پاتریك ئاشنا دەبێت لەگەڵ دکتۆر هانس، دۆزەرەوەی میکرۆبی گوللی. هەر بۆیە لەو بارەوە گەلێك زانیاری لەسەر گوللی بەدەست دەهێنێت. [ئەوکاتە گوللی، نەخۆشیەکی بەربلاو بووە لە ئێران و گشت کوردستان.]

ساڵێك دواتر دەگەڕێتەوە بۆ ئێران. دکتۆر سەعید ساڵی ١٩٠٥ هەمەدان بە جێ دەهێڵێت

و بەرەو تاران کۆچ دەکات. حەوت ساڵان لەوێ دەمێنێتەوە. ساڵی ١٢٩١ هەتاوی وکیل الملك کوردستانی و سەید نەجمەدین هەمرۆڵەیی داوایی لێ دەکەن بگەڕێتەوە بۆ سنە. پاش ٣٠ ساڵان دەگەڕێتەوە بۆ زێدەکەی. لەو هاتنەوەیەدا جیا لە سنە سەردانی هەمرۆڵە و هەورامانیشی کردووە. چەند مانگێك کە لە سنە دەبێت بێ بەرامبەر نەخۆشی زۆری چارەسەر کردووە. پاش نزیکەی ٣ مانگ دەگەڕێتەوە بۆ هەمەدان و تاران. ساڵی ١٢٩٩ نۆرینگەکەی لە تاران بووە. هاوینی ١٣١٥ دیسانەوە خەڵکی سنە داوای لی دەکەن بگەڕێتەوە بۆ سنە و لەوێ خزمەتی پزیشکی خۆی بکات بە مرۆڤەکان. هەر بۆیە تا هاوینی ١٣١٦ لە سنە دەبێت و پاشان دەگەڕێتەوە بۆ هەمەدان. لەو ساڵەدا شەوێك پیاوانی ڕەزاخان هەڵدەکوتنە سەر ماڵەکەی و دەیگرن. پاش لێپرسینەوە و دەستبەسەر کردنی دەر ئەکەوێت کە هۆکاری گرتنەکەی نامەگۆڕینەوەی دکتۆر سەعید و سەرۆك هۆزەکانی کوردستان بووە. لە یەکێك لە لێپرسینەوەکانی بە پیاوەکانی زیندان دەڵێت: *من پیاوێکی سیاسی نیىم و حەزیشم لەو کارە نییە، بەڵام خەڵکی کوردستان هاونژادی منن و بۆ چارەسەری نەخۆشیەکانیان سەردانی من دەکەن. بەپێی بڕیار و بەڵێنی دەروونی و پیشەیی و مرۆڤایەتی خۆم کار دەکەم. ئەوان خۆشەویستی خۆیان بەرامبەر من دەنوێنن و منیش بەو شێوەیە وڵامیان ئەدەمەوە.* پاش ٣ مانگ لە زیندان بەر ئەبێت. ئیتر لەمە بەدوا نۆرینگەکەی دائەخات و خانەنشین دەبێت و دەست بە نووسین دەکات. لەو ماوەیەشدا خەڵك نەخۆشەکانیان دەبەنە ماڵەکەی و لەوێ چارەسەریان دەکات. ساڵی ١٣١٨ هەتاوی هاوسەرەکەی کۆچی دوایی دەکات. مەرگی ڕیکا کاریگەری زۆر دائەنێت لەسەر دکتۆر سەعیدی بەساڵاچوو. سەرنجام ئەویش ساڵی ١٣٢١ هەتاوی (١٣٦١ کۆچی) لە هەمەدان بەرەو لای یەزدان دەگەڕێتەوە.

ئەو پیاوە کەسێکی ڕووخۆش و قسەخۆش بووە. باوڕبەخۆبوونەکەی لە ئاستێکی بەرزدا بووە. بەگۆترە و کوێرکوێرانە قسەی خەڵکی قەبووڵ نەکردووە. ئاشنایی تەواوی بووە لەگەڵ زمانەکانی عێبری، عەرەبی، [فارسی، ئینگلیسی، کوردی ئەردەڵانی و هەورامی]. نازناوی شێعری پیروز بووە. کتێبێکی شێعری بە ناوی "نزانی" بە کوردی هەورامی نووسیوە و ساڵی ١٣٠٩ هەتاوی چاپی کردووە.[1] [دکتۆر مەزهەر ئەدوایی توێژینەوەیەکی بەربڵاوی لەسەر

١. لاپەڕە ٢٦٨-٢٧٠، بەرگی ٢، کتێبی مشاهیر کورد، وەگیراو لە کتێبی (طبیب محبوب، نووسینی دکتۆر کیدی ئالێن، وەرگێڕان لە ئینگلیسیەوە، چاپی تاران)

دکتــۆر ســەعید کوردســتانی ئەنجــام داوە و لە وتارێکــدا بــڵاوی کــردووەتەوە. بــۆ ئەوەی زانیاریەکانی سەرەوە لەگەڵ ئەنجامی توێژنیەوەکانی دکتۆر مەزهەر تێکەڵ نەبــن، بە بــژاردە بڕێ لەو زانیاریانە بۆ ئێرە دەگوازینەوە.][1]

• ســەردەمی قاجــاڕ بە دەرکەوتنــی پزیشــکی تــازە لە ئێــران ئەوانەی دەیانویســت ئەو پزیشــکیە فێــر بــن، دەبــوایە لە ناوەنــدەکانی دارالفنــون بخــوێنن و دواتــر لەســەر ئەرکــی حکوومەت یا بە پارەی خۆیان سەردانی زانکۆکانی ئەورووپا بکەن. سەعید خان کوردســتانی جیــا لە ڕێچــکەی بــاوی ئەو ســەردەمە نەچــووەتە دارالفنــون، بەڵام لە ڕێگــایەکی دیــکەوە توانیویە بڕواتە ئەورووپا، واتا بەهۆی ئاشنابوونی لەگەڵ بــانگخواز و مســیۆنەرەکانی مەســیحی کە ئەوکاتە لە ئێران چالاك بوون.

• سەعید خان هاوکات کتێبەکانی ڕازی و ابن‌سینای خوێنــدووەتەوە کە تــا ســەردەمی قاجارِ سەرچاوەکانی پزیشکی لە ئێران و دنیای ئیسلام، ئەو کتێبانە بووە.

• ئەوکاتەی دکتۆر سەعید لە هەمەدان بووە بێ ئەوەیکە ئەزمــوونی کــاری تــاقیگەیی و کرداریی نەشتەرگەری و توێکاری ئەندامەکانی لەشی مرۆڤ و هەروەها فیزیۆلــۆژی بزانێــت، کتێبی زۆری خوێندووەتەوە. هەر بۆیە لەباری خوێندنەوەدا خــۆی ئامــادە کــردووە. ئەڵــبەت ئەوکاتە لە ئێران کردنەوە و شیکاری ئەنــدامەکانی مــردووی مــرۆڤ بــۆ فێربــوونی زانســتی پزیشکی پاوان بووە و کەس نەیوێراوە بەڕاشکاوی بیکات. دکتۆر سەعید حەزی لە فێربوونی ئەو زانستە بووە. هەر بۆیە چووەتە لەندەن و لەوێ فێر بووە.

• جارێك دکتۆر سەعید و دکتۆر کۆك پێکەوە کار لەســەر شــیکاری بەدەنــی نەخۆشــێك دەکەن. سەعید خان پرسیار لە کۆك دەکات کە سوودی ئەو دوو غــوددەی ســەر گــورچیلە چییە؟ دکتۆر کۆك وڵامی ئەداتەوە: *کــارێکی ئەوتــۆ نــاکەن و کــاریگەری بەرچاویــان نیــیە.* دکتۆر سەعید دەڵێت: *لە شوێنێك خوێندوومەتەوە کە میکرۆبی سێل لەســەر ئەو دوو لــووە نیشتەجێ دەبن و هەر ئەو میکرۆبە بــووە ئەدیســۆنیان کوشــتووە. ســەیری ئەو ســێ ڕەگە خوێنە بکە بۆ ئەو لووانە دێن. دیارە کە خوای گەورە بــێ هــۆ ئەوانەی نەخولقانــدووە و ئەو ڕەگ و لووانە پێکەوە کارێك دەکەن.* دکتۆر کۆك دەڵێت: *دیارە لە وڵاتی خــۆت پزیشــکێکی ناسراو و پسپۆڕی.* دکتۆر سەعید ڕووی تێ دەکــات و دەڵێــت: *وێــدەچێ تەشــقەڵەمان پــێ*

---

١. ئەدوایی مەزهەر، "دکتۆر سەعید خان، اسطوره اخلاق پزشکی کردستان در دوره قاجار و پهولی اول (فیزیولوژیست و چشم پزشك)، گۆڤاری تاریخ پزشکی، ژمارە ٢٢، بەهاری ١٣٩٤

*بکەیت.* کـوک دەڵێـت: *نە، بەڵام دیـارە زۆر وردبینـی. دڵنیـام قسـەی تـۆ ڕاسـتە.* مـاوەیەك دەگوزەرێت توێژەران شیفر و ئەلیفێر پەی بە کرداری فیزیۆلۆژیکی لووی سەر گورچیلەکـان دەبەن و لە وتارێکی زانستی بڵاوی دەکەنەوە.

● دکتۆر سەعید ١٢٩١ هەتاوی بۆ چارەسەری نابینا بوونی عەباسقولی سوڵتان سـەردانی ئاوایی ڕەزاو[١] دەکات. ئەگەرچی هەوڵێکی زۆر ئەدرێت تا دکتۆر سەعید دڵنیا بێتەوە خەڵکی خەڵکی ناوچەکە ئەوانەی لەسەر پاشگەزبوونەوەی دکتۆر لە ئیسلام تـووڕە بـوون و ئەگەری کوشتنی لە ئارادا بووە. دکتۆر کاتێ عەباسـقولی خـان دەپشـکنێت بـۆی دەر ئەکەوێـت کە تووشی نەخۆشی تەراخومی چاو بووە. هەر بۆیە ژانەسەری تووش کـردووە. هەروەهـا خـان ڕێژەی قەندی خوێنی لە سەرێ بووە. چل ڕۆژ چاوی دائەپێچیت و بەرنامەیەکی خواردن بۆ دائەنێت، پاشان دەست بە نەشتەرگەری دەکات. تا سەرنجام چاکی دەکاتەوە.[٢]

● ساڵی ١٢٨٣ هەتاوی کە دکتۆر سەعید لە لەنـدەن دەگەڕێـتەوە بـۆ هەمەدان، کـوڕی سالار السلطنه[٣] حاکمی هەمەدان تووشی نەخۆشیەکی کوشندە دەبێت. هەموو دکتۆرەکـانی ئەوکاتە بێ‌هیوا دەبن لە چـاکبوونەوەی. دکتـۆر سـەعید دەیپشـکنێت و چـاکی دەکـاتەوە. هەروەها کوڕی ئەمیر ئەفخەمی هەمەدانـی لە نەخۆشـی وەبـا و سـکچوونی خـوێن ڕزگـار دەکات.

● ساڵی ١٢٨٤ لەلایەن عین الدوله، صدرالاعظمی ئەوکاتەی ئێران بانگێشت دەکرێت تـا لە تاران خزمەتگوزاری پزیشکی بکا.

● سـاڵی ١٣١٥ دەگەڕێـتەوە بـۆ سـنە و مـاوەیەك لەوێ دەمێنێـتەوە، گەلێـك نەخـۆش چارەسەر دەکات و خەڵکێکی زۆر سەردانی دەکەن بۆ چارەسەری. تـا ئەو جێگـایە توانیـویە بێ بەرامبەر کاری کردووە، بەڵام ئەگەر کەسێ بۆ دەستخۆشانە شتێکی بە دکتۆر داوە تەنیا هێلکە و مریشکی کـوردی، ڕۆن، گەنـم و ئەو شـتە خۆماڵیـانەی وەرگرتـووە. ئەڵـبەت ئەو کەسانەی هەژار و دەستکورت بوونە لەبری ئەوە شتێکیان لێ وەربگرێت پارە یا لەو شتانەی بۆی هاتوون، پێی بەخشیون.

● پیاوێکی زۆر لەسەرخۆ، قسەخۆش، قسە پاك، بەپشوو و بەڕێز بووە.

● حەیدەر عەلی کەمـاڵی نووسـەر و ڕۆژنـامەوانی ئێرانـی سـەردەمی پەهـلەوی یەکەم

١. ئاواییەکە لە ناوچەی ژاوەرۆ سەر بە شارستانی سەوڵاوا

٢. باسی سەفەری دکتۆر سەعید بۆ ڕەزاو، بەتەسەل لە کتێبی "رزاو در عصر قاجار و پهلوی" هاتووە.

٣. کوڕی ناسرەدین شای قاجارِ بووە و ماوەی ٢ ساڵ بە حاکمی هەمەدان دانراوە.

دەنووسێت: *ئێرانیەکان دەبێ خۆشحاڵ بن بەوەی دکتۆر سەعید کوردستانیان هەیە. چونکە لە دەرەوە پلە و پایەی پزیشکی دکتۆر بووەتە هۆی شانازی ئێمە و هەم ئەوەیکە لە ناوخۆ ژان و دەردی نەخۆش و دەردەدارەکان چارەسەر دەکات. دەبێ خەڵك لە نزیکەوە بێتە تاران و بیناسن. با بزانن چۆناهی دڵسۆزانە و بەبەزەییانە بە دەم نەخۆشەکانەوە دەڕوات و چارەسەریان دەکات. هەموو تاران ئاگەدارن ئەو دکتۆرە چەندە دڵسۆزە.*

• میرزا حوسەین دیوان بەیگی لە بیرەوەریەکانی خۆیدا ئەنووسێت: *هەفتا ڕۆژ بوو تووشی نەخۆشی سینەوپاڵوو (ذات‌الریه) بووم. ١٥ خەرمانانی ١٢٨٨ بۆ چارەسەری چوومە ماڵی دکتۆر سەعید و چارەسەرم وەرگرت و چاك بوومەوە.*

• میرزا عین السلطنه لە بیرەوەریەکانیدا دەنووسێت: *دکتۆر سەعید کوردستانی یەکێك لە ئازادیخوازانی سەردەمی مەشرووتیەت بوو. دواتر ماڵەکەی هاتووەتە تاران. ئەو پزیشکە بە یەکێك لە پیاوە ناودارەکانی ئێران ئەژمار دەکرێت. هەروەها دەنووسێت داستانی ئاشنایەتی من و دکتۆر سەعید دوور و درێژە و دەگەڕێتەوە بۆ ئەوکاتەی کە باوکم حاکمی کوردستان بووە.*

• دکتۆر سەعید هەمیشە سەرەڕای چارەسەری و دانانی دەرمان، ئامۆژگاری نەخۆشەکانی کردووە کە تەندروستی واتا مرۆڤ دەبێ پێوەندی نێوان بەدەن و ڕۆح بپارێزێ. ئەو لفەدوانە لەسەر یەك کاریگەرییان هەیە و دەبێ یادی خوا لەبەرچاو بگرن تا ڕۆح هێمن بێتەوە. جا ئەگەر ڕۆح و ڕەوانی مرۆڤ هێمنی وەرگرت زۆرێك لە نەخۆشینەکانی جەستە و ڕەوان بۆخۆیان لائەچن و نامێنن.

• لەو کاتەوە بووەتە دەستیاری دکتۆر ئەلکساندەر بابەت و زانیاری پزیشکی بە وتار لە گۆڤار و ڕۆژنامەکان بڵاو کردووەتەوە. بەئانقەست بابەتەکانی بە زمانێکی ساکار و ڕەوان نووسیوە تا بەتایبەت خانمان تێی بگەن و بتوانن بیخوێننەوە.

• دکتۆر سەعید لە گۆڤاری "عالم نسوان" بابەتی لەسەر ئاو و نەخۆشیەکانی بڵاو کردووەتەوە. ئەوکاتە مامۆستا و خوێندکارانی قوتابخانەی ئامریکایی کچان لە تاران داوای لێ دەکەن لەسەر ئاوی لوولەکەشی ماڵان بابەتێك بنووسێت. جا هەر بۆیە ساڵی ١٣٠٨ هەتاوی کتێبێکی ٤٨ لاپەڕەیی لەسەر ئاو و نەخۆشیەکانی نووسیوە. ئەو کتێبە سەرەڕای تایبەتمەندیەکانی ئاوی تەندروست، سەرجەم نەخۆشی و میکرۆبەکانی ناو ئاوی نیشان داوە و چەندین بابەتی دیکەی خستووەتە پاڵی، وەکوو: ڕەچاو کردنی خاوێنی، پالاوتنی ئاو، زیادکردنی قسڵ و ڕەژی بە ئاو لە ماڵاندا، کوڵاندنی ئاو، هەروەها ئەو نەخۆشیانە لەڕێگەی

ئاو دەگوازرێتەوە بۆ ئینسان. ئەڵبەت دكتۆر نامەیەك بۆ سەرنووسەری گۆڤاری ناوبراو دەنێرێت و بۆی دەنووسێت كە بابەتەكانی بە زمانێكی سادە و ڕەوان نووسیوە تا خانمەكان بە ئاسانی بتوانن بیخوێننەوە و تێ بگەن.

● نامیلكەیەكی چكوولەی لەسەر چارەسەری نەخۆشی پای سپاسالاری ئێران نووسیوە، كە پێشتر هیوایان بە چاكبوونەوەی نەبووە.

● دكتۆر سەعید جیا لە كاری پزیشكی چەندین كاری گەورەی بۆ فەرهەنگ و مێژووی كورد كردووە. یەكێك لەوانە ناساندنی قەبالە كۆنەكانی سەردەمی ئەشكانی بووە كە لە هەورامان دۆزراونەتەوە و نیشانی پسپۆڕانی زانكۆكانی برلین، كەمبریج و ئەكسفۆردی داوە تا ئەوان خوێندوویانەتەوە و وتاریان لەسەری نووسیوە.

● لەسەر داواكاری مینۆرسكی و ئەدوارد براون بۆ ناساندنی زمانی كوردی هەورامی، دكتۆر سەعید كتێبی "نزانی" واتا مزگانی نووسیوە.

● پاش ئەوەی سالّی ١٣١٦ لەلایەن شارەبانی هەمەدان دەستبەسەر دەكرێت و لە زیندانی قەسر قەجەر ڕایدەگرن. دەستبەجێ ئەو هەواڵە بە هەموو ئێراندا بلاو دەبێتەوە. بەشێكی بەرچاو لە كەسایەتیە ناودارەكانی كوردستان و پیاوانی ئایینی دەستڕۆیشتوو نامەی بۆ دەنووسن و هەواڵی دەپرسنەوە. دكتۆر هاروی كۆشینگ لە ئەمریكا نامەیەكی بۆ دكتۆر سەعید دەنێرێت كە لەگەڵ سەرۆك كۆماری ئەوكاتەی ئەمریكا، رزۆلۆت، قسەی كردووە و هەواڵی دەستبەسەربوونت پێی دراوە. سەرنجام باڵوێزەكانی ئینگلیس و ئەمریكا دەست بە كار دەبن و لەگەڵ حكوومەتی ڕەزاخان قسە دەكەن كە ئازادی بكەن. هەروەها سامۆئیل كوڕی دكتۆر سەعید كە دامەزرێنەری بانكی ئینگلیسی بووە لە ئێران، نامەیەك دەنووسێت بۆ ڕەزاخان و داوای لێ دەكات باوكی پیری لە زیندان ئازاد بكات. سەرنجام پاش ٣ مانگ و نۆ ڕۆژ لە زیندان دێتە دەرەوە.

## ڕەچەتە پزیشکییەکانی شێخ ئەمین بێژوێ

ئاوایی بێژوێ دەکەوێتە چەقی ناوچەی ئالانی سەردەشت. خانەقای نەقشبەندی ئەو ئاواییە شوێنێکی بەناوبانگە لە ناوچەکانی سەردەشت و قەڵادزێ و بانە. ساڵی ١٢٧٠ کۆچی لەسەر دەستی شێخ ئەحمەدی سەراوی (مردن: ١٣١٣ کۆچی) باوکی شێخ ئەمین (١٢٧٤-١٣٧٨ کۆچی) ئەو خانەقایە بنیات نراوە. ئەو خانەقایە جێگەی کۆبوونەوەی ئالانیەکان، مامۆستا و فەقێ و کەسایەتیە ناسراوەکان بووە. شێخ ئەحمەد سەراوی خەڵکی ئاوایی سەراوی سوبحان ئاغای شارەزوور بووە و کاتی خۆی بووەتە خەلیفەی شێخ سەراجەدین و پاشان هەر بە فەرمانی شێخ هاتووەتە ناوچەی ئالان. مزگەوت و خانەقای بێژوێ خاوەنی دەستنووسخانەیەکی دەوڵەمەند بووە و دوای شێخ ئەمین کەوتووەتە لای شێخ ڕەئووف (مردن: ١٣٨١ هەتاوی).[1] شێخ ڕەئووف کوڕی شێخ موحەمەد کوڕی شێخ ئەمین بووە. شێخ موحەمەد پێش ساڵەکانی ١٣٧٨ کۆچی مردووە و سەرپەرستی شێخ ڕەئووف بە باپیری بووە.

بەرواری ١٣٩٧/٠٣/٠٨ بە سەردان چوومە ماڵی مامۆستا حامید ئەدیب (تەمەن ٧٠ ساڵ) لە شاری سەردەشت. ئەو مامۆستایە دەبێتە کوڕی مەحموود کوڕی موحەمەد سادق کوڕی شێخ ئەحمەدی سەراوی. چەندین کتێبی دەستنووس و بەڵگەی ئەو بنەماڵەیە لای مامۆستا حامید دەپارێزرێت. لە ناو ئەو دەستنووسانە کە سەرنجی زۆرتر ڕاکێشام: دەستنووسێك بە خەتی شێخ ئەحمەدی سەراوی، چەند پارچە هۆنراوەی هەورامی ئەحمەد بەگی کۆماسی و ڕەچەتەیەکی پزیشکی شێخ ئەمینی بێژوێ بوو، هەروەها گەلێك یادەورەی

---

١. ماڵپەڕی: http://zmziran.persianblog.ir/ وەرگیراو لە (زندگی‌نامە شێخ موحەمەد ئەمین و تتمەی فرمایشات او)، شێخ ڕەئووف نەقشبەندی، لاپەڕەی ١١

ئەو بنەماڵە و ناوچەکە کە خەزێنەکەی لای مامۆستا حامیدە و دەبێت بەتەسەل لە بەرنامەیەکی تر سەردانی بکەین و بیگێڕینەوە و تۆماری بکەین.

مامۆستا حامید باسی لەوە دەکرد کە کاتی خۆی شێخ ڕەئووف هەوڵی خستبووە گەڕ کە هەموو یادەوەری و ڕەچەتە پزیشکیەکانی خوالێخۆشبوو باوکی کۆ بکاتەوە و لە کتێبێکدا بینووسێتەوە. [مامۆستا ئاگەداری ئەوە نەبوو کە ئایا ئەو کارە بە ئەنجام گەیشتووە و ئێستە دەستنووسەکەی لای بنەماڵەکەیە یا ئەوەیکە شێخ ڕەئووف فریا نەکەوتووە ئەو کارە بکات.] شێخ ڕەئووف چەندین کتێب و نامیلکەی لە سەردەمی خۆی لە بابەتە جیاوازەکان چاپ کردووە و دیارە کە چەندین بابەتی لای منالەکانیە و هێشتا چاپ نەکراوە. دیسان بۆ زانیاری، کتێبخانەی ئەم بنەماڵەیە یەکێك لەو شوێنانە بووە کە بەرهەمە دەستنووسەکانی زانایانی سەردەمانی زووی سەردەشت وەکوو یوسف اصم، بێتووشی و ابن حاج تێدا هەڵگیراوە.

لەم گوزارشە ئاماژەیەك بە چەند یادەوەری و ڕەچەتەی پزیشکی شێخ ئەمینی بێژوێ دەکەین کە مامۆستا حامید گێڕاویەتیەوە:

● دەگێڕنەوە تازە باوی چایی خواردن هاتووەتە سەردەشت و یەکێك لەو بنەمالانەی ناوچەی ئالان کە یەکەم جار چایی کڕیوە، شێخ ئەحمەدی سەراوی بووە. گوایە شێخ ئەمین گوتوویە کە چایی خواردنەوەیەکی سوودبەخشە و چاکە بۆ مرۆڤ، بەڵام ئەم قەند و قلیانە لەگەڵی دەخورێت چایی خراپ دەکات و زیان بە تەندروستی مرۆڤەکان دەگەینێت.

● دەگێڕنەوە کە سۆفی سالّح ناوێك لە بێژوێ بووە. تووشی نەخۆشیەك دەبێت کە بەجۆرێك تەواوی لێو و دەوری دەمی دەقەڵشێت و بریندار دەبێت. دەڕواتە خانەقا و پرس بە شێخ ئەمین دەکات کە فریای بکەوێت و شتێکی بۆ بنوێنێت چاك بێتەوە. شێخ ڕایدەسپێرێت کە بچێتە کوێستانی سیتی بێژوێ و چەند چەپکێك پێچووکە[1] هەڵبکەنێت و بیهێنێتەوە. گوایە پێی گوتووە کە هەر چەپکێك پێچووکە بکاتە سێ بەشەوە و بەم جۆرە بەکاری بهێنێت: بەشێکی بە ڕووتی بەنانەوە بخوات. بەشی دووهەمی بجنێت و هەندێ ڕۆنی پێوە بکات و بە سوورەوەکراوی بیخوات و بەشی کۆتایی بیکوتێت و لێی بگرێت.

● دەگێڕنەوە شێخ ئەمین بۆ بالووکە و زیاگۆشتی سەر پێست، پرپرەی[2] داناوە کە لێی

---

١. پێچووکە هەمان گیایە کە لە ناوچەکانی دیکەی کوردستان پێی دەڵێن: پیچك و هەندریشە

٢. پرپرە هەمان گیایە کە لە ناوچەکانی دیکەی کوردستان پیی دەڵێن: پەڵپینە، پارپارە، پەرپینە و دگان‌تیژکەرە تیژکەرە

بگرن. بەکارهێنانەکەی بەم جۆرە بووە کە پرپرەکە هەڵبسووی لە بالووکە و زیاگۆشتەکە. ئەو کارە چەند جار دەبێ دووپات بکرێتەوە.

● لە ناو یەکێك لە دەستنووسەکانی مامۆستا حامید ئەدیب، ڕەچەتەیەکی پزیشکی بەرچاوم کەوت کە گوایە شێخ ئەمین داوای کردووە بۆی دابین بکەن و لەوانەیە بۆ چارەی نەخۆشی خۆی یا خەڵکی ویستوویە. لە خوارەوەی ئەو ڕەچەتەیە نووسراوە: *مرسله ملا اسمعیل بیژوی ٣٥/٠٦/٢٣*. دیارە کە چەند مانگێك پێش کۆچی دوایی شێخ ئەمین ئەو ڕەچەتە نووسراوە.

ناوەرۆکی ڕەچەتەکە ئەمەیە:

جوز بویا ٢ دانه، جوزبا ٢ دانه، قاقله صغری ٢ مثقال، امله ٢ مثقال، سینامکی ٥ مثقال، سنبل خوشبو ٥ مثقال، دارچینی ٥ مثقال، زنجبیل ٥ مثقال، حیل [: هل] ٥ مثقال، جاتر [: جاتره، آویشن کوهی] کوهستان ٥ مثقال، قرنفل ٣ مثقال، هلیله سیاه ٥ مثقال، فلفل ٣ مثقال، دارا [؟] ٢ مثقال، پوست هلیله زرد ٥ مثقال، بابنەپیچ [؟] ٢ مثقال، تخم رازیانه ٥ مثقال، تالیشاری ٢ مثقال، ابوالقا ٣ مثقال، خولنجان ٥ مثقال، زردەچیوە ٥ مثقال: ادویه ٢١ جمعا

**تێبینی:** دەرمانەکانی جاترە کێویلە، بابنەپێچ، تاڵیشاری و زەردەچێوە کە لە سەرەوە ئاماژەیان پێ کراوە بە هەمان شێوەزاری کوردی ناوچەکە نووسراون.

## سەید موحەمەد حەکیم ئەلیاسی ناسراو بە اشرف الحکمای کوردستان[1]

خوالێخۆشبوو سەید موحەمەد ئەلیاسی کوڕی خزر لە نەتەوەی سەیدەکانی ئاوایی بـاینچۆی نزیك شاری سنەیە. شەوی چوارشەمە مانگی زیقەعدەی ساڵی ١٢٨٩ کۆچی (١٨٧٢ زایینـی) لە ئاوایی سیاسەران لە باوشی بنەماڵەیەکی دیندار، زانسـتپەروەر و حەکـیم لە دایـك بـووە. حەکیمـی و دەرمـانگەری لەو بنەمـاڵەیە نەریتێکـی بـاو بـووە و تـا وەکـوو ئێسـتەش هەر بەردەوامە. سـاڵی ١٩٣١ بە پێشـنیار و داواکـاری کۆمەڵێـك لە مامۆسـتایانی بەناوبانـگ و وانەبێژی دارالاحسانی شاری سنە بە فەرمانگەی ئەوکاتەی تەندروستی و نەزمـیەی گشـتی کوردستان نازناوی اشرف الحکمای کوردستان بە سـەید مـوحەمەد حەکـیم دەبەخشـرێت. ساڵی ٢٠٠٩ کە کۆڕبەندی سەرتاسەری (طلای سبز) لە تاران بەسترا نازنـاوی (ابـن سـینای ثانی) بەخشرا بە گیانی پاکی ئەو حەکیمە کوردە و لە ڕۆژنامەی (دیار کهـن) ئەو خەڵاتە و ڕاپۆرتێك لە ژیاننامەکەی بڵاو کرایەوە.

سەید موحەمەد هەر لە منداڵیەوە خاوەنی زیرەکی و هۆشێکی تایبەتی بووە. لای باوکی فێری خوێندنەوەی قورئان و هەندێ لە کتێبە سـەرەتاییەکانی ئەو سـەردەمە بـووە. پاشـان ڕێگەی فەقێیەتی دەگرێتە بەر و لە خوێنـدنگەی ئـایینی بیـارە دەگیرسـێتەوە و هەر لەوێ ئیجازەی مەلایەتی وەردەگرێت. ئەڵبەت لەگەڵ خوێندنەکەی ڕێگەی تەریقەتی نەقشـبەندی لەسەر دەستی شێخ زیائەدین دەپێوێت و دەبێتە پێڕەوێکـی ئەو ڕێبـازە تـا کۆتـایی ژیـانی. سەرەتا ماوەی ٤ مانگێك دەبێتە مامۆستای مزگەوتی ئاوایی شـێخ وەجـیم لای سیاسـەران. دیارە وەك دەگێڕنەوە سەید موحەمەد چـونکە پزیشـکی و چارەسـەری پیشـەیەکی بـاب و باپیرانی بووە، لە سەردەمی خوێندنیدا لە کتێبخانەی بیارە و حوجرەکانی دیـکە کتێبەکـانی پزیشکی و سروشتی خوێندۆتەوە و کەڵکـی وەر گرتـووە و بە شـارەزایی و چـاوکراوەیەکی

١. ئەم وتارە لە گۆڤاری هەگبەی سروشت، ژمارە ٢، سلێمانی، ساڵی ٢٠١٨ چاپ کراوە.

زیاترەوە لەسەر ئەو پیشەیە شانبەشانی مەلایەتی ڕێگەی ژیانی بڕیوە. هەر لە شێخ وەجیم لەگەڵ کاری مەلایەتی، دەرمانگەری و چارەسەری بۆ نەخۆشانی ئاوایی و دەوروبەر دەکات. وەك باس دەکرێت شکستەبەندی و گرتنەوە و خستنەوە جێی شکیانی دەست و پێی بە سەخترین شێوە چارەسەر کردووە و ناوبانگی بۆ هەموو ئاواییەکانی ناوچەی بیجاڕ و دیواندەرە و سنە ڕۆیشتووە.

ناوبانگی شکستەبەندی و دەرمانگەری سەید موحەمەد ڕۆژبەڕۆژ زیاتر بووە. جارێك بە ئەسپەکەی ڕێگەی دەکەوێتە لای سنە و لە گەڕانەوە بە سەر شەڕ و تێکەڵچوونی پیاوانی خانی ئاوایی قلیچیانی لای سنە لەگەڵ چەند چەتە و دزێك دەکەوێت. کەیخودای ئاواییەکە عەبدولکەریم تەختەیی پیاوێکی دەوڵەمەند، دیواخاندار، خوێندەوار و خاوەن کتێبخانە بە توندی بریندار دەبێت. پەرینسا خێزانی کەیخودا کەریم ڕوو ئەکاتە سەید موحەمەد حەکیم و دەڵێت: *دڵنیا بە ئەگەر مێردەکەم چاك بکەیتەوە لە بوون و نەبوونی ماڵی کەیخودا هەرچی و هەرچەندەت گەرەك بێت پێت ئەدەین.* حەکیم قۆڵی لێ هەڵدەماڵێت و بەیارمەتی دەوا و دەرمانێك کە لە توورەکەکەیدا بووە و ئەوەی کە لە ناودێ و ماڵی کەیخودا دەست کەوتووە پاش چەند ڕۆژ کەیخودا سەر پێ دەخاتەوە. لە سۆنگەی تیمار و چارەسەرکردنەکەدا کە هاوسەر و منداڵەکانی کەیخودا بەردەستی و پەرستاری دەکەن حەکیم دڵی ئەچێتە سەر زیرەکی و دەستوبردی یەکێك لە کچەکانی کەیخودا بە ناوی ڕابیعە خانم. پاشان ڕابیعە خوازبێنی دەکات و دەیخوازێت و کەیخودا کتێبخانە دەوڵەمەندەکەی بە سەید موحەمەد حەکیم ئەسپێرێت. ئینجا سەید موحەمەد حەکیم لەگەڵ رابێعە خانم لە سنە لە گەڕەکی چوارباخ ماڵێك دەگرێت و هەواری زستان و پاییزانی لە سنە دەبێت و بەهار و هاوینانایش دەڕواتەوە بۆ حسێن خان لای هاوسەری دیکەی.

بەردەوام پێوەندی بە هەواری حسێن خانیشەوە هەبووە و لەوێ یەکێك لە شاگردە زیرەکەکانی واتا سەید هاشمی برازای توانیویە ئەزموونەکانی حەکیم وەربگرێت و بەکاریان بهێنێت و تەنانەت دوای خۆیشی جێگرەوەی سەرەکی حەکیم بێت. دەگێڕنەوە کە سەید هاشم پاش مردنی سەید موحەمەد حەکیم هێندە پسپۆڕی هەبووە کە ماڵ و دیواخانەکەی شەو و ڕۆژ کراوە بووە بۆ وەرگرتنی نەخۆشی ناوچەکە و کەس بە بێهیوایی نەگەڕاوەتەوە. مەعسوومە خانم پیروەیسی خێزانی سەید هاشم وەك پەرستار ئاگەداری لە نەخۆشەکانی کردووە و تا کۆتایی چاکبوونەوە لە ماڵی خۆی ڕایگرتوون. ئەو نەریتە دوای مردنی سەید هاشم (١٩٨٣) گەیشتووە بە کوڕەکەی، سەید عوبەید، کە ئێستە لە شارۆچکەی تەقتەقانی

سنه نۆرینگەی تایبەتی هەیە و هاوینانه دەگەڕێتەوە بۆ حسێن خان، هەروەها سەید زاهێد تەمەن ٦٠ ساڵ کوڕەزای حەکیم ئەویش لە مەریوان نۆرینگە و دەرمانخانەیەکی بە ناوی ئەشـرەفولحوکەمای کوردستانی داناوە و ئەزموونەکانی باب و باپیرانی خۆیان بۆ چارەسەرکردنی خەڵك بەیارمەتی پاشخانی مەزنی پزیشکی خۆماڵی کوردەواری پێشکەش دەکەن.

ساڵی ١٩٢١ سەید موحەمەد حەکیم لەگەڵ سەید ئەحمەدی برای سێ دانگ لە ئاوایی حسێن خان لە هادی خان ئەمیر عەلایی گەڕووس دەکڕن. ئەو ئاواییە لە دەشتێکی بەرزی ناوچەی گەڕووسە و پڕ لە گیا و گوڵی پزیشکی و نایابە. سەید موحەمەد لە حسێن خان ماوەیەك کە دەمێنێتەوە وەك جاران تەواوی ژیانی خەریکی چارەسەری و خزمەت بە نەخۆشەکانی دەکات. وەك دەگێڕنەوە بەردەوام کاتژمێرێك یا زیاتر بەر لە بانگی بەیانی لە خەو هەستاوە و دەستنوێژی گرتووە و تا کاتی نوێژ قورئانی خوێندووە و تێفکریوە لە دنیای دەروون و دەرەوەی خۆی. پاش نوێژەکەی سەرێك چووەتە سەر کتێبی دلائل الخیرات. بەهاران و هاونیان بەر لە خۆرهەڵاتن ڕێگەی کوێستانەکانی حسێن خان و هەروەها دەشت و دۆڵی شاپەسەن لە ئاوایی شێرکوژی سەرەوەی گرتووەتە بەر و هەموو گیا و گوڵی پێداویستی دەرمانگەریەکەی لەو کوێستانانە کۆ کردووەتەوە. وەك باسی دەکەن سەید موحەمەد حەکیم بۆیە ئاوایی حسێن خانی کڕیوە کە دڵی لە دەوڵەمەندی لەوەڕگە و کوێستانی پڕ لە گوڵ و گیای ئەم ئاواییە چووە. بۆیە لە ئاواییەکانی لای سنه هەستاوە لە نزیك گەڕووس و بیجاڕ گیرساوەتەوە. دەگێڕنەوە کە جاری وابووە کەسانێکی کە ناردووە بۆ گژ و گیا، زانیویە لە بەشی سێ دانگەکەی تری هادی خان کۆیان کردووەتەوە. گەردن ئازایی لە هادی خان خواستووە ئینجا گیاکانی بەکار هێناوە. چونکە باوڕی وابووە کە دەرمانی حەڵاڵ شەفابەخشە. هەمیشە دەرمانخانەیەکی گەڕۆکی پێ بووە. توورەکەی دەرمانەکانی خستووەتە سەر ئەسپەکەی و لە ڕێگا هەر کەس ڕووی لێ خستووە خۆبەخشانە چارەسەری کردووە و دەرمانی پێ داوە. وەك دەگێڕنەوە لە هەموو شارەکانی دوور و نزیکی کوردستان و ئێران هاتوونەتە لای، وەکوو: سلێمانی، مەهاباد، سەقز، زەنجان، سەمەرقەند و هتد. چەندین کتێبی دەستنووس و چاپی پزشکی بە دیاری لەملا و ئەولا بۆی هاتووە و هەندێکیان ئێستەش ماون.

چەند نموونە لەو کتێبانەی لە کتێبخانەی ئەو پزیشکە حەکیمە بە جێ ماوە:

١. یەکێك لەو پزیشکانە کە ماوەیەك لە بەردەستی شاگردی کردووە کتێبێکی پزیشکی

پێ بەخشیوە. ئەو کتێبە ساڵی ١٨٧٣ لە چاپخانەی ئەمیر لە وڵاتی لوبنان چاپ بووە.

٢. کتێبی دستور العلاج: ئەو کتێبە لە شاری سەمەرقەند چاپ بووە و فارسیە و یەکێک لە نەخۆشەکانی بۆی هێناوە.

٣. کتێبی شرح الاسباب فی علم طب: ئەو کتێبە عەرەبیە دەستنووسە پوختەیەکە لە کتێبە پزیشکیەکانی جالینووس، ابی سهل مسیحی (ساڵی ٤٠١ کۆچی مردووە و مامۆستای ابن سینا بووە)، ڕازی و قانوونی فی الطب ابن سینا کە حاکم شەرع و مامۆستای گەورەی شاری سنە مەلا مەحموودی موفتی کوردستانی پێی داوە. چیرۆکی دیاری کردنی ئەو کتێبە بەم جۆرە بووە: قەمەرنسا خانم خێزانی مەلا مەحموود نەخۆشیەکی سەخت و کوشندەی تووش دەبێ. سەردانی نۆرینگەی تایبەتی سەید موحەمەد حەکیم دەکەن. نەخۆشیەکە لە بەشی سینگی خێزانی مامۆستا دەبێت. سەید موحەمەد حەکیم بە مامۆستا دەڵێت دەبێ من بە برای ئەم خێزانەت قەبووڵ بکەیت تا بتوانم دەست بدەم بە سینەیەوە. بۆیە مامۆستا ئەم داواکاریە وەردەگرێت و دواتریش هەر بە خاڵۆ بانگی دەکەن. مەلا مەحموود پاش ئەوەی خێزانەکەی چاك دەبێتەوە ئەو کتێبە کە کاتی خۆی لە سلێمانی کڕیویە (هەندێك دەڵێن موفتی الازهر بۆی ناردووە) و هەمیشە خۆشی ویستووە دیاری دەکات بە سەید موحەمەد حەکیم. نووسین و واژۆی مامۆستا لە لاپەڕەی کۆتایی کتێبەکەدا هەیە.

٤. کتێبی فتح الوهاب: ئەم کتێبە بە خەتێکی جوانی مامۆستا عەبدولحەکیمی ئارەنانی ساڵی ١٢٨٤ کۆچی لە شاری سنە نووسراوەتەوە. ساڵی ١٣٤٤ کۆچی مەلا سعدالدین شەهابی دیاری کراوە بە سەید موحەمەد.

٥. کتێبی علوم و اعمال جراحی: ئەو کتێبە دکتۆر یاکووب ئەدوارد پۆلاك نەمسەوی (١٨١٨ - ١٨٩١) دەرمانساز، پزیشك و نەشتەرگەری گەورەی نەمساوی لە نێوان ساڵەکانی ١٨٥١ – ١٨٦٠ کە ماوەی ١٠ ساڵان پزیشکی تایبەتی ناسرەدین شای قاجار و خوێندنگەی دارالفنونی تاران بووە، نووسیویە. سەید موحەمەد واحیدی مامۆستای ئاوایی پشتەنگ ساڵی ١٩١٣ لە تاران کڕیویە و هێناویە بۆ سەید موحەمەد حەکیم. دیارە کە یەکەم خوێندنگەی زانستی سەردەم لە ئێران دارالفنون بووە. ئەو کاتە سەید موحەمەد ئاگاداری خوێندنی و پێشکەوتنەکانی ئەو خوێندنگەیە بووە. بۆیە ڕایسپاردووە کە ئەو کتێبەی بۆ بکڕن.

وەك باسی دەکەن سەرجەم کتێبەکانی کتێبخانەی کەیخودا عەبدولکەریم قڵیچیان و هەروەها کتێبخانەکەی خۆی بەردەوام لە سنە و حوسێن خان لەگەڵی بووە و کەڵکی لێیان

وەرگرتووە. پاش کۆچی دوایی حەکیم زۆربەی کتێبەکانی لە ئاوایی حسێن خان لەبەر کەمتەرخەمی و خەمساردی بنەماڵەکەی دڵۆپە و باران لە ناویان دەبەن. ئەوانەی وا ماونەتەوە ئێستاکە لای بنەماڵەی ئا سەید جەعفەر و کوڕەکانی ئا هاشمی برازای لە شاری سنە دەپارێزرێن. وەك باسی دەکەن حەکیم هۆگرییێکی تەواوی هەبووە بە کتێبی مەسنەوی مەعنەوی مەولانای ڕۆمی، منطق الطیری عطار نەیشابووری، شاهنامەی فێردەوسی و هتد. بەشێك لە کتێبی شاهنامەکەی ئێستەش ماوە کە کاتی خۆی لە بەمبەیی هێندستان چاپ بووە. کاتی هێرشی ڕووسەکان بۆ سەر کوردستان، ئەو هێزە ڕێگەیان دەکەوێتە ناوچەی گەڕووس و لەوێ ئوردوو دەخەن. وەك دەگێڕنەوە سەید موحەمەد بە هەر جۆرێك بووە توانیویە کە بزانێت بە شێوازی نەشتەرگەری و چارەسەری پزیشکانی ناو هێزەکە چۆن بووە. یەکێك لەو شتانەی لە ڕووسەکان فێر بووە شێوازی تەقەڵ و برینی برین بووە. دەگێڕنەوە لەسەر داوای سەنجەر خانی نەڕانی، سەید موحەمەد حەکیم دەبێتە برینپێچ و دەرمانگەری سپاکەی سەنجەر خان. هەروەها گوایە لە ڕێگەی نێوان سنە و دیواندەرە سەید موحەمەد و هاوڕێیانی ئاغافڵ و کوتووپڕ هەڵدەکوتنە سەر پەلێك لە سەربازانی ڕووس و تێکیان دەشکێنن.

ڕۆژێك لە ڕۆژان سەربازانی ڕووس هەڵدەکوتنە سەر ماڵی حەکیم. ئەوکاتە حەکیم خەریکی خوێندنەوەی تەفسیری حوسەینی بووە. یەکێك لە سەربازەکان خەنجەرێك دەکوتێتە ناو کتێبەکە و ئێستەش شوێنەواری بەو کتێبەوە ماوەتەوە. چەند کتێب و نامیلکەی دیکە لە کتێبخانەی ئەو گەورەپیاوە بۆ ئێمە بە جێ ماوە وەکوو: کەشکۆڵی شێعری شاعێرانی کۆنی کورد، قورئانێکی دەستنووس، کتێبەکەی مامۆ عەبدوڵا کە شێوەی کەشکۆڵە و شێعری ئێل بەگی جاف و هەروەها چیرۆکی خەوەکەی سەید موحەمەد حەکیم بە شێوەی هۆنراوە تێیدا تۆمار کراوە، قەواڵەی کڕینی ئاوایی حسێن خان و چالاوی سوور، شەجەرەنامەی حەکیم تا سەردەمی سەفەویەکان، نامەیەکی ئامۆژگاری شێخ عەلائەدین بیارە بە سەید موحەمەد حەکیم، نامیلکەیەکی نامە و بیرەوەری ڕۆژانەی ئاغایەکی گەڕووس، نامیلکەیەك کە باسی ژن و تایبەتمەندیەکانی ژن دەکات، هەروەها هەندێ پەڕە و پەراوێزی تر.

وەك دەگێڕنەوە کە سەید موحەمەد حەکیم داوای یارمەتی لە شێخ عەلائەدین دەکات کە گوایە ماوەیەکە نەخۆشەکانی شەفا ناگرن و کەمتر چاك دەبنەوە. شێخ لە وڵامدا دەنووسێت کە لەوانەیە تەماع و چاوی دنیایی پێشی بەو کارە گرتبێت. سەید موحەمەد

دوای ئەو ئامۆژگاریە بەردەوام هەوڵی داوە پـارە لە کەس وەرنەگرێـت و چـاوەڕوانی پـارە و دینار نەبێت. مەگین کابرا خۆی بە زۆر شتێك دابنێت.

بەشێك لەو کتێب و نامیلکانە کە سەید موحەمەد خۆی دایناوە و ئێستە بە دەسـتنووس ماونەتەوە و چاپ نەکراون:

١. دستور العلاج کە بە توحفەی تەبـابەت دەناسـرێت. ئەو کتێـبە ٨٣ لاپەڕەیە و سـاڵی ١٣٢٦ کۆچی نووسیویە و لەسەر تایبەتمەنـدی و سـوودی پزیشـکی ڕوەکە دەرمانیەکـان و بەکارهێنانیان بۆ چارەسەری نەخۆشیەکان دانراوە. بەشێوەیەکی جـوان و بەپێـی ڕیزبەنـدی ئەلفوبێ نووسراوە.

٢. هەزاران ڕەچەتەی پزیشـکی نووسـراو و نەنووسـراو، کە تەنیـا بەشـێکیان مـاوە و هەڵگیراوە و تۆمار کراون. وەك: دەرمانە سوورە، دەرمانی ددانی ئێشـە، دەرمـانی بێهۆشـی و هتد.

٣. وەك دەزانین سەید موحەمەد حەکیم تەنیا حەکیمی ئەبدان نەبووە بەڵکوو حەکیمـی ئەدیانیش بووە. نامیلکەیەکی ٨٠ لاپەڕەیـی سـەبارەت بە عیبـادات و ئامۆژگـاری بە فارسـی نووسیوە.

٤. کتێبی سراج الطریق کە پێك هاتووە لە ٥٠ بەش، کە سـەبارەت بە پـالاوتنی دەروون و عێرفان و تەریقەتە.

وەك دەگێڕنەوە هۆی هاتنی سەید موحەمەد حەکیم بۆ شاری سنە بۆ ئەوە دەگەڕێـتەوە کە پاش هاوسەرگیری لەگەڵ ڕابیٔعە خانم و هاتوچۆ بـۆ لای گەورەپیـاوان و نەخۆشـەکانی شاری سنە، مامۆستایان و پیاوماقووڵانی شار داوای لێ دەکەن کە نـۆرینگەکەی لە حسـێن خان بگوازێتەوە بۆ شاری سنە. هەروەها لە لایەن خوێنـدنگەی دارالاحسـان و مامۆسـتایانی ناوشار دەیکەن بە مامۆستای مزگەوتی دارۆغە. ئەوکاتە کە ماڵەکەی لە تەنیشت ماڵی میـرزا مـوحەمەد کەرباسـی لە گەڕەکـی چواربـاخ بـووە دەتوانێـت زیـاتر پەرە بـدات بە کـاری دەرمانگەری و چارەسەری نەخۆشەکانی. هەر لەو سـەردەمە بە پێشـنیاری حـاکم شـەرعی کوردستان مەلا مەحموودی موفتی سێ ڕۆژ لە هەفتە تا نیـوەڕۆ بـۆ کـاری دەرمـانگەری و پزیشکی دەچێتە سەربازخانە و پادگانی سپای حکـوومەت و پـاش نیـوەڕۆ لە نـۆرینگەکەی خـۆی لە ناوشـار لە خزمەتـی خەڵکـی ئاسـاییدا دەبێـت. لە ئەنجـامی چارەسـەر کردنـی نەخۆشیەکی زۆر سەخت و گراندا کە بۆ یەکێك لە فەرمانـدەکانی پادگـان، ناوبـانگی سـەید موحەمەد حەکیم زیاتر بڵاو دەبێتەوە و دکتۆر عبدالله بەرپرسی تەندروستی ئەوکاتەی سـنە

و هەروەها بەرپرسی گشتی نەزمیەی وڵات لقی کوردستان بە ژمارە نامەی ۳۳۰۲ بەرواری ۱۳۱۰/۱۰/۰۸ هەتاوی (۱۹۳۱) بە نووسراوێکی فەرمی دەستخۆشی لە سەید موحەممەد دەکەن و ڕێزانەی دەوڵەتی پێ دەبەخشرێت. هەروەها سەرجەم مامۆستایانی شاری سنە نامەیەك دەنووسن و گەواهی ئەوە ئەدەن کە سەید موحەممەد حەکیم شایانی نازناوی اشرف الحکمای کوردستانە. ئەم نامەیە کە ئێستەش ماوە کۆپیەکی دەدرێت بە فەرمانگەی نەزمیەی وڵات لقی کوردستان و ئەوانیش ئیجازەنامەی فەرمی بۆ کردنەوەی نۆرینگەی پێ ئەدەن و ئیتر لەمەودوا بە اشرف الحکمای کوردستان دەناسرێت. بەپێی یاداشتەکەی سەید موحەممەد پشتەنگ کە ساڵی ۱۹۱۳ (۱۲۹۲ هەتاوی) لە پشت کتێبی "علوم و اعمال جراحی" نووسیویە، نازناوی "اشرف الحکما" ئەوکاتە بەکار هاتووە بۆ سەید موحەممەد. گوایە ئەو نازناوە یەکەم جار لە داواکاریەکەی دەرباری موزەفەرەدین شای قاجار بۆ سەید موحەممەد هاتووە. کاتی خۆی لە نووسینگەی دەرباری شای ئێران بەفەرمی داوا لە سەید موحەممەد دەکرێت بۆ کاری دەرمانگەری و پزیشکی بڕواتە دەربار، بەڵام ئەو حەکیمە خۆی لا ئەدات لە قەبووڵ کردنی ئەو داواکاریە.

**مردنی سەید موحەممەد حەکیم**

ئەو کاتەی هەوڵە بنەڕەتیەکان بۆ دامەزراندنی حکوومەتی ئیسرائیل لە ڕێگەی بە دەست خستنی جمگە و هەلە ئابووری و سیاسی و کۆمەڵایەتیەکان لە هەموو وڵاتان لای جوولەکەکان هەوڵێکی گشتگیر بووە لە کوردستانیش بەتایبەت شاری سنە هەموو زێڕینگەر و پزیشکەکان جوولەکە بوون و خەڵك بۆ ئەم پیشانە چاویان لە دەستی ئەوان بووە. دیارە هاتنی پزیشکێکی لێزان و دڵسۆزی موسڵمان بۆ شاری سنە لای جوولەکەکان ناخۆش بووە. سەید موحەممەد حەکیم وەك نەریتی هەمیشەیی خۆی شەوانە گۆزەیەك ئاوی لەبەر پەنجەرەی دیوەکەی داناوە کە سارد بێتەوە و بەیانی بە نەخوریتی پیش بەرچایی و چاشتینە لێی بخواتەوە. وەك دەگێڕنەوە شەوێك لە شەوان ئەو دەستە لە جوولەکەکان کە ڕقیان لە سەید موحەممەد هەبووە پیاوی خۆیان دەنێرن و ژەهری کوشندە دەکەنە ناو گۆزە ئاوەکە. بۆیە لە ئەنجامی خواردنەوەی ئەو ئاوە ساڵی ١٣٥٤ کۆچی (۱۹۳۵) لە تەمەنی ٦٣ ساڵیدا دڵی لە لێدان دەکەوێت و بە بەشداری هەزاران کەس تەرمەکەی دەبەنەوە بۆ حسێن خان و لە گۆڕستانی ئەوێ دەینێژن.

## چەند نموونەیەک لە دەستکەوتەکانی سەید موحەممەد حەکیم

١. بێهۆش کردن و هێنانەوە سەر هۆشی نەخۆش: ڕەچەتەی تایبەتی بۆ بێهۆش کردنی نەخۆش بەم شێوە بووە: تالّی جالّجالّۆکە و ناوکەی سێوە ترشەی لە بەر هەتاو وشك کردووتەوە و دوایی کوتایە و کردوویە بە تۆز. لەو تۆزەی کردووە بە ناو لووتی نەخۆشدا و لە ماوەیەکی کورتدا نەخۆشەکە لەسەرخۆی چووە و حەکیم توانیویە بە ئاسانی نەشتەرگەری بۆ بکات.

٢. ڕەچەتەی تایبەتی بۆ هێنانە سەر هۆش بەم شێوە بووە: بە یارمەتی سیری وشکی هاڕاوە کە هەندێکی کردووەتە ناو لووتی نەخۆشەکە، دیسان نەخۆش هاتووەتەوە سەر هۆش.

٣. حەکیم بۆ تەقەڵی نەشتەرگەری جۆرێك بەنی تەقەڵی تایبەتی هەبوو. بۆ تەقەڵی ئەندامەکانی ناوەکی جەستە کە ناکرێت تەقەڵەکە پاش نەشتەرگەری بکێشیتەوە، لە دەماری پشتی گوێرەکە یا ڕیخۆڵەی گوێرەکە ساوا کە وشکی کردووەتەوە و وەك بەنی تەسکی لێ کردووە و خستوویەتیە ناو ڕۆنی کەتان و کەڵکی وەر گرتووە.

٤. کوتان (ڤاکسەن): حەکیم شێوازێکی دەرمان کردنی هەبووە بۆ تووشبوانی نەخۆشیە کوشندەکان کە هاوشێوی کوتانی ئەورۆ بووە. بۆ نموونە کەسێك وا تووشی نەخۆشی هاوڵە (مێکوتە) بووە هەندێ لە ئاوی ژێر زیپکەی هاوڵەکانی جەستەی نەخۆشەکەی دەرکێشاوە و بە دەرزی داویەتی لە پێستی کەسانی ساق تا ئەوان تووشی ئەو نەخۆشیە نەبن و خۆڕاگری پەیدا بکەن بەو نەخۆشیە.

٥. دەگێڕنەوە کابرایەکی سنەیی باسکی دەستی تووشی برینە ڕەشە دەبێت. ئەوکاتە کەس نەیتوانیوە چارەسەری بکات و گوتوویانە دەمرێت. کاتێ ئەیهێننە لای حەکیم، ئەویش چارەی بێ چارەسەری پێ دەڵێت و بۆ ئەوەی کە برینەڕەشە هەموو جەستەی نەگرێتەوە تەنیا چارەی ئەوە بووە باسکی ببڕنەوە. نەخۆش و کەسەکانی هاوڕێی قەبووڵ دەکەن کە ئەمە باشترە تا بمرێت. حەکیم داوا دەکات کە دەبێ چەند کەسی ڕیش سپی و مامۆستای ناوشار بانگ بکەن و شایەدی ئەو بڕینەوە بن. مامۆستا شێخ الاسلام یەکێ لە مامۆستایانی ئەو سەردەمە ئامادە دەبێت. حەکیم کاسەیەك مسینە پڕ لە ڕۆنی گەرم دادەنێت. چاوی نەخۆشەکە دەبەستن و دەرمانە بێهۆشەکە بە لووتیدا دەکات و ئینجا بە چەقۆیەکی تیژ دەستەکە دەبڕنەوە و خێرا جێگەکەی دەخەنە ناو ڕۆنەکە تا زوو خوێنی بگیرسێتەوە و گۆشتەوزوون بهێنێتەوە. مامۆستا شێخ الاسلام هێندە ئەو دیمەنە بە لایەوە

گران دەبێ لەسەرخۆی ئەچێت.

٦. بیرەوەریەك لە شێخ موحەممەد مەردۆخ نووسەری کتێبی تاریخی کورد و کوردستان: ئەو بیرەوەریە بۆ سەید جەعفەر (١٣١٤ – ١٣٩٣ هەتاوی) کوڕی سەید موحەممەد حەکیمی گێڕاوەتەوە. مەردۆخ بەهۆی سەید موحەممەد حەکیم ڕێزی تایبەتی لەو بنەماڵەیە گرتووە. بیرەوەریەکە بەو جۆرەیە: ڕۆژێك شێخ موحەممەد لەگەڵ چەند مامۆستایەکی بەرجەستە و ناوداری کوردستان بە سواری ئەسپ و هێستر دەچنە زیارەتی وەیسی قەرەنی لە نزیك کرماشان. لە ڕێگا وەتەی (گون) مامۆستا عبدالعظیم موجتەهیدی دەکەوێتە بەر زینی ئەسپەکە و وای لێ دێ لەبەر ژانی دنیا وەخۆ ناگرێت. دوایی سەید موحەممەد حەکیم بانگ دەکەن. مامۆستا دەباتە ژوورێك و دەرمانی سڕی دەکاتە سەر گونی و چارەسەری دەکات.

٧. یەکێ لە کارە گەورە و بەناوبانگەکانی سەید موحەممەد حەکیم چارەسەر کردنی نەخۆشێك لە بنەماڵەی قوسەیری شاری سنەیە کە بنەماڵەیەکی ناودار و دەوڵەمەند ئەوکاتە بوونە. یەکێ لە کوڕەکانی ماڵی قوسەیری کاسە و کاشیوەنی قوونی دەشکێت و هەموو پزیشکانی جوولەکی شاری سنە و تەنانەت ئەو پزیشکانەی لە شارەکانی ئێران دەیبەن بۆیان چارەسەر ناکرێت. نەخۆش دەبەنە لای سەید موحەممەد حەکیم لە گەڕەکی چوارباخ. حەکیم بە باوکی کوڕە دەڵێت گایەك بهێنن وێنجە و جۆیەکی زۆری پێ بدەن و تا سێ ڕۆژ ئاوی مەدەنێ. دوای سێ ڕۆژەکە کوڕە لەسەر پشتی گاکە درێژ دەکەن. دوو دەستەکەی لە ژێر سکی گاکە بە دوو پێی دەبەستنەوە. پاشان ئاو ئەدەن بە گاکە. بەرەبەرە کە سکی گا بەرز دەبێتەوە و گوشار دەکەوێتە سەر هەموو جەستەی کوڕەکە، ئێسکی شکاو و دەرچووی کاشیوەنی دێتەوە جێ و چاك دەبێتەوە.

**تێبینی**: ئەم وتارە بەشێکی زۆری لە ڕووی وتاری سەید ڕاشد ئەلیاسی کوڕەزای سەید موحەممەد حەکیم وەرگیراوە و وەرگێڕدراوەتەوە سەر کوردی. وتارەکەی کاك ڕاشد بە پێشنیاری ناوەندی توێژینەوەی پزیشکی میللی ئێران لە زانکۆی شاهێدی تاران بۆ کتێبی بووژێنەرانی پزیشکی میللی ئێران (احیاگران طب سنتی ایران) نووسراوە. ئەو کتێبە داگری ناو و ژیاننامە و ئەزموونی سەرجەم ئەو پزیشکانەیە کە لەم سەدەیەدا لە وڵاتی ئێران نموونەی پزیشکی خۆماڵی ئێرانین. سەرجەم زانیاریەکانی کاك ڕاشد لە ڕووی یاداشتەکانی باوکی (سەید جەعفەر) و هەروەها کتێبی ماڵەمیران و ناوداران کورد (بەرگی ٣ لاپەڕەکانی ٦٣٣ تا ٦٣٥) بابە مەردۆخ ڕۆحانی وەرگیراوە. خاڵێکی تر ئەوەیە بەندە (وەرگێڕی ئەم وتارە) سەرەڕای ئەم وتارە گەلێك زانیاری دیکەم سەبارەت بە حەکیم کۆ کردووەتەوە:

یەکەم: سەرەتای ساڵی ٢٠١٦ لەگەڵ چەند گیادەرمانێکی شاری سنە و بانە چووینە ئاوایی حسێن خان و لە نزیکەوە سەیری یادگاریەکانی سەید موحەممەد حەکیمان کرد و هەروەها لەگەڵ سەید عوبەید کوڕی سەید هاشم وتوویژمان کرد و بەشێك لە نامە و کتێبەکانی سەید موحەمد حەکیمان ئێسکەن کرد.

دووهەم: پاییزی ٢٠١٦ لەگەڵ سەید زاهێد و سەید خالێد لە مەریوان وتوویژم کرد و بەشێکی تر لە نامە و یاداشت و کتێبەکانی حەکیم ئێسکەن کران.

سێهەم: سەرەتای ٢٠١٧ لەگەڵ سەید عابید و سەید ڕاشد لە شاری سنە وتوویژم کرد و دوای ئەوە کە بەشێکی گرینگ لە قەواڵە و نامە و کتێبەکانی حەکیم لای ئەم دوو بەڕێزەیە، بڕیاری ئەوە درا کە سەرجەم بابەتەکانی نووسراو و زارەکی کە کۆ کراونەتەوە ئێسکەن و تۆمار بکرێن تا وەکوو بۆ توێژینەوە و کار لەسەر کردن ئاسانتر و ئامادەتر بێت. (وەرگێڕ)

چوارەم: بۆ کۆنگرەی گەڕووس‌ناسی کە بڕیارە زانکۆی ئازادی سنە لە شاری بیجاڕ بەڕێوەی ببات، وتارێکم لەسەر سەید موحەممەد حەکیم بە فارسی ئامادە کردووە و ناردوومە بۆ ئەو کۆنگرەیە. دەقی ئەو وتارە لە بەشی وتارە فارسیەکانی ئەم کتێبەدا هاتووە.

## میرزا حوسێن حەکیمیزادە لە سەردەشت

شاری سەردەشت دەکەوێتە نێوان باسکی گردەسوور و دەشتی شۆربێ. وێدەچێت ناوی سەردەشت لەوە وەرگیرابێت کە هەڵکەوتووە لە لای سەرووی دەشتی شۆربێی کەناری چۆمی کەلوێ. چونکە شۆربێ لەکۆنەوە لای خەڵکی ناوچەکە و کۆچەریەکان گرینگ بووە. کاتی خۆی کۆچەریەکانی شارەزوور و گەرمیان کە بەهارانە هاتوونەتە کوێستانەکانی ئەم ناوچەیە بەشی زۆریان لەو دەشتە ڕەشماڵیان هەڵداوە. دانیشتوانی شاری سەردەشت پێکهاتووە لە خەڵکی ئاواییەکانی دەوروبەری و هەروەها کەمینەیەك لە خەڵکی شارەکانی دیکە. دەکرێت بڵێین زۆربەی دانیشتوانەکەی پێك هاتوون لە خێڵەکانی بەریاجی، سوێسنی، مەڵکاری، نەڵێنی، گەورك، ئالانی، میراودەلی، سەکر، شێخ و سادات.

یەکێك لەو بنەماڵانە کە چەند پشتیان هەر لە ناوشاری سەردەشت نیشتەجێ بوون و بە ڕەچەڵەك خەڵکی ئەو شارەن، بنەماڵەی حەکیمزادەیە. ئەگەر لە کەسی ئەوڕۆیانەوە حەسابی بکەین، بەو شێوەیە دێتە بەرچاو: کاك فەریدوون حەکیمزادە (نووسەر و توێژەر: لەدایکبووی ١٣٤٧ هەتاوی) کوڕی عەبدوڵا (مردن ١٣٩٦ هەتاوی) کوڕی میرزا حوسێن (١٣٠٣-١٣٨٢ کۆچی) کوڕی موحەممەد ئەمین کوڕی حەسەن لەر.[1] وەك لە شەجەرەنامەی ئەو بنەماڵەدا دیارە سەردەمێك وا باوی شۆرەت و ناسنامەی تازە لە ئێراندا داهاتووە میرزا حوسەین شۆرەتی خۆی "حەکیمزادە" داناوە. میرزا حوسێن خوێندنی مەلایەتی تەواو کردووە و دواتر کە گەڕاوەتەوە بۆ سەردەشت جگە لە بواری مەلایەتی دەستی بە کاروباری پزیشکی خەڵکیش کردووە. نێوانی لەگەڵ پیاوانی ئایینی ئەو سەردەمە زۆر بووە، وەکوو

---

١. زانیاریەکانی ئەم وتارە بەڕێز کاك فەریدوون حەکیمزادە بۆی هەناردم. کاتی خۆی کورتە باسێك سەبارەت لە ژێر ناوی میرزا حوسێن حەکیم لە گۆڤاری سروە بڵاو بووەتەوە (سروەی ژمارە ١٥٨،ساڵی یازدەهەم، خەرمانانی ١٣٧٨ هەتاوی، لاپەڕە: ٥٢-٥٣).

شێخ عەلائەدینی بیارە، شێخ ئەمینی بێژوێ[١]، و زانا و شاعێرانی دیکە. میرزا حوسێن کـاتی خۆی لە ساڵی ١٣٠٥ هەتاوی ماوەیەك لەبەردەستی میس داڵ کە خانمێکی نۆرویژی بووە و لە مەهابادەوە هاتبووە سەردەشت و بانە بۆ کاروباری پزیشکی خەڵك، زیاتر پسـپۆڕی پەیـدا دەکات لەسەر دەرمانگەری و پزیشکی. دواتر خەڵکی ناوچەکانی سەردەشت و پشدەر و بـانە بەردەوام ڕوویان لە میرزا حوسێن خستووە و ئەویان بردووە بۆ چارەسـەری نەخۆشـەکانیان. هەر ئەوە بووە کە کاتێ ئیدارەی ئامار دێتە سەردەشت بێ یەك و دوو شۆرەتی حەکیمـزادە بۆ میرزا حوسێن هەڵدەبژێرن.

میرزا حوسێن مۆریدی شێخ عەلائەدینـی بیـارە بـووە. هەر بـۆیە ئەرکـی سەرپەرشـتی خانەقا و کاروباری ئایینی لە خانەقای نەقشـبەندی ناوشـاری سەردەشـتی پـێ سـپێردراوە. بەگشتی میرزا حوسێن نێوانی لەگەڵ خانەقای بیارە و بێژوێ خۆش بووە. نموونەی یەکێـك لە شێعرەکانی میرزا حوسێن کە بۆ ڕێبازی نەقشبەندی داناوە:

نقشبندیه عجب قافله سالارانند / که برند از ره پنهان بحرم قافله را

از دل سالك ره جاذبەی صحبتشان / می‌برد وسوسەی خلوت و فکر چله را

قاصری گر زند این طایفه را طعن قصور / حاشا لله که برارم بزبان این گله را

همه شیران جهان بستەی این سلسله‌اند / روبه از حیله بسان بگسلد این سلسله را

ئەوەیکە کاك فەرێدوون لە میراتی میرزا حوسەین توانیویە کۆی بکاتەوە، تا وەکوو ئێستا ئەمانەیە: یازدە نـامە کە نـاوەرۆکی پزیشـکیان هەیە و لەمەڕ چـۆنیەتی داودەرمـان کردنـی برینداری و نەخۆشاندا دەدوێ، چواردە نامە و نووسراوە کە لەسەر شتگەلی ئایینی نووسـراون، دوازدە نامە و نووسراوە کە هۆنراوەن (تاقمێکیان شـاعێرەکانیان دیـار نیـیە کە کـێن؟). ئەو پیاوە جیا لە کاروباری ئایینی و پزیشکی لە بـاری شێعریشـەوە دەسـتی هەبـووە. بەداخەوە ئەودەم کوردی وەك ئێستا باوی نەبووە. هەر بۆیە زۆربەی شـێعرەکانی فارسـین و ئێسـتا لە دەفەتەر و پەڕاوی نـاو کـوڕ و نەوەکانیـدا پـارێزراون. دەگێـڕنەوە جارێکیـان کـابرایەك دەستخەتێکی لە دۆستێکی بۆ دێ. زۆری لێ ورد دەبێتەوە نازانێ دۆسـتەکەی چـی گەرەك بووە؟ ناچار دەیبا بۆ لای میرزا حوسێن. لە نامەکەدا دوای سـڵاو و هەواڵپرسـی نووسـرابوو ئەگەر لە دەستدایە کەمێکم "راندن مرغ و مادر بره" بۆ بنێرە. دەستبەجێ میرزا دەفەرمـوێ:

---

١. کورتە وتارێك سەبارەت بە شێخ ئەمینی بێژوێ و خانەقاکەی و هەروەها کاروباری ئامۆژگاری و پزیشکی ئەم پیاوە ڕێکەوتی ١٣٩٧/٠٣/١٠ بۆ ئەم زنجیرە توێژینەوەیە ئامادە کردووە.

کشمیشی بۆ بنێرن.

میرزا جگە لە کاروباری پزیشکی و ئایینی لە باری نووسینی شێعریشەوە دەستێکی باڵای هەبووە. بەداخەوە ئەودەم کوردی وەك ئێستا باو نەبووە. هەر بۆیە زۆرتر شێعری بە فارسی داناوە:

ای بی وفا زمانه، کردی به من بهانه / تیر از کمان نهادی، کردی مرا نشانه
فرهاد بیستونم، از گریه غرق خونم / شیرین ز دست رفته، معذور در میانه
گر ظلم کرد با ما، آن یار بی وفا، رو / برسان به شهریارم این عرض خالصانه
پیرا بسی حزینم با درد هم قرینم / ترسم ترا نبینم آخر شوم فسانه
یکدم محل ندارم از شرم سر برارم / روزی بیا کنارم یك بار، ای یگانه
دردم دواش پنهان خاگر بسی پریشان / بی تو میسرم نیست اندر دو شهر خانه
این یك سریر جوید آن یك عبیر بوید / من هم ترا می‌جویم چون مرغ دانه دانه
از همت شه دین یك ذره کم نگردد / با یك نفس ز رحمت از گوشه‌ی خزانه
حسین ز کارت مسرور باش و دلخوش / تا که فرستدت پیر نوید جاودانه

ای بی وفا زمانه، کردی به من بهانه / تیر از کمان نهادی، کردی مرا نشانه
فرهاد بیستونم، از گریه غرق خونم / شیرین ز دست رفته، معذور در میانه
گر ظلم کرد با ما، آن یار بی وفا، رو / برسان به شهریارم این عرض خالصانه
پیرا بسی حزینم با درد هم قرینم / ترسم ترا نبینم آخر شوم فسانه
یکدم محل ندارم از شرم سر برارم / روزی بیا کنارم یك بار، ای یگانه
دردم دواش پنهان خاگر بسی پریشان / بی تو میسرم نیست اندر دو شهر خانه
این یك سریر جوید آن یك عبیر بوید / من هم ترا می‌جویم چون مرغ دانه دانه

## بەشێک لە نامە و نووسراوە ئایینی و پزیشکیەکانی بەجێماو لە میرزا حوسێن

بەشێکی زۆر لە نامەکانی میرزا حوسێن کە سەبارەت بە بورای پزیشکیە، نامەگۆڕینەوەی نێوان میرزا حوسێن و شێخ موحەمەد کوڕی شێخ ئەمینی بێژوێ بووە. شێخ موحەمەد پێش ساڵەکانی ١٣٧٨ کۆچی مردووە.

**وێنەی ژمارە ۱: شەجەرەنامەی حەسەن لەر و لقی بنەماڵەی میرزا حوسێن حەکیم لە سەردەشت**



**وێنەی ژمارە ۲: میرزا حوسێن حەکیم لە تەمەنی پیریدا**



**وێنەی ژمارە ۳: نامەی شێخ عەلائەدین بیارە بۆ میرزا حوسێن حەکیم**



**وێنەی ژمارە ٤: خەلافەتنامەی میرزا حوسێن حەکیم کە ڕاستەوخۆ لە شێخ ئەمین بێژوێی وەرگرتووە**


باعث تسطیر و ترقیم این عریضه این من که خادم الفقرا ...
باسم الشیخ محمد امین میرزا حسین را اجازت دادم که در جمیع دائم
اوقات جمعیت برادران (در خانقاه) بطریق وعظ و نصائح و حکایات
سلف صالح با ایشان مصاحبه فرماید اول اصول دین که
عقاید باشد ثانی فروع المذهب ثالث امر بمعروف و نهی از منکر
مرحوت که این معامله مایه افاده برادران و استفاده خود باشد

الداعی
محمد امین

**وێنەی ژمارە ٥: نامەیەک بۆ شێخ ئەمین بێژوێ سەبارەت بە تووتنی ئاوایی گروێس، هەروەها چەند ڕەچەتەی دەرمانی**



**وێنەی ژمارە ٦: نامەیەکی موحەممەد کوڕی شێخ ئەمینی بێژوێ بۆ میرزا حوسێن، هەروەها پەراوێزی "جلی کوردیی مرادخانی"**



استاد محمد عرض سلام دارد
و جلی کوردیه مرادخانی برای بنویسی

محب محترم مکرم آغا احمد اخوی میرزا حسین سلمه الله امیدوارم

که بحمد الله تعالی اوقات عزیز بر حسب مراد و آرزو و صحت بگذرد

در تاریخ مدت ده پانزده روزی باشد که عیال و زوجه داعی به زخمی

و جراحتی در پستان جانب چپ دچار شده در اول مسئله که

بظهور آمده بسیار ... شده بود تدریجاً بواسطه اشیاء و ادویه

گرم در شیب و پایین گوی پستان جراحت کرده حقیقة

چندان عمیق نیست ولی هم به اندازه پهن است و اکنون یک

هفته حاضر است هر گاه برای من ... صدید و غوری بسیاری کشد

می باید درمان خوب که ان شاء الله بزودی رفع جراحت بکند

برایم می فرستید و صورت دستور العمل مفصلاً برایم بنویسید

الداعی ابن الشیخ
محمد

**وێنەی ژمارە ٨: نامەیەکی موحەممەد کوڕی شێخ ئەمینی بێژۆیَ بۆ میرزا حوسێن**


محب ارجمند و محبوب سعادتمند میرزا حسین زید توفیقه

کاکه

پس از ابلاغ سلام و احترام بی حد پسر علی نام خلف

محمد امین کاکه رشید زخم دارست خدمت می آید

با کمال ملاحظه به اصلاح زخم پرسش قیام

و چون وقت که ... در خانه نبود

خسارت می شود اذا حتی الامکان در اصلاح

زخم جدیت بکار بیاورید در خاتمه

خیر و موفقیت

والسلام علیکم

الداعی
ابن الشیخ
محمد

**وێنەی ژمارە ٩: نامەیەکی موحەممەد کوڕی شێخ ئەمینی بێژوێ بۆ میرزا حوسێن (سەبارەت بە نووشتوو)**


محب مهربان برادر دینی جناب میرزا حسین
همواره مشمول توجهات پیران کبار باد از اطلاع
مرض فرزند مقام میرزا محمد امین متأسف شدم
دعای لازم بود معمول شد زیاده از آن تعویذ نفرستم
روانه خدمت شد شمع کرده آب کشیده بپاشند برگ
کرده با خود دارد از خدا خواهم صحت و سرور ... باز

وێنەی ژمارە ١٠: نامەیەکی موحەممەد کوڕی شێخ ئەمینی بێژوێ بۆ میرزا حوسێن


محبوب ارجمند مکرم میرزا حسین سلمه الله

**وێنەی ژمارە ١١: نامەیەکی موحەممەد کوڕی شێخ ئەمینی بێژوێ بۆ میرزا حوسێن**


حبیبا [illegible] و محبوبا [illegible] میرزا حسین سلمه الله

بعد از ابلاغ سلام تمام صوفی عبدالله حرکت
[illegible] [illegible] را [illegible] اکنون زحمتی [illegible]
شده احتیاج به زحمت جناب [illegible] اگر ماذون
دارند تشریف بیاورند موجب آزادی [illegible]
شادی ما ها می گردد ولی هر گاه تشریف آورد [illegible] عبدالله
که خدا محمود در [illegible] [illegible] [illegible] رحم [illegible] خواهش دارم
ملاحظه زحمت بکنند در ترتیبات برایش قرار دهند

والسلام علیکم
ابن الشیخ [illegible]
محمد

**وێنەی ژمارە ١٢: نامەیەکی موحەممەد کوڕی شێخ ئەمینی بێژوێ بۆ میرزا حوسێن**



محبوب سلامت شده و محب ارجمند میرزا حسین سلمه

پس از ابلاغ سلام و احترام کلام عرض می شود امروز

رشید پسر فقیر محمد پسر ملا محمد امین از جای بلند

فروافتاده سر و چشمش بغایت زخم دار شده

قابلیت آن ندارد که بخدمت بیاوریم هرچند

که ماه صیام است اگر آن جناب خیلی زحمت [illegible] ولی

چون هیچ علاجی دیگر نیست لابد اگر اینجا [illegible] بکنید

که جناب تشریف بیاورید بلکه [illegible] تعالی

بواسطه جناب علاج پذیر شود واسطه [illegible] و الوجه

همان پسر شود معلوم است انشاءالله بغایت الغایت [illegible]

اجر می شوند زیاده تقدیم عرض سلام

الداعی ابن شیخ [illegible]

**وێنەی ژمارە ١٤: نووسراوێکی میرزا حوسێن بۆ مەلا موحەممەد ناوێک، لە کۆتایی نامەکە نووسراوە: اقل الاطبا حسین**



خدمت ذی‌مرحمت جناب ملا محمد سلمه الله مشرف گردد

فدایت شوم

[illegible]

اقل الاطبا

حسین

**وێنەی ژمارە ١٥:** نووسراوێکی میرزا حوسێن بۆ چارەسەری نەخۆشی ئاتەشێ فەرەنگی (سفلیس) و زخم گلو، لە کۆتاییدا نووسیویە: از نویشته حضرت قطب الاولیاء

[مەبەست یەکێك لە شێخانی نەقشبەندی بیارەیە]


جهت دور آتشک فرنگی و زخم گلو

شنجرف سنگ وزن دو بیجو که عبارت از ثلث یک مثقال است

و جیوه وزن یک بیجو که عبارت از سدس یک مثقال است هر دو را

در چینی و سحق نموده چینی باشد یا غیر چینی ولو هم باید دو مثقال خمیر را میان

آن کرده این سه چیز را باهم خمیر کرده دوازده پاره نموده مثل قرص [illegible] یک یک

[illegible] کرده بگذارند تا خشک شوند ابتدا [illegible] آن باید ترک چای و خوراک

[illegible] الا نان بی نمک شود باید بی نمک و بی روغن باید بخورد غیر آن جمیع حا[illegible]

[illegible] و مشروبات ترک کند تا پانزده روز اول روز یک را [illegible] از گلو [illegible]

[illegible] کرده و در هر خود [illegible] آب [illegible] نموده و [illegible]

[illegible] را [illegible] دود [illegible] آتش نهاده [illegible] آن دود

را به بینی در کشید که تمام دود آن به بینی [illegible] و آب دهن [illegible]

**وێنەی ژمارە ١٦: هۆنراوەیەک و نووشتوویەک بۆ بەستنی وەزە و پێوەدانی مار و دووپشک**



هر بنده که عیب خویش کم دیده بود
احوال به خویشتن پسندیده بود
آن لحظه که عیب دیگران بنماید
سر تا قدم از وجود او دیده بود

بجهة بستن مار و عقرب و غیره

هر شب ۳ بار بخوان

بستم دم مار و دم عقرب بستم

به نوح نبی سلام کردم رستم

ای وای بران دل که درو سوزی نیست
سودا زده مهر دل افروزی نیست
روزی که تو بی عشق بسر خواهی برد
ضایع تر از آن روز ترا روزی نیست

**وێنەی ژمارە ١٧: نووسراوێکی میرزا حوسێن بۆ چارەسەری ژانی برین و هەڵماسیوی**



## باسێک سەبارەت بە حەکیمانی گوندی کۆیلێی قەندیل

ساڵی ٢٠١٣ بەڕێکەوت وتاری "گەشتێك بە بناری شاخی سەرکەشی قەندیل"ی مامۆستا شاسوار هەرشەمی[1] لە ماڵپەڕی پێنووسەکان بەرچاوم کەوت و بەچێژەوە خوێندمەوە. هەر ئەوە بووە هۆی فێرخوازیم لە بابەت و وتارەکانی ئەو مامۆستا هێژایە لە ڕێگەی کتێب و ئینترنێت بۆ تەوەری زمانی کوردی و مێژووی کۆن و هاوچەرخی کوردستان و گەلێك بابەتی دیکە. لەو وتارە جیا لە ناساندنی زنجیرە کوێستانەکانی قەندیل دوو تەوەر دیکە بەردڵی توێژینەوەم کەوت: "حەکیمانی گوندی کۆییلێ و کرمی بەفرەکانی کەناری گۆمی کرمەسووران".

ئەوساڵ بۆ نووسینێك لەسەر ئەو دوو بابەتە پێوەندیم بە کەسانێکی شارەزا لەسەر بابەتەکە و قەندیل و کۆییلێ گرت و هەندێ زانیاری پێویستم بە دەست هێنا.

## پێشەکی

سەری ئەم باسەی ئێمە لە قەندیلی سەرکەشەوە دەست پێ دەکات. قەندیل یەکێك لە زنجیرە چیاکانی زاگرۆسە کە دەکەوێتە نێوان سنووری ڕۆژهەلات، باکوور و باشووری کوردستان. واتا بەشێکی لە پیرانشار و ئەوی دیکەی لە چۆمان و سیدەکان و هەکارییە. ئەگەرچی خەڵك قەندیل بە هەمان بەشی زنجیرە کێوەکانی نێوان قەلادزێ و پیرانشار و چۆمان دەزانن. لە دیوی باشووری کوردستان قەندیل بریتیە لە زنجیرە چیاکانی نێوان قەلادزێ و ناوچەی باڵەکایەتی قەزای چۆمان، واتا لووتکەکانی شەمۆڵ، سەوە، کرمەسۆران،

---

[1] ١. شاسوار ئەحمەد عەبدوڵا، لەدایکبووی ١٩٥٩ شاری هەولێر، خوێندن لیسانسی زەویناسی بەغداد، و زانستی مێژوو و زمانە هێندوئەورووپیەکان لە سوید، مامۆستای قوتابخانە لە ستۆکهۆڵم

حەساری ڕۆست و حەساری سەکران. بەفری ساڵی تازەی زۆربەی ئەم کێوانە دەکەوێتە سەر بەفری پار و پێرار. بڵیندترین شاخی قەندیل لە باشووری کوردستان ٣٦٠٧ مەترە کە لە حەساری ڕۆست واتا لووتکەی هەڵگورد هەڵکەوتووە. هەر چەند وا باوە هەڵگورد بەرزترین چیای عێراقە، بەڵام چیای شێخەدارە چەند مەترێك زیاتر بەرزە و دەکەوێتە گوندی کونەدای لە سۆران کە ٣٦١١ مەتر بڵیندە.[١]

هەندێك لە قەدپاڵ و سەر لووتکەی چیاکانی قەندیل بەهۆی ئەوە کە بەشێکی زۆر لە ساڵ یاخود تەواوی ساڵ [وەکوو هەساری سەکران[٢]] کلێلە و شاخە بەفری پێوە دەمێنێت، گۆماو و چاڵاوی جوان و سەرنجڕاکێشی تێدا ساز بوون. وەکوو: گۆمی کرمەسۆران لە گوندی زەنگەڵین، بێکۆدیان لە چیای سەکران، چلدار لە گوندی گوندەژوور، سەرنشێوە و هیشك لە بناری هەڵگورد، گەورەزین لە گوندی باڵخ و فێلاو لە سەرەوەی گەشتیاری جناسانی چۆمان. لە ناو ئەم گۆمانە بێکۆدیان لە بەرزترین ئاستی قەندیل واتا ٣١٥١ مەتردا هەڵکەوتووە و بەشێکی زیاتر لە ساڵ بەفری کەناری گۆمەکە دەمێنێتەوە.[٣] گوایە ساڵانی زوو لە بەفرەچاڵ و کەناری گۆمی کرمەسۆرانی چیای زەنگەڵین کرمێکی سوور و مەیلەو پەمەیی لە نێوان بەفری پار و پێرار دەرکەوتووە. خەڵك ئەم کرمەیان وشك کردووە و هاڕاوەکەیان لە ماستاو و دۆ کردووە فێنکی کردووەتەوە. ئەو کرمە بە زولال و زەلال دەناسرێ.[٤]

## باڵەکایەتی و باڵەک

ناوی باڵەك لە ناوی گوندی "باڵاکان"ی هەکارییەوە هاتووە. بەگوێرەی ڕاپۆرتێکی شەریف پاشای عوسمانی، ئەوکاتە هۆزەکانی باڵەکی و هەرکیەکان کۆچیان کردووە لە هەکاری و وان و شەمزینان بۆ سنوورەکانی سەفەویە. لە باڵەکایەتی هۆزەکانی باڵەك، مەلا شەرەفی،

---

١. ویکیپیدیای کوردی: هەڵگورد

٢. کتێبی ڕەواندز، باڵەك و برادۆست، لاپەڕە ١٢٨

٣. هاوشێوەی ئەم گۆمانە لە ناوچەکانی دیکەی کوردستاندا هەیە، وەکوو: چیارەش لە جۆلەمێرگ، داڵانپەڕ لە شنۆ، بەردەکەر لە بالیکەدەری پێنجوێن، چاڵاو لە کوڕەمیانە و زەل لە تفلی مەریوان

٤. تا وەکوو ئێستە کاری ناسین و توێژینەوە لەسەر ئەو کرمە نەکراوە لە کوردستان، بەڵام نموونەی ئەو کرمە ساڵی ١٨٨٧ لە شەختە و بەستەڵەکەکانی ئالاسکادا دۆزراوەتەوە. ناوی زانستی کرمەکە *Annelids* یە و سەر بە خێزانی Mesenchytraeus تۆمار کراوە. [سەرچاوە: وتاری کاك شاسوار هەرشەمی]

شیوەزایی، سەكر، مەلازادە، و هیتر دەژین، بەلام جەماوەری بـاڵەك زۆرتـرە و هەر بـۆیە بە باڵەكایەتی دەناسرێت. هەروەها لە كۆنەوە وا هاتووە كە بنەماڵەی مەلاشـەرەفیەكان سـەرۆك و ئاغای باڵەكایەتی بوون و تەنانەت ئێستاكەش كە باوی ئاغاواتی نەماوە، هێشتاكە هەنـدێ سنووری كۆمەڵایەتی نێوان ئاغا و ڕەعیەت ماوە و مەلا شەرەفیەكان بە خۆیان دەڵێن ئاغا و بەویتر كرمانج.[1]

*لەبارەی شوێنی هاتنی مەلا شەرەفیان بۆچوونێك هەیە. گوایە باپیرە گەورەیان كە نـاوی مەلا شەرەف بووە خەڵكی گوندی زینك نزیك چیای قەفقاسە و هاتۆتە باشووری كوردستان و لە ناوچەی ئێستەی باڵەكایەتی ژنی هێناوە و نیشتەجێ بووە. دەشڵێن كە بۆ یەكەم جـار لە قەفقازەوە هاتووەتە هەریر و لای خانزادی میری سۆران. زۆر لەوێ نەماوەتەوە و چـووەتە خزمەت شێخ موحەمەدی باڵەك[2] و لەوێ خوێنـدنی تەواو كـردووە. ڕایەكـی دی پێـی وایە مەلا شەرەف لە بنچینەدا خەڵكی گەلاڵەی لای ماوەت بووە و لەوێ هـاتووەتە باڵەكـایەتی.[3]*

ئەو هۆزە زەویدار و دەوڵەمەند و دلێر و باڵادەست بوون. كاتی خۆی نازناوی "میر" دراوە بە ئاغاكانی مەلا شەرەفی لە لایەن میرنشینی سۆرانەوە. جاری وابووە بازنەی دەسەڵاتی ئەمـانە تا شنۆ و لاجان چووە. شێخ موحەمەد ئاغای وەڵاش[4] ئاغا و سەرۆكێكی دەسەڵاتدار بووە لە باڵەكایەتی.

---

١. لە موكریانیش هەروایە. ئاغاوات بە خۆیان دەڵێن ئاغا و بە خەڵكی دیكەش كرماج.

٢. زیارەتگای شێخی باڵەك كەوتووەتە دێی حاجی ئۆمەران. ژیان و مردنی ئەم پیاوە نادیارە و گوایە سەدەی ١٧ زایینی یا پێشتر ژیاوە. لای ئەم زیارەتگایە كانی شێخی باڵەكان هەیە كە ئاوێكی زۆر سارد و سازگاری هەیە و خەڵك وەك ئاوی پیرۆز سەیری دەكەن و بۆ چارەسەری بەردی گورچیلە بەكاری دەهێنن. [سەرچاوە: زۆسك حەمەد مینە]

٣. كتێبی ڕەواندز، باڵەك و برادۆست لاپەڕە ١٠٣

٤. موحەمەد ئاغا (١٨٧٥-١٩٥١) كوڕی سلێمان ئاغا كوڕی مەحموود ئاغا كوڕی میر موحەمەد كوڕی مەلا شەرەفییە. سەرۆكی عەشیرەتی باڵەك بووە. نێوانی لەگەڵ شێخانی نەهری، شێخ مەحموودی نەمر، قازی موحەمەد و مەلا مستەفای بارزانی و تەنانەت كەسانێك وەكوو مەلیك غازی، نووری سەعید و باڵوێزی ئینگلیسدا هەبووە. چەندین جار و بۆ چەندین ڕۆژ ئینگلیسیەكان لە دیواخانەكەی لە وەڵاش ماونەتەوە و بەرنامەیان داڕشتووە. ساڵی ١٩٣٨ ئەندامی ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراق بووە. [لاپەڕە ١٤٠، كتێبی ڕەواندز، باڵەك و برادۆست]

ناوچەی باڵەکایەتی شوێنێکە هاوچەشنی هەورامان.[١] زۆرتر باخ و لێرەواره و بەروبوومی وەکوو هەنگوین، هەرمێ، ترێ، ترش، برێنج (مەرزە)، کونجی، گەنمەشامی و تووتنی زۆرە. تووتنی باڵەکایەتی لای جگەرەکێشان ناسراوە و بەرامەی کوێستانی هەیە و بە تووتنی باڵەکی دەناسرێت.

لە کۆنەوە ئەم ناوچە لانکەی شۆڕش و بزووتنەوە نیشتمانپەروەرییەکانی کوردستان بووە و بۆ ئەو ئازادیخوازانە و خەڵکانی دیکەش نەریتی ناندەری و میوانداریی باڵەکیەکان بەناوبانگ بووە. جا هەر بۆیە لە ویژەی باڵەکایەتی و تەنانەت ناوچەکانی دیکەشدا باوە، ئەگەر کەسێك میوانی زۆری لێ بکەوێت و بەردەوام میواندار بێت، ئەڵێن: "*دەڵێی مزگەوتی شێرکاوەی باڵەکایەتیە*". گوندی شێرکاوە لە دۆڵی ڕوستی باڵەکایەتی هەڵکەوتووە و سەردەمانێك مزگەوتەکەی وەك میوانخانەیەکی خۆڕایی بووە بۆ ڕێبواران و هەژاران. هەر گوندێکی باڵەکایەتی مزگەوت و حوجرەی هەیە و ئەوساکە مەلا و میرزای زۆر سەردانیان کردووە. بۆ نموونە سەیری ژیاننامەی شێخ موحەممەد ڕۆستی ناسراو بە "ابن آدم" بکەین. کاتی خۆی چەندە پلەی زانستی باڵەکایەتی بڵیند بووە. "*موحەممەد کوری ئادەم کوری عەبدوڵا [کوردی] کە نازناوی شێعری واجیم بووە، ساڵی ١١٦٠ کۆچی لە ڕۆست ناوچەی باڵەکایەتی لەدایك بووە. بۆ خوێندن زۆر شوێن گەڕاوە. ساڵی ١١٩٢* چووەتە مەهاباد *و لەوێ فارسی فێر بووە. موحەممەد پاشا میری ڕەواندز ڕێزی زۆری گرتووە و لەوێ وانەی گوتووەتەوە و کتێبی نووسیوە [٢٥ کتێبی بە فارسی و کوردی هەیە].*[٢] *دواتر بەرەو دێڵزەی پشت چۆمان چووە و ساڵی ١٢٥٢ کۆچی دوایی کردووە. [گڵکۆی لە کۆنەخانانی سەر ڕێگەی دێڵزەیە]. کەسانێك وەك مەولانا خالید نەقشبەندی، مەلا موحەممەد خەتێ و مەلا عەلی وەسانی شاگردی وی بوون.*[٣]" هەروەها باسی باڵەکایەتی حاجی قادری کۆیی لە

---

١. هاوشێوەی هەورامی شێوەزاری گوندەکانی گرتك و ڕوست لە باڵەکایەتی جیاوازی ویژەیی هەیە لە نێوان نێر و مێ. مەلا وەیسی (کوڕی عەبدوڵا کوڕی ئەحمەد کوڕی عبدالخالق کوڕی موحەممەد کوڕی زانای بەناوبانگ ابن آدم: ١٧٤٧-١٧٧٨) خەڵکی گرتك بووە. یەکێك لە کەڵەزاناکانی سەردەمی خۆی ناسراوە و ساڵی ١٩٧٩ لە گوانەی دیانا مردووە. گەلێك دەستنووسی ئەم بنەماڵە ئێستا لای نەوەکانیانە.

٢. کاك هێرش کەماڵ ڕێکانی خەڵکی شیلادزێ، بەرپرسی گۆڤاری نیژەن -کە بابەتی مێژوویی و بەڵگە و دەستنووسی زانایانی کورد بڵاو دەکاتەوە- [١٣٩٧/٠٤/١١] باسی لەوە دەکرد کۆمەڵێك دەستنووسی بنەماڵەی ابن آدم لە سۆران و مێرگەسۆر لای مامۆستاکانە.

٣. مەشاهیری کورد، بەرگی ١، لاپەڕە: ٣٥٧

نامەیەكی بۆ مەلا عەبدوڵا جەلیزادە، دەنووسێت:[١]

*وە بیرت دێ زەمانێ چووینە باڵەك / بە پێخواسی نە كەوشم بوو نە كاڵەك*

كاتی خۆی گوندەكانی جاوەكە و مامەخەتیبیان ملكی شێخ تەهای نەهری شەمزینانی بووە و شێخانی نەهری هاتوچۆی باڵەكایەتیان كردووە. یا سەردەمێك باڵەكایەتی وا بووە لە شوێنە دوورەكانەوە فەقێ هاتووەتە مزگەوتی وەسان. *دوو كوڕی پاشای شام كە بۆ خوێندن هاتوونەتە لای مەلا عەباس وەسانی بە نەخۆشی تاعوون لە وەسان مردوون. گۆڕی ئەم پاشازادانە لە وەسانە و لەسەر گۆڕی یەكیان نووسراوە: الشهید ملا محمد ابن ملك الشام توفی بعرض الطاعون.*[٢]

ئاواییەكانی باڵەكایەتی بە سەر چەند دۆڵ و شیودا دابەش بوون: دۆڵی ڕۆست، دۆڵی شیوەزوور، دۆڵی سەكرایەتی، دۆڵی وێلزە و دۆڵی باڵەییان.

**ئاواییەكانی دۆڵی باڵەییان:** زەنگەڵین، بەستی، ماونان، قەڵات، وەسان، چۆمساك، دیلمان، بۆران و كۆیلێ.

## گوندی كۆیلێ و حەكیمەكانی

وەك دەزانین كۆتا گوندی دۆڵی باڵەییانە و بە سەر هەموو ناوچەكەدا دەڕوانێت. شوێنێكی بڵیند و شاخاوییە. گوایە ناوی گوندەكە لە "كۆڵ" و "كۆڵەدار"ەوە وەرگیراوە. دەگێڕنەوە سەردەمانی زوو خەڵك بۆ هەڵبەستنی جۆگەی ئاوی گوندەكەیان، شاخێك دەبێتە لەمپەری جۆگە ئاوەكە. كۆڵكە دارێك هەڵدەكۆڵن و دەیكەنە كۆڵ و ئاوەكە دەگوازنەوە، واتا وەك لوولەی ئێستەكانێ. بەرەبەرە وشەی كۆڵی و كۆڵی دار بووەتە كۆلیلە و كۆییلێ. جا هەر بۆیە ئێستاكەش زۆر جار لەگەڵ ناوی كۆییلێ دارەكەیش دێت. وەك لە كتێبی ڕواندز، باڵەك و برادۆست لاپەڕە ١١٨ بۆ ناوی ئاوایی كۆییلێ نووسراوە: *كۆییلە و دارەكە.* بەساڵاچووانی كۆیلێ دەگێڕنەوە كە ٤٠٠ بۆ ٥٠٠ ساڵ پێش ئێستا مەلا ئەحمەد هەمەوەندی هاتۆتە گوندی كۆیلێ و بووەتە مەلای مزگەوت. ئیدی كۆیلێ وەك گوندێكی هەمیشە ئاوەدان ماوەتەوە و گەشەی كردووە. لە مێژووی كۆییلەدا سێ جاران گوندەكە لە دۆڵ و دەشتی سنوورەكانی گواستراوەتەوە. جاری یەكەم لە دەشتەبیلێ بووە و جاری دووهەم

١. حاجی قادر كۆیی (١٨١٥-١٨٩٧) لەگەڵ مەلا عەبدوڵا جەلیزادە ماوەیەك لە خۆشناوەتی و شێخ وەتمانی باڵەكایەتی خوێندوویە. [سەرچاوە: "بابەتی مێژووی ژیان و مردنی حاجی قادر"، www.wishe.net: ٢٠١٧/١٢/١٦]

٢. كتێبی ڕەواندز، باڵەك و برادۆست لاپەڕە ١١٩

چووەتە دەرکێ مووسا و کۆتاییش هاتووەتە شوێنی ئێستاکە.

کاتی خۆی موحەمەد ئاغای وەلاش سەرۆکی باڵەکایەتی ویستوویە ئاغا دەستنیشان بکات بۆ ئەو گوندانەی ئاغایان نەبووە. کۆیبیلێ هەر زوو ڕەتی کردووەتەوە و زۆرداری و یەکگرتوویان بووەتە هۆی سەرکەوتنیان لەو هەڵوێستە. دانیشتوانی دۆڵی باڵەییان و بەتایبەت کۆیبیلێ هەموویان بە ژن و پیاوەوە بەهۆی سەختی و هەڵەمووتی سروشتەکەی کەسانی چوست و چالاك و بەدەستوبردن. بێ پەروا بەرەنگاری هەموو سەختیەکان دەبنەوە. هەر وەك چۆن ئێمە بەری دەستی خۆمان دەناسینەوە باڵەییەکان ئاوا شارەزاییان لە هەموو ڕێ و ڕێچکەی کوێستانە سەرکەشەکانی سنوورەکەیان هەیە. تێکەلاوی زۆرینەیان لەگەڵ سروشتەکە وایکردووە هەموویان گژوگیا و سوودەکانی بناسن.

کۆیبیلێ ئەگەر زیاتر ناسراوی دەرکەوتووە بەهۆی بنەماڵەی حەکیمانیەوە بووە. واتا بنەماڵەی فەقی ڕەسووڵی کۆیبیلێ.[١] باسی ئێمە لەم وتارە حاجی کوێخا ئەحمەد کوڕی ئەو فەقێ ڕەسووڵەیە. ساڵی ١٨٩٧ لە کۆیبیلێ لەدایك بووە و ساڵی ١٩٨٧ لە تەمەنی ٩٠ ساڵی لە پیرزینی هەولێر کۆچی دوایی کردووە. کوێخا ئەحمەد جیا لەوەی کاتی خۆی سەرپەرشتیاری ئاواییەکە و خاوەن دیواخانی پڕ میوان بووە، وەك حەکیم و دەرمانگەرێك لای ناوچەی باڵەکایەتی و دەرەوە ناسراوە. خەڵك لە هەموو باڵەکایەتی و دوورتر بۆ چابوونەوەی سەخت- ترین و هەستیارترین شکان و دەرچوونی ئێسك و جومگە، یاخود بۆ چارەسەری برین و بڕین و نەخۆشی دیکە هاتوونەتە دیوەخانەکەی. زرار سلێمانی بەگی دەرگەڵەیی[٢] لە لاپەڕە ٥٩-٦٠ کتێبی "بیرەوەریەکانی"دا باسی ئەوە دەکات: *من لە ماڵی عەزیز ئاغا مامەوە. مەجید بەگ چووە ڕواندز وەلاخەکانی ناڵ کرد و گەڕایەوە لای من. لەوێ بەرەو ماڵ گەڕاینەوە بەئێش و ئازارێکی یەکجار زۆرەوە. دوو شەو هیچ خەوم لێ نەکەوت. ماوەیەکی زۆری بە سەردا*

١. کاك لوقمان نەوەی کوێخا ئەحمەد دەیگێڕێتەوە: *جارێك مام ئەحمەد بەگی سەرکان کە تەمەنی سەرووی سەد ساڵان بوو، گێڕایەویەتیەوە منداڵ بووم باسکم شکابوو فەقێ ڕەسووڵ باوکی کوێخا ئەحمەد هەڵیبەستەوە. جا کوێخا ئەو حەکیمیە لە باوکیەوە پێ گەیشتبوو.*

٢. مام زرار ساڵی ١٩٢٧ لە گوندی دەرگەڵەی ڕەواندز لەدایك بووە و ٢٠١٨/٠٥/٢٠ لە سۆرانی کۆچی دوایی کردووە. کاتی خۆی لەگەڵ باوکی و برایەکی پێشمەرگەی کۆمار بوون. پاش کۆمار ئاوارەی ڕووسیا بووە و دوای چەند ساڵ گەڕاوەتەوە کوردستان. ئەم پیاوە خەباتگێڕ و نووسەر و کەسایەتیەکی ناسراوی دەڤەری سۆران و ڕەواندز بووە. [ئاکۆ حەمەد ڕابی، "پێشمەرگەیەکی کۆماری کوردستان کۆچی دوایی کرد"، www.dwarozh.net: ٢٠١٨/٠٥/٢٠]

*تێپەڕی تاکوو خۆی گرتەوە. ئینجا بە دیار کەوت خوار هەڵبەستراوەتەوە. باوکم کە بینی دەستم خوارە ناردی بە دوای کوێخا ئەحمەدی کۆیلەیی. ناوبراو پسپۆڕی شکەست بوو. کە کوێخا گەیشتە جنێراوە و زوو سەیری باسکی کردم و گوتی: ماسیەکم بۆ پەیدا بکەن. ماسیان بۆ هێنا. دیار بوو ماسیەکەی کوتا. گۆشتە کوتراوەکەی لە شوێنی شکاوەکە بەست و ئەو شەوە پێیەوە نووستم. بەیانی زوو بانگی کردم و داینامە تەنیشت خۆی و قسەی سەیرۆکەی بۆ دەکردم. دەیگوت: زانیوتە شا بۆتە عەجەم. لەپڕێکا دەستێکی لە شوێنە شکاوەکە دا هەر ئەوەندەم زانی چاوم تاریك بوو. کوێخا کۆمەڵێك پەلە داری بێ ئامادە کردبوون و پووشیەکەی رووناسیان کردبووە هەویر. لە دوای ئەوەی شوێنە شکاوەکەی داناوە جێگای خۆی زوو رووناسەکەی دانایە سەر و پەلە دارەکانی پێوە پێچایەوە. هەر ئەوەندەم خۆ دیتەوە ئێش و ئازارەکەی نوێ بووەوە. دوو شەو و رۆژ چاوم نەچووە خەو. وەك جاری پێشوو ئازارم هەبوو. کوێخا رۆیشتبووەوە من لەبەر ئازار ئاگام لێ نەبوو. هەڵبەتە ماوەیەك دەستم بە هەڵبەستراوی مایەوە. زیاتر لە بیست رۆژ پەلەکان بە باسکمەوە بوون. ئینجا پەلەکان لێ کرانەوە و تەنها پەرۆی بەرۆناسی پێوە مایەوە.*

لە کتێبی "ڕەواندز، باڵەك و برادۆست" لاپەڕە ١١٨ سەبارەت بە کۆیلێ هاتووە: *لەم گوندە مرۆڤێکی زۆر شارەزا و چاونەترس دەژیا. خاوەن میوانداری و دیوەخان بووە بە ناوی کوێخا حاجی ئەحمەد. شارەزایی لە پزیشکی کوردەواری بەتایبەت شکانی ئێسقان و دەرچووندا هەبووە. لە هەموو دەڤەری باڵەکایەتی و دەرەوە هاتوونەتە لای ئەم پیاوە بۆ چاککردنەوە و هەڵبەستنەوەی شکستەکانیان. ئەم پیاوە ئێستە خۆی و کوڕەکانی لە پیرزینی [هەولێر] دەژین.*[1]

دەگێڕنەوە زۆر جاران پلیتەی[2] خستووەتە شوێنی گوللە و بریندارەکەی چاك کردووەتەوە. کاك شاسوار دەگێڕێتەوە: *جارێك یەکێك لە پێشمەرگەکان گوللە لە زگی دابوو*

---

١. دیارە کاتێ نووسەر زانیاری سەبارەت بە کۆییلە و حەکیمانی کۆ کردووەتەوە بۆ کتێبەکەی، حاجی کوێخا ئەحمەد لە ژیاندا بووە.

٢. ئەوانەی لە وتووێژەکان هاوکاریان کرد بۆ ئەم وتارە، پێکهاتە و شێوەی پلیتەکەیان بەجوانی نەدەزانی. بەڵام ئەوەی حەکیمانی کوردەواری پلیتەیان بە چەندین شێوە ساز کردووە. حەکیمانی گوندی سەبەتلووی بانە پلیتەیان بە ریشاڵی پەموو یا پەڕی مریشك دروست کردووە و ماجوومی بنێشتە تاڵ و هەنگوین و هاڕاوەی هەندێ گیایان پێوە داوە. کونی برینەکەیان چزاندووە و داخ کردووە. ئینجا ماجوومەکەیان بە پلیتەکەوە داوە و لە کونی برینەکە ئاخنیوە.

*لە پشتیەوە دەرچووبوو. برینـدارەکەمان بـردە لای کوێخـا ئەحـمەد و ئەویـش پلّیـتەی بـۆ دەکرد و برینەکەی پێ سارێژ دەکرد تا چاك بووەوە.* دەیان و سەدان نمـوونەی وا بـووە کە پێشمەرگە گوللەی وێ کەوتووە و کوێخا ئەحمەد یا کوڕەکانی پلّیتەیان بۆ سـاز کـردووە و لە کونی برینەکەیان خستووە و چاك بـووەتەوە یـا نمـوونەی کەسـی وا بـووە کە چەنـدین حەکیم و پزیشك و شکستەبەند بردوویـانە کە ئێسـکی شـکاوی چـاك نەبـووەتەوە. ڕێـگەی کۆییلەیان بڕیوە و خۆیان گەیاندووتە دیوەخانی کوێخا ئەحمەد. ئەویـش ودمـی نـوژداری و دەستی پسپۆڕی خۆی خستووەتە کار و هەڵیبەستووە و تا چـاك بـووەتەوە لە مـاڵی خـۆی میوانداریشی کردووە. گوایە زۆر جاران بەهۆی سەختی و دووری ڕێگەوە نەخۆش نەیتوانیوە ڕێگەی کۆیيلێ ببڕێت. هاتوونەتە شوێن کوێخا ئەحمەد و بۆخۆی چووەتە سەر نەخۆشـەکە. کـاك لوقمـان دەیگێـڕێتەوە کە: *خواليێخۆشـبوو مەلا مسـتەفا بـارزانی کـاتی خـۆی کە لە باڵەکایەتی بوو بەڵێنی بە کوێخا ئەحـمەد دا خەسـتەخانەیەکی بـۆ بکـاتەوە، بەڵام ئەوکـاتە شۆڕش شکستی هێنا و کارەکە جێبەجێ نەبوو. یـا دەگێـڕێتەوە بـاپیرم بـۆ داودەرمـان سـوودی لە دەیـان گیـا و گـوڵی کـوردەواری وەردەگـرت، تەنـانەت سـوودی لە ئەنـدامی جەستەی زیندەوەرانیش بینیوە [وەکوو گۆشتی کیسەڵ]. بۆ نموونە مام شـێخ مـوحەمەدی کۆییلێ بۆی گێڕامەوە کە کوێخا جەرگی کیسەڵی بەکار هێنـاوە بـۆ چارەسـەری نەخۆشـی مرۆڤ.*

سەردەمی بەعس لە ڕاگواسـتنی دۆڵـی باڵەییـان کوێخـا ئەحـمەد لە پیرزینـی هەولێـر گیرسایەوە. هەر زوو لەوێش دەستی کردەوە بە پیشە پزیشـکیەکەی. بگـرە ئەمجـارە زیـاتر خەڵك سەردانیان کـردووە و تەنـانەت لە شـوێنەکانی دیـکەی کوردسـتان و عێـراق خەڵـك هاتوونەتە لای بۆ پیرزین. هەر بـۆیە شـوێنەکەی کوێخـا لە پیـرزین بە گەڕەکـی بەیتـاران ناسراوەتەوە. تا کۆتا بڕست و وزەیەك کە لە جەستەی ئەم حەکیمەدا بووە خۆی نەبـواردووە لە شکستەبەندی و چارەسەری نەخۆش و دەردەداران. دەگێڕنەوە لە تەمەنی ٩٠ سـاڵیدا کە چاوەکانی بەئاستەم سۆما و سووسـەیان داوە، خەڵـك هـاتوونەتە لای و ئەویـش لە ڕێگـای دەستەکانیەوە شوێنی شکانی دۆزیەوەتەوە و خستوویەتیەوە جێ و هەڵیبەستووەتەوە.

کوێخا ئەحمەد چوار کوڕی بووە کە حاجی جەلال و حاجی مستەفا و کاك نەبی نەریـت و میراتی حەکیمی کوێخای پێ گەیشتووە. ئەگەرچی کاکە ئەمین کوڕی دیکەی کوێخا کە ئێستە بەرپرسی فەرمانگەی ژینگەی چۆمانە و هەروەها مام خـدر بـرازای کوێخـا ئەحـمەد، ناوبەناو خەڵك بەتایبەت بۆ شکستەبەندی سەردانیان کردووە. کوڕی دیکەی کوێخـا شـەهید

ئیبراهیم بووە كە كاتی خۆی فەرماندەی تیپی ٧٤ كارۆخ بووە لە یەكیەتی. كاك نەبی كە زگماكی كەڕولاڵ بووە و بە "كەڕە" ناسراو بووە ئەویش لە پیرزین هەمان پیشەی باوكی كردووە. حاجی مستەفا كە ئەویش ئیستە تەمەنی ٨٠ ساڵ دەبێت و ماڵی لە ڕانیەیە، خەڵك بۆ شكستەبەندی سەردانی دەكەن. ئەوەی ئێستا لەو بنەماڵەیە زۆرتر بەرچاوە و نەیهێشتووە نەریتی حەكیمی كوێخا ئەحمەد كۆیلێ بكوژێتەوە، كاك گۆران كوڕی حاجی جەلالە. ئەگەرچی تەمەنی ٣٠ ساڵان دەبێت، بەڵام ساڵانێك لەبەردەستی باوكی شاگردی كردووە و ئەزموونی حەكیمی بنەماڵەی باب و باپیرانی پاراستووە و هاوكات دەرچووی زانكۆیە و ئێستە لە پیرزین بەفەرمی نۆرینگەی داناوە.

**تێبینی زیادە**

● لاپەڕە ١١٢ كتێبی ڕەواندز، باڵەك و برادۆست سەبارەت بە گوندی گەزنە دەنووسێت: *ئاوایی گەزنە كە لە دۆڵی ڕوست هەڵكەوتووە، بە ئاوایی وەجاغ زادان ناسراوە. ئەوسا ئەم گوندە شوێنی نووشتە و دۆعانووسین و چاكردنەوەی نەخۆشییە دەروونییەكان بووە. [واتا ئەو نەخۆشانە كورد گوتەنی: پەڕیوەتە سەریان و شێت و لێوە بوون،] لە گەزنە چارەسەر كراون. لە باڵەكایەتی باوە، دەڵێن: "ئەگەر یەكێك شێت بوو دەیبەنە گەزنێ. ئەی ئەگەر گەزنە شێت بوو، چی؟"*[1]

---

١. كتێبی: ڕەواندز، باڵەك و برادۆست، لاپەڕە ١١٢

**سەرچاوەکان:**


• بابا مردۆخ ڕۆحانی، مشاهیر کورد، بەرگی ١، پەخشانگای سرووش، چاپی دووهەم، تاران، ١٣٨٢

• شاسوار هەرشەمی، وتار: گەشتێك بە بناری شاخی قەندیلدا، (www.penusakan.com): ٢٠١٤/٠٧/٣٠

• زرار سلێمان بەگ دەرگەڵەیی، بیرەوەریەکانم، چاپی یەکەم، چاپخانەی ڕەهەند، سلێمانی، ٢٠١٠

• مەلا ئەحمەد حەداد دەرگەڵەیی، کتێبی: ڕواندز باڵەك برادۆست، چاپی یەکەم، چاپخانەی هێڤی ڕواندز، ٢٠١٥

• ویکیپیدیا کوردی: هەڵگورد، وەرگیراو: ١٣٩٧/٠٤/٠٩


**وتووێژ لەگەڵ:** *شاسوار هەرشەمی (مامۆستا، تەمەن ٥٩ ساڵ، دانشتووی ستۆکهۆڵم)، جەماڵ مەولوود (کارمەندی خانەنشینی وزارەتی تەندروستی، تەمەن ٦٠ ساڵ، خەڵکی هەولێر)، لوقمان کوڕی شەهید ئیبراهیم کوڕی حاجی کوێخا ئەحمەد (خوێندکار، تەمەن ٤٨ ساڵ، خەڵکی کۆییلێ و دانشتووی ڕانیە)، هاوڕێ ڕەمەزان (کارمەند، تەمەن ٣٠ ساڵ، خەڵکی کۆییلێ و دانشتووی شارۆچکەی قەسرێ)، سۆران موحەمەد مەولوود (مامۆستای زمانی کوردی، تەمەن ٢٨ ساڵ، خەڵکی بۆران لە دۆڵی باڵەیان، دانشتووی قەسرێ)، زۆسك حەمەد مینە (ڕۆژنامەنووس، تەمەن ٣٠ ساڵ، خەڵکی کۆییلێ و دانشتووی چۆمان) و گۆران کوڕی حاجی جەلال (تەمەن ٣٠ ساڵ، خەڵکی کۆییلێ و دانشتووی هەولێر)*

وێنەی حەكیم كوێخا ئەحمەد (وەرگیراو لە ئەرشیڤی كاك گۆران كوڕی حاجی جەلال)



## شێخ موحەممەد سوورکەوڵ یەکێکی تر لە حەکیمانی بنەماڵەی شێخانی بیارە

زیاتر لە دوو سەدەیە لای زۆربەی خەڵکی هەموو پارچەکانی کوردستان و وڵاتانی دراوسێ بنەماڵەی شێخانی نەقشبەندی هەورامان وەك کەسایەتیەکی بواری سۆفیگەری و پزیشکی ناسراون. ئەگەر بەوردی بچینە ناو ئەم باسە و باری پێوەندییە کۆمەڵایەتیەکانی پارچەکانی کوردستان شی بکەینەوە ئەو شێخانە کاریگەری زۆریان داناوە لەسەر نزیککردنەوەی پێکهاتەکانی گشت کوردستان و یەکخستنیان لەسەر یەك ڕووگەی هاوبەش، واتا خانەقاکانی بیارە، باخەکۆن و دوورۆ. یەکەم پێوەندی لە نێوان سەرقافڵەی تەریقەتی نەقشبەندی، مەولانا خالید[1] (١١٩٣-١٢٤٢ کۆچی) و شێخی ناسراوی شەمزینان، شێخ عەبدوڵای نەهری پێك هات، پاشان سەدان خەلیفە و مۆریدی بەرچاو هاتنە بازنەکە و لە باکوور و باشوور و ڕۆژاوا و ڕۆژهەڵاتی کوردستان بەرەو خانەقاکانی نەقشبەندی هەورامان هەرکام بۆ لای مۆرشیدی خۆی بەرێ کەوتن و تا ئێستەش هەر درێژەی هەیە.

ئەم بنەماڵەیە جیا لە باری بەڕێوەبردنی دروشمەکانی ڕێبازی نەقشبەندی، دەستێکی باڵایان هەبووە لە بواری پزیشکی و دەرمانگەری نەخۆشان و دەردەداران. ئەگەرچی باری پزیشکیەکە زیاتر لە ناو بنەماڵەی شێخ عەلائەدین و کوڕەکانی (عوسمان، خالید و موحەممەد)دا دەرکەوتووە. وەك دەگوترێت حەکیمی و دەرمانگەری نەریتێکی میراتی و بۆماوەیی بووە بۆ کوڕەکانی شێخ عەلائەدین. نازناو و ناوبانگی حەکیمیی شێخ عوسمان بۆ هەمووان ناسراوە و دیارترین حەکیمی ئەم بنەماڵەیە دێتە ئەژمار. دیارە کە ئەم کەسایەتیانە

---

١. مەولانا خالید ٦٧ خەلیفەی لە هەموو وڵاتانی ئیسلامیدا هەبووە کە ٣٤ خەلیفەیان کورد بوون و لە چوار پارچەی کوردستاندا ئیرشادیان کردووە. (ڕۆحانی، ١٣٨٥: ٢٧٧)

ئەزموونی پزشکی باب و باپیرانیان پێ گەیشتووە و کەڵکیان لە کتێبە پزیشکیەکانی کۆن وەرگرتووە[١] و ئەزموونی خۆیشیان خستووەتە سەری و بەم شێوەیە سەردەمی خۆیان وەك نۆژدار و پسپۆڕێکی پزیشکی ناسراون.

## کورتە ژیانی شێخ عەلائەدین

شێخ عەلائەدین کوڕی شێخ عومەری زیائەدینیە و ساڵی ١٢٨٠ کۆچی (١٢٣٩ هەتاوی) لە گوندی تەوێڵێ لەدایك بووە و پاش ٩٢ ساڵ تەمەن پاش گەڕانەوە لە دووڕۆ ساڵی ١٣٧٢ کۆچی (١٣٣٣ هەتاوی) لە بیارە کۆچی دوایی کردووە. ساڵی ١٣١١ کۆچی سەفەرێك دەکات بۆ سنە و ماوەیەك لەوێ نیشتەجێ دەبێت. پاشان دەگەڕێتەوە بۆ بیارە و پاش ئەوەی ساڵی ١٣١٨ (١٢٧٧ هەتاوی) باوکی عەمری خوا دەکات و براکەی شێخ نەجمەدین دەبێتە جێنشینی باوکی و ئەویش بەرەو ئاوایی دەرەشیشی ژووروو لە هەڵەبجە کۆچ دەکات و خانەقایەك بنیات دەنێت و تا ساڵی ١٣٢٠ لەوێ دەمێنێتەوە. پاشان دێتە سەوڵاوا کە شوێنی کوڕانی شێخ موحەمەد سادقی وەزیری و باوانی خێزانەکەی بووە. ساڵی ١٣٢٤ لەلایەن سانەکانی ئاوایی ڕەزاو ئاوایی دووڕۆی پێ ئەدرێت. تا ساڵی ١٣٢٦ خانەقا و ئاش و میوانخانە و باخ و بێستانێکی باش لە دووڕۆ دائەمەزرێنێت و مەلا موحەمەد ڕەشەدێیی کە ئەوکاتە مامۆستایەکی زانا و ناسراوی ناوچەی مەریوان بووە دەکاتە مامۆستای حوجرەی خانەقاکە. هەر لەو ساڵانەدا بووە کە زەوی و زاری لە شوێنەکانی دیکەدا کڕیوە. خانەقای دووڕۆ ساڵی ١٣٣٥ کۆچی لە قاتوقڕیەکەی هێرشی ڕووس بۆ سەر کوردستان پەناگە و فریادڕەسێکی باش بووە بۆ هەژاران و لێقەوماوان.

پێگەی شێخ عەلائەدین و خانەقاکەی لە دووڕۆ هەر زوو دەبێتە خولگە و بنکەیەکی ناسراو لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان. شێخ بۆ بڵاوکردنەوەی زیاتری بازنەی ڕێبازەکەی و هەروەها دەسەڵات و بژیوی کوڕەکانی، لە ئاواییەکانی سوورکەوڵ، قەڵاشێخان، دووڕۆ، سوورەتوو و دێکانان زەوی و زار دەکڕێت. شێخ خالید ناسراو بە شێخ مەولانا (شۆرەت

---

١. کاك همایۆن نیكڕەفتار خەڵکی دزاوەری هەورامان و دانیشتووی مەریوان کە هاوکات کەسێکی چالاکە لە بواری بەڵگە و دەستنووسەکانی کوردەواری باس لەوە دەکات کە لە ماڵی یەکێك لە نەوەکانی شێخ عوسمان لە دووڕۆ چاوی بە کتێبێ پزیشکی توحفەی حەکیم تۆنەکابۆنی کەوتووە کە لە قەبارەیەکی پان و درێژە و چاپی سەنگییە و شێخ بۆخۆی دەیان پەراوێزی بۆ نووسیوە. هەروەها لە کتێبخانەی شێخ موحەمەد سوورکەوڵ کتێبێکی چاپی سەنگی توحفەی حەکیم هەیە کە ئەویش ئەم کتێبەی زۆر بەکار هێناوە.

سەراجەدینی) لە ئاوایی قەڵاشێخان سەر بە ناوچەی کەڵاتەرزان،[1] شێخ زاهید (شۆرەت عەلایی) لە دێکانان و سوورەتووی سەرڕێی سەوڵاوا بۆ کامیەران و شێخ موحەمەد (شۆرەت زیایی نەقشبەندی) لە ئاوایی سوورکەوڵ نیشتەجێ دەبن. ساڵی ١٣٣٩ کۆچی شێخ عەلائەدین دەگەڕێتەوە بۆ بیارە. وەك مەلا عەبدولکەریم مودەڕس دەڵێت: *شێخ بۆخۆی هاوکات زانا و مامۆستایەکی پایەبەرز بووە و کتێبێکی بە ناوی (طب القلوب) داناوە و چاپ کراوە.*[2]

میرزا سدیق چنگیانی یەکێك لە حەکیمانی سلێمانی کە دوو کتێبی گیادەرمانی (گژوگیا و ئاژەڵ، و گەنجینەی دارستان)ی نووسیوە و چاپ کراوە، کاتێك باس لەوە دەکات کە ساڵەکانی ١٩٥٠ یەکەم جار لەگەڵ بنەماڵەی شێخانی بیارە ئاشنا بووە و بەهۆی ئەوانەوە بووە کە ڕێچکەی گیادەرمانی و پزیشکی کوردی وەرگرتووە. ئەم پیاوە لە لاپەڕە ١١ پێشەکی کتێبی "گژوگیا و ئاژەڵ" باس لەوە دەکات: "*... ئەم تۆزە شارەزایەم لە ٤ ڕێگاوە وەرگرتووە. یەکەم: لە ئاموشۆکردن و گوێگرترتن لە بەڕێزان و خاوەن پلەکانی شێخانی بیارە کە ئامۆژگاری نەخۆش و هەژارانیان ئەکرد بۆ خواردنی ئەو جۆرە گژوگیا، وە ئەیشمدی پێی چاك ئەبوونەوە... ئەمانەم بەزۆری لە پایەبەرزی بەهەشتی خوالێخۆشبوو شێخ عەلائەدین بیستووە. لە دوای بەڕەحمەت چوونی لە شێخ عوسمانی کوڕی بیستووە و وە ئەبیستم. هەر بە گژوگیا زۆر کەسیان لە ناسۆر و سزای نەخۆشی و ئازاری برینداری جۆربەجۆر ڕزگار کردووە و نەیان هێشتووە تووشی ورگ هەڵدڕین و بڕێك عەمەلیات ببن بەتایبەت گەدە و گورچیلە و جگەر و گولی و پێست و ئەعساب. وە زۆریان لەمانە بە چاوی خۆم دیومە...*". کەواتە دیارە ئەگەر توێژینەوەی زیاتر بکرێت و ڕێچکەی دەرمانگەری و ئەزموونداری پزیشکی بنەماڵەی شێخانی بیارە بە کتێب و بەڵگەی نووسین ڕوون بکرێتەوە، چۆڵاییەکی گەورە لە مێژووی پزیشکی کوردەواری پڕ دەبێتەوە.

### سوورکەوڵ

ئەم ئاواییە ئێستاکە لە ناوچەی کۆماسی سەر بە شارستانی مەریوان هەڵکەوتووە، بەڵام

---

١. ئێستاکە شێخ تاریق کوڕی شێخ مەولانای قەڵاشێخان لە شاری سنە دووکانی گیادەرمانی هەیە و ڕۆژانە خەڵکی نەخۆش و دەردەدار سەردانی دەکەن. [هیوادارم هەوڵێك بخەینە گەڕ زانیاریەکانی ئەم بنەماڵەیشە بکەینە وتارێك]

٢. بەشێکی زۆر لە زانیاریەکانی ئەم بەشە لە لاپەڕە ٣١٦-٣١٩ کتێبی بنەماڵەی زانیاران وەرگیراوە.

سەردەمانی زوو ئەو ناوچەیە و سەرجەم ناوچەی ئێستەی کەلاتەرزان بە کورەویژ[١] ناسراو بووە. لە کتێبی نورالانواری عبدالصمد تووداری کە کۆتایی سەدەی ١٠ کۆچی نووسراوە، باسی سوورکەوڵ کراوە. واتا شێخ زەکریا سەردەستەی تەریقەتی شازەلی کە لە ئاوایی کاکۆزەکریای کەلاتەرزان نیشتەجێ بووە ساڵی ٧٦٥ یا ٧٥٦ کۆچی بەشێك لە ئاواییەکانی کورەویژ و بەرپلەی سالاڵی کڕیوە و دواتر کوڕەکانی بەم ئاواییانە و شوێنەکانی دیکە [وەکوو پیریۆنس لە هەنجیرانی مەریوان و بابا شێخ لە بێسارانی ژاوەرۆ] بلاو بوونەتەوە. دەقی قەواڵەی کڕینی ئاواییەکانی کورەویژ و پشترێ (بەرپلەی سالاڵ) ئەمەیە:

*بسم الله الذی احل البیع و حرم الربا. الحمد لله الذی علم نبیه احکامکل محتاج الیه فی الاخره و الاولی. و الصلوه و السلام علی سیدنا محمد المصطفی و علی کل من آل لیه بالیمان لاسیما آله و اصحابه اصحابی المروه و الصفا. اما بعد: بەپێی ئەم مامەڵەیە میرزا عبدالکریم کوڕی خالێد کوڕی میر ئەحمەد بابانی بە ئارەزووی خۆی سەرجەم مڵکی لە ناوچەی پشترێ و کورەویژ کە بریتیە لە: ئاڵیهەمان و هەوارەکانی، ئەسفەڕەنگین[٢]، گاوەران[٣]، وەنێنە، قەتەون، گولان و هەوارەکانی (هەنگەژاڵە، لاوێسان، بلچەسوور و ماموڵە) و ئاوایی سوورکەوڵ و هەوارەکانی (نێزل، گڵیە، بێرە) و ئاواییەکانی شاییەر و چوێین بەرامبەر بە ٢٠١ مسقاڵ زێڕ فرۆشتی بە شێخ زەکریا کوڕی شێخ عبدالرحمن خالدی شاذلی، ساڵی (٦٧٥ کۆچی: خمس و سبعین و ستماه)[٤]. کاتب: قازی ئەسعەد پایگەلانی*

---

١. لە قەواڵە و نووسراوە کۆنەکاندا بە "کورەومز" و "کورەگویژ"یش هاتووە. هەر سێ شێوەی وشەکە واتای کێوی گویژ ئەدا. لە کوردستان بەتایبەت کەلاتەرزان و هەورامان و شارەزوو نموونەی کورە زۆرە بۆ کێو، وەکوو: کورەی دەرەکێ، کورەمیانە، کورەی پیازە، کورە مریەم، کورەمێو، کورە کاژاو، کورەی بالامبۆ و تاد.

٢. ئەم ئاواییە لە باشووری رۆژهەلاتی تەیناڵە

٣. ئاوایی شێخ عەتاری ئێستە

٤. نورالانوار و هەروەها بنەماڵەی زانیاران (ئەمیش لە نورالانواری وەریگرتووە) ساڵی وەقفنامەکەی میرزا عبدالکریم بابانی بۆ شێخ زەکریا ٦٧٥ کۆچی نووسیوە کە دەبێتە پێش لەدایکبوونی شێخ زەکریا، هەروەها بەپێی ساڵی مردنی باپیرە گەورەی واتا شێخ ابوالحسن ٦٥٦ کۆچییە، کەواتە بەرواری ئەم وەقفنامەیە ٦٧٥ نییە، بەڵکوو ٧٥٦ یا ٧٦٥ کۆچی دروستە. بابە مەردۆخ کە سەرچاوەی زانیاریەکانی بۆ شێخ زەکریا جیا لە کتێبی نورالانوار، کەشکۆڵ و دەستنووسی دیکەش بووە {وەك خۆی نووسیویە: نورالانوار، جنگهای خطی}. کەوابوو ساڵی ژیانی شێخ زەکریا کە بابە مەردۆخ نووسیویە ٧٢٦ تا ٨١٠ کۆچی لەگەڵ ئەم قەواڵەیە و مەودای شێخ زەکریا تا باپیرە گەورەی یەك دەگرێتەوە. لە لاپەڕەی ٧٣ کتێبی بنەماڵەی زانیاراندا هاتووە: شێخ زەکریا ساڵی ٧٧٥ کۆچی شەهید کراوە کە دیسان ئەمە هەڵەیەکی دیکەیە.

*[مەلا عەبدولکەریم مودەرِس لە بنەماڵەی زانیاران دەقی قەواڵەکەی وەرگێڕاوەتە سەر کوردی.]*

بەپێی ئەم قەواڵەیە سوورکەوڵ سەدەی ٧ کۆچی ئاوەدان بووە و ئاواییەکانی ئێستەی نێزڵ، وشترمل[١]، بێرە و گلیە هەواری سوورکەوڵ بووە. هەروەها ئێستەش کەلی نێوان گلیە و دیوی سەوڵاوا بە "کەل سوورکەوڵ" دەناسرێت. هەروەها ئاواییەکانی بەری شامیان و سەوڵاوا سەرجەم زنجیرە چیای کوڕەمیانە تا کوڕەی پیازە بە "کێف سوورکەوڵ" دەیناسن. ئەو دۆڵەی کە ئێستە ئاواییەکانی سوورکەوڵ، بێرە، نێزڵ و گلیەی تێدایە جارجارە لە ناو خەڵکدا بەتایبەت لای ئاواییەکانی هۆزی کۆماسی بە "دۆڵ یا چەم گۆڕانەکان"یش دەناسرێت. کاتی خۆی سوورکەوڵ و هەوارەکانی ملکی شێخ حەسەن باوکی باوامراد[٢] و شێخ یۆسف ئەعرەج[٣] ناسراو بە سەوزەپۆش و پیر موحەمەد ئەمین بووە. [ئەم سێ کەسایەتیە کوڕی شێخ زەکریا بوون]. گڵکۆی ئەم شێخانە ئێستە لە سوورکەوڵ و نێزڵ هەڵکەوتووە. دەگێڕنەوە کە جارێك شێخ سادق کوڕەزای شێخ زەکریا دەیهەوێت لە کاکۆزەکریا بچێت سەردانی باوا مراد کوڕی شێخ حەسەن بکات لە سوورکەوڵ. [ئەوکاتە لە نێوان کاکۆزەکریا و سوورکەوڵ پردی پەڕینەوە نەبووە لەسەر چۆمی کوڕەوێز. هەر بۆیە باوا مراد ئاگەداری سەردانی شێخ سادق دەبێت و لە بواری چۆمەکە دیوی سوورکەوڵ چاوەڕوانی دەبێت]. وەرزی بەهار بووە و چۆم خرۆشاوە و ئاوەکە ڕێگەی نەداوە پێکەوە دابنیشن. هاژەی چۆمەکەش نەیهێشتووە گوێچکەیان بە قسەی یەکەوە بێت. شێخ سادق ڕوو لە ئاوەکە دەکات و ئێژێت: ئاو کش بە. ئاوەکە بێدەنگ دەبێت. ئەو شوێنە ئێستە بە کشەیەرە بەناوبانگە.[٤]

---

١. تا سەردەمی شێخ موحەمەد سوورکەوڵ وشترمل ئاوەدان بووە و ئێستە چۆڵ کراوە.

٢. باوامراد دوو کوڕی بووە: ئەبووبەکر و ئیبراهیم. گڵکۆی باوامراد لە سوورکەوڵە و ئێستاکە بەشێك لە شێخەکانی سوورکەوڵ شەجەرەی خۆیان دەگەڕێنەوە بۆ سەر ئەم باوا مرادە. بەرەیەك لە نەوەکانی باوامرادیش چوونەتە باقلاوا.

٣. بە کوردی واتا شەل

٤. ئەگەرچی ئەم گێڕانەوە زۆر بە چیرۆکەوە نزیکە، بەڵام لە نورالانواردا هاتووە. خەڵکی ناوچەکە ئێستە، دەڵێن: ئەو شوێنە پێش چاوپێکەوتنی باوا مراد و شێخ سادق ناوی سوورەلێژ بووە. چیرۆکی ئەم کشەرە و سوورەلێژە لە ئاوایی باقلاوا بۆ شێخ حسەینە سوور (مردن ١٢٧١ کۆچی) باسی لێوە دەکەن. دیارە کە باسەکەی نورالانوار هی سەردەمی پێش شێخ حسەینە و نابێ بۆ شێخ حسەین دروست بێت.

بەرەچەی شێخانی شازەلی لە نێزڵ و سوورکەوڵ، ئێستە تەنیا بەرەی بنەماڵەی شێخ عبدالصمد سوورکەوڵ ماوەتەوە. دیارە کە بەرەبەرە ملکی ئەم ئاواییانە دەستاودەست بووە و بە وردەمالك و زەویداری دیکە گەیشتووە. وەك لە قەواڵەکانی ئەرشیڤی کاك سەعدی کوڕی شێخ موحەمەد زیاییدا هەیە شێخ عەلائەدین لە ماوەی چەندین ساڵدا (۱۳۲۹ تا ۱۳۵۷ کۆچی)[1] زەوی و زاری ئاوایی سوورکەوڵی کڕیوەتەوە. وەك دیارە خاوەن زەویەکانی سوورکەوڵ پێش شێخ عەلائەدین خەڵکی ناوشاری سنە و دەوروبەر بوون. دواتر ساڵی ۱۳۲۵ هەتاوی شێخ عەلادین زەوی و زاری سوورکەوڵ نەزری شێخ موحەمەد دەکات و قەواڵەی ئەم نەزرنامەیە پەراوێزی مۆر و ئیمزای چەند شاهیدی پێوەیە، بۆ نموونە فەرەج خان زەنووری بەخشداری ئەوکاتەی کەلاتەرزان و قائمقامی وەختی هەڵەبجە.

## شێخ موحەمەد سوورکەوڵ[2]

پاش شێخ عوسمان و شێخ مەولانا، شێخ موحەمەد ساڵی ۱۲۹۹ هەتاوی لە بیارە هاتووەتە دنیا و ساڵی ۱۳۸٦ هەتاوی لە شاری سنە کۆچی دوایی کردووە و مەزاری لە گۆڕستانی ئاوایی دووڕۆیە. هەر بە منداڵی دەستی بە خوێندنی قورئان و ئەلفوبێ کردووە و لە خانەقای بیارە ئیجازەی مەلایەتی وەرگرتووە. هەروەها تا پۆلی ۹ ناوەندی خوێندنی قوتابخانەیشی تەواو کردووە. شارەزایی تەواوی بووە لە زمانەکانی کوردی هەورامی و سۆرانی و ئەردەڵانی، عەرەبی و فارسی. زمانی دایکی هەورامی بووە، بەڵام بەشێکی زۆری ژیانی لە ئاوایی سوورکەوڵدا بووە کە شێوەزاریان کوردی ئەردەڵانییە. هەڵکەوتنی سوورکەوڵ جۆرێك بووە کە کەوتووەتە نێوان دووڕۆ و قەڵاشێخان و سوورەتوو. هەر بۆیە بەردەوام هاتوچۆ لەم نێوانەدا زۆر بووە. شێخ موحەمەد بەفەرمی لە ساڵی ۱۳۲۵ هەتاوییەوە لە سوورکەوڵ نیشتەجێ بووە و دیواخانێکی گەورە و سەردەمیانەی بۆخۆی پێکەوە ناوە. شێخ موحەمەد ۵ هاوسەر و ۲۱ منداڵی بووە. وەك کاك سەعدی کوڕی دەیگێڕێتەوە: باوکم زۆر گرینگی بە تەندروستی، خۆراك، گوزەران و خوێندەواری خۆی و خاوخێزانەکەی داوە. هەر بۆیە لەو سەردەمەی کە منداڵی خەڵك بە تاق و تاقمە مردوون و ئەوانەیش ماون زۆر

---

۱. بەرابەر بە ۱۲۸۷ تا ۱۳۱۵ هەتاوی

۲. کتێبی بنەماڵەی زانیاران سەبارەت بە شێخ موحەمەد تەنیا ئەوەی نووسیوە کە: کوڕەکانی [دیکەی] شێخ عەلائەدین موحەمەد زاهید و موختار و موحەمەدە. ... موحەمەدیش لەسەر زەوی و زاری خۆی ماوەتەوە. (لاپەڕە ۳۲۰)

بە کەمی تەنیا کوڕەکانیان خوێندوویانە، لە ٢٢ منداڵی شێخ موحەممەد تەنیا یەك منداڵی بە ساوایی مردووە. هەروەها بۆخۆی ٧ کچەکەی فێری خوێندن و نووسینی فارسی و کوردی کردووە و کوڕەکانیشی ناوەتە بەر خوێندن. کاتێ سوورکەوڵ قوتابخانەی سەرەتایی نەبووە کوڕەکانی لە قوتابخانەی باقلاوا[1] خویندوویانە و دواتر کە سوورکەوڵ خوێندنگەی بۆ هاتووە لەوێ خوێندوویانە و دواتر چوونەتە سنە بۆ درێژەی خوێندن.

دیواخانەکەی شێخ موحەممەد لەچاو ماڵ و خانووەکانی دیکەی خەڵکی ئەو سەردەمە زۆر پێشکەوتوو بووە. لە کانیاوێکی لای ماڵەکەیەوە بە جۆگەلە ئاوی ڕوونی کێشاوە تا لای دیواخانەکەی لە ناودێ. لەوێ دوو بەش کراوە و لقێکی بۆ جۆگەلەی ئاودەستخانە چووە و لقی دیکە بۆ گەرماوە [= حەمام و جلشۆرخانە] و چێشتخانەکە براوە. گەرماوەکەی توونی ئاوگەرم کردن و دیواری سیمانکراوی بووە. نهۆمی سەرەوەی دیواخانەکەی شێخ موحەممەد دوو دیوی هەبووە. دیوێکی بۆ نەخۆش و میوانانی ئاسایی و دیوی دیکەی دەرمانخانە و شوێنی هەڵگرتنی داودەرمان و کتێبەکانی شێخ موحەممەد بووە.

کاتی خۆی شێخ موحەممەد لە بیارە و دووڕۆ ئاشنا بووە لەگەڵ گەلێك کەسایەتی کورد و بیانی کە هاتوونەتە خانەقای شێخ عەلائەدین. هەر بۆیە دەگێڕنەوە زۆر جار کەسانێك لە عێراق و وڵاتانی دیکەی عەرەبی وەکوو لوبنان هاتوونەتە دیدەنی شێخ موحەممەد لە سوورکەوڵ. هەروەها دەگێڕنەوە وەك چۆن نامەگۆڕینەوەی زۆر بووە لە نێوان بارزانی و شێخ عوسمانی دووڕۆ، بەو جۆرەش شێخ موحەممەد کاتێك لە بیارە و دووڕۆ بووە ئاشنایەتی بەستووە لەگەڵ کەسایەتی مەلا مستەفا بارزانی و دواتریش کە هاتووەتە سوورکەوڵ، بەردەوام گوێی لە ڕادیۆ گرتووە و پەیجۆری چارەنووسی ئەو بزووتنەوەی بارزانی بووە. گوایە سەردەمی پەهلەوی واتا دەوروبەری ساڵەکانی ١٣٥٠ هەتاوی، جارێك پاسگای ژاندارمری ئاوایی نگڵ هەڵدەستێت و بەرەو سوورکەوڵ بەڕێ دەکەوێت. پێشتر کەسانێك شێخ موحەممەد ئاگەدار دەکەنەوە. ئەویش بەشێکی زۆر لە بەڵگە و نووسراوەکانی دەسووتێنێت. گوایە هەواڵی ئەوە بە پاسگا گەیشتووە کە شێخ پێوەندی هەیە بە بزووتنەوەی کوردییەوە و

---

١. ساڵی ١٣٤٢ هەتاوی عەباس موکری خەڵکی سەقز وەك یەکەم معلم هاتووەتە باقلاوا بۆ دەرس وتنەوە. هەر لەو ساڵەدا ئاواییەکانی زەنووری و پلوورە قوتابخانەی بۆ هاتووە. پێش ئەمانە تەنیا ئاواییەکانی پیرخێران و چاولکان حاجی لە کوڕەوێز و پشترێ قوتابخانەی بووە. ساڵی ١٣٢٦ هەتاوی مالکی ئاوایی چاولکان، سەید ئەحمەد عەزیزی، داوای لە ئیدارەی فەرهەنگ کردووە و قوتابخانەی بەو ئاواییە دراوە. [قەواڵەی ئەم داواکاریە لای نەسرین عەزیزی نەوەی ئەم پیاوە، دانیشتووی مەریوان هەیە. کۆپیەك لەم قەواڵە لای منیش هەیە.]

بەڵگە و نامەی شۆڕشی بۆ دێت.

بەهۆی باری شەڕ و شۆڕی بزووتنەوەكانی كورد و حكوومەتی ئێران، شێخ موحەمەد ساڵی ١٣٥٨ هەتاوی بەرەو شاری سنە كۆچ دەكات و تا كۆتایی ژیانی لەوێ دەمێنێتەوە. بەردەوام خەڵك بۆ چارەسەری نەخۆشینەكانیان سەردانیان كردووە. بە دەستی خۆی و هاوكاری خێزان و منداڵەكانی پەسای دەرمانی دابین كردووە و گرتوویەتیەوە و بە نەخۆشەكانی داوە. بێ بەرانبەر كاری كردووە و هیچ چاوەنوارێەكی پارە و پووڵی لە خەڵك نەبووە. مەگین ئەوە كە خەڵك بۆخۆی شتێكی دانابێت. ئێستاش كە خاتوو خەجێی خێزانی لە ناوشاری سنەیە ڕێچكەی شێخی گرتووەتە بەر و چەندین ڕەچەتە و دەرمانی هەیە و ڕۆژانە ئەوانەی سەردانی دەكەن بە ڕووی كراوە و دڵی فراوانەوە پێشكەشی خەڵكی دەكات.

## چەند تێبینی و بژاردە:

● شێخ موحەمەد زۆر حەزی لە تیرەنازی، ڕاویاری، ڕاوەماسی، شاخەوانی و گەڕانی دەشت و كێو بووە. هەر بۆیە شارەزایی تەواوی بووە لەو بارەوە بەتایبەت لە بواری ناسینی گژوگیا دەرمانیەكانی ناوچەكە.

● ئەم پیاوە كاتی خۆی ئاوی چۆمی كەل سووركەوڵی كێشاوە بۆ دەشت پەڕان و لەوێ مەرەزەی كردووە و برێنجی كوردی بەرهەم هێناوە.

● شێخ لەگەڵ چەند كەسایەتیەكی لوبنانی نێوانی خۆش بووە و ساڵانە سەردانیان كردووە. گوایە لە ڕێگەی ئەوانەی نەمامی سێوی تایبەتی لوبنانی بۆ هاتووە و لە باخەكانی ڕواندوویە. ئێستاكەش ئەو سێوە لە كەڵاتەرزان بە سێف لوبنان دەناسرێت.

● یەكەم كەس بووە لەو ناوچەیە شەتڵی تووەفەرەنگی چاندووە. وەك دیارە یەكەم كەس شێخ عوسمان بووە لە ئێران كە تووەفەرەنگی هێناوەتە دووڕۆ. دیارە شێخ موحەمەد لە دووڕۆ ئەو شەتڵەی هێناوە.

● یەكەم كەس بووە لە چەم كوڕەوێز كە تراكتۆر و كامیا و گاوەسنی كڕیوە و بۆ كاری كشتوكاڵ بەكاری هێناوە. ئەم هەڵوێستە لە ساڵەكانی ١٣٥٠ بەدوا توانیویە بەشێوەیەكی بەرچاو بواری كشتوكاڵی ناوچەكە بگۆڕێت و وەرچەرخانێكی مێژوویی بووە.

● شێخ موحەمەد سەردەمی پەهلەوی ماشێنی كڕیوە و بە ڕێگەی كەڵاتەرزان و جانەورە چووەتە مەریوان و سنە. گوایە دوای دروستكردنی جادەی شەوكەتبەو بۆ كۆماسی ئەو ماشێنەی كڕیوە. كاك شەریف تجارە تەمەن ٨٥ ساڵ خەڵكی باقلاوا دەیگێڕێتەوە كە

ئەو ساڵە بەهارەکەی بەرنامەی اصلاحات ارضـی گەیشـتە بـاقلاوا [واتـا سـاڵی ١٣٤٢] ئـێمە جادەکەمان تـا مـلەی مەنیـان بەرەو سـوورکەوڵ هێنـابوو. ئەم پـرۆژەیە جۆرێـك بـووە کە حکوومەت لە سێ پێچیەکەی شەوکەتبەو بەرەو ئاوایی قەڵاشـێخان، سـپاردبووی بە میـرزا موحەمەد خەڵکی تازاوا وەك پەیمانکار، دێ بە دێ خەڵك کاریان کردووە و ڕۆژانە بە پـاچ و بێڵ جادەیان کێشاوە و حکـوومەت پـارە یـا ئـاردی ئامریکـایی پـێ داون. سـاڵی ١٣٤٢ کە جادەکە لە سنووری باقلاوا دەرچووە خەڵکی کۆماسی و ئـاوایی سـوورکەوڵ درێژەیـان پـێ داوە. ڕێگەی ماشینڕەو تا ئاوایی سوورکەوڵ چووە. شێخ موحەمەد خەڵکـی بانـگ کـردووە کە لەسەر چۆمی کوڕەوێز تا ناوئاوایی جادەکەیان بردووە.

● دایکم دەیگێڕێتەوە: *تازە ئینقلاب کرابوو. سەلاحی کـوڕم زۆر نەخـۆش بـوو. چـووینە سوورکەوڵ و ڕوومان لە شێخ موحەمەد خست کە چارەسەری بکات.* گـوایە شـێخ سـەیری سەلاح دەکات و بە خاتوو خەجێی خێزانی دەڵێت کە برۆ لە دەرمانخـانەکە فـلان دەرمـان بهێنە. پاشان دایکم بۆ قەڵش و شەقی دەستی کە بەهۆی کارەوە خوێنی لێ هـاتووە داوای دەرمان دەکات. شێخ بۆخۆی دەڕوات و دەرمانەکە دەگرێتەوە و دەیهێنێـت. دواتـر کە کـاك سەلاح فەوت دەکات و باوك و دایکم جارێ دیـکە ڕێگەیـان دەکەوێـتە سـوورکەوڵ. شـێخ هەواڵی کاك سەلاح دەپرسێت. خەڵـك بـاس لەوە دەکەن کە شـێخ جـاری وابـووە کەسـێك سەردانی کردووە و زانیویە کە چارەسەری لای ئەو نییە بۆ ئەوەی نەخۆشەکە یا هاوڕێکـانی بـێ هیـوا نەکـات خێـزانەکەی نـاردووە کە دەرمـان بهێنێـت، بەڵام ئەگەر چارەسـەریی نەخۆشییەکەی زانیوە بۆخۆی هەوڵی داوە و نەخۆشـەکەی تـا دەرمانخـانەکەی بـردووە تـا تەواو هەوڵی چارەسەری بۆ بخاتە گەڕ.

● شێخ موحەمەد کەلوپەلی ددان کێشان وەکـوو دەرزی سـڕکردن، لـۆکە و بەتـادین و ئەمووری دەرکێشانی بووە و ئێستەش ماوە.

● وەك لە نووسـین و کتێبەکانیشـیدا دیـارە دەرزی و دەوای پزیشـکی تـازەی بەکـار هێناوە. واتا هاوکات هەم دەرمانی گیایی و هەم دەرمـانی زانسـتی پزیشـکی تـازەی بەکـار هێناوە. کاك سەعدی دەیگێڕێتەوە کە ئێمە هەر پێش هاتنی برق بۆ سـوورکەوڵ یەخچـاڵی نەوتیمان بووە و باوکم دەرمان و دەواکانی دەخستە ناو یەخچاڵەکە.[1]

● بە قسەی کاك سەعدی، ساڵێك ژن و پیاوێك منداڵێکی پێـنج شـەش سـاڵان هێنـایە

١. برق ساڵی ١٣٧٣ هەتاوی هاتە باقلاوا. پاشان ئاواییەکانی کۆماسی و سوورکەوڵ برقیان بۆ کێشرا.

لای شێخ موحەمەد. منداڵەکە لاڵ بووە و قسەی نەکردووە، بەڵام قسە و باس حاڵی بووە. شێخ منداڵەکە لەسەر کۆشی دائەنێت و دەمی ئەکاتەوە. ئینجا هەندێ بەڕووی منداڵانەوە لەگەڵی قسە دەکات و ژێر زمانی منداڵەکە دەگرێت و دەیبڕێت. هەندێ خوێن دێتە ناودەمی و دەگریت، بەڵام هەر زوو بانگ لە دایکی دەکات و دێتە قسە. گوایە پەردەی ژێر زمانی منداڵەکە تا نووکی زوانی هاتووە و نەیهێشتووە منداڵەکە زوانی بچەرخێت و کەلیمەکان بێژە بکات.

**ڕەچەتە (نوسخە) دەرمانیەکان شێخ موحەمەد**

بەداخەوە تاکوو ئێستا کەس هەڵنەستاوە ڕەچەتە و شێوە دەرمانەکانی ئەم حەکیمە کۆ بکاتەوە تا نەفەوتێن و لەبیر نەچنەوە. ئەوەی کە لەم وتارە دەرکەوتووە هەوڵێکە بەیارمەتی کاک سەعدی زیایی و کاک ئاسۆ مەعرووفی بە ئەنجام گەیشتووە. ئەڵبەت ئێستاکە بەشێکی بەرچاو لە ڕەچەتە و شێوەدەرمانیەکانی شێخ موحەمەد، هاوسەرەکەی خەدیجە خانم لە شاری سنە پێشکەش بە خەڵکی نەخۆش و دەردەدارانی دەکات. هیوادارم دەرکەوتنی ئەم وتارە ببێتە هەنگاوی یەکەم بۆ کۆکردنەوە ژیان، بەرهەم و ڕەچەتەکانی حەکیم شێخ موحەمەدی سوورکەوڵ.

[تێبینی: بەشی زۆری لێزانی و ڕەچەتە دەرمانیەکانی نەجوانی خانم لە شێخ موحەمەدی باوکی فێر بووە. خۆشبەختانە کاک ئاسۆ بەشێك لەو ڕەچەتانەی کە لە خوالێخۆشبوو دایکیانەوە لە بیر مابوو، بۆ نووسینی ئەم وتارەیان نارد.]

## باسێک لەسەر نەوجوان خانم کچی گەورەی شێخ موحەمەد

ئەم خانمە ساڵی ١٣٢٥ هەتاوی لە ئاوایی سوورکەوڵ لەدایك بووە ساڵی ١٣٨٦ لە شاری مەریوان کۆچی دوایی کردووە. نەوجوان خانم خێزانی شێخ موحەمەد[1] بووە لە باقلاوا. ئەو خانمە وەك خاڵێکی گرینگ لە مێژووی ئاوایی باقلاوا ئەژمار دەکرێت. چونکە لە بنەماڵەیەکی ناوداری شێخانی بیارە گەورە بووە و لەچاو خەڵکی ئەوکاتە زیاتر چاوکراوە

١. شێخ موحەمەد کوڕێ ئاغە جەمیل ساڵی ١٣١٠ لە باقلاوا لەدایك بووە و ئێستە لە شاری مەریوان نیشتەجێیە و خانەنشینی ئیدارەی آموزش و پرورشە. پاش ئەوەی خوێندنی مەلایەتی تەواو کردووە ساڵی ١٣٤٤ لە باقلاوا بووەتە معلمی سەرەتایی. کەسێکی زانا، قسەخۆش و شاعیرە. خۆشبەختانە ئەو مامۆستایە شێعرەکانەی بە بەندە سپاردووە. تا وەکوو ئێستا تایپ کراوە و هەندێ پەراوێزی نووسراوە. هیوادارم ئەو شێعرانە لە ژێر ناوی "دیوانی سەبری" لە داهاتوویەکی نزیکدا چاپ بکرێ.

بووە و کە هاتووەتە باقلاوا بووەتە چاوساقی خەڵکی ئاوایی بەتایبەت چینی خانمان. وەك دەگێڕنەوە ئەوەی سەبارەت بە پزیشکی و نەخۆشی و چارەسەری لە باوکی فێر بووە بە خەڵکی ناودێ باقلاوا گەیاندووە، بەتایبەت بۆ خانمان و کچان.

لێرە چەند ڕەچەتە و شێوە دەرمانی نەوجوان خانم ئاماژە پێ ئەکەین کە کاك ئاسۆ مەعرووفی کوڕی ئەم خانمە کۆی کردووەتەوە:

- شارەزایی بووە لە تیمارکردن، برینپێچی و دەرزی وەشاندن.
- مەڵهەمی تایبەتی بووە بۆ چارەسەری سووتان، کە پێك هاتووە لە ڕۆنی ماسی و بنێشتەتاڵە.
- بۆ دەرمانی سووتان بەم شێوە کاری کردووە: سەرەتا سووتانەکەی بە ئاوی کوڵاتەی ساردەوەبوو (پلەی گەرمی شیرتین) شۆردووە. پاشان بە مەقەست توێخڵی سووتانەکەی لێ کردووەتەوە. مەڵهەمی جاجکەتاڵە و ڕۆنی ماسی پێدا هەڵناویە. ئەگەر پێستە سووتاوەکە هێشتا بلۆقی نەکردووە، ئەوە ئاردی وشك یا ماستی پێدا کردووە کە بەرگری کردووە سووتانەکە بلۆق نەکات.
- بۆ چارەسەری برین و برینە ئاساییەکانی پێست، هەنگوینی بەکار هێناوە. پاشان تۆزی مادەی پنیسیلینی پێدا کردووە تا شوێنەکە چڵك نەکات.
- بۆ چارەسەری نەخۆشییە پێستیەکان ئاوی گەڵای پنگی بەکار هێناوە.
- بۆ کەمکردنەوە و دامرکاندنی یاو و لەرز، ئاوی گەڵای بی دەستنیشانی بەکار هێناوە.
- کەسانێك وا پێستیان گەڕی گرتووە یا زۆر خوراوە، بە گەڵای بی کوتراو، شۆردوویە چاك بووەتەوە.
- کەسانێك وا نەخۆشی جەرگ و سیپەلاکیان بووە ئاوتك و ئاوی چەقچەقەی داناوە بۆیان. دەگێڕێتەوە کە بیستوویە لە شێخ عوسمانی مامۆی کە، فەرمووویەتی: *ئەگەر خەڵکی کورد بە سوود و تایبەتمەندی پزیشکی و شەفابەخشی گیای چەقچەقەیان ئەزانی، سەربانی ماڵەکانیشیان چەقچەقە ئەچاند.*
- بۆ دابەزاندنی تەوژمی (فشار) خوێن خواردنی گوڵباخی، سزگی (تیژاو) دۆ و چایی ڕیشەی ڕێواسی داناوە.
- کەسانێك کە ئازار و بەردی گورچیلەیان بووە، دەرمانێکی گیراوە نواندووە کە ناوی حەفت دەرمانە بووە: قونچکی گێلاس، ڕیشۆڵی گەنمەشامی، گیا قەیتەران، پەیکوڵ، ...
- بۆ کەسانێك نەخۆشی باداری و ڕۆماتیزم و ئارترۆزیان بووە: گیراوەی زەنجەفیل و

سیری کوتراو لەسەر شوێنی ژان و ئازارەکە بگرێت.

● بۆ شل کردنەوەی ماسوولکە، هێورکردنەوەی ژانی شوێنی شکان و دەرچوونی ئێسک و هەڵکپلیکیان و جەمامی ڕەگ، گیراوەی زەفت و قیری بەکار هێناوە.

● کەسانێك ڕشك و نەخۆشی پێڵی چاویان بووە یا تووشی سووربوونەوە چاو هاتوون، تووی خەربەنگی داناوە بۆیان کە بیستووتێنن و سەریان بگرنە سەر دووکەڵەکەیدا.

● بۆ ئەوانەی کرم و مشەخۆری ناو گەدە و ڕیخۆڵەیان بووە کولاتەی گیای گەلاڕێواسی داناوە بۆیان. ئەڵبەت پێش بەکارهێنانی ئەو دەرمانە، پێویستە نەخۆش شەووڕۆژێك ماست و شیرەمەنی دیکەی نەخواردایە تا ئەو دەرمانەکە زیاتر کاریگەر بوایە.

● چایی توێکڵی زەرد و سپی داری بی بۆ چارەسەری یاو و لەرز و چڵکی بەدەن و کەمکردنەوەی ترس و دڵەڕاوکێ و کێشە ڕەوانیەکان.

● بۆ بەهێزکردنی توانست و بڕستی بەدەن (تقویت جسمی) خواردنی ئاوتکی قارچك یا ئاوی قرژانگی نواندووە. (ئاوی قرژانگ: دەرکێشانی ئاوی بەند بەندەکانی بەدەنی قرژانگ)

● بۆ نەخۆشی و کێشەکانی جسمی تایبەت بە ئافرەتان هەمیشە لەگەڵ خانمەکان ئامۆژگاری ڕاگرتنی خاوێنی و تەندروستی کردووە و لەم بوارەشەوە دەرمانی تایبەتی بووە.

● کاتی خۆی کە هاتووەتە باقلاوا و ژیانی هاوسەرگیری پێك هێناوە، لەپاڵ دیواخانی ماڵی خەزووری ئاودەستخانەیەکی دروست کردووە، هەروەها شوێنی حەمام کردن. ئەمە وەك یەکەم هەنگاوی بواری تەندروستی ئەم ئاواییە بووە کە خەڵك جیا لە حەوز و ئاودەستخانەی مزگەوت و کانی ژنانی ناودێ، لە ناوماڵی خۆیان ئاودەست و گەرماویان دروست کردووە.

**سەرچاوە:**

- چنگیانی، میرزا سدیق ئەحمەد، گژوگیا و ئاژەڵ، چاپی یەکەم، پەخشانگای ئاشتی، سلێمانی ۱۹۹۰
- مودەڕس، مەلا عەبدولکەریم، بنەماڵەی زانیاران، پەخشانگای ئانا، تاران، ۱۳۸۹
- روحانی، کمال، *تاریخ جامع تصوف در کردستان، نقد و بررسی طریقت قادری به ضمیمه تاریخ عرفان از آغاز تاکنون*، تهران: نشر سامرند، ۱۳۸۵

وێنەکانی شێخ موحەمەد (وەرگیراو لە ئەرشیڤی کاک سەعدی ضیایی لە سنە)

وێنەی ۱: یەکەم کەس دانیشتوو لای ڕاست لە ئاوایی سوورکەوڵ



وێنەی ٢: شێخ موحەمەد، شێخ عوسمان دوورۆ و شێخ مەلك حسامی



وێنەی ٣: شێخ موحەمەد و دکتۆر مادێح کوڕی شێخ عوسمان لە ئاوایی سوورکەوڵ



# ناساندن و دەرخستنی کەسایەتی و پێگەی پزیشکی حەکیمە کۆڵەی گردەکشانێ

هەر لە کۆنەوە نیشتمانی کوردان جێگە و پێگەی گەورەپیاوان و شۆڕەژنانێ بووە کە جیا لە هەوڵی دابین کردنی نان، ئەزموون و زانستیان بەخشیوە و ژیانیان بۆ مرۆڤەکان خۆشتر کردووە و واتایان بە ناوەرۆکی ژین بەخشیوە. ئەمجارە ڕێگەمان کەوتووەتە ئاوایی گردەکشانێ لە دەشتی لاجان.

گردەکشانێ لە چەقی دەشتی لاجانی پیرانشار هەڵکەوتووە و ئێستە بووەتە شارۆچکەیەکی خنجیلانە. ساڵی ١٣٩٢ لە سەفەرێکدا چووینە گردەکشانێ و پرساپرسا ماڵی حەکیمە کۆڵەمان دۆزییەوە. گەلێک زانیاریمان لەسەر ئەم پیاوە لە زمانی کاک سامان چووپانی کوڕی سۆفی حەکیمە کۆڵە دەست کەوت. هەر چەند بەداخەوە وەك نەریتی باوی کوردەواری بۆ ناسینی حەکیمانی خۆماڵی، شاردنەوە و ڕازئاسا کردنەوەی ژیان و بەرهەمی ئەم حەکیمەش لای بنەماڵەکەی بەرچاو دەکەوت و گەلێك پرسیارمان بێ پەرسڤ مایەوە. لە ناو قسەکانی کاك سامان ئەوەم بەرگوێ کەوت کاتی خۆی ڕووسەکان کە نووسینگەیان بووە لە ورمێ و مەهاباد، هاتوونەتە ئەم ناوچەیە و حەکیمە کۆڵە لەگەڵیان زۆر گەڕاوە و کتێبێکیان پێ داوە کە گوایە دەستنووسێکی دەگمەن بووە و حەکیم زۆر سوودی لەم کتێبە وەرگرتووە.[1] ساڵی ١٣٩٥ بۆ بەدەست هێنانی زانیاری لەسەر ئەم کتێبە دیسانەوە سەردانی ئەم بنەماڵەیەمان کرد. پاش قسە و باسێکی زۆر، بەداخەوە هیچ ناونیشانێك لە ڕاستی و ناڕاستی ئەم هەواڵەم بە دەست نەهێنا و بۆ خاترجەمی لە شوێن نەکەوتنی و نهێنی هێشتنەوەی سەرەداوی ئەوەیان پێداین کە پاش مردنی حەکیمە کۆڵە

---

١. وەك دەرکەوتووە حەکیم نەیخوێندووە و حوجرە و مەکتەب نەچووە. هەندێك دەڵێن بڕێکی زانیویە، بەڵام زۆر نەبووە. جا ئەوە کە سوود وەرگرتنی حەکیم لە کتێب چۆن بووە تا ئێستێ بۆمان ڕوون نەبووەتەوە.

دەستنووسەکەمان لە گاچەرمێك خستووە و لەناو بەردە سێحراویەکانی ئاوایی خورینج[١] شاردراوەتەوە.

جاری سێهەم کە سەردانی ئەو بنەماڵەیەم کرد بەرواری ١٣٩٧/٠٣/٠١ بوو کە بۆ نووسینی وتارێك لەسەر حەکیمە کۆڵە چوومە دووکانی گیادەرمانی کاك سامان لە شاری پیرانشار.[٢] کاك سامان دووکانەکەی بە ناوی گیادەرمانی حەکیمە کۆڵە داناوە و خۆی بە شاگردی ڕێباز و ڕەچەتەکانی باوکی دەزانێت. لەم سەردانەدا کاك موحەمەد زەنگیاوێ مامۆستای خانەنشین و تەمەن ٦٠ ساڵە ئەویش گەلێك زانیاری لەسەر حەکیمە کۆڵە بۆمان باس کرد. کاك موحەمەد خەڵکی زەنگیاوێیە و نزیکایەتی هەبووە لەگەڵ حەکیم، بەتایبەت ئەو کاتەی حەکیم لە ئاوایی کولیچ بووە و ڕۆژنامەکانی ئەو سەردەمە بابەتیان لەسەر حەکیم نووسیوە. زیاتر لەمانە لە ناوچەی پیرانشار و شنۆ و نەغەدە لای هەر کەس باسی حەکیمە کۆڵە بکرێت، دەیناسن و یادەوەری دەرمان و چارەسەری ئەم پیاوە لایان هەیە. بەواتایەکی تر پیاوێکی ناسراوی ئەم ناوچەیە ئەژمار دەکرێت.

**ژیان و بەسەرهاتە پزیشکیەکانی حەکیمە کۆڵە**

حەکیمە کۆڵە لە بنەڕەتدا خەڵکی گوندی غەوساباتی لای بۆکانە. ناوی حامید و شۆرەتی چووپانی و دایکی لە مەسیحیەکانی لای شەقلاوا بووە. دەوروبەری ساڵەکانی ١٢٨٠ هەتاوی لە بنەماڵەیەکی وەرزێر و ئاژەڵدار هاتووەتە دنیا. گوایە لە سەردەمی مێرمنداڵی و گەنجی شوانێکی چالاك بووە و هەر بۆیە دواتر شۆرەتی خۆی بە چووپانی داناوە. ئەو سەردەمە موکریان هێزی ڕووسی تێدا بووە و کۆمەڵگای شار و گوندی کوردەواری بە بەرنامە و هەزر و ئامانجی ڕووسەکانیان زانیوە، بەڵام هەندێك لە پیاوانی ناوچەکە زۆرتر دوای ئەو هێزانە کەوتوون و لێیان نزیك بوونەتەوە. گوایە حامید هەر لە غەوسابات تامەزرۆ دەبێت کە هەڵسوکەوت و هەزر و بەرنامەی ڕووسەکان فێر بێت. هەر بۆیە تێکەڵاویان دەبێت و ساڵانێك دەڕواتە ڕووسیە و تەنانەت لەوێ هاوسەرگیری دەکات و دوو کوڕیشی لە ژنە ڕووسیەکەی دەبێت.[٣] دەوروبەری

١. ئاواییەکە لە دەشتی لاجان کە کۆمەڵێك بەردی قنج و پان و شێوەی ڕەنگاوڕەنگ و جۆراوجۆر هەیە کە بە بەردە سێحراویەکان دەناسرێن و هەر لە کۆنەوە شوێنی هێلانەی حاجی لەقلەق بووە.

٢. ئەمجارە لەگەڵ کاك کەماڵ ڕەحمانی خەڵکی زەنگیاوێ سەردانمان کرد. زەنگیاوێ ئاواییەکە هاوسێی گردەکشانێیە. لەم سەفەرە گەلێك زانیاری لەم پیاوە و دایکی بەڕێزیان لەسەر حەکیمە کۆڵە بە دەست هێنا.

٣. حەکیم پاش هاتنەوەی لە ڕووسیە ئیدی هیچ پێوەندی نامێنێت بە بنەماڵەکەیەوە لەوێ. گوایە هەندێ جار بەتایبەت جەژنانە حەکیم فرمێسك ئەکەوتە ناوچاوانی و بیر ئەیبردەوە و چەند وشە یا ڕستەیەکی ڕووسی بە

ساڵەکانی ١٣٢٠ دەگەڕێتەوە بۆ موکریان و بنەماڵەکەی لە ڕووسیە بە جێ دەهێڵێت. ماوەیەك لای پزیشکێکی جوولەکە لە مەهاباد کار دەکات و دوایی بەرەو ناوچەی لاجان کۆچ دەکات و لە ئاوایی کولیچ دەگیرسێتەوە. سەرەتای ساڵەکانی ١٣٣٠ دیسانەوە هاوسەرگیری دەکات و دەست بە کار و ژیانی ئاژەڵداری و کشتوکاڵ دەکات لە کولیچ و سەرەتای ساڵەکانی ١٣٥٠ بەرەو گردەکشانێ کۆچ دەکات. گوایە هەر لەو سەردەمەوە کە لە غەوسابات شوان بووە و دواتریش لە کولیچ و گردەکشانێ ئاژەڵداری کردووە گەلێك شارەزایی بووە لەسەر شکستەبەندی و چارەسەری ئاژەڵ.

حەکیم گەلێك جار لەگەڵ پیاوانی ڕووسی نیشتەجێی موکریان و ورمێ چووەتە کوێستان و دەشتەکان و گوایە شتیان لێ فێر بووە و لە ژیانی خۆی و خەڵکیدا بەکاری هێناوە. خەڵکی ناوچەکە دەگێڕنەوە کە حەکیم ئەو پسپۆڕی و لێزانیەی لەسەر پزیشکی کە بە دەست هێناوە بەشێکی بەهۆی تێکەڵاوی لەگەڵ ڕووسەکان بووە. چونکا ڕووسەکان کاتێ چوونەتە کێو و دەشتەکان ماویان گرتووە و وەك ماسی برژاندوویانە و خواردوویانە. هەر بۆیە ڕووسەکان ماریان بە حەکیم داوە و ئەویش فێری ئەم پسپۆڕییە بووە.[1] دەگێڕنەوە کە حەکیم ساڵانە چەندین جار چووەتە کوێستانەکان و ئاگەداری تەواوی بووە لە گژوگیای هەموو ناوچەکانی دەوروبەری. یەکێك لە تایبەتمەندیەکانی حەکیم ئەوە بووە کە بەشێك لە پێکهاتەی ڕەچەتەکانی هاڕاوە یا ئاوتکی ڕەگی گیاکان بووە.

حەکیم کاتێك لە کولیچ بووە بەرەبەرە دەنگ و باسی دەرمان و چارەسەریەکانی بڵاو بووەتەوە بە شار و گوندەکانی دەوروبەریدا. سەرەتای ساڵەکانی ١٣٥٠ گەرمەی کاری بووە لەم بوارەدا. گوایە ڕۆژانە خەڵکێکی زۆر سەردانی حەکیمیان کردووە و تەنانەت شەوانە

---

زاردا دەهات و بیری دەچووەوە بۆ لای ژن و منداڵەکانی لە ڕووسیە. بنەماڵەکەی باس لەوە دەکەن کە باسی بنەماڵەکەی و بیرەوەریەکانی لە ڕووسیە تا کۆتایی ژیانی وەك ڕازێك لە دڵی خۆیدا قەتیسی کرد و بۆ کەسی باس نەکرد.

١. ئەم بۆچوونە باوەڕی چینی ڕەشۆکی و ئاسایی کۆمەڵگای ئەوسای کوردەواری بووە و هیچ بنەمایەکی زانستی نییە. ساڵی ١٣٩٤ سەردانی کاك سەلام ڕەفاعی ـم کرد لە ئاوایی سەبەتلووی بانە. بنەماڵەی ڕەفاعی هەر لە کۆنەوە بە پزیشك و حەکیم ناسراون لە کوردستان. لەسەر ئەمە کە یەکەم جار باپیرانی ئەم بنەماڵەیە چۆن ئاشنا بوونە بە باسی پزیشکی، پرسیارم کرد. وڵامەکە ئەوە بوو کە لای خەڵکی ئاسایی باپیرانی ئێمە ماریان خواردووە کە فێری ئەم پیشەیە بوون، بەڵام ڕاستیەکەی ئەوەیە باپیرە گەورەی ئێمە ڕێڕەوی ڕێبازی کاك ئەحمەدی شێخ بووە لە سلێمانی و لە کتێبخانەی کاك ئەحمەد کتێب و زانیاری پزیشکی لێ بووە و خوێندوویەتیەوە و دواتر شێخ ئیجازەی چارەسەری و دەرمانگەری پێ داوە.

لەوێ ماونەتەوە تا نۆرەیان هاتووە. ئەوکاتە حکوومەت لە ناوچەکە چەند جار حەکیم دەکێشن بۆ ورمێ و پیرانشار و ئاگەداری دەکەنەوە کە دەست لەم کارەی هەڵبگرێت و دژایەتی دەکەن، بەڵام حەکیم هەر جارەو لەسەر کاری خۆی زیاتر سوور بووە. دواتر پێشنیاری پێ دەکەن کە بە هەماهەنگی ئەوان بجووڵێتەوە. کاك موحەمەد زەنگیاوەیی کە ئەوکاتە لە خوێندن بووە، دەڵێت کە جارێك بە ناو خەڵکدا بڵاو بووەوە کە ڕۆژنامە[1] لەسەر حەکیمە کۆڵە بابەتێکی نووسیوە. گوایە بابەتەکە لە ژێر ناونیشانی (دکتر علفی) بووە.

**نازناوەکانی حەکیم**

ئەم پیاوە زۆرتر بە سۆفیە کۆڵە ناسراوە و هەندێ جار سۆفی حەکیمە کۆڵە و هەروەها حەکیمە کۆڵە[2]. دەگێڕنەوە جارێك چووەتە کوێستان بۆ کۆکردنەوەی گژوگیا. مار بە قامکیەوە داوە و لەوێ ناچار بووە قامکی ببڕێتەوە. سەبارەت بە نازناوی حەکیم دوو بۆچوون هەیە: یەکەم ئەوەیکە ئەم پیاوە لەگەڵ شێخ عوسمانی دوورۆ پێوەندی هەبووە و شێخی خۆش ویستووە و خەڵك بە سۆفی شێخ عوسمانیان زانیوە. ئەگەرچی بیر و بۆچوونەکانی دیکەی حەکیم کە دواتر باسی دەکەین بەڕاشکاوی دژی ڕێبازی سۆفیگەری بووە. دووهەم ئەوەیکە هەندێ هەڵسوکەوت و شێوەی ڕواڵەتی و کەسایەتی حەکیم وەك سۆفی بووە و هەر بۆیە بە سۆفیە کۆڵە ناسراوە.

**پێوەندی حەکیم بە بزووتنەوەی کەڵبەش**

حەکیمە کۆڵە جیا لە پیشەی پزیشکی و کشتوکاڵ و ئاژەڵداری، لە جووڵانەوەی کۆمەڵایەتی مەلا ڕەسووڵی ئەدیب کە بە کەڵبەشان ناسراوە، بەشدار بووە. حەکیم یەکێك لە دامەزرێنەران و ڕێڕەوانی سەرەکی و سەرەتایی ئەو بزووتنەوە بووە لە ناوچەی موکریان. دامەزرێنەری ئەم جووڵانەوەیە مەلا ڕەسووڵ ئەدیب کوڕی مەلا سادق کوڕی خەلیفە عەبدوڕەحمان زەندی سەر بە خێڵی زەندییەکانی[3] گوندی شاولێ لاجان بووە و ساڵی ١٢٩١ هەتاوی بە دنیا هاتووە. لە حوجرەکانی کوردستان خوێندوویە و شارەزای باشی هەبووە لە زمانەکانی کوردی، فارسی، عەرەبی و ڕووسی. ئەم پیاوە دژایەتی کردووە لەگەڵ زۆربەی

١. کاك موحەمەد دەگێڕێتەوە کە بۆخۆی ئەم بابەتەی خوێندووەتەوە. بەداخەوە زۆر دڵنیا نەبوو کە ناوی ڕۆژنامەکە چی بووە. ئەڵبەت گومانی لەوە بوو کە ڕۆژنامەی اطلاعات بووە.

٢. کۆڵ لە کوردیدا واتا کەسێك کە قامك و پەنجەی نەبێت یا خوار و خێچ بێت.

٣. خێڵی زەندی لە موکریان بنەڕەتی خۆیان بۆ کەریم خانی زەند دەگەڕێننەوە.

نەریتە باوەکانی کۆمەڵگای کوردەواری کە پێوەندیان بە خورافات و زڵمی دەرەبەگەوە بـووە. بەواتایەك دژایەتی خوێندنەوەی کۆنی ئـایینی کـردووە و بۆخـۆی خوێنـدنەوەیەکی تـازەی لەسەر ئایینی ئیسلام هەبووە. هەر بۆیە لای زۆرینەی کۆمەڵگا بە مۆرتەد و دەرکراو لەدیـن ناسـراوە. بەشـێکی زۆر لە خوێنـدنەوە و بۆچوونەکـانی ئەم پیـاوە و پێڕەوانـی لەو کـاتەدا هاوشـێوەی بیـر و بۆچـوونی چینـی ڕۆشـنبیرانی ئێسـتەی کۆمەڵگـا بـووە. مەلا ڕەسـووڵ وەستایەکی لێهاتوو بووە لە بوارەکانی وانەگوتنەوە، دارتاشی، پزیشکی، خۆشنووسـی و ئـاش وەستایی.[1]

ئەم بزووتنەوەیە جۆرێك ڕیفۆرم و ڕوانینی تازەی مەلا ڕەسووڵ بووە بەرامبەر بە ئایین و هەروەها جۆرێك هەڵوێست گرتن بووە بەرانبەر زڵمی ئاغاکـان. پـاش مردنـی مەلا ڕەسـووڵ بزووتنەوەکە وەك دیارە کـاریگەری زۆری گرتـووە لە ڕێبـاز و بەرنامەکـانی بـاوی کۆمەڵگـا وەکوو فکری چەپ و بەهایی و مارکسیسـم. دەگێـڕنەوە کە حەکـیمە کـوڵە بڕێـك جـار بە شۆخیەوە سوێندی بە لنین خواردووە. ئەگەرچی حەکیم بۆخۆی نوێژی کردووە و باوڕی بە ئیسلامیش بووە، بەڵام هاوشێوەی مەلا ڕەسووڵ خوێنـدنەوەیەکی دیـکەی لەسـەر ئیسـلام بووە و زۆر شانی شل نەکردووە بۆ هەموو ئەحکامە باوەکانی ئیسلام. دەگێـڕنەوە حەکـیم لە گردەکشانێ گەلێك جار لەگەڵ مامۆستا و فەقێیەکان لەسەر ئـایین و بۆچـوونە فێقهییەکـان قسەی کردووە و باسەکەی بە سوودی خۆی تەواو کردووە.

**سەرچاوەکان:**


- گیوی موکریانی، فەرهەنگی گیو، چاپی یەکەم، پەخشانگای ئـاراس، هەولێـر، ١٩٩٩: ص ٧٥٢
- مامۆستا هەژار، چێشتی مجێور، چـاپی دووهەم، پەخشـانگای کتێبـی مێهرگـان، سـنە، ٢٠٠٧: ص ٤٦٥
- مەلا ڕەسـووڵ ئەدیـب، دیـوانی ئەدیـب، کـۆکردنەوە: گیـوی موکریـانی، چـاپی یەکەم، هەولێر، ١٩٦٠


١. لە ڕۆژنامەی ڕۆژان، ڕێکەوتی ١٣٩٧/٠٩/٢٤ وتارێکم لە ژێر ناوی "سەرەتایەك لە ڕۆشنبیری ئایینی لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان: توێژینەوە لەسەر مەلا ڕەسووڵی ئەدیب" چاپ کردووە. هەروەها سەرجەم شێعرەکانی مەلا ڕەسووڵی ئەدیب و باسی بزووتنەوی کەڵبەشان، ئامادەی چاپ کردووە.

## ودمی بڕینی بای سوور له بنەماڵەی عەبە مەلای شوێ[1]

پێش ئەوەی باسی بای سوور بکەین پێویستە ئاوڕێك لە پەیام و پەندی وشەی "ودم" بدەینەوە. لە کوردەواری ودم وەك بەهرە و میراتێك لە هەندێ بنەماڵەدا باوە و پشتاوپشت دەگوازرێتەوە. لە ناو قسەی خەڵکدا ئەو دەستەواژانە بۆ ودم بەکار دێت: *'فڵانی ودمی پێیە، ئیجازەی ودمی هەیە، دەم و ودمێ پاکی هەیە، قسەی زۆر بە ودمە، باوکی ودمی پێ داوە و ئەویش باو/ ترس/ بای سوور دەبڕێت، ...'*. شاعیرانی کوردیش ودم وەك هەناسە و هەوایەکی مەسیحایی و شەفابەخش بەکاریان هێناوە:

*"...لە هەر گاز و ڕێبازێ وا گازی ئاوی ئەگاتێ*
*نیازی هەزاران گەزیزەی بەنازی وەدی دێ*
*ئەبووژێتەوە داری چاکی بە ودمی هەناسەی*
*شنەی نەرمە لاوێنی دەم بای ئەخاتێ."*[2]

*"ئەگەر ودمی هەناسەی تۆ نەبایە*
*ئەمن چی بووم، مەگەر هەر خوا بزانێ.* [ئامانج لە پێغەمبەرە]"[3]

مامۆستا هەژار لە وەرگێڕانی قورئانی پیرۆزدا بۆ ئیزن و ڕێگەپێدان، وشەی ودمی بەکار

---

١. لە کتێبی شەرەفنامە لە بەشی میرانی بانە ناوی شوێ بە "شیو" هاتووە. سەرچاوە ئیداریەکانی ئێران بە "شوی" دەینووسن، بەڵام لە بێژەی سەرزاری خەڵك "شوێ" دەبیسترێت. ئەوەیکە شوێ مانای چییە پێویستە توێژینەوەی زیاتر بکرێت. هەندێ دەڵێن ڕیشەی شوێ لە "شۆ و شێ: بە واتای تەڕایی" و "شووبا: بە واتای شنەبا" هاتووە. شوێنێکی کۆن لە بەر ئاوایی شوێ هەیە بە ناوی "زیارەتانی سوێ سوێ". وێدەچێت کە ئەم سوێ سوێیە پێوەندی بە شوێ بێت. جا لەوانەیە سوێ گۆڕابێت بە شوێ.

٢. هۆنراوەی سوارە ئیلخانیزادە، خەوەبەردینە

٣. هۆنراوەی کاك ئەحمەد موفتیزادە

هێناوە: *ڕۆژێکی کە جوبرائیل و فرشتەکان هەمـوو بە ڕیـز ڕاوەسـتاون؛ نائاخێون مەگـین کەسێ لەوڕا ودمی پێ درابێ، ئەویش قسەیکی چاك بکا.*[1]

کەواتە ودم بە ڕۆحێکـی شـەفابەخش و ڕۆحـبەخش ئەژمـار دەکرێـت کە هەنـدێك لە ئینسانەکان بەهۆی تایبەتمەندی مەعنەوی و پارێزکـاری و ئـایینپەروەریـیەوە بـە ئاسـتێك دەگەن کە بتـوانن ورە و وزەیەك بگەیـنن بە مرۆڤەکـانی دیـکە، بەتـایبەت نەخـۆش و دەردەدارەکـان تـا چـاك ببـنەوە. ئەوەی دیـارە ئەو بنەمـاڵانە کە ودمـی چـاككـردنەوە و چارەسەری نەخۆشیەکیان پێیە، پشتاوپشت بەپێـی ڕاسـپاردنی بـاوك یـا دایکـانە کە فـلانە منداڵەمان شایستەی ئەوەیە ئەو ودمەی پێ بێت و پاش مردنی ئەوان خەڵك سـەردانی ئەو کەسـە بکـات. لە کـوردەواری ودم بە دوو شـێوە بەکـار دەچێـت: یەکەم تەنیـا بە دۆعـا و ئامۆژگـارییە نەخۆشـەکەیە، دووهەم دۆعـا دەخوێنرێـت بە دەرمـان و نەخـۆش بەکـاری دەهێنێت. بەگشتی لە بەشی پزیشکی پێشێنیانی کوردەواری ئەو کەسانەی کە بەهرەیەکـی پزیشکیان لە باپیران و باوانیانەوە پێ گەیشتووە و دەیگوازنەوە بۆ نەوەکانی داهاتوو، ئەوە بە ودم دەناسرێت. واتا ودم جۆرێك ڕێگەپێـدانە حەکیمـان و دەرمـانگەرانی کـۆن دایاننـاوە کە کەسـانی دوای خۆیـان کە شـاگردیان کـردووە و بە ئاسـتی شایسـتەی چارەسـەر کـردن گەیشتوون، ئەوانە مۆڵەتی دەرمان پێدان و چارەسەر کردنی نەخۆشیان پێ بێـت. دەکرێـت بەوێنەی جۆرێك بڕوانامە و مۆڵەتی کارکردن سەیری بکەین.

چەندین نەخۆشی و دەرد و ئازار هەیە کە ودمی کەسە تایبەتەکـان چاکیـان دەکەنەوە: ترس و یاو[2] برین بۆ منداڵ، بالووکە برین، بای سوور، بیرۆ هەڵوەرین، ناوك گرتنەوە، بەبـۆن کەوتن، گیراوی بەردان و ...

## بنەماڵەی عەبە مەلا

دەگێڕنەوە کە کاتی خۆی بانە دوو قەلای دەسەلاتداری بـووە: قەلای بەرۆژە لە شـوێنی ئێستە ناوشاری بانە و قەلای شـوێ. لەکـۆنەوە دەسـەلاتی ئەم قەلایـانە بە دەسـت هـۆزی "قەقۆن"ـەوە بووە.[3] بەشێك لە قەقۆنەکان ئاشتیانە ئیسلامیان قەبووڵ کردووە و هەر بۆیە لە سەرەتای هاتنی ئیسلام بۆ کوردسـتان قەبـاڵە و فەرمـانی حوکمڕانیـان لەلایەن ئیسـلامەوە

---

١. يَوْمَ يَقُومُ الرُّوحُ وَالْمَلَائِكَةُ صَفًّا لَا يَتَكَلَّمُونَ إِلَّا مَنْ أَذِنَ لَهُ الرَّحْمَنُ وَقَالَ صَوَابًا: ٣٨/ نباء

٢. تا، تەو بە فارسی "تب". وەك دەڵێن: یاو نیشانەی نەخۆشییە

٣. ئێستاکە لە ناو خەڵکدا قەلای ئاوایی سیاوەمە بە قەلای قەقۆن دەناسرێتەوە.

وەرگرتووە. ئەمانە دواتر ناوی خۆیان کرد بە "اختیارالدینی" داناوە، واتا بە ئیختیاری خۆیان دینیان وەرگرتووە. هەر لەو کاتەوە تا کۆتاییەکانی سەدەی ١٢ کۆچی دەسەڵاتی بانە بە دەست ئەمانەوە بووە. ساڵەکانی سەدەی ١٠ دەسەڵاتی قەڵای بانە بە دەست سلێمان بەگەوە بووە. بەپێی گێڕانەوەکان ئەوکاتە دەسەڵاتی قەڵای شوێ بە دەست باواگەورەکانی بنەماڵەی عەبە مەلای شوێیەوە بووە. گوایە دەسەڵاتی قەڵای شوێ بە میرخزر یا باوکی بووە و میری ئەو ناوچەیە ئەژمێردراوە. لە ڕووداوێکدا میرخزر لە دەشتی شوێ کوژراوە.[1] پاش میر خزر لەو بنەماڵەیە پیشەی مەلایەتی جێی حوکمڕانی دەگرێتەوە، بەڵام هەمیشە بەشێك لە زەوی و زاری شوێ هەر بەو بنەماڵەیە بووە و ئەوان بەرەچە و باجیان وەرگرتووە.

پیرانی ئەم بنەماڵەیە باس لەوە دەکەن کە بنەچەیان هەر شوێی بووە و بە خێڵ "مەلایان یا میرخزر" ناسراون.[2] کاتی خۆی مەلا شەریف باوکی عەبە مەلا چووەتە ناوچەی شارباژێر و ماوەیەك لە ماوەت مەلایەتی کردووە و هەر لەوێش کۆچی دوایی کردووە. پیاوێکی زانا، خۆشنووس و کەسایەتیەکی پارێزکار بووە. لای خەڵکی خۆشەویست و بەڕێز بووە. هەر بۆیە پاش مردنی خەڵکی ماوەت وارش و پاردە بۆ گڵکۆی مەلا شەریف هەڵدەبەستن. هەندێك باوڕیان وابووە کە ئەگەر کەسێك ناوسکئێشە بگرێت و بچێتە سەر گڵکۆی مەلا شەریف و کێلی گڵکۆی لە باوش بگرێت، پێی چاك دەبێتەوە. باوك و باپیرانی مەلا شەریف تا دەگەنە مەلا سلێمان گوایە ودمی بڕینی بای سووریان پێ بووە و لەوانەوە گەیشتووە بە کوڕەکانی عەبە مەلا. پاش ئەوەی مەلا شەریف کۆچی دوایی دەکات

---

١. دوو بۆچوون هەیە سەبارەت بە گڵکۆی میرخزر: یەکەم، میرخزر لەلایەن هێزی هێرشکارەوە بەشێوەیەکی زۆر دڕندانە کوژراوە و لاشەکەی پارچە پارچە کراوە و دوایی لە ناو کەڵەکەکانی دەشتی شوێ شاردراوەتەوە. دووهەم ئەوەیکە پاش ئەوەی میرخزر دەکوژرێت لاشەکەی دەگوازرێتەوە بۆ زیارەتانی نەمەشیر و لەوێ دەنێژرێت. ئێستاکەش لە گۆڕستانی نەمەشیر شەخسێك هەیە بە میرخزر دەناسرێ. لە لاپەڕە ٨٩ کتێبی "تاریخ و جغرافیا بانە" موحەمەد ڕەئووف تەوەکولی ئاماژە بە کێلە نووسراوێك دەکات لە ئاوایی نەمەشیر کە هی میر خزر ناوێك بووە: هذا قبر المرحوم المغفور خضر بن موسی بن میرزا محمد افضل سنه ١٠٢٩ هجری.

٢. شوێ لەکۆنەوە سێ بەرە بنەماڵەی ڕەسەنی تێدا بووە: مەلایان، وەستایان و شێخان. خێڵ وەستایان کە پیشەیان ئاسنگەری بووە. زەوی و زاری شوێ پێنج دانگی "املاك خاصە" بووە. واتا مڵکی حکوومەت بووە و ساڵانە موباشێر و زابت لەلایەن دەوڵەتەوە ئەنێردرا و باجەکەی کۆ دەکرایەوە. ئەوی دیکەی دانگێ یا زیاتری بە بنەماڵەی مەلایان بووە. جا هەر بۆیە کە شوێ ئاغای نەبووە هەمیشە ڕەعیەتی دەرکراو لەم لا و ئەو لا هاتوونەتە شوێ. ئاغاواتی دەوروبەریش تانەیان لە شوێ داوە و گوتوویانە بووە بە "حیزاوا و خوێڕیاوا". واتا هەڕەمە هەموو کەس ڕووی تێ دەکا.

منداڵەکانی دەگەڕێنەوە بۆ شوێ.[١] چونکا ڕەچەڵەکی ئەو بنەماڵەیە تا چەند پشت بە مەلا هاتووە: عەبدوڵا کوڕی مەلا شەریف کوڕی فەقێ قادر کوڕی فەقێ شەریف کوڕی مەلا ئێسماعیل کوڕی مەلا موحەمەد کوڕی مەلا عومەر کوڕی مەلا عوسمان کوڕی مەلا سلێمان کوڕی میرخزر.[٢]

عەبدوڵا کە بە عەبە مەلا ناسراو بووە ساڵی ١٣٣٩ هەتاوی لە تەمەنی ٩٠ ساڵیدا کۆچی دوایی کردووە. کەسێکی قورئان خوێن و بانگبێژ و سەڵاخوانی ناودێ شوێ بووە. ڕەمەزانانە سەڵای کردووە و پاشان بە ناودێدا گەڕاوە و خەڵکی بۆ پارشێو خەبەر کردووەتەوە. بەهۆی شێخ مەلا عەلی شوێ[٣] کە خەلیفەی شێخ حسامەدین بووە و خاڵی عەبە مەلا بووە، ئەویش ئاشنایەتی گرتووە بە تەریقەتی نەقشبەندی و خۆشی هاتووە لەو ڕێبازە. کاك عەبدوڵا بەهرەی برینی نەخۆشی بای سووری لە باب و باپیرانیەوە پێ گەیشتبوو. پاش مردنی ودمی ئەو بەهرەیە بە کوڕەکانی بەتایبەت مەلا مەحموود، مەلا موحەمەد و حاجی شەریف بڕاوە و تا ئێستەش بەردەوامە.

## بای سوور

ئەوەی خەڵکی خۆمان باس لە نیشانەکانی بای سوور دەکەن، ئەمانەیە: *بای سوور بەزۆری*

١. لە لاپەڕە ٧٠ کتێبی (نامداران علم، فرهنگ و هنر کردستان در دو سده اخیر: عبدالحمید حیرت سجادی، ١٣٩٢) هاتووە: مەلا عبدالرحیم کوڕی مەلا عبدالرحمن کوڕی مەلا حەیدەر کوڕی مەلا سلێمان کوڕی مەلا ئەحمەد خەڵکی شوێ بووە و ساڵی ١٢٠٩ کۆچی لەدایك بووە. کەسێکی زانا بووە و کاتی خۆی بە نووسینی کتێب و خۆشنووسی بەسەر بردووە. [کەواتە شوێ دوو بنەماڵە مەلای تێدا بووە].

٢. ئەم ڕەچەڵەکە لە ئەنجامەی کتێبی (مختصر فی فقه الخلاف شافعی و حنفی) کە مەلا شەریف ساڵی ١٣٠٦ کۆچی نووسیویەتیەوە و کتێبەکە ئێستە لە کتێبخانەی مەلا مەحموود کوڕەزای ئەم مەلا شەریفە لە ڕەبەت پارێزراوە. پیرانی ئەم بنەماڵەیە باس لەوە دەکەن کە لە نێوان مەلا سلێمان و میرخزر چەند پشتی دیکە هەیە کە بەداخەوە تۆمار نەکراون و ئێمە نازانین کە ناویان چی بووە.

٣. کەسێك بووە چووەتە لای ڕەزاخان و قەواڵەی دانگی شوێ لە حکوومەتی ڕەزاخان وەرگرتووە. کاتی خۆی لە سەردەمی حەمە ڕەزا شا کە بوودجە هاتووە بۆ دروستکردنی ڕێگای بانە سەردەشت، ئۆستوار ساڵحی کوڕی مەلا عەلی بەرپرس و پەیمانکاری ئەو ڕێگەیە بووە کە خەڵك بە پاچ و پێمەڕە کێشاویانە. لە لاپەڕە ٤٢٨ کتێبی جغرافیا و تاریخ بانه (موحەمەد تەوەکولی)، ڕێکەوتی ١٣٠٨/٠٦/٠٥ لە نامەیەکی ئیدارەی حکوومەتی کوردستان باسی شێخ مەلا عەلی شوێ هاتووە و بە "مجتهد بانه" ناوی هێناوە. لەو نامەیە وا نووسراوە کە مەلا عەلی گوتویە لەبەرکردنی "لباس متحد الشکل" زەرەری بۆ ئیسلام نییە.

*له دەموچاو و پشت و ناوگەڵ دەر ئەکەوێت. پێستی ئەو شوێنە سوور هەڵدەگەڕێت و زیچکە زیچکە دەبێت و هەندێ جار زیچکەکان تۆقلە دەکەن وەك نەخۆشی زۆنا.* مەلا موحەممەد ئەرواسی لە لاپەڕە ٢٣ کتێبە پزیشکیەکەیدا سەبارەت بە چارەسەری بای سوور دەنووسێت: *"ئەگەر بایێ سۆر ل جانێ یەکی بکەڤت، قۆلالەیێ بقوتن، ب ناڤ ئاڤێ بخن، پاك هەل بکن، ئاڤا وی ل سەر وی جهی بدن، پاك دبت".*[1] فەرهەنگی دێهخودا بۆ وشەی "باد سرخ" نووسیویە: *نەخۆشیەکی ناسراوە. و ناوەکانی دیکەی دەبێتە: باد مبارك، بادژنام، بادژوام، بادشوام، بادژکام، بادژنام، حمرة مبارکە.* زانستی پزیشکی ئەورۆ دەڵێت: بای سوور نەخۆشیەکە لەسەر پێست ئاشکرا ئەبێت. هۆکاری ئەم نەخۆشییە دزە کردنی باکتری (*Streptococcus pyogenes*)ـیە بۆ بەشی ژێر پێست. چالاکی و گەشەی ئەم باکتریە دەبێتە هۆی سووربوونەوە و زیچکە کردنی پێست، هەروەها شوێنی سوور هەڵگەڕانەکە هەندێك گەرم دادەگەڕێت و نەخۆش لەوانەیە تووشی تا و نیشانەکانی دیکەی نەخۆشی ببێت. بای سوور لەناکاو سەر هەڵدەدات و سەرەتا نەخۆش هەست بە سووتانەوە و خورووی پێست دەکات. پاشان سوور دەبێتەوە و گەم دادەگەڕێت و ئازاری ئەو شوێنە دەست پێ دەکات. ئەگەر زۆری پێ بچێت و زوو چارەسەر نەکرێت نەخۆش تووشی قورگ ئێشە، گەورە و سووربوونەوەی لەوزەکان، ژانەسەر، ڕشانەوە، چڵك و تۆقلە کردنی پێستی شوێنی نەخۆشیەکە دەبێت. ئەم نەخۆشییە زۆرتر لە منداڵ و پیرەکان ڕوو ئەدات و بەزۆری لە پێستی دەموچاو و هەندێ جار لە سەر و دەست و سینگ و قاچەکانیش دەر ئەکەوێت.[2]

## چارەسەری بای سوور

ئەوەیکە پشتاوپشت لە باپیرانیەوە گەیوەتە عەبە مەلا و ئەویش پاش خۆی ڕایسپاردووە بە منداڵەکانی، شێوازی چاکردنەوەکە بەم جۆرەیە:

نەخۆش سەردانی کردووە و ئەوانیش هەندێ هەنگوین، هاڕاوەی ئەسپۆن و ئاویان تێکەڵ کردووە. ئینجا چلێ داری سەندەلیان[3] هەڵسووە بە بەردێك و هەندێك لە توێکڵ و

---

١. شێخ موحەممەد ئەرواسی وانی (مردن: ١٧٨٨ زایینی)، تببا ئەرواسی (بەشی کوردیەکەی)، ئامادە و چاپ کردن: دکتۆر قەدری یەڵدرم، زانکۆی ماردین، ٢٠١٣

٢. بابەتی "بیماری باد سرخ چیست؟"، وەرگیراو لە ماڵپەڕی (www.asanteb.com)

٣. سەندەل (*Santalum paniculatum*) دارێکە بەقەی داری گوێز دەبێت و لە وڵاتی هیندوستان، نیپاڵ و ئۆسترالیا دەڕوێت. دارێکی بۆنخۆشە. لاسك و چڵەکانی بۆ دەرمان دەبێت کە سێ ڕەنگی سوور، سپی و زەردی هەیە.

چێوی دارەکەیان لێ کردووەتەوە و تێکەڵی هەنگوین و ئەسپۆنەکەیان کردووە. هەندێ جار لەبری ئاوەکە، تفی زاریان تێ کردووە. چونکە باوڕیان وابووە بۆ پیرۆزی دەرمانەکە، ئەو کەسە کە ودمی بڕینی بای سووری پێیە تفەکەی دەبێت هۆی شەفابەخشی زیاتری نەخۆشیەکە. ئەڵبەت چەند ئایەت و سوورەی بچووکی قورئانیان بە دەرمانەکەشدا خوێندووە. جا نەخۆش دەرمانەکەی بردووەتەوە و بەیانیان و ئێواران لە شوێنی سووربوونەوەی پێستی داوە و پێی چاك بووەتەوە.

## وتووێژە کردن لەگەڵ:

- حاجی شەریف شەریفی (لەدایکبووی ١٣١٣ هەتاوی) کوڕی عەبە مەلا، دانشتووی شاری بانە
- حاجی مستەفا شەریفی (لەدایکبووی ١٣٣٢ هەتاوی)، دانشتووی شاری بانە
- کچەکانی خوالێخۆشبوو مەلا مەحموود شەریفی (ئایشێ و حەلیمە)



**وێنەی ١: نیشانەی نەخۆشی بای سوور لە دەموچاو**

## چەند ئەزموونی پزیشکی لە بنەماڵەی سەیید موحەمەد حوسەینی سوێرۆ

مەیدانی یەکێکی تر لە توێژینەوەکان کەوتووەتە ئـاوایی سـوێرۆ. ئەم ئـاواییە لە نـاوچەی گەورکی سەردەشـت لەسـەر ڕێـگەی مەهابـاد هەڵکەوتـووە. زسـتانی سـاڵی ١٣٩١ لەلایەن ئیدارەی کشتوکاڵی سەردەشت چووینە ئەم ئاواییە و سەبارەت بە باخـداری لەگەڵ خەڵکـی سـوێرۆ دانشـتین و زانیـاری پێویسـتمان پێشـکەش کـردن. بـۆ نیـوەڕۆ میـوانی سـەیید موحەمەد، پیاوێکی سۆفی ڕواڵەتی ڕیـش‌سـپی و زانـا و قسـە خـۆش بـووین. ڕێکەوتێکـی چارەنووس‌ساز بوو. گەلێـك زانیـاری لەسـەر بنەمـاڵەی حوسـەینی لەم نـاوچەیە و پیشـەی مەلایەتی و حەکیمی خۆیان بۆ ئاشکرا کـردین. بەداخەوە پـاش ئەم سـەفەرە هەلـی دیـکە نەڕەخسا بە خزمەتی بگەمەوە و ئەزمـوونە پزیشـکی و باسـە مێژوویيەکـانی ئەو بنەمـاڵەیە تۆمار بکەم. ساڵی ١٣٩٣ هەتاوی سەیید موحەمەد لە تەمەنی ٧٦ ساڵیدا کۆچی دوایی کـرد و بووە داخێکی سەوز لەسەر دڵم. ڕێکەوتی ١٣٩٧/٠٣/١١ دیسانەوە بە خزمەت ئەو بنەمـاڵەیە گەیشتم و لە شاری ڕەبەت لەگەڵ خێزان و کوڕەکەی[1] وتوویژێکمان ڕێك خست.

سەیید موحەمەد کـوڕی مەحمـوود کـوڕی حوسـەین سـاڵی ١٣١٧ هەتـاوی لە ئـاوایی سیسێر لەدایك بووە. باوکی سەیید موحەمەد ناوی سەیید حوسەین بـووە و وەك لە پەراوێـز و ئەنجامەی دەستنووس و بەڵگەکانیدا دیارە بە (الحسینی، الواژی و الواژی البانی) ناسراوە.[2] واتا لە بنەڕەتدا خەڵکی ئاوایی واژەی بانەیە و هاتوونەتە ئەم ناوچەیە. گوایە بە مەلایەتـی لە سیسێر ماوەتەوە و دواتر بووەتە مامۆستایەکی ناسراوی موکریان و گەلێك زانـا و مامۆسـتای

---

١. کاك کامیل مامۆستای قوتابخانەیە و لیسانسی ڕەوان‌ناسی خوێندووە

٢. بەشێك لە دەستنووس و بەڵگە بەجێماوەکانی بنەماڵەی مەلا سەیید حوسەین ئێستە لە کتێبخانەی کاك کامیل کوڕی سەیید موحەمەد دەپارێزرێت لە شاری ڕەبەت. ئەم دەستنووسانە بریتین لە: بابەتی فیقهی، هۆنراوەی کوردی و فارسی، قەباڵەی زەوی، نامەگۆڕینەوە، شەجەرەنامە، بەڵگەی مارەبڕین و تەڵاق

بەناوبانگی ناوچەکە وەکوو مامۆستایان خدر عەباسی، ڕەحمان سیسێری، کەریم گۆڵەیی، شێخ عیزەدین و هتد لەسەر دەستی ئەم مەلا حوسەینە لە سیسێر ئیجازەی مەلایەتیان وەرگرتووە. سەیید موحەمەد منداڵ دەبێت کە باوکی کۆچی دوایی دەکات. لە قاراوای بانە دەست بە خوێندن دەکات و لای خاڵوانی (مەلا سەیید جەلال و مامۆستا شێخ عیزەدین) دەخوێنێت و ئیجازەی مەلایەتی وەردەگرێت. ماوەیەك لە سوێرێ مەلایەتی دەکات، بەڵام بۆخۆی دائەنیشێت و ڕوو ئەکاتە کاری کشتوکاڵی و تا کۆتایی ژیانی لەو ئاواییە دەمێنێتەوە.

وەك دەیگێڕنەوە پیشەی حەکیمی و دەرمانگەری لەو بنەماڵەیەدا هەر لە کۆنەوە باو بووە و بۆخۆیان ڕەچەتەیان بووە و داودەرمانیان داناوە بۆ خەڵك و لای خۆیان نووسیویانەتەوە، ئەم بنەماڵە خاوەنی کتێبی پزیشکی و دەرمانی فارسی و عەرەبی بوون. کاك کامیل کوڕی سەید موحەمەد ئەو شەوە کە لەماڵیان بووم و قسە و باسمان کرد باسی لە کەشکۆڵێکی باپیری کرد کە لای باوکی بووە و ساڵی ١٣٩٦ ئامۆزاکەی بە ئەمانەت وەریگرتووە. بڕیاری دا وەریبگرێتەوە و پیشانی بەندەی بدا کە کاری تایبەتی ناوەڕۆکی ئەو کەشکۆڵەش بکەین. ئەم کەشکۆڵە بابەتی هۆنراوە و ڕەچەتە و داودەرمانی باپیرانی تێدا بووە. بەداخەوە ئەمانەتیەکە وەك کورد دەڵێت ئێستە: *"کەوتووەتە گەنم گەنم"*. ئیدی بە نازانم و ونبوون و پێمداونەتەوە، کەشکۆڵەکە تاوەکوو ئێستە نادیارە و داخێکی دیکەی زیاد کرد.

خێزانی سەید موحەمەد ناوی سەیزادە عیسمەت شەریفی خەڵکی ئاوایی ماڵمالانی بانەیە و ئێستە تەمەنی ٥٥ ساڵە. ئەم شۆڕەژنە وەك خۆی باسی دەکات هەمیشە هۆگری هەبووە بە بواری گژوگیا و ساڵانە چووەتە کوێستانەکانی سیسێر و نستان و گیای خۆراکی و پزیشکی کۆ کردووەتەوە و بۆ فرۆش و بەکارهێنانی خۆیان سوودی لێ وەرگرتوون. سەیزادە عیسمەت دەرمانگەری لە هاوسەرەکەی فێر بووە و گوایە سەیید موحەمەدیش لە باوك و دایکی وەریگرتووە کە بنەماڵەیی لەم بوارەدا شارەزا بوون. هەروەها دەگێڕێتەوە کە جارێك لە زستانێکی سەختدا بۆشکەی نەوت تلۆر دەبێتەوە و سەیید موحەمەد وە بن بۆشکەکە دەکەوێت و تەواوی گۆشت و ئێسکی دەکوترێت و خوێنی تێ دەزێت و لە ناویشەوە خوێنی بەر دەبێت و ڕێڕەوی گورچیلە و مسووڵدانی دەگیرێت. سەیزادە هەویر خاوێکی زۆری بۆ دەشێلێت و تێوەی دەپێچێت و لە دەستەبەرەی دەخەن و ڕێ دەکەون بەرەو سەبەتڵووی بانە لای حەکیمی گەورە سەیید موحەمەد ڕەفاعی. وەك دەیگێڕێتەوە

حەکـیم بەم فریـاگوزاری و هەویـر خـاوە ئـافەرین بـارانی دەکـات و پێـی دەڵێـت ژیـانی هاوسەرەکەت پاراستووە. ئەگینا ئەم کوتران و خوێن‌تێزان و میزگیرانە مەرگـی پێـوە بـووە. حەکیم هەویرەکەی لێ دەکاتەوە و کەشێ چاك دەیشێلێت و بەدەنـی دەکێشـێت و ڕێکـی دەخاتەوە و هاڕاوەیەکی پێ ئەدات کە بیخوات. ئینجا لە گەڕانەوەدا میزەکەی بەر ئەبێـت و ڕزگاری دەبێت.

**لێرە وەستایی و ئەزمونی چارەسەری و دەرمانی ئەم ژن و مێردە باس دەکەین:**

سەیید موحەممەد حەکیم بۆ چارەسەری ئێش و ژانی نەخۆشانێك کە سەردانیان کـردووە چەندین ئەزموونی هەبووە. سپڵی ئەنجنیوە، حەمایلی بۆ ژنی دووگیان داناوە، و نووشـتووی نووسیوە بۆ بڕینی ترس و لەرز و فیلە کە خەڵك داوایان کردووە.

● **سپڵ ئەنجنین:** ئەو کەسانەی تووشی نەخۆشی سپڵ هاتوون. گوایە نیشـانەی نەخـۆش بەم شێوە بووە کە سکی ئاوی هێناوە و شلقەشلقی هاتووە و زیاد لە دۆخی ئاسـایی ورگـی نەخۆش گەورە بووە. خەڵکی ناوچەکە بۆ چارەسەری ئەم نەخۆشییە هـاتوونەتە لای سـەیید موحەممەد تا سپڵیان بۆ بئەنجنێت. شێوازی کـارەکە بەم شـێوە بـووە کە هاوشـێوەی نـاوك-گرتنەوە نەخۆش ڕاکشاوە و لاقی هەڵێناوە. کاك موحەممەد ڕوو بە قیبلە دانشتووە و دەسـتی بە خوێندنی قورئان کردووە و بە شانی خەنـجەر تـا نیـو کـاتژمێر کوتـاویەتیە لای ڕاسـتی کەلەکەی نەخۆشـەکە. خەنـجەرەکەی لە کـێلانەکەی دەرنەهێنـاوە و تەوژمـی کوتـانەکە مامناوەندی بووە. بە جۆرێك لە نێوان توند و هێواشدا بووە و هـیچ جـۆرە برینـداری و ئـازار پێگەیاندنی نەبووە. ئەم کارە ڕۆژێك جارێك و لە ماوەی چەند ڕۆژدا بووە.

● **حەمایڵ:** ئەو ژنانەی کە لە پێش هاتنی ئیدارەی تەندروسـتی بـۆ نـاوچەکە لە مـاڵەوە منداڵیان بووە هەنـدێ جـار ژنەکە لە مەرگ نزیـك دەبـووەوە و منـداڵە بە دژواری بە دنیـا دەهات. هەر بـۆیە خەڵکـی سـوێرێ و تەنـانەت ئاواییەکـانی دەوروبەر ڕوویـان لە سـەیید موحەممەد خستووە کە فریایان بکەوێت. ئەویش پەڕۆیەکی خاوێنی هێنـاوە و بڕێـك دۆعـا و نووشـتووی نووسـیوە و لەوێ خسـتووە و تەقەڵـی داوە. ئەم پەڕۆ نووشـتوویە بە حەمایـل ناسراوە. ژنی دووگیان لەسەر سکی داناوە و دڵی خۆی بەو نووشـتەیە دڵنیـا کـردووەتەوە و منداڵەکەی بە دنیا هێناوە.[1]

---

١. لە ناوچەی سەردەشت بۆ ئەو ژنانەی کە کاتی منداڵبوون کەوتوونەتە دۆخێکی دژوار و مەرگ لە پێش چاویان بووە، دوو ڕێکاری دیکەم بیستووە. یەکەم: لە هەر ئاواییەك پیاوێك کە بەتایبەت سەیید بووە و لای خەڵك بەوە ناسراوە کە زۆر داوێن‌پاك بووە و کورد گوتەنی: دۆخینی حەرامەی نەکردووەتەوە، دەسنیشان کراوە.

● **بیروو برین**: بیروو بریتیە لە نەخۆشی پێست. هەندێ جار ئەم بیرووە پێستی نەخۆش یەکسەر دائەوەشێنێ و دەقەڵشێت و خوێنیشی لێ دێت. گوایە سەیید موحەممەد حەکیم خەنەی هێناوە و ئاوی لە دەمی وەرداوە و گرتوویەتیەوە و هەندێکیش خۆڵەمێشی تەندووری تێ کردووە. نەخۆش ئەم گیراوەیە چەند جار بەکار هێناوە و چاك بووەتەوە.

سەیزادە شانبەشانی مێردەکەی لەم بوارە چالاك بووە و سەرەڕای یارمەتیدانی سەیید موحەممەد لە کاری چارەسەری نەخۆشان، بۆخۆیشی فێڵەی منداڵی بڕیوە و دەرمانی میز و مامیلەی گرتووەتەوە بۆ برینی سندان و لاڕەشەی پشت و لاقی گوێدرێژ و بارگینان.

● **فێڵە برین**: هەندێ جار منداڵی ساوە تووشی نەخۆشیەك دەبێت کە چاوی دەشلەقێت و بژۆڵکی تاق و جووت دەبێت، هەروەها تووشی سکچوون و ڕشانەوە و دۆخی شیرنەخواردن دەبێت. لە کوردەواریدا بەم حاڵەتە دەگوترێت: فێڵە. واتا منداڵ فێڵەی گرتووە یا دەڵێن فێڵەی منداڵی دیکەیان بە سەریدا بڕیوە. دایکان ئامۆژگاری دەکەن کە نابێ منداڵی ساوا بە کۆڵان و شەقامان زۆر بگێڕیت. چونکە ئەگەری ئەوە هەیە کەسانێك وا منداڵەکەیان فێڵەی هەیە فێڵەکەی ببڕنە سەر منداڵی ئێوەدا و ئەویش تووشی بێت. ویدەچێت هاوشێوەی بڵاوبوونەوەی میکرۆبی نەخۆشی بێت. سەیزادە بۆ بڕین و لابردنی ئەم فێڵە بە دایکی منداڵەکەی گوتووە کە دەبێ تا سێ ڕۆژ بەیانیان منداڵەکە بە نەخورێتی بهێنێت تا فێڵەکەی ببڕین. گوایە پیوازی دوولەت کردووە و وردە وردە بە ناوچاوانی و دەوری چاوی و هەموو دەموچاویدا هێناوە و دۆعای بە سەردا خوێندووە. بەم شێوە تا سێ ڕۆژان چاك بووەتەوە. هەروەها زۆر جاران سەیزادە ئاوی ناوقاپی قرژاڵی کانیاوی گرتووە و بە منداڵی فێڵەدراوی داوە و زوو چاك بووەتەوە.

● **ماجوومی میز و مامیلە**: ئەم گیراوەیە لە میزی مانگا، گیای مامیلە و گەڵای داری وەن پێك هاتووە. لە تەنەکەیدا تێکرا مامیلە و میز کوڵاوە تا خەست بووەتەوە و بووەتە ماجوومێکی قوڕاسا. پاشان چەند جار لە برین و قەڵشی پشت و بندەست و لاقی گوێدرێژ و بارگین گیراوە و چاك بووەتەوە. بەم ماجوومە گوتراوە: میزومامیلە.

---

بۆ ڕزگاربوونی ئەو ژنانە لە منداڵبوون ڕوویان لەو پیاوە ختسووە کە دۆخینەکەی بە ئەمانەت پێیان بدات و ئەوانیش لە ناوقەدی ژنەکە ببەستن تا منداڵەکە بە دنیا دێت. دووهەم: ڕاویژیان کردووە کە ئەو ژنە ناچار بکرێت لە ناو تاکەوشی مێردەکەی ئاو بخواتەوە. بەم حاڵەتە ژنە هێڵنج ئەدات و ڕزگاری ئەبێت.

## کورتەیەک لە دەرمانگەر و شکستەبەندانی خۆماڵی ئاوایی باقلاوا

ئەگەر ئێمە لە دیدێکی دوورەوە سەیری بەرژەوەنـدی پزیشـکی بکەیـن، ژووری "پزیشـکی خۆماڵی کوردەواری" پێك هاتووە لە چالاکی و ئەزموون و لێزانـی هەزاران پیـاو و ژن کە بە شێوەی شکسـتەبەند، دەرمـانگەر، ڕەچەتە دانەر، چارەسـەرکار، هەتـوانساز، پشـتشـێل، وەستای ناوك و کەهەنگ و بابەتی دیکە لەم بـوارە لە گونـد و شـار خزمەتیـان کـردووە و هەگبەی ئەزموون و زانستیان بۆ ئێمە بەجێ هێشتووە. ئەگەر بەوردی بچینە ناو پێشـینە و مێژووی خەڵکی کوردستان، هەر ئاوەدانیەك بە هەوار و گونـد و گەڕەکـی شـارەوە یەك یـا چەندین کەسی تێـدا بـووە کە ئەزموونـداری بـواری خۆمـاڵی چارەسـەر کـردن و هەتـوان گـرتنەوە و شکسـتەبەندین. ئەگەرچـی ئەوڕۆکە کـاریگەری هرووژمـی پزیشـکی تـازە وای کـردووە کە وەسـتا و ئەزموونـدارانی ڕاسـتەقینەی ئەو بـوارە خۆمـاڵی و فۆلکلـۆرییە کەم بووەتەوە، بەڵام بەڕاستی هێشتاکە گەلی ئێمە لەچاو گەلانی تر پێشەنگە و هەگـبەی چـۆڵ نەبووە و تەنانەت هەگبە و پرێسکەی تازە پێکەوە دەنێـت. ئەوسـاکە چارەسـەر و سـوکنایی برین و ئازاری مرۆڤەکان لە هەمان ئـاوەدانی ئەنجـام بـووە. ئەگەریـش توانسـت و زانسـتی ڕەچەتەی حەکیم و چارەسەرکاری ئاوایی تەواو بڕی نەکـردووە نەخۆشـەکانیان بەرەو مـاڵی حەکیمی سەرتر و ئەزموونداتر بردووە. ئەم حەکیمە پلە سەرووانە هەندێ جار لە ئاوایی یا شاری نزیکدا بووە و جاری واش بووە لە شوێنی دوور. بۆ نموونە تا پـێش هـاتنی پزیشـکی تازە و ئیدارەی تەندروستی ئەگەر نەخۆش بە دەستی دەرمـانگەرانی خۆمـاڵی بـاقلاوا چـاك نەبووەتەوە بردوویانە بۆ لای کوڕەکانی شـێخ عەلائەدیـن بیـارە (شـێخ عوسـمان لە دووڕۆ، شێخ موحەمەد لە سوورکەوڵ و شێخ خالێـد لە قەڵاشـێخان)[1] یـا بـۆ لای بـاوك و بـاپیری

---

١. ئاواییەکانی سوورکەوڵ و قەڵاشێخان سەر بە ناوچەی کەڵاتەرزانە.

حاجی سەعید[١] لە دەرەویان و کەسانی دیکە.

ئـاوایی بـاقلاوا دەکەوێـتە چەقـی نـاوچەی بەربـڵاوی کەڵاتەرزان کە ئەوڕۆکە سـەر بە بەخشداری شوێشەیە لە شارستانی سنە. پێشینەی بنەڕەتی ئەم ئاواییە بۆ پێش سـەدەی ٧ کۆچی دەگەڕێتەوە. کۆنترین دۆزراوەی کەونارایی نـاوچەکە و تەنـانەت شارسـتان لە قەڵای لۆشـــتەی بـــاقلاوا دۆزراوەتەوە کە دەگەڕێـــتەوە بـــۆ ســـەردەمی پـــێش ئەشـــکانی و هەخامەنشیەکان.[٢] هەروەها دووهەم خانەقای نەقشبەندی ڕۆژهەڵاتـی کوردسـتان لە نێـوان ١٢٥٠ تا ١٢٧٠ کۆچی لەم ئاواییە دروست کراوە و زیاتر لە ١٥٠ ساڵە باقلاوا شوێنی هـاتوچۆ و گەشتی خەڵکی نـاوچەکە و دەرەوە بـووە. لە گرانـی گەورە خەڵکـانێکی زۆر پەنایـان بـە خانەقای باقلاوا هێناوە. گـوایە بەهـۆی جەمـاوەری زۆرەوە فریـای هەمـووان نەکەوتـوون و خەڵکێکـی زۆر لە سـنووری بـاقلاوا تیـاچوون و لە بەشـی زیارەتـانی غەریـوان نێـژراون.[٣] پێکهاتەی کۆمەڵایەتی خەڵکی باقلاوا خێڵەکانی گۆران، جاف (کویکی، زەردۆیـی و دیـکە)، شـێخ (کاکۆزەکریـایی و مەردۆخـی) و هەورامییەکـانە. جەمـاوەری بـاقلاوا ئێسـتاکە ٥٠ بنەماڵەیەك دەبێت و وەك دەگێڕنەوە سەردەمانی کۆن ٧٠ ماڵی تێدا نیشتەجێ بـووە. باسـی ئەم ڕاپۆرتە لەسـەر پێشـینەی دەرمـانگەری و چارەسـەر کـردنە لە ئـاوایی بـاقلاوا، بەپێـی تەمەنی لەدایکبوونی پیرترین کەسایەتی ناو ئەم وتارە پێشینەی بۆ ئەم سەد ساڵەی دوایـی دەگەڕێتەوە.

١. **خاتوو فاتمە**: کچی شـێخ حەمە سـەعید هاوسـەری ئـاغە جەمیـل بـووە لە بـاقلاوا. ئەگەرچـی زانیـاری ئەوتـۆم لەسـەر ڕەچەتە دەرمانیەکـانی دەسـت نەکەوت، بەڵام شـێخ موحەمەد کوڕی گەورەی ئەو خانمە دەگێڕێتەوە کەسێکی خوێندەوار بووە و لە ڕێنموونی و ڕێنشاندان بە خانمانی نـاودێ هەمیشـە هەوڵـی خـۆی داوە و لە کاروبـاری چارەسـەری و

---

١. حاجی سەعید تەمەنی ٦٧ ساڵە. شارەزایەکی ناسراوە لە بواری شکستەبەندی و ژانی پشت و ئێسکدا. سەدان بابەت هەبووە کە بۆ پزیشکانی ئیستا چارەسەر نەکراوە و ئەم پیاوە چارەسەری کردووە. خاڵی گرینگ ئەوەیە کە ئەم پیاوە ئیستاکە بەیارمەتی وێنەی ڕادیۆلۆژی کارەکانی دەباتە پێش. ئەم ئەزموونە لە باوك و باپیرییەوە بۆی بە جێ ماوە.

٢. بررسی باستان‌شناسی محدوده سد آزاد کردستان، نووسەران: جەوانمەردزادە و هاوکارانی، گۆڤاری پەیام باستان شناسی، ژمارە ١٥، ١٣٩٠: لاپەڕە ٧٣-٩٠

٣. وەرگیراو لە: دووهەم خانەقای نەقشبەندی ڕۆژهەڵاتی کوردستان: خانەقای شێخ حسەینە سوور باقلاوا، ئیرەج مورادی، پاییزی ١٣٩٦ (هێشتا چاپ نەکراوە)

هەتوانی نەخۆشان دەستی شەفابەخشی بووە.

٢. **شێخ یوسف ناسراو بە بابەشێ:** ئەم پیاوە مێردی خاتوو ڕابیعە ئەسکەندەری بوو. دەوربەری ساڵەکانی ١٢٩٠ لەدایك بووە و ساڵی ١٣٦٨ کۆچی دوایی کردووە. لە بنەڕەتدا بنەماڵەیەکی خوێندەوار بووە و بۆخۆی و باوکی ساڵانێك مامۆستای مزگەوتی ئاوایی بوون. بالووك و مایەسیری بڕیوە. ئێستاکەش کاك عەبدولا کوڕە گەورەکەی دۆعای بالووك دەخوێنێت و ئەم زیاگۆشتە لە کۆڵ خەڵك دەکاتەوە. گوایە ڕۆژانی چوارشەممە خەڵك هاتوونەتە لای شێخ وێسۆ و حەوت دەنکە جۆ و حەوت دەنکە خوێیان کڕیوە و ئەویش دۆعای پێدا خوێندووە. ئینجا جۆ و خوێیەکەی لە بن دارێ خستووەتە چاڵ. بە کابرای گوتووە کە بڕۆرەوە خوێیەکە توایەوە و جۆکە خووسا بالووکی تۆیش هەڵدەوەرێت. دەیان نموونەی وا هاتوونەتە باقلاوا و بیستوومە کە چاك بوونەتەوە. [ڕەمز و ڕازی ئەم کارە سەیرە و لای عەقڵ قەبووڵ نییە، بەڵام بەرچاوە و ئێستەش کاك عەبدولا دەیکات و بالووك هەڵدەوەرێت.] بۆ بابەتی مایەسیری، گوایە بابەشێم بەوانەی گوتووە کە ئەو نەخۆشییان هەیە کە تەرمەکێك تووڵی داری بی دەستنیشان بهێنێت. لە سەردانی یەکەمدا باپیرم تەنیا دۆعای خوێندووە و دڵنیای کردووە کە چاك دەبێتەوە و پێی گوتوون کە خۆراکی وشك و گرس نەخۆن و ڕوو بکەنە چێشتی چەور و تراو، ئینجا بۆخۆی دانشتووە و تووڵەکانی بە چەقۆ لەت لەت بڕیوە و تا هەزاری بژاردووە و داینـاوە تا وشك ببنەوە. بە دەم بڕینی تووڵەکانەوە هەموو دۆعای خوێندووە. پاش وشکبوونەوە چیلکەکانی خستووەتە سەر کوانوو سووتاندوویە و بە نەخۆشەکەی گوتووە کە کۆم و ناوگەڵی بگرێتە سەر دووکەڵەکە، هەتا دوایی دێت. بەم جۆرە گوایە مایەسیریەکە کۆتایی هاتووە.

٣. **موحەمەد جاوید ناسراو بە کا حەمە خەنان:** دەوربەری ساڵەکانی ١٣٠٠ هەتاوی لەدایك بووە و ساڵی ١٣٩٣ کۆچی دوایی کردووە. بنەماڵەی کا حەمە خەنان سەردەمی هێرشی ڕووسەکان بۆ سەر کوردستان لە ئاوایی ئاڵیاوای لای شوێشە باریان کردووە و هاتوونەتە باقلاوا. گوایە لەگەڵ باوکی خۆیان سپاردووەتە خانەقای باقلاوا و لەوێ ماونەتەوە. ئەم پیاوە کەسایەتیەکی زەحمەتکێش و چالاك بووە و لە ڕێی ئاژەڵداری و کشتوکاڵی خەڵە و تووتنەوە تا ئەوکاتەی لە ژیاندا بوو، یەکێك لە دەوڵەمەندەکانی باقلاوا ئەژمێردرا. بەشێکی بەرچاو لەو کەسانەی پارەی تەواویان مسۆگەر نەبووە بۆ ژنهێنان، کا حەمە خەنان قەرزی پێ داون و دوایی لەبری قەرزەکە کاری کشتوکاڵ و ئاژەڵداریان کردووە بۆی و قەرزەکەیان بار کردووە. بەشێك لە تایبەتمەندی و ئاکاری تایبەتی ئەم پیاوە لێرە ئاماژە پێ دەکەین:

دەگێڕنەوە هەموو ڕۆژێ بەیانیان دەرکەی ژووری ماڵەکەی کردووەتەوە و پێی وا بووە کە ڕسق و ڕۆزی ڕوو لە ماڵێك دەکات کە دانیشتوانەکەی زووخێز بن و نان و چایی بەیانی پێش خۆرکەوتن بخۆن و خۆیان ئامادە بکەن بۆ کاری ڕۆژانە. گوایە بۆ ئەوە دەرکەی ژوورەکانی کردووەتەوە کە فریشتەی ڕەحمەت بچێتە ناو ماڵەکەی و کوڕ و کچەکانی گیانی تازە وەربگرن. نەك لە تەم و تاوی هەوای نووستنی شەوانە هەموو چرچەڵ داگەڕن و لەشی کارکردنیان نەبێت. بەیانیانە پاش بەرچایی ئەهاتە سەربانیژەی ماڵەکەی و تا نزیك دوای تاو هەڵاتن ئەوانەی لە ناودێ ئەچوونە دەرەوە هەواڵپرسییانی دەکرد. نێوانی لەگەڵ کەسانی تەمەڵ و تەوەزەلی ناودێ خۆش نەبوو. زۆر جاران تەشەری لەو کەسانە ئەدا. لە کاری ئاوەدانی و هاریکاری ناودێ کەسێك بوو هەمیشە پێشەنگ بوو. بەر لە هەموو کەسێك کاروباری ئاژەڵداری و کشتوکاڵی دەست پێ دەکرد و دوایی دەهێنا. بەگشتی خەڵك چاویان لە دەسپێکی کاری کشتوکاڵی و ئاژەڵداری کا حەمە خەنان بوو. واتا ڕۆژمێری کارکردنیان ئەو پیاوە بوو. ئەگەرچی لە پێش نەریتی تقسیم اراضیشەوە سەر بە چینی ڕەعیەت بوو، بەڵام بەهۆی دەوڵەمەندی و دارایی باشەوە لە ڕیزی بنەماڵە خۆشنشینەکان بوو.

کا حەمە خەنان بەهۆی ئەوە کە هەمیشە ژمارەیەکی زۆر مەڕ و ماڵاتی هەبووە و هەمیشە ئەگەری شکیان و برین و بڕین و ئێسك دەرچوونی ئاژەڵەکانی لە ئارادا بووە. بۆیە بۆخۆی لەم بارەوە ئەزموونی کۆ کردووەتەوە و ئاژەڵی نەخۆش و زیان بەرکەوتەی چاك کردووەتەوە. خەڵکیش بۆ چارەسەر و دەرمانی نەخۆشی ئاژەڵەکانیان زۆر جار یارمەتیان لەو پیاوە وەرگرتووە. ئەم ئەزموونە ڕۆژبەڕۆژ بوێری بە کا حەمە بەخشیوە کە ئەگەر بابەتێکی هاوشێوە لە ئینسانیشدا پێش هات دەستی بۆ ببات و چاکی بکاتەوە. ساڵانێکی زۆر خەڵکی باقلاوا کە کاری شکیان و دەرچوون و دەرپەڕینی ئێسك و جومگەیان بووە ئێوارانە چوونەتە ماڵ کا حەمە و کارەکەیان جێبەجێ کراوە. بێ هیچ ماف و مزێك ئەو کارانەی کردووە و تەنانەت زۆر جاران پەڕۆ و هێلکە و گیاکامی[1] پێویست بۆ شکستەبەندیەکە لە ماڵی خۆیان دابین کراوە.

**تێبینی:** ئەڵبەت جیا لە کا حەمە خەنان، کەسانێ تریش کاری شکستەبەندیان لە ناودێ

---

١. گیاکام هەمان گیای (کتان سفید) لە زمانی فارسییە کە گوڵەکانی شین و سپییە. بەهارانە شوانەکانی باقلاوا ئەم ڕووەکەیان لە کێو دەهێنایەوە و وشکیان دەکردەوە. کاتی پێویست هاڕاوەی ئەم گیایە [یا ئەگەر دەست بکەوتایە هاڕاوەی ڕەگی گیای ڕۆنیاس] لەگەڵ سپێنەی هێلکە تێکەڵ دەکرێت و دەخرێتە سەر پەڕۆیەك و لەسەر ئێسکی شکاو دەبەسترێت.

باقلاوا ئەنجام ئەدا. وەکوو کاك حەمە ڕەحیم ئەسکەندەری و شێخ حەسەن تەختفیروزە، بەڵام ئاستی ئەزموونی کا حەمە خەنان زیاتر بوو.

٤. **پەریجان خودامرادی ناسراو بە نەنێ پەریجان**: ئەم خانمە دایکی باوکم بوو. لە ناودێ بە نەنێ دەناسرا. ساڵی ١٣٠٠ هەتاوی لە ئاوایی خانەقای جووجوو لەدایك بووە و ساڵی ١٣٨٤ کۆچی دوایی کرد. بە منداڵی ڕاویارێکی ناسراو بووە و دەیگێڕایەوە کە دەیان جار مەڕ و بزنە کێوی کوشتووە. خێزانی یەکەمی – سەیید مستەفا حوسەینی – بەڕێوەبەری خانەقای باقلاوا بووە لە سەردەمی شێخ حەمە سەعید خەلیفەی شێخ حسامەدین. ڕێز و حورمەتێکی سەیری دەگرت لە بنەماڵەی کوڕەکانی شێخ حسامەدین و کوڕەکانی شێخ عەلادینی بیارە (شێخ عوسمانی دووڕۆ، شێخ خالیدی قەڵاشێخان و شێخ موحەمەد سوورکەوڵ). ژنانی ناودێ کە نەخۆش کەوتوون و هەلومەرج ڕێگەی نەداوە سەردانی پزیشك و حەکیم بکەن، ئەم شۆڕەژنە خۆبەخشانە چووەتە لای شێخ موحەمەد لە سوورکەوڵ و دەرمانی بۆ هێناون. پێش هاتنی بنکەی تەندروستی بۆ باقلاوا، نەنێ پەریجان مامای یەکەمی هەموو ژنانی دووگیانی ناودێ بووە. هەر بۆیە هەموو خەڵکی ئاوایی وەك دایەگەورە و ژنێکی خاسخوا سەیریان دەکرد و ڕێزیان دەگرت. دەگێڕنەوە کە سەردەمی ئاغاواتی و دەرەبەگایەتی ترسی لە هیچ خان و مالك و ئاغایەکی ناوچەکە نەکردووە و قسەی خۆی بەرامبەر بەوانە کردووە و تەنانەت بە جنێو وڵامی داونەتەوە. بۆ ناوك گرتنەوە بەتایبەت بۆ چینی ژنان کەسێکی شارەزا بوو. هەروەها لەم ئاخرانە زۆرکەس بۆ پشتئێشە و کوڵنج دەهاتنە لای و باوڕیان وابوو کە دەستی شەفابەخشە. هەرچەند نە هێزی دەست و پلی وەها بوو کە کوڵنج بتەقێنێت، بەڵکوو نەرم نەرم دەستی بە پشتی نەخۆشدا دەهێنا و سوکنایەکی پێ دەبەخشی.

نەنکم پاش مردنی مێردی دووهەمی شوو بە هێوەری دەکات و تا کۆتایی ژیانی لەگەڵ ئەم پیاوە ژیا. خەڵکی ناودێ و تەنانەت ئاواییەکانی دەوروبەریش، هەندێ جار کە منداڵەکانیان ناودەمیان هەڵئەزڵەپیا و بریندار ئەبوو (زارێشە)، دەیان هێنایە لای نەنکم و ئەویش چەند تاڵ مووی سەری خۆی بە دەم و لێویاندا دەکێشا. گوایە ئەم نەریتە تەنیا بۆ ئەو ژنانە دەبێت کە مێردیان بە هێوەری خۆیشیان کردووە. یەکێ تر لە کارەکانی نەنکم، گرتنەوەی فریشك و مەڵاشووی منداڵان بوو. فریشك هەمان ناوکە کە گوایە لە منداڵدا دەکەوێت و منداڵەکە تووشی سکچوون و بێ حاڵی دەبێت. منداڵە بە پشتدا لەسەر لاقی خۆیان ڕائەکێشن و دەست لەسەر ناوکی ئەخەن تا ترپەی ڕەگەکەی دەست بە لێدان

دەکاتەوە. ئینجا چەپ و ڕاست دەست و لاقی دەگرن و دەیکێشن و پـێکەوەی دەگـرن، لە کۆتاییدا منداڵەکە سەرمەقولاتێ پێ ئەدەن. خستنەوە جێی مەڵاشوویش بەم جـۆرە ئەنجـام ئەدا: بە قامکی ئاماژە (براتووتە) چەند جار مەڵاشووی ناودەمی منداڵەکەی بەرەو بـان فشـار ئەدات تا حەوا دەکەوتەوە. ئینجا کەمێ زەفت و قیری چەور دەکرد و دەیخستە بان بەشـی پێشەوەی سەری منداڵەکە و دەیبەست بۆ ماوەی تا یەك دوو ڕۆژ.

٥. **ڕابێعە ئەسکەندەری**: دایکی دایکم بوو. ئـێمە بە دایەشـێ بانگمـان دەکـرد. هەر بـۆیە خەڵکیش بە دایەشێ دەیـان ناسـی. دەوروبەری سـاڵەکانی ١٣١٠ هەتـاوی لە ئـاوایی زۆنـج لەدایـك بـووە و سـاڵی ١٣٩١ کـۆچی دوایـی کـرد. بنەمـاڵەکەی سـاڵەکانی ١٣٣٥ هەتـاوی هاتوونەتە باقلاوا. دایکی لە بنەڕەتدا خەڵك ئاوایی ساڵیانی ژاوەرۆ بووە و بنەڕەتـی بنەمـاڵەی باوکی لە خێڵ شاوەیس بووە کە سـەردەمانی زوو کەوچکتـاش بـوونە و لە ئـاوایی زەڵمـی هەورامـان هـاتوونەتە ئەم نـاوچەیە و زۆنجیـان ئـاوەدان کـردووەتەوە. دایەشـێ بـێ ئەوە خوێندەواری بێت زۆربەی بیرەوەریەکانی هێرشی ڕووسـەکان لە زمـانی بـاوك و بـاپیریەوە، هەروەها بیرەوەری هاتنی سپای ڕەزاخان بۆ سەر دەسەڵاتی سانەکانی ئاوایی ڕەزاو و گەلێك بابەتی مێژوویی و کۆمەڵایەتی دیکەی بە وردەکارییەوە دەگێڕایەوە. بەگشتی ژنێـك بـوو کە لە هەموو کاروباری تایبەتی ژیانی خۆماڵی و لادێیی شارەزایی هەبوو. بۆ نموونە: هەنگەوانی، تووتن و لۆکە، تەشی (بۆ خوری و موو ڕستن) و دووخ (بۆ پەمـوو ڕسـتن) و جـیکەنە (بـۆ جیاکردنەوەی لۆکە لە دانەکەی)، تەون و شاڵ و جاجم، جـلدووریـن، جـواڵ، گـوریس، و تاد. خۆی دەیگێڕایەوە کە گەلێك لەو شتانە کە لە ژیانـدا ئەیـزانم لە دایکـم فێـر بـووم. بـۆ کاروباری چارەسەری و نەخۆشی یەکێك لەو ژنانە بـووە کە خەڵـك پرسـیان پـێ کـردووە و داوای ڕێنوێنی و ڕەچەتەیان لێی کردووە. لە بوارەکانی نـاوك گـرتنەوە، فریشـك گـرتنەوەی مناڵ، مڵاشوو گرتنەوە، سەرگرتنەوە، دڵ گرتنەوە (هەمان چارەسـەری گیـراوی و گرفـت)، لاشەویلکە خستنەوە جێ (چارەسەری ملەخڕە و ترازانی لاشەویلکە)، چارەسـەری گیـراوی ناوسکی منالان، مامایی، خستنەوە جێی گوێردان و بەرخدانی مەڕ و ماڵات، شکستەبەندی، گرتنەوەی هەنوون و ماجووم بۆ برین و چڵك، هەروەها دەیان ڕەچەتەی گیایی و خاکی بـۆ نەخۆشیەکان. [بەشێکی زۆر لە ڕەچەتەکانی گەیشتووە بە دایکی بەنـدە ـ فەریـدە تەخـت-فیرووزە ـ کە دەبێتە کچە گەورەی خاتوو ڕابێعە.]

٦. **شێخ بەدرەدین**: ئەم پیاوە لە بنەماڵەی شـێخانی مەردۆخـی بـاقلاوایە. شـێخ ڕەئـووفی باوکی خەلیفەی شێخ عەلادینی بیارە بووە و کەسێکی خوێندەوار بووە. چەنـد کەشـکۆڵ و

دەستنووس و پەڕاو پاش شێخ ڕەئووف بە جێ ماوە. شێخ بەدرەدین ساڵەکانی ١٣١٠ هەتاوی لەدایك بووە و ساڵی ١٣٧٥ کۆچی دوایی کردووە. ئەم پیاوە شێوازێکی تایبەتی بۆ ناوك گرتنەوەی هەبوو. بەگشتی شێوازی ناوك گرتنەوەکەی لەچاو شێوازی کەسانی تر لە ناودێ وەکوو کاك حامێد نەخشیدە و نەنێ پەریجان، سەختتر بووە و خەڵك ئەگەر لە ژێر دەستی کاك حامید و نەنێ پەریجان چاك نەدەبوونەوە سەردانی شێخ بەدرەیان دەکرد. لە شێوازی شێخ بەدرە، نەخۆش بە جووچکانەوە لە بەردەستی دادەنشت و باڵی ڕاستی هەڵدەکرد و دەیخستە سەر ئەژنۆی. ئینجا شێخ بەدرە قامکە گەورەکەی لەسەر ڕەگی ناوەڕاستی چاڵی نێوان باسك و بازووی دادەنا و دەیگرت هەتا ترپەی ڕەگەکە لە کەوتن دەهاتەوە لێدان. ئینجا بە نەخۆشی دەگوت تا دەست و لاقت تەواو بتەزێت. جا ڕاکشە تا دەست و لاقیشت ڕێك و ڕاست بکەم. [ئەڵبەت هەندێ جار ڕەگی ژێر گوێی گرتووە و ترپەی ڕەگەکەی لە کەوتن هێناوەتەوە لێدان.]

٧. **نەوجوان ضیایی کچی شێخ موحەمەد سوورکەوڵ:** ئەم خاتوونە کچەزای شێخ عەلادینی بیارەیە و خێزانی شێخ موحەمەد[١] کوڕی ئاغە جەمیل باقلاوا بوو. ساڵی ١٣٣٠ لە سوورکەوڵ لەدایك بووە و ساڵی ١٣٨٠ کۆچی دوایی کردووە. بنەماڵەی ئەم خاتوونە لە گشت کوردستاندا ناسراون و باری خوێندەواری و پزیشکی ئەم خاندانە لای کەس شاراوە نییە. گوایە چەند ڕۆژ لە بەرماڵ ئاغە جەمیل کۆڕی هەڵپەڕکێ گیراوە بۆ گواستنەوەی ئەم بووکە و یەکێك لە گۆرانیبێژانی زەماوەندەکە عوسمان هەورامی بووە. دەیگێڕنەوە کە یەکەم جار برینپێچی و تیمارکردنی برین بە شێوەی هاوچەرخ ئەم خاتوونە هێناویەتیە باقلاوا. هەروەها ژنانی ناودێ لە ڕێگەی ئەم خانمەوە نەخۆشیەکانی خۆیان باس کردووە و ئەویش تا ئەو جێگە توانیویە یارمەتی داون یا پرسیاری لە باوکی حەکیمی کردووە. لە دەهەی ١٣٤٠ هەتاوی ئەم ژنە هاتووەتە باقلاوا. ئەوکاتە ماڵان دەستبەئاو و حەمامیان نەبووە. یەکەم جار ئەم ژنە دەستبەئاوێك لە تەنیشت دیواخانی ئاغە جەمیل دروست ئەکات و بەم جۆرە وردە وردە خەڵکیش بۆخۆیان ئەم کارە دەکەن.

٨. **فەریدە تەختفیرووزە:** ئەم ژنە کە دەبێتە دایکی بەندە، ساڵی ١٣٣٦ لە باقلاوا لەدایك بووە و ئێستە نیشتەجێ شاری سنەیە. هاوشێوەی دایکی پسپۆرێکی بێوێنەیە لە

١. ئەم شێخ موحەمەدە یەکەم کارمەند و موعەلمی ئاوایی باقلاوایە و ئێستە خانەنشینە و لە مەریوان دائەنیشێت. کەسایەتیەکی ئێجگار ڕووخۆش و قسەخۆش و زانایە و دەستێکی باڵای لە نووسینی هۆنراوەی فارسی و کوردیدا هەیە و چەند دەفتەر شێعری داناوە کە هێشتا چاپ نەکراون.

ئەنجامدانی کاروباری خۆماڵی و لادێییدا. هەمیشە بۆ منداڵ و خزمانی کەسێکی حەکیم و دەرمانگەرە. ئێستاکەش قوتوو و جانتای گژوگیا و دەرمانی کوردەواری لە ناوشاری سنەدا هەیە و بۆ کاتی پێویست بەکاریان دەهێنێت. دیارە کە دایکم ئەزموونەکانی لە میراتی هەگبەی دایە کاڵێ نەنکی، هەروەها دایك و باوك و خەسووی و هەروەها تاقیکردنەوەکانی خۆی پێی گەیشتووە. [کاك موحەمەدی برام کە خەریکە کتێبی کەشکۆلی کورەویژ دەنووسێت و ئەم کتێبە هەموو داب و نەریت و فولکلۆر و قسە و باسی کۆنی ناوچەی کەلاتەرزانی تێدایە، بەشێکی زۆری لە دایك و باوکم وەرگرتووە، هەروەها بەندەیش کە چەند دەفتەرێکی یادەوەری ڕۆژانەم هەیە و یەکەم دەفتەریان ساڵی ١٣٨٠ دەستم پێ کردووە و ناوم ناوە "بەرەڕۆچکە"، ئێستەش درێژەی هەیە و هەموو پەند و پەیڤی پێشینیان، قسەی نەستەق، وشە و دەستەواژەی کەلاتەرزانی، بابەتی پزیشکی خۆماڵی و چیرۆکی تێدایە، بەشێکی بەرچاوی لە باوك و دایك و نەنك و کەسە بەساڵاچووەکانی خۆمان وەرگرتووە.]

## حەکیم خەلیفە سابیری بەکرەجۆ[1]

ئاشنایەتیم لەگەڵ بنەماڵەی خەلیفە سابیر، دەگەڕێتەوە بۆ بەهاری ساڵی ٢٠١٤. ماوەی دوو ساڵان وەرگێڕی کۆمپانیایەکی بیناسازی ئێرانی بووم لە سلێمانی. جیا لە کاری سەرەکیم لە کۆمپانیا خۆشبەختانە لەگەڵ کۆمەڵەی ڕووەکناسانی باشووری کوردستان ئاشنا بووم. یەکێك لەو کەسانە کاك ئێسماعیل کوڕی خەلیفە سابیری بەکرەجۆ بوو. بەکرەجۆ ئێستا شارۆچکەیەکە نزیك بە ناوشاری سلێمانی. ئەوکاتە چەند جاران لەگەڵ کاك ئێسماعیل بۆ گەشتی گیاناسی چووینە پێدەشت و قەدپاڵەکانی بەکرەجۆ، بەرانان، کانی کوردە، هەواری شار، ئەزمەڕ و ڕێگای قەرەداغ، هەروەها چەند شەو و ئێوارە بە خزمەت خەلیفە سابیر گەیشتم و لە نزیکەوە لەگەڵ ئەم حەکیمە ئاشنا بووم و گوێداری کار و بەرنامە و ڕەچەتە دەرمانیەکانی دەبووم. لەپاڵ ماڵەکەی ژوورێکی ساز کردووە کە پێك هاتووە لە ژووری پێشوازی لە نەخۆش و میوانان، و ژووری دیکە دەبێتە دەرمانخانە و کتێبخانە. بەختەوەرانە کاك ئێسماعیل کوڕی گەورەی ئەم حەکیمە هۆگری زۆری هەیە بە بواری گیادەرمانی و بەگشتی چارەسەرکردنی نەخۆشان. چەند ساڵێکە لەبەردەستی باوکی شاگردی کردووە و وەك هاوەڵ و هاوڕێیەك پێکەوە کارەکانیان بەڕێوە بردووە و خەڵك ئەگەر سەردانی کردوون بە نەبوونی خەلیفە سابیر کارەکە زۆر پەکی نەکەوتووە و کاك ئێسماعیل ڕێنمایی و ڕەچەتەکانی داوەتە نەخۆشەکان. ئێستاکە کاك ئێسماعیل بۆخۆی هاتووەتە ناوشاری سلێمانی و دووکانێکی گیادەرمانی داناوە و ئەزموونی ڕەچەتە و ڕێنماییەکانی باوکی و خۆی پێشکەشی نەخۆش و دەردەداران دەکات.

خەلیفە سابیر کوڕی ئێسماعیل کوڕی ئەحمەد کوڕی قادر ساڵی ١٩٥٢ لە گوندی

---

١. سەرەڕای یاداشت و بیرەوەریەکانی خۆم لە بنەماڵەی خەلیفە سابیر لە ساڵەکانی ٢٠١٣ و ٢٠١٤، دیسانەوە داوام کرد لە کاك ئێسماعیل کە چەندین پرسیارت بۆ دەنێرم کە لە باوکت بپرسە و هەروەها زانیاریە پێویستیەکانی خۆیشت بەڕێ بکە. کەواتە ئەم وتارە ئەنجامی ئەم دوو هەوڵەیە.

گەڵنێری[١] سەر بە شاری دووکان لەدایك بووە. ئەم بنەماڵەیە و چەند ماڵباتێکی تر بە خێڵی سۆفان دەناسرێن، بەڵام ئێستاکە جیا لە سۆفان، بنەماڵەی خەلیفە سابیر و نەوە و براکانی لە بەکرەجۆ بە خێڵ سمە گەردەش[٢] ناوبانگیان هەیە. باب و باپیرانی خەلیفە سابیر پیشەیان ئاژەڵداری بووە و ساڵانە بە کۆچەری گەرمێن و کوێستانیان کردووە. وەرزی بەهار و هاوین چوونەتە کوێستانەکانی دیوی ڕۆژهەلاتی کوردستان و پاییز و زستانان هاتوونەتەوە خواری بۆ دیوی دووکان و کۆیە و ئەو ناوچانە. ئەگەر بگەڕینەوە بۆ مێژووی ئەو سەردەمەی کوردستان، تا ساڵەکانی ١٢٩٠ کۆچی (١٨٧٠ زایینی) ئاژەڵدارانی جاف لە شارەزوور و کەرکووك و گەرمیانەوە ساڵانە باجیان داوە بە حاکمی ئەردەڵانەکانی سنە و تا سەرەتای وەرزی سەرما لە دیوی ڕۆژهەلات دەبوون. کاتێ فەرهاد میرزا مامی ناسرەدین شای قاجاڕ بووە والی ئەردەڵان و دەستی کرد بە شەڕ لەگەڵ سانەکانی هەورامان و جافەکان، بۆ هەمیشە پابڕانی کرد بە کۆچەریەکانی جاف بۆ ئەم ناوچانە.[٣] کەواتە بنەماڵەی سۆفانەکانی گەڵنێریش هاوشێوە، خێڵێك بوونە لە هۆزی گەورەی جاف و لە ساڵەکانی ١٨٧٠ ئیدی هەر لە گەڵنێری ماونەتەوە و لە کۆچەری بڕاون.

خەلیفە سابیر دەیگێڕێتەوە کە باب و باپیرانم بەهۆی پسپۆڕی بێوێنەیان لە بواری ئاژەڵداری، و هەروەها ژیانی کۆچەری، هەمیشە پشتیان بە ئەزموون و زانیاری و ورەی خۆیانەوە بەستووە و گەلێك نەخۆشی و دەرد و ئارێشەی ژیانیان و ئاژەڵەکانیان بە دەستی

---

١. مامۆستا ڕاجی (مەلا ڕەحمان کوڕی مەلا ئیبراهیم: ١٩١٢-١٩٦٩) شاعیری گەورە خەڵکی گەلنێری بووە. ئەویش لەگەڵ بنەماڵەی خەلیفە سابیر پاش چۆڵ کردنی گەلنێری سەرەتا چووەتە سابووراوا و دواتر لە بەکرەجۆ گیرساوەتەوە و هەر لەوێ کۆچی دوایی کردووە. (دیوانی ڕاجی، ئامادەکردن: مەسعوود موحەمەد، چاپی یەکەم، ٢٠١١)

٢. دوو بۆچوون هەیە لەسەر گەردەش. یەکەم، گوایە گەردەش هەمان گارداشی تورکیە، واتا برا. دووهەم، گۆڕدراوی وشەی فارسی گەردش بێت واتا گەشت و گێڵ.

٣. لەو ساڵانەدا دەبێت کە فەرهاد میرزا بڕیار ئەدات کە ئیدی نەهێڵێت جافەکان باشووری کوردستان بێنە دیوی ڕۆژهەلات. سەرۆك هۆزەکانی جاف مەولەوی تاوگۆزی ئەکەنە تکاکار تا بەشکوو بچێتە دیواخانی والی لە سنە. لە نامەیەك کە مەولەوی لە ڕێگەدا لای هاوڕێ و شاعیری هاوچەرخی شێخ عەزیز لە ئاوایی جانەورەی مەریوان لا ئەدات و نامەیەك بۆ فەرهاد میرزا ئەنووسێت و پێش خۆی نامەکە ئەنێرێت بۆ سنە. [هەر چەند توێژینەوەکان و گوزارشە مێژووییەکان وای دەرئەخەن فەرهاد میرزا دەستی بە ڕووی تکاکاریەکەی مەولەویشەوە نا و بۆ هەمیشە جافەکانی لە گەرمیان و شارەزوور هێشتەوە.] سەرچاوە: دیوانی مەولەوی، ئامادە کردن: مامۆستا عەلی قەرەداغی، بەرگی ٢، لاپەڕە ٩٨٩

خۆیان چارەسەر كردووە. هەر بۆیە ئەمان بەتایبەت لە بواری شكستەبەندی و بەیتاڵی گەلێك شارەزا و پسپۆڕ بوون و هەر ئەمە بووەتە هۆی ئەوە كە خەلیفە سابیر بوێری نیشان بدات كە ئەزموونەكانی پزیشكی بگوازێتەوە و لەسەر مرۆڤی نەخۆشیش ئەنجامی بدات.

ئەو گوندەی خەلیفە سابیر تێدا لەدایك بووە و ساڵی ١٩٥٨ بەهۆی گلدانەوەی ئاوی بەنداوی دووكان و ژێركەوتنی گەلنێری، دانیشتوانەكەی هەموو دەگوازرێتەوە بۆ ئاوایی سابووراوای تازە لە ناحیەی سووورداش لە داوێنی چیای پیرەمەگروون. گوایە بنەماڵەی خەلیفە سابیر بار دەكەن و لە بەكرەجۆ ئەگیرسێنەوە. لێرە بەدواوە خەلیفە سابیر زیاتر وەك جوتیار و باخەوان و تەرەوانێك دەرئەكەوێت تا ئاژەڵدار. هەتاكوو ئێستەش خەلیفە رۆژانە تا نیوەرۆ سەردانی باخ و بێستانەكەی دەكات و بە هاوكاری منداڵەكانی هەموو كاروباری بژار و گیادروون و ئاودێران و جووت و دروێنە دەكات و یەكێك لەو بنەماڵانەیە كە لە هەرێمی كوردستان پشتی بە داهاتی كشتوكاڵی بەستووە نەك مووچە و مەعاشی حكوومی. پاش نیوەڕوان تا پاش خواردنی شێوی شەوانەی لە دەرمانخانەكەی چارەسەری نەخۆشەكان دەكات.

بنەماڵەی باوك و باپیرانی خەلیفە سابیر لەسەر رێچكەی رێبازی نەقشبەندی بوون، بەڵام حەكیم سابیر بۆخۆی تاقیكردنەوەیەكی دیكەی كردووە و چووەتە سەر رێبازی قادریەی كەسنەزانی و لەسەر دەستی شێخ عبدالكریم كەسنەزانی (١٩١٥-١٩٧٨) و دواتر لەسەر شێخ موحەمەد پەیمانی بەستووە و بووەتە خەلیفە لە تەكیەی بەكرەجۆ.

**چەندین تێبینی بەرچاو لە ژیان و ئەزموونی ئەم حەكیمە:**

• جیا لەو ئەزموونانەی كە لە باب و باپیرانیەوە پێی گەیشتووە، هەندێ تێكەڵاویشی بووە لەگەڵ ماڵباتی شێخ عوسمانی دووڕۆ. سەردانی ئەو حەكیمەیشی كردووە و ئاگەداری رەچەتە و رێنماییە دەرمانیەكانی شێخ عوسمان بووە.

• بەهۆی ئەوە كە تا پۆلی شەشی خوێندووە و بەردەوام لە حاڵی خوێندنەوەی قورئان و بابەتەكانی ئایینیدا بووە، خوێندەواری وای هەیە كە سوود لە سەرچاوە كوردی و بیانیەكان ببینێت.

• یەكێك لەو سەرچاوانە كە بەردەوام دەیخوێنێتەوە و تێرامانی دەكات، كتێبە پزیشكیەكەی داود ئەنتاكیە. ئەم كتێبە چاپێكی كۆنە و لە میسر چاپ بووە و ساڵانێكی زۆرە لای خەلیفە سابیر هەڵگیراوە.

• خەلیفە سابیر بۆ دۆزینەوە و كۆكردنەوەی گژوگیای پزیشكی سەردانی زۆربەی چیا و كوێستانەكانی دەوروبەری خۆی كردووە و ئێستاكەش بەشی هەرەزۆری هەگبەی گیا و

دەرمانی دەرمانخانەکەی لە گژوگیا و بەرهەمی خۆماڵی کوردستان دابین دەکا و پشت بە بەستە و قوتووی کارگەیی و سەنعەتی نابەستێت.

● خەلیفە سابیر تا ساڵەکانی ۱۹۹۱ زۆرتر کاری شکستەبەندی، پشتئێشە، پشت و لاق وەرگەڕان، ناوك گرتنەوە، چاو تەکاندن و پاژنە تەکاندن[1] بوو.

● پاش سەرهەڵدانەکەی کوردانی هەرێمی کوردستان خەلیفە سابیر زیاتر بەرەو لای گیادەرمانی ڕاکێشراوە و جیا لە بابەتە پسپۆڕیەکانی پێشووی، دەستی داوەتە بەکارهێنانی دەرمان و چارەسەری گیایی بۆ نەخۆشەکانی بواری بەردی گورچیلە، منالّدان و نەزۆکی ژنان، پرۆستات، و ...

● ئەوەی ئێستا جێی دڵخۆشییە، خەلیفە سابیر بەیارمەتی کاك ئێسماعیل خەریکە ئەزموون و زانیاریە پزیشکیەکانی دەنووسێتەوە و بەهیوایە بیکاتە پەرتووکێك و چاپی بکات تا ئەم گەنجینە نەفەوتێت.

● ئەم حەکیمە یەکێك لە دامەزرێنەرانی کۆمەڵەی ڕووەکناسانی ـ گیادەرمانان ـ کوردستان بووە کە ساڵی ٢٠٠٤ بە یارمەتی چەند کەسێکی تری ئەم بوارە بنەما و بنکە و پێڕەوی ئەم کۆمەڵەیانە دامەزراند و وەك کۆمەڵەیەکی خاوەن لۆگۆ و پێڕەونامە خۆیان بە فەرمانگە و شوێنە پێوەندیدارەکانی باشووری کوردستان ناساندووە. خۆشبەختانە کۆمەڵەکە ئێستا قۆناغی پێشکەوتنی زیاتری بڕیوە و ئەندامی زیاتری لە دەورە کۆ بووەتەوە.[2]

---

١. ئەوانەی وا چاویان کرێش و کرم و ڕشك هەڵدێنێت یا بە هەمان شێوە پاژنەی لاقیان دەقەڵشێت و گوایە کرمی هەڵێناوە، لە پزیشکی خۆماڵی کوردەواری تووی گیای خەربەنگ و بنێشتی کوردی لەسەر خەڵووز ئەسووتێنن و ئینجا نەخۆش دەبێ چاو یا پاژنەی بگرێتە سەریدا. ئەڵبەت پاش چاوداگرتنەکە بە دار یا گەسکە کۆتەرەیەکی خاوێن بەشێنەیی بە سەر یا بە پێی نەخۆشدا ئەکوتن تا ئەو کرم و کرێشە دابکەوێت و چارەسەری بێت.

٢. هاوینی ساڵی ۱۳۹٥ نوێنەرانی کۆمەڵەی ڕووەکناسانی کوردستان (مامۆستا قەیۆم هەورامی و کاك جەلال سەید کەریم) بەشداری پێشانگای سەرتاسەری پزیشکی خۆماڵی و گیادەرمانی ئێرانیان کرد لە شاری تاران. بەندە و کاك جەلال ڕەئووفی بانە وەك هاوکار و وەرگێڕ، توانیمان بۆچوون و نیازی کۆمەڵە بگەیەنینە لایەنە پەیوەندیدارەکانی وەزارەتی تەندروستی ئێران. هەر بۆیە لەگەڵ نوێنەری وەزارەتی تەندروستی لە بەشی پزیشکی میلل و هەروەها سەرۆکی زانکۆ و ڕاگری کۆلیژی (طب سنتی) زانکۆی ئێران دانشتنمان کرد و هەر دوو لا ڕەزامەندییان نیشان دا کە لقێك لە کۆلیژی ناوبراو لە هەولێر بکەنەوە. هیوادارم هەوڵەکان بۆ ئەم هەلە زێڕینە، بچێتە بواری جێبەجێکردن.

## حاجی سەعید دەرەویان شکستەبەندێکی تایبەت

بۆ نووسین و ئامادەکردنی ئەم وتارە ڕێکەوتی ١٣٩٧/٠٣/١١ چووینە ئاوایی دەرەویان. ئەم ئاوایییە دەکەوێتە ناوچەی کەڵاتەرزان. ئەڵبەت خەڵکی کەڵاتەرزان بەشی پشت جادەی تێژتێژ بۆ مەریوان بە بەرپلەی ساڵاڵ دەناسن. دەرەویان ئاوایییەکی تازەیە و دەوروبەری ساڵەکانی ١٣٣٠ هەتاوی لەلایەن قادر بەگی بابان[١] ئاوەدان کراوەتەوە. پێشتر بەشە ملکی پلوورە و کاکۆزەکریا بووە و هەر لە کۆنەوە سەر بە میراتی بنەماڵەی شێخ زەکریاییەکان بووە. لە دەراو دۆڵی دەرەویان زیارەتانی کۆنی شێخ زەکریاییەکان هەیە و هەروەها کەمێک سەرووتر بەرەو کەلی زەلاوا تەپۆڵکەیەکی توورەکەڕێژ هەیە کە بە تەپەی نادرشا دەناسرێت. گوایە سپای نادرشا کاتێ لەم ناوچەوە تێ پەڕیوە ئەم شوێنەیان دروست کردووە. لە نێوان دەراو دەرەویان و کاکۆزەکریا دەشتی هەزارگرێ هەیە. ئەم دەشتە لە سەدەکانی ٧ و ٨ کۆچی ئاوایی بووە و یەکەم بنەماڵەی شازەلیەکان کە دوایی بوونەتە بنەماڵەی گەورەی شێخ زەکریایی، لەم شوێنە نیشتەجێ بوون و ئەوکاتە ئاوایی هەزارگرێ بووە و لە کتێبی نورالانواری شێخ عبدالصمدی تووداری[٢] کە سەرەتای سەدەی ١٠ کۆچیدا نووسراوە، سەبارەت بە زیارەتانی دەراو دەرەویان، هەزارگرێ، پیر و شەخسەکانی کاکۆزەکریا و پلوورە و گشت ناوچەکە گەلێک بابەتی نووسیوە.

ئاوایی دەرەویان سەر بە بەشی شارستانی مەریوانە و ٣٦ بنەماڵە لێرە نیشتەجێن. دانیشتوانەکەی خەڵکی هۆزەکانی گەڵواخی و جافی کەڵاتەرزان و سەیید و بەگی

---

١. قادر بەگ (١٣٠٧-١٣٧٧ هەتاوی) سەرەتا لە ئاوایی کاکۆزەکریا نیشتەجێ بووە و دواتر ئەم ئاوایییە بە ناوی خۆیەوە واتا قادراوا ئاوەدان کردووەتەوە. ئەڵبەت هەندێ جار بە دەرەویان قادریش دەناسرێت. قادر بەگ کوڕی حەمە سەعید بەگ کوڕی حاجی ئیبراهیم بەگی بابان بووە. ئەم بنەماڵە لە سلێمانییەوە هاتوونەتە ناوچەی مەریوان. ئاوایییەکانی ئیبراهیماوا و قەڵوەزەی لای سلێمانی ملکی ئەم ئیبراهیم بەگە بووە. ئەم قادربەگە حەزی زۆری لە خوێندنەوەی شێعری کوردی هەبووە. (وەرگیراو لە: ویکیپێدیای فارسی، بابەتی قادرآباد، ١٣٩٧/٠٣/١٨)

٢. تووداری شێخ عبدالصمد، نورالانوار، چاپی یەکەم، پەخشانگای حوسەینی نەسەب، سنە، ١٣٦٩

ناوچەکەن. بنەماڵەی حاجی سەعید بیووس کە لێرە باسی دەکەین لە بنەڕەتدا خەڵکی ئاوایی هەزارکانیانی ناوچەی سالاڵ و سەر بە بنەماڵەی گەورەی عەودلا خانی گەڵواخییە. مەحموود کوڕی باسام باپیری حاجی سەعید ساڵەکانی ۱۲۵۰ هەتاوی هاتووەتە ئەم ناوچەیە و دواتر ئەحمەدی کوڕی لە ئاوایی دەرەویان نیشتەجێ بووە. حاجی سەعید ساڵی ۱۳۳۰ هەتاوی لەدایك بووە و لە تەمەنی جوانیدا باوکی دەمرێت و ئەرکی ماڵ و منداڵ وە ئەستۆی دەکەوێت. ئێستا بنەماڵەیەکی گەورەماڵ و دەوڵەمەندە و لە دەرەویان و ناوچەکە و بەشێکی زۆر لە سنە و مەریوان و سالاڵ و سەرشیو ناسراوە. وەك خۆی دەیگێڕێتەوە کە شکستەبەندی و پشت تەقاندن و کۆڵنج پرواندن و کاروباری بەیتاڵی ئاژەڵ پیشەی باوك و باپیریشی بووە. ئەم پیشەیە لەوانەوە بۆ ئەو بەجێ ماوە و ئێستاکە وەك خۆی باسی دەکات کچە گەورەکەی ئەگەر دەستی بگرێت و هان بدرێت دەتوانێت جێگەی باوکی بگرێتەوە.[1] بەداخەوە هیچ کام لە کوڕەکانی دڵیان بەم پیشەیە خۆش نییە و فێری نەبوون.

حاجی سەعید خوێندەواریی ئەوتۆی نییە، بەڵام وەك باسی دەکات سەردەمی شا خوێندنی گەورەسالان (ئەکابر) بووە لە ئاوایی. چەند کەسێك لە دەرەویان دەست بەم خوێندنە دەکەن، بەڵام هەر زوو ئەوان دەستی لێ هەڵدەگرن و هەر دەمێنێتەوە ئەم پیاوە. کەواتە خوێندنەکەی نیوەچڵ دەبێت و بۆخۆی لە ماڵەوە و بەیارمەتی مامۆستا و معلمی ناودێ خوێندن و نووسین فێر دەبێت و بەشی خۆی ئێستە دەزانێت. تا بتوانێت بە دەستی خۆی ڕەچەتە و دەرمانەکان دەنووسێت بۆ نەخۆشەکانی.

**چەند تێبینی لە بواری شکستەبەندی حاجی سەعید:**

- ئەم پیشەیە بنەماڵەییە و لە باوك و باپیرانیەوە بۆی بەجێ ماوە. وەك خۆی دەیگێڕێتەوە کە پاش مردنی باوکی بەهیوا نەبووە کە ئەم پیشەیە درێژە پێ بدات، بەڵام خەڵکی داخواز سەردانیان کردووە و ئەوپەڕی متمانەی خۆیان نیشان داوە و بووەتە هۆی ئەوە کە زیاتر بۆی دابچێت.
- پیشەی سەرەکی خەڵکی دەرەویان و بەگشتی بەرپلەی سالاڵ ئاژەڵدارییە. بنەماڵەی حاجی سەعیدیش بەم شێوە بەشێکی بەرچاو لە کاروباریان ئاژەڵدارییە. هەر بۆیە شکیان و

---

۱. ئەڵبەت خاتوو حەمیدە خۆشکی حاجی سەعید کە خێزانی شێخ عەبدوڵای هاشمی نەسەبە لە ئاوایی پلوورە، پلوورە، بۆخۆی دەستێکی باڵای هەیە لە دەرمانگەری و شکستەبەندی خۆماڵییدا. ئەڵبەت لەچاو حاجی سەعید شکستەبەندیەکەی ناسراو نییە، بەڵام وەك نەریتێکی بنەماڵەیی ئەم خاتوو حەمیەیە شۆڕەژنێکی لێهاتووە لە بواری داودەرمانی کوردەواری.

لەجێ چوون و برین و بڕین و نەخۆشی بەردەوام لەناو ئاژەڵەکانیان بەرچاو دەکەوێت و حاجی سەعیش هەمیشە هەوڵی ئەوە بووە کە ئازار و زیانی ئاژەڵدارانی ناودێ و بۆخۆی کەم بکاتەوە. کەواتە بەشێکی زۆر لە ئەزمونی ئەم نوژدارە لە بەیتاڵی ئاژەڵەکانەوە وەرگرتووە.

● سەرەڕای چەند ڕەچەتە و ڕێنوێنی دەرمانگەری تایبەت، شارەزاییەکی بێ‌وێنەی لە خوێندنەوە و سەرلێ‌دەرکردنی وێنەی رادیۆلۆژی هەیە. زۆربەی نەخۆشەکانی پێش ئەوە سەردانی بکەن وێنەی رادیۆلۆژی و ئێم‌ئارئای دەگرن و بەخاترجەمییەوە سەردانی حاجی سەعی دەکەن.

● بەشێك لە کەرەستە و شمەکی پێداویستی کارەکەی لە چەسپ و باند و پارچەی دەرمانخانەکان دابین دەکات و دەڵێت: ئەو شتانەی وەك تەختە و پەڕۆ و خام و هێلکە و گیاکام و چی و چی کە ئەوسا ئێمە بەکارمان دەهێنا، ئیشی ئەوە بوو کە ئەم شتە تازانەی ئەوڕۆ نەبوون.

● زۆربەی نەخۆشەکانی دەبێ جارێ یا دوو جار سەردانی بکەن. چونکا جاری یەکەم پشکنینی سەرەتایی بۆ دەکات و ڕێنمایی تایبەتی پێ دەدات کە ئەنجامی بدات و پاش هەفتەیەك تا ٣ مانگی تر سەردانی بکاتەوە.

● پسپۆڕی ئەم پیاوە لە بوارەکانی پشت تەقاندن، کۆڵنج پرواندن، دیسکی کەمەر و مل خستنەوە جێ، چارەسەری بەرکەوتنی زیان بە کەشی دەوروبەری ڕەگی نۆخاع و مۆرەکانی پشت، شکیان و لەجێ چوونی مەترسیدار، دەرچوون و دەرپەڕینی جومگە و ئێسکی شوێنە هەستیارەکانە.

● دەیان و سەدان نموونەی وا هەیە کە شوێنێکی شکاوە و لای دکتۆرەکان و شکستەبەندەکانی تر گیراونەتەوە و دوایی دەرکەوتووە کە ئێسکەکە خراپ گیرساوەتەوە و لارولەوێر بووە. حاجی سەعید ڕەچەتەی خۆی بۆ داناوە و پاش یەك تا دوو هەفتە نەخۆش چووەتەوە بۆ لای و ئارام ئارام شکاندوویەتیەوە و خستوویەتیەوە جێ.

● پێش ئەوەی کار لەسەر شکیانی کۆنی ئێسك و خواربوون و دەرپەڕینی مۆرەکان بکات، لە سەردان و پشکنینی یەکەمدا تەنیا ڕەچەتەکەی بۆ دەنووسێت کە جوان بەکاری بهێنێت و دوایی سەردانی بکاتەوە تا کاری پێویستی لەسەر ئەنجام بدات. وەك خۆی باسی دەکرد کە کاتێ دەوروبەری مۆرە یا جومگە و ئێسکی شکاو خوێنی تێ زاوە و کیم و زووخی لە دەورەدا کۆ بووەتەوە، هەر کارێکی لەسەر بکرێت هەڵەیە. کەواتە پێویستە

سەرەتا شتی لێ بگیردرێت تا خوێن و زووخەکە بڕەوێتەوە. ئینجا دەستکاری بکرێت و بکێشرێت و بخرێتەوە جێ یا بتەقێنرێت.

● وەك نەریتی باب و باپیرانی، کاری حەکیمی و شکستەبەندی بە پارە و مز ناکات و چاوەڕوانی لە کەس نییە کە هیچی بۆ بهێنن. بەشێکی زۆر لە پێداویستی کاتی شکستەبەندی نەخۆشەکان هەر لە ماڵی خۆی دابینی دەکات و بەدڵکراوەیی و بە نیازی خێر و چاکی لە ڕێگەی خودا ئەم کارە دەکات. ئەگەرچی وەك خۆی باسی دەکات هەندێ جار نەخۆشەکان بە سوێند و ناو خوا دەستخۆشانەیەکی بۆ دائەنن یا دیاریەکی بۆ دەهێنن، بەڵام نیازی ئەو مزە و پارە نییە و بێ چاوەڕوانی ئەم کارە دەکات.

● زۆربەی پزیشك و خەستەخانەکان کە کاری شکستەبەندی و گرتنەوە دەکەن لە شارەکانی سنە و مەریوان و تاران، دەیان ناسێت و ئەگەر نەخۆشەکانی بە کارەکەی ڕازی نەبوون و یا چاك نەبوونەوە ئەوە ناونیشانی پزیشك و خەستەخانەی ئەو شارانەیان پێ ئەدات.

● حاجی سەعید هاوکات کاری ئاژەڵداری و کشتوکاڵ دەکات و بەشێکی زۆر لە کاتی ساڵ، لە دەشت و دەر ئیش دەکات. هەر بۆیە ئەگەر لە ماڵەوە نەبێت لە دەشت و دەر سەردانی دەکەن. ئەو ڕۆژەی کە ئێمە سەردانمان کرد تا ئێمە لەوێ بووین چەند کەس لە دوور و نزیکەوە سەردانیان کرد. [کاك ئیسماعیلی برام بۆ دڵنیابوون لە چاکبوونەوەی دەرچوون و شکیانی دوو قامکی دەستی و شکیانی لووتی بۆ جاری سێهەم، فەرماندە سپای شارۆچکەی شوێشە بۆ ئازاری مۆرەکانی پشتی و ڕەپبوونی ملی، پیرەژنێك خەڵکی ئاوایی گاگل لای مەریوان بۆ گرێ و گۆڵی لاقی و دیسکی پشتی، کوڕێکی ناودێ دەرەویان کە لاقی بەهۆی کارەوە لەجێ چووبوو].

**ڕەچەتەکان:**

حاجی سەعید دەرەویان چەند ڕەچەتەیکی هەیە کە لەوانەیە تەنیا تایبەت بە خۆی بن. ئەم ڕەچەتە و شێوازە دەرمانگەرییانە وای کردووە کە بازنەی ناوبانگیی ئەم پیاوە ڕۆژبەڕۆژ زیاتر و بەرفراوانتر بێتەوە.

● **بۆ شکاندنەوەی جومگە و ئێسك کە خوار و نارێك گیرساوەتەوە:** پێویستە بە ڕێژەیەکی یەکسان خورما و دووگی مەڕ پێکەوە بکوترێ و هەندێ خوێی پێدا بکرێ. ئینجا بە شیلەگەرمی بەپانایی و ئەستووری یەك کەلانە بخرێتە بان شوێنی مەبەست. ئەم کارە دەبێ دوو جار لە شەو و ڕۆژدا بگۆڕدرێت. ماوەی تێگرتنەکە نابێ زیاتر لە دوو هەفتە بێت. چونکا

دەبێتە هۆی شکاندنەوەی زیاتری ئێسك و جومگەکە. بەگوێرەی ئەستوورایی و ڕەقی ئێسك و جومگەکە (واتا بۆ منداڵ و پیر و گەنج و ئێسکی لاق و دەست و قامك جیاوازە) ماوەی تێگرتنی خورما و دووگەکە لە یەك تا دوو هەفتە جۆراجۆرە. ئەگەر کەسەکە منداڵ بێت و شوێنەکە ئێسك و جومگەیەکی چکوولە بێت پێویست ناکا کە ماوەکە زۆر بێت و کەمتر لە یەك هەفتە تەواوە بۆ تێگرتنی ئەم ماجوومە، بەڵام بۆ کەسێك کە گەنجە و ئێسك و جومگەی ئەستووره تا نزیك بە دوو هەفتەیش بۆی هەیە کە تێی بگرێت. پێویستە لە پشکنین و سەردانی یەکەمدا ئەم ڕێکارە دائەنرێت بۆ نەخۆش، بەجوانی ڕەچاو بکرێت و ئەنجام بدرێت و بۆ جاری دووهەم سەردانی بکات کە ئێسکەکە بشکێنێتەوە و بیخاتەوە جێ.

● **بۆ داماڵین و فڕێدانی چڵك و زووخی لووتی شکاو:** ئەوانەی کە لووتیان دەشکێت یا ئازاری پێ ئەگات و خوێن و زووخی تێدا دەمێنێتەوە، ئەو کەسە مینگن دەبێت و مینگەمینگ قسە دەکات. هەر بۆیە حاجی سەعید بۆ ئەمانە ماجوومی هەویر بە ڕۆنی زەنگ و دۆشاوی توو دائەنێت. کەواتە وەك چۆن نیمەنمەك دروست دەکرێت دەبێ وەها هەویرەکە ئامادە بکرێت و ئینجا ڕۆن و دۆشاوی پێوە بدرێت و لە شوێنی مەبەست بگیردرێت. بۆ ئێسکی لووت پێویستە کە ماجوومەکە بە تینی شیلەوگەرمی بخرێتە سەر پارچەیەك و ئینجا بەشێنەیی لەسەر لووتی پان بکرێتەوە و ببەسترێت. نەخۆشەکە هەوڵ بدات کاتی نووستن تا بەیانی بە هەمان شێوە بە پشتدا بخەوێت تا ماجوومەکە کاری خۆی بکات و جیا نەبێتەوە لە بان لووتی. ئەم کارە تا چەند ڕۆژ ئەنجام ببێت تا ئەو جێگەیە کە دەنگی قسە کردنەکەی پاك دەبێتەوە و مینگەی نامێنێت.

● **بۆ بەستنی شوێنی شکان و خستنەوەجێ:** پاش ئەوەی کە ئێسك و جومگەی شکاو یا دەرچوو خرایەوە جێی خۆی، پێویستە کە ببەسترێت. ئەوسا بەستنەوەکە بەم شێوەیە بوو: بۆ یەك شوێنی مەبەست سپێنەی دوو هێلکە لەگەڵ هەندێ هاڕاوەی گیاکام یا ڕۆنیاس لەسەر پەڕۆیەك پان دەکرایەوە و بە دەوری ئێسکەکەدا دەگیرا. ئینجا تەختە یا کارتۆنێك لە دەوری پەڕۆکە دەبەسترا و مامناوەند شەتەك ئەدرا. ڕێژەی توندی و شلیەکەی ئەوەندە بوو کە لە نێوان تەختە و پەڕۆ و ئێسکەکەدا لەقی و هاتوچۆ نەبێت. ئەڵبەت حاجی سەعید ئەوڕۆکە لەبری ئەم تەختە و ماجوومە، باندی چەسپی قرقرەیی کە دەکێشرێت بەکار دەهێنێت. ئەم باندە لە دەرمانخانەکان هەیە و بۆ بەستنی شوێنی شکان و ئازاری ئێسك بەکار دەچێت.

**تێبینی:** بۆ منداڵان و ئەوانەی ئێسکیان نەرمترە لەبری سپێنە دەبێ زەردێنەی هێلکەکە بەکار بهێنرێت. هەروەها بۆ ئەو منداڵی کۆرپانەی کە تازە لەدایك دەبن و شوێنێکیان لەجێ

دەچێت یا دەشکێت نابێ ئەم ماجوومەی لێ بگیردرێت. بەڵکوو لەبری ئەوە لۆکەی نەرم و نوێ بەکار بهێنرێت.

• **بۆ ڕەواندنەوەی خوێن و زووخی دەور مۆرەی مل و پشت یا ئێسک و جومگە**: حاجی سەعید بە قسەی خۆی ئەوانەی کە کێشەی دیسکی مل و پشتیان هەیە یا جومگە و ئێسکێکیان شکاوە یا سواوە و خوێن و زووخی لە دەورەدا کۆ بووەتەوە لە پشکنین و سەردانی یەکەمدا تەنیا چاو لە شوێنی مەبەست دەکات و دەستکاری ناکات. بەڵکوو دەبێت سەرەتا لە یەك هەفتەوە یا ٣ مانگ شوێنی مەبەست ماجوومی تایبەتی لێ بگرێت تا ئەو خوێن و زووخە بڕەوێتەوە ئینجا مۆرەکە ڕاست بکرێتەوە یا ئێسکەکە بخرێتەوە جێ. ئەوەیکە ماوەکەی تا ٣ مانگ داناوە وەك خۆی دەڵێت: دیسکی وا هەیە کە هێندە کۆن بووە و خوێنی تێ زاوە کە کابرا ملی ڕەپ بووە و پشتی کووڕ و کوچ بووە و پێویستە زۆرتر ئەو گیراوەیەی لێ بگیردرێت ئەگینا چاك نابێتەوە. سێ مانگەکە ماوەی لای زۆری ڕەچەتەکەیە. ئەگینا لەوانەیە پاش دوو هەفتە یا یەك مانگ ئازاری شوێنی مەبەست کەم ببێتەوە و خوێنەکە نەمێنێت. پاش بەکارهێنان و تێ گرتنی گیراوەکە، لە پشکنین و سەردانی دووهەمدا حاجی سەعید دەستکاری دەکات و مۆر و جمگەکە دەخاتەوە جێ.

ڕەچەتەکانی ئەم بەشەیە ئەمانەن:

• پێنج کیلۆ [یا زۆرتریش] هاڕاوەی ڕیشەی گیای مێکووکی[1] تازە [پێش گوڵ کردن] بکرێتە ناو ٤٠ لیتر ئاو و هێندە بکوڵێت تا نیوەی بمێنێتەوە. ئینجا پاڵفتە بکرێت و بۆ هەر جار بەکارهێنان یەك لیتری دیسانەوە ماوەی ١٠ خولەك بکوڵێت و لەگەڵ ئاردی جۆ یا گەنم تێکەڵ بکرێت تا شێوەی هەڵوا بگرێت. پاشان هاڕاوەی زەنجەفیل [و هاڕاوەی ڕەشکەی] تێکەڵ بکرێت و لەسەر نایلۆنێك پان بکرێتەوە وەك کەلانە، لە شوێنی مەبەست بگیردرێت. ئەم کارە شەو جارێك و ڕۆژیش جارێ دووپات بکرێتەوە. هەر جارە پاش گۆڕینی گیراوەکە بە ئاو و سابوون جوان بشۆردرێت و هەندێ مەڵهەمی گەرم و تیژی لێ بدرێت و بەئارامی بماڵدرێت. ئینجا دیسانەوە گیراوەی تازەی بخرێتەوە سەری [حاجی سەعید مەڵهەمی ئامریکایی سبیل بەکار دەهێنێت.]

[**تێبینی**: ئەگەر ڕێژەی ڕیشەی گیا مێکووکەکە دە کیلۆیش بێت کێشە نییە. هەروەها ئەگەر مێکووکەکە پاش گوڵ کردن دەست بکەوێت ئەوە هەموو گیاکە بە ڕیشە و گەڵا و

---

١. ئەگەر مێکووك نەبێت دەکرێ گیای چەقچەقە بەکار بهێنرێت.

گـولەوە دەبـێ بکولێـت. ئەگەر مێکـووك بە وشـکی دەسـت کەوت ئەوە دەبـێ ڕێـژەی مێکووکەکە زۆر بێت. چونکا مێکـووکی وشـك حیکمەتـی کەمە و پێویسـتە ڕێژەیەکـی زۆر بکرێتە ناو ئاوەکە تا مادەی مەبەستی لێ دەست بکەوێت].

● بەڕێژەیەکی یەکسان گۆشتی ماسی و خورما و دووگی مەڕ تێکەڵ بکرێت و هەنـدێ خوێی پێدا بکرێت و هەر جارە بە پانـایی و ئەسـتوورایی یەك کەلانە لە شـوێنی مەبەسـت بگیردرێت. شەو و ڕۆژێك دوو جار بگۆڕدرێت و دیسانەوە لێی بگیردرێتەوە. ئەم کـارە دەبـێ هێندە دووپات بکرێتەوە تا ئازار و خوێنی مەیـی و زووخ و لـووی نەمێنێـت و بـڕەوێتەوە، هەروەها گیراوی و جەمامی دەوروبەری شوێنەکە نەمێنێت. [بەپێی پێویست دوو هەفتە تـا دوو مانگ ئەم کارە بکرێت.]

● **بـۆ ڕەوانـدنەوەی خـوێن و زووخـی زۆر کە لە شـوێنێک وەک ئێسکی شکاو کـۆ بـووەتەوە و لەوانەیە ئێسـکەکە خـراپ بێـت و مەترسـی بـڕین و لێکـردنەوەی لەسـەر بێـت، ئەم ڕەچەتە دانەنێت.** تەرسـی مـاکەر هێنـدە بکولێنـدرێت و چەنـد جـار پـاڵفتە بکرێـت و دیسـانەوە بکولێندرێت تا خەست بێتەوە تا وەك دۆشاوی لێ بێت. ئینجا بـۆ هەر جـارە و یەك لیتـری دیسانەوە ماوەی ١٠ خولەك بکولێنیت و ئاردی جۆی پێـوە بـدرێت و لە شـوێنی مەبەسـت بگیردرێت. ئەم گیـراوەیە بۆگەنـدی زۆرە و پێویسـتە نەخـۆش دان بە خۆیـدا بگرێـت. ئەم گیراوەیە حاجی سەعید پێی دەڵێت: خەرمەڵهەم. دەبێ تا کاتی ڕەواندنەوەی خوێن و زووخ و لووی شوێنەکە بەکار بهێنرێت. [بۆ نموونە دەیگێڕێتەوە کە چەند کەس تا ئێستە کاریـان تا نزیکی بڕینەوەی ئێسکی دەست یا لاقیان بووە، بەڵام ئەم گیـراوەیە چڵـك و خـوێنەکەی ڕەوانـدووەتەوە و دیسـانەوە دەوری ئێسـکەکەی خـاوێن کـردووەتەوە و ڕزگاریـان بـووە لە بڕینەوە.][1]

● **بۆ کاتی دەست پێدا هێنـانی پشت و مل و تەقانـدن و خستنەوە جێی مۆرە و جومگەی دەرپەڕیـو و نارێك:** پێویسـتە مەڵهەمـی گەرم و تیـژ بەکـار بهێنرێـت. [بـۆ وێـنە مەڵـهەمە گەرمەکانی دەرمانخانە کیمیاوییەکان کە مەوادی توند و تیـژی وەکـوو مـێخەك و پنـگ و

١. یەکێك لەوانە کە ئەم ڕەچەتەیە بۆی بەکار هێنا، ئەشرەف تەختفیرووزە خەڵکی باقلاوا (خالۆی بەندە) بوو. ساڵی ١٣٨١ ئێسکی بازووی دەستی گردەبڕ شکا و لە خەستەخانەی ساسان لە تاران گرتیانەوە. پاش گیرسانەوە شوێنی شکانەکە بووە گرێ و لە بەینی ئێسکەکە زووخ و کیم مەنەری کرد و کۆ بووەوە. ڕێنمایی پزیشکان کاریگەر نەبوو. حاجی سەعید ڕەچەتەی تەرسی ماکەر و ئاردی جۆی بۆی دانا و ماوەی دوو هەفتە بەکاری هێنا. لك و خوێن و زووخەکە ڕەوییەوە و ئێسکەکە خاوێن بووە و ئازاری نەما و چاك بووەوە.

شـارێحان و ڕۆزماریـان لەگەڵە.] ئەم مەڵهەمـانە هەتـا تیژتـر بێـت کـاریگەرترە و شـوێنی مەبەست گەرم دەکـات و ئـازاری شـوێنەکە کەم دەکـاتەوە و خـوێنەکەی دەرەوێنێـتەوە و بەری ئەدات. حاجی سەعید باسی لەوە دەکرد کە مـاوەیەکە خەریـکە تـاقیکردنەوە لەسـەر ئەوە دەکات کە بۆخۆی بە گیا و گوڵی ناوچەکەی خۆیان مەڵهەمێ دروست بکـات. بـۆ ئەم کارە تا ئیستە هەموو گژوگیای توند و تیـژی دەرەویـانی کـۆ کـردووەتەوە و کوڵانـدوویە و خەریکە بیکاتە مەڵهەم، بەڵام هێشتا بە ئامانجی خۆی نەگەیشتووە.

• **بۆ ئەو کەسانەی ڕەنگی نۆخاعیان ئازاری پێ دەگـات [بەڵام ڕەنگەکە نەپچڕاوە] و کانـاڵی خوێنی دەوروبەری بەسترابێت:** دەبـێ کەتیـرای گـوێنی و جەوی لاسـکی توێسـی لانسـار بتوێنیتەوە و لەگەڵ ئاردی گەنمی بەهاروو تێکەڵ بکرێت و بخرێتە سەر شـوێنی مەبەسـت تا ماوەی نزیك بە مانگێك یا زیاتر. ئینجا جاری دووهەم سەردانی حـاجی سـەعید بکـات تـا دەستکاری بکاتەوە.

• **بۆ ئەو کەسانەی پراسوویان شکاوە:** لە پشکنینی یەکەمدا حـاجی سـەعید دەسـتکاری دەکات و بە ڕاکێشانی پێستی سەر پراسووەکە، ئێسکی پراسووەکە ڕاسـت دەکـاتەوە. ئینجـا دەبێ زەفت و قیر بخرێتە سەری و تا ماوەیەك بەو شێوە ببەسترێت. ئەڵبەت دەکرێت زەفت و قیرەکە بە باندی چەسپی قرقڕەیی دەرمانخانەکانیش ببەسترێت.

• **خواردنی گیای چەقچەقە و قازیاخە:** بۆ ئەوانەی وا کێشەی خوێنیان هەیە و پێسـتیان خورووی هەیە ئاوی چەقچەقە یا خۆراکی گیای قازیاخە باشترین دەرمانە.

• **چایی ڕیشەی چەقچەقە:** ئەوانەی چەوری جەرگیان هەیە خـواردنی چـایی چەقـچەقە بۆ ماوەی مانگێك یا زیاتر باشترین دەرمانە. بۆ چایی چەقچەقە ڕیشەی وشکی گیاکە بەکـار دەهێنرێ. چونکا ڕیشەی تازەی تاڵە و ئازار دەگەینێ بە ناوسك.

• **خواردنی گیـای قـازیـاخە:** ئەو کەسـانەی وا پێسـتیان نەخۆشـی کـوارگ و بیـروو دەر ئەدات باشترین دەرمان بۆ ئەمانە خواردنی گیای قازیاخەیە. دەکرێـت تـا چەنـد مانـگ ئەم گیایە بە کاڵی و کوڵیوی یا ئاوتکەکەی بخورێت.

• **بۆ لابردنی لووی بالووکە یا لکێک کە بەهۆی نەخۆشی بیروو یـا کوارگەوە لەسەر پێست دەرهـاتووە:** بۆ ئەم مەبەستە پێویستە بە پاشۆرێك لووەکە بسوویت تا سوور ببێتەوە و پێستی سەرەوەی لا ئەچێت. ئینجا دارە گـوێزی کـۆن کە لـە سـرمیچی خـانوو بەتـایبەت دیـوی تەندوور بووە و دووکەڵی خواردووە، سەرێکی بسووتێنی و لەو سـەرەکەیەوە ئـاو و ڕۆنێکـی ڕەنگی دەر ئەدات. ئەو ئاوە بە لۆکەیەك لە شوێنی مەبەست بدەیت.

## ڕەچەتە دەرمانیەکانی خات بەهێ ئالانی لە نەڵاس

بۆ ئامادەکردن و نووسینی ئەم وتارە ڕێکەوتی ١٣٩٧/٠٣/٢٣ چووینە ماڵی وەستا ئیبراهیم نەجاڕ لە شارۆچکەی نەڵاس سەر بە شارستانی سەردەشت. باس و ناوبانگی داودەرمان و حەکیمی خات بەهێ خێزانی ئەو وەستایە تەنانەت تا سنوورەکانی دەرەوەی سەردەشت چووە. وەك خۆی باسی دەکرد تا ئێستەکانێ چەندین کەس هاتوون هەموو وردەکاری گرتنەوە و پێچانەوەی دەرمانەکانم بۆیان بەڕوونی گوتووە و فێریانم کردووە لە ڕاهی خودا. بۆ نموونە خوێندکاری کارناسی باڵای گیادەرمانیەکان کە دانشتووی نەڵاسە و هەروەها کابرایەکی تورکی ئازەرەی و چەندین کەسی تر لە سەردەشت و ڕەبەت و شوێنەکانی ترەوە.[١]

بەهیە مەلازادە کچی مەلا حەمید کوڕی مەلا عەبدوڵا کوڕی مەلا ئەحمەد خەڵکی گوندی سنجوێ ناوچەی ئالانی سەردەشتە. بەهیە خانم کە خەڵك بە خات بەهێ دەیناسن لەدایکبووی ساڵی ١٣٣٦ هەتاوییە. بنەماڵەی ئەم خاتوونە تا چەند پشتیان لە دەواودەرمان و چارەسەری نەخۆشان دەستی شەفابەخشیان هەبووە. وەك خۆی دەیگێڕێتەوە باوك و باپیرانی دەرمانی گول و کوێری و پیسیان زانیوە و دوور و نزیك لە ناوچەکانی بانە، سەردەشت، ماوەت و ڕانیە سەردانیان کردووە. چەند پشتی خات بەهێ هاوکات کاری حەکیمی و مەلایەتی کردووە و مەڵبەندی کار و ژیانیان لە سنجوێ و کاکۆسانی ئالان بووە. خات بەهێ لە دایکەوە دەچێتەوە سەر بنەماڵەی نەقشبەندی ئالان. نەقشبەندیەکانی ئێرە نەوەی شێخ ئەحمەدی سەراوین. ئەم شێخە خەڵکی سوبحان ئاغای شارەزوور بووە. کە

---

١. لە ئەنجامی وتووێژەکەدا چەند جار ئەم قسەیە دووپات کردەوە کە: بریا ئەم دەرمان و بەرهەمانەم تۆمار دەکرد یا کەسێك وەك تۆ بە ناوی خۆم و باب و باپیرانمەوە دەینووسی با نەفەوتێن. لە ناوچەی سەردەشت دوو کەسی تر هەن کە ئەوان دەرمانی سووتانیان هەیە. یەکیان خانمێکە لە ئاوایی داوداوێ و ئەوی تر لە ئاوایی کانی‌بی.

بووەتە خەلیفەی شێخ سەراجەدین و دواتر بە فەرمانی شێخ هاتووەتە ئاوایی بێژوێی ئـالان. شـێخ ئەمـین کـوڕی شـێخ ئەحـمەد ئەویـش دەسـتێکی بـاڵای بـووە لە دەرمـانگەری و داودەرمانی کوردەواری.

خـات بەهـێ وەك خـۆی باسـی دەکـات زۆربەی ئەو ڕەچەتـانەی وەك میـرات لە بنەماڵەکەیەوە بۆی بە جێ ماوە، هەروەها ئەزموونی هـۆگری و تێکۆشـانی ژیـانی خۆیشـی خستووەتە سەری و بووەتە ئەمانە کە ئێستە بـێ بەرامـبەر و مـز و مافێـك بەخـۆڕایی و لە ڕاهی خودا پێشکەشی دەکات. هەر کەس بۆ تاوێك بچێتە خزمەت ئەو شـۆڕەژنە هەسـت بە دڵفراوانی و دڵسۆزی و دڵپاکی ئەو ئینسـانە دەکـات و پەی بەوە دەبـات کە شـوکر هێشـتا کەسانێك لەو کۆمەڵگا پڕ ژاوەژاو و شڵەژاوەدا ماون ڕەنج و ماندوویی بەر سوورەتاوی هـاوین و گـرمەی هەورەهەڵای بەهـار بە دڵ قەبـووڵ دەکەن گژوگیـا کـۆ بـکەنەوە و بە پـارەی گیرفانی خۆیان لە بازاڕ ڕۆنی زەنگ و تووی گیا و دەرمانی وشـك بکـڕن و ئاوتـك (عەرەق) بگرن و بێ بەرامبەر تەنیا لەبەر هەستی خێرخوازی بیدەن بە نەخۆش و دەردەداران. ڕۆژانە ژن و پیاوی نەخۆش سەردانی ئەو خانمە بەڕێـز و حەکـیمە دەکەن و دەردی خۆیـان دەر ئەخەن و دەرمانەکەیان وەردەگرن و تەنیا نزایەکی پاك داوا ئەکەن بۆ خات بەهێ و ماڵبـات و باوك و دایکی.

## پسپۆڕییەکانی خات بەهێ

• **کلک گرتنەوە:** ئەگەر سەرنج بدرێتە دوایین خاڵی مۆرەی پشـت لە خـوارەوە، هەمـان کۆتایی ئێسـکەکە کە قـنج و سـێگۆش و هێنـدێ نـووك تیـژە، ئەوە بە کـوردی کلـك یـا کلینچکەی پێ دەگوترێت. ئەوانەی بە منداڵی زۆر بزۆز و هاروهاجی دەکەن یا ڕێـکەوت لە شوێنێك بە پشتەقووندا بە زەویـدا ئەکەون لەوانەیە ئەو کلیـنچکە بشـکێت یـا ئـازاری پـێ بگات. هەندێ جار یەکسەر دەشکێت[1] و لە ئاراستەی بڕبڕەی پشت جیا دەبێـتەوە و ئـازار و ژانی زۆر دەبێت. خات بەهێ نیشانەکانی نەخۆش بۆ ئازار و شکانی کلك کەوتن بەم شێوەیە بـاس دەکـا: نەخـۆش ئەگەر لەسـەر کـۆمی دابنیشـێت هەسـت بەوە دەکـات چەقڵـێ یـا

١. ڕێکەوتی ٩٧/٠٣/١١ کە سەردانی حاجی سەعید شکستەبەندی بەئەزموونی ئاوایی دەرەویانی ناوچەی مەریوانم مەریوانم کرد، ئەویش باسی لە نموونەی چەند کەسێکی کرد کە بەهۆی شکان و ئازاری کلینچکەی پشتەقوونیان هاتوونەتە لای، بەڵام حاجی دەیگوت کە ئەو شوێنە کە شکا دەبێ نەشتەرگەری بکرێت و لا بچێت.

چیلکەیەك لەو شوێنە پێیدا هەڵدەچەقێت، هەمیشە وا ئاسوودەیە لەسەر لایەکی دابنیشێت و خۆی بە سەر ڕانێکیدا بخات، ئەگەر بە پشتدا بخەوێت و گوشارێك بخاتە سەر نێوان پشتوێنە و کۆمی ئەوە ژانێکی زۆری پێ دەگات. ئەوانەی ئەم نیشانانەیان تێدا هەبێت ئەوە کلکیان کەوتووە و دەبێ بیگرنەوە. خات بەهێ بۆ خانمان خۆی کاری دەستیەکەی دەکات، بەڵام بۆ پیاوان ئەوە بە هاوسەر یا دایکی نەخۆش نیشان ئەدات کە ئەنجامی بدەن. گرتنەوەکەی بەم شێوەیە: نەخۆش وەك حاڵەتی سوجدەی نوێژ خۆی شل دەکات. ئینجا هەندێ لە مەڵهەمە چەورەکەی خات بەهێ کە لە خوارەوە باسی دەکەین، لە دەور و ناوەوەی کۆمی دەکرێت. بە ئەندازەی یەك بەندی قامکێك یا هەندێ زیاتر قامك دەبرێتە ناو کۆمی و ئینجا بەرەو دیوی سەرەوە فشار ئەدرێت تا ئێسکەکە جێی خۆی بگرێتەوە. پێویستە کەسی نزیکی نەخۆش لە ماڵەوە دوو یا سێ جاری تر ئەم کارە بکات یا دیسانەوە سەردانی خات بەهێ بکات تا ئەو کارە دەستیە دووپات بکرێتەوە. پارێزەکانیشی تا چەند ڕۆژ یا هەفتەیەك ئەمانەن: هەوڵ بدات کە بەسەر ئەو شوێنەدا نەکەوێت و گوشاری پێ نەگات، هەروەها لەسەر هەمان لا کە ئاسوودەیە دابنیشێ و ڕابکشێت.

• **ناوک گرتنەوە (نێوک هێنانەوە)**: دەستەواژەی ناوك کەوتن و ناوی گرتنەوە زۆرتر تایبەتی ناوچەکانی ئەردەڵان و شارەزوور و کەڵهوریيە. لە سەردەشت و ناوچانەکانی سۆران و موکریان، بە نێوك هێنانەوە و نێوك چوون دەیناسن. شێوازی خات بەهێ بۆ گرتنەوەی ناوك بە دوو شێوەیە:

**یەکەم**: کەسەکە درێژ ڕادەکشێت و دەست و لاقی لە پاڵ یەکەوە جووت دەکات. پێویستە ئەو کەسە هەوڵ بدات نووکی هەر دوو قامکە گەورەی لاق و دەستی لە یەك نزیك بکاتەوە. خات بەهێ سەرەتا لای سەرەوە هەر دوو دەستی نەخۆش دەکێشێت بۆ دواوە و قامکە گەورەکانی جووت دەکات. لە ڕاکێشانی دوو قامکەکەدا دیارە کە کام قامکی لەوی تریان کورتترە. جا بە لای کورتیەکە دەبێ قامکی یا مەچەکی دەستی بگری و دوو یا سێ جار ڕایتەکێنی. ئینجا ئەو کەسە دەبێ بە هەمان شێوە دەستی بە درێژارە لە پشتی سەریەوە جووت بکات و نەجووڵێت. لای خوارەوە ئەمجارە قامکی دوو لاقی جووت دەکات و بە باری کورتیەکەدا ئەو لایە ڕادەتەکێنرێت. پاشان دەبێ نەخۆش هەستێتەوە و لەسەر ئەژنۆ دابنیشێت تا هەر دوو لاقی ئەتەزێت. ئینجا نەخۆش هەست بە هێوربوونەوەی ژانی ناوسکی دەکات، هێزی ئەژنۆی دەگەڕێتەوە، وزە و وازی دێتەوە بەر، تەڕایی و سوورایی دەکەوێتە سەر لێوی، دەتوانێت نان بخوات و کاتی خۆی تینوی بێت و ئاو بخواتەوە.

**دووهەم:** نەخۆش بە دەما ئەخەوێت. وەستا هەر دوو دەستی درێژ دەکات و لای کورتی دیاری دەکات کە ناوکەکە بە کام لادا کەوتووە. پێویستە نەخۆش دەستی لە تەنیشتیەوە و لاقی ڕێك و ڕاست درێژ بکات و خۆی کرژ و شل بگرێت تا وەستا چاکتر بتوانێت کاری دەستی ئەنجام بدات. ئینجا وەستا لە بەشی پشتوێنەی نەخۆش بەنەرمی و شێنەیی پێستی هەڵدەگرێ و ڕایدەکێشێ. بەجۆرێك کە ئازاری پێ نەگات. بەو بارا کە کورتە زۆرتر کاری دەستی ئەنجام دەبێت کە ڕێك بێتەوە. لە کۆتاییدا نەخۆش هەڵدەستێت و لەسەر ئەژنۆ هەندێ دادەنیشێت تا بتەزێت. ئەم شێوازە خات زەهرا خێزانی کاك حەسەن عەبدوڵازادە لە ئاوایی بێشاسب، ئەویش ئەنجام ئەدات.

● **فریشک گرتنەوە (فرچک هێنانەوە):** خات بەهێ فرچکی بە "پچك" بێژەی دەکرد. هەرچەند ئەم وشەیە لەم ناوچەیە فرچکیشی پێ دەگوترێت. لای سنە و هەورامان بە فریشك دەیناسن. حاڵەتەکانی فریشك کەوتن لای خات بەهێ ئەمانە بوون: منداڵ تووشی سکچوون و ڕەوانی زۆری ناوسك دەبێت، ئاستی گرسایی پیساییەکەی منداڵ زۆر شلە و ئەگەر ماوەی فریشك کەوتنەکە زۆر بێت ئەوە پیساییەکەی تراو دەبێت، منداڵە تووشی ناوسکێشە، بێ حاڵی، بێوازی، کەمجووڵەیی و گریانی زۆر دەبێت. تا تەمەنی ٤ و ٥ساڵان ئەگەر منداڵ تووشی ئەم حاڵەتانە بێت ئەوە پێی دەڵێن: فریشك کەوتن. دواتر دەبێتە ناوك کەوتن. واتا تا کاتێ بتوانرێت منداڵە لەسەر دوو لاق ڕابکێشێت و تاوێك دەست بخەیتە سەر نێوکی تا ڕەگەکەی دەست بە لێدان دەکاتەوە و ئینجا بە هەمان شێوە منداڵەکە سەراوبن بکەیتەوە ئەوە بە فریشك دەیناسن. ئەگینا فریشك و نێوك یەك حاڵەت و نیشانەیان هەیە. پاش ئەوەی کە منداڵە سەراوبن کرایەوە دەبێ هەندێ لە پشتوێنەی کەمەریەوە لە هەر دوو لای مۆرەکانی، پێستەکەی بەرەو بان بکێشرێت.

● **مەلاشوو خستنەوەجێ:** ئەو منداڵانەی وا هێشتا ساوان و ئێسك و پێستی سەر و بەدەنیان نەرمە، لەوانەیە بەهۆی زەربە یا تەوژمێك مەلاشووی سەریان بەرەو ناودەمیان دابکەوێت. لە ئەنجامی ئەو کەوتنەدا ئەوانە تووشی قرخەقرخ دەبن. خات بەهێ دەڵێت قامکی ئیشارەم هەندێ هەنگوینی پێوە ئەدەم و ئینجا مەلاشووی ناودەمی منداڵەکە بەرەو بان فشار ئەدەم تا جێی خۆی دەگرێتەوە.

● **سەر گرتنەوە:** بە هەمان شێوەی باوی کوردەواری کە چارۆکەیەك بە سەری نەخۆشدا ئەدرێت و بە پەتێکی توند ئەبەسترێت، ئینجا بە بەند و دەرزیەك باری کەوتنەکەی دەستنیشان دەکرێت. بەو بارە چەند جار چارۆکەکە بەرەو خوار ڕائەتەکێنرێت. پاشان دەبێ

نەخۆشەکە سەر بخاتە سەر باڵنجێك تا سەری ئەتەزێت. پاشان چارۆکەکە دەکرێتەوە و ئیدی نەخۆش هەست بە چاکبوونەوە و سووك بوونی سەر و هێوربوونەوەی ژانەسەرەکەی دەکات.

• **بەردانی گیراوی:** ئەوانەی وا تووشی گرس و گیراوی ناوسك دەبن و ناتوانن هیچ بخۆن و کاری دەستبەئاویان بۆ ناکرێت. ئەمانە دەبێ ٣ ڕۆژ بە نەخورێنی دەست بە سکیدا بهێندرێت. هەروەها دووری بکات لە خواردنی خۆراکی گرس و قەبز.

• **ڕەچەتە گرتنەوە** بۆ چەند نەخۆشی وەکوو زارێشە، کێشەی سووڕی مانگانەی خانمان، چڵکی منداڵدان و ئەندامی پێوەندیدار لە خانمان، ژانەسەر، برین و ئازاری گەدە، ژانی مسووڵدانە، ئارامبەخشی ئەعساب، کەمبوونی شیری دایکان، سووتان و لابردنی لك و لووی ئەستوور و هەڵماسیو، هەروەها تیماری نەخۆشی ئاژەڵەماڵیەکان.

• **ودم بۆ برینی بالووک و بیرۆ:** خات بەهێ دەڵێت لە باوك و باپیرانمەوە ودمی برینی بالووك و بیرۆم پێ براوە و ئیجازەم پێ دراوە کە بالووك و بیرۆ ببڕمەوە. بۆ ئەم کارە ئەوانەی بالووك یا بیرۆیان هەیە چوارشەممانە حەوت جۆ و حەوت خوێ دەهێنن و دۆعای پێدا دەخوێنم. ئینجا خوێ و جۆکە لە گڵ دەخەم. بەم جۆرە بالووك و بیرۆکە هەڵدەوەرێت.

## گرتنەوە و ئامادەکردنی دەرمانەکان

• **مەڵهەمە چەورە:** ئەم مەڵهەمە کە بە دەرمانی سووتانیش دەناسرێت گیراوەیەکی چەند کارەیە و خات بەهێ ساڵێك دوو یا سێ جار دروستی دەکات و بۆ نەخۆشانی بەکار دەهێنێت. زۆرترین نەخۆش بۆ ئەم دەرمانە سەردانی دەکەن. پێکهاتەکانی: پنگ، کوڵووکی هێرۆ، جاترە کێویلە، پیواز، ڕۆنی زەنگ، دووگی مەڕ، مازووی سەوز و بنێشتی کاڵ. سەرەتا دەبێ ڕۆنی زەنگ و دووگە مەڕەکە قاڵ بکرێت و پاڵفتە بکرێت. پاشان پنگ، کووڵووکی هێرۆ، جاترە کێویلکە و پیوازەکە دەکرێتە ناو ڕۆنەکە و هێندە سوور دەکرێتە تا وەك پووشی لێ دێت. پاشان پاڵفتە دەکرێتەوە و هاڕاوەی مازووی سەوز و بنێشتە کاڵی پێوە ئەدرێت تا هاوشێوەی مەڵهەمێکی چەوری لێ دێت. ئەم ماجوومە بە دەرمانە سووتاو یا مەڵهەمە چەورە دەناسرێتەوە. ڕێژەی دەرمانەکان دەبێ بەم شێوە بێت: پنگ و جاترە و گوڵە هێرۆ و پیوازەکە بە ڕێژەیەکی یەکسان، ئەگەر ئەمانە ٢٠ بیست کیلۆ بن ئەوە یەك کیلۆ هاڕاوەی مازووی سەوز و یەك کیلۆ بنێشتە کاڵی تێ دەکرێت. ڕێژەی ڕۆنەکەیش دەبێ هێندە بێ کە ئەو بیست کیلۆ دەرمانەی تێدا سوور ببێتەوە.

ئەم مەڵهەمە بۆ سووتانی پێست، برین، ڕەشبوونەوەی لاق و دەست، خوراوی و ئـاڵۆش، چەورکردنی کۆمی بۆ مایەسیری و کلك گرتنەوە، دەبێت. هاوکـات لەگەڵ بەکارهێنـانی ئەم مەڵهەمە ئاوتکی گیاکانیشی بە تێکەڵی بە نەخۆشان ئەدات، وەکوو: ئـاوتکی پنـگ، جـاترە، گوڵە حاجیانە، تۆڵەکە، فریزوو و گەزگەسك. هەروەها لەگەڵ چەورکردنی ڕەشبوونەوەی لاق و دەست و شوێنی سووتان، دەبێ کەلەرم یـا گەڵای ترشـۆکە گـایەی لـێ بگرێـت تـا ئەو شوێنە بە چەورکردنەکە کە پێستەکەی تازە دەبێتەوە کەلەرم یا گەڵا ترشۆکەکە شێداری و تەڕایی پێ دەبەخشێت و پێستەکە ناقەڵشێتەوە.

● **دەرمانی زارێشە**: پێکهاتەی ئەم ماجوومە ئەمانەیە: سـەلکی گیـای ڕەبنـاڵۆك، مـازووی سەوز، مێخەك و زاخی سپی. ڕیژەی زاخ و مێخەکەکە هەندێ زیاتر دابنرێـت و وردکـراوی مازووە سەوزەکەیش چارەکێ زاخەکە بێت. کەسێك وا تووشی برین و هەڵزڵەپیـانی نـاودەم دەبێت (بە فارسی: آفت دهات) ڕێـژەی یەك کەوچـك چێشـتخـۆری لەم مـاجوومەی پـێ ئەدرێت تا چاك دەبێتەوە. هەر جارە بە ئەندازەی خوێی جامی چێشـتێك – هێنـدەی کە بە قامکە گەورە و دۆشاومژەیەك (ئیشارە) یەك جار هەڵـدەگیردرێت – بخـاتە نـاو دەمـی و لە دەم و ددان و زمانی وەر بدات و تا چەند چرکەیەك تفی نەکـاتەوە. ئەم دەرمـانە بەتـایبەت مازووەکە پێستی نـاودەم کـرژ و سـفت دەکـاتەوە. ئەم دەرمـانە خـات زەهـرا لە بێشاسـب ئەویش بە نەخۆشانی ئەدات.

● **هاڕاوەی تووی ڕازیانە و نەبات**: تووی وشکی ڕازیـانە و نەبـات بە جیـا دەهـاڕێتەوە و چەشنی قاووتی لێ دەکات. ئینجا بەپێی پێویست ٤ تا ٥ کەوچکی چێشـتخـۆری دەکـاتە ناو قوتوویەك و بە نەخۆشی ئەدات. خاڵێکی گرینگ لەم هاڕاوە ئەوەیە کە هاڕاوەی نەبـات و ڕازیانەکە لێك جیا بوون. چونکە دەیگـوت لەوانەیە کەسـێك ناوسـکی زۆر بێشـێت و برینـی گەدەی بێت ئەوە دەبێ نەباتی هەندێ زۆرتر بێت یا کەسـێك نەخۆشـی شـەکرەی هەبێـت ئەوە ڕێژەی نەباتەکەی کەمتر لەبەرچاو دەگرم. ڕێژەی خواردنی یەك کەوچك چـایی خـۆری بەیانیان بە نەخورێتی و شەوانە پێش نووستن. خواردنەکەی هەم بە ویشکی دەبێـت و هەم دەکرێت بە ئاوەوە بخورێت. ئەم هـاڕاوەیە بـۆ ئەوانەی وا برینـی گەدەیـان هەیە (هەروەهـا کێشەی هەرسی خواردن و ترشەڵۆکی ناوسك)، خانمانێك کە سووڕی مانگانەیـان نـاڕێکە یـا چڵکی منداڵدانیان هەیە، کەسانێك وا چڵك و زووخ لە لاق و دەستیان کـۆ دەبێـتەوە یـا بە هەر شێوەیەك کە چڵك لە لاشەیاندا کـۆ دەبێـتەوە، بە کـار دەچێـت. لەگەڵ خـواردنی ئەم هاڕاوەیە دەبێ ڕێژەی دوو جێگە نۆشابە ئاوتکی تێکەڵە (عرق مخلوط) بخـواتەوە. ئـاوتکەکە

ڕۆژێك ٢ یا ٣ جار و هەر جارە یەك پەرداخی چایی. ئاوتکی تـێکەڵەکە لە تـێکەڵاو کردنـی یەکسانی ئەم ئاوتکانە پێك دێت: پنگ، جـاترە، فریـزوو، قەزوان و گـوڵە حاجیـانە. ئەڵـبەت ئاوتکی قەزوان بۆ کەمکردنەوەی ترشەڵۆکی ناوسك زۆر بەسوودە.

● **ئاوتک (عەرەقی گیایی)**: خـات بەهـێ بۆخـۆی مەنـجەڵ و ئـامێری سـادەی گرتنـی ئاوتکی گیایی لە ماڵەوە داناوە و ڕۆژانە دەیگرێت. ئەو گیایانەی ئاوتکیان دەگرێت، ئەمـانەیە: پنگی کانی، جاترە کێویلە، تۆڵەکە، گەزگەسك، گوڵە حاجیانە (بەیبوون)، فریزوو (هەرێـز) و قەزوان [و یا پێکەوە لەگەڵ گەڵاکەی]. ئەڵبەت بۆ نەخۆشی خانمـان و ناوسکێشـە و هەروا چڵکی بەدەن پێکەوە ئاوتکی چەند گیایان پێ ئەدات لەگەڵ مـاجووم و گیـراوەکە. بۆخـۆی ئەو ئاوتکانە وا پێکەوە بە نەخۆشی ئەدات ناوی ناوە: تێکەڵە.

● **ڕەچەتەی زیادبوونی شیری دایکـان**: ڕێنمایی کردنی دایکان بە خواردنی خـواردەمەنی و چێشتی تراو، هەروەها خواردنی ماستاو و هێلکاو. چێشتی هێلکاو بەم شـێوە لـێ دەنرێـت: ڕۆن و پیواز سوور دەکرێتەوە، ئینجا ئاو دەکوڵێندرێت و هێلکەی شلەقاوی تـێ دەکرێـت و ڕۆن و پیوازەکە و هەندێ خوێی تێ دەکرێت و دەخورێت.

● **ڕەچەتەی ژانەسەر**: بخورکردنی (هەڵـم هەڵمژینـی) تـوێکڵی پیـواز و گـوڵە حاجیـانە، پاشان تێگرتنی خووساوی کوڵووکە هێرۆ لە سەر شەوانە تا بەیانی. هەروەها خـواردنی ٣ یـا ٤ جار لە ڕۆژدا چایی گوڵەباخ، گوڵە شیلانی زەرد و گوڵە حاجیانە (بە ڕێژەیەکی یەکسان).

● **ڕەچەتەی شکاندنی ئازاری پرۆستاتی پیاوان**: خواردنەوەی ئاوتك یا چایی گەزگەسك.

● **ڕەچەتە بۆ کەچەڵی و بیرۆی پێست**: ڕۆژانە ٢ یا ٣ جار گیراوەی کوتراوی سەلکی سیر و هاڕاوەی گزگل (گڵوان) و کەمێك خوێی تێ بگیرێت چاك دەبێتەوە.

● **ڕەچەتە بۆ مایەسیری**: هاڕاوەی گزگل لەگەڵ بەتادین هاوشێوەی خەنە دەیگـرێتەوە و لە دەوروبەر و ناوەوەی کۆمی نەخۆشەکە بکرێ.

● **ڕەچەتە بۆ هەستیاری (حساسیت) پێست**: بۆ ئەو ژنانەی وا هەسـتیاری پێسـت ئەگـرن دەکرێت گیراوەی ماست و خوێ و هاڕاوەی گڵوان لە پێستەکە بدرێت.

● **ڕەچەتە بۆ گولی و گرویێی ئاژەڵ**: ئەو ئاژەڵانەی پێستیان گـروێ دەبـێ و دائەوەشـێت. دەکرێت پاڵاوتەی پاشماوەی ئاوی ئەو گیایانە وا ئاوتکەکەی گیرا، لەگەڵ هاڕاوەی مـازووی شین تێکەڵ بکرێت و هەڵیسوویت بە پێستە گرویێیەکە.

● **ڕەچەتە بۆ تەبەقـی مانگـا**: هـاڕاوەی خـوێ و تـرش و زاخ بکـرێتە نـاو ئـاو و لاق و دەستی مانگاکەی تێ هەڵبکێشیت یا ئەگەر بە زار گرتبێتـی گیـراوە یـا هـاڕاوەکە بکەیـتە

## وەستا موحەمەد ڕەحیم کەڵەکەجان چارەسەرکاری گیراوی ناوسک

لە کۆمەڵە گەشتەکەی مەریوان ڕێکەوتی ١٣٩٧/٠٣/١٧ چوومە ئاوایی کەڵەکەجان لە دەشتی کـاکی بە کـاکی بەری زرێـوار. هەوروهەڵا و ڕۆژێکـی بـارانی بـوو. پرساپرسـا لـە دەشـتی مەحموود ئاغای بەر ئاوایی کەڵەکەجان چوومە خزمەت کاك موحەمەد ڕەحیم بـاب. پێشـتر لە سەردانێکی کـاك مـوحەمەد خـاکی لە دەرمانخـانەی گیـایی شـەفای مەریـوان هەواڵـی پسپۆڕی و کاری دەستی ئەو پیاوەم ژنەفتبوو. گـوایە هەر لە کـۆنەوە لە نـاوچەی مەریـوان باوە کە خەڵك بە منـداڵ و جـوان و پیـرەوە کە تووشـی گیـراوی بـوون سـەردانی بـاب و باپیرانی کاك ڕەحیمیان کـردووە لە کەڵەکەجـان. بەخـتەوەرانە لەو دانشـتنەدا لەگەڵ کـاك موحەمەد ڕەحیم، زۆر پوخت و تەواو ناوەرۆك و ڕواڵەتی بابەتەکەم دەست کەوت.

کاك موحەمەد ڕەحیم دەیگێڕێتەوە کە چارەسەری گیراوی و نـاوك گـرتنەوە نەریتێکـی بنەماڵەیی و میراتی ئەوانە لەم ئاواییە و لە باپیرانیەوە بۆیـان بە جـێ مـاوە. ئەم پسـپۆڕییە پیشەیەکی پشتییە و تەنیا بەرەی نەوە و نەوەزادەی پشت دەتوانێت لەو بنەماڵەیە چارەسەر بکات و دەستی شەفا و چابوونەوە ببەخشێت. ئەم پیاوە باس لەوە دەکات کە باوکی باپیری واتا قوربان، یەکەم کەس بووە کە دەستی بەو وەستایی و پسپۆڕییە کردووە. ئەو دەستپێکە چیرۆکێکی لە پشتە کە گوایە بەم جۆرە ئەم بنەماڵەیە بوونەتە پسپۆڕی ڕەهاکردنی گیـراوی و گرتنەوەی ناوك. ئێژن: سەردەمانی زوو دەشتی کەڵەکەجـان ڕێـگەی هـاتوچۆی کـاروانی جنۆکە و ئەوانیەل بووە. بەهارێ کاروانێك دێن و تێ ئەپەڕن یەکێـك لەوانە وە بەر دەسـتی باپیرە قوربان دەکەوێت و ئەویش دەرزی بەرۆکێ ئەکاتە بەر سینەیدا و بەم شێوەیە لە چاو کاروانیەکانی تر نوقم دەبێت و لای خەڵکی ئاشکرا دەبێت. ساڵێك لە بەردەستی کاك قوربـان ڕەنجـبەری دەکـات. بەهـار کە داتێـتەوە و کـاتی گـوزەری کـاروان دەبێـت ڕەنجـبەرەکە دەپاڕێتەوە کە ئازادی بکات. ئەویـش بەزەیـی پیـا دێـتەوە و بەری ئەدات. جنـۆکەکە بـۆی دەپاڕێتەوە کە بەرامبەر بەو دیلکردنەی هەتاهەتایە ناومـاڵی ئەو بنەمـاڵەیە شـپرز و داپژیـاو بێت، بەڵام بۆ وڵامدانەوەی چاکیەکانی خـاڵۆ قوربـان و برسـی نەهێشـتنەوەی لەو سـاڵەدا دەڵێت کە ئەوە من چووم و ئەتـۆیش دەسـت بە چـارەکردنی گرفـت و گیـراوی ناوسـکی

خەڵك بکە و پشت بە خوا ببەستە کە ئەم نەریتە ئیتر لە نەوە و وەچەدا نابڕێتەوە.[١]

ئەگەر گەرەکمان بێت بزانین کە داهاتنی ئەم نەریتە لەم بنەماڵە کەنگێ بووە بە بەراورد دەتوانین لێی نزیك بینەوە. کاك موحەمەد ڕەحیم ساڵی ١٣٢٦ هەتاوی لەدایك بووە و ساڵی ١٣٩٠ هەتاوی کاك مەحموودی باوکی لە تەمەنی ١٠٠ ساڵیدا کۆچی دوایی کردووە. کاك مەحموود لە بێشکەدا بووە کە مەعرووفی باوکی مردووە. ئەوکاتە کاك مەعرووف لە تەمەنی نزیك پیریدا بووە واتا دەوری ٥٠ ساڵیدا. بەم جۆرە دەوروبەری١٢٤٠ هەتاوی مەعرووف کوڕی قوربان لەدایك بووە. کەواتە ویدەچێ کە ئەم نەریتە زیاتر لە ١٥٠ ساڵە لە ناو بنەماڵەیەدا باوی هەبێت. پشتاوپشت ئەم نەریتە بۆ کوڕ و کچەکانیان گوازراوەتەوە. ئەڵبەت تا کوڕ یا کچی گەورە لە ژیاندا بێ ئەو دەستی لە ناو ئەم کارەدا دەبێت. هەمیشە پیاو کاری گرفتی پیاوی کردووە و ژنیش کاری خانمەکان. کاك ڕەحیم ئێستاکە کچە گەورەکەی واتا مریەم خانم کە تەمەنی ٣٠ ساڵە لە مەریوان دادەنیشتێت ئەو کارە دەکات. پوورە خەدیجە کە لە باوکی گەورەتر بووە و ساڵی ١٣٨٠ کۆچی دوایی کردووە لە سەردەمی باوك و باپیریدا کاری خانمەکانی کردووە.

کاك ڕەحیم دەڵێت لە شەڕی ئێران و عێراق جارێك کابرایەك کوڕەکەی لە خەستەخانەی مەریوان نەخۆش دەبێت و ماوەیەك هەروا لە ژێر دەوا و دەرمان دەبێت و چاك نابێتەوە. پەرستارەکان بە پزیشکی خەستەخانەکە دەڵێن ئەم نەخۆشییە کابرایەکی لادێیی هەیە ئەتوانێ چاکی بکاتەوە. بەیانیەك باوکی نەخۆشەکە کاك موحەمەد ڕەحیم کە ئەوکاتە نەجاڕی بووە لە ناوشار، ئەدۆزێتەوە و ڕووی لێ ئەخات کە سەردانی خەستەخانە بکات. گوایە کاتێ ئەچێتە سەر نەخۆشەکە، پزیشکەکەیش کە کابرایەکی تارانی بووە دێتە تەنیشتی و سەیری دەست پێداهێنان و ڕەوتی کارەکەی دەکات. ئەو کارە تا سێ بەیانی ئەنجام دەدات و کوڕەکە چاك دەبێتەوە. دواجار پزیشکەکە کاك ڕەحیم دەخاتە ژێر پرسیار و زۆری لێ دەکۆڵێتەوە کە ئەم کارە لە کێ فێر بووە و چۆنی پێ گەیشتووە و چلۆن دەزانی نەخۆش ئەم گیر و کێشەیە هەیە و چەندین پرسیاری تر.

## نیشانە و حاڵەتەکانی گیراوی

کاك ڕەحیم دەفەرمێت کە کەسێك ئەم نیشانانەی بێت ئەوە گیراوییە: ناوسکی کار نەکات[١] و

١. ئەم باسە و چیرۆکی جنۆکە خستنە ژێر ڕکێفی مرۆڤەکان لە کوردەواریدا دەبیسترێت، بەڵام سەیر ئەوەیە ئێستا هیچ باس و هەواڵێك لەم گرتنانە نییە. [لەوانەیە ئەم جۆرە باسانە پێوەندی بە بابەت و کەشی بیرکردنەوە و زانین و فامینی کۆنەوە بێت و لە ڕاست نەچێت.] نەنکی خۆم ئەیگێڕێتەوە کە باوکی (گەنجە) لە ئاوایی خانەقای جووجوو هەر بەم شێوەیەی خاڵۆ قوربانی جنۆکەیەکی گرتووە و دوایی خەڵك دەرزیەکەیان لێ کردووەتەوە و هەڵاتووە.

قەبز بێت، لێوی زوو زوو وشك بێتەوە و بەردەوام حەزی لە ئاوخواردنەوە بێت، ئەژنۆی بێ هێز بێت و لە شوێنی نەیەت، تین و تاقەتی ڕۆیشتنی کەم بێت، بەرسك و ناوسکی بێشێت، هەست بە برسیەتی بکات و نەتوانێت نان بخوات، هەست بەوە بکات کە دنیا ڕووخاوە و بەسەر ئەودا کەوتووە، هەروەها ناوکی کەوتبێت و ناوکی بگرنەوە و هەر چاك نەبێتەوە. کەواتە دیارە کە کەسێك گیراوی بێت بێ گومان تووشی کەوتنی ناوکیش دەبێ و ڕەگی ناوکی زۆر بەهێمنی لێ ئەدا و بەئاستەم هەست بە لێدانەکەی دەکرێ، واتا ترپەی دەکەوێت و نزم دەبێت.

## پارێز و پێشنیار و ئامۆژگاری بۆ نەخۆش

کەسێك وا تووشی نیشانە و حاڵەتەکانی سەرەوە بێت، پێویستە ٣ ڕۆژ تەرخان بکات کە کاك موحەمەد ڕەحیم کاری دەستی و ماڵینی سکی بۆ بکات، هەروەها دووری بکات لە خواردنی خواردەمەنی و چێشتی گرس و گیر. پیاسەی نەرم و ناوبەناو توند بکات. ئەوسا کە هێستر و بارگین و ئەسپ لە ئاواییەکان زۆر بووە بە نەخۆشی گیراوییان کوتووە کە لەو ٣ ڕۆژانەدا پاش دەست پێداهێنانەکە غار بکات و وێرغە بچێت. سواریی ئەوانە ناوسکی گیراو دەژەنن و دەیشلەقێنن و زووتر گرفتەکە بەر ئەبێت. هەروەها نەخۆش دەبێ بەیانیانە بێتە لای کاك موحەمەد ڕەحیم و بە نەخوریتی و دڵی خاڵی دەستی پێدا بهێنێت.

## شێوازی دەست پێدا هێنانەکە

دیارە کە نەخۆش لەگەڵ گیراویەکە ناوکیشی ئەکەوێت و ڕەگی ناوکی نزم لێ ئەدات و زۆر بە سەختی هەستی پێ دەکرێت. نەخۆش بەیانی بە نەخوریتی دێتە بەردەستی وەستا و ڕادەکشێت و ئەژنۆی هەڵدەدات. وەستا سکی چەور دەکات و لە سێگۆشی سەر گەدەوە تا خوار ناوك بە چوار قامکی دەیماڵێت. ئاراستەی ماڵینەکە ڕاست و چەپ و بان و خوارە. ماوەی ماڵینەکە هەر جارە دەبێ تا ١٠ خولەك درێژەی بێت بە یەك کێشان و تەوژم.

ڕۆژی سێهەم پاش دەست پێدا هێنانەکە بە ڕەگی سك یا ڕەگی باسکی دەست ناوکی دەهێنێتەوە جێ. دەبێ وەستا هێندە دەست لەسەر ئەو ڕەگەدا دابنێ تا لێدانەکەی دەست پێ دەکاتەوە. ئینجا سکەیەکی پان [وەك ٢ تمەنی] لەسەری دابنێت و بیبەستێت تا ئەتەزێت. ئینجا شلی بکاتەوە و ئەو کەسە دابنیشێت و وچان بگرێت.

---

١. لە کوردەواری بە حاڵەتی قەبز بوون دەڵێن: ناوسکی کار ناکات یا دڵی کار ناکات. جا بۆیە هەندێ جار ئەگەر حاڵەتی گیراوی توند بێت و مرۆڤ لە پێ بخات و لەسەرخۆبوونی نەمێنێت و دڵی هیچ ئارەزوو و ئاوێکی نەوێت دەگوترێت کە دڵی کەوتووە.

## شێوەی ناوکگرتنەوەی کوردانی کەجوور

لەم ڕۆژگارە بەیارمەتی دنیای مەجازی و ئینترنێت هەموو قوژبنەکان لێك نزیك بـوونەتەوە و بەهۆی نووکەیەکی مۆبایل و پەیامۆك و دیمانەیەکی ڤیدۆییەوە، گەلێك گەشـت و سـەردانی ناپێویست نەماوە. ڕۆژانە کە کاتێکی بەتاڵ و چـۆڵم دەبێـت هەنـدێك بە چاوخشـکە کانـاڵە سوودبەخشەکانی تلێگرام سەیر دەکەم و ئەوانەی شتێکی تایبەت و تـاك بـن هەڵیانـدەگرم. کاناڵی "ناسنامە و فۆلکلۆر کورد" گەلێك بابەتی کەلتوور و کەلەپووری کۆن و نـوێی کـوردی کۆ کردووەتەوە و نیشانی ئەدات. بانتر لە هەزار ئەندامی هەیە و یەکێك لەوانە بەڕێز کامیاب خەزایی خەڵکی کەجـوورە. ئەم پیـاوە جارجـارە بـابەتی پەیوەسـت بە فۆلکلـۆری کـوردەوە دەنێرێت و لەو کاناڵە بڵاو دەبێتەوە. بۆخۆی زنجیرە نووسینێکی بە ناوی "یادی از گذشـتە" هەیە کە تا نزیك بە ٣٠٠ بابەت چووە. چەندین ڕەچەتە و شێوەکاری دەرمانی و چارەسـەری پیرەژنـان و پیرەپیـاوانی کـوردی کەجـووری کـۆ کـردووەتەوە. ڕێکەوتـی ١٣٩٧/٠٣/٢٢ لە پێوەندیەك لەگەڵ ئەم بەڕێزە زیاتر پێکەوە ئاشنا بووین و بەشێك لەو بابەتـانە وا پەیوەسـتن بە چارەسەری و پزیشکی پێشکەشی کردین. جا ئەم بابەتانە هەندێك دەسـتکاری ویژەیـی و زمانی کراون و ناوەرۆکی بابەتەکە دەست لێ نەدراون. خاڵێکی گرینگ لەم باسە ئەوەیە کە ئەو کوردانە کە لە کەجوور و کەلاردەشت نیشـتەجێن ئەم ڕەچەتە و شـێوەکارانە بە "دەس و دەوای کوردانە" ئەزانن و بەم شێوەیە مۆرکی ڕەسەنی کوردستانی هێشتا پێوە ماوە.

کەجوور شارۆچکەیەکە سەر بە شارستانی نەوشەهر لە پارێزگای مازندەران و خەڵکی بە شێوەزاری مازەنی و کوردی کەلهوڕی قسە دەکەن. بەشێك لە کـوردانی کەلهـوڕ سـەردەمی ئاغە موحەمەد خانی قاجاڕ دوور خراونەتەوە بۆ کەجوور و کەلاردەشـت و لەوێ نیشـتەجێ کراون. شێوەزاری ئەم کوردانە وەك لە ئاخاوتنیاندا دیارە کـوردی کەلهـوڕییە. کـاك کامیـاب بـاس لەوە دەکـات کە بەپێـی سـەرژمێرییە فەرمیەکـان کەجـوور و ناوشـاری نەوشـەهر و

كەلاردەشــت ١٥ هەزار كــوردی كەلهــوڕی تێــدایە و هێشــتاكە بە كــوردی قســە دەكەن و خۆیان بە كورد دەزانن و هەستی كوردایەتیان نەمـردووە. شـێوەزارەكەیان هەنـدێ وشـەی مازەنی تێ كەوتووە، بەڵام شوكر وەك كوردی خۆمان ئەوانیش لە پاڵ زمـانی دایكیـان جـا فارسی فێـر بـوون. هەنـدێ لە سـەرچاوەكان ئامـاژە بەوە دەكەن كە كـوردانی كەجـوور و كەلاردەشت سـاڵەكانی ١٧٢٠ (١٠٩٩ هەتـاوی) لە سـەردەمی شـا عەباسـی سـەفەوی دوور خراونەتەوە بۆ كەجوور و كەلاردەشـت. ئەم كـوردانە لە ئەسـڵدا سـەر بە هـۆزە [كەلهـوڕ و گـۆران و] گەڕووسـەكانی سـوڵتان قەڵخـانی، كاكاوەنـد، خاجوەنـد و دڵفـانن. ئەم كـوردانە سەردەمی كەریم خانی زەند (١٠٨٣-١١٥٧ هەتاوی) دیسانەوە گەڕاونەتەوە بۆ زێـدی بـاب و باپیرانیان، بەڵام ئاغە موحەمەد خانی قاجاڕ (١١٢١-١١٧٦ هەتاوی) بەزەیی پێـدا نەهـاتنەوە و دیسان كۆچی دانەوە بۆ كەجوور و كەلاردەشت.[1] ئەم توێژەرە باس لەوە دەكـات كە ئەمـانە كـوردی گەڕووسـن. وێـدەچێت كە لەم بـارەوە زۆر ورد لێكـۆڵینەوەی نەكـردووە. چـونكە كوردانی كەلاردەشت و كەجوور سەر بە ڕێبازی یارسـانن. وەك دەزانـین یارسـەكان هەمـان كوردانی گۆران و قەڵخانی نیشتەجێ پارێزگای كرماشانن و ئێستاكە كـوردێكی گەڕووس لە كوردستان نییە كە سەر بە یارسان بێت.

## شێوەكاری ناوك گرتنەوەكە

نـاوك كەوتـن لای كـوردانی كەجـوور بەهـۆی ئەم شـتانەوە ڕوو ئەدات: بـارێكی قـورس هەڵبگریت، تایەكی قورس بە سـەر لایەكـدا بكەوێـت، خەریكـی ئەنجامـدانی كارێـك بیـت كوتووپڕ هەواڵێكـی ناخۆشـت پـێ بـدەن، زۆرێكـی تونـد بكەیـت لە شـتێ بیكێشـیت یـا ڕایبگریت، و تاد. كەسێك وا ناوكی ئەكەوێت دەوری ناوكی دەست بە ژان دەكات و هەندێ جـار ژانەكەی وەك ژانـی گـورچیلە تـاقەتپـڕووكێن دەبێـت. ئەگەر نـاوكەكە بە شـێوە و حاڵەتێكی زۆر خراپ بكەوێت كابرا ناتوانێت تەنـانەت لاق هەڵبگرێـت و سـواری بـارگین و ئەسپ بێت. ئەوسا ئەم جۆرە كەسانەیان بە مافە[2] دەیانبرد بۆ لای حەكیم و وەسـتای نـاوك گرتنەوە. كاك كامیاب كە ئەم باسی ناوك گرتنەوەی لای كەجووڕ دەگێڕێتەوە، تەمەنـی ٥٥

١. كتێبی: مردم شناسی ایران. نووسینی: فیلف هنری. وەرگێرانی: عەبدوڵا فەریار. بەخشانگای كتابخانه ابن سینا. ١٣٣٤. ل: ١٩٩-٢٠١

٢. مافە وشەیەكی كەجوورییە واتا دەستەبەرە یا هەمان بلانكارد لە زمانی فارسی. مافە بە دوو داری درێژ دروست دەكرا و كراس یا پانتۆڵیان بە ناوقەدەوە دەبەست و نەخۆشەكەیان دەخستە سەری.

ساڵە و وەك باسی دەكات مەش شیسی كوردێكی هۆزی نازم بـووە لە كەجـوور چـوار جـار ناوكی بۆ گرتـووەتەوە. ئێسـتەش كەسـانێك لەو بنەمـاڵە و مـاڵی كـوردانی تـر لە كەجـوور پسپۆڕییان هەیە لە ناوك بگرنەوە، بەڵام كاری مەش شیسـی تـایبەتی بـووە و لە نـاوچەكە ناسراو بووە.

كەسێك كە ناوكی كەوتووە وەستا مەش شیسی پێـی گوتـووە: ڕێـك و ڕاسـت ڕاكشـێ. ئینجا نەرمەی گوێچكەی هێندە پرواندووە تا لە ژانی خۆیـدا سـڕ بـووە. پاشـان دوو تـووڵە داری درێژی هێناوە و یەكیانی خستووەتە ژێری بە درێژاره و ئەوی تر لە سـەرەوە تـا ژێـر چناكەی. دوو سەری دارەكەی سەر و ژێری پێكەوە بەستووە. یەكێك یارمەتی وەستای داوە و وردە وردە سەری كابرایان بۆ لای نـاوكی داهێنـاوەتەوە. وەسـتا قـامكە گەورەی دەسـتی خسـتووەتە چـاڵی نـاوكی كـابرا و سـووڕاندوویە. ئەم سـووڕاندنەوەی قـامكە لە نـاوك و داهووچاندنەوەی سەرە بۆ لای ناوك، چارەكێ یا زیاتری بردووە. پاش ئەم كێشان و سووڕانە وەستا هەندێ دەوروبەری قامكە گەورەی هەر دوو دەستی نەخۆشی ئەپرواند و ئینجا چەند جار بەو قامكانە دەستی ڕائەتەكاند. بەگشتی ئەم شێوازە لە گرتنەوەی ناوك، نەخـۆش ژان و ئازاری كەم و زۆری پێ دەگات.

# چەند کەرەستەیەکی ناوکگرتنەوە

هەوڵێکی بەرفراوان و گشتگیری پێویستە کە سەرجەم کەلەپووری پزیشکی کوردەواری لە هەموو ناوچەکانی کوردستان کۆ بکرێتەوە. لقە جۆراوجۆرەکانی پزیشکی خۆماڵی و کۆنی تایبەت بە گەلی کورد دەیان کەرەستە و شمەکی تایبەت بە چارەسەر و دەرمانی تێدایە کە بەشێکیان هی سەردەمانی کۆنە و ئێستە وەك کەرەستەیەکی مێژوویی و مۆزەخانەیی ماونەتەوە و بەشی دیکەیان هێشتا بەکار هاتوون و سوودیان لێ دەبینرێن.

بابەتی ناوك کەوتن و ناوك گرتنەوە یەکێك لە لقە سەرەکیەکانی کەلتووری پزیشکی کۆنی کوردانە کە هەمیشە بەکاریان هێناوە و ئێستەش باوی ماوە. پسپۆڕانی ناوك گرتنەوە هەم بە کەرەستە و هەم بە کاری دەستی ناوکی نەخۆش جێ دەخەنەوە و بە تێچوویەکی هیچ یا هەرزان ئێش و ئازاری لە کۆڵ دەخەنەوە. هەوڵی ئەم وتارە ئەوەیە چەند کەرەستەیەکی پزیشکی ناوك گرتنەوە بخرێتە ڕوو تا هەم زانیاریەکانی و هەم ناونیشانیان لەبیر نەچنەوە.

١. **حەوتجۆش یا حەوجۆش**: جۆرێك گۆزەڵەی کۆنە کە جنسی لە کانزای مسە. ئەوسا زۆر بەکار هێنراوە بۆ دەستشۆردن و ئاوخواردنەوە. ئەندازەی حەوجۆش لە نێوان کووزی و ئافتاوەدایە. ئەوسا کەسانێك وا ناوکیان دەکەوت حەوجۆشیان بۆ گرتنەوەی بەکار ئەهێنا. واتا نەخۆش ٢-٣ بەیانی بەنەخورێتی ڕائەکشا و ئاوی شیلەوگەرمیان لە حەوجۆش ئەکرد و لەسەر ناوکی ڕایدەگرت تا چارەکێك یا نیو کاتژمێر. بەم جۆرە ناوکەکە ئەهاتەوە جێی خۆی.[1]

٢. **قۆشە**: بە دوو واتا بەکار هاتووە. یەکەم: دراوێکی ڕەشباوی بەکار نەهاتووە. دووهەم:

---

١. وێنە و باسی حەوتجۆش بۆ ناوکگرتنەوە لە بەڕێز کاك ئەحمەدە موسەنیفی لە ئاوایی کانیسپیکەی مەریوان وەرگیراوە. وێنەکە لە مۆزەخانەی شەخسی کەلوپەلی کۆنی کوردەواری ئەو بەڕێزە گیراوە.

کەسێکی بەدفەڕ و نەگبەت و بەدشەنگس. [واتای دووهەم وەك جنێو بەکار دەچێت: *بـڕۆ ئەی قۆشەی نەگبەت.*] هەندێ جار ئەوانەی ناوکیان دەکەوێت بە کاری دەستی واتا دەست خستنە سەر ناوك، دێتەوە جێ، بەڵام دیسانەوە دەکەوێت و دەچێتەوە دۆخی جاران. پسپۆڕانی ناوكگرتنەوە بەم دۆخە، دەڵێن: کابرا ناوکی فێرە کەوتنە. کەواتە بە حەوجۆش و قۆشە و خوێ و ناوکبەند دێتەوە جێ. ئەم کەسانە دەبێ چەند ڕۆژ قۆشە لەسەر ناوکیان ببەستنەوە و نەیکەنەوە تا ڕەگی ناوکەکە جێی خۆی دەگرێتەوە و ئیتر نەترازێتەوە.

٣. **قۆشە و قیر**: هاوشێوی سەرەوە کە بۆ قۆشە باس کرا، لێرە چۆڕێ قیر ئەدرێتە قۆشەکەوە و پاشان لەسەر پەڕۆیەك دەخرێت و ئینجا لەسەر ناوکەکە دەبەسترێت. ئەم حاڵەتە کاتێ بەکار دەچێت کە ناوکەکە بە قۆشە و حەوتجۆش و خوێ ناخرێتەوە جێ. ئەڵبەت قۆشە و قیر لە منداڵی ساوایش کە فریشکی کە بەهۆی گرەزۆك و گرینۆکیەوە دەکەوێت بەکار دەچێت.

٤. **خوێ**: کاتی بەکار هێنانی خوێ هاوشێوەی قۆشە و ناوکبەندە. بۆ ئەم مەبەستە توورەکەی چکوولە دەدروون و هەندێ خوێ زوورەی تێ دەکەن، بە ئەندازەی کەمکۆڵە گوێزێك.

٥. **ناوکبەند**: شێوەی ناوکبەند بەم جۆرەیە: هەندێ لۆکە و خوری بە ئەندازەی کەمکۆڵە گوێزێك دەخرێتە ناو توورەکەیەك و دەخرێتە ناو پەڕۆیەکی درێژی لوولەیی. ئینجا توورەکەکە دەخرێتە سەر ناوك و وەك کەمەربەندی شەڵوار لۆ درێژەکەی بە دەور کەمەری نەخۆشدا دەهێندرێتەوە و دەبەسترێت.

٦. **جامیلکە**: ئەم کەرەستەیە جۆرێك جامی لێوانییە کە بە ئەندازەی یەك پەرداخی ئاوخواردنەوە دەبێت. لە ناوچەی بادینان بەتایبەت بەرواری باڵا و گولیانی زاخۆ زۆرتر بەکار دێت. کەسێك کە ناوکی کەوتووە ڕێك ڕادەکشێت و لاقەکانی کۆ دەکاتەوە و ناوكگرەکە سەرەتا جامیلکەکە لەسەر ناوکەکە ڕادەگرێت تا تاوێك کە بیگوشێت. ئینجا بۆ ماوەی چارەکێك جامیلکەکە لەسەر ناوکەکە بان و خوار و ڕاست و چەپ پێ دەکات. لە کۆتاییدا دیسان وەك شێوازی سەرەتا جامیلکەکە دەخاتەوە سەر ناوکەکە و ڕایدەگرێت و دەیگوشێت. بەم جۆرە ناوکەکە دێتەوە جێ.

٧. **جامی بادکێش**: هەمان جام و پیاڵەیەك بۆ کەڵەشاخ گرتن بەکاری دەبەن لێرە بۆ ناوك گرتنەوە سوودی هەیە. کاك غەفار ئیبراهیمی لە جوانڕۆ باسی لەوە کرد کە دکتۆر مورووەتی کە پزیشکی عموومیە لە جوانڕۆ، ئەوانەی کە ناوکیان دەکەوێت و سەردانی دەکەن

بادکێشی کەڵەشاخ دەخاتە سەر ناوکیان و چەند جار ڕایدەکێشێت و دەیبەستێت تا چاك دەبێتەوە.

٨. **گڵوان**: هاوشێوەی پریسکە خوێکە گڵوان لەسەر ناوك دەبەسترێت تا ناوکەکە دێتەوە جێ. گڵوان بەرێکی داری مازووە کە هەندێ لە کەمکۆڵە گوێز گەورەترە و ڕەق و سووکە.

٩. **بابۆڵە پەڕۆ**: پەڕۆیەك وەك بابۆڵە دەپێچرێتەوە. دەبێ بابۆڵەکە هەندێك ڕەق و توند بێت. ئینجا بابۆڵەکە لەسەر زەوی دادەنرێت و نەخۆش سکی ڕووت دەکات و خۆی بە سەر بابۆڵەکەدا دەخات. بە جۆرێك کە بابۆڵە بکەوێت نێوان بەرسك و ناوك و سینگی. ماوەی چارەکێك تا نیو کاتژمێر بەم شێوە دەبێت ئینجا هەڵدەستێتەوە."[1]



**وێنەی ١: حەوتجۆش**

١. کەرەستەی جامیلکە و بابۆڵە پەڕۆ لە "کاك ئیسماعیل شاهین تەها" لە شاری دهۆك وەرگیراوە. ڕێکەوتی: ١٣٩٧/٠٦/١٤. [پێوەندی]

کەوتن بە دەیان جۆر و دەربڕین لە زمانی کوردیدا هـاتووە، وەکـوو: کەوتـنە تەك، کەوتـنە جێگا، کەوتنە داو، کەوتنە درەنگ، کەوتنە سەر، بەبۆن کەوتن، کەوتنە سـواڵ، کەوتـنە لا، کەوتـنەوە یـاد، کەوتـنەوە مـاڵ، بەتەقەوە کەوتـن، بەقینـدا کەوتـن، تەلاق کەوتـن، چـاوپێکەوتنەوە، تـێکەوتن، دواکەوتـن، دوورکەوتـنەوە، زیـرە پێکـردن، قـر تـێکەوتن، هەڵکەوتـنەوە، هێـز تێکەوتـنەوە، میـرات بەرکەوتـن، و هیتـد. ئەم دەسـتەواژانە و دەیـان نموونەی دیکە نیشانی ئەدەن کە "کەوتن" باری واتاییەکەی گرانە و ناکرێت یەك واتای لـێ بدەینەوە. بەم پێیە دەکرێت بۆ ئەو نەریتە پزیشکیانەی کە کەلتووری کۆنی ئێمەیە و بەجێ ماوە بۆمان، قووڵتر دابچین و پێداچوونەوەی زانستیان بۆ بکەین.

## • مەڵاشوو کەوتن

مەڵاشوو، مەڵاشـك، مەلاژ، مـلاژی و مـلاژگ، میچـی دەمـی مرۆڤەکـان و گوانـدارانی دیکەیە. مەڵاشوو بۆشایی دەم لە بۆشایی لووت جیا ئەکاتەوە و بە سـەر دوو بەشـدا دابەش بووە، بەشێکی ئێسکی پێشەوە بە ناوی "ڕەقەمەڵاشوو" و بەشـی گۆشـتی پاشـەوە بە نـاوی "نەرمەمەڵاشوو". ڕەقەمەڵاشوو بەر لەدایکبوون خۆی دەگرێت، بەڵام ئەگەر بێت و بەتەواوی جۆش نەخوات دەبێتە هۆی مەڵاشوو قڵیشاوی کە نەخۆشیەکی زگماکییە.[1] هەر لە کـۆنەوە دایکان تا دوو ساڵان بەردەوام ئاگایـان لەوە بـووە کە کەس پەسـتان نەخـاتە سـەر بەشـی پێشەوەی سەری کۆرپەکەیان و ئازاری ئەو شوێنەی نەدات. ئەو بەشە بەتـایبەت تـا چەنـد مانگێك دوای لەدایکبوونی مناڵ هێشتا هەر نەرمە و ئێسکەکەی بەتەواوی خۆی نەگرتـووە.

---

١. وەرگیراو لە ویکیپیدیای کوردی، بابەتی: مەڵاشوو، ١٣٩٧/٠٦/١٣

هەندێ جار پێش هاتووە کە منـاڵ تووشـی لرخەلـرخ بـووە و ئەگەر هەناسـە هەڵـدەمژێت دەنگی گەرووی دێت و بەتایبەت لە شەوانە تا دەمی نەکاتەوە ناتوانێ هەناسە بدات. دایکان تا ئەمە ئەبینن خێرا دەیبەنە لای دایەپیـرە و شـۆڕەژنی گەڕەك و نـاودێ کە منـاڵی زۆری دیتووە و دنیادیدەیە. ئەم ژنانە پسپۆڕی خستنەوە جێـی مەڵاشـووی منـداڵن. دەسـتبەجێ ناودەمی منـاڵەکە ئەپشـکنن. لای ئەم پسـپۆڕانە دوو هۆکـار دەبێـتە هـۆی لرخەلـرخیەوە. یەکەم: قورگ هاتنە یەك، واتا گەرووئێشە و سـووربوونەوەی قـورگ. کە ئەمە بە تێـوەردانی خوێواوك لە ناودەم یا ملپێچی گەرم چارەسەر دەبێـت. دووهەم: داچـۆڕانی ئاسـمانگەی دەم کە هەمان مەڵاشوویە و بەر بووەتەوە. ئەم بەربوونەوە وا نییە کە داچۆڕاوەتە ناودەم. بەڵکـوو وەك ئەم پسپۆڕانە دەڵێن: پەستان کەوتووەتە سەر بەشی پێشەوەی سەر و ئێسـکی میچـێ ناودەم تەوژم و زەبری بەر کەوتووە و لە ئاستی خۆی خزاوەتە خوارەوە. پسـپۆڕی مەڵاشـوو گرتنەوە چەند جارێك قامکە گەورەکەی دەباتە ناودەمی مناڵەکە و میچی دەمـی بەرەو بـان دەباتەوە. بەم شێوەیە کۆرپەکە لرخەلرخەکەی چاك دەبێتەوە.

پزیشـکانی ئەورۆ بەتـایبەت ئەوانەی لە کوردسـتان ڕۆژانە باسـی مەڵاشـوو کەوتـن بەرگوێیان دەکەوێت دژایەتی دەکەن لەگەڵ ئەم نەریتە و بە کـارێکی زانسـتی و دروسـتی نـازانن و باوڕیـان وایە کە بە هـیچ شـێوەیەك مەڵاشـوو ناکەوێـت. ئەوان بەم شـێوە باسـی مەڵاشوو کەوتن دەکەن: *ئاگادار بن لە کاتی گریان و پاڵ کەوتـن و ڕشـانەوە مەڵاشـوو بـۆ دەرەوە دەردەچێت و ئەمەش ئاساییە. هەنـدێك کەس لە کاتێکـدا کە مەڵاشـوو دەچێـت بە ناوەوە و چاڵ دەبێت لەکاتی وشك بوونەوەدا پەستان دەخەنە سەر بەشی سەرەوەی نـاودەم. وا ئەزانن مەڵاشووی مناڵەکەیان کەوتووە و بەوە دەیهێننەوە، بەڵام نازانن کە ئێسکێکی زۆر پتەو لە نێوان دەم و مێشـکدا هەیە کە بە هـیچ شـێوەیەك ئەو پەسـتانە کـاریگەری نیـیە. بەڵکوو تەنیا ئازاری مناڵەکە ئەدەن.*[1] هەندێ لە پزیشکانی ئەورۆ بۆچوونیان ئەوەیە کە هـیچ پێوەندیەك لە نێوان بەرزکردنەوەی میچی ناودەم بە قامك و مەڵاشووی پێشەسەر نییە.[2]

- **سەر کەوتن**

ئەو کەسـانەی وا سـەریان دەکەوێـت هەسـت بە ئـازارێکی تونـد و کوتـوپڕ دەکەن لە

---

١. وەرگیراو لە کاناڵی ڕووداو، بابەتی: مەڵاشوو چییە؟ ئایا مەڵاشوو کەوتن هەیە؟، وتووێژ لەگەڵ دوو دکتۆری بواری پزیشکی مناڵان، ئاکۆ کەریم جەلال زەنگەنە و پشدەر عەبدوڵا ئیسماعیل، ٢٠١٧/٠٤/٢٢

٢. وەرگیراو لە کاناڵی کوردسات. بابەتی: ڕاست و دروستی کەوتنی مەڵاشوو لە ڕووی زانستی پزیشکیەوە، وتووێژ لەگەڵ دکتۆر کامران عومەر پسپۆڕی مناڵان و تازە لەدایکبووان، ٢٠١٧/٠٧/٠٤

بەشێکی سەریان. ماوەی ژانەسەرەکەیان دوور و درێژە و جیا لە ژانەکە هەست بە قورس و گرانبوونی سەریان دەکەن بەرەو لایەك. بەم شێوە سەر دەگرنەوە: نەخۆش ڕێك لەبەردەست کەسی شارەزا دائەنیشێت. دەزوویەکی درێژ ئەکرێتە دەرزییەکەوە و بە دەور سەر نەخۆشەکەدا دەگیردرێت. دەبێ دەرزیەکە بکەوێتە بان لووتی نەخۆشەکە. لە پشتەوە دەزووەکە ڕێك دەکرێت و ئینجا دەر ئەکێشرێت و توند دەکرێت. بە هەر بارێکدا سەر کەوتبێت لۆی دەزووەکە بەو لایە درێژترە. ئینجا چارۆکەیەك بەسەر نەخۆشەکەدا دەدرێت و بە دۆخینێك توند بە دەور سەریدا دەبەسترێت و لە پشتەوە دۆخینەکە بە کەوچکە دارینەیەك توند دەکرێتەوە. بەرەبەر و لەسەرخۆ چارۆکەکە بەرەو خوار دائەتەکێنێ تا تەواو کاسەی سەری توند دەبێتەوە. دواجار بەو لایە وا سەری کەوتبوو تا چارەکێك سەری لەسەر باڵنجێك دائەنێت. ئینجا چارۆکەکە دەکەنەوە.[1]

- **دڵ کەوتن**

ئەگەر سەیرێکی هەندێ قسە و باسی ئاسایی ناو خەڵك بکەین، بەکارهێنانی دەستەواژەی دڵ کەوتن جیا لە باری پزیشکیەکەی بۆ دەربڕینی هەستی ناخۆشی بەکار دەچێ: "*دڵم کەوتە مشتم لە ترسا، ئای دڵم کەوت بەو هەواڵە ناخۆشە، کورە هێواش خۆ دڵم داکەوت بەو قسانەت، هەواڵ مردن باوکیان پێدا یەکسەر دڵی داکەوت و ئەژنۆی شکیا، بۆ وا ئەکەیت ڕامەچڵەکێنی خۆ دڵمە داخست*"، و هیتد. لە ڕووی ئەم دەستەواژانە دەر ئەکەوێت کە دڵ داکەوتن و دڵ کەوتن و دڵ داخستن، جۆرێ دەربڕینی هەست و هەوایەکە بەهۆی بیستن و دیتنی هەواڵ و ڕووداوێکی ناخۆشەوە یا ڕاچڵەکانی کوتوپڕەوە تووشی کابرا دەبێت. ئەوانەی تووشی دڵکەوتن ئەبن، بارودۆخێکی پڕ دڵەڕاوکێ و ترس و چڵەکانەوە ڕوویان تێ دەکات. بەردەوام ترپەی دڵیان لە دۆخی نائاساییە و توند توند و نارێك لێ ئەدات. ئاسوودە نیین و چۆکیان ئەلەرزێت و دائەهێزرێن. دڵیان وێڵە[2] و ناتوانن بە ڕێگەدا بڕۆن. هەندێ جار ئاو لە زاریان دێت. ئەو کەسانەی وا ناوك و سەر دەگرنەوە، دەیشتوانن کە دڵیش بگرنەوە. ئەڵبەت بۆ دڵگرتنەوە زۆربەی پسپۆڕەکانی ودمی باب و باپیرانیان پێیە. شێوازەکانی دڵگرتنەوە:

ـ نەخۆش ڕێك دائەنیشێت چەشنی دانشتن لە دیواخان. ئینجا وەستا پشتوێنێك لە بەر

---

١. شێوازی سەرگرتنەوەی دایکی خۆمە

٢. دڵ وێڵبوون یا دڵ خاوبوونەوە، جۆرێك هاوچەشنی دابەزینی تەوژمی خوێنە کە مرۆڤ بەرەو بوورانەوە دەچێ و لەسەر خۆی دەچێ.

سـینگیەوە دەبـاتە پشـتەوە و دەیبەسـتێت. وەسـتاكە چەنـد جـار لە پاشـەوە پشـتێنەكە هەڵدەتەكێنێ بەرەو بـان و سـینگ و بەرۆكـی نەخۆشـەكە ڕێـك و ڕاسـت دەكـا. ئەڵـبەت بەردەوام بە ناوی خوا و دۆعای بەخێـر و خوێنـدنی قورئـان ئەم كـارە دەكرێـت. پێویسـتە نەخۆش بەیانیانە و بە نەخوریێتی ئەم كارەی ئەنجام دایە.[١]

ـ نەخۆش ئاسوودە چوارمێلكە دادەنیشێت. وەستای دڵگرتنەوە لە پشتەوە هەر دوو دەسـتی لە بن هەنگڵی نەخۆشەكەوە دەهێنێت و ئەو شـوێنەی لە بـان دڵـیەوە كە تونـد تونـد لـێ ئەدات و ترپە ترپ دەكات بە چوار قامكی هەر دوو دەستەكەی دەیگرێت و تاوێـك دەسـتی پێدا دەهێنێت و دۆعا و ناو خوای لەسەر دەخوێنێت. ئەم دەست پێداهێنانە هەندێ جار تـا نیو كاتژمێر دەخایەنێت. ئینجا ئەڕۆنە لای ژنێـك كە نـانی دەكـات. نـانێكی گەرم دەهێـنن. پێویستە نانەكە ساق بێت و كونی تێدا نەبێ. نانەكە سـێگۆش چەنـد قەد دەكرێـت. پاشـان نانەكە دەخرێتە سەر دڵی نەخۆش و شانەیەكی دارینەی لەسـەر دائەنرێـت و بە پشـتوێنێك دەیبەستنەوە. پاش یەك ڕۆژ پشتێنەكە دەكرێتەوە و دیسـان تۆزێـك دەسـت بە سـەر دڵـی نەخۆشدا دەهێنن و بەم شێوە كابرا ڕزگاری دەبێت.[٢]

### • گۆشەك كەوتن[٣]

هەندێ جار كەسێك بەهـۆی كـردنەوەی لەڕادەبەدەری دەم، لاشـەویلكەی نـاكرێتەوە و ئەگەر تین ئەداتە خۆی كە دەمی بكاتەوە بناگوێ و ملی دێشێت. یا ئەوەیكە ماوەیەكی زۆر لەسەر باڵنجێكی بەرز و ڕەق نارێك خەوتووە و ملی خوار بـووە. ئەم جـۆرە مـلخواربـوون و ئازاری لاشەویلكەیە بە "گۆشەك كەوتن" دەناسرێت. ئازاری گۆشەك كەوتن زۆر لە نەخۆشـی

---

١. نەریتی بنەماڵەی شێخ موحەمەد ئەمین قەرەداغی دانشتووی شاری سلێمانی. وەرگیراو لە دادە شلێر كچی شێخ موحەمەد ئەمین. وەك دەگێڕێتەوە دایك و خوشكێكی ودمی دڵگرتنەوەیان لە باب و باپیرانیانەوە پێ گەیشتووە و بە خێری خۆیان ئەم كارەیان كردووە بۆ خەڵك.

٢. ئەمە نەریتی بنەماڵەی شێخ وێسۆی تەخت فیرووزەیە لە ئاوایی باقلاوای كەلاتەرزان. دادە ڕابیعە خێزانی شێخ و هەروەها فەریدە كچە گەورەكەی بەم شێوە دڵی خەڵكیان دەگرتەوە. [وەرگیراو لە كتێبی چاپنەكراوی "كەشكۆڵی كوڕەوێر"، نووسەر: موحەمەد مورادی] بۆ نموونە كەسانی دیكەش لە شوێنەكانی دیكە كاری دڵگرتنەوە دەكەن، وەكوو: دادە بەهیە لە ئاوایی تەرخاناوای مەریوان و دادە شەهین لە گەڕەكی كارخانە شیری شاری سنە

٣. ئالوو كەوتن

ملەخـرە[1] دەچێـت. ئەگەر سـەرنج بـدەین گۆشـەك کەوتـن هەمـان تـرازان و لارێ بـوونی جومگەی لاشـەویلکەکانە. خوالێخوشـبوو نەنکـم ڕابـێعە ئەسـکەندەری لە بـاقلاوا وەسـتای چاکردنەوەی گۆشەك کەوتن بوو. بە دوو شێواز گۆشەکی دەخستەوە جێ: بە باری درێژیـدا قوتووە شـەمچەی دەخسـتە نێـوان هەر دوو لای ددانەکـان لە پێشـەوە. هەروەهـا قـامکی ئاماژەی کۆ دەکردەوە و لەگەڵ قامکە گەورەکە پێکەوە دەیخستە ناودەم کەسەکە و هەندێ بان و خواری پێ ئەکرد.

## • ڕیخۆڵە پێچ کەوتن

ئەڵبەت ئەم حاڵەتە بە "تـرِ پـێچ کەوتن"ـیش نـاوی لـێ دەبرێـت. بەشـێك لەوانەی وا شارەزان لە ناوك گرتنەوە و دڵ گرتنەوە، گرفتی پێچ کەوتنی ڕیخۆڵەیش چارەسـەر دەکەن. هەموومان ڕۆژانە لەوانەیە تووشـی ئەم حـاڵەتە بـین، بەڵام بە سـەرئاو چوونێـك ڕزگارمـان دەبێت. هەندێ جـار کەسـێك تووشـی ئـازارێکی تونـد لـە بەشـی خـوار گەدەی دەبێـت و بەردەوام هەست دەکات مارێك بە ناوسـکیدا دەڕوات و ڕیخۆڵەکـانی پـێچ دەخـۆن. لەوانەیە دەنگ و قووڕەی ناوسکیشی بێت. سەرئاو چوونیش کاریگەر نییە. پێویستە ئەمانە سـەردانی شـارەزای ئەم بـوارە بـکەن. یەکێـك لە شـێوازە باوەکـانی ئەم گـرفتە ئەوەیە، کە: نەخـۆش لەبەردەستی وەستا چوارمشقی ئاسوودە دائەنیشت. وەستا چەند جـار هەر دوو دەسـتەکەی بەرەو بان ڕادەکێشێت و بەرەو پاش و پێش دەیکێشێت. پاشان نەخۆش ڕادەکشـێت و نەرم نەرم بەرسکی دەستی پێدا دەهێنێت و ڕایدەماڵێت. هونەری وەستا لێـرەدا ئەوەیە نەخـۆش ماندوو بکات تا نەتوانێت خۆی بە قوونەوە بگرێت. دواجار هەڵیدەسـتێنێتەوە بەدووچکـانەوە دابنیشێت. کوتوپڕ وەستا لە ژێرەوە قامکێکی بۆ دەبات و ئەویـش دەکەوێـت. هەنـدێ جـار بایەکی توندی لێ دەبێتەوە. بەم جۆرە و ئەم ڕامـاڵین و ڕاچڵەکـان و داتەکانـدن و خسـتنە دەبێتە هۆی بەربوونی پێچی ناوسکی نەخۆشەکە.

هەندێ جار ئەوانەی تووشی ئەم نەخۆشییە دەبـن بەهـۆی زۆرخـواردن و هەڵپەهەڵـپ خواردنەوە ڕوو ئەدات. لە کوردەواری کەسێك بەهۆی زۆر خواردن و هەڵپەهەڵـپەوە تووشـی پێچ کەوتنی ڕیخۆڵە بێت بە "کاپێچ" و "گێرپێچ" ناوی دەبەن. بەم شـێوەیە وشـەکە دەربـڕ ئەکەن: *فلانی هەڵپەهەڵپ ئەونەی خواردیە گێرپێچی کـردییە. تـرِ نەتەقیـاوی فـرەس و لە*

---

[1] ۱. نەخۆشیەکە بەهۆی ڤایرۆسی ئۆریۆنەوە دروست دەبێت و بەتایبەت غۆدەکانی بناگوێ هەو دەکەن و دەبێتە هۆی ژانەسەر، تا و ئاوهاتن لە لووت و چاو. ئەم نەخۆشییە زۆرتر منالان تووشی دەبن.

*ڕیخۆڵەیا گیریان خواردییە و ئامادەی تەقینەوەن. ئەشێ بچێتە سەراو بایەك درێژ بەر با خاسەو ئەوێ.*

**• جەرگ کەوتن**

خاتوو شلێر کچی شێخ موحەمەد ئەمین قەرەداغی کە بۆخۆی ئەندامی کۆمەڵەی گیادەرمانانی باشووری کوردستانە باس لەوە دەکات کە باب و باپیرانی ئاگەداری نەخۆشی "جەرگ کەوتن" بوون. ئەوانەی کە تووشی ئەم نەخۆشییە هاتوون بەردەوام یا ناوبەناو خوێن دادەنن [خوێنیان لەبەر دەچێت] و کز دەبن. ئەوسا حەکیم کاتێ سەیری ئەم دۆخەی کردووە و زانیویە کە نەخۆشەکە خوێنی لەبەر دەچێت و پاشەڕۆی خوێناوییە، مەرگی نەخۆشەکەی هاتووەتە بەرچاو. چونکە پاشەڕۆی خوێناوی و کزبوون پێکەوە، ئەوسا نیشانەیەکی باش و هیوابەخش نەبووە لای حەکیم. ئەم نەخۆشانە بەرەبەرە کە خوێنبەربوونەکەیان زۆر بووە و نەبڕاوەتەوە سەرنجام مردوون.

**• منداڵدان کەوتن**

کەوتنی ئەندامی منداڵدانی دایکان بە خزان و داکەوتنی منداڵدانیش دەناسرێت. ئەوسا نەخۆشیەکی ناسراو بووە بۆ حەکیمان و دایکانی پیر و مامانەکان. چونکا بەردەوام ژنان سەردانیان کردوون و چارەسەریان ویستووە. بەگشتی ئەوسا ئەم نەخۆشینە زۆرتر بەهۆی کار کردن و هەڵگرتنی بار لە کاتی دووگیانیدا، منداڵبوون لە تەمەنی سەروو، قەبزی و گرسی هەناو، کۆخەی بەردەوام و توند، ماندووبوونی زۆری دایکان بەهۆی کاری ڕۆژانە بەتایبەت لە دووگیانیدا کە ئەمانە بووەتە هۆی داخزانی منداڵدان و مسووڵدان لە جێ خۆیان بەرەو ئەندامی زاوزێ. هەندێك لە دایکان بەگشتی ڕەوتی منداڵبوونیان درێژخایەن و دژوار بووە و ماوەیەکی زۆر پێوە بوون تا لە منداڵبوون لێ بوونەتەوە. ئەم دایکانە مەترسی داخزانی منداڵدان لەسەریان زۆرتر بووە. نیشانەکانی داخزانی منداڵدان: میزەچرتێ، بەردەوام نەخۆش میزی دێت، قەبز بوون، بەخۆدا ڕیان، ژانی کەلەکە، ژانی سمت و کلۆك، هەست بە ئازار لە کاتی سەرجێیی، تەڕبوونی زیادەی ئەندامی زاوزێ، هەست بە داخزانی شتێك لە پشت ئەندامی زاوزێ، زۆری ڕێژەی خوێنی مانگانە، و هتد.

ئەوسا مامانەکان ئامۆژگاری ئەم دایکانەیان دەکرد کە وریا بن قەبز نەبن، شتی قورس تاو مەدەن، پەتا و ئالامەت مەگرن با کۆخەی توند نەگرن، نان و پێخۆری زۆر مەخۆن با قەڵەو نەبن، بەستنی پشتێنی کوردی ژنانە بە بەردەوامی، هەروەها کاتی وچان گرتن و خەوتن چەند خولەکێك لاق بە دیوارەوە بگرن تا مسووڵدان و منداڵدان بەرەو پاش بڕۆاتەوە.

### • کلک کەوتن

کلك دوا خاڵی بڕبڕەی پشتە کە دەکەوێتە پشت کۆمەوە. چەشنی کلکێ چکـوولەیە. بە فارسی پێی دەڵێن: دنبالچە. هەندێ جا ر کەسانێك بەهۆی زۆر دانشـتن لەسـەر سـمت یـا بەهۆی زەبرێك کە بەو شوێنەیان دەکەوێت ئەو ئێسکە نووك تیژە ئازاری پێ دەگـات. پـێش هـاتووە کە ئەو ئێسـکە شـکاوە و کەسـەکە نەیتوانیـوە لەسـەر قـوون خـۆی بگرێـت. لە سەردانەکانمدا بۆ کۆکردنەوەی زانیاریەکـانی ئەم وتـارانە دوو کەس کـاری کلـك خسـتنەوە جێیان دەکرد. یەکەم کاك سـەعید لە ئـاوایی دەرەویـانی مەریـوان. بەڕێزیـان باسـیان لەوە دەکرد کە هەموو کەس دەتوانێ کلك بخاتەوە جێ. بۆخۆم ئەو کارە کەم دەکەم. مەگەر چار نەبێت. قامکە درێژەی دەست چەور دەکات و دەیخاتە کـۆمی کەسـەکە و ئێسـکەکە بەرەو بان فشار ئەدات و ئامۆگاری دەکات کە ماوەیەك بە لا دابنیشێت و زۆر لەسەر قوون نەبێت. دووهەم خات بەهێ خەڵکی شارۆچکەی نەڵاس لای سەردەشت کە ئەویش بۆ خانمـان ئەو کارە دەکات. شێوەی خستنەوە جێی خات بەهێ هاوشێوەی کاری کاك سـەعید بـوو، بەڵام چەورکردنی قـامکەکەی بە هەمـان دەرمـانە تـایبەتیەکەی خـۆی بـوو کە بـۆ چارەسـەری سووتانەوە بەکاری هێناوە. هەروەها نموونەی دیکە لە کلك خستنەوە جێ، پسـپۆڕانی نـاوك گرتنەوەیە لە دەڤەری عەفرین. لە بەشی وتـاری "پزیشـکی خۆمـاڵی ڕۆژاوای کوردسـتان ـ ئەفرین" باسی کەسانێك دەکات کە ناڤك کەتـن و بۆچـك کەتـن دەکەن. بۆچـك لە زاراوەی عەفرین واتا کلك کە لە شێوەزاری کرمانجی ورمـێ بە کەلێـژ دەناسـرێت. هاوشـێوەی کـاك سەعید و دادە بەهێ، لە عەفـرینیش کلـك کەوتـن دەخـرێتەوە جـێ. ئەڵـبەت لە عەفـرین ئەوەی پێ زیاد کراوە کە کەسێك ماوەی کلـك کەوتـنەکەی زۆر بـێ و خـوێنی تـێ زابـێ. پێویستە سەرەتا هەندێ خورما لەسەر شوێنەکە بگرێت و ئینجا بۆچکەکە بخرێتەوە جێ.

### • ناوک کەوتن

لەم زنجیـرە باسـانە کە نووسـیومە لە چەنـد وتـاردا بەتەسـەل باسـی نـاوك کەوتـن و گرتنەوەی کراوە. وتارەکانی: "نەریتی ناوك گرتنەوە پاڵپشت بە سەرچاوە کۆنە پزیشـکیەکان و زانسـتی سـەردەم"، "نـاوك گـرتنەوەی کـوردانی کەجـوور"، "کـورتەیەك لە دەرمـانگەر و شکستەبەندانی خۆماڵی ئاوایی باقلاوا" و "کەرستەکانی ناوك گرتنەوە".

## کلک کەوتن

باسی ئەم جارەمان لەسەر "کلك کەوتن" یا هەمان "بۆچك کەتن"ـە. باس و چارەسەری کلك کەوتن وەك یەکێ تر لە گەنجینەکانی پزیشکی خۆماڵی کوردەواری ئەژمار دەکرێت. بۆ کۆکردنەوەی زانیاری لەسەر کلك کەوتن لە میانی توێژینەوەکانمدا لەسەر پزیشکی کۆنی کوردی بە سەر ئەم بابەتەشدا کەوتم و زانیاریم دەست کەوت. سەرچاوەی زانیاریەکان ئەمانەی خوارەوەن:

• دکتۆر فەخری عەبدۆ، خەڵکی شاری عەفرینە، ئێستە پزیشکی خەستەخانەیە لە بەرلین. چەند ساڵێك لەگەڵ کۆمەڵێك چالاکی ڕۆژاوای کوردستان بەتایبەت ناوچەی عەفرین و دەڤەری چیای کرمانج سەرجەم بابەتەکانی پزیشکی خۆماڵی کوردەواری لە ژێر ناونیشانی "*بژیشکی (نووژداری)ـیا گەلێری[1]، نەخوەشیێن مرۆڤان*" کۆ کردووەتەوە. بەهۆی پێوەندیەك کە ماوەیەکە لەگەڵ دکتۆر فەخرییەوە بەستوومە و ئاگەداری توێژینەوەکانی بەندەیە فایلی زانیاریەکانی خستە بەردەستم. "بۆچك کەتن" یەکێك لە بابەتەکانی ئەم توێژینەوەیە کە وەك کەلتوورێکی پزیشکی خۆماڵی کوردی لە عەفرین و ناوچەکانی دیکەی ڕۆژاوای کوردستان دەناسرێت.

• خات عەیدێ ڕەشۆ کەریم تەمەن ٧٩ ساڵ، خەڵکی گوندی سەیزارای ژۆری سەر بە شاری سێمێل لە پارێزگای دهۆك. ئەم خانمە دەستێکی باڵای بووە لە چارەسەری خۆماڵی کوردەواری و بابەتی کلك خستنەوە جێ.[2]

• حاجی سەعید بیووس خەڵکی ئاوایی دەرەویان سەر بە شارستانی مەریوانە، کەسێکە لە بواری پشتئێشە و ئازارەکانی بڕبڕە و مۆرە، شکستەبەندی و هەروەها کلك کەوتن ناسراوە. ئەم پیشەیە لە باب و باپیرانیەوە پێ گەیشتووە. لە وتاری "*حاجی سەعید دەرەویان*

---

١. خۆماڵی، بوومی، یا هەمان سنتی لە فارسی

٢. ئەم زانیاریانە بەڕێز ئیسماعیل شاهین تاها کوڕی خات عەیدێ لە دهۆك هەناردوویە.

شكستەبە*ندێكی تایبەت*" چرۆپڕ لەسەر ئەم پیاوە و كارەكانی باس كراوە.

● خات بەهێ مەلازادە لە شارۆچكەی نەلاس، ئەم خاتوونە كچی مەلا عەبدولڵایە كە مامۆستایەكی ناسراوی ناوچەی ئالانی سەردەشت بووە. چەند ڕەچەتە و دەرمانی پزیشكی هەیە وەك دەرمانی سووتان، زاریشە و بیرۆ، هەروەها لە چارەسەری كلك كەوتن دەستێكی باڵای هەیە. لە وتاری "*ڕەچەتە دەرمانیەكانی خات بەهێ ئالانی لە نەلاس*" بەتەسەل باسی ئەم خاتوونە كراوە.

چارەسەری كلك كەوتن كە بە كلك خستنەوە جێ دەناسرێت لە زۆر شوێنی كوردەواریدا دەكرێت. بەتایبەت ئەو حەكیمانەی دەستی پسپۆڕی پزیشكیان هەیە یا ئەو پیرەژنانە كە پیشەی چارەسەری دەكەن.

## ئەندامی كلك یا بۆچك

لە كوردی بە كلك، كەلێژ، بۆچك و كلینچكە دەناسرێت. ئەندامێكی سێگۆشە لە كۆتایی بڕبڕەی پشت كە دەكەوێتە ناوەڕاستی سمت و نزیك بە كۆم. ئەم ئەندامە چكوولە نووك تیژە كەمێك قۆپاو و چاڵە. هەر بۆیە وەك سەری چەماوەی بڕبڕەی پشت دەر ئەكەوێت. كلینچكە لە سێ مۆرە پێكهاتووە و بەسراوە بە ماسوولكەكانی تەنیشتی سمتەوە. زانایانی ئەوڕۆی بواری ئاناتۆمی پزیشكی ئەركی كلیچكە لە جەستەی مرۆڤدا گرینگ دەزانن، وەكوو: ڕاست ڕاوەستانی بڕبڕەی پشت، جێگیركردنی ڕێك و ڕاستی لە كەمەر و پێكهاتەكانی پەیوەستی، بەهێز كردنی تاندۆنەكان و دابەش كردنی زەبر و تەوژم لەسەر سمت و كلۆل.

## ئازاری ئەندامی كلك

ئەوسا كەسانێك كە بە دەست ژانی كلینچكەوە هاواریان بووە، ئەمانە بوون:

● كەسێك لە دار، سواری و بانی بەرز بەر دەبووەوە. ئەڵبەت ئەگەر كەسەكە سمتی بە زەویدا دراوە.

● زۆر سوار بوون لەسەر زین و كورتانی ڕەق و خوار. بەتایبەت ئەگەر ڕێگەكە دوور بووە، یا ڕۆژانە لە هەورازێكی تیژەوە بە سواریی سەر كەوتووە.

● ژنانی دووگیان كە لە كاتی مناڵبوون زەبری زۆریان پێ گەیشتووە.

● قەڵەوی و بەتایبەت لە بەشی سمت و كلۆكدا.

ئەو كەسانەی تووشی ئەم ئازارە دەبن كاتێ دائەنیشن بەتایبەت لە شوێنێكی ڕەقدا، لە بەشی كلینچكەدا هەست بە ژانێكی تیژ دەكەن. ئەگەر زوو چارەسەر نەكرێت ئەو شوێنە چڵك دەكات و ئازارەكەی زۆرتر دەبێت. هەروەها نەخۆش ناتوانێت لەسەر سمت دابنیشێت.

کورد گوتەنی: "*خۆی بە قوونەوە ناگرێت*".

## چارەسەر کردن

شێوەکاری هەر سێ پسپۆڕی کلك خستنەوە جێ کە لەسەرەوە باسمان کرد، یەکسانە. واتا سەرەتا نەخۆشەکە وەك حاڵەتی سوژدەی نوێژ لەبەردەستی پسپۆڕەکە ئامادە دەبێت. بەجۆرێك دەبێ ماسوولکەکانی سمت و کلۆکی شل بکات و خۆی کرژ نەکات تا کارەکە زووتر بکرێت و ئازاری پێ نەگات. پسپۆڕ قامکی ناوەڕاستی چەور دەکات و لە کۆمی دەکات و بەرەبەرە بەرەو بان پاڵی پێوە دەنێت و بەنەرمی هەر سێ مۆرەی کلینچکەکە بەرز دەکاتەوە. لەوانەیە ئەو کەسە سەرەتا ئازارێکی کەمی پێ بگات، بەڵام پاشان هەست بە هێوربوونەوەی کلینچکەی دەکات. ئەوسا جیا لەمانە ئامۆژگاری دەکرا کە نەخۆش تا چەند ڕۆژ زۆر لەسەر کلۆکی دانەنیشێت و سواری ئەسپ و گوێدرێژ نەبێت و لە شوێنێکی نەرم و نۆڵ دابنیشێت.

لە عەفرین پێش ئەوەی کە پسپۆڕ کاری دەستیەکەی ئەنجام بدات، هەندێ خورمایان لە شوێنەکە دەگرن تا خوێن و زووخی دەوری کلینچکەکە خاو بکاتەوە و بڕەوێتەوە. هەروەها خات بەهێ بە هەمان دەرمانی سووتانەکەی قامکی چەور دەکات و پێی وایە کە ئەو دەرمانە جیا لەوەی زووتر قامکی دەڕواتە ژوورێ، هەندێ سڕی دەکات و کەمتر ئازاری پێ دەگات. حاجی سەعید باسی لەوە دەکرد: "کە ئەم ئامێر و دەرزی و دەوا و نەشتەرگەریەی پزیشکی سەردەم هاتووە کەسانێك وا کلینچکەیان لە جێ دەچێت ڕەوانەی خەستەخانەیان دەکەم. ئەوسا بۆخۆم کارەکەم دەکرد، بەڵام ئێستە باشتر وایە لە خەستەخانەکان بکرێت."

**تێبینی**: خەستەخانەکان بۆ چارەسەری کلك کەوتن، دەرمانی سڕکردن و چارەسەری ئیلتەهابات و هەو بەکار دەهێنن. کە ئەمە تەنیا بۆ ماوەیەك ئازاری نەخۆش کەم دەکاتەوە. هەندێ جار نەشتەرگەری دەکەن. زۆربەی پزیشکان نەخۆش ڕەوانەی لای پسپۆڕی تایبەت دەکەن. پسپۆڕانی بواری پزیشکی وەرزشی لە فیزیۆتراپییەکان ئەم کارە دەکەن.[1] ڕێك هاوشێوەی چارەسەر کردنەکەی پسپۆڕانی کوردەواری فیزیۆتراپیستەکان کاری خستنەوە جێ دەکەن.

١. وەرگیراو لە بابەتی "*درد استخوانی دنبالچه: علت و درمان*"، دکتۆر سپێهریان، پسپۆڕی پزیشکی فیزیکی و وەرزشی، www.darmanedrd.ir

## نەخۆشی بەبۆن کەوتنی منالآن

گەلێك ڕێز لە گەنجینەی شارستانیەتی خۆی نەگرێت و فەرهەنگ و کەلەپووری خۆی نەنرخێنێت، بێ گومان ڕێگەی خۆش کردووە بۆ نەمان و فەوتانی خۆی. کورد وەك نەتەوەیەك کە مێژوویەکی چەند هەزار ساڵەی هەیە و لە چەقی شارستانیەتی مرۆڤایەتیەوە واتا ناوچۆمان (مزۆپۆتامیا) ڕسکاوە و گەشەی کردووە و بە چاخی ئیمرۆ گەیشتووە، خاوەنی پاشخان و هەگبەیەکی پڕ گەنج و گەوهەرە کە ڕەنج و ئەزموونی پێشینیانیە و دەبێ نەوەکانی ئەمڕۆی لەسەر بنەڕەتی کەلەپووری دوێکەیەوە دیواری داهاتووی بنیات بنێت.

مێژوو تەنیا گێڕانەوەی شەڕ و گۆڕانی دەسەڵات و حاکمان نییە. بەشێکی پاشخانی مێژوو گێڕانەوەی ڕەوتی گەشەی زانستە لەناو نەتەوەکاندا. زانایانی کورد لە بواری پزیشکی و چارەسەریدا لە کەشی ژیان و بژیوی کوردەواری سەردەمی خۆیاندا بەرهەمی پزیشکیان بە عەرەبی و فارسی و تورکی و لەم دواییانەشدا بە کوردی نووسیوە و گەیشتووە بە پەرتووکخانەکانی ئێمە. دیارە کە پاش دەسەڵاتی مادەکان، کورد بەشێوەی فەرمی دەسەڵاتی وای نەبووە کە دیوان و دەفتەری سەربەخۆی بێت تا بتوانێت پشت بە ئەزموونی پیران و پسپۆڕانی خۆماڵی خۆی ببەستێت و بابەتەکانی زانستی بەوانەوە کەڵەکە بکات و بیگەیەنێتە ناوەندەکانی خوێندن و حوجرە و دیواخان و دەربارەکان. بەڵکوو تا چەند سەدەی پێشوو ئەزموونی پیران و پسپۆڕانی خۆماڵی کوردەواری وەك پزیشکی، گیادەرمانی، کشتوکاڵ، ئاژەڵداری، ڕاویاری، پیشەسازی، ماڵداری، ڕۆژمێری[1] و هتد تەنیا زارەکی بوون و

---

١. دەیان نموونەی دەستنیشانکردنی کاتی نوێژ و ڕۆژەکانی ساڵ بووە کە ئەوسا بەپێی سێبەر و بەرزی و نزمی خۆر لەسەر قەڵا و لووتکەکان خەملێندراوە و ئێستە تەنیا شوێنەوار و ناویان ماوەتەوە. وەکوو بەردەکانی بەرامبەر مزگەوتی شابەدینی شارباژێر، فەلەکیاتەکەی شێخ حەسەن لە گڵەزەردی سلێمانی، دیاریکردنی ڕۆژمێر

نەنووسرابوونەوە. جا بابەتی چڵ و پرژە جۆراجۆرەکانی شاچڵی پزیشکی خۆماڵی کوردەواری وەك یەکێك لە زانستەکانی ناوبراو زۆربەی بابەتەکانی نەنووسراون و زارەکین و ئەگەر کۆیان نەکەینەوە و شەنوکەویان نەکەین و خەرمانی سووریان بە دەست نەهێنین، ئەوا بۆ داهاتوو لەبیر دەچێتەوە و هێرشی پزیشکی سەردەم لەناوی دەبات.

یەکێك لە لقۆکەکانی ئەم شاچڵە، "بەبۆن کەوتن"ـە. ئەم دەستەواژەیە زیاتر لە باشووری کوردستاندا دەبیسترێت. زۆربەی نیشانە و زانیاریەکانی لای دایکان دەست ئەکەوێت. چونکا بابەتەکە زیاتر پێوەندی بە منداڵی ساواوە هەیە. ئەگەرچی هەندێ جار لە گەنج و پیریشدا خۆی دەر ئەخات.

## نیشانەکانی بەبۆن کەوتن

- سەرەتا منداڵەکە ڕەنگی ئاسایی نامێنێت و دەگۆڕێت و دەشلەژێت،
- منداڵ سەرەتا تووشی سکچوون و ڕەوانی زۆری ناوسك دەبێت،
- پاشان دەڕشێتەوە،
- دڵی خاو دەبێتەوە و بەباشی خۆراك و شیری بۆ ناخورێت،
- چاوی بە قووڵدا دەچێت و برژانگەکانی تاق و جووت دەبن،
- تووشی جەستەیەکی خاو و داهێزراو دەبێ و ناتوانێ دابنیشێ و هەستێت،
- بەتایبەت شەوانە یاو (تا) و لەرز دەکات،
- لە حاڵەتی زۆر تەشەنەکردنیدا منداڵەکە ملی بۆ ناگیردرێت و وەك مل شکاوی لێ دێت،
- ماسوولکەکانی شلك و بێ هێز دەبن،
- لەپی دەستی تاڵ دەبێت،
- لە خەو ڕائەچەنێ و بەتایبەت شەوانە ڕاچڵەکین و لەخەو هەستانەوە و گریان و شیوەنی زۆرە. ئەگەر منداڵەکە بتوانێ قسە بکا دەبزرکێنێ و وڕاوە دەکات.
- بەگشتی منداڵەکە شەوق و زەوق و تریقاندنەوە و بزە و خۆشی نامێنێت.

## هۆکارەکانی تووشبوون

وا باس دەکەن کە منداڵی ساوا کاتێ بۆنێکی قورس و تیژ بەر لووتی دەکەوێت و

---

و کاتەکان نوێژ لەلایەن مەلا خەلیل گۆڕەومەری لە هەواری گوندێ هەڵوێ سەردەشت و دەیان بابەتی دیکە. ئەمانە نەنووسراون و بەداخەوە خەریکە بەربەرە زانیاریە زارەکیەکانیشی لەبیر دەچنەوە.

هەڵیدەمژێ، یا بۆنێکی ناخۆش وەك نەوت و گاز و زێـراو بە لووتیـدا دەچێـت تووشـی ئەم نەخۆشیە دەبێ. لەم حاڵەتەدا دەگوترێ ئەو منداڵە بەبۆن کەوتووە. هەروەهـا کـاتێ دایکێـك لەگەڵ منـداڵە سـاواکەی سـەردانی دایکێکـی زەیسـتان دەکەن و هێشـتا چـلەی منـداڵە تازەبووەکە نەچووە، لەوانەیە منداڵەکە تووشی بەبۆن کەوتن بێت. لەم حـاڵەتەدا دەگوترێـت ئەو منداڵە بەبۆن کەوتووە و چلەگیر بووە. یا تەنانەت هەندێ جـار کە لە ماڵانـدا پەلەوەر و ئاژەڵ سەر دەبڕن و بۆنی خوێن و تێزاوی گۆشتەکە بڵاو دەبێـتەوە منـداڵ تووشـی بەبـۆن کەوتن دەبێ.

منداڵ زیاتر تا قۆناغی لە شیر بڕانەوە تووشی بەبـۆن کەوتـن دەبێـت. ئەڵـبەت ئەگەری تووشبوونی تا تەمەنی ٤-٥ ساڵانیش لە ئارادا هەیە.

**چارەسەر کردن**

- ساوایی قۆناغێکی هەستیارە بۆ منداڵ. کەواتە دایکان هەوڵ بدەن کۆرپەکانیان کەمتر بە ناو خەڵك و شوێنە قەرەباڵغ و پڕ هاتوچۆکاندا بگەڕێنن.
- پێش ئەوەی منداڵ هێشتا چلەی تێ نەپەڕیوە، هەروەها تا قۆناغی مـلـگـرتن، کـاتێ دەیبەنە دەرەوە سەری بە دەسرەیەکی تەنك داپۆشن تا هەناسە و هەڵمی خەڵـك بە ڕوویـدا نەدرێت و بۆنی دەرەوە نەکات و تەپ و تۆزی بۆ نەچێت.
- ڕێـگە مەدەن کەسـانی نەناسـراو و نەیـار، تەنـانەت بـڕێ جـار هەنـدێ لە کەسـە نزیکەکانیش، سەری جۆلانە و لانکەی منداڵەکە هەڵبدەنەوە و کایەی لەگەڵ بکەن و ماچی بکەن.
- ئەگەر منداڵەکەتان لای دایکی زەیستان بەبۆن کەوتووە، پێویسـتە دیسـان سـەردانی ئەو دایکە بکەن تا شیر بە منداڵەکەتان بدات. ئەڵبەت دەکرێت داوا لەو دایکە بکەن شـیری بۆ دابدۆشێت و لە ماڵەوە بە کەوچك بە دەمیەوە بکەن. پێویستە ئەم کارە تـا حەوت ڕۆژان بکرێت تا منداڵەکە چاك دەبێـتەوە. ئەڵـبەت بـاس لەوە دەکرێـت کە ئەو منـداڵە وا بەبـۆن کەوتووە دەبێ جارێك بیبەنەوە بۆ لای ژنە زەیستانەکە تا جارێك شیری بخوات و بۆنی پێـوە بکات.
- ئەگەر منداڵ بە بۆنی عەتر و گیا و نەوت و شتە، نەخۆش کەوت پێویسـتە دایـکەکە بیر بکاتەوە کە بە بۆنی چی گیرۆدە بووە. دەبێ لۆکەیەك بهێنێت و تەڕی بکات بەو بـۆن و عەتر و نەوتە. ئینجا قاوەسینیەك بهێنێت و شەکر یا قەندی تێ بکات و لـۆکە بۆنـاویەکە لە ناوەڕاستی شەکرەکە دابنێت و سەری داپۆشێت تا بەیانی. جا منداڵەکە هەسـتا لە خەو، لەو

شەکرە کە بۆنی عەتر و شـتەکەی گرتـووە قەنـداخێکی بـۆ بگـرێتەوە و پێـی بـدات چـاك دەبێتەوە.

● ئەوانەی کـاری بـۆنبڕی دەکەن بۆخۆیـان زۆربەی عەتـر و بۆنەکانیـان لایە. ئەگەر منداڵێك بۆ بۆنێکی تایبەتی کەوتووە و نەخۆش بووە، پاش ئەوەی لە دایـکەکە دەپرسـێت و بۆنەکە دەستنیشان دەکات، کەوچکێ چاخۆری لەو بۆنە لەگەڵ هەندێ شـەکر ئەکـاتە نـاو ئاو و ئەیداتە منداڵەکە. بەم شێوە بۆن بە بۆنەوە دەڕوات.

● هەندێ لە بۆنبڕەکان گیراوەی ئاوتکی نێرگـز، گوڵەبـاخ و ڕازیـانە ڕەچەتە ئەکەن بـۆ منداڵانی بەبۆن کەوتـوو. واتـا سـێ ژەمە پـێش نـانخواردن و شـیر پێـدان، کەوچکـێ لەم گیراوەیە بکرێتە ناو ئاو و بە منداڵەکە بدرێت.

● جاری وایە جیا لە پێدانی گیراوە و بۆنەکان بە منداڵەکە، شـان و مـل و سـینگی بە ڕۆنی گەرم چەور دەکەن و دەسـتی پێـدا دەهێـنن و وردە وردە وەك شـێلاندن جەسـتەی منداڵەکە دەشێلن و دەیلاوێننەوە.

● هەندێك لە دایکان کاتێ منداڵەکەیان دەبەنە دەرەوە، دەست بە بن هەنگڵـی خۆیانـدا دەهێنن و ئینجا بە لووتی منـداڵەکەیانەوە ئەدەن. باوڕیـان وایە بەم شـێوە ئیتـر منـداڵەکە بەبۆن ناکەوێت.

● لە کوردەواری بـاوە کـاتێ منـداڵ لە مـاڵ دەبەنە دەرەوە لەتکـێ نـان دەخەنە سـەر سینگی کۆرپەکەیان. چونکا باوڕیان وایە نرخـی پیـرۆزی نـان وەك پەڕەی پیـرۆزی قورئـان دێتەوە و ئەو نانە منداڵەکەیان لە نەخۆشی و دەرد و ژان دەپارێزێت.

**نموونەی بۆنبڕەکان لە باشووری کوردستان**

● سەید ماجد جوبرائیل، دووکـانەکەی لە بـازاڕی قەیسـەری هەولێـرە. ئەم پیشـەیە لە باوکیەوە پێی گەیشتووە.

● سەییدە ئاهوو، ماڵەکەی لە ناوشاری چەمچەماڵ

● ڕێبوار عەلی کەریم تەمەن ٤٠ ساڵان و دانیشتووی چەمچەماڵ

● حەلاو مەرگەیی، دانشتووی ناوشاری سلێمانی

**تێبینی:** ئەگەرچـی ئەم نەخۆشـییە لەخۆیـدا بنەمـاکەی ڕاسـتە و هۆکـار و نیشـانە و چارەسەریشی هەیە، بەڵام لەوانەیە بەپێی داب و نەریتی تایبەتی خەڵکی، بابەتەکە تووشـی هەندێ ئەفسانە و دەلەسە و خۆرافات بووبێت. ناکرێـت زۆر بەئاسـانی بە نووکەشـەپ تێـی

هەڵدەین و دووری بخەینەوە. سەرنجێك لە بابەتی پزیشکی دەرزیاژنی چینی بدەین کە ئەوان چۆن هەوڵی ناساندن و بانگەواز و زانست کردنیان داوە و هەناردەی دوورترین شار و دێی جیهانیان کردووە. لەوانەیە ئەگەر دەرزیاژن لە کوردەواری بوایە پزیشکانی ئێمە هەرگیز لە ڕوویان هەڵنەهاتبا باسی بکەن. وەك چۆن بەدواکەوتوویی دەزانن باسی "ناوك گرتنەوە و کەهەنگ" بکەن کە ملکی گەلی کوردە و داخەکەم زانکۆی پزیشکی میللی ئێران بە ناوی خۆیانەوە تۆماریان کردووە.

● لە هەورامان و ناوچەی ئەردەڵاندا نەخۆشی بەبۆن کەوتن بە "ترسیاو" ناوی دەبەن و دەڵێن: منداڵەکە ترساوە یا ترسیان بە ملیدا بڕیوە. تەنانەت وا باس دەکەن کە هەندێ لە دایکان ڕۆژانی چوارشەمە منداڵەکانیان لە کووجی و کۆڵانان دەگەڕێنن تا ئەگەر منداڵێکی دیکە ڕووبەڕوویان هات نەخۆشیەکە بکەوێتە سەری و لە کۆڵ ئەم بێتەوە. چارەسەریی بەم شێوەیە: زۆرتر دەیبەنە لای دۆعانووسێك و نووشتەی یاو و ترسی بۆ دەنووسێت. [دەڵێن: ترسی بۆ ئەبڕن.] هەندێك لە دۆعانووسەکان بە دایکان دەڵێن کە پەتێك وەك بازنە ببەستە بە مەچەکی منداڵەکەوە تا لە خەودا هەست نەکا بەرەڵا کراوە و کەسی بە دەورەوە نییە. ئەو پەتە دەبێتە هۆی دڵ قایمی بۆ منداڵەکە. پاشان دەبێ تا چاکبوونەوە نەیبەنە دەرەوە و پیواز بە لەپی دەست و ژێر پێ و ناوچاوانیدا بهێنن تا ترسەکەی بڕەوێتەوە.

● لە ناوچەی موکریان ئەم نەخۆشییە بە "فێڵە" دەیناسن. دەڵێن: منداڵەکە فێڵەیە یا فێڵەی بە سەردا بڕاوە. بەهەمان شێوەی ناوچەی هەورامان و ئەردەڵان هەوڵی چارەسەری بۆ ئەدەن.

● پێویستە هەوڵ بدەین بەردەوام لایەنی زانستی و ئەزموارەی بابەتە کەلەپووریەکانی پزیشکیمان زەق بکەینەوە نەك لایەنی ئەفسانە و خورافاتەکەی. چونکە بەڕاستی بابەتی پزیشکی هێندە هەستیارە کە لە بوقراتی حەکیم و ئەبووعەلی سینا تا هەنووکەش، هەمیشە لایەنی خۆرافات و ئەفسانە و درۆ و فێڵ و دەهۆ هەڕەشەی لێ کردووە. هەندێ جار بازنەی لایەنە زانستیەکەی وا بەرتەسك بووەتەوە کە کەسانی پسپۆڕ و زانا خۆیان بواردووە نزیکی بکەونەوە. بەداخەوە ئێستاکە بەشێکی بەرچاو لە بۆنبڕەکانی کوردەواری هەوڵیان داوە بازنەکە زیاتر بەرەو لایەنی خۆرافات بکێشن و لایەنی پەیوەندیداری تەندروستی هەستیار بکەن کە بەئاسانی تەشقەڵە بە گەنجینەی پزیشکی خۆماڵی کوردەواری بکەن.

**سەرچاوەکان:**


- بێخاڵ حسێن، بابەتی: "بەبۆن کەوتنی منداڵ لای پزیشکە یـا حەکـیم؟"، ڕۆژنـامەی ئاوێنە، ژمارە ٣٤٦، ڕێکەوتی ٢٠١٦/١٠/٠٦
- فەرهەنگی کوردی بە کوردی ئاناهیتا، وشەی: بەبۆن کەوتن
- قەیۆم عەبدولکەریم (بەرپرسی کـۆمەڵەی گیادەرمانـانی کوردسـتان لقـی سـلێمانی)، بابەتی: بەبۆن کەوتن، پەیجی فەیسبووك، ڕێکەوتی ٢٠١٧/١٠/١٣
- وتوویژ لەگەڵ: کاك جەلال سـەید کەریـم (بەرپرسـی بەشـی ڕاگەیانـدنی کـۆمەڵەی گیادەرمانــانی کوردســتان) و شــلێر مــوحەمەد ئەمــین قەرەداغــی (ئەنــدامی کــۆمەڵەی گیادەرمانانی کوردستان)، دانشتووی شاری سلێمانی

## کەھەنگ

گەنجینەی کەلەپووری کورد پڕە لە هەزاران ماکی بەهادار و بەنرخ کە پێویستە بناسرێن و ئاشکرا بکرێن و بخرێنە بەردەست گشت تاکی کۆمەڵی کوردەواری و ئاراستەی ناوەندەکانی جیهانیش بکرێن. تا گەنجینەی فەرهەنگ و شارستانیەتی گەلی کورد دەر بکەوێت و پێی بزانرێت. یەکێك لەم گەنجینانە "کەهەنگ"ـە کە بابەتێکی پزیشکییە و دەتوانێت ژانێك لە ئێسك و پرووسکی مرۆڤەکان کەم بکاتەوە.

ئەگەرچی بابەتی "کەهەنگ" بەهرەیەکی پێشینیانە و سینە بە سینە گەیشتووە بە ئێمە، بەڵام یەکەم جار ساڵی ١٩٥٨ مامۆستا عەلائەدین سەجادی باسی لە کەهەنگ کردووە و نووسیویە: *"ئەڵێن ئەگەر یەکێك تووشی کەهەنگ بوو خۆی بخاتە ئاوی ساردەوە چاك ئەبێتەوە".*[1] [جا بۆخۆی لە پەراوێزی کتێبەکەی بەم جۆرە ڕوونکردنەوەی داوە لەسەری: کەهەنگ نەخۆشییەکە کە کوتوپڕ لە پشتەوە پەیدا ئەبێ و ئەو شوێنە ژان ئەکا. وا لە پیاو ئەکا پشتی کووڕ ئەکا.] دواتر مامۆستا هەژاریش لە هەنبانە بۆرینە بۆ کەهەنگ نووسیویە: *بەرهەنگ، نەخۆشی تەنگەنەفەسی.* ئەڵبەت بۆ "بەرهەنگ" نووسیویە: *نەخۆشی تەنگەنەفەسی کە زیاتر پیر تووشی ئەبێ.* مامۆستا گیوی موکریانی لە فەرهەنگی گیو بۆ بەرهەنگ نووسیویە: *بەرەنگ، دەردێکی ناسراو و دیارە.*

ئەگەر بە کەلەپووری زارەکی ناوچەکانی کوردەواریدا بگەڕێین و پشکنین بکەین بۆ کەهەنگ، بۆمان دەر ئەکەوێت کە وشەی "کەهەنگ" تایبەتی ناوچەی موکریانە و زارەکی تەنیا لەوێ دەبیسترێت. بەداخەوە کەمتەرخەمی خۆمان و بێنرخ نیشاندانی بەهاکانی کەلەپوورمان وای کردووە کە بەرەبەرە خۆمان لە خۆمان تێ نەگەین و پاش ئەوەی بەهرە

---

١. لاپەڕە ٢٤٧، بەرگی ٣، کتێبی ڕشتەی مرواری

و بەهاکانمــان دزران، بەخۆمانــدا بێیــنەوە و ئــاگەداری ســامانی نیشــتمانیمان بــین. ئەگەر سەیری ناوەڕۆکی نامیلکەی "سند طب سـنتی ایرانـی ـ اسـلامی"[١] بکەیـن کە سـاڵی ٢٠١١ لەلایەن جێگری سەرۆككۆماری ئێرانەوە پەسەند کرا و گشـتێندراوە، یەکێـك لە بابەتەکـانی ئەم بەڵـگە فەرمیـیە "کەهەنگ"ــە. لەوێ پیشـەی "کهنـگ‌گیـر" بە یەکێـك لە پیشـەکانی پزیشـکی خۆمـاڵی ئێرانـی دانـراوە و خـراوەتە بەردەم وزارەتـی تەندروسـتی و زانکۆکـانی پزیشکی ئێران. داخەکەم هـیچ ئامـاژەیەك بەوە نەکـراوە کە کەلتـووری کەهەنـگ لە کـوێ ڕسکاوە و تایبەت بە کام نەتەوەیە.

## دروستبوونی کەهەنگ

کاتێك مرۆڤەکان لە جموجووڵ و کاری ڕۆژانەیان تووشی ماندوویەتی و ئارەق ڕشتن دەبـن، لەوانەیە کوتوپڕ جەستەیان خاو بێتەوە و تووشی کەهەنـگ بـن. لە کـوردەواری وا بـاوە کە پیاوی کارا و کرێکاری بەئەزموون، بە هەوای شان و نەرمەنەرم کار دەکـات. نەك کوتـوپڕ و هەڵەشە. چونکا کەسێك کە وارە وارە دەست بکات بە کارکردن و کورد وتەنی "پیاوانە شـان بداتە ژێر کار"، بەرەبەرە بەیەنی گەرم دادێـت و دەبـێ هەر بەو شـێوەش بەرەبەرە بەیەنـی سارد بکاتەوە. ئەوانەی کوتوپڕ بە کار کردن و هەڵاتن گەرم دادێن و سارد دەبنەوە، تووشی جەمـامی و گۆتبـوون و کەهەنـگ دەبـن. کەواتە کەهەنـگ بەهـۆی گیـران و کـوترانی ماسوولکەکانی پشت و لاق دروست دەبێت. کەهەنگ ئەگەر کاتی بێت و تەنیا بە چەند ڕۆژ حەسانەوە و وچان گرتن چاك بێـتەوە، ئەوە بە "جەمـامی و گۆتبـوون" دەناسـرێت. ئەگینـا ئەگەر گۆتبوونەکە کات بخایەنێت و کەسەکە تووشی کووڕی پشـت و ڕەقبـوونی لاق بێـت ئەوە دەبێتە کەهەنگ. هەندێ جار کەهەنگ جۆرێك "ڕەگ وەرگەڕان"ــە. واتا بەهۆی خـراپ هەڵگرتنی شتێکی قـورس، نووچـدان لە هەڵاتـن و هەڵبەزیـنەوە یـا لاق بـادران دروسـت دەبێت. ئەگەر کەهەنگ لە بەشی سەرەوەی پشت بێت و کووڕی بەدواوە بێـت نەخۆشـەکە تووشی هەناسەسواری دەبێت و بەچاکی ناتوانێت هەناسە بکێشێت. هەر بـۆیە هەنـدێ جـار

١. ساڵی ٢٠١٤ بە ڕاسپاردەی کۆمەڵەی ڕووەکناسانی هەرێمی کوردستان ئەم نامیلکەیە و هەروەها دوو نامیلکەی "پێناسەیەکی گشتی کۆمەڵەی توێژینەوەکانی پزیشکی خۆماڵی ئێران" و "بەڵگەنامەی نیشتمانی ڕووەکە دەرمانیەکان و پزیشکی خۆماڵی و سروشتی ئێران" لە فارسییەوە کردمە کوردی. ئامانجی ئەم وەرگێڕانە ئەوە بوو کە کۆمەڵەی گیادەرمانان پەکەیجێك ئامادە بکەن و بۆ پەسەند کردنی پرۆژە یاسای "پزیشکی خۆماڵی کوردەواری" پێشکەشی پارلەمانی کوردستان بکەن.

کەهەنگ بە تەنگەنەفەسی دەناسن.

هەر سەبارەت بە کەهەنـگ پێشـینیان بە ڕەمـزی لە زمـانی گـاجووتەوە دەگێـڕنەوە: "*گاجووت گوتوویەتی: حەوت ڕۆژ جەمامیم بشکێنە و حەفتا ڕۆژ جووتم پێ بکە.*" هاوشـێوە لە ئینسانیشدا جەمامی شکاندن هەیە. واتا ئەوانەی وا بڕیارە کارێکی قورس و گران دەسـت پێ بکەن پێویستە لەپێشدا خۆیان گەرم بکەن و جەستەیان ئامادەی کـارە گـرانەکە بـکەن. جا ئەم خۆئامـادەکردنە دەکرێـت لە چەنـد خـولەك، یەك کـاتژمێر یـا دوو سـێ ڕۆژ بێـت. کەهەنگ، جەمامی، گۆتبـوون و ڕەگ وەرگەڕان لە ئـاژەڵە بـارەبەر و سواریەکانیشـدا دێـتە ئاراوە. هەر بۆیە ئەسپسواری بەئەزموون لیخوڕینی ئەسپەکەی لە ڕەوتەڕێ، لۆقە، وێـرغە و نەرمەوێرغە دەست پـێ دەکـات تـا دواجـار دەیغـارێنێ. بەپـێچەوانەش ڕەوتەکە لە غـارەوە دەگەڕێنێتەوە بـۆ ڕەوتەڕێ. تـا ئەسـپەکە کوتـوپڕ کـرژ و خـاو نەبێـتەوە و ماسـوولکەکانی دانەگیرێن. ئەڵبەت ئەم نەریتە بۆ بارگین و گوێدرێژیش حوکم دەکات و نابێت خێرا زیـن و کورتانەکەیان لێ بکرێتەوە. چونکە دەبێ بە دەم ڕێگەوە ئارەقەکەیان وشك بێتەوە یا تا وشك بوونەوە کورتانەکەیان پێوە بێت.

### وەستای کەهەنگ

لە کوردەواری ئەو کەسانەی کە کاری چاككردنەوەی کەهەنگ و گیرانی ماسـوولکە و ڕەگ وەرگەڕان دەکەن بە "پشـتشـێل و وەسـتای کەهەنـگ" دەناسـرێن. ئەوانەی وا ئـازاری کەهەنگ چارەسەر دەکەن بەم دەستەواژانە بانگ دەکرێن: *فلانی کەهەنـگ دەشـکێنێت یـا فلانی کەهەنگ خاو دەکاتەوە.* پێویستە وەستای کەهەنگ چەند تایبەتمەنـدی و ئەزمـوونی تێدا بێت تا وەك وەستایەکی شارەزا بناسرێت:

- کەسێك هەڵەشە و شپرێو و هەڵچوو نەبێت. چونکە کەهەنگ شکاندن یا خـاوکردنەوە کارێکی هەستیارە و ئەگەر وەستا وریا نەبێت نەخۆش تووشـی ئـازارێکی فـراوان دەبێـت و لەوانەیە ڕەگی بپسێت یا ڕێژڵەی[1] ببرێت.
- هێمنی وەستا لە ئاستێکدا بێت کە وارە وارە دەست پێـداهێنان بکـات تـا شـوێنەکە گەرم دابێت و ماسوولکە یا ڕەگەکە خاو بکاتەوە.
- پاش هێمنی و شێنەیی، وەستا دەبێت تین و هێزی دەستی لاواز نەبێت تـا بتوانێـت

١. ڕێژڵە ڕەگ و دەماری پێوەندی نیوان لاق و پشتە. گوایە ئەگەر کەسێك ڕێژڵەی بپسێت ناتوانێت خۆی بگرێت و هێزی وەستانی نامێنێت. ئەوانەی وا لە دانشتندا فێر نین ڕێکوپێك دابنیشن و هەمیشە خۆیان ئەخەنە بارێکدا و خۆ درێژ دەکەن، پێیان دەڵێن: ئێژی ڕێژڵەی بڕیا.

بەردەوام بێت لە دەست پێداهێنانەکە و شکاندنی کەهەنگەکە.

- وەستا شارەزا بێت لە دۆزینەوە و هەست پێکردنی ڕەگ و ماسوولکە وەرگەڕاو و گیراوەکە.
- وەستا جیا لە کاری دەستی خۆی چەندین ئامۆژگاری حەکیمانەی خۆی بکات کە نەخۆش کەهەنگەکەی خاو بێتەوە و کووڕی و ژانەکەی نەمێنێت.

## چاککردنەوەی کەهەنگ

شێواز و شێوەکانی شکاندن و خاوکردنەوەی کەهەنگ لە ناو وەستا و شارەزایانی ئەم بوارەدا جیاوازە. ئەوەی هاوبەشە و هەموویان دەیکەن: دەست پێداهێنان، شێلان، کێشان و گەرم داهێنانە. جاری وایە نەخۆش لاق یا پشتی تەواو کووڕ دەبێت. وەستا بەرەبەرە دەستی پێدا دەهێنێت و بەنەرمی دەیکێشێت. ئەم دەست پێداهێنان و کێشانە لەوانەیە زیاتر لە کاتژمێرێك بخایەنێت. هەندێ جار کەهەنگ بەهۆی ڕەگ وەرگەڕانەوە دروست دەبێت و کەسەکە ناوێرێت پشتی ڕاست بکاتەوە. وەستای شارەزا بە هۆکارێك نەخۆشەکە تووشی ڕاچڵەکان دەکات و ڕزگاری دەکات لەو گیران و وەرگەڕانە. ئامۆژگاری سەرەکی بۆ زیاتر خاوکردنەوەی کەهەنگ، گەرم داهێنانی شوێنی کەهەنگە. تەواوی ئەو شتانە گەرمی دەبەخشن وەك مەڵهەم، هەنوون، ڕۆن، ئالاندن، خۆداپێچان و گەرماو دەتوانێت کەهەنگ خاو بکەنەوە.

## گێڕانەوەیەکی خۆش سەبارەت بە کەهەنگ

کاك ناسر خەڵکی قازیاوای مەهاباد لە زمانی باوکیەوە (مامۆستا عبدالرحمن قازی)[1] دەیگێڕێتەوە، کە: سەردەمی پەهلەوی دووهەم سەرهەنگێکی پلە دووی ئەرتەش بووە لە مەهاباد بە ناوی سەرهەنگ ئەمینی. کەسێکی ناسراو و بەرچاو بووە و هەموو کەس باسی توندی و تووڕەیی و زەبر و زەنگیان کردووە. هاوسەری ئەمینی کە ژنێکی زۆر جوان و شۆخ و شەنگ بووە و خەڵك بەئاوات بوونە لە سووچێکەوە چاوێکی لێ بکەن، تووشی پشتئێشەیەکی توند دەبێت. ئەوکاتە هەرچی پزیشکی شارەزا بووە لە مەهاباد و ورمێ و دەوروبەر چاوی پێ کەوتووە و چارەسەری بۆ داناوە، بەڵام چاك نەبووەتەوە. تا ئەوەیکە تەواو پشتی کووڕ دەبێت. هەر بۆیە سەرهەنگ تووشی خەم و خەفەتێکی فراوان دەبێ.

---

١. خوالێخۆشبوو مامۆستا عبدالرحمن یەکێك لە کەسایەتی و ناودارانی مەهاباد بووە. کەسێکی دنیادیدە و قسەخۆش و زانا و خۆشنووس بووە. کتێبی بیرەوەریەکانی بە ناوی "ڕۆژگاری ونبوو" کە کاك ناسری کوڕی ئامادەی کردووە، ٢٠١٨ چاپ کراوە.

ڕۆژێك پیاوێکی مەهابادی بە سەرهەنگ دەڵێت: کابرایەك هەیە بە نـاوی قـادر ئاغـا خەڵکـی ئاوایی شەختانی لای پیرانشارە. وەستا و پسـپۆڕێکی شـارەزایە لە بـواری دەسـت شـکان و نەخۆشی و پشت ئێشە. سەرهەنگ سەرەتا بە تەشقەڵەوە وڵامی کابرا ئەداتەوە کە چەنـدین دوکتۆر کە لە زانکۆکانی دەرەوەی ئێران خوێندوویانە نەیانتوانیوە چاکی بکەنەوە، کابرایەکی لادێیی بە چی چاکی دەکاتەوە. پاش ماوەیەك، ڕۆژێك سەرهەنگ ڕائەمێنێت کە نەکا قسەی ئەم پیاوە ڕاست بێت. چەند کەس ئەنێرێـت کە قـادر ئاغـا بهێـنن بـۆ مەهابـاد. پیاوەکـانی سـەرهەنگ ڕێ ئەکەون و ئەچـنە دیواخـانی قـادر ئاغـا، بەڵام پیاوەکـان بە دەسـتبەتاڵی دەگەڕێنەوە. بە سەرهەنگ دەڵێن کە قادر ئاغا گوتـوویە: کەنگـی حەکـیم بـۆ لای دەردەدار چووە؟ نەخۆشەکە فەرق ناکات ناودارە یـا هەژارە. دەبـێ بیهێنـنە شـەختان و لێـرە چـاکی بکەمەوە. ئەم وڵامدانەوە بۆ سـەرهەنگ زۆر گـران دەبێـت. چونکـا حـوکمی سـەرهەنگ لە موکریان باڵادەست بووە و کەس بەئاشکرا پێی نەوێراوە. هەر بۆیە هەست دەکات بـۆ چـاك-کردنەوەی خێزانەکەی دەبێ حوکمی باڵادەستیی ئاغای شەختان قەبووڵ بکات. سـەرهەنگ و نەخۆش و چەنـد کەسـی تـر بەرەو شـەختان ڕێ ئەکەون. کـاتێ کـاروان دەگەنە نزیـك ئاوایی، قادر ئاغا بە پیاوەکانی دەڵێت: بڕۆن پێشوازییان لێ بکەن و بە سـەرهەنگ بڵـێن کە دەبێ تەنیا بۆخۆی و خێزانەکەی بێتە دیواخانەکەی. قادر ئاغا لە بەرماڵی خۆی پێشوازی لە سەرهەنگ و خێزانەکەی دەکات. ئاغا بە سەرهەنگ دەڵێت کە میوان دەبێ پـێش بکەوێـت. هەرووەها بە سەرهەنگ دەڵێت کە لەنگەری نەخۆش مەگرە با خـۆی لە پلیکانەکـانەوە سـەر بکەوێت. سەرهەنگ هەموو ئەم قسانەی لا سەیر دەبێت، بەڵام چی بکات ناچـارە و هیـوای بەستووە بە دیواخانەکەی شەختان کە خێزانەکەی پشتی قیت بکاتەوە.

کاتێك سەرهەنگ چەند پلەیەك دەبڕێت و خێزانەکەیشی کـوورە کـووڕ سـەر دەکەوێـت کوتوپڕ ئاغـا لە ژێـرەوە قامکێـك دەبـات بـۆ خـانم. ئەویـش ڕائەچڵەکێـت و پشـتی ڕاسـت دەبێتەوە، بەڵام چە ڕاست بوونەوەیەك. سەرهەنگ ئـاوڕ دەداتەوە کە خێـزانەکەی بە پشـتدا کەوتووە و بووراوەتەوە و سەری بە کۆشی قادر ئاغاوەیە. خانم دەبەنە دیواخان و ئینجا ئاغـا بانگ دەکات کە میوانداری بکەن لە سەرهەنگ و کاروانەکەی. ئیدی هیچ باسێك ناکرێـت و هاوسەری سەرهەنگ کووڕیەکەی ڕاسـت بـووەتەوە و لەسـەر خـۆی چـووە و لە دیواخـان ڕاکشاوە. سەرهەنگ هیچی پێ ناگوترێـت و لەم هەمـوو داب و هەڵوێسـتە سـەیرانەی ئاغـا سەری سووڕ ماوە. پاش ماوەیەك خانم دێتەوە هۆش و دەزانێت کە ئەم دەسـتکارییە، فێڵـی ئاغا بووە کە ئەو پشت ڕاست بکاتەوە. گوایە پاش میواندارییەکە خێزانـی سـەرهەنگ قیـت و

قۆز دەگەڕێتەوە بۆ مەهاباد. پاش ماوەیەك سەرهەنگ بە ئاغا دەڵێت کە ئەم فێڵە چی بوو. تەنگ هەڵدەچنێت بە ئاغا کە ڕازی ئەم چارەسەرەیەی بۆ بدرکێنێت. ئاغا زۆری لێ دەپاڕێتەوە کە بۆ گوتن نابێ، بەڵام سەرنجام بۆی باس دەکات.

نموونەی چەند کەس لەوانەی وەستای کەهەنگ ئەژمێردرێن:

- قادر ئاغای قادرپوور خەڵکی ئاوایی شەختان لای خانێ کە سەردەمی پەهلەوی یەکەم و دووهەم ناوبانگی بووە لەو بوارەدا
- بنەماڵەی چاوڕەق لە مەهاباد، بەتایبەت کاك قادر و کاك عەبدوڵا و میرزا حەسەن کە تەمەنیان سەرووی ٧٠ ساڵ دەبێت و ماڵیان لە نزیك مزگەوتی ناوبازاڕی مەهابادە
- کاك جەعفەر مەیهەنپوور و شێخ حەسەن لە شاری پیرانشار ئێستادا وەستای کەهەنگ دەناسرێن.

### وتووێژ لەگەڵ:

- کاك ناسر قازی، دانشتووی شاری سلێمانی
- کاك شەفیع خزری، دانشتووی شاری شنۆ
- کاك کەماڵ ڕەحمانی و مامۆستا موحەمەد شەریفی، دانشتووی پیرانشار

## باداری و کانی با

پێش ئەوەی باسی باداری و کانی با بکەین، پێویستە بزانین واتای با چییە. بـا جـووڵەیەکی نادیارە لەسەر ڕووپەڕی زەوی کە لە شوێنێکەوە بۆ شـوێنێکی تـر ڕادەبرێـت. هەسـتی پـێ دەکرێت، دەنگەی ڕابـوردنی دەبیسـترێت، کـاتێ بە لەمـپەری بەردەمـی دەکەوێـت لەرەی دەبینرێت، سەرما یا گەرما لەگەڵ خۆی بهێنێت مرۆڤ هەستی پـێ دەکـات، بەڵام وێـڕای ئەم نیشانانە با خۆی نابینرێت. بوونی با بۆ هەمووان سەلمێنراوە و کەس لاری نیـیە لەسـەر بوونی با. لە کوردەواری کاتێ با دەشنێت بە دەنگیدا دەیناسنەوە: گژەگـژ و گـیڤەی گژەبـا، شنەشنی سروەی بەیان، هووژەهووژ و هووڕەهووڕی بای شەماڵ، زیرەزیـر و زریـن زرینـی بای زریان، و چەندین دەنگەناوی تر. هەروەها با لە وێژە و ئاخاوتنی ئاسایی خەڵکـی کـورد زۆر ڕیشەدار جێی خۆی کردووەتەوە، وەك: شەوبا، ڕۆژبا، بای خەیاڵ، بای باڵ، بای بەتـاڵی، بای ئێش، بای ناوسك، بای سوور، شنەبا و گژەبا.

قسەی ئێمە لەم وتارە بای ئێش و ژانە کە ڕوو ئەکاتە جەستەی مرۆڤ و شەکە و تەکە دەخاتە تەندروستیەوە. بۆ زیاتر دەرخستنی ئاقاری بـا لە دەوروبەری تەندروسـتی نمـوونەی چەند ڕستە و دەستەواژە ئاماژە پێ ئەکەین:

- خەیار و ماست بارین[1].
- لاشەی باری هەس (لەشی باداری تێدا هەیە).
- ئێشێ ها لە لاشەما بارییە، هیچ ڕۆژێك لە شـوێنێك ناوێسـێ (ژانێـك لە جەسـتەمدایە بادارییە، بەردەوام دەگەڕێت و ناوەستێت).

---

١. باری لە شێوەزاری ئەردەلانی واتا باداری

● باداری هی چیامانییە وا لە ئێسك و پرووسکی ئینسانا ئەمێنێتەوە.
● باداری بە جەوەنە و حمام کووزەڵە لا ئەچێت.
● بە زستانا ماست و دۆ زۆر مەخۆ بای ژانیان/ بای چیامانیان پێوەیە.
● لەشی بە بار و زارە. [بریتیە لە کەسێکی نەخـۆش و لاواز کە بەردەوام ژان و ئـازاری هەیە.]
● ڕاوچـی هەمیشـە بـژ و بارێـك لە جەسـتەی خۆیـدا کـۆ ئەکـاتەوە لە پیـری خـۆی دەرئەخات.

ئەگەر هەندێ ورد بینەوە و واتای با بۆ نیشانەی ئێش و ژان لێك بدەینەوە، دەبینین کە ئەم واتایە ڕێك هەمان وێنایە لە ژان لە ڕوانـگەی پزیشـکی کـۆنی ئێرانـی و یۆنـانیەوە. لەو ڕوانگەیەوە توخمە چوارینەکانی دنیا بریتین لە: ئاو، هەوا (با)، خاك و ئاور. ئەم چوار توخمە هەرکام نوێنەر و وێنەیەکی گشتی لە ئاستێکی مـادە و وزە نیشـان ئەدەن. خـاك نـوێنەری شێوە و دۆخی جامد و ڕەقە، ئاو نوێنەری شێوەی تراوە، هەوا نوێنەری گازە و ئاوریش وەك نوێنەری وزە خۆی نیشان ئەدات. وەك پسپۆڕانی ئەم بوارە باسی دەکەن دۆخەکانی مـادە و وزە بۆیان هەیە بە ناو یەکدا بڕۆن و ئاوێتە یا جیا بن. کەواتە لە ڕوانـگەی پزیشـکی کـۆنی کـوردەوارییەوە گەڕانـی بـا بە نـاو ئەنـدامە ڕەق و تراوەکـانی جەسـتەی مـرۆڤ و ئاژەڵـدا دەسەلمێت و بەهۆی ئەم گەڕانە هەندێ جار وێکەوتنێکی ئـازاردەر و زیانـدەر لەم نێـوانەدا ڕوو ئەدات و ژان و ئێش دێنێتە ئاراوە بۆ مرۆڤ، ئەویش هەر جێی سەلماندنە.

وشەی "بخـار" لە کتێـبە پزیشـکیەکانی جـالینووس، ڕازی، بـووعەلی سـینا، تفلیسـی، حەکیم تۆنەکابۆنی و تاد، تەوەرێکی بنەمایە و بۆ باسی هەر چوار خەڵتـی خـوێن، بەڵـغەم، سەفرا و سەودا بابەتێکی پێویسـتە. بەگشـتی ئەم ڕوانـگەیە کـە لـە جـالینووس و بـۆقراتی حەکیم دەستی پێ کردووە و ئەوڕۆکە ئەوانەش وا پێڕەوی ڕێبازی پزیشکی کۆنی ئێرانـی و یۆنانین لەسەر ئەو ڕوانـگەیەن. واتـا بۆخـارێکە وا بەهـۆی گەنـدەڵبوونی یەکێـك لە خەڵـتە چوارینەکانی ناو یەکێك لە ئەندامەکان یا هەموو جەستە هەڵدەچێت و دروست دەبێـت و لە ڕێگەی ڕەگەکـانەوە بەرەو ئەنـدامی مێشـك و سـەر دەڕوات و دەبێـتە هـۆی دروسـتبوونی نەخۆشی و تێکچوونی باری تەندروستی مێشك.

ئەگەر زۆر ورد بینەوە و تێڕامان بکەین لە ناوەڕۆکی کتێبە پزیشکیەکانی کـۆنی ئێرانـی و یۆنانی و هێندی، لەوانەیە واتایەك هاوشێوە یا هەندێك جیاواز بدۆزینەوە بۆ هەمان وێنـای پزیشکی کوردەواری بۆ بای ئێش و ژانی جەستە. [تـوێژینەوەی زیـاتری پێویسـتە.] هەر لە

کۆنەوە لە کوردەواری باداری ناسراوە و هۆکار و نیشانە و دۆخ و چارەسەری ئەم گرژی و گرانیەی تەندروستی مرۆڤی کورد بە "با" دەستنیشان کراوە.

## ئەو کەسانەی زیاتر تووشی باداری دەبن:

● ژنی زەیستان: بەتایبەت ئەو دایکانەی بە وەرزی سەرما و سۆلە منداڵیان دەبێت. ئەڵبەت ئەورۆکە کەشی تایبەتی ناوماڵی کوردەواری کەمتر رێگە ئەدات کە ژنی زەیستان تووشی ئەوە بێت بەیەنی سەرما بکێشێت و چیامانی بڕواتە جەستەی، بەڵام ئەم حاڵەتە لە قەدیم زۆر بووە. تەنانەت لە زمانی سەرمای زستانەوە گوتراوە کە: *لە کونای دەرزیشەوە بێت خۆم ئەکێشمە بن قورسینەکانتان.*

● ڕاوچی: بەتایبەت ئەو ڕاوچیانەی وا بە دەست و سەوەتە و ژار ڕاوەماسی دەکەن یا بۆ کوشتن و گرتنی باڵندە و ئاژەڵ شەو و ڕۆژ ناناسن و کێوماڵی دەکەن.

● ئاودێر: بەتایبەت ئەوانەی وا پاییزانە بوومێر و شەوئاژین دەکەن و دەبێ شەوانە سەردانی زەویەکەیان بکەن، پیاوی بنەوان (ئەوانەی بەهاران جۆماڵ دەکەن و هاوین و پاییز قەوزەماڵ) و بەگشتی ئەوانەی وا زیاتر لەگەڵ ئاو تێکەڵاویان هەیە.

● کەسانی وەسواس: زۆر کەس هەیە دڵی داناساکێت لە شۆردن و خاوێنکردنەوە. بەردەوام شمەکی ماڵ دەشوات و دەست و لاقی خۆی تەڕ دەکات یا ماوەیەکی زۆر لە حەمام خۆی دەشوات و شیو دەکات.

● هەوارنشین و شەوکێو: ئەوانەی شەوانە ناچار دەبن لە بەر سەرمای شەوانە ئاوی ساردی ناو گۆزە و کانیاو بخۆنەوە. ئەم بارودۆخە زیاتر لەو کەسانە ڕوو ئەدات کە زیاتر بە دەرەوەن و کەمتر لە ماڵەوەن.

## نیشانەکانی باداری:

● بەزۆری ئێسکی دەست و لاقیان ئێشێت و ژانەکەی لە یەك جێگە یا شوێنەکانی دیکەی ئەندامەکانی جەستەی دەسووڕێتەوە.

● جمگەی ئێسکەکانی ژانی بەردەوام یا کاتییان هەیە.

● ژانی گەڕۆك ئازاردەرە، بەڵام وەك ژانی نەجووڵ کەمتر زیانی دیکە دێنێتە ئاراوە. چونکا ژانی نەجووڵ بەتایبەت لە جمگەکانی دەست و لاق و مۆرەکانی بڕبڕە و مل نیشانەی سوان و پوانی مەودای جمگە و مۆرەکانە. ئەم حاڵەتە ئەگەر زوو چارەسەر نەکرێت لە کۆتاییدا نەخۆش تووشی کووڕی و گۆچی ئەندام یا گشت جەستە دەبێت. دیارە ئەم

نەخۆشییە ئەوڕۆکە بە ڕۆماتیزم و ئارترۆز دەناسرێتەوە.

● هەندێ جار نەخۆش بادارییەکەی وا باس دەکات کە گوایە پێوەندی بە ئێسکەوە نییە و لە ئەندامە نەرمەکانی دیکەدا خۆی نیشان ئەدات. بۆ ئەم نیشانە دەگوترێت: بـرك و ژانێـك لەم ناوسکەم دێت و دەڕوات و هەر تاوێ لە شوێنێك بریسکە ئەدات.

**چارەسەرییەکانی باداری لە کوردەواری:**

● حمامی کووزەڵە
● لمی گەرم
● خەوتن لەبەر خۆرەتاو
● پشت کردن لە سۆبە
● نەخواردن یا کەمخواردنی خۆراکە ساردەکان
● دوورکەتنەوە لە دانشتنی سەر شوێنی تەڕ و چیامانی
● خواردنی خۆراکە گەرمیبەخشەکان
● بەکارهێنانی خۆراکی چاکساز (مصلح) لەگەڵ خۆراکە ساردەکان
● بەکارهێنانی جەوەنە
● خۆشۆردن بە ئاوی شیلەوتینی بەرەو پلەی گەرم
● خۆشۆردن بە ئاوی کانی با و کانی شەفاکان

**کانی با:**

هەر لە کـۆنەوە خەڵکـی کـورد پەی بە سـوود و دەرمـانی ئەو ئـاو و کانیـاوانە بـردووە کە تایبەتمەندیەکی جیاوازتریان لەچـاو کانیاوەکـانی تـر هەیە. ئەڵـبەت بەگشـتی لە پزیشـکی کوردەواریدا سەبارەت بە ئاو چەند بۆچوون هەیە و حەکیمـان بە ئامۆژگـاری دەستنیشـانی ئەکەن:

● زیاتر ئاوی ئەو کانیاوانە بخۆرەوە کە کانیاوی هەمیشەییە. واتا هەر چوار وەرزی سـاڵ ئاوی هەیە.

● تا بۆت ئەکرێت ئاوی قوڕگی گابەرد و خیزەڵان و نسارەکان بخۆرەوە.

● ئەو شوێنانەی وا خاکەکەی گەچ و سپی و قسـڵ و خۆڵەمێشـە، مەگەر ناچـار بیـت. ئەگینا لەوێ ئاو مەخۆرەوە.

● ئاوە قورس و سووکەکانی ئاوەدانی خۆت بناسە و لە کانیاوێك وا ئـاوی سـووکی هەیە بخۆرەوە.

• ئـاوی گەنـدەمێرگ[١] و لای مـۆڵگە و بەر گڵەجـانێ[٢] و بووڵیـا[٣] و سـەرەنگوێڵکەکان مەخۆرەوە.

• کاتێ ئاوی کـارێز و ئەسـتێراوەکان ئەخـۆیتەوە، ئـاگەدار بە قەوزە و بێچـووە بـۆق و زەروو نەخـۆیتەوە. [پێشـینان گوتوویـانە: کەسـێك قەوزە بخـواتەوە ناوسـکی وەك تەختـی هەسێڵ [ئەستێر] قەوزەپۆش ئەکرێت. یا دەگوترێت: زەروو نەخۆیتەوە لە ناوسـکتدا دەبێـتە گوێرەکە و ئەقۆڕێنێت. یا بۆ بۆق گوتوویانە: گەرا و بێچووە بۆق نەخۆیت کاتێ قسە ئەکەیت ئەملا و ئەولای قورگت وەك بۆق هەڵەتۆقێت.]

• پاییزانە کەمتر ئاوی کانیاو بخۆرەوە. [ئـاوی مـاڵەوە لە نـاو گـۆزە و دێـزە بخـۆرەوە.] پاییزەرێز ئەبیت. واتا نەخۆش ئەبیت. پاییزەرێز زیاتر وەك ئاڵامەت و پەتای قورس وایە.

**تێبینی:**

• لە کوردەواری بەرێکەوت یا تاقیکردنەوە و ئەزموون ئاوە دەرمـانی و شەفابەخشـەکان دۆزراوەتەوە. بـۆ نمـوونە سـەبارەت بە کانیـاوی ئـاوایی زوێـران[٤] بـاس لەوە دەکەن کە ئەو ماڵانەی وا لەو ئاوە دەخۆنەوە کتری و سەماوەری ماڵیان بەڵخ ناگرێت، هەروەها دەگێـڕنەوە کە ساڵێك کابرایەك تراکتۆرێکی بووە هاوینێتك بۆ گێرە هاتووەتە زوێران. گـوایە ئەو کـابرایە بەردی گورچیلەی بووە و پێش ئەوە بێتە زوێران هێندە ئازار و ژانـی بـووە ئـارام و قەراری نەبـووە. ئەو مـاوەیە کە لە زوێـران دەبێـت کـاتێ دەڕواتەوە و سـەردانی پزیشـك دەکـات. پزیشکەکە پێـی دەڵێـت کە بەردەکەت نەمـاوە و خـزاوە و فرێـت داوە. لەوانەیە مێـزڕەو و مسووڵدانیشت بریندار بووبێت و چڵکی کردبێت. ئەویش دەڵێت تا ئەو جێگەیە بـزانم بەردم فرێ نەداوە و لەو کاتەوە چوومەتە ئەو ئـاواییە ئـازارەکەم نەمـاوە. گـوایە پزیشـکەکە پێـی دەڵێت کە لەوانەیە لەو ئاواییە کانیاوێك بێت و تایبەتمەندی تواندنەوەی بەردی گـورچیلەی

١. گەندەمێرگ یا گەنەمێری واتا ئەو شوێنانە لە دۆڵ و قەدپاڵەکان کە لە وەرزی هاوینیش گیاوگژی سەوزی تێدایە، بەڵام ئاوەکەی هێندە کەمە لە مێرگەکە ناچێتە دەرەوە. ئەم شوێنانە زۆرتر گیای وەکوو هەزبێ و سالمە و گیای دەرمانی تێدایە.

٢. گڵەجانێ بە "کەنەتەقێ"ش دەناسرێت. ئەو شوێنانەیە لە قەدپاڵەکان کە خاکەکەیان لە جنسی گەچ و قسڵە و ساڵانە دەتەقێت و کەمتر گیای تێدا شین دەبێت. ئەوسا ژنان خاکی گڵەجانێیان ئەبردەوە بۆ ناوینەوە و سواقدانی ناوماڵ.

٣. ئەو شوێنەی لای ئاوایی خەڵك خۆڵەمێشی ناو سۆبە و کوانگ و سووتەمەنیەکانیان لەوێ ڕۆ دەکەن.

٤. زوێران دەکەوێتە لای ڕۆژهەڵاتی بەنداوی گاڕان لە ناوچەی سەرشیوی مەریوان

هەبێت. ئیتر بەرەبەرە خەڵك ڕوو لەو ئاواییە دەکەن. لە پێوەندیەك لەگەڵ کاك ئیسماعیل ڕەوانگەرد[1] لە زوێران، باسی ئەوەیان کرد کە تا ئێستە دوو جار هەوڵ دراوە کە کاری تۆمارکردنی کۆدی تەندروستی ئەم کانیاوە ئەنجام بدەین و بیکەین بە کارگەی بەستەبەندی ئاوی دەرمانی. یەکەم تاقیکردنەوەی تەندروستی ئەم ئاوە ١٥ ساڵ پێش ئەنجام بووە.

● هەندێ جار تام و ڕەنگی ئاوەکە بووەتە هۆی ناسینی باری دەرمانی ئاوەکە. وەك ڕەنگی سووری ئاوی باوەگوڕگوڕ لە نزیك شاری قوروە، کانیە ترشەکەی گوندی ئاوەسپی ناوچەی سەنگاو، یا ئاوی گازداری کانی گڕاوان لە ئاوایی کانی گوێزی سەردەشت.

● هەندێ جار شەخس یا گڵکۆیەك لە تەنیشت ئەو کانیاوانە هەیە و خەڵك وەك کانی با و کانی شەفابەخش سەیریان کردووە و چوونەتە سەری خۆیان پێی شۆردووە یا ئاوەکەیان خواردووەتەوە. وەك کانی بای ئاوایی بەردیسپی لە ناوچەی کۆماسی مەریوان کە شەخسێك لە تەنیشتیەوە بە ناو پیر موحەمەد هەیە، هەروەها کانی بای ناوشاری سلێمانی کە شەخسەکەی تەنیشتی بە شەخسی کانی با دەناسرێت. [*مامۆستا نالی سەبارەت بەم کانی بای سلێمانیە دەفەرمێت: ئایا بە جەمع و دائیرە بە دەوری کانی با / یاخۆ بووە بە تەفرەقەیی شۆڕش و نشوور؟. سەیوان نەزیری گونبەدی کەیوانە سەبز و ساف / یاخۆ بووە بە دائیرەی ئەنجومی قوبوور؟. ئیستەش مەکانی ئاسکەیە کانی ئاسکان / یاخۆ بووەتە مەلعەبەی گورگ و لوورەلوور؟*]

## ناوی چەند دانە لە "کانی با" و "کانی گڕاوە"کانی کوردستان:

ساڵی ١٣٩٥ لەگەڵ بەڕێز کاك جەلال سەید کەریم ئەندامی بەشی ڕاگەیاندنی کۆمەڵەی گیادەرمانانی باشووری کوردستان پلانێکمان دارشت کە تا ئەو جێگەیە هەل بڕەخسێت و بتوانین بە ناوچەکانی کوردستاندا توێژینەوە بکەین سەرجەم ناوی ئەو شار و ئاوایی و کێو و کانیاوانە وا پێوەندیان هەیە بە گیا، سروشت، دەرمان و کانزاوە هەیە کۆی بکەینەوە و لە پەرتووکێك بە ناوی "گیادێ" چاپی بکەین. هەر بۆ ئەم کارە پاییزی ئەوساڵە بانگێشتی کەناڵی NRT سلێمانی کراین و بانگەوازی ئەم بەرنامەیەمان کرد و زیاتر ناوەرۆکی پلانەکەمان دەرخست. خۆشبەختانە تا وەکوو ئیستە وشەیەکی زۆرمان کۆ کردووەتەوە. ئەڵبەت بەندە جیا لەم بابەتە سەرجەم ئەو ناوانە وا لە ئاواییەکان بۆ کێو، کانی، دەشت،

١. تەمەن ٣٣ ساڵ، ماستەری کشتوکاڵی هەیە و ئێستە دانشتووی مەریوانە.

دۆڵ، قەڵا و شوێنی دیکە بەکار دەچێن کۆم کـردوونەوە. ناوەکـانی سـەرەوە بەشـێکیان لە ئەنجامی ئەو بەرنامەی گیادێ وەرگیراون.

جیا لە کانی با کە وەك ئاوی خواردنەوە بەکـار دەچێـت لە کـوردەواری هەنـدێ کانیـاو هەن کە مـادەی کیمیـاوی وەك مـادەی گـۆگرد و شـتەیان تێـدایە و زۆربەی ئەم گـراوانە ئاوەکەیان بۆنی هێلکەی کولیو ئەدات. هەندێ لەم گراوانە تینی گەرم و هەڵماویـان هەیە و وەك ئاوگەرم دەر ئەکەون. گراوەکان زۆرتر بۆ چارەسەری نەخۆشی پێستی و گەری و گولی بەکار دەچن.

١) **باقلاوا**: ئەم ئاواییە دەکەوێتە ناوچەی کەلاتەرزان سەر بە شاری سنە. ئەم کانی بـایە لە دۆڵ ئاوایی هەڵکەوتووە. دەگێـرنەوە کە کـاتێ مەولانـا خالیـد شـارەزووری لە سـەفەری هێندووستان گەڕایەوە، پاش لادان لە مزگەوتی قەڵابەگی سنە لە خزمەت شـێخ قەسـیمی سنەیی، بە ڕێگەی سنە بۆ مەریوان لە ئاواییەکانی پلـووره و بـاقلاوایش لایـداوه. لە بـاقلاوا سەردانی شێخ عبدالرحمن زاوای بنەماڵەی وەزیریەکانی سنەی کردووە. ئەم شێخ ڕەحمـانە دەبێتە باوکی شێخ حسەین کە دووهەم خانەقـای نەقشـبەندی ڕۆژهەلاتـی کوردسـتانی لە نێوان ساڵەکانی ١٢٥٠ تـا ١٢٧٠ کـۆچی لە بـاقلاوا دروسـت کـردووە. لەو سـەردانەدا گـوایە خەڵکی ناودێ خەریکی نۆژەنکردنەوەی مزگەوتی ئـاوایی بـوون. مەولانـا بە دەسـتی خـۆی چەند بەردێك لە دیواری مزگەوتەکە دائەنێت. [ئەو بەشە لە مـزگەوتەکە تـا سـاڵی ١٣٧٦ بە بەرهێوانەکەی مەولانا خالێد دەناسرا.] گوایە شێخ ڕەحمان باسی کـانی بـاکەی کـردووە بـۆ مەولانا. ئەویش فەرموویە ئەو شوێنە بکەن بە دەستنوێژخانە. ئێسـتاکە ئەو کانیـاوە جیـا لە کانی با بە کانی حەوزە کۆنێش دەناسرێت.[1]

٢) **سالووك**: ئەم کانیاوە بە کانی بۆگەن دەناسرێت لە ئاوایی ساڵووك لای بانە. ڕێکەوتـی ١٣٩٧/٠٤/٠٢ لەگەڵ کاك جەلال ڕەئووفی بـانە سـەردانمان کـرد. ئـاوەکەی بـۆنی هـێلکەی کولیوی لێ دێت و هەڵدەقولێت و لە دوو قوڵکە کـۆ دەبێـتەوە. گـوایە مـادەی سابوونیشـی تێدایە. چونکا ژنانی ناودێ باسیان لەوە دەکرد کە هەر لە کۆنەوە خەڵك لەوێ بێ سـپۆن و فاف جلیان شۆردووە. ڕووپەڕی ئاوەکە توێژە ڕۆناوێکی لەسـەرە. دیوارێکیـان بە دەورەی ئەم کانی بۆگەنە ساز کردووە کە خەڵـك لەوێ خۆیـان دەشـۆن. زۆرتـر تایبەتمەنـدی هەیە بـۆ

١. بڕوانە وتاری "روایت سفر مولانا خالد شهرزوری به کلاترزان: روستاهای باقلاوا و پلوره"، ئیرەج مورادی، کونفرانسی مەولانا خالیدی شارەزووری، زانکۆی کوردستان، سنە، پاییزی ١٣٩٧

نەخۆشی پێستی و بیروو.[1]

٣) **سەردەشت** لە نێوان شارۆچکەی ڕەبەت و ئاوایی کانی گوێز کانیاوێك هەیە بە گـڕاوان دەناسرێت. ئەم کانیـاوە وەك شـوێنێکی گەشـتیاری دەناسـرێت. لە دێرزەمـانەوە کە ئـاوەکە هەڵقوڵیوە مادە کیمیاویەکەی نیشتووە و بووەتە شاخ و بەردێکی زەرد لە بەردەم کانیـاوەکە. ئەم کانیاوە دەکەوێتە تەنیشت چۆمی هورمزاوێ. کاتێ ئاوەکە دێتە دەرێ دەنگی کفەکف و گازی لێ دێت. بۆنێکی تایبەتی نییە. خەڵك بۆ نەخۆشی پێستی خۆیانی تێدا دەشۆن. گـوایە سەردەمانی زوو لە دەوری ئەم گڕاوانە کانی تاڵیش بـووە. ئەم گـڕاوانە بە "کـانی گـڕاو"یش دەناسرێت. هەروەها لە ئاوایی پاشبەرد ئەویـش کـانی گـڕاو هەیە لە کەنـاری چـۆمەکە. لە ئاوایی بریسـوێ لە زێـدی کەڵەزانـای گەورەی کـورد یوۆسـفی ئەسـەم کە بە مەلاوەسـوو دەناسرێت و ساڵی ١٠٠٢ کۆچی مردووە، کانی مەلاوەسوو هەیە. ئەم کانیاوە خەڵـك منـداڵێك کە نەخۆشی زەردۆیی هەبێت دەیبەنە سەری و بەدەنی پێ دەشۆن و ئـاوەکەی پـێ ئەدەن بیخواتەوە. هەروەها لە ئاوایی هەرزنێ ئالان و کونەمشکێ کانی گڕاو هەیە.

٤) **بەردیسپی**: لەم ئاواییەی ناوچەی کۆماسی مەریوان لە داوێنی کیوی باوەلی تەنیشـت زیارەتانی پیر موحەممەد کانی با هەیە. خەڵك بۆ نەخۆشـی بـاداری و لاقێشـە خۆیـانی تێـدا دەشۆن. هەروەها لەم ئاواییە کانی تاڵ هەیە.

٥) **شوێشە**: لە ناو ئاوایی کانی وا هەیە. ئاوەکەی سووکە و گوایە بۆ نەخۆشـی لاقێشـە و باداری چاکە. ڕۆژانە خەڵك بەردەوام بە تۆنگە و گۆزە ئاوی لێ دەبەن و بەکاری دەهێنن.

٦) **زوێـران**: ئەم ئـاواییە دەکەوێـتە سـنووری سەرشـیوی مەریـوان و لە داوێنـی چیـای مێشەڵواز هەڵکەوتووە. ئەم کانیاوە لە کۆنەوە خەڵك بۆ خواردنەوەی ئـاوی نـاودێ بەکاریـان هێناوە و ئێستە بووەتە ئاوی لوولەکێشـی خەڵـکەکە. ڕۆژانە خەڵـك بـۆ نەخۆشـی گـورچیلە سەردانی ئەو ئاواییە دەکەن و لێی دەخۆنەوە و لەوێ سەیران دەکەن تا ئێوارە. یـا ئەوەیـکە

---

١. لەم ئاواییە پیرەژنێك هەیە بە ناوی ئایشێ خانم کە ناوك دەگرێتەوە و بالووك و بیروو دەبڕێت. بەرامبەر بە کانی بۆگەن شیوەڵێك هەیە کە مێرگ و ئاوەڵە. لەوێ بە تەمووی لیز و ڕەوەزی کانیاوەکان گیابالووك هەیە. کاتێ لێمان کۆڵییەوە گیابالووك هەمان گیا قەیتەرانە. لەم ئاواییە بەهارانە ئەو گیابالووکە دەهێنن دەیجنن و کەلانەی لێ دروست دەکەن. کەسێك چەند کەلانەی بخوات بالووکەکەی هەڵدەوەرێت. هەروەها شێوازێ تر هەیە کە کەسێ بالووکی پێوە بێ حەوت خوێ و حەوت جۆ دەهێنێت و ئەوانەی ودمیان پێیە. دۆعای پێدا دەخوێنن و ئینجا جۆ و خوێیەکە دەخاتە گڵێکی تەڕ و شێدار. خوێکە توایەوە و جۆکە چەکەرەی کرد بالووکەکە هەڵدەوەرێت.

بە خەڵکی زویران ڕادەسپێرن کە لەو ئاوەیان بۆ بهێنن.

٧) **غەیسوور:** ئەم کانیاوە دەکەوێتە داوێنی باسکی کانی شا لە ئاوایی غەیسووری دیواندەرە. گوایە یەکێك لە پاشاکانی ئێران کاتێ سەردانی کوردستانی کردووە لەو شوێنە لایداوە باسی ئەم کانیاوەیان بۆ کردووە و ئەویش لە ئاوەکەی خواردووەتەوە و لەوێ وچانێکیان گرتووە. خەڵکەکە ئێژن ڕەزاخان بووە کە هاتووەتە ئیرە. ئەم کانییە بە کانی شا و کانی با دەناسرێت.

٨) **ئاویەر:** لە داوێنی کێوی ئاویەری شاری سنە چەند کانیاو هەیە کە خەڵك وەك شەفا و دەرمان سەیری دەکەن. کانی شەفا، کانی خەیرەزنە و کانی سەنگشکێن. خەڵك هەر لە کۆنەوە بۆ فڕێدانی بەردی گورچیلە چوونەتە سەر کانی سەنگشکێنەکە و لە ئاوەکەیان خواردووەتەوە.

٩) **گاوەرە:** لە دۆڵ سۆڵەی ئاوایی گاوەرە سەر بە شارستانی سنە کانیاو و مێرگێك هەیە کە بە "سۆڵاوەکە" ئەناسرێت. کاك حەسەن سەرمەستی باس لەوە دەکات کە ئەوسا مەڕەکێوی هاتوونەتە سەر ئەم مێرگە و لەو ئاوەیان خواردووەتەوە و خاکەکەیان لستووە. گوایە ئەگەر چاڵاوێك لەو مێرگە هەڵبکەنیت شەوانە ئاوی تێ ئەچێت و بە ڕۆژا ئاوەکەی ئەنیشێت و خاکەکە سپی ئەبێتەوە. ئێمە کە چووینە سەر کانیاوەکە کەمێك بۆنی تایبەتی ئەهات. لە پشت ئەم مێرگە شوێنێك هەیە بە "تاف پشتەنگ" ئەناسرێت. بەردێکی سافە و دوو چاڵی تێدایە بە تەمووەکەیەوە. دیارە کاتی خۆی جێگای نای ئاش بووە.

١٠) **شنۆ:** لە ناوشاری شنۆ پێشتر کانی گراوێك هەبووە کە مادەی گۆگردی تێدا بووە و خەڵك بۆ نەخۆشی پێستی و گەڕی و خوروو بەکاریان هێناوە. ئاوەکەی مەیلەوسوور بووە. لە گەڕەکی سۆفیان دیسان کانی بیرۆ هەبووە کە ئەویش بۆ نەخۆشی بیرۆی پێست بەکار هاتووە.

١١) **مەرگەوەڕ:** لە ناوچەی هەرکییانی مەرگەوەڕ ئاوایی دەرماناوێ هەیە کە ئەم گوندە بەهۆی کانیا دەرماناوێ ناو نراوە و هەر لە کۆنەوە ئاوەکەی بۆ باداری و ژانی ئێسکی دەست و پێ بەکاریان هێناوە.

١٢) **زەرینە:** لە دەشتی هەوەتوو تەنیشت ئاوایی زەرینە بەرەو گوندی ئەحمەوەکەڕ کانی شەفا هەیە. ئەم کانیاوە تایبەتمەندی توانەوەی بەردی گورچیلەی هەیە و ڕۆژانە دەیان کەس بۆ ئەم نەخۆشییە سەردانی دەکەن. ئاوەکەی زۆر سووك و خۆشە.

١٣) **مەهاباد:** لە شوێنی ئێستەی دیواری بەنداوەکە لە نزیك باخی میکائیل بەرەو ئاوایی

قازیاوا کانی گەڕاو و کانی تاڵ بووە. ئاوی کانی گڕاو مەیلەوسوور بووە. ئەوسا خەڵك بۆ نەخۆشی گولی و بیرۆ و خوروو بەکاریان هێناوە. هەروەها لە ئاوایی برایمە دیسان کانی کانی با هەیە ئەویش هاوشێوە بۆ ژانی دەست و لاق دەبێت. لە کتێبی "بەرەو موکریان" مامۆستا هەژار شێعرێك بۆ کانی گڕاوی مەهاباد هێناوە:

مەڵێ سوێراوە گڕاو جێ نزمە / بۆرە خزمێکی دوو چاوی کزمە

بەرد لە خۆی کۆوە دەکا پێموایە / شۆڕشی گەرمی لە بن سەردایە

١٤) **گواز**: لە سنووری ژاوەرۆی دیوی سەولاوا ئەم کانیاوە زۆر ناسراوە کە لە باسکی کێوی کورەمریەم لە ئاوایی گواز هەڵکەوتووە. هەورامیانە بە "هانەو وا" یا "هانە واوەین" دەناسرێت. ئاوەکەی گەرمە و بۆنی هێلکە ئەدات. خەڵك بۆ ژانی دەست و لاق و شەفای نەخۆشی دیکە خۆیانی تێدا دەشۆن و لێی دەخۆنەوە.

١٥) **هەجمنە**: ئەم ئاواییە لە دەشتی سەرکەلی مەریوان هەڵکەوتووە. کانی بای هەجمنە ئاوەکەی بۆ ئەسرەوتنی ژانی ددان بەکار دەچێت.

١٦) **جوانرۆ**: لە ئاوایی گەڕاو کانیاوێك بە ناوی کانی با. ئاوەکەی بۆ نەخۆشی ژانی دەست و لاق دەبێت. خەڵك دەڵێن ئەم کانیاوە بۆ ژانوبا دەبێت. کانی با لە ئاوایی قشلاخ هەیە ئەویش هاوشێوەی ئاوایی گەڕاو. کانی وای ئاوایی شاینگان. لە چیای ڕێزە سەر ڕێگای سەلاس کانی ڕێزە کە بۆ بەردی گورچیلە دەبێت و کانی زیبکە بۆ ژانی دەست و لاق. خەڵك بۆ چارەسەری بەردی گورچیلە ڕوو لە کانیاوی ڕێزە دەکەن لە چیای ڕێزە. باوڕی خەڵکی ئەوەیە کە ئەم کانیاوە شێخ عبدالقادری گەیلانی هاتووەتە سەری و نەزەرەگای ئەوە. جا خەڵك کاتێ لە داوێنی ئەم کێوە سەردەکەون کاتێ گەیشتنە بەرایی ئاوەکە سەرەتا لێی دەخۆنەوە و وچانێك دەگرن. پاشان بەرەو کانیاوەکە سەردەکەون و لەوێ بەشی خۆیان دەخۆنەوە و دەگەڕێنەوە.

١٧) **ئیلام**: لە سنووری ئەم پارێزگایە چەندین کانیاو هەیە کە تایبەتمەندی دەرمانیان هەیە. کانی ئاوگەرم بیجار لە ٣٠ کیلۆمتری، کانی ئاوگەرم تەجریان لە ٢٠ کیلۆمتری و کانی بولی لە ٦٠ کیلۆمتری ئیلام، پلەکوو لە کێوی هەلیلان، کانیاوەکانی لای دیڵۆڕان لە داوێنی سیاکێو لای ئەشکەوتی شەمشەمەکوێرە، کانیاوی ئاوگەرم سەرگەرۆ لە دیڵوڕان کە بۆ نەخۆشی گەڕی و کەچەڵی دەبێت، کانیکانی گەڕیساوە لە مێهران کە ئاوەکەی گۆگردی هەیە.

١٨) **ئاوەسپی**: ئەم ئاواییە دەکەوێتە سنووری ناوچەی سەنگاو لە نزیك شاری کفری.

ئاوی ئەم کانیاوە ترش و بۆگەنــدە و بــۆ نەخۆشــی حەساســیەتی پێســت و خــوروو بەکــار دەچێت.

١٩) **دمگاشێخان**: ئەم ئاوایيە لە نزیك تووتمەر و سەرنژماری مەریــوان هەڵکەوتــووە. کــانی یاو لەم ئاواییە ئەوسا منداڵ کە تووشی تا و یاو هاتووە بەیانیان و ئێواران بردوویانەتە ســەر ئەو کانیــاوە و پێیــان شــۆردووە و خــواردوویەتیەوە چــاك بــووەتەوە. هەروەهــا لە دەشــتی سەرشــاوکە کــانی خــاتووپیرۆز هەیە کە ئەویــش خەڵــك وەك شــەفا و دەرمــان ئــاوەکەی دەخۆنەوە و لە دوور و نزیك ئاوەکەی دەبەن.

٢٠) **بەرقەڵا**: لە داوێنی قەڵای هەڵۆخانی مەریوان لە پاڵ مزگەوتە سوورە کانی بــا هەیە کە خەڵك وەك شەفا و دەرمان ســەردانی دەکەن. ئەم کانیــاوە جیــا لە بــاری دەرمــانیەکەی خەڵك وەك شەفایەك بەهۆی نزیکبوون لە مزگەوتەکە بۆ شەفای نەخۆشی دەیبەنەوە و لێــی دەخۆنەوە. لە داوێنی ئەم چیایە کانیاوی بەرقەڵا هەیە کە ئێستە کــارگەی ئــاوی کانزاییــان لەوێ دروست کردووە و ئاوەکەی بەستەبەندی دەکەن و دەیفرۆشن.

٢١) **باواگورگور**: ئەم کانیاوە دەکەوێتە نزیك شاری قوروە. شوێنێکی گەشتیارییە و خەڵــك بۆ سەیران و شەفای نەخۆشیەکانیان سەردانی دەکەن و تاوێــك لە حەوزەکەی مەلە دەکەن بۆ نەخۆشــی پێســتی و ئاویشــی دەخــۆنەوە بــۆ نەخۆشــیەکانی ناوسکێشــە و بەدهەرســی. ئاوەکەی ڕەنگی زەرد و سوورە و پڕە لە مــادەی گــۆگرد. هاوشــێوەی ئەمە لە پیــر ســاڵحی بیجاریش هەیە. هەروەها لە کۆندا کەرکووك بە باواگورگوڕ ناسراوە.

٢٢) **ئاگرێ**: کانی زەرك بۆ نەخۆشــی زەردك دەبــێ، کــانی هەشــتکا بــۆ فرێــدانی بەردی گورچیلە دەبێ، کانی شێخ ماف بۆ کۆخەی تیژ (خەندەقوك) و منالبوون دەبێ.

٢٣) **ئاواییەکانی تر کە کانی با و کانی گراویان هەیە:**

● ناوچەکانی سنە: ئاواییەکانی بەرقڕوو، تازاوای ئیسیاوا، گــزەردەرە، نگــڵ، قەڵاشــێخان، میانە، مەڵەکشان، نەڕان و تووار مەڵا

● بانە: ئاواییەکانی سوێروێ (کانی سوێر)، ئــارمردە (کــانی گەرمــاو)، دەوســێنە (بنــاری کێوی زاغە کە ئاوەکەی بۆ بەردی گورچیلە دەبێ).

● سەقز: ئاواییەکانی باشماخ (کانی گڕاو و کانی با)، وزمــان (کــانی عەتــر لە کوێســتانی بۆرەسە کە ئاوەکەی بۆ بەردی گورچیلە دەبێ).

● پاوە: کانی وانە لە ئاوایی نووریــاو و هــانە بــزازەرا لە ئــاوایی زاوەر و کــانی بــای لای

بابایادگار

- نۆتشە: هانی وا
- شاهیندژ: کانی جۆشەتوو لە ئاوایی جۆشەتوو کە بۆ بەردی گورچیلە دەبێ.
- دیواندەرە: کانی با لە ئاوایی شاقەڵا
- کامیەران: کانی با لە ئاوایی بوانە
- مەریوان: ئاواییەکانی دەرزیان، سوورکەوڵ، زەکریان (کانی با و کانی جگەری)، مەیدۆڵ (کانی بای بناری کێوی بەردەزەرد)
- دێولان: کانی با لە ئاواییەکانی تەڵوار و کەڕەونان
- نەغەدە: کانی گڕاوی شێخ مارف
- کوودەشت: کانی گەرم و گڕاوەکانی تەنیشت شاری گڕاو کە ناوچەیەکی گەشتیاریشە.
- دەربەندیخان: ئاوی کانزایی کانی گڕاوی بانیخێڵان
- هەورامان: هانە وای لە ئاوایی سلێن و هانە داوود لە هەورامان تەخت
- ڕوانسەر: ئاواییەکانی کانی گڕاوی خوار و بان
- چۆمان: کانی با لە دۆڵی ڕۆستی ناوچەی باڵەکایەتی کە ئاوەکەی گۆگردییە، هەروەها کانی شێخی باڵەك لە حاجی ئۆمەران کە ئاوەکەی زۆر ساردە وەك سەهۆڵ، و بۆ بەردی گورچیلە دەبێ.
- خورماڵ: کانی گڕاو
- کۆیە: کانی گڕاوی ئاواییەکانی جەلی و بابا جیجك

## گەلاوێژ ئەنگوتن و پەتای پاییزەڕێز

نیشتمانی کوردستان لە جێگە و پێگەیەکی جوغرافیاییدا هەڵکەوتووە کە هەموو وەرز و وەرزۆکەکانی بەگوێرەی باری جوغرافیایی و سروشتی خۆی دانراوە و پشتاوپشت بە ئێمە گەیشتووە. ئەگەر سەیری وەرزەکانی بکەین، مانگەکانی و وەرزۆکەکانی، سەرجەم هاوتەریبە لەگەڵ باری کەش و گەشەی سروشتی جوانی کوردەواری.

یەکێك لە مانگەکانی ڕۆژمێری کوردەواری، گەلاوێژە. دەرکەوتنی ئەم مانگە گەلێك یاد و فریا لەگەڵ خۆی ڕادەکێشێت کە پێویستە بۆ لەباری ژیانی ڕۆژانە و تەندروستی گیانی خۆمان ڕەچاوی بکەین.

### گەلاوێژ

گەلاوێژ لە کوردیدا بە ئەستێرەی "گولاوێژ، کاروانکوژە، کاروانقڕان، قۆرەپیشان، گاقۆڕان، مانگ گاقۆڕ و قورخ"یش ناسراوە. بە واتای گیشە و شارای گەنمی درواویش هاتووە.[1] لە زمانی فارسی بە "شباهنگ، تیشتر"، لە عەرەبی بە "الشعری الیمانیة" و لە ئینگلیسی بە "Sirius" دەناسرێت. لە قورئانی پیرۆز بەم شێوە ناوی هاتووە: "وَأَنَّهُ هُوَ رَبُّ الشِّعْرَى"[2]. ئەم ئەستێرەیە لە کۆنەوە خەڵك ناسیویانە. هەندێ جار خەڵك ناوی گەلاوێژ و ئەستێرەی

---

١. ماجد مەردۆخ ڕۆحانی، "فەرهەنگی کوردی بە فارسی دانشگاه کوردستان"، ٤ بەرگی، پەخشانگای زانکۆی سنە، ١٣٩٧: وشەی: گەلاوێژ

٢. سوورەی نەجم ئایەی ٤٩. گوایە هەندێ لە خەڵکی عەرەب پێش هاتنی ئیسلام ئەستێرەی گەلاوێژیان پەرستووە و خوا لەم ئایەتە ئاماژەی بە خولقێنەری گەلاوێژ کردووە کە خوای هەموو جیهانە.

ســیوەیل بە یەك دەزانــن، بەڵام ئەم دوو ئەســتێرەیە لەیەك جیــان.[١] لای یۆنانیەکــان بە ئەستێرەی هەرەدرەوشاوە و میسریەکان بە ئەســتێرەی نیــل بەناوبانــگ بــووە. میســریەکان وتوویانە: ئەستێرەی گەلاوێژ هەڵدێت چۆمی نیل دەژێیتەوە و خەڵــك ئــاگەدار دەکــاتەوە کە خرۆشان و لافاو دێتەوە.[٢] لای ئایینی زەردەشــت ئەســتێرەی گەلاوێــژ بەم شــێوە ناسـراوە: *تیشتەر، ئیزەدێکە کە خاوەنی یەشتی هەشتەمی ئاڤێستایە. سروشت و جنسی ئاوە. پاشــای هەموو ئەستێرەکانە و پێویستە هەموان پەسن و پەســەندی بکەن. ئەگەر گەلاوێــژ نەبێــت دێوی وشکەساڵی هەموو دنیا لەناو دەبات.*[٣]

وەك زانیاریەکانی بــواری گەردوون و ئەستێرەناســی دەریــدەخەن گەلاوێــژ ڕوونــاکترین ئەستێرەی ئاسمانە و یەکێك لە نزیکترین ئەستێرەکانە بە گــۆی زەوی. بارســتە و ئەنــدازەی گەلاوێژ ٢/٤ ئەوەندەی خۆر دەبێت. هەڵهاتنی گەلاوێژ کاتژمێرێك پــێش هەڵاتنــی خــۆرە لە باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسماندا و زوو تێ دەپەڕێــت. لای بــاکووری زەوی (نیمکــرە شــمالی) لقێك لە سێگۆشەی زســتان، ئەم ئەســتێرەیە. گەلاوێــژ لە بــازنەی کــۆی ئاســمانی "ســەگی گەورە"دا هەڵکەوتووە.[٤]

هەموو ساڵێك لە ڕۆژمێری جەلالی، مانگی دووی هاوین دەست پــێ دەکــات و ٣١ ڕۆژە. گەلاوێژ دەکەوێتە نێوان پووشپەڕ و خەرمانان، واتا لە ناوەڕاســتی وەرزی هــاوینە. نیشــانەی دیاریکردنی ئەم مانگە، هەمان دەرکەوتنی ئەستێرەی گەلاوێژە لە ئاسمانگی کوردســتان کە پاش چلەی هاوین لە بەرەبەیانی ڕۆژی ١٥ گەلاوێــژ (مــانگی پێنجــی ڕۆژمێــری کــوردی و جەلالی) دەست پێ دەکات، کە بەرابەرە لەگەڵ ڕۆژی ٥ لە مانگی ٨ ڕۆژمێری زایینی.[٥]

لە کوردەواری کاتێ ئەم ئەســتێرەیە دەر ئەکەوێــت، خەڵــك دەڵــێن: *گەلاوێــژ هەڵهــات،*

---

١. ئەستێرەی سیوەیل (بە فارسی سهیل) پاش گەلاوێژ دووهەمین ئەستێرەی درەوشاوەیە. لە گۆرانی کوردیدا دەڵێن: باڵاو بە بەرزی قەد بە باریکی / ئەستێرەی سیوەیل کەفتە تاریکی.

٢. ویکیپێدیای فارسی، وشەی: شباهنگ

٣. مێهرداد بەهار، کتێبی "پژوهشی در اساطیر ایران"، چاپی یەکەم، پەخشانگای آگە، تاران، ١٣٩٥: لاپەڕە ٦١-٦٢

٤. ویکیپێدیای فارسی، وشەی: شباهنگ

٥. بەداخەوە ماوەیەکە هەڵەیەکی زەق لە هەندێ میدیای باشووری کوردستان دەرکەوتووە و جێ خەرمانان و گەلاویژیان گۆڕاوە. بۆ نموونە ڕۆژانە لە ناوبرەکانی کەناڵی کوردسات مانگی خەرمانان بە مانگی دووهەم و گەلاوێژ بە مانگی سێهەمی هاوین دادەنرێت.

*گەلاویژ لە کۆ[1] کنیا، گەلاویژ دەرکەوت، گەلاویژ ئەنگوت و گەلاویژ بەدیار کەوت.* کاتێ گەلاویژ ئەنگوی هەوا بەرەو فێنکی دەڕوات، کەشی شەوانە بەتایبەت نزیکەو بەیان سارد دەبێت، ڕۆژانە سوورەتاوی هاوین زۆر کاریگەر نابێت و شنەی ڕۆژبا فێنکی دێنێت. دەرکەوتنی گەلاویژ بۆ خەلەوانان هێمایەکی گرینگە. دەبێ وەخۆ کەون و شەغرە و شاراکانیان کۆ بکەنەوە. کێشە و گێرەی بکەن. چونکا کە گەلاویژ هەڵهات ڕۆژبا و شەوبا دێتە هاوکاری خەرمان و شەنەوان. ئەوسا لە کوردەواری خەڵك بۆ شەن کردن، شەوانە لەسەر خەرمان شەوبنە دەبوون و پاش نیوەشەوان سوودیان لە شنەی شەوبا وەردەگرت و تا نزیکەی چێشتەنگاو بەشەوبا شەنیان دەکرد. دیسان تا نزیکەو نوێژی خەوتنان بەڕۆژبا شەن و کەویان دەکرد. ئەمانە هەموو لە ڕووی بەرنامە و پێڕەوی پەسەندی پێشینیان هاتووە و بە ئێمە گەیشتووە.[2]

لای جوتیار و وەرزێر و باخەوان و شوانەکان، ئەنگوتنی گەلاویژ چەندین پەیام و پەیڤی پێوەیە:

- کانیاوەکان وا بە سوورەتاو و هەڵمی گەرمی هاوین کز بوون و وشکاییان هاتبوون، ئاوەکەیان زیاد دەکات یا هەندێ دەژیینەوە. لە ناوچەی ئەردەڵان ئێژن: *ئاو ئەژووژیێتەو.*
- زەوی شۆ هەڵدەهێنێت (شێدار دەبێت) و بەیانیانە تەڕایی دەکەوێتە سەر ڕووپەڕی دەشتی نسارەکان.
- دانیشتوانی بەری زرێواری مەریوان کاتێ لە هاوینا تەم و مژێك لەسەر قامیشەڵانەکانی زرێوار بکەوێت، ئەو بە نیشانەی هەڵهاتنی مانگی گەلاویژ دەزانن.
- گەلاویژ هەڵهات پەپووی شەلەمینکەرە دێتە سەر ئاوایی و مژدەی فێنکایی کەش-وهەوا ئەدات و کابانی ماڵان دەست بە دۆینە و شەلەمین نانەوە دەکەن. هەروەها پەلە دەکەن لە پاشەکەوت و زمهاڕ بۆ زستان.
- ئاودێران لەچاو جۆزەردان و پووشپەڕ کەم دەبێتەوە و فێنکایی کەشی خاك و سەرزەوی یارمەتیدەرە بۆ دامرکاندنی توونیایەتی باخ و بێستانەکان.
- بەرەبەرە میوە و بەرەکانی پاییز دەگەن و شیرینایی‌یان تێ دەکەوێت.

---

١. هەمان صورت فلکی لە عەرەبی و پیکر آسمانی لە فارسی

٢. لە ناوچەی "خوور و جەندەق"ـی ئێران کاتێ گەلاویژ هەڵدێت خەڵك جەژن دەکەن و بە "جەژنی شێلم" دەناسرێت. [فەرهادی مورتەزا و تەوەکولی نیرە، کتێبی "فرهنگ یاریگری در ایران: درآمدی به مردم شناسی و جامعەشناسی تعاون"، پەخشانگای نشر دانشگاهی، تاران، ١٣٩٥]

● گوێز لە قۆناغی چڵمەلەتەیی بەرەو گرسانی کاکڵە دەچێت.

● قوورەقووڕی شەوانەی ڕێوی ناو باخە ڕەزەکان دەست پێ دەکات. واتا ئاژەڵی ڕێوی شەوانە ڕوو لە خواردنی ترێ دەکات و بەرەبەیان ناوسکێشە دەگرێت و تا تاو هەڵدێت دەقووڕێنێ.

● دوای هەڵهاتنی گەلاوێژ، میوەی ترێ تامی شیرین دەبێ و پێدەگات. هەر بۆیە لەکۆنەوە وتویانە: *دوای گەلاوێژ ترێ بەتامتر ئەخورێ یان گەلاوێژ کەوتە بەر شەوێ، دەست بەرە بۆ باخەڵی مێوێ.*

● شەڵتە و زەردهەڵگەڕانی بێستانەکان دەست پێ دەکات.

● مەلوێچە و گیاکەوگ و جەواشیر و هەرێزی ناو شێف و دێمەکارەکان شین دەبن و زیاتر گەشە دەکەن.

● جوتیار دەست بە بوومێری جاڕ و پەرێز دەکات و شێلم و توور دەچێنێت.

● کاتی کاکێشان و بارکێشی خەلە و خەرمان و باخ و بێستان دەست پێ دەکا.

● چرۆ و خەڵف و تەرزی گەلاوێژی دار و بێستان دەست پێ دەکات.

● هەر دارێك گەڵای وەریبێت لە تینووان، دوای گەلاوێژ دووبارە چرۆ دەکاتەوە، زەویش دەخووسێ و باشتر ئاو ڕادەکێشێت، باخ و بێستان و شیناوەردیش ئاوێکی کەمتریان دەوێ.

● پێش گەلاوێژ کاتێك دارێك دەبڕی بە ئاسانی توێکڵی لێ دەبێتەوە، بەڵام دوای گەلاوێژ بەزەحمەت توێکڵی لێ دەبێتەوە.

● زڵەزڵی ئاوی گۆم و بوار و کانیاوەکان بەهۆی سەرماوە دەست پێ دەکەن. کورد گوتەنی: *ئاوی کانی وەك چاوی قرژانگ ڕوون دەبێت.*

● خەڵك زیاتر خۆی دەپارێزێت لە مەلەکردنی ناو گۆمەکان، بەتایبەت بەدەر لە کاتی نیوەڕۆیان.

● لە ناوچەی سنە ئێژن: گەلاوێژ هەڵهات ئەگەر خۆت شۆرد یا لە گۆم و چۆما مەلەت کرد، حەتمەن خوەت داپۆشە. ئەینا هەواپەتا ئەگریت. هەواپەتا هەمان پاییزەڕێژە.

● لەکۆندا کاتێك ئەستێرەی گەلاوێژ دەردەکەوت، ئەیانگوت: *مندالینە چیتر مەلەی مەکەن و خۆ دەناو ئاوێ هەڵمەینن. گەلاوێژ ئەنگوتیە نەخۆش دەبن.*

● خەڵك دڵنیا دەبن کە کەشی گەرا و بەچکردنی ماسی کۆتایی هاتووە و دەتوانن بەئارخەیانی ڕاوەماسی بکەن.

● ژەمی عەسرانەی شوان و دەشتەوان خۆی ئەداتە پاڵ ژەمی نیوەڕۆ یا ئێواران. واتا ڕۆژ کورت بووەتەوە.

● کۆڕی مەڕ و بزنان زۆر گەرم نابێ و نیوەڕۆیان زوو ڕائەدەن و مۆڵگە بە جێ دەهێڵن.

● کاتی تگەگرتنی بزن و بەران گرتنی مەڕ دادێ و سکپڕ دەبن بۆ زایینی زستان.

● هاوینەزێ و پاییزەزێ مەڕ و بزنەکان دەست پێ دەکات.

● ئاژەڵداران دەست بە گلدانەوەی مەڕ و پاتاڵی لاواز و پیـر دەکەن و نێـری و بەرخـی نێر لە ماڵ دائەبەستن و خزمەتیان دەکەن بۆ فرۆشی پاییز.

● مەڕ و ماڵات هەست بە هاتنی گەلاوێژ دەکەن و دوای گەلاوێژ لە شـەویندا لەیەکتـر نزیك دەبنەوە. ئەوەش نیشانەی فێنکبوونی کەش و هەوایە.

● کـاتی لەوەڕانـدنی ڕۆژانە لە پـاش گەلاوێـژ کەم دەبێـت و شـوان فریـا ناکەوێـت بحەسێتەوە و نان و چایی بخوات. زوو لارەسێوەری دۆڵەکان دێـنەوە. جـا پێویسـتە شـوان هەڵمەتی زۆرتر بێت و گاڕان و گاگەلەکەی تێر بکات.

● شیری مانگا و بزن و مەڕە دۆشەنەکان کەم دەکەن و تا کاتی زایینـی پـاییز، زۆرێـك لە خێزانەکان ماست و دۆیان نییە یا کەمیان هەیە. کورد گوتەنی: *دەم وشك ئەبن.*

● کابانی ماڵ دروستکردنی بەلەچەك (وشككردنەوەی کوولەکە)، پەتڵە (گەنـم کوڵانـدن بۆ دۆینە و بروێش)، شۆردنەوەی خەلەی هاڕین، بژاردن و پاك کردنی دانەوێـڵە و وردەدان، دۆینە و شەلەم نانەوە، و بەگشتی پاشکەوتی زمهاری زستان دەست پێ دەکات.

● پیـاوان گەلێـك وردەهەرمـانی وەك پەیـین کێشـان، بەردچنینـی نـاو جـاڕ و پەرێـز، قەوزەماڵی هەسێل و جۆگە، کاکێشان، دارکردنەوە (دار قەڵاشتن) و لیژنەدار ئامـادە کـردن، ئاوەنیا و بوومێر کردنی جاڕەکان بۆ کێڵانی پاییز، و گەلێك کاری دیکە دەکەن.

● پـاش گەلاوێـژ چونکـا خێزانەکـان بەتـایبەت لە لادێ بەرهەمیـان کـۆ دەکەنەوە و داهاتیان دیاری دەبێت، گەلێك جموجووڵی لاوەکی بنەماڵەیی بەرچـاو دەکەوێـت: زەمـاوەن کردن، ماڵ کردنەوە و نۆژەنکردنەوەی خانوو، پۆشتەکردنی ناومـاڵ، بـازاڕچوون بـۆ کڕینـی پێداویستی ماڵ و منداڵ، هاوماڵی ئاوایی (وەك کاری لوولەکەشی ئـاو، ڕێگاوبـانی دەشـت و کێو، مزگەوت و ماڵە هەژاران، دەستگرتن و یارمەتی فەقیر و لێقەوماوان)

● گەلاوێژ هەڵهات هەندێ لە دارەکان میوەی گەلاوێـژی دەرئەکەن، وەکـوو گـوێژ. ئەم میوەیە چکوولەیە و کەمتر نـاوکەکەی دەگرسـێت بە کـاکڵە. باخەوانەکـان بە گەلاوێـژی و گوێژە میژووکی دەیناسن. هەروەها هەندێ لە گیاکان وەکوو هەرێـز لە گەلاوێـژ دیسـانەوە

واشبڕیان دێتەوە و گوڵ دەکەن.

- ئەگەر گەلاوێــژ ئەنگــوت، هەر دوو باڵنــدەی پەڕەســێلکە و حــاجی لەق لەق کــۆچ دەکەن و پەپووسلێمانکە هەر کە هەستی بە نزیکبونەوەی گەلاوێژ کرد، دێتە جێگای ئەوان و شوێنیان دەگرێتەوە. گوایە پەپووسلێمانە لەسەر گیای هەرێز دەنیشێت و تــووی دەخــوات و باڵەفڕێ دەکات بە فێنکایی ساڵ.
- ئەگەر گەلاوێژ ئەنگوت ئیتر وەختی مازووانە و خەڵك دەچن مازوو دەکەن.
- گەلاوێژ هەڵهات ئاژەڵداران کوناوچی کادێنەکانیان هەڵـدەدەنەوە و تفـاق دەکێشــن و کا و گزرەی ئاژەڵەکانیان بۆ زستان دابین دەکەن.
- ئێژن ئەگەر مەڕەسوور خۆی کۆ کردەوە، یانێ ئەوە گەلاوێژ هەڵهاتووە.

بە ئەنگوتنی گەلاوێژ، یەکێك لەو ئامۆژگاریانەی پیران و پێشینیان دەیکەن، خۆپاراســتنە لە پاییزەڕێز بوون.

## پاییزەڕێز

ئەم وشەیە زۆرتر لە ناوچەکانی هەورامان و ئەردەڵان باوی هەیە. پێش گەلاوێژ بــاوی نیــیە و نابیسترێت. ئاماژەی وشەکە بۆ ئەوەیە کە ئەگەر گەلاوێژ ئەنگوت کەشی شــەوانە زیــاتر و ڕۆژانە فێنك دەبێت و هەوا بەرەو ساردی دەڕوات. ئاوی کانیاو و چۆماوەکان ســارد و چیــاو دەبن. ئەو کەسانەی سروشتی سارد و تەڕیان هەیە ئەگەر پاش گەلاوێژ زۆرتر خۆیان بخەنە ناو ئاو و مەلە بکەن، لەش‌ولاریان چیامانی دەکێشێت و پەتا و ئالامەت دەگرن. زۆر جــار لە بەسالاچووەکانم بیستووە کە گەلاوێــژ هەڵهــات پــارێز بــکەن و زۆرتــر دەســت بگــرنەوە لە خــواردنی بەرهەمــی وەك خەیــار، تــرۆزی و ماســت. یــا شــەوانە ئەگەر لە کێــو دەبیــت و شەوبنەی، کەمتر ئاوی کانیاوەکان بخۆنەوە. چونکا پــاییزەڕێز دەبــن. ئەم ئامۆژگــارییە هەتــا بەرەو وەرزی پــاییز و گەلاڕێــزان و ســەرماوەز دەچێــت، زیــاترە. پــاییزەڕێز هەمــان پەتــا و ئالامەتە کە مــرۆڤ بەهــۆی هەڵمژینــی ســەرما و ســۆڵەوە تووشــی دەبێــت. جــا ســەرەتای پاییزەڕێزی لە پاش هەڵهاتنی گەلاوێژەوە دەست پێ دەکات و لە سەرماوەز دەگاتە لــووتکە. پاییزەڕێز تەنیا بۆ مرۆڤ بەکار ناچێت. بۆ ئاژەڵەکانیش دەگوترێت. بۆ نمــوونە ئەوانەی مەڕ و مالاتیان شەوانە بە کەژ و کێوەوە بووە و شەوگەڕ بوون، پاش گەلاوێژ شــەوانە وردەوردە لە ئاغەڵ و گەوریان دەکەن. بەپێــی هەلــومەرجی جوغرافیــایی نــاوچە پــاییزەڕێزی دەتوانێــت درەنگ یا زوو بێت. واتــا لە کوێســتانەکان پــاییزەڕێزی زووتــرە و کۆتــایی مــانگی گەلاوێــژ

هەڕەتی سەرما و پاییزەڕێزی دەست پێ دەکات. کاتێ سەرما زۆر کاریگەر ئەبێت و بەروبوومەکان دەشڵەقێنێ و دەیگۆڕێ، دەگوترێت: *پاییزەڕێز بووە.*

پاییزەڕێز بە "شەختەلێدراو و سەرمابردوو"[1]یش ناسراوە. شەختە هاووتای دیکەی "شەڵتە، بەستەڵەك و سەهۆڵ"ـە.[2] لە فەرهەنگی ئاناهیتا بۆ وشەی پاییزەڕێز هاتووە: سەرمابردووی پاییز، شتێکە سەرمای پاییز لێی دابێت و کاری لێ کردبێت. شەختە بە چەندین دەستەواژە و هۆنراوەی بەرچاو لە فەرهەنگی کوردیدا خۆی دەرخستووە:

- شەختە ئەنگاوتن: سەرما لێدان (دیارە لای شەختەیە ناخۆش خەوەرێ / دارە خۆی دەرنێ، خەزەڵ هەڵدەوەرێ، ... لەجێی بادی سەبا شەختە نەسیبی نەونەمامان بوو / لەجێی بولبول قەلی ڕووڕەش نەواخوانی گوڵستان بوو [دیوانی بۆ کوردستان، هەژار]، لە باخ و چڕ ئەوی دار و درەختە / هەموو زەردن لە ترسی هێرشی شەختە) [تاریك و ڕوون، هێمن].
- شەختەبەند: بەستەڵەك و سەهۆڵبەندان (دڵمان شەختەبەند چون زمستانەن / دەروون ساف وێنەی کەمەر هەسبانەن). [دیوانی حیلمی کاکەیی، شێعری فەقێ خاسەنان]
- شەختە بزووتن: سەرما و سۆڵە داهاتن (تێپەڕی سەرما، و سەرما ئەنگووت / لەپڕێ بەستەڵەك و شەختە بزووت). [دیوانی مامۆستا حەقیقی]
- شەختە کەوتن: شەختە هاتن و سەرما و بەستەڵەك داهاتن (هۆڵی بینا نا بزن و تێ خزن / شەختە کەوت قاچ و قولی پەز تەزی). [دیوانی مامۆستا حەقیقی]
- شەختە و بەند: سەرما و بەستەڵەك (تۆ بڕۆ تا زووە لەو مەڵبەندە / هەڕەتی هاتنی شەختە و بەندە). [دیوانی مامۆستا حەقیقی]

---

١. بە فارسی "سرمازده"

٢. ماجد مەردۆخ ڕۆحانی، "فەرهەنگی کوردی بە فارسی دانشگاه کوردستان"، ٤ بەرگی، پەخشانگای زانکۆی سنە، ١٣٩٧: وشەی: شەختە

## دووگیانی و منالّبوون له سەردەمی کۆنی کوردەواری

**(وەرگیراو له نەریتی کۆنی شاری سەقز[1] و ئاوایی باقلاوا[2])**

بەردەوام بـوونی ژیـان لەم دنیـایە بەهـۆی منـاڵبوون و لەدایکبـوونەوە دێـتە ئـاراوە. ئەگەر بەرەیەکی سەد ساڵە مناڵ لەدایك نەبێت و دایکان دووگیـان نەبـن تـۆرەمەی مـرۆڤ بەرەو لێواری نەمان دەڕوات. کەواتە لە هەموو چاخەکـانی مێـژووی مرۆڤایەتیـدا زاوزێ دیـاردەی سەرەکی ژیان بووە و مناڵ درێژەدەری بوونی بنەماڵە دانراوە. سـەردەمانی کـۆن کە هێشـتا یاساکان خێڵەکی و ڕەشۆکی بوون ژن وەك پارچە زەویەك مامەڵەی بۆ کراوە و پیـاوان وەك تووچێن بەرهەمیان چاندووە. ئەمە سەرەتاییترین هەڵوێسـتی مـرۆڤ بـووە لەمەڕ دایـکەوە. هەر بۆیە فرەژنی ڕەهەندێکی ئاسایی و قەبـووڵکراو بـووە لای نەتەوە کۆنەکانـدا. دەسـەڵاتی دارایی و هێزی جەستەیی پیاو ژمارەی ژنەکانی یەك پیـاوی دیـاری کـردووە. کـاتێ باسـی پەروەردە ئاسمانی و زەوینیەکان هاتە گـۆڕێ و مـرۆڤ بەرەو قۆنـاغی شارسـتانیەت و ژیـار هەنگاوی هەڵێنا، بەرەبەرە باسی یەکسانی گیانی ژن و پیاو دەسـتی پـێ کـرد. ئەم قۆنـاغە ڕێگەیەکی دووری پێواوە و هێشتا هەر درێژەی هەیە.

له خۆشترین حاڵەتی شارستانیەت و ژیاری مرۆڤایەتیـدا منـداڵ بەرهەمێکـی یەکسـانی نێوان دوو مرۆڤی پیاو و ژنە واتا بەری داری بنەمـاڵەی دایـك و بـاوکە بـە بەرهەمهێنـان و بەرپرسیارەتی یەکسان.

هەوڵی ئەم وتـارە ئەوەیە کەشـی دووگیـانی و منـاڵبوونی سـەردەمانی کـۆن لە ژیـانی کوردەواریدا نیشان بدات. دیارە کە ئەم گەشتە گێـڕانەوەیە لاپەڕەیەکـی گرینگـی مێـژووی شارستانیەتی گەلی ئێمەیە و نابێت فەرامۆشی بکەین. چونکا فەرهەنگـی پزیشـکی زایـین و

---

1. زانیاریەکانی ئەم بەشە وەرگیراوە لە بابەتی (آزمودەهای مردمان سقز از ولادت طفل و مامایی سنتی تا دوره کنونی)، ئازاد کەریمی، www.sharnews.com: ۱۳۸۷/۱۱/۱۷

2. سەر بە ناوچەی کەلاتەرزان لە شارستانی سنە

زەیستانی لە بواری تەندروستی هەنووکەدا درێژەی ئەزمـوون و زانسـتی ڕێگـای پێشـینیانە. تەندروستی سەردەم کەشێکی جیاوازتری ڕەخساندووە بـۆ دووگیـانی و منـاڵبوون. لای زۆر کەس ئەم کەشە تەنیا ئەنجام و ئاکامی زانسـت و ئەزمـوونی دەرەوەیە و پێشـینیانی ئـێمە هیچ بەرهەمێکیان نەبووە کە بیخەینە سـەر ئەو پاشـخانە پزیشـکییە. دیـارە ئەم تێـڕوانینە تەواو سەقەتە و نابێ بۆ ترۆ کـردن و تـووڕدانی فەرهەنگـی خۆمـان ڕێـگە خۆشـکەر بـین. ئەوەی لە تەندروستی سەردەمدا هاتووەتە ئاراوە ڕەنجی هەموو زانایانی نووسـەر و تـوێژەر و هەروەها ئەزموونـدارانی خوێنـدەوار و نەخوێنـدەواری شـاری و لادێیـیە کـە گەیشـتووە بە کاروانی تەندروستی ئەورۆ. کەواتە لێدوان و نووسینی چاخە مێژووییەکانی هەموو بوارەکانی زانستی نەتەوەکەمان دەتوانێت ئەوە دەربخات کە ئێمە لە گەیاندنی ئەم هەگـبە جیـاوازە بە کاروانی تەندروستی ئەورۆ چە دەور و ئەرکێکمان بووە و ڕێژە و بارستایی ئێمە لە توێشـەی ئەم پرێسکەیەدا چەنێك بووە.

### ١) دووگیانی[1]

بەستنی هەوێنی نێوان ژن و پیاو لە سات و چرکە و خولەکی خۆیدا پاش ڕەحەتبـوون و ئاوهاتنەوەی پیاو دروست دەبێت. ئەوسا ئەم قۆناغە بە تێکەڵبوون و سـەرجێیی دەناسـرا. لەم قۆناغەدا تۆواوکی پیـاوەکە بەرەو دیـواری هـێلکەی ژنەکە دەڕوات. زانسـتی ئەورۆ وای دیاری کردووە کە خانەیەکی هاوبەش لە تۆواوك و هـێلکە تـا ٣ ڕۆژان دروسـت دەبێـت و بەرەبەرە زیاد دەکات و گەورە دەبێتەوە. پاش ئەم سێ ڕۆژە بەرەبەرە تڵە خوێنێـك دروسـت دەبێـت. دایـك پـاش ئەوەی جـاری یەکەم کە سـووڕی مانگـانە ڕووی نەدا هەسـتی تـێ دەگەڕێت کە دووگیان بووە. ژن بۆخۆی ئەم قۆناغە سەرەتاییە بە "سکپڕی" ناو دەبـات. واتـا بە مێردەکەی دەڵێت: *پیاوەکە دیارە کە سکم پڕ بووە و ئەم جارە سەروعزرم نەشۆردیە.*

### ٢) بێزیەوان

لەنـاو قسـەی خەڵکـدا هەیە کـاتێ کەسـێك ئـارەزووی زۆر لە خـواردنی شـتێك بێـت، دەگوترێت: *"ئێژی ژنی بێزیەوانە"*. بێزی[2] حاڵەتێکە هەندێك لە دایکـان پـاش ٣-٤ مانـگ لە دووگیانی تووشی دەبن. واتا ئارەزوویان دەچێتە سەر خواردن. ئەم ئیشتیا و ئارەزوویە ڕەگی

---

١. سکپڕی و بارداری، بەفارسی دەبێتە حامله و بارداری. ژنی دووگیان بە فارسی دەبێتە "زائو"
٢. بێزگ و مژدی، بەفارسی دەبێتە ویار

هاری پێوەیە و دایك زۆر بەسەختی دەتوانێت پڕکێشی بۆ نەکات و نەیخـوات. هەنـدێ جـار دایك ئارەزووی دەچێتە سەر شتی سەیر و سەمەرە. جاری وایە ژن بێزی کردووە بە میوە یا خواردنێکەوە کە ئەوکاتە لەبەردەستدا نەبووە یا هێشتا پێ نەگەیشتووە. بـۆ نمـوونە زسـتان بووە و بێزی کردووە بە هەڵووژە ترشە یا شـووتیە دەیمـیلە. تەنـانەت وا پـێش هـاتووە ژن ئارەزووی چووەتە سەر بابەتی گڵ، دار و شتی پـیس و پۆخـڵ. ئەوسـا دەر و دراوسـێ کە ئاگەداری دووگیانیەکە دەبوون ئەگەر خواردەمەنی یا چێشتێکی ئاوارتە و دەگمەنیـان بـوایە و هەستیان بکردایە کە دایکە دووگیانەکە چاوی پـێ کەوتـووە بۆیـان دەبـرد کە بیخـوات. چونکا خەڵك باوڕی وابوو کە نەوسی کۆرپەلەکەی دەبێتە ڕەشماریك و شەو دێتە خەویـان و لە ملیان دەئاڵێت. بێزی کردن کاتێ سەر هەڵئەدات کە قۆناغی تـڵە خـوێن و پـلە گۆشـت کۆتایی پێ هاتووە و کۆرپەلە[1] دەست و پێ و سەر و بەچکی دەر کـردووە. واتـا "کـۆرپەلە" دروست بووە.

### ٣) ئاولەمە

بەگشتی کۆرپەلە بە منداڵی ناوسکی دایـك دەگوترێـت، بەڵام قۆنـاغی ئـاولەمەیی کـاتێ دەست پێ دەکات کە دەست و پێ و سەر بەچکی کـۆرپەلەکە ئاشـکرا بـووە، بەڵام هێشـتا هەندێ ئەندامی تر ماوەتەوە. کاتێ تەواوی ئەنـدامەکانی یەك مـرۆڤ لە ئـاولەمەدا دروسـت بوون ئیدی بە کۆرپەلە دەناسرێت. بەپێی پزیشکی ئەوڕۆ ئاولەمە بە فارسیدا دەبێتە "جنـین اولیە" و کۆرپەلە دەبێتە "جنین کامل یا تکامـل یافتـە". لە هەنـدێ شـوێنی کوردسـتان لە شارەکاندا دووکانەکانی کەلەپاچە و قەسابی گۆشتی ئاولەمەی مانگـا ئەفرۆشـن. جـا هەر لە ڕووی ئەو ئاولەمەیە دیارە کە قۆناغی پێش تووك کردنـی گـوێرەکە بە ئـاولەمە دەناسـرێت. واتا کاتێ مانگایەکی ئاوس سەر ئەبـڕن گـوێرەکەکەی ناوسکیشـی سـەر دەبـڕن و ئەویـش دەخۆن.

### ٤) قسە و باسەکانی دووگیانی

ئەوسا کە ئامێری پزیشکی نەبووە هەموو قسـەکان لەسـەر کـوڕ و کچیـی کـۆرپەلەکە، تەندروست و ناتەواوی و ڕۆژی منـداڵبوونەکە، بە گـوێرەی پێشـبینی و خەملانـدن و فـاڵ بووە. ژنی دووگیان بۆ دڵنیابوون لە ژیانی منداڵەکەی پاش سێ مانگان دەچووە لای مامـانی ئاوایی. لەبەردەستی مامانەکە ڕادەکشا و ئەویش دەسـتی لە نـاوك و بەرنـاوکی دەخسـت و

---

١. بە فارسی دەبێتە "جنین"

جووڵانەوەی منداڵەکەی پێ دەگوت. خانمی مامان بە ژنە دووگیانەکەی دەگوت کە لە کەنگێوە سەروعوزرت نەشۆردووە. بەپێی وڵامی ئەو پرسیارە مانگێ کەمتر یا زیاتر ڕۆژی منالبوونەکەی پێ دەگوت. جاری وابووە دایك چەند جار چووەتە لای مامان بەتایبەت لە مانگ و ڕۆژەکانی پێش لەدایك بوونەکە. مامانەکە دەستی لەسەر سك و منالدانی[1] گێڕاوە و بارودۆخی منالەکەی پێ گوتووە تا ژنەکە دڵنیا بێتەوە و ترس و دڵەڕاوکێ نەیگرێت. هەر لە کۆنەوە وا هاتووە کە منداڵ تا نۆ مانگ و نۆ ڕۆژ و نۆ خولەك و نۆ چرکە لە ناوسکی دایکیدا دەمێنێتەوە. دەکرێت زووتر بێتە دنیا، بەڵام لەم ماوە زیاتر بمێنێتەوە تێزاو و تاماوی ناو منالدانەکە دەخواتەوە و دەخنکێت. وا باو بوو دایکێك لە کاتی دووگیانیدا مۆن و گرژ بوایە ئەیانگوت منالەکەی کچە و ئەگەر ڕووخۆش و خۆشحاڵیش بوایە ئەوە منالەکەی کوڕە. یا ئەگەر سەر منداڵەکە بەرەو لای چەپ بوایە منالەکە کچ و بەرەو لای ڕاست کوڕ دەبوو.

ئەوسا بۆ پاراستنی ژنی دووگیان و کۆرپەلەکەی ئەم ئامۆژگاریەیان کردووە:

- ژنی دووگیان نابێ هارە (دەستاڕ) بکات و بچێتە لای چەقچەقەنەی ئاش.
- لە کاتی شەڕ و ئاژاوەدا ژنی دووگیان خۆی بشارێتەوە یا دەستێك بە داوێنەکەیەوە بگرێت و دەستێکیش بگرێتە بان چاویەوە و دوور بکەوێتەوە.
- دارەوانی و هەڵگەڕان بە دیوار و بانی بەرز بۆ ژنی دووگیان مەترسیدارە.
- دەستەخۆشکان بۆ کاتی دووگیانی بەکەڵکە. ئەو کارانەی وا قورس و دژوارن و پێویستە بۆ ماڵداری بکرێن، یەکێك لە دەستەخۆشکەکانی ناودێ و گەڕەك یارمەتی دایکەکە بدەن.
- کاتێ نان ئەخوات دەستێکی بە پارووەکەیەوە بێت و دەستێکی بە سەر سکیەوە تا هەست بکات کە کۆرپەلەکەی نانەکەی پێ خۆشە یا نە.
- دوور لە چاوی کەس دابنیشێت و دەست لەسەر سکی بگێڕێت و سەری کۆرپەلەکەی بدۆزێتەوە و بیلاوێنێت و هۆرە و لۆرە و گۆرانی بۆ بخوێنێت.
- زۆر خۆی تەڕ نەکات و بەر باران و ناو ئاو نەچێت. ژنی دووگیان و زەیستان زوو ئاوجز ئەکات و چیامانی ئەکێشێ.
- بار و کۆڵی قورس هەڵنەگرێت بەرەکەی ئەتۆقێت. واتا لفەکەی ئەتەقێت و

---

1. کۆرپەدان و پزدان، بە فارسی دەبێتە "رحم"

کۆرپەلەکەی تێدا ئەچێت.

● خەڵك بە بەرچاوییەوە شتی خۆش نەخۆن. چونکا ئێژن: *بەرەکەی ئەتۆقێ یا بەرەکەی ئەخات.*

● ئەگەر بێزی کرد بە شتێکەوە تا ئەو جێگەیە دەکرێت بۆی مسۆگەر بکرێت.

● بەهێ زۆر بخوات با منالەکەی جوان بێت.

● تیکەی حەرام و گوماناوی نەخوات بـا خـوێنی منـاڵەکەی تێکەڵـی هەوای حیـزی و دزی نەبێت.

**٥) منالی نۆکام**[1]

هەندێ جار دایکان زووتر منالیان بەدنیا هاتووە. ئەگەر کۆرپەلەکە لە مانگی خۆیدا بـوایە یا ئەوەیکە بەگشتی کۆرپەلەکە وردیلە بوایە، ئەوە کـوولەکە سـەراویەکی گەورە و وشـکیان ناوکۆڵ دەکرد و لۆکەیان دەخستە ناوی و خامێکی ناسك و کەتانیان دەخستە سەر لۆکەکە. منالەکەیان لەوێ دەخست و تەڕ و وشکیان دەکرد و شیریان بۆ دائەدۆشی و بە دەمیـانەوە ئەکرد. ئەوپەڕی هەوڵیان ئەوە بوو کە کەمتر دەستەمۆ و دەسـتاژۆ بێـت و هەوای دەرەوەی وێ نەکەوێت تا وشکەوە نەبێت و نەمرێت. لە حـاڵەتی ئاسـایی و ڕەشـاییدا تـا هەفـتەیەك کۆرپەکە بەم شێوە ڕائەگیرا. ئەگەر حەکیمێکی لێهاتوو لە ناودێ بوایە بە هاوکـاری حەکـیم و مامانەکە لەوانەبوو تا نزیك یەك مانگ مندالەکە هەڵیکردایە. ئەگینـا ئەوسـا زۆربەی منـالە نۆکام و نەمەگیەکان چارەنووسیان مەرگ بوو. ئێستاش یادگاری سـەردەمی ئەم کـوولەکەیە لە زاری خەڵکدا ماوەتەوە: "*ئێژی سـەری لـە نـاو کوولەکـا جەڕیـا*: یـانێ کەسـێکی لاواز و بابردەڵەیە"، "*ئەشێ بە کوولەکە سەراویچ بێـژێ دایە*: واتـا خەڵـك هەق و منەتیـان زۆرە بە سەریەوە" و "*ئێژی لۆکەی ناو کوولەکە سـەراوییە*: یـانێ جـێ خەوەکەی هێنـدە خـاوێن و نەرمە". ئەڵبەت ئەگەر منداڵی پێش ٦-٧ مانگی بە نەمەگی ئەناسرێت. ئەم جۆرە کـۆرپەلانە زوو دەمردن.

**٦) لف**

کـۆرپەلە لە نـاو منالـدان لە تـوورەکەیەکی تەنکـی پـڕ ئـاو و خوێناویـدایە کە بە لـف دەناسرێت. لە ئاژەڵانی گواندار لف بە پەڕۆڵە نـاودێر دەکرێـت. پـاش ئەوەی کـۆرپەلە دێـتە دنیاوە، مامان بە بەرمامانەکە دەڵێت: *زوو لـفەکە بـخەرە نـاو تـوورکەیەك و دوور لە چـاوی*

---

١. بە فارسی دەبێتە "نارس"

*خەڵك لە شوێنێك بیخە ناو چاڵێك*. چونکا باوڕیان وابووە کە لف نابێ خەڵکی تـر ببینێـت و ئەبێ زوو بشاردرێتەوە. هەروەها جۆرێك بخرێتە چاڵ کە پشیلە و سـەگ ڕێ نەبەنە سـەری و نەیخۆن. لفێك دێر بخرێتە چـاڵ و بمێنێـتەوە یـا سـەگ و پشـیلە لە چـاڵ دەریبێنێـت کۆرپەلەکە دەمرێت. لە مانگا و گوانداره‌کانی دیکەشدا بە هەمان شێوە نابێ بهـێڵن ئـاژەڵەکە پەڕۆڵەکەی بخواتەوە. ئێژن ئەگەر مانگا پەڕۆڵەی بخواتەوە وشك ئەکـات و شـیری نـابێ بـۆ گوێرەکەکەی. لە کوردەواری لە هەمبەر "قلو"ـی فارسی، لف دائەنرێت. واتـا بە منـاڵی دوانە کە پێکەوە دەبن، دەڵێن: *لفە دوانە*.

**٧) ناوک**

کۆرپەلە لە ڕێگەی ناوکەوە بەندە بە خوێن و تەنی دایکـیەوە. واتـا ڕیخـۆڵەیەکی درێـژ لە ناوکی کۆرپەلەکەوە کێشـراوە و بەسـراوەتەوە بە هەنـاوی منـاڵـدانەکەوە. کـاتێ منـاڵ لەدایـك دەبێت یەکەم کار کە مامان دەیکات بڕینی ناوکەکەیە تا مناڵەکە بۆخۆی هەناسـە بکێشـێت و بژیـت. هەر خێـرا نـاوکەکە دەگرێـت و بەنـدی قـامکێکی دەهێڵێـتەوە و بە بەنێکـی تونـد دەیجەڕێنێت. لە کوردەواریدا دایکەکان ئەو کەسەی وا نـاوکی مناڵەکەیـان دەبڕێـت لە بیـری ناکەن و کاتێ مناڵەکەی گەورە بوو پێی دەڵێن کە فلانی ناوکی بڕیوی. واتا مافی بە سـەرتەوە هەیە. هەمیشـە مامـان نـاوکی منـاڵەکە دەبڕێـت. چـونکە شـانازییە بـۆ مامـان کە یـارمەتی دایکەکەی داوە و لێ بووەتەوە[١] و ئێستە مناڵەکەی بە دەستەوەیە. ئەوسـا بەشـێك لەو دایکـانە وا بە سەر سـکەوە ئەمـردن کۆرپەلەکەیـان سـوار ئەهـات یـا نـاوکەکە ئەپێچـرایە دەور ملـی کۆرپەلەکەدا. کاتی مناڵبوون مامان دەستی لەسەر سکی دایـکەکە دەخسـت و دەیپشـکنی تـا بزانێت مناڵەکە سوارە یا ئاسایی. کاتێ مامان ئەیگوت مناڵەکە سـوارە واتـا بە دەسـت و لاقەوە دێت.[٢] لە کاتی ئاسـاییدا منـاڵەکە سـەرەتا سـەری دەر ئەکەوت. ئەو دایکـانەی وا کـۆرپەلەی گەورەیان بووە یا سوار هاتووە یا ناوکەکە بە دەور ملیەوە بووە، دایکەکە زۆری پێوە بووە تا لێ بێتەوە. هەندێ جار هێندەی خایاندووە کە مناڵەکە خنکـاوە و خـوێنی زۆر لە ژنەکە چـووە و مامان چاری نەکردووە و ژنەکە مردووە. وا بـاوە کە ژن کـاتی منـاڵبوون تەواوی جومگەکـانی

١. لێبوونەوە واتا زایش و تەواو کردنی کارێ. هەندێ جار کاتێ جنێو ئەدەن، دەڵێن: یاخوا لی نەبێتەوە. واتا کارت بۆ ئەنجام نەبێت و بمریت. چونکە ژنی دووگیان کە کاری مناڵبوونی بۆ نەکرێت و لێ نەبێتەوە، دەمرێت.

٢. ئەو دایکانەی کۆرپەکەیان سوار بووە، هەندێ لە مامانە بەئەزموونەکان بۆ ئەوە گیانی دایکەکە ڕزگار بکەن بانگیان لە مێردی ژنەکە کردووە کە ژنەکەی چەشنی کایەی "کوڵکۆلانێ" بگرێتە کۆڵەوە. ئینجا بە پشت و سمتی بداتە ژێر سمت و پشتی ژنەکە تا بەشکوو مناڵەکە پیادە بێت و بەلاقەوە نەخزێت.

لێك دەبنەوە و دەکێشرێن تا ئەو کۆرپەلەیە بێتە دنیا. هێندە ژان و ئازاری هەیە کە ئارەقی ڕەش و شین دەر ئەدات. دەگوترێت کە منالبوون وەك ئەشکەنجەیە بۆ ژن. دەلێن ژانی منالبوون هەرچی گوناح و تاوانی پێشووی ژنە دەیشواتەوە. جا هەر بۆیە دەلێن ئەگەر ژن بە سەر سکەوە بمرێت، شەهیدە. دەلێن کاتێ ژن منالی دەبێت خواگیان دوو پۆل فریشتە دەنێرێتە سەری. پۆلێکیان دەپارێتەوە کە ژنەکە بمرێت. چونکە سەیر ئەکەن ژنەکە هێندە ژانی هەیە و ئازاری منالبوونی چەشتووە کە هەرچی گوناهی پێشوویە شۆراوەتەوە. ئەگەر بگەڕێتەوە بۆ لای خوای خۆی وەك پەری و پەپوولە وایە. پۆلی دیکە لە فریشتەکان دۆعا دەکەن کە دایکەکە زوو لێ بێتەوە و چاوی بە کۆرپەلەکەی بکەوێت و ماندوویی دەر بچێت و بحەسێتەوە و نەمرێت با منالەکە لە باوشی دایکی خۆیدا گەورە بێت.

## ٨) ژانگرتن

ژنی دووگیان کاتێ نزیك بە نۆ مانگی دەبووە دەیگوت: *پاوە مانگم یا مانگی خۆمە*. چونکا ئەوسا ڕێك دیار نەبوو کە چە ڕۆژێك منالەکەی دەبێت. ڕۆژەکانی کۆتایی مانگ و ماوەی منالەکە، ژان دەستی پێ ئەکرد. ئەم ژانە لەوانەبوو ڕۆژێك یا چەند ڕۆژ بوایە. کاتێ دایکەکە ژان دەیگرت مێردەکە یەکێك لە دەستەخۆشکەکانی یا خزمە خانمێکی نزیکی بانگ دەکرێت کە ئاگەداری ژنەکەی بن. ئەم خانمە بە "بەرمامان"[١] دەناسرا. بەرمامان هاوکاری ژنەکەی دەکرد و ئارامی دەکردەوە و دلنەوایی ئەدایەوە و دەستی بە پشت و سکی دەگرت. تا ئەوەیکە ژنەکە نیشانەی جوولانی منالەکەی بەرەو خوار دەستی پێ ئەکرد. بەرمامان کەسێکی ئەنارد کە مامانی ئاوایی یا گەڕەك بێت. مامان ژنێکی بەئەزموون و زیرەك بوو.[٢] چەندین ژنی لە منالبوونی سەخت و دژوار ڕزگار کردووە و گەلێك ئەزموونی پێویستی لە منالی سوار و پیادە هەبووە. جا کە مامان هاتووەتە دیوی ژنی ژانگرتووەکە خێرا چاوی پێدا ئەخشاند و دەیپشکنی کە منالەکە خزاوە یا هێشتا لە کۆرپەدان

---

١. بەرمامان زۆرتر دایك یا خوشکی ژنەکە بوو. تا ئەو جێگەیە ئەگونجا دش و خەسوو بەرمامانی نەدەکرد. مەگین کاتێ مامان ئەچووە دیوی ژنەکە. ئینجا دش و خەسوو یا مامانی دەستیاریش ئەچوونە یارمەتی.

٢. لە باقلاوا نەنکم (نەنێ پەریجان) و دادە عوزرا مامانی قابل بوون. نەنکم مامانی زۆربەی ژنانی ناودێ کردبوو. هەر بۆیە هەموو خەلك بە نەنێ بانگیان دەکرد و ڕێزیان دەگرت. دەگێڕنەوە کە دادە عوزرا ئامۆژگاری بە ژنانی دووگیان دەکرد کە: "ئەگەر ژان گرتنی قاپێك ڕۆنی کوردی بتوێننەوە و بیخۆنەوە با لاشەتان تەواو ڕەها بێت و زوو لێ ببنەوە".

نەجوولاوە. ئەگەر منالەكە خزابوو ئەوە تەشتە مسينە و تيانەی[1] گەورەيان ئامادە ئەكرد. تيانەكەيان بەراوەژوو لە ناو تەشتەكە دائەنا و ژنەكە لەسەر ئەوە دائەنشت. ئينجا بەرمامان ئەچووە بەردەمی تا دەستی پێ بگرێت و بەسەر ئەودا زۆر بكات. هەروەها مامانەكەش لە پشتەوە دەيگرت و پاڵی پێوە ئەنا و پێی دەگوت نقە بكە. هەندێ جار ژنەكە دەبوورايەوە لە ژان و ئازار.[2] هەر بۆيە مامان هەميشە دەستی پێ دەگرت كە نەكەوێت. بەرەبەرە كە مندالەكە سەری دەر ئەكێشا مامانەكە دەستی ئەخستە پشت ملی و هەندێ بەرەو دەرەوە ئەيكێشا. بەم شێوە ژنەكە لە منالبوون لێ دەبووەوە. پاش ئەوەی لفەكەی خست. بەرمامان ژنەكەی دائەشۆرد و گورجی ئەكردەوە و دەستی ئەگرت تا لەسەر جێگەكەی ڕاكشێت. مامان لەو لاوە ناوكی منالەكەی ئەبڕی و وشكی ئەكردەوە و دەم و لووتی ئەكێشا و پەڕۆيەكی پێوە ئەپێچا.

● مامان و بەرمامان تا ئەو جێگە بيانتوانيايە نەياندەهێشت كە مێردی ژنەكە بێتە ديوی منالبوونەكە. چونكا ئەوسا ژن زۆر شەرمی لە مێردەكەی دەكرد تەنانەت لەم كاتانەشدا.

● درگا و پەنجەرەی ماڵيان توند دەبەست و هەموو كەسێك نەيدەتوانی بچێتە ژوورەوە. مامانەكە دەيگوت ئاگەدار بن غەوارە و كتك و مشك خۆی نەكاتە ديوەكەدا.[3]

● ئەگەر كوتوپڕ كچێكی ساوا يا گەنج ئەچووە ژووری منالبوونەكە، مامانەكە خێرا تيتۆڵێ لە كراسەكەی ئەبڕی و ئەيگوت: *بڕۆ ڕۆڵە بەرت تەنگە*. واتا تۆ كچی لەگەڵ خۆت سەختی و تەنگانە دێنيت.

### ٩) لانكە و پێچانەوە

پاش ناوك بڕين و وشككردنەوە، مامان چەندين كاری دەكرد تا كۆرپەكە ئامادە بكرێت بۆ خواردنی شير و باوش گرتنی دايكەكەی:

● لووت و دەم و گوێچكەی ئەكێشا. چونكە ئێژن ئەندامەكانی كۆرپە هێشتا نەرمە و

---

١. مەنجەڵی گەورە

٢. جاری وا بووە كە ژنەكە نەيوێراوە نقە بكات تا منالەكە زياتر بخزێت، مامان چووە كەوشی مێردەكەی هێناوە و ئاوی تێ كردووە و دەرخواردی داوە. تا هێڵنج بدات و منالەكە بخزێت. يا ئەچوون دۆخينی پياوێكی خاسخوای ناودێيان ئەهێنا و لە ئاويان هەڵدەكێشا و بە ژنەكەيان ئەدا. (پياوی وابووە كە زۆر لەخواترس و پارێزكار بووە. خەڵك وتوويانە دۆخينی حەرامەی نەكردووەتەوە.)

٣. ديوی منالبوون ديواخان و بەرهێوان و زووری سەر جادە و كۆڵان نەبوو. بەڵكوو ديوی پشتی و پەستوو بوو كە دەنگ و هاواری ژنەكە بەرگوێی خەڵك نەكەوتبايە.

ئەگەر نارێك بێت ڕاست ئەبێتەوە. منداڵەکە ئەگەر کچ بوایە مامانی قابل دەستبەجێ گوێچکەی کون دەکرد و دەزووی تێ هەڵدەکێشا.[1]

● به پەڕۆیەکی نەرم و خاوێن ناو گوێچکە و لووت و دەمی منداڵەکەی پاك ئەکردەوە. ئینجا چۆڕێك قەنداوی خەستی دەگرتەوە و قامکی پێدا ئەژەند و له دەمی کۆرپەکەی دەخست. ئەم قەنداو پێدانە پێی دەڵێن: *گۆچ کردن*. واتا فێری شیر خواردن کردن. گۆچ کردن یەکەم فێرکردنی منداڵ لەسەر ئەم دنیایە. هەر بۆیە هەندێ جار بە کەسێك دەڵێن: *ئێژی به شەر گۆچ کریایته وا ئەونه تووڕە و تۆسەنی.*

● کۆرپەی کچ و کوڕ ئەوسا کراسێکی درێژی توورەکەییان بۆی لەبەر ئەکرد. ئەم کراسه نەرم و نۆڵه به کراس کوولەکەبڕ ئەناسرا.

● سەری منالەکەیان به پەڕۆیەکی نەرم شێوەی لەچکە ئەبەست. ئەم پەڕۆیە به سرکەیی ئەناسرا.

● ئەوسا باوڕی خەڵك وابوو کە کۆرپە نابێت دەست و لاقی کراوە بێ. چونکا گەورە بوو گورج و گۆڵ و توند و تۆڵ نابێت. هەر بۆیە دەستبەجێ سێ لەتکە پەڕۆی سێگۆشیان ئەهێنا و یەکیان له ژێر پشتێنەیەوە ڕائەخست و لۆیەك له پەڕۆکە دەخستە ناوگەڵی و بەوی تر ئەپێچرایەوە. پەڕۆی دووهەم به لاقیەوە دەبەسترا. پەڕۆی سێهەم ئەو دوو پەڕۆیەی پێکەوە توند دەکرد.

● جێگەیان له بێژنگ یا سەبەتەی بچووك ڕائەخست و مەلۆتکەکەیان لەوێ دەخست و سەریان دائەپۆشی. مووررووی شەوەیان به جلی کۆرپەکەوە ئەکرد و چەقۆیەکی کولی چکوولەیان ئەخستە ژێر سەری کۆرپەکە تا شەوە منالەکە نەبات و نەمرێت.

● بەرمامان پێش ئەوەی کۆرپەکە بخەنە سەر بێژنگ یا ناو سەبەتەکە، هەرچی جل و جێوبانی تایبەت به باوکی کۆرپەکە بوایە له دیوەکە ئەیبردە دەرەوە. چونکە ئەیانوت: *منالی ساوا ئەگەر جل و جێوانی باوکی نزیکی بێ خەرکانە*[2] *ئەگرێ.*

● باوکی ماڵەکە کاتێ هەواڵیان پێ ئەدا کە منالتان بووە، بەتایبەت ئەگەر منالەکەیان کوڕ بوایە، دەستبەجێ چەند دەستە گوێزی هەڵدەگرت و لەسەر بانێك هەڵیدەخستەوە بۆ

---

١. ئەوسا له هەندێ بنەماڵەی کوردەواری باو بووە کە کچی کۆرپەیان له کاتی بەربوونەوە له دایك خەتەنه ئەکرد. ئەوانەیش ئەوکاتە خەتەنه نەدەکران کاتێ دۆم و قەرەچی ئەهاتنە ناودێ، و ژنە دۆم خەتەنەی ئەو کچانەی دەکرد.

٢. نەخۆشی ئەگزما

منالآنی ناودێ. ئەڵبەت گوێزەوانە بە نەقوڵ و شـیرینیش کـراوە. بەتـایبەت نەقـوڵی حەوت ڕەنگ. هەروەهـا دەسخۆشـانەی مامـان و بەرمامـانی ئەخسـتە پەڕۆیەك و لە درگـاکەوە بە مامانەکەی ئەدا.

● مۆچیاری مامانەکـان ئەوە بـوو کە منـاڵ نـابێ تـا چـلەی ئەچێت زوو زوو سـەری هەڵبدەیتەوە. چونکە مرخن و لرخن ئەبێت.

● تا چلەی تەواو ئەبوو، هەروەها دایکە زەیسـتانەکە بۆخـۆی هەڵدەسـتایەوە منـداڵەکە لەسەر بێژنگ یا سەبەتەکە بوو.

● مامان پاش قەنداو پێدان و گورج کردنەوەی کۆرپەکە، بەرمامـانی ئەنـارد کە ژنێکـی دراوسێ کە منداڵی هەیە بهێنێت و شیری پێ بدات. ئەوسا زۆرتـر هەوڵیـان ئەوە بـووە کە کۆرپە ژەکی دایکی نەخوات تا شیرەکەی تراو دەبووەوە. چونکا ژەك مناڵ تووشی زەردۆیـی ئەکا. ئەو دایکانە وا ئەهاتن و شـیریان بە کـۆرپەکە ئەدا، ئەبـوونە دایکـی شـیری. جـا ئەم کۆرپە وەك منداڵی ئەوانی پێ دەهات و دوایی کـچ بـوایە لەگەڵ کـوڕی ئەوان نەیـدەتوانی هاوسەرگیری بکات و کوڕیش بوایە نەیدەتوانی کچی ئەوان بهێنێت.

● مامان دەستی بە دادۆشینی شـیری دایـکەکە دەکـرد تـا شـیری مەمکەکـانی ڕوون بێتەوە و کۆرپە لە شیری دایکی بخوات.

● قەیماخیان ئەکرد بۆ ژنەکە تا بیخوات و ناوسکی گەرم بێتەوە. ئەڵـبەت هێلکەوڕۆنـی چەور، سایلەی کونجی، هەڵوای شیرین و خـواردەمەنی گەرم و تەڕیـان بە ژنـی زەیسـتان ئەدات تا حاڵ و باڵ بگرێتەوە.

● بەرمامان دەستبەجێ دوای لێبوونەوە نەبات داخی دەگرتەوە و چۆڕێ ئـاوی نەعنـای تێ ئەکرد با ژان و ژلیوەی ناوسکی ژنەکە داساکێت.

● دواتر ئەگەر ژنەکە دڵێشە و ناوسکێشەی بوایە ماجوومی ڕازیانە و قەنداویان پێ ئەدا.

● تا حەفـتەیەك ژنـی زەیسـتان لەسـەر لـێفە و دۆشـەکی سـوور دەکەوت تـا هێـزی دەگرتەوە. کەسانێك لە نزیکانی دایـك و بـاوکەکە ئاگەداریـان لە ژنەکە دەکـرد و لەچـکەی سـووریان لەسـەری دەکـرد. ئەم حەوت ڕۆژەی سـەرەتای زەیسـتانی دایـك و منـاڵەکە بە "حەفت یار" ئەناسران. واتا زۆر خۆشەویست و ئازیز بوون. پـاش حەوت ڕۆژەکە بەرمامـان و دایك و خوشـك، ژنە زەیسـتانەکەیان ئەبـردە گەرمـاوە و حەفتانەیـان دەر ئەکـرد و پاکیـان ئەکردەوە.

● ئەوسـا بەتـایبەت لە زسـتانان تـا ڕۆژی چـلە، مناڵەکەیـان نەدەشـۆرد تەنیـا پاکیـان

دەکردەوە. پاش چلە منالێکی دیکەیان ئەهێنا تا بە جامی چل کابە[1] یا توێکڵی هێلکە چل جار ئاوی بکردایتە ناو تەشتێك. ئینجا ئەو ئاوەیان ئەکردە مل منالە ساواکە تا چڵەی دەرچێت با ئیتر نەخۆش نەکەوێت.

• بیستوومە لە ناوچەی سالاڵ ئەوسا کاتێ منالێك لە وەرزی زستان لەدایك بووە تا هەفتەیەك یا تەنانەت چل ڕۆژ نەیانشۆردووە. بەڵکوو بە خۆڵەمێشی تەپاڵەکووجیلە وشکیان کردووەتەوە و ئینجا سڕیویانە. باوڕیان وابووە کە سەرما و سۆڵەی زستان هێندە کاریە کۆرپەی تازەلەدایکبوو مەلە بدرێت دەمرێ.

• دایك لە ماوەی زەیستانیدا زۆر هەستیارە. ئەوسا ئامۆژگاری مامان و حەکیمانی کوردەواری ئەوە بوو کە ژنی زەیستان تەنیا دابشۆرن و پاش هەفتەیەك حەمام بکات. چونکا ژنی زەیستان وەك پەڕەی گوڵ وایە بە هەموو با و هەوایەك ئەشەمزێت و چیامانی ئەکێشێت.

• ئەگەر زەیستانی لە زستان و پاییزاندا بووە هەوڵی مامان و بەرمامان ئەوە بووە کە لە هیچ شوێنێك یەك سووسە هەوا نەیتە ژووری منالبوونەکە. چونکە ئەڵێن: *زمسان وتیـیە لە کونای دەرزیچەو بێ خوەم ئەخەمە باوش ژنـی زەیسان*. زۆر جاران لە پیریدا کە دایکان تووشی گۆچی دەست و خێچی لاق و پشت ئێشە ئەبن، ئێژن: *ئەوە لە زەیسانیا هۆشـی بە خوەیەو نەبووە و چیامانی کێشا.*

• ڕۆژی حەوتەم خەڵکیان کۆ ئەکردەوە و نان و چێشتیان ساز ئەکرد و منالەکەیان ناو ئەنا.

• دایکی وا بووە کە ژەکی مەمکەکانی زۆر خەست بووە و نەهاتووەتە دەرێ تا شیرەکە ڕوون بێتەوە. کوولەکە زەردەیان بۆ مامان ئەهێنا. لە مەنجەڵێك گەرمی ئەکرد تا هەندێ شل بێتەوە. ئینجا پەڕۆیەکی ئەخستە سەر مەمکی دایکەکە و کوولەکەکەی پێوە ئەنا. ئەم کارە جاری وابووە تا چەند ڕۆژ دووپات کراوەتەوە.

• دایکی وا بووە کە شیری کەم بووە. ماجوومی شیریان پێ داوە. ئەم ماجوومە لە ئاوی ڕازیانە و شویت و هەنگوین گرتوویانەتەوە.

• جاری وابووە دایك نەیهێشتووە کە کەس کۆرپەکەی تا پاش چلە ماچ بکات تا

---

[1] ئەوسا حاجیان جامێکی زەردی چکوولەیان لە مەککە دەکڕی و بە دیاری بە خەڵکیان ئەدا. ئەم جامە چکوولە بە جامی چل کابە دەناسرا.

نەخۆشی بۆقژە[١] نەگرێت و نەترسێت و دەم و لێوی هەڵنەزرێیت.[٢]

• بۆ ئەوەی منال نەترسێت و زوو زوو ڕانەچلەکێت سیر یا پیوازێکیان بە شیشێکەوە دەکرد و لە پشت سەری کۆرپەکە دایان ناوە.

**١٠) چلە لە یەک کەوتن**

کاتێ ژنێك منداڵی دەبوو ئەگەر ژنی خزم یا کەسێکی نزیك لە گەڕەك و ناودێ کە ئەویش پاوەمانگی بووە، ماوەی ١٣ ڕۆژی سەرەتای منالبوونەکە شەوانە ئەو ژنە چووەتە لای دایکە زەیستانەکە تا چلەی منالەکەیان یەك نەکەوێت و نەمرن.

**١١) بێشکە**

پاش حەفتە یا چلە دایکەکە بۆخۆی بێشکەی ئامادە دەکرد و دەستەرازە و دۆشەك و سەرجلە و سەربێشکە و قەلەم میز و گۆزەڵەی دەخستە ناو بێشکەکە. بێشکە زۆرتر لە داری هەنار و سپیدار و توو دروست ئەکرا. بەرەبەرە دایك خشڵ و خرخاڵی دەگرتەوە و دەیکردە دەستەی بێشکەکە. خشڵی موورگ، گوێچکە ماسی، داری ژاڵە، کلانە[٣]، کووژەکە[٤]، موورگی شەوە و زرزڕە. کاتێ منالەکە پای ئەنایە ناو ٣-٤ مانگی، بۆ ئەوەی منالەکە زووتر مل بگرێت ملەکۆچەی مریشکیان ئەبرژاند و ئەیانبەستە دەستەی بێشکەکە. تا منالەکە خۆی بکێشێت و زۆر بکات، بیگرێت و ملی توند بێتەوە.

**١٢) بەخێو کردنی منال**

بەخێو کردن و پەروەردەی منال هەر لە دایکبوونەوە دەست پێ دەکات، بەلام ئەوەی زۆرتر گرینگایەتی نیشان داوە، پاش ناونانی منالەکە بووە:

• ژنی زەیستان مەگەر زۆر پێویست بوایە ئەگینا نەدەبوو تا چلەی ئەچوو بچێتە سەردانی ژنی زەیستانی دیکە. لە کاتی ناچاریدا ژنەکە دەرزی بەرۆکی خۆی ئەگۆڕییەوە لەگەڵ ژنەکەی دیکە تا چلەیان یەك نەکەوێت و منالەکەیان پارێزراو بێت.

• ئەوسا منالی ساوایان تەنیا لە کاتی شیرپێدان و ژەماوژەم هەڵدەگرت و باوشیان دەگرت. دایك نەیدەهێشت منالەکە زۆر لە کۆش بگرن تا دەستاژۆ و بەدخوو نەبێت و لە

١. نەخۆشی بە فارسی "برفك دهانی"

٢. هەڵزریان، هەڵزلەپیان و تێمیسکە، بە فارسی دەبێتە "تبخال"

٣. موورگی گەورە بە فارسی "خرمهره"

٤. موورگی گەورە و سەوز

بێشکه و جێوبانی خۆیدا ژێر بێتەوه.

● منالی وابووه که هەق و ناهەق گریاوه و دێر ژێر بووەتەوه. ئەم جۆرە منالانە بە گرینۆك دەناسران. دایکەکان زۆر هەولیان ئەدا کە ئەمانە نەرم ڕاژێنن و بیلاوێننەوه تا بەشکوو ژێر ببنەوه. هەندێ جار گرینۆکی منالەکە بەهۆکاری بەدخوویی و هاروهاجیەوه بووه و ئەم منالانە بە گڕەزۆك ناسراون. ئەگەر دایك ئاگەداری منالی گڕەزۆك نەکا و گوێی پێ نەدات تووشی پیران[1] و ناوك دڕان دەبێت.

● بۆ ناوك دڕان پوولی قۆشە و قیریان ئەخستە سەر پەڕۆیەك و لەسەر ناوکەکەیان ئەبەست تا چەند ڕۆژ.

● ئەگەر دایکەکە مەزاجێکی سارد و تەڕی بوایە منال زووتر تووشی ساردی و ناوسکێشە ئەبوو. نەبات داخێك کە چۆڕێ نەعنا یا ئاوی هەزبی و پنگی تێدا بوو بە منالەکەیان ئەدا ژان و برکی ناوسکی دەبڕی.

● ئەو منالانەی تووشی سکچوون و سکەشۆرە ئەبوون نەبات داخ و چۆڕێك ئاوی قەزوانیان پێ ئەدا.

● ئەو منالانەی کە تووشی گرسی و قەبزی دەبوون بە چەند شێوە چارەسەر ئەکران: یەکەم) تووی خەیارچەمەر[2]، ڕکێشە و ڕازیانە و کەرەیان دەهاڕییەوه و بە ماجوومی کوردی ئەناسرا. ئەم ماجوومەیان تا چەند ڕۆژ دەرخواردی منالەکە ئەدا. دووهەم) دەرخواردانی کەرە و ئاوی شیلەوگەرم بە منالەکە. سیهەم) وەرەق ماسییان بە منالەکە ئەدا. ئەم خۆراکە ئێستاش لە دەرمانخانە گیاییەکان هەیە. دەکرێتە ناو ئاو و دەیتوێننەوه وبە مندالەکەی ئەدەن. چوارەم) پووشەلەك[3] هەلگرتن: ئەگەر چارەسەرەکانی ناوبراو کاریگەر نەبوون پووشەلەیان هەلدەگرت بۆ منالەکە. پووشەلە واتا هەمان شیافی پزیشکی تازە. پووشەلە لە کەرە یا سابوونی مەراغە دروست ئەکرا و لە کۆمەوه بۆ منالیان هەلدەگرت.

● ئەگەر منال تووشی باژێلە[4] دەبوو دەیانبردە لای پسپۆڕی باژەلە. کەسانێك بوون کە

---

١. پیران یا گەشکە بەهۆی گریان و پێکەنینی زۆرەوە دروست دەبێت. واتا هەناسەی منالەکە ئەڕواتە خوارەوە و دەرەنگ دێتەوه سەر.

٢. بامیەپێچ، بە فارسی میوەی کەلووئاسای داری ئاکاسیا

٣. پووشەلە، بە فارسی "حقنه و شیاف برداشتن" لە ڕێگەی کۆمەوە

٤. باژێلە، بە فارسی و عەرەبی "عسر البول". لە هەندێ شوێنی کوردەواری باژێلە بۆ ناوسکێشە و دلێشەی منال بەکار دەچێت. تەنانەت ئێستاکە بە شەربەتی گرەیپ میکسچێر کە لە دەواخانەکان هەیە بە شەربەتی باژێلە

کاری باژەڵە تەقاندن و گیـراوی بەردانیـان کـردووە. حەکیمـانی ئەوسـا باوڕیـان وابـوو کە هۆکاری باژەڵە کاریگەری تەڕی و چیامـانی ناوسـکی دایـك لەسـەر مسـووڵدان و بەرسـکی کۆرپەلەکە بووە. هەر بۆیە بەرسکی مناڵەکە ژانی زۆر دەکا و ڕێگەی میزی دەگرێ. وەستای باژەڵە تەقاندن یا گیراوی بەردان، مناڵەکەی لەسەر لاقی درێژ دەکێشا و دەسـتی ئەکـرد بە ڕاماڵین و نەرم پرواندنی بەرسکی. پاشان هێلکەی برژاو کە کەمێك ئاوی تێدا بوایە دەخـرایە سەر پەڕۆیەکی جاوگ[١] و لە بەرسکی مناڵەکە ئەبەسرا. ئەم کارە دوو جـار لە ڕۆژدا ئەنجـام ئەدرا. ئەگەر لە کاتی کردنەوەدا هـێلکەکە بـۆنی زۆرتـر بـوایە ئەوە دیسـان هێلکەیـان تـێ دەگرت تا چاك بێتەوە.

• مناڵ بەهۆی سەرما و سۆڵەوە تووشی کۆخە دەبێ. ئەوسـا بـۆ چارەسـەری کـۆخەی مناڵ، تووی بەهێ لە ناو ئاوی شیلەوگەرم تا بەیانی ئەخووسرا. ئینجا هەندێ لە ئاوەکەیـان ئەدایە مناڵەکە و چاك دەبووەوە. لە نـاوچەی سـەقز ئەو منـاڵانەی تووشـی کـۆخە دەبـوون دەیانبردە ئاوایی زیویە. لەوێ کونێك بوو بە کونەکۆخە ئەناسرا. تاوێك سەری مناڵەکەیـان لەو کونە دەکرد تو هەوای ناو کونەکە هەڵبمژێت و چاك بێتەوە.

• ئەگەر منـاڵ دەسـت و پێـی زۆر لـێ ئەدا و سکەشـۆرەی دەگـرت و شـیری هەرس نەکراوی دەدایەوە، ئەیانگوت: *فریشکی کەوتووە*. جا فریشك کەوتـن بەهـۆی خـراپ بـاوش گرتن، دەستاژۆی زۆر، بەربوونەوە لە بێشکە، ترسانی کوتوپڕ، و هۆکارەکانی دیـکە دروسـت دەبوو. فریشك کەوتن لە مناڵ هەمان ناوك کەوتنە لە گەورەکان. ئەو ژنانەی لە ناودێ نـاوك دەگرنەوە دەتوانن فریشکیش بگرنەوە. شێوازی فریشك گرتنەوە بەم جۆرەیە: خـانمی وەسـتا مناڵەکە لەسەر قاچی درێژ ئەکات و قامکەکانی هەر دوو دەسـتەکەی دەخـاتە سـەر نـاوکی مناڵەکە تا تاوێك ڕایدەگرێت. ئینجا قامکی دەست و پێ مناڵەکە چەپ و ڕاست هەڵدەگرێت و بەرزیان دەکاتەوە. دواجار مناڵەکە سەرمەقولاتێ پێ ئەدا.

**بەشێک لە مامانە ئەزموونداڕەکانی ناوشاری سەقز:**

• خا خونچە (خونچە خانم)، دانشتووی کۆڵانی کانی کەلانتەر

• خا ئەشرەفی و خا پەریزاد، کە خانم ئەشرەفی دەستێکی نەبووە و بە دەستێك مامانی کردووە.

---

ناوی دەبەن. ناوەندی گیادەرمانی شەفا لە شاری سنە شەربەتێکیان لە ئاوی ڕازیانە، شویت و زیرە دروست کردووە بۆ ناوسك ئێشەی مناڵ. ناوی "گرامیداب"ـە. لە سنە ئەمە بە شەربەت باژێلە دەیناسنەوە.

١. جاوو، بە فارسی دەبێتە "کرباس"

● خانم ئایشێ موکری، مۆرید و سۆفی شێخ عەلی دۆزەغەرە بووە.

● سەیزادە فاتمە و سەیزادە خەجێ کە خەڵکی ئاوایی سەرچاوە بوون. دەگێڕنەوە کە سەیزادە خەجێ کاتێ مامانی کردووە دەستنوێژی هەڵگرتووە و تا دایکەکە لێبووەتەوە دەستەودۆعا بووە بۆ منالّ و دایکەکە. کاتێ دایکەکە لێ بووەتەوە، وتوویە: یا حەزرەتی خدر و ئەلیاس، بەندە لە بەندەکەی ترازا.

● دایە خاتوون کە تا ساڵەکانی شەڕی یەکەمی جیهانی مامانێکی شارەزای ناوشاری سەقز بووە.

● دایە مەلەك کە خانمێکی جوولەکەی ناوشاری سەقز بووە. ئەم خانمە شارەزایەکی بێ وێنە بووە لە مامانی و گەلێك ژنی جوولەکە و موسڵمانی سەقزی لە مەرگ ڕزگار کردووە. دانشتووی گەڕەکی ناوقەڵا بووە.

● هەروەها کەسانێ تر وەکوو: خات نازێ و دایە لەیلێ.

## کەرەستەی پزیشکی جەوەنە (دێمکە)

ئەوسا لە کوردەواری زۆربەی بنەماڵەکان جیا لە ناوی باوك و باپیر یا هۆزەکەیان بە سەرناوێکی دیکەوە ئەناسران، وەکوو: جووتیار، تەنەکەچی، دیانکێش، بەرخە، ڕەشە، تەژەدرێژ، جەوەنە و هتد. هەندێ جار ئەم سەرناوە بابەتێکی دزێو و ناپەسەند بوو، وەکوو: گابنە، گولە، کەرخنکێنە، چاوبزن و تاد. لە ئاوایی ئێمە باقلاوای کەلاتەرزان هاوشێوە کەسانێك بەم شێوە دەناسران: جەوەنە، کووڕە ماساوخوەر، کاخان، دوینە، کاخوەر و هتد. زۆر جاران بیرم لەوە کردووەتەوە کە بلێی ئەو بنەماڵە کە بە جەوەنە دەناسران، ئەم وشەیە لە چییەوە هاتووە.

بەرێکەوت بابەتی (هۆکارەکانی ئازاری بڕبڕەکانی مل و چارەسەرکردنی) لە ماڵپەڕی کوردی خەندان (بەشی پزیشکی، بەرواری ٢٠١٧/٠٣/٠١) دەخوێندەوە کە باسی بەکارهێنانی کەرەستەی جەوەنەی کردبوو بۆ کەمکردنەوەی ئازاری پشت و مل. گوایە *جەوەنە دەبێتە هۆی چارەسەریی گرژبوونی ماسوولکە و ڕەگەکانی پشت و مل و هەروەها سووڕی خوێن لەو شوێنانە زیاد دەکا.*

لە فولکلۆر و قسەی ئاسایی ناو خەڵکیدا هەندێ جار ئەم دەستەواژەیە بەکار دەچێت: *ئای زەمانە، بووین بە مەشکە و جەوەنە، باومان نەما.* لێرە مەبەست لەوەیە باوی مەشکە و جەوەنە کە کەرەستەیەکی کۆنە نەماوە. مەشکە، کوندە، خیگە، پێستەپەنیر، هەنبانە، جەوەنە، گالۆس، بەرەپێست و تاد، ئەمانە هەموو لە چەرمی ئاژەڵ دروست کراون و ئەوڕۆکە باویان نەماوە یا سوودێکی دیکەیان لێ دەبینرێت. جەوەنە ئەوسا لە چەرمی بزن ساز کراوە کە کونی تێدا نەبووە. هاوشێوەی مەشکە و کوندە خۆشە و جەوت و ڕەنگاو کراوە و ماوەیەك لە تەندوور و سەر کوانوو دانراوە تا چاك خۆی گرتووە و تامی گۆشت و پیو و خوێنی ئاژەڵی لێ براوە. پاشان ئاویان تێ کردووە و بۆ خواردنەوە بەکاریان هێناوە. جەوەنە جیا بووە لە کوندە. چونکا چەرمێکی پان بووە تەخت کراوە و هەڵیاندووریوە و تەنیا

یەك زارکی بووە. ئیدی دەسك و پاچکەی نەبووە.

پاش خوێندنەوەی ئەو وتارەی ماڵپەڕی خەندان، بابەتەکە بە لامەوە جوان بوو کە هەندێ توێژینەوەی زیاتری لەسەر بکەم. سەیری کتێبەکانی فەرهەنگ و هەروەها دنیای ئینترنێتم کرد و ئەوەی لەسەر ئەم وشەیە هەبوو کۆم کردنەوە.

● لە ناوچە جیاجیاکانی کوردستان بەم کەرەستەیە دەگوترێت: جەوەنە، دێمکە، جەوتك، جەودك و مەشکۆرە

● ئەوسا جەوەنە کەرەستەیەکی هەڵگرتنی ئاوی خواردنەوە بووە و ئێستە بۆ کەمکردنەوەی ئازاری ماسوولکە و ڕەگ سوودی لێ وەردەگرن.

● جەوەنەی ئەوسا لە پێستی بزن ساز کراوە و ئەوڕۆکە لە جنسێکی پلاستیکی ئەستوور و نەرم دروست دەکرێت و بەرامبەر بە ئاوی کوڵاتوویش هەڵکردی هەیە. ئەم جەوەنە پلاستیکیە ئەوڕۆکە لە فرۆشگاکانی کەرەستەی پزیشکی و دەرمانخانەکان دەست دەکەوێت.

● ئەوڕۆکە جەوەنە تەنیا بۆ بارە پزیشکیەکەی بەکار دەچێت و کەس بۆ هەڵگرتنی ئاو بەکاری ناهێنێت.

● ئەوسا پێشێنیانی ئێمە جەوەنەیان هەم بۆ هەڵگرتنی ئاوی خواردنەوە و هەم بۆ کەمکردنەوەی ئازاری ڕەگ و ماسوولکەکان بەکار هێناوە.

● مامۆستا قانعی شاعێر لە شێعری "ماڵ بەشکردن لەگەڵ براکەم"دا دەڵێت:

*ئەو ئاوە ساردە لە ئەو جەوەنە / دایبنە بۆ خۆت هەر پێی پێکەنە.*

● حەز ئەکەم کاتێ نەخۆش بووم بە جەوەنە و نیمەنمەك و شێلان و پیازەپیشاوی دایکم چاك بمەوە نەك بە مەڵهەم و دەزری و دەرمانی پزیشك و حەکیمان.

● کابرایەك لە بازاڕ تووشم بوو وتی: ئەرێ کاکە بۆ هێندە خۆشت دێ لە وێنە و باس و گێڕانەوەی شتی کۆن. ئاخر تازە چیت داوە لەم کوندە و جەوەنە و خیگەیە. وتم: کاکە گیان ئەوانە تازە نەماون، بەڵام با منداڵەکانمان بزانن کە تەنیا بەرەی ئەوان ژیر نین و عەقڵیان گەیشتووە بە یەخچاڵ و ساردکەرەوە و سەهۆڵدان. پێشینیانیش توانیویانە لە ئاستی خۆیاندا ئاوی سارد هەڵبگرن بە جەوەنە و کوندە، و لە کاریز و کانییەوە بۆ کەپر و سەرخەرمانی ببەن.

● مەتەڵ و پەندێکی خۆش: [تایبەتی ناوچەی گەرمیانە.] *سێ کەر، سێ کچ، یەك جەوەنە ... کەر؟ چ! کچ؟ چ! جەوەنە؟ ئـمـ...* . [ئەم مەتەڵە باوکان لە منداڵی کوڕیان

دەپرسن. بزانن چەندە زیرەکن و دەتوانن حەکیمانە وڵام بدەنەوە.] واتا ئەگەر بژاردەی سێ کەر و سێ کچ و یەك جەوەنەت پێ بدرێت، کامیان هەڵدەبژێریت؟ لە ڕیتم و ئاهەنگی مەتەڵەکەوە دیارە کە پێشوەخت دەبێ جەوەنەکە هەڵبژێرین. چونکە جەوەنە جێی ئاوە. ئاویش ئاوەدانی و ژیانە. بێ ئاو هیچ زیندەوەرێك نابێت و نییە. ئەگەر ئاوت هەبێت هەم سوود لە کەرەکە دەبینیت و هەم دەتوانیت دڵی ئەو کچە ڕابگریت کە دەتهەوێت بیکەیت بە هاوسەرت.

● هەندێ جار دایکان دوای منالبوون تووشی هەڵاوسانی مەمك دەبن. پێویستە ئەم ڕێنماییانە بەکار بهێنن تا هەوای مەمکیان بنیشێتەوە و ئازارەکەی کەم بێتەوە. پاش شیردان گۆی مەمکت بشۆ و لێی گەڕە با بە هەوا وشك بێتەوە. ئەگەر ئازاری زۆر نییە و دەتوانی خۆت ڕابگریت ئەوە منداڵەکە بخەرە سەر کۆشت با شیرەکە بەتەواوی بمژێت یا ئەگەر ئازاری زۆر بوو بەشێنەیی بە مەمکەکێش شیرەکە دادۆشە یا بە دەست پێداهێنان، دواتر بە ئاوی شیلەوتین بیشۆ و جەوەنە بە ئاوی شیلەوتین بۆ ماوەیەك بخەرە سەری.

● هەندێ لە شوانەکان ئەوڕۆکە گۆزە یا تۆنگەیەك دەخەنە ناو چەرمێك یا تەلیسە بەنینەیەك و بەردەوام تەڕی دەکەن و دەیبەستنە کۆڵیاندا تا تاوێکی درێژ ئاوی سارد و فێنك بخۆنەوە. ئەم کەرەستەیەش بە جەوەنە و دێمکەی شوانانە دەناسرێتەوە.

● لە زمانی گوڵەوە دەڵێن: *دێمکە ئاوەکە بێنە با بچین گوڵە ماتەکانی سەر سینگی جوانەمەرگان ئاو بدەین.*

## بنەمای زانستی بەکارهێنانی جەوەنە[1]

هەر دوو چارەسەری ساردی و گەرمی لەمێژە بۆ مەبەستی کەمکردنەوەی ئازار و باشکردنی سووڕی خوێن بەکار دەهێنرێن. بەتایبەت لە نەخۆشخانەکان و لە بواری وەرزشدا وەك دوو چارەسەری گرنگ هەژمار دەکرێن. دیارە جۆری نەخۆش و جۆری سەرچاوەی ئازار بنەمای بڕیاردانی بەکارهێنانی ساردی یان گەرمین بۆ کەسی نەخۆش یان ئازاردار. ئاوی سارد، سەهۆڵ، بەفر، هەوای سارد و کیسەی تایبەتی ساردکردنەوە لە جۆرەکانی پێدانی ساردین بە جەستەی مرۆڤ کە ڕاستەوخۆ لەسەر ئەو بەشەی جەستە بەکار دێت. هەرچی

١. ئەم بابەتە بە دەستکارییەوە وەرگیراوە لە ماڵپەڕی تەندروستی کورد، ٢٠١٦/٠٢/٢٧، بابەتی: جیاوازی نێوان چارەسەری ساردی و گەرمی، نووسەر: زانا ئەحمەد قادر (پسپۆڕی بواری چارەسەری فیزیکی و وەرزشی)

چارەسەری گەرمییە لە ڕێی هەوای گەرم، ئامێری گەرمکەرەوە، چەسپ و مەڵمەهی گەرمکەرەوە، ئاوی گەرم، جەوەنە، تیشکی گەرمی و کیسەی تایبەتی گەرمییەوە بەکار دەهێنرێت.

## تایبەتمەندییەکانی چارەسەری گەرمیی جەوەنە بۆ ئەندامێک ئازاری هەیە:

● گەرمی دژی گرژبوون و بەئازاربوونی ماسوولکەکان زۆر بەسوودە و ئارامبەخشە. لەو ڕێگەیەوە دەبێتە هۆی بەگەڕخستنەوەی جووڵەی بڕبڕە و جومگەکان.

● باشکردنی سووڕی خوێن و پێدانی مادەی خۆراکی و گەرمی بە خانەکانی جەستە لە ڕێی گەرمییەوە کە دەبێتە هۆی بووژانەوەی ئەو خانانە و هەروەها خاوێنکردنەوەی جەستە لە ژەهراویبوون.

● بەرزکردنەوەی پلەی گەرمی لەش بەتایبەت لە وەرزی سەرمادا. لە ڕێی پێدانی گەرمییەوە کە دەبێتە هۆی پاراستنی دەست و پێکان لە تەزین و تێکچوونی سووڕی خوێنیان.

● هۆکاری گەرمیبەخشی کاریگەری ئەرێنی هەیە لە سەر دەروونی مرۆڤ، هەروەها هەستی بەختەوەری و ئارامی دەبەخشێت.

● کاراکردنەوەی چەرخەی گۆڕینی خۆراکیی بۆ وزە و باشکردنی پێدانی ئۆکسیژن و مادە خۆراکییەکان بە خانەکانی جەستە.

لە کاتی هەوکردن، پێکان و برینداربوون، هەڵئاوسان و سووربوونەوەی پێست، یاو و لەرز، بوونی شێرپەنجە، سەرەتای پاش نەشتەرگەری، شکاوی ئێسك، ڕۆماتیزمی جۆری هەوکردن، لە هەر مرۆڤ شوێنێك نەخۆشی پێستیی هەبێت، خوێنتێزان و خوێنبەربوون و هەروەها پاش دەرزی وەشاندن، ئەمانە دەکرێت جەوەنە بخرێتە سەر شوێنی مەبەست.

**جەوەنەی پلاستیکی**



**دێمکە یا جەوەنەی شوانان**



## بەڕوو لە دەقی زارەکی و نووسراوی کوردیدا

یەکێك لە پاژە گرینگەکان کە پێکهاتەی فەرهەنگ و ژیاری گەلێك ساز دەکات، سروشت و جوغرافیای نیشتمانی ئەو گەلەیە. بەشێکی زۆری نیشتمانی کورد لە ژینگەی بەڕوودا هەڵکەوتووە. واتا بەڕوو، بەڕووەوەیە بۆ زۆربەی کوردان و دارێکی ناسراوە. ژینگەی بەڕوو لەم ناوچەیە بەستراوە بە چیاکانی زاگرۆسەوە.[1] واتا هەموو پارێزگاکانی لوڕ و بەختیاری و کوردنشینی ئێران دەگرێتەوە تا دەگاتە سنووری باشوور و باکووری کوردستان. ئەنجومەن و بنکەکانی ژینگەپارێزی، فیلم و بەرنامەسازان لە کوردستان بەشێکی بەرچاو لە کارەکانیان خزمەتە بە ناو و نەمام و نزارەکانی بەڕوار و مازوارە. لێرە بۆ نموونە ئاماژەیەك بە چەند چالاکی دەکەین:

• ڕۆژی ۲۱ی ڕێبەندانی ۱۳۹۳ ئەندامانی ژینگەپارێزی نۆژینی نەڵاس و چالاکوانانی بواری ژینگەی سەردەشت بەدەم کەمپەینی چاندنی بەڕوو ڕۆیشتن و لە دارستانەکانی دەوروبەری سەردەشت بەڕوویان چاند. [ماڵپەڕی *www.kurdistanmedia.com*، بابەتی "لە درێژەی چالاکیی ژینگەپارێزی لە کوردستان، هاوڵاتیانی سەردەشت و چالاکانی ژینگەپارێزی دار بەڕوویان چاند".]

• هاوڵاتیەك لە ناوچەی برادۆست بە ناوی عومەر برادۆستی، ساڵی ۲۰۱٦ هەڵمەتێکی ڕێکخست بۆ چاندنی بەڕوو. ئەم هەوڵە بەرەبەرە ناوچەکانی دیکەی باشوور و ڕۆژهەڵاتی کوردستانیشی گرتەوە و ئێستەش درێژەی هەیە.

---

۱. کتێبێك بە ناوی "عاشقانەهای سرزمین بلوط: شعر اقوام ایرانی / کوردی" کە کاك فریاد شیری کۆی کردووەتەوە و لەلایەن پەخشانگای تەوەکولی بانە چاپ کراوە. لێرە وڵاتی بەڕوو بە ناوچەی زاگرۆس کە هەمان نیشتمانی کوردانە، ناسراوە.

● نەورۆزی ٢٠١٨ کۆمەڵەی هیڤی بە چاندنی بەڕوو لە چیای ئەزمەڕی سلێمانی وڵامی تۆپباران و قڕکردنی سروشتی دەڤەری عەفرین لەلایەن سپای تورکیە دایەوە. لەو چالاکیە نوێنەران و هاوڵاتیانی ڕۆژاوای کوردستانیش بەشدار بوون. [ماڵپەڕی *www.rojnews.news*، بابەتی "لە ئەزمەڕ بە چاندنی بەڕوو پشتگیری لە عەفرین کرا".] هەر دیسان بەپێی هەواڵی ئەو ماڵپەڕە لە کۆتایی زستانی ٢٠١٧ دەستەی شاخەوانانی قەیوان لە شاری سلێمانی لە ژێر ناوی [شاخی گۆیژە بە درەختی بەڕوو سەوز دەکرێت] هەڵمەتێکی چاندنی بەڕوویان لە چیای گۆیژە داوە.

● لە هەڵمەتێکی جوتیارانی گوندی بێورێ ناوچەی شارباژێر سەر بە ناحیەی باسنێ چوارتا، کوێستانەکانی ئەو ئاواییە چاندراوە بە وەن و بەڕوو. وەك خۆیان باسیان کردووە کوێستانی بێورێ بەهۆی سەرمای زستانان زۆر بەکەمی داری قەزوان و بەڕووی تێدایە و ویستوویانە بەم هەوڵە بیکەنە دارستان. [*ماڵپەڕی www.xelk.org، بابەتی "لە شارباژێر جوتیارانی گوندێك قەزوان و بەڕوو لە شاخەکان دەچێنن"، ٢٠١٧/١١/٢٥.*]

● مەهدی نوورموحەمەدی دەرهێنەری ئیلامی، ساڵی ٢٠١١ و ٢٠١٢ فیلمی دیکۆمێنتاریی لەسەر ژیانی سمۆرە لە نزارەکانی بەڕووی زاگرۆس لە ژێر ناوی "لە تەنیشت دار بەڕوو" دروست کردووە و سەرماوەزی ٢٠١٣ لە فێستیڤاڵی نێودەوڵەتی سینەما هەقیقەت لە تاران دوو خەڵاتی وەرگرتووە. [*ماڵپەڕیwww.kurdpa.net بابەتی "فیلمی لە تەنیشت دار بەڕوو دەلاقەیەکی نوێی بۆ دیکیۆمێنتسازی ژینگەی ئاژەڵاندا کردەوە، ٢٠١٣/١٢/١٩*.]

● لە ڕۆژی جیهانی ئاژەڵان بە هەوڵی ئەنجومەنی ژینگەپارێزی پاژین و شارەداری بانە، پەردە لەسەر پەیکەری سمۆرەیەك کە بەڕووی بە دەستەوەیە، لە پارکی ژینگە هەڵدرایەوە. ئەم سمۆرەیە وەك هێمای باخەوان و پاسەوانی ژینگەی زاگرۆس ناودێر کراوە. [*ماڵپەڕیwww.jamekurdi.com بابەتی "پەیکەری سمۆرە لە بانە باخەوان و پاسەوانی ژینگەی زاگرۆس"، ٢٠١٦/٠٩/٠٦*.]

● فێستیڤاڵی نێودەوڵەتیی فیلمی کوردستان لە هەولێر ساڵی ٢٠١٧ خەڵاتەکەی بە "دار بەڕووی زێڕین" ناسراوە. بەڕێوبەری فێستیڤاڵەکە سەبارەت بە ناونیشانی خەڵاتەکە، گوتی: دار بەڕوو دارێکی پتەوە و ڕەگی لە نێو خاکی قووڵ چەقیوە و بەرگەی سەختی سەرما و سۆڵەی زستان و گەرمانی هاوین دەگرێت و لە سەردەمی خەبات و بەرگریی شاخیشدا بەری ئەو درەختە یەکێك بووە لە خۆراکی سەرەکی پێشمەرگە لە چیاکانی کوردستان.

[ماڵپەڕی www.flyreklam.com، بابەتی *"فێستیڤاڵی نێودەوڵەتی فیلمی کوردستان"*، ٢٠١٧/٠٨/٢١.]

## بەڕوو لە گۆرانی و پەند و چیرۆکەکان[1]

• ئێژی بەڕوو لە دەمیا تەقییە. [*ئاماژە بە کەسێك کە بڵەبڵ و پەلەپەل و پچرپچڕ قسە دەکات.*]

• قەت پیاوی تووڕە نەدوێتی چاکە / بەڕوو لە دەمیا تەقیوە کاکە. [*ئاستی تووڕەبوون و قەڵسی مرۆڤ نیشان ئەدات کە ئەگەر کابرا تووشی تووڕەیی هات، قسە و دەربڕینەکانی ڕێك و ڕاست و ڕوون دەرناکەون.*]

• لە بەهارا بەڕواریچ بدۆشە، شیری هەس. [*ئاماژە بە مشەمەری و فراوانی شیرەمەنی کوردەوارییە لە وەرزی بەهار. داری بەڕوو بە لاسك و بەر و گەڵاوە، لەچاو دارەکانی تر وشکە و سروشتێکی کەم شیلەی هەیە. جا هەر بۆیە ئەم قسەیە براوە بەسەر بەڕوودا.*]

• خورما ئەوا بۆ مەنەلی و بەڕوویچ بۆ هەورامان. [*بە کەسێك دەگوترێت کە فێڕ و دەجووڵێتەوە و هەڵسوکەوت دەکات و هیچ بەرنامەیەکی نییە. مەنەلی خاکی ئیلام و خانەقینە و خورمای بەناوبانگە و هەموو خاکی هەورامانیش بەڕواری هەیە. وەك لە فارسیدا هەیە: زیرە بە کرمان بردن، است.*]

• میراتی سمۆرە، بەڕووە. [*گیانداری سمۆرە لە دارستان و باخەکانی کوردەواری زۆر بەرچاو دەکەوێت. خۆراکی سەرەکی ئەم گیاندارە، بەڕوو، گوێز، بادام و بەرهەمە هاوشێوەکانی دیکەیە. ئەوەی بێ منەت دەیخوات و کۆی دەکاتەوە، بەڕووە. ئەگەر باس لەوە دەکرێت کە لێرەوارەکانی بەڕووی کوردستان خۆڕسکە، بەشێکی زۆری، بەهۆی سمۆرەوە شین بووە. چونکە وەك باس دەکەن سمۆرە بەڕوو لە کون و قوژبنەکانی ژینگەی دەشارێتەوە. بەشێك لەم پاشەکەوتانە لەبیری دەچنەوە و ڕێ ناباتەوە سەریان. کاتێ بەڕووەکان لە شوێنێکی شێدار و گەرمی کولانەی سمۆرەکە یا ژێر بەرد و خاك دەمێنێتەوە، چەکەرە دەکات و دەڕوێت.*]

• تا بەڕوو زۆر بێ، سمۆرە برسیەتی. [*خواردنی سەرەکی سمۆرە بەڕووە. لێرە مەبەست لە ئاستی تەماعی مرۆڤە.*]

---

١. بەشێك لەم زانیاریانە مامۆستا سەیید ئەحمەد موسەنفی خەڵکی ئاوایی کانیسپیکەی مەریوان کۆی کردووەتەوە و بۆی هەناردووم.

• وەك ئاو دوای بەڕوو / شیرین بی لای خەسوو. [*ڕواڵەتی ئەم پەندە، قسەیەکە بۆ بووك. واتا کەسێك کە پاش بەڕوو خواردن، چەندە ئارەزووی ئاوخواردنەوەی هەیە، هێندە لای خەسوو خۆشەویست و لەبەر دڵان بیت.*]

• کاورا بە خۆڕایی بینێری بۆ مازوو، بە دارەکەیچیا ناڕوانێ. [*کۆکردنەوەی مازوو لە وەرزی کۆتایی هاوین و پاییز، پیشەیەکی کۆنی خەڵکی کوردستانە. جا ئەگەر کەسێك بیهەوێت مازوو کۆ بکاتەوە، دەبێ بڕواتە ناو نزارەکان و مازووودارەکان بپشکنێت و چاو بە ناو پەلوپۆی مازواردا بگێڕێت تا مازوو بدۆزێتەوە و دایبگرێت.*]

• هەچی کەسە بەڕووی هەس بۆ ماڵ و مێمان. [*مەبەست لە فراوانی و مشەمەری بەرهەمی بەڕووە کە بەشی هەموو دانیشتوانی نزار و دارستانەکانی کوردستان دەکات و دەتوانن وەك بەرهەمێك کۆی بکەنەوە و بۆ خزمەتی خۆیان و میوان بەکاری بهێنن. مەبەسەتی سەرەکی قسەکە ئەوەیە کە هەموو ماڵێك بەشی ئەوەندەی تێدایە کە خزمەتی خۆی بنوێنێت بۆ میوان.*]

• بازەڵە و مەچەکی ئێژی کۆتەرە بەڕووە. [*بۆ کەسێك ئەگوترێت کە ماسوولکە و دەست و لاقی ئەستوور و پتەو و زۆردارە.*]

• ڕیشە بەڕوار هەڵەکێشێ. [*ئاماژە بە کەسێکی زۆردار و پاڵەوانە. دەرکێشانی داری بەڕوو لە جێگەی خۆی، کاری مرۆڤی ئاسایی نییە و لەوانەیە تەنیا لە تینی ماشێندا بێت.*]

• خوا کلاویچی بۆ بەڕوو دروست کردیە. [*ئێرە کلاو مەبەست لە قووچکە و جەوتەکەیە. مەبەستی پەندەکە ئەوەیە کە خواگیان پەکی بوونەوەرانی ناکات و نابێ بێهیوا بن لە بەزەیی و ڕەحمی. چونکا فریای هەموان دەکەوێت.*]

• زۆر جار خەڵکی دەشتانیەکانی کەرکووك، شارەزوور، هەولێر، موکریان، گەڕووس، لەیلاخ و کولیایی بە خەڵکی ناو چیا و کوێستانەکانی دیکەی کوردستان دەڵێن: "بەڕووخۆر".

• فلانی کوڕ بەڕووە. [*مەبەست لە کەسێکی ئازا و پتەو و پاڵەوانئاسایە.*]

• بەڕوولە. [*خەیاری تازە و ناسك و چکوولە. هەمان فەریکە خەیار.*]

• گزگلە گول. [*گزگل بەرهەمێکی لاوەکی داری مازوارە. لە مازوو چکوولەترە. مەبەست لە کەسێکی چکوولە و کورتەباڵایە.*]

• بەقەی گزگلێکە. [*واتای وەك گزگلە گولە.*]

• دانیشە سەر گزگلە. [*بە منداڵ دەگوترێت.*]

● سیچکە سیچکە / زیچکە زیچکە. *[سیچك بەرهەمێکی لاوەکی مازوارە کە وەك خاڵێکی هەڵتۆقیو لەسەر گەڵاکانی دەردێت. کاتێ ئاماژە بە زیپکە و کوانی بچووك دەکرێت لەسەر پێستی بەدەنی مرۆڤ و ڕێژەکەی زۆر بێت. دەڵێن: بەدەنی فلانی زیچکە زیچکە بووەتەوە. سیچك ناوێکی دیکەی گیای سیچرۆکەیە (بە فارسی: علف هفت بند).]*

● هەکڵ مەکڵ کلکافەکێ / زەرد و سوور و شەمامەکێ. [ئەم قسەیە بەشێك لە هۆنراوەیەکە بۆ منداڵان دەخوێندریتەوە لەکاتی کایەی "هەتۆڵ مەتۆڵ": هەکڵ مەکڵ کلکافەکێ / زەرد و سوور و شەمامەکێ / مێخم کوتا مێخ هەڵبەزێن / حاجی حوسێن زەرِنەشکێن.]

● لە خۆتەن گاڵ نەو، بەرِوو بووە هامێژەنی. *[ئەم پەندە دەگەرێتەوە بۆ سەردەمی گرانی و قاتیساڵی. کاتێ نانی گەنم و جۆ دەست نەکەوتووە لەبرسا پەنایان بردووە بۆ نانی گاڵ. لەو شوێنانەش دارستانی لێ بووە نانی بەرِوویان خواردووە. لای خۆمان گاڵ ناکەوێ بۆ خواردن هەرچەند زۆر ناخۆشە، کەچی بەرِوو هەر چەندە لە گاڵ ناخۆشترە بووە بە هاوتای گاڵ.]*

● لە بەختی حیز / خوێرِی گەزۆ ئەباری. *[ئەوسا لە کوردەواری باوریان وا بوو کە گەزۆ لە ئاسمانەوە ئەبارێتە سەر گەڵای داری مازوو. واتا بەهرەیەکی خواییە کە تایبەتی دێتە سەر گەڵای ئەم دارە. جا لێرە کە حیز و خوێرِی هێناوە، واتا بۆ ئەوانیش هەیە. بەگشتی مەبەست ئەوەیە کە خوێرِی و کەسانی حیز بەختیان زیاترە.]*

● بی درۆزنە / چنار عەشقنە / بەرِوار گەڵا کا / ئەمجا بەهارە. *[ئەم پەندە بۆ کاتی هاتنی بەهار دەگوترێت. واتا لە کوردەواری کاتێ بەرِوار گەڵای کرد، واتا دڵنیان ئیتر سەداسەد وەرزی بەهارە و زستان دوایی هاتووە.]*

● هەرجن درۆزن بەرِاڵوو تەیار / بەلوو گۆشەملە، وەهار هەی وەهار. *[ئەم پەندە تایبەتی ناوچەی کرماشان و کامیەرانە. وەك پەندی (بی درۆزنە / چنار عەشقنە...) بۆ کاتی هاتنی بەهار دەگوترێ. واتا باوڕ بە گەڵاکردنی بەرِاڵووك ناکەن و کاتێ بەرِوار گەڵای دەرکرد بە ئەندازەی گوێی مشك، ئەوکاتە بەهارە.]*

● ئەوسا لە کایەی گۆروابازی (پشکیلان) مازوو بەکار هاتووە لەبری پووڵ بۆ شاردنەوە لە ژێر گۆرواکان.

● پێشینیان وتوویانە: "دایك کە تازە منداڵی ئەبێ، ئەگەر بەئەندازەی قووچکە بەرِوویەك شیری هەبێت، بەسیەتی بۆ منداڵەکەی". *[لێرە ئاستی دەوڵەمەندی ماکی شیری دایك*

*نیشان ئەدات بۆ گەشەی کۆرپە.]*

● بە قەی قووچکە بەڕوویەك ئەبێ. [*مەبەست لە خانوو، دیو یا هەر شـوێنێکی دانشـتنە کە زۆر بچووك بێت.*]

● هەر دەوەنە ئەبـێ بە دار. [*دەوەن واتـا بنچکـی بچـووکی داری بەڕوار و مـازوار. واتـا پێویستە دەوەن گەشە بکات تا بەڕوار هەبێـت. مەبەسـت لە پەنـدەکە مـرۆڤە کە منـداڵە و گەورە ئەبێ.*]

● قسە دەمم کەوتەرە / سەرەم لوا جەوتەرە.

● پیاوێ بەڕوو ئەدا بە بزنەکەی، دەستیشی ئەهێنا بە پشتی بزنەکەیـدا بزانـێ چـاخەو بووە. [*بەڕوو خۆراکێکی سەرەکی بزنە، بەتـایبەت جـۆری بەرووە بـزنە. پەنـدەکە مەبەسـت لەوەیە کە کابرا خێرا ویستوویە ئەنجامی کارەکەی ببینێت.*]

● سۆفی عەلی خەڵکی ئاوایی ئاسنەوەی مەریوان کە کـاتی خـۆی پێشـمەرگەی شـێخ مەحموودی نەمر بووە، گێڕاویەتیەوە بۆ مامۆستا ئەحمەد موسەنیفی لە ئاوایی کانیسپیکەی مەریوان، کە شێخ مەحموود کـاتی خـۆی ڕاویـژی کـردووە لە هەر جێگـایەك بەڕوو زۆرە، بیکەنە ژێر گڵەوە تا لە کاتی تەنگانە فریاتـان بکەوێـت. جـا شـێخ مەحمـوود و هاوڕێکـانی بۆخۆیان ئەم کارەیان کردووە و فریایشیان کەوتووە.

● لە مەریـوان لە زمـانی بەڕوو، دەڵـێن: "بـاو بـاپیرت خاسـتر بـوون لە تـۆ / منـیش ئەمبەخشی بەوان نانی پۆ". [*واتا بەڕوو گلەیی لە خەڵکی ئێستاکە کردووە کە خراپ مـامەڵە و هەڵسوکەتی لەگەڵ دەکەن و ئاوری تێ بەرئەدەن و دەیفەوتێنن. نـانی پـۆ هەمـان نـانی "کەلگ"ـە کە ئێستاش لە ناوچەکانی ئیلام و لوڕستان و بەختیـاری هەیە. نـانی پـۆ کـاتی برسیەتی و وشکەساڵیەکانی سەردەمانی زوو لە ئاردی گەنم و بەڕوو دروست کراوە.*]

● کابرایەکی مەریوانی بۆ مازووکردن ڕوو لە ناوچەی بانە دەکات. سەیر ئەکا وا داڵێکـی گەورە کەروێشکێك دەڕفێنێت، لەسەری باتەوە و بیگرێت. نزیکی کابرای مازووچن دەبێتەوە ئەویش چارۆکەیەك خەپـلەی هەرزنـی پێـیە. خەپلەیەکـی تـێ دەگرێـت و کەروێشـکە لار ئەبێتەوە و دەیگرێت. جا ئەم بەند و بەستەیە، دەهۆنێتەوە بە باڵای خەپلەکا:

*ماڵی باوکم کیتلە قووڵە / هەم تانجیە و هەم تووڵە*

*هەم تیرە و هەم کەوانە / هەم نانی دەشتەوانە*[1]

---

١. پیرەژنێکی خەڵکی سلێمانی کاتی خۆی ئەمەی وتووە:

● هۆنراوەیەکی فۆلکلۆری:

*تاکوو ئەو ڕۆژەی ئەمکەن سپی‌پۆش / لە سۆز و خۆشیت ناتکەم فەرامۆش*

*وەکوو چۆن بەڕوو عاشقی کێوانە / من لە گۆڕیشدا هەر بۆ تۆم بەجۆش*

● داری گزگل داری لیمۆ هەر دو مەخلووقی خودان / چی بکا بێچارە گزگل نرخی هەر وەکوو لیمۆ نەبوو. [مامۆستا شەپۆل]

● ئەڵێن جارێ کابرایەکی گەرمیانی کە جیاوازی نێوان مازوودار و وێوڵی نەدەزانی، دەیبەن بۆ مازووکردن. ئەویش لەبری ئەوە مازوو کۆ بکاتەوە، دەست بۆ وێوڵەکان دەبات و بەڕووی وێوڵ دەخاتە توورەکەکەی. هاوڕێکانی پێی دەڵێن: خۆ ئەوە مازوو نییە، وێوڵە بە کەڵك نایەت. ئەویش دەڵێت: قەی ناکا وێوڵیش هەر مازگە.

● کچانی ئاوایی وەك گزگل وان. تا منداڵن هەموو پێکەوەن و بە یەك داری ئاوایین. دواتر گەورە بوون هەر کامەیان بە لایەکا تلۆر دەبنەوە.

● مازوویان نیا. [*ئەم قسەیە لەوە هاتووە کە ئەوسا لە ناوچەی گەرمیان باو بووە کە ئەگەر کەسێك دزی کردووە، گرتوویانە و بە بەڕوو ئەشکەنجەیان داوە. واتا بەڕووەکەیان لە کۆمی خستووە و هەندێ لەولاتر سێڵە یا سینیەکیان داناوە و وتوویانە دەبێ ئەو مازووە فڕێ دەیت و لەو سێڵە بکەوێت. ئەم کارەیان تا کاتێ مازووەکە لە سێڵەکەی داوە، درێژە پێ داوە. جا ئەم قسەیە ئێستە بۆ ئەوپەڕی ئەشکەنجە و تەنبیهـ کردنی کەسێك دەگوترێت.*]

● چەند پەند و ئیدیۆمێکی ناوچەی کەلار و خانەقین سەبارەت بە بەڕوو: ئێژی بە زەردەی بەڕوو کەفتیە، ئەولای ئارد بەڕووە، بەڕوویەك بۆ برسیەك قەڵایەکە، داری بەڕوو بە یەکەم تەور ناکەفێتە زەوی، زەمانە داربەڕوو ئەکاتە تابووت، لە بەڕوو نان گەنم دروست ناکرێ، لە دار بەڕوویچ سکڵ و بووڵ ئەکەفێ، مەیکوتە جەفتە، ئەگەر لە خوەت نەخەفتی وەکوو کونە بەجەفتی، خوەت مەکوژە جەفتە، لە مازووا تێ شکیا و لە سیچکا قەرەبووی ئەکاتەو، مازووی چنی و باوشی بەتاڵە، وەکوو مازووچنەکەی پاشوول کوون بووە.[١]

---

*چوومە ماڵە گاوەر / قولپەقولپی ساوەر. چوومە ماڵی جوولەکە / کلپەکلپی کوولەکە*

*چوومە ماڵی ئەرمەنی / قولتەقولتی سەمەنی. چوومە ماڵی موسڵمان / دەس نەکەوت باینجان.*

١. ئەم پەندانە زەحمەتی کاك کاروان عوسمان خەیاتە لە کەلار. بەڕێزیان سەرجەم پەند و قسەی پێشێنیانی ناوچەی گەرمیانی کۆ کردووەتەوە و هێشتا لەسەری بەردەوامە.

**بەڕوو لە هۆنراوەی شاعیرانی کورد**[1]

- **سالم (١٨٠٠-١٨٦٦)، دیوانەکەی:**

**. شێعری "لەلقەقناسا لەق و بەد ڕەوتە مەلا":**

*... وەك درەختی ڕەشەبا ڕیشە کەنیو / هەر لەسەر تا بە قەدەم چەوتە مەلا*

*خایەیی گزگلییە و نەوسی بەڕوو / شکەمی کوندەیی پڕ جەوتە مەلا...*

**. شێعری بۆ منی سووختەدڵ شەمعی نەدامەت دەگرێ":**

*...گەر لە بن داری بەڕوو کیسەڵی ڕەق خشپە بکا /*

*بێ هەوەس وەسڵی ئەویش بێ لە قوڕ هەڵدەپەڕێ...*

**. شێعری "بەدا ئەحواڵی ئەشخاسێ کە خاسسەی موڵکی بابانن":**

*...لە بیمی تازیانەی مەردی ڕۆمی سەیید و سۆفی /*

*بە ئۆممێدی گەزۆ و مازوو لە بن داری مەریوانن...*

- **حاجی قادری کۆیی (١٨٥٩-١٩٤٦)، دیوانەکەی، شێعری "وەرە سەیری بزانە لاوی کۆیی":**

*...بەراو و ئەرزی ئێوە کیمیایە / دوڕ و گەوهەر، گەزۆ و مازووی چیایە*

*مەعادین خاتری تۆ بێ لەگەڵ کان / گەنمتان زێڕە حەتتا زیوە زیوان...*

- **مەلا حەسەن دزڵی (١٨٥٩-١٩٤٦)، دیوانەکەی، شێعری "بەچکەی فەرەنجی و ڕۆڵە هەورامی":**

*...تا بەڕوو مابێ لە هەورامانا / تا شەماڵ بدا بە کۆسالانا*

*تا بەڕەزایەك با بیشەکێنێ / هەتا ڕێواسێ چووزە دەربێنێ...*

*شەرتە هەورامان بەجێ نەهێڵم / مەگەر ئەو ساتە کە بە جێی دێڵم...*

- **حاجی تۆفیق بەگ ناسراو بە پیرەمێرد (١٨٦٧-١٩٥٠)، کتێبی "پەندەکانی پیرەمێرد":**

*زۆڵەکی بەڕوو هەرگیز نابرژێ / پریشکی ئێستر لە کەر ئەپرژێ...*

*بەڕوو بە ئاگر کە هەڵدەتۆقێ / دەستەی گوێ ئاگر تێکرا دەتۆقێ...*

---

١. بەشی زۆری زانیاریەکانی ئەم بەشە لە ماڵپەڕی "ڤەژین بۆکس"ـی مەریوان وەگیراوە. ئەم ماڵپەڕە چەند ساڵە بەیارمەتی چەند چالاکێکی دڵسۆز و خەمخۆری ویژەی کوردی پێك هاتووە و دەقی دیوانەکانی هۆنراوەی هۆنەرانی کوردی تێدا جێ کراوەتەوە. بۆ نموونە بەشێك لە دیوانی مامۆستا قانع لەلایەن بیرمەندی گەورەی جیهان پرۆفیسۆر کۆچەر بیرکار، براوەی خەلاتی فیلدز (نۆبلی بیرکاری)، تایپ کراوە و لەم ماڵپەڕەدا دانراوە.

*نۆك و ئێستر و بەڕوو سێ زۆڵن / پەنجە و ناشی و بار هەر سێکیان کۆڵن...*
*خوا عەیبی بزنی دەرخستووەتە ڕوو / کەچی کڵاوی کردو بۆ بەڕوو...*
*مایسە و گەرمەی گەزۆ بارینە / لە کێ دەنیشێ مێش ئەم هاوینە...*
*باڵەشۆڕێمان تێکەوت بە جارێ / بۆیە مێش زۆرە گەزۆ دەبارێ...*

- **ناری (١٨٧٤-١٩٤٤)، دیوانەکەی:**
  - **شێعری "ئەی موقیمی مەکتەبی فەزل و هونەر":**

*...چون غەزەل ئەمڕۆ ڕەواجێکی نەما / ئێستە من مەشغووڵم جاوم موختەسەر*
*مشتەری گەر بێ لە بەغدا، وەك بەڕوو / ئەیفرۆشم من بە خورما سەربەسەر...*

  - **شێعری "بۆ غەزەڵ ئیمڕۆ بە من چاوی بە ناحەق گەڕ دەکەی":**

*بۆ غەزەل ئیمڕۆ بە من چاوم بە ناحەق گەڕ دەکەی؟*
*من بە مزگل ئیحتیاج و تۆ بە لیمۆ شەڕ دەکەی*
*من لە بێلوودا بە بێ ئاو و بە بێ بوڕ کەوتووم*
*تۆ لە بەغدادا هەمیشە سەیری بەحر و بەڕ دەکەی*

  - **شێعری "خودا عەدلی لە لای عارف عەیانە":**

*...وەلێ مەجبوورە فیکرم بۆ جەوابت / ئەگەرچی عاجزی دەوری زەمانە*
*تەریقی لانسلم با نەمێنێ / نەبێتە بەحس و گاڵەی مازووانە...*

  - **شێعری "تووتیی دڵم کە شیومن و فریاد و ڕۆ ئەکا":**

*... ناری لە شەوقی لەبی تۆیە لەم دەمە /*
*شۆخی بە قەند و یاری بە تۆزی گەزۆ ئەکا.*

  - **شێعری "شەشدەری لێ بەستووم وەک جەردەیی یوونان درۆ":**

*... قەت لەگەڵ عولوی مەقاما عاجزی تا سەر نییە*
*عاسمان بارشتی گاهێ، تەرزەیە و جارێ گەزۆ[1]...*

---

١. لە کوردەواری وا باوە کە گەزۆ ئەبارێتە سەر مازوواردا، بەڵام توێژینەوە زانستیەکان دەریانخستووە کە گەزۆ ئەنجامی چالاکی مێش و مێرووی سەر گەڵای ئەم دارەیە کە پاشەڕۆیان دەبێتە تەڕەنگوینی سەر گەڵاکان.

• **موفتی پێنجوێنی** (١٨٨١-١٩٥٢)، **دیوانەکەی، شێعری "ساڵان لەم فەسڵە سەیرانی و چەم بوو"**:

*ساڵان لەم فەسڵە سەیرانی و چەم بوو / ئاهەنگ و شایی عالەم بێ خەم بوو...*

*خسووسەن خوری و تا کەتیرە و موو / سەعلەب و گەز و دووبەرە و مازوو*

*ڕۆژێ دە لۆری لێرە دەر ئەچوو / ئەبوو بە دینار هەمووی زووبەزوو...*

• **حیلمی کاکەیی** (١٨٨٢-١٩٦٦)، **دیوانەکەی، شێعری "یارستان دوڕساخ"**:

*... چە کەردەی گەردوون مەحزوون و ناساخ /*

*چە لای قەوم لووت قسەی حەق یاساخ*

*جارجار تەعتیلم پەرێ یەك بەرماخ / حەڵوای گەزۆمان بییەن وە تۆراخ...*

• **ئەحمەد موختاری جاف** (١٨٩٦-١٩٥٣)، **دیوانەکەی، شێعری "ئەگەر بینێمە سەر خوودەی وەکوو دنگ"**:

*...چلۆن ئەیدەم بە خورمای قاچ و قول ڕووت*

*قەدی بەرزی چنار و گوێز و هارژنگ*

*لە زەیتوون چاکترە هەنجیر و سێومان*

*گەزۆم پێ خۆشترە سەد جار لە بالنگ...*

• **قانع** (١٨٩٨-١٩٦٥)، **دیوانەکەی، شێعری "سوودی وڵاتم"**:

*سوودی خاکی کوردستانم چەن هەزاران دەر هەزار*

*بۆت بنووسم کاکی کوردم، میوەیەکی بێ‌شومار...*

*مێو و سنجوو و کێکف و ژاڵە و گزیچار و شەهێن*

*گۆیژ و چوالە و بەڕوو و پەڵك و بەلاڵووك و چنار*

*داری بی پێنج تایفەن لازم نییە ناویان ببەم*

*خاوەنی سی و نۆ بەری خاوەن ڕەواجە مازوودار*

*گزگل و خرنووك و مازوو، پانکە و سیچکە و کەڵنج*

*پۆزەخووگە و هەمزەئاغا، هەر بردوو و شاخدار*

*بەرگەلا و تسقل و سەوزاڵی و نیسکە و گرێ*

*کارگ و قژگە و دەمووکە، سێفەڵووکەی ئاودار*

*جەوت و شۆکە زۆڵەك و شینکە و بەڕوو هەژگ و گەڵا*
*هەم گەزۆ و زووخاڵ و پیفوو چاکترینیان بارەدار*
*قانعی کاسب نییە بۆیە کەمی لێ زانیوە*
*بۆ ئەوانی تر بپرسە لای پیاوی کاسبکار.*

• **فایەق زێوەر (١٩٠٨-١٩٥٢)، دیوانی بەختیار زێوەر، شێعری "شێرە سەگێکە هی دۆستێکی من":**

*...بێ وەفا و سپڵە خائین نالەبار / کەموکووڕیی پیاو ئەبەن شاربەشار*
*ماڵی خزم و دۆست وەك گەزۆ و مازوو / ئەفرێنن ئەیخۆن بە زۆری بازوو...*

• **ئەخۆڵ (١٩١١-١٩٨٨)، هۆنراوەی "سۆزی پیری":**

*چەن جوانی بەڕوو جوانتری بەخوو / هەر تۆی لەلای من، لەنجەی لێهاتوو.*
*بەڵام بە من چی پیری دەس لەرزین / ڕێ ناسا جارێك بگاتە داوێن ...*

• **مینە جاف (١٩١١-١٩٦٥)، دیوانەکەی، شێعری "لە وەقتی شەفەق کردی نومایان":**

*...کردی بە کەرەم دارای دادار / حەسەن وە وێنەی گەوهەری شاوار*
*چونکە بە شێوە و بەڕوو حەسەن بوو / بە ئارا ناوی حەسەن پەسەن بوو...*

• **هێمن موکریانی (١٩٢١-١٩٨٦):**

**. دیوانی تاریک و روون، شێعری "بەهاری لادێ":**

*...بە تاڵ و تفت و سارد و گەرم و ناخۆشی ژیان ڕادێن /*
*بەگژ تین و بلێسە و بەفر و باران و هەوردا دێن*
*پەنیر و ڕۆن و ماست و هێلکەت بۆ لە دێڕا دێن /*
*خوری، مازوو، کەتیرە، دەغڵ و تووتن بەرهەمی لادێن...*

**. دیوانی تاریک و روون، شێعری "یادگاری شیرن":**

*...کوا مەتاعی کوردەواریمان دەچوو بۆ هەندەران؟*
*گەر بە سەربەستی نەژیبا ئەو کچە مازووچنە...*

**. دیوانی تاریک و روون، شێعری "لە بیرم مەکە":**

*...کەی گەزۆ شیرن وەکوو دەمی بوو / کەنگێ بەڕەزا وەك پەرچەمی بوو...*

- **هەژار موکریانی (١٩٢١-١٩٩١)، هەژار بۆ کوردستان:**

**. شێعری "سەمای دارانە":**

*...سپیندار و گێلاس و توو / مازوو، دەمووکانە و بەڕوو*
*دەسگیرانە لە هەر لاوە / سەما دەکەن بەدەم باوە...*

**. شێعری "شۆڕش ئەکەم":**

*...زۆڵە کوردی بێ ئابڕوو / دەنێرمە سەر هوڕڕەی بەڕوو*
*ڕووی گوندیخۆران ڕەش دەکەم / ئاو و زەوییان دابەش دەکەم...*

**. دیوانی وەرگێڕانەکەی مەم و زین:**

*...پەروەردە ببێ لەناو گوڵاوێ / ڕاپگوێزە لە سێبەر و لە تاوێ*
*هەر ڕۆژە لە لایەکی لەتی کە / قەڵشاوی پڕی گەزۆی سپی کە...*

**. کتێبی "یەک لە پەنای خاڵ و سیفری بێبڕانەوە":**

*...هەڵەمووت بە لەناو چیا / دار بەڕوو بە لەناو گیا...*

**. کتێبی کورد و کوردستان، شێعری "کوردم":**

*...کە تۆ گیرفان بڕی، گیرفان پڕی من هەر هەژار ماوم /*
*کە تۆ خۆت دا بە خواردن، من لەگەڵ گاڵ و بەڕوو کوردم*

**. دیوانی چوارینەکانی خەیام بە کوردی:**

*... بوولێڵە کە هات مەپرسە کەنگێی ساڵە*
*مەی فڕ بکە لەخوڕێنی بە تاس، بە پیاڵە*
*شێخ وازی لە هەنگوین و گەزۆیە و من مەی*
*مەی تاڵە دەبێ هەق بێ، دەڵێن: هەق تاڵە.*
*... شەو ئەستێرە بە زریوەن لەسەرمان*
*لە مانگی ڕووت، هەناسەم بۆتە خەرمان*
*تکەی ئاونگی کوڵمت تەڕ دەکا لێو / گەزۆ باری لە گەرمان و لە شەرمان...*

- **مەلا غەفوور دەباغی (١٩٢٧-١٩٩٠)، کتێبی "پەندی پێشینیان":**

*ئاوی سەر بەڕوو، نانی بێ کەڕوو / کووزەڵەی ناسك، بەڵام بێ زەروو...*

*بۆم پەیدا نابێ بەهێزی بازوو / نانی خەڵك ئەخۆم وەك گەزۆ و مازوو...*
*گەزۆ و شەلاقە بۆ جوو ئەباری / ئێستا دەمتاڵن بە دەردی کاری...*

● **موحەممەد سالح دیلان (١٩٢٧-١٩٩٠)، دیوانەکەی:**

*ساڵ پاییزە، گەرمەی گەڵارێزانە / رێزبارانە، شێوەی ساڵی جارانە.*
*گەڵای رژاوی دار مازووی چیای بەرز / ملوانکەکەی ئەئاڵانە ملی وەرز...*

● **سوارە ئیلخانیزادە (١٩٣٧-١٩٧٦)، تاپۆ و بوومەلێڵ، بەخشانی "هونەرمەند ئەندازیاری کۆشکی ئاواتی گەلە":**

*... رۆژێك تیرێك لە کەوانێك دەرچوو بەرەو فەزای بێ بن، هیچ چاوێك نەیدی تیرەکە لە کوێ کەوتە خوارەوە، پاش ماوەیەك تیرەکەیان دۆزییەوە کە لە دارێکی بەرِوو هەڵچەقی بوو، چونکە تیرەکە لە داری بەرِوو بوو؛ رۆژێك من ئاوازێکم لە ژێر لێوەوە زەمزەمە ئەکرد، ئاوازەکەم نیوە تەواو مایەوە، پاش ماوەیەك هەر ئەو ئاوازەم لە دەمی دۆستێك بیست لەو جێگایەوە کە من نیوە تەواوم هێشتبۆوە...*

● **شێرکۆ بێکەس (١٩٤٠-٢٠١٣):**

**. دیوانی "دەربەندی پەپوولە":**

*... دار بەرِوو دێ بۆ لام / رەگی خۆی ئەبەستێ بە رەگی قاچمەوە.*
*گابەرد دێ و هێزی خۆی / بە دیاری بۆ پشتم ئەهێنی...*

**. مێرگی زام مێرگی هەتاو، شێعری "بەندەر":**

*سەد و پێنج کورسی رەنگارەنگ / پەنجاوی سەوز و / پەنجای زەرد و / پەنجای مۆر و / رووبەروویشیان هەزار و یەك .. کێشەی رەش و / ترسی تاڵخ و/ گێژی پرسیار. بەڵام هەموو / لەناو ئەم کەشتیی هۆڵەدا / لەگەڵ سەوڵی زیوینی دەس / بیست و پێنج ملیۆن دار بەرِوو / روومان کردۆتە بەندەری / ئایندەیەك وەکوو گەنم / پرچ زێرین و / وەکوو ئاشتیش / بەژن سپی.*

**. مێرگی زام مێرگی هەتاو، شێعری "کەرکووکنامەیەک":**

*ئەگەر باڵدار بم.. یەك باڵم / ئەگەر بەرِوو.. ئەگەر قەڵەم / یان کڵاوکورەی شێعریش بم / بێکڵاوم / گەر ئەسپ بم.. خاوەنی تاقەیەك چاوم / ئەگەر "با" بم بێ گڤەم و / ئەگەر ئاو بم بێ خورەم و / ئەگەر هەنگوینی وشەیش بم / لەناو زاری ئازادیمدا / تفت تفت و هەر بێ*

*تامم. / من کوت و مت بە بێ کەرکووك / مرۆڤێکی کەم ئەندامم.*

• **عەبدوڵا پەشێو (لەدایکبووی ١٩٤٦):**

. **دیوانی "گەورە مەبە":**

*...ئەگەر وەرەس بووی، پێم بڵێ، / خانووچکەی شووشەت بۆ دەکەم.*

*ئەگەر برسی بووی، پێم بڵێ، / چنگۆڵانت / پڕ باسووق و گەزۆ دەکەم...*

. **شێعری "سەدان ساڵە":**

*... دە لە دار بەڕوو بپرسن، / تەوری دیوە داربڕ نەبێ؟...*

• **لەتیف هەڵمەت (لەدایکبووی ١٩٤٧)، دیوانەکەی:**

*داری بەڕوو فێری کردم / چۆن ڕەگی هۆنراوەم قووڵ بێ*

*داری بەڕوو فێری کردم چۆن نەخزێم / هەر چەند شەختە و گەردەلوول بێ*

*داری بەڕوو فێری کردم / کە چۆم ڕەگم بگا بە ئاو*

*داری بەڕوو فێری کردم / چۆن پەل بهاوێم بۆ هەتاو...*

• **مامۆستا قەلەندەر، شاعێری ناسراوی سەردەشت، دیوانی "چاپنەکراو":**

*...بزانە غەیری یادت چی دەوێدا / ئەگەر زیادی هەبوو گشتی وەکۆکە*

*دڵم شیرینە پێشکەش بێ بە تۆی گوڵ / بەنۆشت بێ وەکوو شیرنایی شۆکە.*

• **موراد دێهبانی (ڕێوار)، هۆنراوەیەکی کەلهوڕی بە ناوی "دار بەڕوو":**

*دار بەڕووم، پیرم / لەی خاکە ڕیشە دێرم*

*من و کورد جوور برایمن / لە پیشت یەك درایمن...*

## سووده خۆراکی و دەرمانیەکانی بەڕوو

ئەگەر دەشـــتاییەکانی عەرەبســـتان بە داری خورمـــا و کوێســـتان و پێدەشـــتەکانی لوبنـــان و فەلەســـتین بە داری زەیتـــوون ناوبـــانگی هەیە، چیاکـــانی زاگـــرۆس بە بەڕوودار و وەن دەناسرێنەوە. هەموو خاکی ڕۆژهەڵاتی کوردستان لە ئیلام و کرماشان و سنە تا دەگاتە ئـاوایی پردانانی پیرانشار داری وەن و بەڕووی هەیە. هەروەها چیاکانی باشوور و بـاکووریش ڕواوگەی بەڕووە و بەم شێوەیە کوردستان و بەڕوو پێکەوە تونـد گـرێ دراوە. ئەوەیـکە داری بەڕوو وەك بەرهەمێکی خواپێداوی کوردستان ئەژمـار کـراوە، پێویسـتە شـوکرانەبژێری بکەیـن و هەمـوو سوودەکانی بزانین و بیپارێزین. هەر لەکۆنەوە هەموو ئەنـدامەکانی بەڕووار سـوودی خـۆراکی، پزیشکی و تفاقی ئاژەڵ، هەروەها بۆ ژینگەپارێزی و جوانی سروشت سوودی لێ وەرگیراوە. لە زمانی کوردی بەگشـتی بە بەرهەمە خـۆراکیەکەی جۆرەکـانی داری بەڕوو دەگوترێـت: بەڕوو، بەلوو و بەلی. داری بەڕوو زۆر بەهێمنی گەشە دەکـات و لە پـاش ٢٠ تـا ٢٥ سـاڵییەوە دێـتە بەرهەم و میوە ئەدات.[1]

بەڕوو وەك نیشانەیەکی خۆڕاگری و بەرخۆدانی کورد ئەژمار دەکرێت و دروشـمی گەلـی کوردستانە. هەروەها دارە بەتەمەن و پیرەکـانی بەڕوو وەك دارێکـی پیـرۆز سـەیر دەکرێـت. هەندێ جار دار بەڕووە کۆنەکان بێ ئەوەی دارنیشانی مەزار و گڵکۆی کەسێك بێـت بە "دار شەخس" دەناسرێت. خەڵك لەسەر مەزاری مردووەکانیان نەمـامی بەڕوو دەنێـژن. هەر بـۆیە زۆربەی گۆڕستانی لادێیەکانی کوردەواری پـڕە لە جۆرەکـانی دار بەڕوو. لە بـاوڕی خەڵکـی کورد مەزاری مردوو دەبێ گوڵ یا دارێکی لەسەر بێت.

## جۆرەکانی بەڕووی کوردستان

جنسی بەڕوو ناوی زانستیەکەی *Quercus spp*. و ناوی ئینگلیسیەکەی بە Oak دەناسرێت. ئەم دارە سـەر بە بنەمـاڵەی Fagaceae یە. لە تـوێژینەوەیەکی زانسـتی لە دەوروبەری دەریـاچەی زرێـوار دەرکەوتـووە کە نـزیکەی ١٣ هەزار سـاڵ پـێش ئێسـتا پـاش قۆنـاغی سەهۆڵبەندان، کە زەوی گەرم بووە چیاکانی دەوروبەری ئەم دەریاچەیە وەن و بەڕووی تێدا

---

١. سادقی موحەمەد موعین و ڕەزا بەسیری، "مونوگرافی بلوط ایرانی در جنگلهای زاگروس ایران"، زانکۆی چەمرانی ئەهواز: www.centralzagros.doe.ir

شین بـووە. تەنیـا لە خـاکی ئێـران جۆرەکـانی بەڕوو نـزیکەی ٤٠ لەسـەدی دارسـتانەکانی داپۆشیوە.[١] بەگشتی سێ جۆر بەڕوو لە چیاکانی زاگرۆسدا هەیە:

- **بەڕووداز:** شەکی، بەڕوار (Q. persica & Q. brantii): ئەم دارە زۆرتر لە جەنگەڵەکـانی خوارووی کوردستاندا هەیە. بۆ نموونە نـزیکەی ٩٠ لەسـەدی دارسـتانەکانی ئـیلام ئەم دارە پۆشیویە. [میوەکەی بە بەڕووە خاسە دەناسرێت و تاڵایی کەمترە و زۆرتر دەخورێت.]
- **مازووداز:** مازوار، دارمازی (*Q. infectoria*): ژینگەی ئەم دارە لە سنووری هەورامـان و مەریوان دەست پـێ دەکـات تـا بەشـەکانی دیـکەی کوردسـتان. ڕەنگـی گەڵاکەی لەچـاو جۆرەکانی تر تەڕ و جوان و ڕوونترە و بزن چاکتری دەخوات. [میـوەکەی بە بەڕووە بـزنە و مازووێن دەناسرێت. درێژ و باریکە. لە پلەی سێهەمدا بەڕووەکەی دەخورێت.]
- **ویوڵ:** ویۆل، وێهۆڵ، وێلوودار، هێلـوودار و دینـدار (*Q. libani*): ئەم دارە لە بەشـێکی بچووکی سەردەشت، مەریوان، بـانە و سـنووری ئەم شـارانە لەگەڵ باشـووری کوردسـتاندا هەیە. ناوی کوردی ویۆڵ چووەتە ناو کتێبە فارسیەکان. کۆتە و لاسکی ویۆڵ کرێژەی سپی پێوەیە کە ئەم سپیاییە هەمان کرێژەی سەر دارەکانە و هاوسفرەیی کـوارگ و کرێـژەبەردە. [میوەکەی بە بەڕووە کـۆپە و هێلـوێن دەناسـرێت. هاوشـێوەی بەڕووەخاسـەیە و لە پـلەی دووهەمدا دەخورێت.][٢]
- **بەڕووداز:** (*Q. longipes*) ئەم جۆرە لە داری بەڕوو چەند ساڵ پێش ئێستا ناسێندراوە و تا ئێستە تەنیا لەسەر ڕێگەی بانە بۆ مەریوان پاش ملەی قەرەژدابـان لە کەنـاری جـادەی ئاواییەکـانی سـیانزار، شـیپانەجۆ، سـووتە و تاڵەجـاڕدا هەیە. جیـاوازی ئەم بەڕووە لەگەڵ جۆرەکانی دیکە ئەوەیە کە قونچکی نێوان جەوتەکە تا لقی دارەکە درێژترە.[٣]

## سوودەکانی گشتی بەڕوو

هەر لەکۆنەوە هاتووە کە بەڕوو دارێکی سەخت و پتەوە. دارەکەی بۆ دارەڕای سەرماڵ، پرد، دارتاشی، نیرە و ئاموور، بەلەم، و کەرەستەکانی دیـکە بەکـار هـاتووە و وەك دارێکـی پـڕ و پتەوە ناسراوە. گەڵاکانی تاڵایی و تامی تایبەتی خۆی هەیە. لە ناوچەکـانی بـانە، پێنجـوێن،

---

١. هەمان سەرچاوەی پێشوو

٢. هەمان سەرچاوەی پێشوو

٣. فەتاحی موحەمەد، "شناخت جوامع جنگلي و نقشه پوشش گیاهي بانه "، چاپی یەکەم، پەخشانگای سازمان جنگلها و مراتع ایران، تاران، ١٣٧٢

چوارتا، بانە، سەردەشت، قەڵادزێ، ڕانـیە، ئـاكرێ، ئامێـدی و شـەمزینان وەك تفـاقی بـزن بەكاری دێـنن. بەم بـۆنەوە گەڵاجـار لە ئاوایيەكـانی نـاو دارسـتانی بەڕوو جێـی گیاجـاڕ و لەوەڕگای گرتووەتەوە. ڕەگ و ڕیشەی بەڕوو زۆر ئەستوور و پـتەوە. تـا چەنـد گەز دەڕواتە قووڵایی خاكەوە. وەك لەنگەر و پاسەوانێكی خاك و خیزەڵانەكانە بۆ دژی شۆردنەوە، لافاو و جمگە. ئەم دارە چەندین بەرهەمـی هەیە كە ناسـراوترینیان بەڕوو، مـازوو، گەزۆ، شـۆكە و كارگە[1]. لە پزیشكی كـۆن سروشـتی گەرم و وشـك دانـراوە بـۆ بەڕوو. مادەكـانی نـاو بەڕوو بریتین لە:

تانین (*Tanin*)،[2] قەند، ترشی گالیك، ترشی مالیك، كوێرسین، مووسـیلاژ، پێكتـین، ڕۆن و جەوی.

● **گەڵا**: ئاژەڵدارانی كوردەواری گەڵای جۆرەكانی بەڕوو هەڵدەپاچن و بۆ تفـاقی زسـتانی بزنەكانیان بەكاری دێـنن. بەگشـتی گەڵای داری بەڕوو پاسـەوانێكی تەواوە بـۆ گلـدانەوەی تەپ و تۆز و بەفر و باران. بەپێی بەراوردەكان ساڵانە یەك هێكتار دارستان ٦٨ تـۆن تەپ و تۆز گل دەداتەوە و دەیكاتە خاكی بەستێنی خۆی.[3]

● **میوە**: بەرهەمی جۆرەكانی بەڕوو هەمان میوە درێژەی نـاو كـڵاوەكەیە (جەوت) كە بە بەڕوو دەناسرێت. خواردنی ئەم میوەیە بەكاڵی زۆر تاڵە. خواردنی لە كاتی گەڵاڕێزانی پاییزدا دەست پێ دەكات. بەڕووی شەكی خۆشترە و تاڵایی كەمترە و بە بەڕووەخاسـە دەناسـرێت. دواتر بەڕووی وێوڵ و پاشان بەڕووی مازوار. بۆ خواردنی بەڕوو دەبێ سەرەتا بەڕووەكە نووك و جێ قونچكەكەی ببڕدرێت پاشان ببرژێـت یـا بكوڵێنـدرێت تـا تـاڵاییەكەی كەم بێـتەوە. ئەوسا ناوكی بەڕوو پاش برژاندن، هاڕدراوە و كراوە بە كولێرە و خواردوویانە. هەر لەكـۆنەوە خەڵك بەڕووی برژاوی یا چایی بەڕوویان خواردووە بۆ پتەو كردنی دیوارەی گەدە و لابردنی برینی گەدە و چارەسەری نەخۆشینی دیـكە. ئەوسـا لە كـوردەواری خـواردنی بەڕوو لەپـاڵ قورسین و سۆبەكان نەریتێكی تایبەتی بووە بۆ شەوانی درێژی پاییز و زسـتان. بەدەم قسـە

---

١. بەهارانە لە بن دار بەڕووەكان جۆرێ كارگی گەورە هەڵدەتۆقێت كە كەمتر دێتە سەر خاكەكە و تەنیا بە قەڵشینی زەویەكەدا دیارە.

٢. بەپێی سەرچاوەكان بەڕوو یەكێك لە دەوڵەمەندترین بەرهەمەكانە بۆ مادەی تانین كە ٨ تا ٢٠ لەسەدی ئەم مادەیە تێدایە.

3. FAO (Food and Agriculture Organization of the United Nations). State of the World's forests. FAO, Rome, 2005.

و چیرۆك گێڕانەوە بەڕووی برژاویان خواردووە. لە کوردیدا پەندێك هەیە بۆ برژاندنی بەڕوو: *"قەت پیاوی تووڕە نەدوێنی چاکە / بەڕوو لە دەمیا تەقیوە کاکە".*

چەند ساڵێکە پاییزانە خەڵك هەموو جۆرەکانی بەڕوو کۆ دەکەنەوە و دەیفرۆشن و کارگەکانی دروستکردنی کەپەك (خۆراکی کۆنسانترەی مانگا) دەیکەن بە کەپەکی بەڕوو. هەروەها کارگەی گیادەرمانی شەفا لە شاری سنە ماوەیەکە خەریکی توێژینەوەیە لەسەر بەکارهێنانی ئاردی ناوکی بەڕووە خاسە بۆ جۆری کێکی بەڕوو. نموونەی ئەم کێکە دروست کراوە و شیرینیەکەیشی لە دۆشاوی توو دابین کراوە.

ئەوسا کوردەواری لە وشکەساڵی و کاتی برسیەتیەکاندا خەڵك پەنایان بۆ بەروبوومی نزارەکان بردووە. بۆخۆم لە خەڵکی بەساڵاچووی ئاوایی باقلاوا بیستوومە، کە: *"باب و باپیرانمان باسیان کردووە کە گرانی و برسیەتی و قڕەساڵیەك کوردستانی گرتەوە کە هیچ نان و زاوێك دەست نەدەکەوت. خەڵك زۆر مردن و فەوتان. ئەوانەی مانەوە بۆ سکی برسییان ڕوویان لە ناو بەڕوارەکان کرد و هەرچی بەڕووی تازە و کۆن بوو کۆیان کردەوە. جا بەڕووتی یا لەگەڵ مستێ ئارد هاڕییان و کردیانە نان و خواردییان".* ئەڵبەت قەدیم ئەو ساڵانەی وا نان مشەمەر بووە خەڵك بۆ بەهێزبوونی لەش و بەرگری لە نەخۆشیەکان نانی بەڕوویان دروست کردووە و خواردووە. لە ناوچەی مەریوان ئەو نانەی لە ئاردی گەنم و بەڕوو کاتی خۆی دروست کراوە وەك نانی کەلگی لوڕ و بەختیاریەکان، بە نانی پۆ ناسراوە. تەنانەت ئێستەش نانی پۆ لە شێعرێکدا لە زمانی داری بەڕوو هەر ماوەتەوە:

*باو باپیرت خاستر بوون لە تۆ / منیش ئەمبەخشی بەوان نانی پۆ*

نانی بەڕوو ئێستەش لای کورد و لوڕەکانی ئیلام، لوڕستان و بەختیاری ماوەتەوە و دەخورێت. نانی بەڕوو لای بەختیاری و لوڕەکان بە "کەلگ" دەناسرێت. ئەم خەڵکە کەلگ تەنیا بە خۆراك نازانن. بەڵکوو وەك نانێکی دەرمانی و وزەبەخش سەیری دەکەن. شێوەیی دروستکردنی کەلگ بەم جۆرەیە:

پاش پەڵەی پاییز بەڕووەکان کۆ دەکرێنەوە. ناوك و توێکڵ و جەوتەکە لێك جیا ئەکەنەوە. پاش وشك کردنەوە لەبەر هەتاوی بەڕووەکان ئەبرژێنن یا ئەوەیکە وردی دەکەن و لە جۆگە و کارێزی دەخەوێنن تا چەند ڕۆژ کە تالاییەکەی بە دەم ئاوەوە بڕوات. ئینجا دەیهاڕن و دەیکەن بە هەویر. وەك کەشك و دۆینە سەلك سەلك لەبەر هەتاو وشکی دەکەنەوە. لە ئەسڵدا بەم سەلکانە دەگوترێت کەلگ. پاشان هەر ئەگەر ویستیان نانی لێ دروست بکەن دەیهاڕنەوە و لەگەڵ ئاردی گەنم تێکەڵی دەکەن و نان و کولێرەی لێ

دروست دەكەن. ئەڵبەت دەكرێت وەك كولێرەی ناوساجی ئاردی كەلگ بكەن بە كولێرە چەورە. ئەم جۆرە كولێرە بە لالەكی دەناسرێت.[١] جیا لە بەكارهێنانی كەلگ بۆ نان، هاڕاوەی كەلگ دەكرێتە ناو ماست و دەخورێت.[٢]

● **مازوو:** بەرهەمێكی لاوەكی داری مازووە. جۆرەكانی بەڕوو چەندین بەرهەمی لاوەكی دیكەیان وەكوو (قلقاف، تسقل، پانكە، كەڵنج، پۆزەخووگە، هەمزەئاغا، سەوزاڵی، نیسكە، گرێ، زۆڵەك، قژگە[٣]، گزگل،[٤] سویرەكە، بنەوەشیلە،[٥] خڕیلە، پەمۆلە، كوڵ، سێفۆڵكە، خڕنووك،[٦] بەرەگەڵا[٧] و سیچكە) هەیە. ئەم بەرهەمە لاوەكیانە لە زمانی زانستیدا بە گاڵ دەناسرێن. زەردەواڵە و مێش و گیاندارەكانی دیكە لەسەر بەر و گەڵای بەڕوو كاریگەری دادەنێن و ئەم گاڵانە دروست دەكەن. گاڵی مازوو مێشی *Andricus stenlichti* و گاڵی كڵكاف مێشی *Andricus querustozae* لەسەر چڵ و پۆی لاوەكی و كۆتایی شاچڵەكانەوە داری مازوو دروست دەبن. ئەم دوو بەرهەمە مادەی تانێنیان زۆرە، هەروەها بۆ كاری ڕەنگسازی و مادەی دژە بەكتریا بەكاری دێنن.[٨] كۆكردنەوەی مازوو لە پاییزدا تا ئێستاش پیشەیەكی باوە و خەڵك كۆی دەكەنەوە و ڕەوانەی بازاڕی دەكەن. پەندێكی كوردی هەیە: *"كابرا بە زۆر بینێری بۆ مازوو، بە دارەكەیشیا ناڕوانێ."*

بەگشتی گاڵەكانی بەڕوار و مازوار بەرهەمی چالاكی گیاندارە ورد و وردیلەكانی سروشتە، وەكوو مێروو، هەنگ، گەنە، نەماتۆد و بەكتریاكان. چالاكی ئەو گیاندارانە لەسەر

---

١. وەرگیراو لە بابەتی "كلگ یادگار دیرین پیوند هزار ساله ایل و بلوط / جای خالی نان بلوط در سفرەها"، سدیقە ئۆمیدی، ماڵپەڕی www.mehrnews.com. ١٣٩١/١١/٠٤

٢. وەرگیراو لە بابەتی "٢٥ خاصیت دارویی و درمان باور نكردنی بلوط آشنا شوید"، ئامادەكردن: جەهان باورصاد. ماڵپەڕی www.delgarm.com: ١٣٩٦/١٢/٢٢

٣. قچكە، قرژە، قژنۆكە

٤. گڵوان

٥. واتا مازوویەك تازە دەركەوتووە. هەروەها بنەوەشیلە ناوی جۆرێ قەزوانە كە نەرمە.

٦. مازوول: لە مازوو چكوولەترە

٧. فەرهەنگی خاڵ بۆ وشەی بەرەگەڵا (بەرێ پەڕەگەڵا) نووسیویە: شتێكی وردی خڕە لە پشتی گەڵای مازوودار پەیدا دەبێ.

٨. دوخواهرانی سەمانە چهارمیری و هاوكارانی، "فعالیت ضد باكتریایی عصارە آبی گال‌های قلقاف و مازوج درختان بلوط از جنگلهای لرستان"، گۆڤاری زانستی ـ توێژینەوەیی زانكۆی پزشكی لوڕستان، دەورەی ١٥، ژمارە ٢، ١٣٩٢

ئەو دارانە دەبێتە هۆی جۆرێك گەورەبوون یا نارێکی ئەندازە (Hypoplasia) و زیادبوونی ڕێژەی خانەکانی (Hyperplasia) شوێنی چالاکیەکە. گاڵ مکانیزمی بەرگری دارە بەرامبەر بە هێرشی چزووی گیانداران. تا وەکوو ئێستە نزیك بە ١٣٠ جۆر گاڵی بەڕوو لە سەرانسەری دنیا دۆزراوەتەوە. ئەم گاڵانە مەوادی ئانتی ئۆکسیدانیان تێدایە واتا دەکرێت بۆ دژی شێرپەنجە بەکار بهێندرێن. ئەوسا لە پزیشکی کۆندا مازوو و بەرهەمە لاوەکیەکانی دیکەی مازوار و بەڕوار چەندین سوودی پیشەسازی و دەرمانیان بووە:

- بۆ ئازار و نەخۆشیەکانی گەدە و ڕیخۆڵە،
- بۆ سکچوون، وشككردنی برین و گیرساندنەوەی خوێنی برین و برینەکان،
- جێگیر کردنی ڕەنگی خوری و بەنە ڕەنکراوەکان لە کارگەی ڕەنگرێژی،
- دروستکردنی ڕەنگ و مەرەکەف.[1]

کۆتایی هاوین ئەو مێروانەی کە بەهار و هاوین شیلەی گەڵای مازوار و وێولیان مژیوە و گەزۆیان دەرداوە، گەراکانیان لەسەر مازوو، کڵکاف، قژگە و گاڵەکانی دیکە دادەنێن تا ساڵێکی دیکە دیسانەوە سەر هەڵدەنەوە.[2]

- **جەوت**: ناوی دیکەی قلووچە و جەفتە. کارگەکانی دەباغی و دروستکردن و خۆشەکردنی پێستی ئاژەڵ ئاشنایی تەواویان لەگەڵ جەوتی بەڕوو هەیە. جەوت پێستی ئاژەڵ بۆ کوندە و مەشکە و خیگە توند و پتەو دەکات و ڕەنگی خۆی پێ دەبەخشێت. هاوینی ١٣٩٦ بۆ توێژینەوە لەسەر قورئانە دەستنووسەکەی بێساران چووینە هەواری داسێران لای کاك یەعقووب ناسراو بە کاکەلێ. ئەم پیاوە تەمەنی ٨٥ ساڵە و دەیگێڕایەوە کە سەردەمی لاوی بارە جەوت و قەزوانم بردووە بۆ ناوچەی ساڵاڵی دیواندەرە و فرۆشتوومە و لەبری گەنم و شمەکی دیکەم هێناوەتەوە. هاڕاوە یا ئاوی جەوت بۆ لەناوبردنی نەخۆشیەکانی بەکتریایی و کوارگی بەکار دێت، بەتایبەت بۆ دەرمانی زاریشە. هەروەها شیرەی هایدرۆئەلکۆڵی جەوت تایبەتمەندی دژە کوارگی هەیە.[3] مادەی تانێن کە

---

١. وەرگیراو لە بابەتی "مازو، دردانە درختهای بلوط لرستان" [وتوویژ لەگەڵ توێژەرانی ناوەندی توێژینەوەی ژینگە و کشتوکاڵی لوڕستان]، سەمیرا عەزیزی، ماڵپەڕی: *www.isna.ir* ١٣٩٥/٠٧/٢٥.

٢. مەحموود موحەمەدی و هاوکارانی، وتاری "بررسی عوامل مولد گز علفی *Quercus infectoria* و نحوە تولید و بهرەبرداری"، گۆڤاری "تحقیقات گیاهان دارویی و معطر ایران"، ژمارە ٤، ١٣٨٢: لاپەڕە ٣٧٦

٣. عەسگەری حشمەتوڵا، "ارزش‌گذاری اقتصادی حسابداری جنگلهای بلوط در استان ایلام"، گۆڤاری اقتصاد منابع طبیعی، ژمارە ٢، ١٣٩٢

لە جەوت و توێکــڵ و گەڵای بەڕوودا زۆرە، جیــا لە خۆشــەکردنی پێســتی ئــاژەڵ، لە پیشەسازی بۆ دروستکردنی ڕەنگ، چەسپ، ڕەنگ کردنی لوولەی ئاسن و پۆڵا، جێگیـری و پتەوکردنی ڕەنگی خوری و پەشمی ڕێسەمەنی بەکار دەچێت. تانێن لە بواری پزیشکیدا بـۆ ناو دەرمانەکانی دژی سکچوون، گیرساندنەوەی خـوێن بەتـایبەت خـوێنی گەدە و ڕیخـۆڵە سوودی لێ وەردەگرن.[1] لە ناوچەی سەردەشت دوو کەس دەرمانی زاریشە دروست دەکەن: خات بەهێ لە ئاوایی نەڵاس و خات زارا لە ئـاوایی بێشاسـب. یەکێـك لە پێکهاتەکـانی ئەم دەرمانە، هاڕاوەی جەوتە. لە کوردیـدا پەنـدێك هەیە بـۆ جەوت: *"خـوا کڵاویچـی بـۆ بەڕوو دروست کردییە"*.

• **لاسک**: کۆتە و داری بەڕوو جنسێکی لەبارە بۆ دارتاشی و پیشەی نازککاری[2]. دارێکـی سەخت و پتەوە. ئەوسا بۆ دارەڕای مـاڵ، کـۆڵەکە، داری سـەرپرد و دروسـتکردنی درگـا و دەروازە و پەنجەرە بەکاریان هێنـاوە. کـۆلکەی بەڕوو بەرهەمێکـی چـاکە بـۆ دروسـتکردنی ڕەژی. ئەوسا خەڵکی لادێ پاییزانە بارە ڕەژی بەڕوویان بردووە بۆ شار و لەو سەرەوە شمەك و پێداویستیماڵیان پێ کڕیوە.

داری بەڕوار و مــازوودار لە هەنــدێ شــوێن بە "هەژگ" دەناسـرێت. گەلێـك سـوودی دارتاشی و تەختەسازی هەیە لە کوردەواری. داری مازوو لە جوانیدا بۆ گۆچان، داردەست و نەقیزە زۆر بەکارە. هەروەها دواتر کە گەورە بوو دەبێتە سەختەدار و بۆ دارەڕای سەر ماڵ و گەوڕ نموونەی نییە. داری بەڕووداریش کە بۆ نیرە و ئاموور (ئێرەق و نێڵە) و کەڵەمەی مل گا ئەوسا بەکاریان هێناوە. بەتایبەت بەشەکانی گاینجە، هەپە، بەڕوولە، مژان، دەسەکەوشـە و ئێرەق ئەگەر لە بەڕوودار بێت ئەو کەرەستە دەبێتە شتێکی تایبەتی.

• **ڕەگ و ڕیشە**: ئەگەر سەیری شوێنی ڕوانی بەڕوو بکەین، زۆر بە هێز و قـایمەوە شـین دەبێت. ڕەگی ئەو دارە تا چەند گەز خـاك و گـڵ و بەردی زەویەکە دەگـرێتە خـۆ. دەبێـتە هۆی پاراسـتنی خـاك و خیـزی دەوری خـۆی و پـێش دەگرێـت بە لافـاو و شـۆردنەوە و هەرەس و جمــگە. ئەمــانە هەمــوو ســوودی ســەرەکی ئەو دارەن کە ئەگەر ئەمــانە نەبـن سروشتی کوردەواری بەتایبەت قەدپاڵ و خیزەڵان و زرووکانەکانی هەر زوو ڕووتەن و چۆڵ دەبن لە گژوگیا، هەروەها بەفر و بـاران کە دەبارێـت خـاکەکە نایمژێـت و ئـاوەکە دەبێـتە

---

١. هەمان سەرچاوەی پێشوو

٢. نازککاری پیشەی باوی شاری سنەیە کە تەختەنەرد، شەترەنج، گۆچان، پەیکەر و کەرەستەی دارینە دروست دەکەن.

سێڵاو و دەڕوات. پاشان کانیاوەکان ناتەقن و ناژینەوە و وشك دەبن.

• **گەزۆ**: بەگشتی گەزۆ جۆرێك شیرینیە کە لەسەر گەڵا و میوە و لاسکی بڕێ دار دەکەوێت. گەزۆ لە دەستەی مان (Manna) ئەژمار دەکرێت و قورئانی پیرۆزیش ئاماژەی بە گەزۆ کردووە و بە (من) ناوی هێناوە.[١] ئەم مادەیە لە سەرچاوەکان بە "گەزۆ، مانی کوردی و مانی بەڕوو" و بە فارسی "گز علفی" دەناسرێت.[٢] لە کوردەواری هەر لەکۆنەوە گەزۆی داری مازوار و وێوڵ کۆ کراوەتەوە. گەڵای داری مازوو ئەستوورە و ئەگەر بکوترێت و بتەکێت درەنگ گەڵاکە دەشکێت و گەزۆکە جیا دەبێتەوە. لە کوردستان گەزۆ لەسەر بەڕوار نابینرێت و تا وەکوو ئێستە لەسەر مازوار و وێوڵ بووە. گەزۆ لە کۆتایی بەهار دەکەوێتە سەر گەڵای ئەو دارانە. واتا کاتێ مێرووەکان دەتوانن بەئاسانی شیلەی گەڵاکان بمژن. کاتێ گەڵای دارەکان پیر بوون و گەیشتن چالاکی مێرووەکان کەم دەبێتەوە. زۆر جاران لەو شوێنانە وا گەزۆ هەیە چەند ساڵ جارێك گەزۆ بەرچاو دەکەوێت. کە ئەمە پێوەندی هەیە بە بوونی مێرووەکانەوە. لەو ساڵانەدا وا گەزۆ نییە مێرووەکان تەنیا گەراکانیان هەیە و مێرووی زیندوویان نییە. ئەڵبەت لەناو دارستان لەو شوێنانە وا کەشی گەرم و هەندێ شێدار و پەنابایە چالاکی مێرووەکان زۆرترە. لەڕاستیدا گەزۆ هەمان شیلەیە کە لە بەشی پاشەوەی ئەو دوو مێرووە دەردێت: *Tuberculoides annulatus* Hart. و *Thelaxes suberi* Del. واتا کاتێ ئەم مێروانە شیلەی گەڵای دار مازوو و وێوڵ دەمژن، شیلەیەکی هەنگوینی لە دوایانەوە دەردێت. پاش ئەوەی کە گۆڕنکاری کەشی ژینگەیی دارستان ڕووی دا، شیلەکە وشك دەبێتەوە. ئینجا خەڵك گەڵاکان دەبڕن و پاش ئەوەی وشك و کزر بوونەوە دەیتەکێنن و گەزۆکە جیا دەکەنەوە. گەزۆ دەوڵەمەندە بە ڤیتامینی C، و چەند جۆر قەندی پۆلیساکارید. سوودی سەرەکی ئەم مادەیە وزەبەخشی جەستە و ڕەوانکاری گەدە و ڕیخۆڵەیە. برینەکانی ناوسك و ناودەم چارەسەر دەکات.[٣] لە کوردەواری گەزۆ شیرینیەکی تایبەتی سەر سفرە و خوانی خەڵکە. لەگەڵ کەرە بەیانیانە دەیخۆن، شیرینی کونجی گەزۆی لێ دروست دەکەن و بە چاییەوە دەیخۆن یا بۆ شیرین کردنی

---

١. وَظَلَّلْنَا عَلَيْكُمُ الْغَمَامَ وَأَنْزَلْنَا عَلَيْكُمُ الْمَنَّ وَالسَّلْوَى كُلُوا مِنْ طَيِّبَاتِ مَا رَزَقْنَاكُمْ وَمَا ظَلَمُونَا وَلَكِنْ كَانُوا أَنْفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ. ٥٧: بەقەرە

٢. مەحموود موحەممەدی و هاوکارانی، وتاری "بررسی عوامل مولد گز علفی *Quercus infectoria* و نحوه تولید و بهرەبرداری"، گۆڤاری "تحقیقات گیاهان دارویی و معطر ایران"، ژمارە ٤، ١٣٨٢؛ لاپەڕە ٣٦٧-٣٨٧.

٣. هەمان سەرچاوەی پێشوو

خۆراك و دەرمانەكان بەكاری دێنن.

لە فەرهەنگی كوردی "ئاناهیتا" لە ژێر وشەی "گەزۆ" نووسراوە: مادەیەكی شیرینە لەسەر گەڵای مازوو دەبینرێت. هەڵوای لێ دروست دەكەن و بەشێوەی دەرمان بۆ ڕەوانكردنی ناوسك بەكار دێت. جۆرە مێش و مەگەزێك لەسەر گەڵای بەڕوو هەیە كە پێی دەڵێن: "زە". ئەم مێرووە لەسەر ئەو گەڵایە جۆرە مادەیەكی هەنگوینی شل دەرئەدات و دوایی دەبێتە كریستاڵی بچووك بچووك.

• **شۆكە**: تویژینەوە زانستیەكان لەسەر گەزۆ دەریدەخەن كە ئەو مادەیە لە وەرزی كۆتایی بەهاردا دەكەوێتە سەر گەڵاكان و تەنیا لە ئەندامی تازەی دارەكە وەكوو گەڵا و خەڵفی نوێ دەنیشێت. هیچ ئاماژەیەك بەوە نەكراوە كە گەزۆ لەسەر میوەی دارەكە هەیە. شۆكە مادەیەكی سپی و هاوشێوەی شەكرە كە لەسەر بەڕووەكان هەیە و پاییزانە وەك شەكری وشك دەبینرێت. ئەڵبەت پاش ئەوەی كۆ دەكرێتەوە و دەیكەنە شیلە، ڕێك هاوشێوەی شیلاوی گەزۆیە بە تام و ڕەنگ و بۆنەوە. دەكرێت توێژینەوەی زیاتر بكرێت كە سەرچاوەی دەردانی ئەم شەكرە چە مێروویەكە. پاییزانە خەڵك بەڕووی شۆكەدار كۆ ئەكەنەوە. ئینجا لە ئاوی شیرتینی دەكەن و خێرا دەستێكی تێ وەرئەدەن و بەڕووەكە لە ئاوەكە جیا ئەكەنەوە. ئینجا چەند جار ئاوەكە دەپاڵێون و دەیكوڵێنن تا خەست بێتەوە. خواردنێكی وزەبەخش و خۆشە. وەك دۆشاوی ترێ و توو بەكاری دەهێنن. دۆشاوێكی ڕەوانە و بۆ ناوسك زۆر بەسوودە. دەگوترێت سوودبەخشە بۆ هێزی جنسی. لە ناوچەی ئیلام "شەوەكە" بە بەڕوو دەگوترێت كە بۆ دەرمان و خواردن بەكاری دەهێنن.[1] هەندێ لە سەرچاوەكان شەوەكە بە هەمان شۆكە دەزانن كە لەسەر بەڕوو دەنیشێت و هاوشێوەی شەكرە.[2]

• **پیفوو**: بە "پیفۆك"یش ناودێر دەكرێت. جۆرێك كوارگە لەسەر قەدی داری مازوو و بەڕوو شین دەبێت. سەرەتای گەشەكردنی پێكهاتەیەكی پیفەڵ و هەندێك فشی هەیە، بەڵام دواتر ڕەق و ئەستوور دەبێت. ئەوسا یەكێك لە كەرەستەكانی هەڵكردنی ئاور بووە و لەگەڵ بەردی چەخماخ كراوە و ئاگری لێ ساز بووە و پێیان گوتووە: پیف و چەخماخ.

---

١. وەرگیراو لە بابەتی "شوكه موثر در درمان ورم و زخم معده"، وتوویژ لەگەڵ كارناسانی ژینگەی ئیلام. ماڵپەڕی www.isna.ir: ١٣٩٢/٠٨/٢٩

٢. وەرگیراو لە بابەتی "شوكه چیست و چرا برای معده مفید است؟"، ماڵپەڕی www.hanarek.ir

• **دەمووکە**: بە "دەمکانە و دەمووکانە"ـیش دەناسرێت.[1] چەشنی چڵ و پرژی گیایەکە لەسەر دار وێوڵ و مازووەکان ڕسکاوە. بۆخۆی گیایەکی مشەخۆرە و بە قەدی ئەو دارانەوە شین دەبێت. کاتێ پەلەوەرەکان لەسەر ئەم دارە دەنیشنەوە و دەنکە دەمووکە چەسپناکەکان بە چنگیانەوە دەنووسێت و دیسانەوە لەسەر دارێکی دیکە دەنیشنەوە، بە قەدی داری دیکەوە شین دەبێت و ڕەگەکانی لە توێکڵ و قەدی ئەو دارە ئاو و شیلە هەڵدەمژن. ئەگەر پرژ و لاسکی ئەم گیا مشەخۆرە لەسەر دارەکان زۆر بمێنێتەوە و زیاد بکات ئەوە دەبێتە هۆی لاوازبوون و لە کۆتاییدا وشکبوونی دارەکە. بەری ئەم گیا مشەخۆرە کە میوەیەکی خڕ و چەسپناکە، خەڵك کۆی دەکەنەوە و دەیفرۆشن.

## کۆکردنەوەی بەڕوو

هەر لەکۆنەوە لە کوردستان پاییزانە پاش پەڵە دەست ئەکرێت بە کۆکردنەوەی بەڕوو. ئەوسا بە مەبەستی خواردنی نانی بەڕوو، شەوچەرەی زستان، دەرمان، خواردنی ئاژەڵ و فرۆشتن کۆ کراوەتەوە. ئەوڕۆکە کارگەکانی دەرمان، ڕەنگسازی، خۆشەکردنی پێست و پیشەسازی ڕوو لە لادێیەکان دەکەن و بەڕوو بۆ ئەو مەبەستانە کۆ دەکەنەوە. چەند ساڵێکە کەسانێك لە شارە فارس و ئازەریەکانی ئێرانەوە بەرەو نزارەکانی سەردەشت و بانە دێن و بەرووی کوردستان دەکڕن و دەیبەن کەپەکی مانگای لێ دروست دەکەن.

لە نزارەکانی باشووری کوردستانیش هاوشێوەی ڕۆژهەلات بەڕوو کۆ دەکرێتەوە. بەتایبەت لە نزارەکانی ئاکرێ، باڵەکایەتی، قەلادزێ، هەورامان و شارەزوور. لە ئاکرێ کۆکردنەوەی بەڕوو لەکۆنەوە نەریتێکی باو بووە. واتا خەڵکی گوند ڕۆژێك دیاری دەکەن و ئەو ڕۆژە پێی دەڵێن "بانگ". ئینجا ڕوو لە دارستان دەکەن و قەزوان و بەڕوو کۆ دەکەنەوە.[2] ئەڵبەت سەرەتا لە تەنیشت ماڵەوە شوێنێك بە تووڵ و دار تەیمان دەکەن و پێی دەڵێن: "کوتەڵ". بەڕووەکان لە کوتەڵ دەکەن تا وشك ببنەوە.[3]

## سوودە دەرمانیەکانی بەڕوو

---

١. بە فارسی "دبق، موخور و لورانتوس" دەیناسن و لە جنسی *Loranthus sp.* دانراوە.

٢. وەرگیراو لە بابەتی "بەڕوو و کەزانی کوردستان ڕوو لە کەمییە"، نەوزاد هلۆری لە ئاکرێ، ماڵپەڕی www.wishe.net: ٢٠١٥/١١/١٠

٣. وەرگیراو لە بابەتی "لە ئاکرێ و ئامێدی ساڵانە سەرووی ١٠٠ تۆن بەڕوو کۆ دەکرێتەوە"، ئامادەکردن: نەوزاد هلۆری. ماڵپەڕی www.wishe.net: ٢٠١٦/١١/١٨

لەنـاو بەڕوو پێکهـاتەی خـۆراکی گرنـگ هەیە کە سـوودی بـۆ تەندروسـتی مـرۆڤ زۆرە. سوودەکانی پزیشـکی بەڕوو هەر لەکـۆنەوە لەنـاو خەڵکـی کـورددا ناسـراوە. چـونکە بەڕوو هەمیشە بەرهەمێکی مشـەمەر و فـراوان بـووە لەبەردەسـتیاندا و هەوڵیـان داوە بە هەمـوو شێوەیەك ئەزموونی بکەن و ببێت بە دار و بەرهەمێکی ئەزموارە.[١] هەوڵی ئـێمە لەم بەشـەی وتارەکەدا ئەوەیە کە دەمباسەکانی خەڵك و بابەتی توێژەران لە ماڵپەڕەکـان کـۆ بکەیـنەوە و لە یەك شوێن بیخەینە پاڵ یەك تا هەموو لایەنەکانی سوودبەخشی بەڕوو بناسرێت.

- خواردنی زۆری بەڕوو دەبێتە هۆی وشکبوونی شیر لە دایکاندا.
- چارەسەری سکچوون و بێهێزی دەمار دەکات،
- ترشەلۆکی گەدە کە ئازاردەرە، چارەسەر دەکات و لایدەبات،
- برینی ناودەم چارەسەر دەکات،
- چارەسەری نەخۆشیەکانی پێست وەکوو ئەگزیما دەکات،
- ڕێژەی شەکر لە خوێندا ڕێك دەخات. کەواتە مرۆڤ لە تووشبوون بە نەخۆشی شەکرە دەپارێزێت،
- هـاڕاوەی تـوێکڵی بەڕوو، دەکـرێتە چـایی و بـۆ تووشـبوانی سـکچوون بەسـوودە. ئامادەکردنی ئەم چاییە بەم شـێوەیە: تـوێکڵەکە لەبەر هەتـاو وشـك دەکـرێتەوە. ئینجـا کە تەڕاییەکەی نەمـا، دەهاڕدرێـت و هەر جـارە کەوچکـێ بچـووکی ئەکـرێتە نـاو چادانێـك و دەیکوڵێنی و دەیخۆیت،
- ئەگەر هاڕاوەی توێکڵی بەڕوو بکەیتە ناو ئاوی کـوڵاتە و ئینجـا وردە وردە کە پـلەی گەرمیەکەی دابەزی، دەسـتی تـێ بخرێـت نەخۆشـیەکانی پێسـت وەکـوو بیـرۆ چارەسـەر دەکات.[٢]
- ئەوانەی قوڕگ و ناودەمیان تووشی هەوکردن بـوون دەکرێـت ئـاوی بەڕووی کـوڵاو غەرغەرە بکەن.
- ئەوانەی تووشی خوێنبەربـوونی نـاوەکی و گەدە و ڕیخـۆڵە هـاتوون خـواردنی ئـاوی

---

١. لە کوردەواری باوێك هەیە، ئێژن: فلان دار ئەزموارەیە. واتا ئەزموون کراوە و ئەنجامەکەی بەئەزموون سەلمێندراوە. بۆ نموونە ئێژن دارنیشانی سەر گڵکۆی فلان شێخ ئەزموارەیە کە هەر کەسێك لێی بخوات فلان نەخۆشی چاك دەبێتەوە.

٢. وەرگیراو لە بابەتی "سوودەکانی خواردنی بەڕوو"، ماڵپەڕی www.westganews.net: ٢٠١٧/١٢/٠٧

بەڕووی کوڵاو چارەسەرە.[١]

● پێکهاتەی چای نەعنا، جاترە و بەڕوو بۆ دژی سکچوونی خوێناوی و ئاسایی ناوسك، بەهێزکردنی بەرگری لەش، کەمکردنەوەی ئازار و کـۆکە، دامرکانـدنی پاڵەپەسـتۆی (تەوژم) خوێن و یارمەتیدان بۆ وەستانی خوێنبەربوونی ناوەکی سوودبەخشە.[٢]

● بەکارهێنانی بەڕوو بۆ کوانی ژێرمل بەسـوودە، واتـا دەرچە دەکـاتە ئەو کـوان و لـکە چڵکدارانە،

● کوڵاندنی توێکڵ و گەڵای بەڕوو بۆ نەخۆشی مایەسیری و سکچوون باشە.[٣]

● دکتۆر عەبدولبەسیر هلۆری پسپۆڕی تەندروستی، بەپێی ئەزموونی پێشینیان دەڵێـت: بەڕوو یارمەتی هەرسکردنی خواردن دەدات. هاوکات دژی هەوکردنە و لاوازی ماسـوولکە و جومگەکانی لەش بەتایبەت منداڵ و پیرەکان چارەسەر دەکات. ئەڵبەت باشتر وایە لە کـاتی خواردنی بەڕوو، هەنگوینی تێکەڵ بکرێت.[٤]

● ئەگەر سکی ئاژەڵ تووشی ئاوسان هات خواردنی جەفتـاوی بەڕوو دەتوانێـت هێـوری بکاتەوە. هەروەها ئەو ئاژەڵانەی کـاتی زایـین گـوێردان و بەرخـدانیان دەردێـت بە جەوتـاو بیشۆرن و ئینجا بیخەنەوە ژوورەوە.[٥]

---

١. وەرگیراو لە بابەتی "بەرووی ئەم ساڵ بخۆ و چارەسەر وەربگرە"، ئامادەکردن: فەرهەنگ حەمید عبدالقادر (ئەندازیاری خۆراك)، ماڵپەڕی www.kshtwkall.blogspot.com: ٢٠١٦/٠٩/٢٧

٢. وەرگیراو لە بابەتی "چای نەعنا و جاترە و بەڕوو"، کارگەی گەنجینەکانی سروشت، ماڵپەڕی www.gulahang.com، ٢٠١٨/٠٢/١٧: ئەم کارگەیە بەسەرپەرشتی سەرۆکی کۆمەڵەی گیادەرمانانی باشووری کوردستان کاك ئیسماعیل موشیر لە شاری هەولێر دانراوە و ناوەندی گیادەرمانی گوڵهەنگ لە ناوشاری هەولێر بنکەی کار و دەرمانگەری ئەم بەڕێزەیە.

٣. وەرگیراو لە بابەتی "بەڕوو"، حامید دروودی، ماڵپەڕی www.kurdflora.com. ئەم ماڵپەڕە وەك فەرهەنگێکی گیاناسی و گیادەرمانییە کە بەڕێز دروودی خەڵکی چرۆسانەی کامیەران و دانشتووی وڵاتی سوید دایناوە و پڕە لە بابەتی هەمەڕەنگ و سوودبەخش.

٤. وەرگیراو لە بابەتی "لە ئاگرێ و ئامێدی ساڵانە سەرووی ١٠٠ تۆن بەڕوو کۆ دەکرێتەوە"، ئامادەکردن: نەوزاد هلۆری. ماڵپەڕی www.wishe.net: ٢٠١٦/١١/١٨

٥. وەرگیراو لە بابەتی "٢٥ خاصیت دارویی و درمان باور نکردنی بلوط آشنا شوید"، ئامادەکردن: جەهان باورصاد. ماڵپەڕی www.delgarm.com: ١٣٩٦/١٢/٢٢

**وێنە ٢: کونجی گەزۆ (بەرهەمێکی شاری سنە)**



**وێنە ٣: نانی بەڕوو (کەلگ)**



**وێنە ٤: هاڕاوەی ناوکی بەڕوو بۆ کەلگ**



**وێنە ٥: وشک کردنەوەی کەلگی بەڕوو**



**وێنە ٦: کوتەڵ بۆ هەڵگرتن و وشککردنەوەی بەڕوو**



وێنە ٧: جەوت و بەڕوو



وێنە ٨: بەڕووە خاسەک



**وێنە ٩: سێفۆڵکەی بەڕوو**



**وێنە ١٠: مازووە شینە**



وێنه ١١: بەرهەمی مازوو



وێنه ١٢: بەرهەمێکی لاوەکی داری مازوو



**وێنە ١٣: پەمۆڵەی مازوو**



**وێنە ١٤: سیچکە**



## گۆلاوی زەل و زەرووەکەی ئاوایی تفڵی ناوچەی شامیان

بۆ ئامادەکردن و نووسینی ئەم بابەتە ڕێکەوتی ١٣٩٧/٠٣/١٢ چووینە ئاوایی تفڵی. ئەم گوندە دەکەوێتە داوێنی کوێستانی کۆسالآن و لە ٧ کیلۆمتری شاری سەوڵاوا هەڵکەوتووە. خەڵکەکەی بە شێوەزاری سۆرانی ئەردەلانی قسە ئەکەن و ١٧٠ بنەماڵەیەك لێرە نیشتەجێن. پیشەی سەرەکی خەڵکی تفڵی کشتوکاڵ، ئاژەڵداری، کرێکاری و کاروانییە. کێوە ناسراوەکانی بریتین لە: پیربالێنان، زەل، جۆلآسان، دۆخوان و بانسار، هەروەها کانیاوەکانی هەوەشی، بالێنان، گویژەمار و بێلووە. چەند دەشتێکی گەشتیاری و سەیرانیشی وەکوو ولەسمت، دەشتەڕەقە، یارۆجاڕ، پانالۆسە، زەل، هەوەشی و تەپەلی هەیە.

خەڵکی ناوچەی شامیان و کەلآتەرزان و ژاوەرۆ هەر لەکۆنەوە بەجۆرێك ناو و ناونیشانی کێوی بالێنان و گۆلاوی "زەل"ـیان لە تفڵی بیستووە. ئەم گۆلاوە گیانداری سوودبەخشی زەرووی تێدایە.[1] هەر چەند ئێستاکە بانگەوازی زەروو و زەلی تفڵی تا شوێنەکانی دیکەش چووە و سالآنە گەشتیار و خەڵکی داخوازی زەروو سەردانی دەکەن. خەڵکی تفڵی هەر لە کۆنەوە لە باوك و باپیرانیانەوە باسی سوود و قازانجی زەرووی زەلیان بیستووە و بەکاریان هێناوە و کەسێك لەم‌لاو ئەولاوە هاتووەتە تفڵی و بۆ نەخۆشی بە شوێن زەرووی زەلدا گەڕاوە خۆبەخش خەڵکی ئاوایی هاوکارییان کردووە کە بتوانێت لە زەل زەروو بگرێت و هەروەها نیشانیان داوە کە چۆن بەکاری بهێنێت. پێشینەی بەکارهێنان و ناسینی سوودی پزیشکی زەروو لای خەڵکی کوردستان پێویستی بە توێژینەوەی زیاتر هەیە. ئەوەی کە لە

---

١. هاوشێوەی گۆلاوی زەل لە تفڵی، لە نزیك لووتکەی کوڕەمیانە دەشتێك پان هەیە کە گۆلاوێکی تێدایە بە چالآو دەناسرێت، هەروەها لە داوێنی بەرزاییەکانی کێوی دالآمپەڕی شارستانی شنۆ ئەویش چەند گۆلاوێکی گەورە و بچووکی هەیە، لە نزیکەوە سەردانی ئەم دوو کوێستان و گۆلاوانەم کردووە، بەلآم گیانداری زەرووی گەورە هاوشێوەی زەرووی بازاڕ و تفڵی لەوانەدا نییە.

چەند پیر و بەساڵاچووی تفڵی و ناوچەکە پرسیارمان کرد بە بیری باوك و باوایشیان زەرووی زەل بەکار هاتووە و خەڵك بۆ نەخۆشی و ناسازییان بەکارییان هێناوە و حەکیمانی ناوچەکە وەکوو شێخ عەلادین و شێخ عوسمان دوورۆ و شێخ مادێحی کوڕیشی بۆ نەخۆشەکان دایان ناوە.

زەل کێو و گۆلاوێکە دەکەوێتە ٣ کیلۆمتری باشووری ئاوایی و لە داوێنی کێوی پیربالێنان و تەنیشت کوێستانی بەرزی کۆساڵان هەڵکەوتووە. زەل واتا زەلکاو و زۆنگاو. گوایە بالێنان شەخس و گلکۆی پیاوێکی خاس‌خوای ئەم ناوچەیە بووە و هەر بۆیە ئەم شوێنە بەوە ناسراوە. لە داوێنی پیر بالێنان دەشتاییەك هەیە کە بەفراوی کێوەکانی دەوروبەری و هەروەها سەرچاوە هەڵقوڵاوەکانی بووەتە هۆی دروستبوونی گۆلاوێکی گەورە بە پانتایی دەوری ٥٠٠٠ میتری دووجا. قووڵایی گۆلاوەکە جۆراوجۆرە و تا نزیك بە یەك گەزیش قووڵی هەیە. دەوروبەری گۆلاوەکە تەنراوە بە چیمەن و گیا و پیزڵ. بەگشتی بەرژەوندێکی خۆش و گەشتیاری هەیە. ڕەنگ و ئەندازەی ئەو زەرووە هاوشێوەی زەرووی بازاڕ و دەرمانخانە سروشتیەکانە و بەڕواڵەت جیاوازییەکی ئەوتۆ لە نێوانیاندا نابینرێت. خەڵکی ناوچەکە پێیان وایە کە سوودی زەرووی تفڵی زۆرترە بۆ لابردنی نەخۆشییەکان تا زەرووی بازاڕ. چونکە زەرووی بازاڕ بە گیاندارێکی بەرهەم‌هاتووی ناسك و لاواز دەزانن و زەرووی زەلی تفڵی بە بابەتێکی سروشتی دادەنن.

حاجی موحەمەد دەستوور خەڵکی ئاوایی تووتمەری دەشتی مەریوان دەگێڕێتەوە کە جارێك دەوروبەری ساڵی ١٣١٥ هەتاوی بۆ چارەسەری کوێربوونی خەدیجەی خۆشکم چووینە بیارە بۆ لای شێخ عەلادین نەقشبەندی. گوایە خوشکەکەی بەهۆی خەم و پەژارەوە کوتوپڕ نابینا دەبێت. شێخ پێی دەڵێ تەمی خەم و خەفەت بەرچاوی گرتووە و دەبێ بڕەوێتەوە. ڕایدەسپێرێ کە لە گۆلاوەکەی زەلی تفڵی چەند زەروو بگرێت و بینێتە دەموچاویەوە. حاجی دەیگێڕێتەوە کە ئەم کارەمان کرد و زەروو خوێنی دەموچاو و لای لووتیان خوارد و بووە هۆی کرانەوەی بینایی خوشکەکەم.[1]

لەو سەردانە بۆ تفڵی چەند بابەتێك جێی سەرنج بوو کە شیاوە لێرە باس بکرێت:

- گوایە لە وشکەساڵی و بێ‌بەفر و بارانیەکانی کۆتایی دەهەی ١٣٧٠ ئاوی زەل وشکی

١. حاجی موحەمەد شکستەبەندێکی لێزان و پسپۆڕە و لە ناوچەی شامیان و دەشتی مەریوان ناسراوە. تەمەنی ٨٦ ساڵە و لەسەر جێگە کەوتووە. ڕێکەوتی ١٣٩٧/٠٣/١٤ سەردانیمان کرد و سەبارەت بە پیشەی شکستەبەندیەکەی لە ئاوایی تووتمەر وتووێژمان لەگەڵیان کرد.

کردووە و تەنیا تەڕایی خاکەکەی دەبینرا و هیچ شوێنەوارێك لە زەروو لەو وشکانییە بەرچاو نەدەکەوت، بەڵام پاش وشکەساڵیەکە دیسانەوە زەرووی زەلکاوەکە بەرچاو دەکەوتن و خەڵك دەیانگرتن.

- ئێستاکە زەلەکە زەرووی کەمی تێدایە و زۆر بەکەمی کەسێك دەتوانێت تا ئێوارە دوو زەروو بگرێت. کەواتە پێویستە لایەنی پێوەندیداری ئیداری و ژینگەپارێزان ئەم مەترسیە لەبەرچاو بگرن.
- نرخی یەك زەرووی تفلّی ئێستاکە تا ٤٠ و ٥٠ هەزار تمەنە و دەبێ داخواز لای دووکانی ڕزوان لە ناو ئاوایی ناو بنووسێت تا بەشکوو زەروویەکی بۆ بگرن.
- سەردەمانی کۆن خەڵك چوونەتە ناو زەلەکە و زەروو پێوەی نشتوون و هاتوونەتە دەرەوە تا زەرووەکە داکەوتووە، بەڵام ئێستاکە خەڵك دەڕۆن سەرەتا ئاوەکە لێڵ دەکەن و ئینجا دەست بە گرتنی دەکەن. گرتنەکە بە دوو شێوازە: یەکەم ئەو کەسە بۆخۆی دەڕواتە ناو ئاوەکە و هەر زەروو ویستی بیگەزێ پەلاماری ئەدات و بە تەیژە و سۆزمەیەك دەیگرێت. دووهەم ئاوەکە لێڵ ئەکەن و بە تەیژە دەیگرن و لە تۆنگە و گۆزەڵەی دەکەن و هەڵیدەگرن.

**سەرچاوەکان:**

ـ وتوویژ لەگەڵ: حامید وەیسی تەمەن ٥٢ ساڵ و ڕزوان نەسری تەمەن ٣٠ ساڵ دانیشتووی تفلّی، حاجی کەریم دەستوور تەمەن ٩٥ ساڵ دانیشتووی ئاوایی تووتمەر

ـ ماڵپەڕی: www.zariwarkhabar.com. ڕێکەوتی ١٣٩٥/٠٦/١٣. بابەتی: تالاب زل سروآباد فرصتی برای جذب گردشگری.



وێنەی بەهاری ۱۳۹۷ گۆلاوی زەل، (سەرچاوە: ڕزوان نەسیری)



وێنەی زەرووی گۆلاوی زەل، (سەرچاوە: ڕزوان نەسیری)

## داره شەفابەخشەکەی مەحموود سەرواڵە

لە کوردەواری باوە، ئێژن: "دنیا کۆنە یـا دنیـا بنـی لە زووەو دانریاگـە". لەم دنیـایە گەلێـك ئینسان هاتوون و چوون و لە ژێـر هەر بەرد و شـاخ و نـاو هەر دۆڵ و دەراو و بەری هەر دەشـت و دەرێـك، سـەدان و هەزاران چیـرۆك و بـاس و ڕازی دیـار و نادیـار خەوتـوون و داپۆشراون و هەڵنەدراونەتەوە. هەندێك لەو چیرۆکانە هێشتا سووچێك لە لاپەڕەی پەرتووکی داپۆشراویان بە دیارەوەیە و هەندێکیان بۆ هەمیشـە کـراونەتە ژێـرەوە و ئەسـتەمە دیسـان تەمی سەر ڕوخساریان بڕەوێتەوە.

یەکێك لەو چیرۆك و باسانە کە دەکرێـت لێکـۆڵینەوەیەکی بەربـڵاوی لەسـەر بکرێـت و هەندێك سەرەداوی کۆن و تازە لەپاڵ یەك بخرێـت تـا وەکـوو بـابەتێکی تـر بخـرێتە سـەر کەلەپـووری چیـرۆك و دیرۆکـی ئەم نیشـتمانە، چیرۆکـی مەحمـوود سـەرواڵەیە. دەوری سەرەکی ناو ئەم چیرۆکە کەسـێکە نـاوی مەحمـوودە. دیـارە ئەم کەسـایەتیە لە بنچیـنەدا یەکەم جار بەند بووە بە شوێنێك یا کەسـێك بە نـاو سـەرواڵە. سـەرواڵە نـاوی ئـاواییەکە لە ناوچەی بان لەیلاخ و لە دەڤەری شارستانی دێولان. ئەوەیـکە تـا ئێسـتە زیـاتر بەرگوێمـان کەوتووە، گوایە لەسەر گڵکۆی مەحموو سەرواڵە دار میـوەیەك بـووە کە بە هـیچ شـێوەیەك بەری نەگرتووە. دارەکە زیندوو بووە بەڵام ساڵانە هەر زوو گەڵای هەڵوەریوە و تەنانەت قەل و قاڵاویش نەیتوانیوە هێلانەی پێوە دروست بکات. بەگشتی دارێکی بێبەر و بـێ بـار و بـێ سێبەر بووە. [لەوانەیە ئەم گێڕانەوە جۆرێکی دیکەش ببیسترێت]. هەر بـۆیە لە نـاو قسـەی خەڵکیدا باوە، ئێژن: "ئەڵێی دارەکەی مەحموو سەرواڵەیە: واتا کەسێکە هیچ کـار و پیشـە و بەرێك لە خۆی ناگرێت". دارنیشانی شەخسی مەحموو سەرواڵەی نێوان ئاواییەکـانی دۆڵاش

و کانی سانان لە مەریوان داری تووە. مامۆستا قانێع لەگەڵ ئەم دار تووە قسەی کردووە و شێعریشی داناوە:

*بە سەد ناڵە و دەرد، دار هاتە وەڵام / وتی: ئەی قانع دەروون پڕ لە زام*

*ئیستە وا ڕەنگم ئێژی عەوداڵە / مەشوور بووم بە تووی مەحمووی سەرەواڵە*

مامۆستا بێسارانیش بەم شێوەیە ئاماژە بە وشەی سەرەواڵە دەکات:

*شێوەی ئەو لەولاو ها بەو باڵاوە / بەو باڵای شیرین سەرەواڵاوە*

کاك ماجد ئیمام خەڵکی ئاوایی خەیدەرەی سەقز، دەڵێت: ئێمە ئەم ئیدیۆمە بەم شێوە بەکار دەهێنین: *"ئەڵێی دارەکەی مەحموو کەرەواڵەیە هیچی نەگرتووەتە خۆی"*. هەرچەند لەوانەیە مەحموو کەرەواڵە هەمان مەحموو سەرواڵە بێت. لە خەیدەرە کە بەم شێوە بەکار دەچێت گڵکۆی شەخسی مەحموو سەرواڵەی تێدا نییە. سەقزییەکانی تر دەڵێن: ئێمە لەم ئیدیۆمە بە سەرواڵە بیستوومانە و کەرەواڵە بەکار ناهێنین. ئەڵبەت لە برێك ئاوایی مەریوان، ڕێك هاوشێوەی ئەم پەندە دەڵێن: *ئێژی دارەکەی شێخ ئۆمەرە*. بەهەرحاڵ کەسایەتی مەحموود سەرواڵە وەك لە مەزارگە و گڵکۆکانی ناسراو بە مەحموود سەرواڵەدا دەبینرێت، کەسایەتیەکی ئایینی و ڕێبەرئاسا و خاوەن ئیمان بووە و خەڵکی ئاسایی بۆ نەزر و نیاز چوونەتە خزمەتی و دوایی سەردانی گۆڕەکەیان کردووە.

ئەوسا لە کوردەواری زۆر باو بوو کە خەڵك بۆ چابوونەوەی نەخۆشیەکانیان و بەدی هاتنی نیازی دڵیان سەردانی گۆڕ و گڵکۆی پیاوچاکانیان دەکرد و لە خوا دەپاڕانەوە. ئەو شوێنانە سەردانیان دەکرد ناوی جۆراجۆریان هەیە و ئێستەش هێشتا ناو و نیشانەیان ماوە، وەکوو: مەحموو سەرواڵە، مام سەرەواڵە، شێخەلا، شێخەسوور، شێخ ڕەش، سەوزەپۆش، کەوڵەزەرد، کەوسوار، حەوسوارە، تاڵەسوار، شاسوار، چاکەسوار، پیرشایی، پیرشالیار، پیرمرا، پیروپرچن، خەیرەزنە، سۆفێخنەزەر، قەرەوڵکەوە، باواکەڕە، پیرەهەژارە و تاد. زیارەتگای ئەم شەخسانە ئەوسا هەرکامیان بۆ مەبەستێك خەڵك نیازیان بردووەتە سەری (وەکی: بای سوور، منداڵبوون، بەختی کچان، ناوسکێشە، لێوەیی، باداری و تاد)، و لە دارنیشانی سەر ئەم گڵکۆیانە بەیداخی سەوز و سپییان بەستووە و دوایی بۆ متفەڕك هەڵیانگرتووە یا ئەوەیکە لە توێکڵ و میوە و گەڵا و چیلکەی دارنیشانی شەخسەکە خواردوویانە. جا ئەوەیکە زیاتر دەبیسترێت گوایە دارەکەی شەخسی مەحموود سەرواڵە جیاواز بووە و وەك شەخسەکانی دیکە نەبووە کە بەرێك بگرێت بۆ متفەڕك بیخۆن یا سێبەری بێت یا بە شێوەکانی دیکە.

مەلا عومەر مودەڕسی خەڵکی بانە تەمەن ٧٠ ساڵ، دەڵێت: *بۆیە دەڵێن کابرا وەك دارەکەی مەحموود سەرواڵەیە کە هیچ لە خۆی ناگرێ.* چونکا ئەوسا ئەو شەخس و پیرانە *وەسیەتیان کردووە کە پاش مردنیان کەس هیچ نەبەنە سەر گۆڕەکەیان و بەیداخ هەڵنەواسن و تەنیا لە خوا بپاڕێنەوە.* جا گوایە شەخسی مام سەرواڵە وابووە و وای وەسیەت کردووە. هەر چەند دوایی وەسیەتەکەی لە بیر چووەتەوە و هاوشێوەی شەخس و خزنەکانی دیکە ئەوانیش پەڕۆی ڕەنگاوڕەنگیان پێوە کراوە و بەر و میوەی متفەڕك کراوە.

ئەگەر سەرەنجێك بدەینە چیرۆك و ئەفسانەیەك وا هێشتا لە شەخس و خزنی ئاواییەکاندا ماوەتەوە، کە هەر شەخسێك وەك نەریتێکی ئاوایی و ناوچەکە وا بووە کە خەڵك شمەك، ئاژەڵ یا بابەتێکیان بۆ سەر ئەو مەزارگە بردووە و نەزریان کردووە تا نیازی دڵیان بەدی بێت. بۆ نموونە: شەخسی وابووە گیسکیان بۆ بردووە، یا کولێرە و مووچە نان، یا شتی دیکە. لای مەریوان دەگێڕنەوە کە کابرایەك ئەچێتە سەر شەخسێك و گیسکێك دەبات کە نیازی بگرێت. بە شەخسەکە ئێژێت: "*ها ئەوە گیسکێکم هاوردیە بۆت ملجەملجی نەگەرەك زوو مراو دڵم حاسڵ بێ. ئەینا ئەرۆم بۆ لای مەلا کە بە دانوولەیەك کرە ئەکا نووشتەم بۆ بکا*". ئەوساکە سەبارەت بە شەخسی مەحموود سەرواڵە لە ناوچەی خورماڵ سەردان کردن بەم شێوە بووە: *ڕۆژانی چوارشەمە خەڵك ئەچوونە سەر مەحموو سەرواڵەی گوڵپ بۆ بەراوردبوونی نیازی دڵیان. هاوکات ئەگەر کەسێکی گوڵپی نەخۆشی باداری و ڕۆماتیزمی بوایە ئەچووە سەر مەحموو سەرواڵەکەی بێرواسی.*

خاڵێکی دیکە سەبارەت بە مەحموود سەرواڵە کە مەلا عومەر مودەڕسی باسی دەکرد و هەندێ لێلی مەحموود سەرواڵەی ڕەواندەوە، ئەوە بوو کە گوایە: *سەرەتا مەحموود سەرواڵە کەسێکی پیاوچاك و ڕێبەر و پێشەنگ بووە و خاوەنی ڕێچکەیەکی تایبەتی بووە بۆخۆی. جا دواتر یا ئەو سەردەمە هەر کەس وەك ئەو هەڵسوکەوتی کردووە و خزمەتی خەڵکی کردووە بە مەحموود سەرواڵە ناسراوە.*

بە گشتی ئەو ئاوایی و شارۆچکانە شەخس و نەزرگە و نیشانەی مەحموود سەرواڵەیان تێدا هەیە:

١) دەرەویان شێخ، یۆرقوڵ و دەرەسمایلە، سەقز
٢) کەلاتێ و قوڵیان، سنە
٣) گڵیە و کانی سانان، مەریوان
٤) دووریسان، نەوسوو و نۆتشە، پاوە

۵) بێساران، ژاوەرۆی سنە
۶) بەرزنجە، قوماش و موانی مەلا تاهیر، شارەزوور
۷) گوڵپ و بێرواسی، خورماڵ
۸) واژە، چوارتا
۹) کۆخی ڕەشەپیرۆز، بانە
۱۰) باخە هەنارە، دەربەندیخان

لە ئاوایی بێرواس گومبەز و بارەگا لەسەر شەخسی مەحموو سەرواڵە درووست کراوە. لەسەر ڕێی سەردەشت بۆ مەهاباد لە ئاوایی بەلاو، دەشت و سەیرانگایەك هەیە کە بە دەشت مام سەرواڵە/ سەراوڵە دەناسرێت و لەو دەشتە شەخسی مام سەرواڵە هەیە و خەڵك سەردانی دەکەن. چەند ساڵ پێش شەوێك دوو کەس پاردە و خزنی مام سەرواڵە هەڵدەدەنەوە و هیچیشیان دەست ناکەوێت. گوایە ئەو دوو کەسە دوایی هێندە ترسی ئەو شەخسە دەچێتە دڵیانەوە نەخۆش دەکەون و کورد وتەنی: *ئەپەڕێتە سەریان.*

زیارەتی مەحموو سەرەواڵە لە باخە هەنارەی دەربەندیخان بە "مام مەحموو"یش دەناسرێت. مامۆستا هێمن مەلا کەریم خەڵکی بەرزنجە و مامۆستای زانکۆی سلێمانیەیە و لەسەر مێژووی بەرزنجە و بنەڕەتی یارسانەکان لە شارەزوور توێژینەوەی کردووە و دەیان دەستنووسی ئیسلامی و یارسانی کۆ کردووەتەوە و خەریکی نووسینی ئەفسانەکانی بەرزنجەیە، سەبارەت بە گڵکۆی مەحموود سەرەواڵەی بەرزنجە دەڵێت: بۆ مەحموود سەرەواڵە زۆرترین گومان ئەوەیە کە یەکێك لە پیر و ڕێبەرانی یارسان بووە و لە کتێبی بەردەستمدا چیرۆکی مەحموود سەرواڵە باس دەکەم. چونکە بەشێکی زۆر لە پیرانی یارسان کە بە بنەڕەت دەگەڕێنەوە بۆ بەرزنجە وەکوو سوڵتان سهاك و پیر عیسا و پیر داوودی کەوسوار.

**ڕیشەی سەرواڵە دەکرێت بەم شێوە لێکی بدەینەوە:**

سەر+واڵە: لە کوردیدا واڵە واتا شێواو و تێکچوو، یا ڕووت و کراوە، یا بە واتای هاورێشم و خوشك (وشەیەکی هەورامی)یش دێت. کەواتە دەکرێت سەرواڵە واتای سەربەتاڵ یا هەمان سەری بێ جامانە و ڕەشتی مانا بکرێتەوە. دەکرێت بەپێی ئەم لێکدانەوە مەحمووی ناوبراو کەسێکی بێ جامانە بووبێت یا [؟]. ئەڵبەت لە شێوەزاری هەورامیدا سەرەواڵە بە سەرەوالا و سەرێوالا دەخوێنرێتەوە.

سپاس بۆ بەڕێزانی خوارەوە کە بۆ نووسینی ئەم وتارە هاوکارییان کردم:

- ئەحمەد مصنف چۆڕی، ئاوایی کانیسپیکە، مەریوان
- فارۆق و ئێسحاق موحەممەدی، ئاوایی سەرواڵە، دێولان
- مەهدی سەنەندەجی و عەبدوڵا حەبیبی، شارۆچکەی نۆتشە
- موحەممەد ڕەشید ئەمینی، پاوە
- ناسێح ڕەحمانی، ئاوایی کەڵاتێ، سنە
- موحەممەد (سەلام) موڕادی، ئاوایی باقلاوا، سنە
- عارف تەبەد، ئاوایی گڵیە، مەریوان
- ماجد ئیمام، ئاوایی خەریدەر، سەقز
- جەلال وەحیدپوور، شارۆچکەی ڕەبەت، سەردەشت
- هێمن مەلا کەریم بەرزنجی، مهندس شێخ سەلام و هێمن حەسەن ڕۆستەم، نـاجێح گوڵپی، سلێمانی
- ڕەئووف گولبادان و مادێح پیریۆنسی، سەقز
- مامۆستا عومەر مودەڕسی، بانە
- سیامەك بەهرامی، ڕوانسەر
- کوورش ئەحمەدی، سنە

## کەنگرۆکی بادینان بەرهەمێکی خۆراکی و دەرمانی

لای هەموو کوردێك گیای کەنگر ناسراوە. بەتایبەت ئەوانەی خەڵکی لادێن بەچاکی ئەم گیایە دەناسنەوە. بۆخۆم ئەوەی لە کەشی ئاوایی باقلاوای ناوچەی کەلاتەرزان سەبارەت بە کەنگر دیتوومە و بیستوومە، چەندین بابەتی جۆراجۆرە. سەرەتای بەهار لە کوردەواری پاش ئەوەی گوڵاڵە نەورۆزی شین بێت یەکەم بەرهەم و گیایەك گوندنشینان پێشوازی دەکەن "چووزەکەنگرە". بەری خۆرەتاو کە زوو بەفری دەتوێتەوە، بەتایبەت شوێنە خیزەڵان و چەکەرێزییەکان شوێنێکی لەبارە کە پێش هەموو شوێنێك چووزەی کەنگر لەوێ چەکەرە دەکات. چووزەی کەنگر لە شوێنی کەنگری پار و لە بن پووشی قەڵۆشکە وشکەدا شین دەبێت. کەواتە نۆبەرەی ساڵی نوێ لە لادێ چێشتی چووزە کەنگرە. ئەڵبەت ئەوەمان لە بیر بێت کە ئەورۆکە بەداخەوە بەهۆی خراپ هەڵکەندن و زۆر بەکارهێنانەوە خەریکە کەنگر و زۆرێك لە گیابرژیوە و خۆرسکەکانی کوردەواری بنەبڕ دەبن.

وەرزی کۆکردنەوەی بنکی کەنگر لە کوردەواری دەکەوێتە ناو مانگی نەورۆز و سەرەتای گوڵانی هەموو ساڵێك. پاش ئەم وەرزۆکە ئەو کەنگرانەی نەکەندراون و ماونەتەوە، گەشە دەکەن و گوڵ دەردێنن. واتا دەکەوێتە ناو مانگی جۆزەردان و کەشی کۆکەن و گیادروون. ئاژەڵداران بەتایبەت ئەوانەی بزنیان هەیە ڕوو لە گیاجاڕ و کوێستانەکان دەکەن و کەنگردڕك (قنگەدڕك) بە پاچ دەبڕن و مەڵۆی دەکەن تا وشك بێتەوە. ئەگەرچی هەموو قۆناغەکانی مەڵۆ کردن، پێچان و کێشە کردن، گێرە و کێشان و هەتا تێکردن و پێدانی زۆر سەختە و هەمیشە بۆ دەست و پێ مەترسی چەقڵی هەیە، بەڵام تفاقێکی لەبارە بۆ بزن و گوێدرێژ. کەنگر کە پیر بوو، واتا گوڵی دەرکرد تەنیا گوێدرێژ دەتوانێت توخنی بکەوێت و بیخوات. ئەم ئاژەڵە زۆر حەزی لە خواردنی گوڵەکەیە. لە کوردەواری باوە کە "گوێدرێژ کە گوڵ و تووی کەنگر دەخوات ئارەزووی جنسی زیاد دەکات و زڕناقی[1] دەبێت". بەگشتی گوێدرێژ حەزی زۆر لە خواردنی جۆ، کەما و کەنگر هەیە. هەر بۆیە ئەم خۆراکانە

---

١. زڕناقی دۆخێکە لە ئاژەڵی نێرەکەردا کە ئەگەر لە ماکەرێك بپەڕێت ئەوە تووشی جموجووڵێکی زۆر دەبێت و ئارەزووی جنسی پێ ڕاناگیرێت. خەڵك باس لەوە دەکەن کە گوێدرێژ بێ ئەوەی بپەڕێت، گوڵ و تووی کەنگر زۆر بخوات زڕناقی دەبێت.

کەوتوونەتە ناو پەندی پێشینیان و بۆ مەبەستی خۆیان بەکار هاتوون:

*کەر بێت و توورەکەی کاوجۆی پێ بدەیت.[هەموو بارێکت بۆ ئەکێشێت].*

*جۆی خواردیە و سەرِی هاتیە.[گوێدرێژ جۆی زۆر بخوات، سەرکەش دەبێت.]*

*خوا داینیا/ دایناوە کەر و کەما.[خواردنی کەما بۆ کەر سازگارە.]*

*کەرەکە مەمرە بەهارە چووزە کەما / کەنگر دیارە.*

*قنگەدرِك بۆ دیان کەر دروست کریا.*

لە هەندێ شـوێنی کـوردەواری ئەو جەوی و شـیلەیە لە لاسـکی کەنگـری خۆرەتـاودا دەردێت و بە "کەنگرزا" دەناسرێت، کۆ دەکرێتەوە و بۆ مەبەستی دەرمان و خواردن بەکاری دەهێنن. جەویەکـی تونـد و مەیلەوڕەشـە. کەنگـرزا لە قۆنـاغی گـوڵ کـردن تـا سـەرەتای قەلۆشکەیی دەردێـت. [لە بـاکووری کوردسـتان ئەو جەوی و شـیلەیەك لە لاسـکی کەنگـر دەردێت بنێشتی کەنگری لێ سـاز دەکەن.[١]] پـاش ئەوەی کەنگـر گـوڵی کـرد و تووەکـانی وشك بوونەوە، ئیتر قۆناغی ئەوەیە کە لاسـك و گـوڵی کەنگـر خـۆی بە زەویەوە ناگرێـت و دەبێـتە گەمەی بـا و بـۆران. کەنگـر لەم قۆنـاغە بە "قەلۆشـکە، قەنگلاشـك و قنگلاشـك" دەناسرێت. کاتێ بە دەم با و بـۆرانەوە دەرِوات تـووە وشـکەکانی هەڵـدەوەرن. بەم شـێوەیە تووی کەنگر بڵاو دەبێتەوە و بۆ چەکەرەی ساڵەکانی دیکە ئامـادە دەبێـت. لە کوێسـتانەکان قەلۆشکە زۆرتر لە ناوەدۆڵ و کووسکەدۆڵەکان لەسەریەك کەڵەکە دەبێـت و جـاری وایە بـا هێندە لەسەر یەك دەیخشکێنێت کە تووەکانی هەڵدەورێت و دەبێتە خـۆراکێکی ئامـادە بـۆ ئاژەڵ و مێرووەکان. پەندێك لە کوردیدا ساز بووە بۆ قەلۆشـکە کە مەبەسـتی لەو کەسـانەیە کە جێگە و مەزڵێکی هەمیشەییان نییە و هەمیشە ئاوارەن: *لە قنگلاشکیان پرسی لە کوێـوە هاتووی؟ وتی: لە رەشەبا بپرسن.* مامۆسـتا هەژار لە پێشـەکی کتێبـی "چێشـتی مجێـور"دا باس لەوە دەکات کە سەرەتا ویستم کتێبەکەم ناو بنێم "قەلۆشکە". چونکا وەك خۆی باسـی دەکات ژیانێکی پرِ لە ئاوارەیی و هەڵوەدایی و دوور لە زێدی بووە.

بۆخۆم ئەوکـاتەی لە دێ بەرغەلەوان بـووم کۆتـایی بەهـار پـاش خوێنـدن، ئێـوارانە بە پرێسکەی کارگ، پیشۆك، کنیواڵ، سوورەبنە، چەپکە هەزبی و گیاکـام دەهـاتمەوە. هەزبـی ناومێرگ گیایەکی تایبەتیە بۆ تامی دانـوولە و دۆڵـمە. هەروەهـا گیاکـام لەگەڵ هـێلکە بـۆ

---

١. عەلیزادە مورتەزا و موحەمەدی چیانە سیامەك، وتاری (کنگر وحشی)، کونگرەی "ملی علوم و فناوریهای نوین کشاورزی"، زانکۆی زەنجان، ١٩ تا ٢١ خەرمانانی ١٣٩٠

پەرۆبەستەی شکیان و لەجێ‌چوون بەکار دەچێت. دواتر کە دەبووە هاوین توێشەی بەرغەلەوانی دەگۆڕا و شتی دیکەمان کۆ دەکردەوە، وەکوو: جەوی گەون، بادامی تەنگس، گوڵی هەزبی کێویلە، گوڵی پوونگە و تووی کەنگر. قەلۆشکە یەکێك لەو ڕووەکانەیە شوان و شاخەوان لە کوێستانەکان ئەگەر تاوێك وچان دەگرێت بە دارکێك هەڵیدەوەرێنێ و تووکە تووك ئەیخوات. خەڵك تووی قەلۆشکە دەخۆن، چونکا باوڕیان وایە کە ناوکێکی وزەبەخش و سوودمەندی هەیە.

**تێبینی**: تووی قەلۆشکەی کوردەواری دوو جۆری هەیە. یەکەم: ئەگەر تووەکە مەیلەوسپی بێت ئەوە توویەکی پووچەڵ و کرمۆڵە و بۆ خواردن ناشێ. دووهەم: ئەگەر تووەکە مەیلەوڕەش بێت ئەوە توویەکی کاکڵەدار و پڕە و بۆ خواردن و کۆکردنەوە دەبێت. [جا ئامانجی ئێمە لەم کورتە وتارە، تووی مەیلەوڕەش و کاکڵەدارە.]

## گیای کەنگر

کەنگر لە شێوەزارەکانی کوردیدا بە "قینگەر، قنگەر، قنگر، کەنگر، کنگر، کەلەنگ و کەنگرۆك"، بە فارسی "کنگر" و بە عەرەبی "عکوب" دەناسرێت. ناوی زانستی کەنگر (*Gundelia tournefortii* L.) و سەر بە بنەماڵەی (Asteraceae)یە. گیایەکە لە وەرزی بەهاردا شین دەبێت و ئەگەر تووەکەی بچێنرێت ساڵی دووهەم یا سێهەم گوڵ دەکات.[١] کوێستانەکانی کوردەواری شوێنێکی لەبارە بۆ شینبوونی ئەم گیا خۆڕسکە. ئەگەر بەشێوەیەکی شارەزایانە و دڵسۆزانە کۆ بکرێتەوە و باری کەم و زۆری گیاکە لە کوێستان لەبەرچاو بگیردرێت، کەنگر دەتوانێت وەك بەرهەمێکی پڕ داهاتی کوردەواری ئەژمار بکرێت.

### سوودەکانی کەنگر:

- سەرچاوەیەکی دەوڵەمەندی ڤیتامینی A، B و C، و مەوادی کانزایی سوودبەخشە. بەکارهێنانی مرخ و حەزی خواردن و باری جنسی زۆر دەکات.[٢]
- سروشتێکی گەرم و وشکی هەیە. هەر بۆیە لە کۆنەوە ئەو پەندە داهاتووە کە "کەنگر و ماست بە وەعدەی خۆی". کەواتە باری گەرمی و وشکی کەنگر بە ساردی و تەڕی ماست

---

١. مصطفی گهرنژاد، وتاری: بررسی امکان کشت و اهلی سازی کنگر وحشی *Gundelia tournefortii* L.، پایان‌نامەی فوق لیسانس، زانکۆی کشاوەرزی مەشهەد، ١٣٨٢

٢. ماڵپەڕی فارسی "گۆڤاری زانستی سلامەتی و تەندروستی پاکیمان" (*www.narspakiman.com*)، بابەتی: کەنگر کە لە کتێبی "زبان خوراکی‌ها: غیاث الدین جزایری" پەخشانگای ئەمیرکەبیر، تاران، ١٣٥٢ وەرگرتووە.

دەبێتە خۆراکێکی سازگار.

• ئامۆژگاری حەکیمان و دەرمانگەرانی کوردەوارییە کە کەنگر بە کاڵی یا کوڵیوی بخۆن تا گورچیلەتان باشتر کار بکات. هەروەها کەنگر گیایەکی میزهێنەرە.

بەگشتی لە کوردەواری کەنگر بە چەند شێوە بەکار دەهێنرێت:

• **بنکی کەنگر** (قۆناغی جوانی): خواردن بە کاڵی، زەڵاتە و چێشت (کوڵاندن، شۆرباو، کەنگرکەباب، کەنگر و ماست، کووکوو، خوەرشت و ترشیات)

• **تووی کەنگر** (تووی کەنگردڕك، کەنگرۆك، سسی، سیسی و داندەرۆك): دەیبرژێنن و وەك ئاجیل و چەرەسات دەیتووکێنن و دەیخۆن، هەروەها بۆ چارەسەری بێهێزی جەستە و بەتایبەت باری لاوازی جنسی بەکار دەهێنرێت.

• **کەنگرزا**: هەمان جەوی کەنگرە. بنێشتی کەنگری لێ ساز دەکرێت و هەروەها بۆ چارەسەریی لە داودەرمانی کوردەواریدا بەکار دەچێ.[1]

• **تفاقی ئاژەڵ**: پێش وشکبوونەوە و لە قۆناغی گوڵ کردندا دەیدروون بۆ ئالیك و تفاقی ئاژەڵ.

• **پەڵخ و پردووی سەربان**: ئەوسا کاتێ سرمیچی خانوویان دەگرت، هەندێ جار کە قامیش و لەوان و پرژی داریان دەست نەدەکەوت قەلۆشکەی کەنگریان پان دەکردەوە و لەسەر دارەڕایماڵیان دەخست و ئینجا گڵیان بە سەریدا دەکرد.

## بەرهەمی کەنگرۆک[2]

تا وەکوو ئێستا تەنیا ناوچەی بادینان لە باشووری کوردستان تووی کەنگر کۆ دەکەنەوە و وەك بەرهەمێکی سروشتی بەکاری دەهێنن و دەیفرۆشن. ساڵانە خەڵکی بادینان وەك نەریت و پیشەی پێشینانیان ڕوو لە داوێنی چیاکانی بارزان و ئاکرێ دەکەن و تووی کەنگرۆك کۆ دەکەنەوە. بەگشتی لە دووکانی چەرەساتی بازاڕەکانی باشووری کوردستان تووی کەنگر بە ناوی "کەنگرۆك، داندەرۆك، سسی و سیسی" دەفرۆشرێت. بەشێکی گرینگە لە ئاجیل و نرخێکی هاوشێوەی پستە و فەندەقی هەیە. ساڵەکانی ۲۰۱۷ و ۲۰۱۸ کیلۆیەك کەنگرۆکی چاك تا ۲۵

---

۱. ماڵپەڕەی گیاناسی کوردفلۆرا (www.kurdflora.com) بابەتی: کەنگر (ئەم ماڵپەڕە بەڕێز کاك حامید دروودری خەڵکی چرۆسانەی کامیەرانە و لە ستۆکهۆڵم دایناوە).

۲. بەرنامەی "کۆکردنەوەی کەنگرۆك لە ناوچە شاخاویەکانی بارزان" کەناڵی ڕووداو، ڕێکەوتی: ٦ ئابی ۲۰۱۷، هەروەها بەرنامەی "وەرزی کۆکردنەوەی کەنگرۆك لە دەڤەرا نەهلەی ئاکرێ" کەناڵی کوردستان ۲٤، ڕێکەوتی: ۲ تەمووزی ۲۰۱۸

هەزار دینار فرۆشراوە. خەڵکی لادێ لە سەرەتای وەرزی هاوین پێش ئەوەی قەلۆشـکە لە زەوی هەڵکەنرێت و ببێـتە فرفـرەی بـای کوێسـتان، ڕوو دەکەنە چیـا و وەك خۆیـان دەڵـێن: کەنگـر دەکوتن و کەنگرۆك کۆ دەکەنەوە. ئینجا پووش و خاشـاکەکەی لا دەبەن و لە بـازاڕ دەیفرۆشـن. کارگەی برژاندنی ئاجیل پاش خاوێن کردنەوە و بێـژتن کەنگـرۆکە دەبرژێنێـت و دەیخـاتە پـاڵ ئاجیلەکانی دیکەوە.

کەرەستەی کۆکردنەوەی کەنگرۆك لە بادینان ئەمانەیە:

● **دارک**: دارێکی درێژە بەئەندازەی گۆچانێك، سەری کوتانەکەی دوولفقانە وەك دەسـکی قەڵماسك (قایشکێش)

● **ڕەندۆ**: شێوەی لە بازنەی گۆڵی بەسکتباڵ دەچێت کە دەسکێ درێژی هەیە. [ئەڵـبەت دیارە کە ئەمە کەرەستەی کۆنە. ئێستاکە بـووەتە دۆڵـچەیەك کە جنسـەکەی تەلە و کـون-کونە.]

لاسك و گوڵی کەنگرەکە بە دارکەکە دەخرێتە ناو ڕەندۆ و دۆڵچەکەوە، ئینجا چەند جـار دەکوترێت تا تووەکەی هەڵبوەرێت. کەسێك لە سپێدەی بەیانیەوە تا ئێوارە کەنگـر بکوتێـت، دەتوانێت ٥ تـا ١٠ کیلـۆ کـۆ بکـاتەوە. کە ئەمە بۆخـۆی داهـاتێکی چـاکە و دەکرێـت وەك بەشێکی بەرچاوی بەرەچەی بنەماڵە ئەژمار بکرێت.

## چاندنی کەنگر لە کوردستان

کاك ئازاد دێبەگەیی بەرنامەسـاز و ئەنـدازیاری کشـتوکاڵ لە کەنـاڵی کوردسـان تـیڤـی و زاگرۆس لەمێژە بەرنامەی کشـتوکاڵی ئەم دوو کانـاڵە ڕێـك دەخـات، ڕێکەوتـی ٢٠١٨/٠٦/٠٧ چووەتە ئاوایی هەنارە لە قەزای ئاکرێ. جوتیارێك بە ناوی کاك حـافیز سـدیق لەپـاڵ کـاری باخ و بێستانەکەی، ماوەی سێ سـاڵە قەدپـاڵی چیـای سـەرێ باڤیـای چانـدووە بە تـووی کەنگر. ئەوەی لەم بەرنامەیە بەرچاو کەوت ئەوە بوو کە جوتیارەکە وەك باخ و بێسـتانەکەی ئاگەداری گیاجاڕی کەنگرەکەی کـردووە و نەیهێشـتووە مەڕ و مـاڵات بیخـوات. سـەرەتای هاوین دەستی بە تەکاندنی کەنگرە وشکەکان دەکـات و بەرهەمێکـی چـاك کـۆ دەکـاتەوە. ئەزموونی ئەم جوتیارە نیشانی ئەدات کە کوردستان بەتـایبەت داوێنـی چیاکـان شـوێنێکی لەبارە بۆ ئەم بەرهەمە گرانبایە. کاك حافیز کاتێ بەرهەمەکەی کـۆ کـردەوە و شـەنوکەوی کرد، بردییە بازاڕی ئاکرێ. کڕیارەکە باسی جۆری کەنگرۆکی چیاکانی سەرێ باڤیـا، پیـرس و دۆڵی هۆرێ بارزان دەکرد کە کەنگرۆکی نموونەی ناوچەی بادینانە. گوایە کەنگـرۆك وەك بەرهەمێکی کوردستان هەناردەی بازاڕەکانی دەرەوەی دەکرێت.

## کێشی کەنگرۆک

کەنگر گیایەکە هەتا شوێنەکەی نەخت، نەرمان و نسار بێت چووزەکەی زیاتر ئەڕواتە خوارەوە و کەنگرێکی باش و لەبارتر ئەژمێردرێت و ئاودار و خۆشترە و کەمترە ڕەگی تاڵی تێ ئەکەوێت. هەروەها کەنگرێك لەم شوێنانە شین دەبێت گوڵ و کەنگرۆکیشی پەسەندتر و پڕترە. یەك بنکی کەنگر ١ یا ٢ لاسکی گوڵدار دەرئەکات.

کۆتایی مانگی پووشپەڕ لە داوێنی کێوی شێخاڵی ئاوایی باقلاوای ناوچەی کەلاتەرزانی سنە چەندین قەلۆشکەم کۆ کردەوە. مامناوەند هەر قەلۆشکە ٤ گوڵ و هەر گوڵ خاوەنی ١٥ کەنگرۆك و کێشی هەر ٣ کەنگرۆك یەك گرەم بوو. واتا بۆ کۆکردنەوەی یەك کیلۆ کەنگرۆگ پێویستە گوڵی ٥٠ بنکی کەنگر (قەلۆشکە) بکوترێت تا ٣٠٠٠ کەنگرۆك بە دەست بێت.

**وێنە ١: کۆکردنەوەی قەلۆشکەی کەنگر**



**وێنە ٢: جیاکردنەوەی کەنگرۆکی یەک قەڵۆشکە (بنکی کەنگر)**



# دۆینه چارەسەری ئالامەت و سەرمای زستان

پێکهاتەی خۆراك و چێشتەکانی کوردەواری جیا لە باری خواردن، حیکمەتی دەرمان و چارەسەریشی تێدایە. دەیان نموونەی وا هەیە کە ئەمە دەسەلمێنێت: یەکاوەی برێنج کە پیازی قاشکراوی تێدەکەن، دۆ و ماستاو کە شویت و قەزوانی تێدەکەن، پەنیر کە بە گوێزەوە دەیخۆن، کەنگر کە تێکەڵی ماستی دەکەن، کەلانە کە بە دۆشاو یا شەکرەوە دەیخۆن، کولێرە کە ڕەشکە یا کونجی پێدا دەکەن، گۆشتاو و دانوولە کە پوونگە یا هەزبی تێدەکەن، سەنگەسیر کە سیر و برێنجی تێ دەکەن، مەزرۆکاو کە هێلکە و ترشی تێ دەکەن، شەلەمین کە چۆنەر و گوێزی تێ دەکەن، بەرمەسێڵ کە پیاز و کەشکی تێ دەکەن، و دەیان چێشت و زاوی تر کە هەرکام پێکهاتەیەکی جیاوازە و حکمەتێکی تێدایە. ئەم حیکمەتی پێکەوەبوونی ئەو خۆراکانە لە چێشتەکان زیاتر چارەسەری زیانی لاوەکی پێکهاتەیەك لە پەسای چێشتەکەیە یا باسی هاوسان کردنی باری سروشتی ساردی یا گەرمی خۆراکەکەیە.

یەکێك لەو چێشتانە کە ئەوسا لە کوردەواری خوانێکی گرینگی زستان و تاوسان بووە، دۆینەیە. ئەم چێشتە بە "دۆینە، دوینە، ترخێنە[1] و داندۆك" دەناسرێت.

شێوازی دروست کردنی دۆینە، دوو جۆرە:

• **دۆینەی کوردی:** دیارە کە لێرە مەبەست لە کورد، تیرەی کوردانی ئاژەڵدار و کۆچەر و ڕەوەندی کۆنە. سەردەمانی زوو ئەو هۆز و تیرە و تایفانەی زیاتر کۆچەر و ئاژەڵدار بوون بە کورد دەناسران. خەڵکی تر کە وەرزێر و باخەوان یا ڕەعیەتی دیواخان و شاری بوون بە گۆران ناوبانگیان بووە. ئەڵبەت ئەم دەستەواژەیە ئێستاکەش لە ناوچەکانی ئەردەڵان و

---

١. لە ناوچەی موکریان چێشتی دۆینە کەمتر بەرچاو دەکەوێت و زۆر باو نییە. جا ئەوان بە چێشتی شەلەمین، ترخێنەیەش دەڵێن.

کرماشان دەبیسرێت. زیاتر خەڵکی ناوچەکانی کەلهور زمان بەتایبەت پەیرەوانی ئایینی یارسان خۆیان بە گۆران دەزانن و خەڵکی تر بە کورد.

جا دۆینەی کوردی بەم جۆرە دروست دەکرێت: سەرەتای بەهار کە شیر مشەمەرە و مەشکە و ملان زۆرە، کابانی ماڵ دۆ دائەخات. واتا دەست بە خەست کردنەوەی دۆ دەکات. ڕۆژانە کە مەشکە ئەژەنێت دۆی بەشی خواردن هەڵدەگرێت و ئەویتر دەکوڵێنێت دەیکاتە سیراج و کەشك یا نایکوڵێنێت و لە هومبەیەکی دەکات و بەرەبەرە کە دەنیشێت تیژاو و سزگەکەی دەگرێت و دەیرژێنێت. هێندە سزگەکەی دەگرێت و دیسان دۆی پێ زیاد دەکات و ئاوەکەی دەگرێت کە تەنیا دەمێنێتەوە دۆیەکی خەست وەك ماست. ئینجا هەندێ خوێ دەکات بەجۆرێك کە تامی بەرەو سوێری بچێت. لەلایەکی دیکەوە گەنم دەکوڵێنن واتا پەتڵە دەکەن و وشکی دەکەنەوە. ئینجا دەستاڕی دەکەن و دەیکەنە کاڵەبرویش. لەو کاڵەبرویشە دەکەنە ناو دۆ خەستەکە و سەری دەنێنەوە هەتا جوان پێکەوە نەرم و تێکەڵ دەبن. هەندێ جار هێندە دەمێنێتەوە کە وەك پەسایەکی گەنیوی لێ دێت. ئینجا لەسەر بان شوێنێك کە دوور بێت لە تەپ و تۆز و هاتوچۆی مرۆڤ و ئاژەڵەکان، لەوێ لاسك و گەڵای پوونگە ڕائەخرێت و سەلك سەلك دۆینەکە ئەخرێتە سەر پوونگەکە تا وشك بێتەوە. زستانان بەتایبەت ئەو ڕۆژانەی هەوا زۆر ساردە و بەفر دەبارێت چێشتی دۆینە زۆرتر لێ دەنرێت. بەیانی زوو کابانی ماڵ چەند سەلك دۆینە ئەخاتە ناو ئاو تا بتوێتەوە ئینجا دەیکوڵێنێت و دواتر پیاز و پوونگە و ڕۆنی بۆ سوور دەکات و دەیخۆن. خواردنێکی زۆر چاکە بۆ پێشگرتن بە سەرما و هەروەها چارەسەری ئالامەت و پەتای سەرما.

**گونێنە**: پاش ئەوەی کە چەند ڕۆژ برویش و دۆ خەستەکە پێکەوە تێکەڵ بوون، ئینجا کەمێك دەیکوڵێنن. ئەم قۆناغە بە گونێنە دەناسرێت. کابانی ماڵ ئەو ڕۆژە کە دۆینە دائەخات (ئەینێتەوە) چێشتی گونێنە و ڕۆن بە ئەندامانی ماڵەوە ئەدات. بەساڵاچووەکان باس لەوە دەکەن کە ئەوسا چێشتی خزمەتی و میوانداری لە کرێکار و میوانان، گونێنە بووە و ئەوانەی کە دەسەڵاتیان بووە گونێنە بە کرێکار بدەن، خاوەنکارێکی باش ئەژمێردراون.

• **دۆینەی گۆران**: لە ناوچەکانی کرماشان، کامیەران، ڕوانسەر و جوانرۆ زیاتر ئەم دەستەواژەیە دەبیسترێت. ئەم جۆرە دۆینەیە تایبەتی قەڵخانی و یارسانەکانە. ئەم جۆرە دۆینەیە هاوشێوەی دۆینەی کوردییە بەو جیاوازییە کە پاش ئەوەی کە دۆ و برویشەکە

تێکەڵ کرا، دۆینەکە ئەکەنە چاڵێك تا چەند ڕۆژ هەندێ لە ئاوەکەی بچنرێت و تامی دیکە بگرێت. گوایە لە شوێنێکی خۆش و خاوێن چاڵێك هەڵدەکەنرێت و سواخی دەدەن و بە پووشی پوونگە یا کولەشی گەنم دیواری چاڵەکە دەکوتنەوە. ئینجا دۆینەکەی تێ دەکەن. پاش چەند ڕۆژ بە هەمان شێوەی دۆینەی کوردی سەلك سەلك دەینێنەوە.

**تێبینی:** کتێبی (خواردەمەنی کوردەواری)[1] کە تایبەتە بە خۆراکەکانی کوردەواری لە ناوچەی هەولێر، ڕواندز و سۆران، جۆرێکی دیکە باسی دۆینە دەکات. لە لاپەڕەی ١٠ باسی داندۆك دەکات. شێوازی گرتنەوە و دروستکردنی داندۆك هەمان شێوەی سازکردنی دۆینەیە. لە داندۆك لەبری برویشی کاڵ، ساوەری[2] تێ دەکرێت. برویشی کاڵ هەمان پەتڵە گەنمە کە دەیکوڵێنن و ئینجا دەستاڕی دەکەن و لە دۆ خەستەکەی دەکەن، بەڵام ساوەر گەنمەکە دەکوڵێنن یا تەڕی دەکەن و ئینجا لە تەلیسێکی بەنی دەکەن و دەست بە کوتانی دەکەن تا توێکڵەکەی لێ دەبێتەوە و دەمێنێتەوە گەنمە ڕووتەکە. لە چێشتی داندۆك جیا لە سەلکی داندۆك سڵقی کوتراو، نانەڕەق و تەنانەت گۆشتی قاورمەی پێ زیاد دەکرێت. لە لاپەڕە ١٢ باسی چێشتی دۆینەی کردووە بەم شێوە: بۆ خێزانێکی کەم دوو پەرداخ گەنمە کوتاو، کیلۆ نیوێك ماست، چارەکێك پوونگە، دوو کەوچك ڕۆن و خوێ بە ئارەزووی خۆت. گەنمەکە شلك شلك بکوڵێت و ماستەکە بکە ماستاوێکی خەست. پوونگەکە دەیشۆریتەوە و وردی دەکەی. پاشان دەیکەتە ناو ماستاوەکە، خوێ و ڕۆنەکەی تێ دەکەی و لەسەر ئاگر دەیکوڵێنی و تێکی دەدەی هەتا بڵق دەدا. گەنمە کولاوەکەی تێدەکەی و تێکی دەدەی هەتا لەگەڵ یەك باش دەکوڵێ و گەنمەکە دەتلێتەوە. ئینجا دایدەگری و دەیخۆیت.

---

١. خواردەمەنی کوردەواری، ئاواز ئەحمەد حەمەد ئەمین دزەیی، چاپی یەکەم، وزارەتی ڕۆشنبیری، ١٩٩٨

٢. نەریتی ساوەر کردن لە کوردستان تایبەتە بە ناوچەکانی موکریان، هەولێر، سۆران و بادینان. وەرزی ساوەرکوتان دەکەوێتە کۆتایی خەرمانان. شەوانە دەنگی دنگ و چاڵ و تەلیسی ساوەرکوتان هەموو دێ دەگرێتەوە. ژنان بەرۆژا و پیاوان بە شەوا کاری ساوەرکوتان دەکەن. ساوەر بەتەنیا وەك چێشتی پلاو یا لەگەڵ تەماتە دەخورێت.

# پەنیری تاڵمە بەرهەمێکی شیرەمەنی ڕۆژاوای کوردستان

لە کوردەواریدا ئەم بەرهەمە بە "پەنیر و پەنێر" دەناسرێت. پەنیر لە دەڵەمەبوونی شیر بە دەست دێت. بە زمانی زانستیەکەی کاتێك بەکتریاکان لە ناو شیرەکە گەشە دەکەن و شیرەکە ئەترشێت و ئەپرووسقێت و لێك جیا ئەبێتەوە، پەنیر بەرهەم دێت. دەگێڕنەوە کە مرۆڤ بەم شێوە لەگەڵ بەرهەمی پەنیر ئاشنا بووە: سەردەمانی هەرەکۆن شوانەکان بۆ هەڵگرتنی شیر کەڵکیان وەرگرتووە لە پێستی بزنەکان واتا پێستە و کوندە. ئەنزیمی ناو پێستە وشككراوەکە لەگەڵ گەرمای هەتاو کاریگەری داناوە لەسەر شیرەکە و بووەتە دەڵەمە.

ئاژەڵدارانی کورد هەر لەکۆنەوە چەندین بەرهەمیان لە شیری ئاژەڵەکانیان ساز کردووە و بەکاریان هێناوە. ژەك یەکەم بەرهەمی گوانی ئاژەڵ بەتایبەت مانگایە. کە کابانی ماڵ ژەکی مانگا ئەدۆشێت و ئەیکوڵێنێت و فرۆ یا کەرەی لێ دروست ئەکات. دووهەم بەرهەم بە شیر دەناسرێت. شیر بۆخۆی چەندین بەرهەمی دیکە وەکوو ماست، پەنیر، دەڵەمە، لۆرك، دۆ، ماستاو، خەستە، کەشك، تێزاو، شیرێژ (سیراج)، سۆڵەکە، کەرە، ڕۆن، دۆینە، گونێنە، و تاد لێ دروست دەکرێت. ئەوسا لای خەڵکی کورد بەرهەمی پەنیر بە دوو جۆر دروست کراوە. کوردانی کەلهوڕ، لەك، هەورامی، گۆران، گەرمیانی، لەیلاخی و ئەردەڵانی پەنیری دەڵەمەیان بەکار هێناوە، بەڵام کوردەکانی موکریان، گەڕووس، بادینان، سۆران و کرمانجەکان جیا لە پەنیری دەڵەمە، پەنیری کووپە و وشکیان دروست کردووە و تا ئێستەش وەك بەرهەمێکی باو و ناسراو بەرچاو دەکەوێت.

**پەنیری کووپە**: بە پەنیری وشك، کوردی و خۆماڵی دەناسرێت. پاش ئەوەی پەنیری دەڵەمە ساز کرا، پەنیرەکە دەکرێتە ناو توورەکە یا دۆدانەیەك لە جنسی متقاڵ و کۆتاڵ. تا ئاوەکەی بگوشرێت. ئینجا سەنگ و بەردی دەخەن تا تەواو ئاوی نەمێنێت. سوێر دەکرێت

و ئینجا لە هەنبانە یا کووپەی دەکەن. ئەوەی لە هەنبانە دەکرێت لە ژێرخانی ماڵان یا ئەشکەوتی سارد هەڵیدەگرن تا زستان. ئەوەی ناو کووپە لە شوێنێکی فێنك لە بن عەزری دەخەن و زستان دەریدەهێنن و ڕەندەی دەکەن و دەیخۆن. لە گوندی نستان سەر جادەی سەردەشت بۆ مەهاباد ئەشکەوتێك هەیە بە کونەپێست دەناسرێت. ئەشکەوتێکی شێدار و فێنکە. هەر لەکۆنەوە خەڵکی ئەم ناوچەیە بەهار و هاوینان پەنیرەکانیان لەو کونەپێستە ئەنبار کردووە و چاوەدێرییان کردووە تا زستان. کونەپێست ئێستا لەلایەن شارەداری ڕەبەت بەکرێ گیراوە و خەڵك پەنیرەکانیان لەوێ بەدڵنیاییەوە تا زستان هەڵدەگرن.

**پەنیری دەڵەمە**: پاش ئەوەی پەنیر لە گوانی ئاژەڵ دۆشرا، بۆخۆی پلەی گەرمایەکەی مامناوەندە. واتا لە دەوری ٣٠ پلەی سانتیگراددا دەبێت. لە کوردیدا پلەی مامناوەندی ئاو بە شیلەوگەرم، شیرتین و شیلەوتین دەناسرێت. ئاوێك نە سارد بێت و نە گەرم، ئاوی شیرتینە، واتا تینی لە ئاستی پلەی گەرمی شیرە. کەوابوو ئەگەر نیاز ئەوە بێت پەنیر دروست بکرێت، پێویستە شیرەکە هەوێن بکرێت تا ماکی شیرەکە بپرووسقێت و گرێ گرێ بێت واتا ببێتە دەڵەمە.

لە کوردەواری چەندین هەوێنی سروشتی هەیە، وەکوو: شیرەی گیا، شیلاوقەی ئاژەڵ، سرکە و ماست.

بەگشتی شێوەی تەندروست و پەسەندی پەنیری دەڵەمە بەم شێوەیە:

- هەوێنی شیلاوقەی ئاژەڵ: شیلاوقە یا هەمان شیردان کە لە ناوسکی گوێرەکە و بەرخۆلە و کاریلەدا هەیە. ئەم ئاژەڵانە پێش ئەوەی بچنە ناو قۆناغی خواردنی گیا، خۆراکیان تەنیا شیری دایکیانە. شیلاوقەی ئەم ئاژەڵانە وشك دەکەن و ئینجا لە شیری هەڵدەکێشن یا هاڕاوەکەی دەکەنە ناو شیر بۆ پەنیر و دەڵەمە. شیلاوقە بەتەنیا یا تێکەڵ بە خوێ و سیر بەکار دەهێنرێت.
- هەوێنی ماست: ٤ کەوچك ماستی ترش بۆ یەك کیلۆ شیر
- هەوێنی سرکە: ٣ کەوچك سرکە بۆ یەك کیلۆ شیر
- هەوێنی شیلەی گیا: یەك کیلۆ شیر، چەند دڵۆپە تا ئاستێك تامی شیرەکە تاڵ نەبێت.

لە کوردەواری گیای دووگنە (*Galium sp.*)[1]، زریزانە (*Asperula setosa*)، خوشیلك (*Euphorbia sp.*)، کاردوو (*Biarum carduchcorum*)[2] و شیرەی هەنجیری کاڵ

١. لە کوردیدا چەندین ناو بۆ ئەم گیا دانراوە، وەك دووگنە، مێزەرەمەلا، شیرگرسێن و شۆتگرسێن

٢. وتاری: بررسی امکان کاربری عصاره گیاه کارده به عنوان رنت گیاهی در تولید پنیر سفید ایرانی، حوجەتوڵا گوڵکاری و هاوکارانی لە زانکۆی شیراز، گۆڤاری بهداشت مواد غذایی، ژمارە ٢٧، ١٣٩٦

بەکار دەهێنرێت بۆ هەوێنی پەنیر.

- هەوێنی کیمیاوی: بە فارسی (مایە پنیر) کە ڕێژەی بەکارهێنانی جیاوازە.

ئەگەر کیلۆیەك شیر بکوڵێنی تا ئاستێك کە قوڵت بدات، ئینجا تینی ئاورەکەی بۆ کەم بکەیتەوە تا ٥ خولەك و هەوێنەکەی پێ زیاد بکەیت. شیرەکە دائەگریت تا سارد بێتەوە و شیرەکە جیاجیا دەبێتەوە. ئینجا لە توورەکەیەکی خام دەکرێت تا ئاوەکەی بگوشرێ و لە خوێاوکی دەخەیت تا سوێر بێ و پەنیری دەڵمە ئامادە دەبێ.

## جۆری پەنیری تاڵمە

ئەم پەنیرە تایبەتی ڕۆژاوای کوردستانە و زۆرتر لە دەڤەری عەفرین دروست دەکرێت. ئەم بەرهەمە چووەتە ناو زمانی عەرەبی و بووەتە (جبنة التالما). تاڵمە، تاڵما یا تالما هەمان وشەی کرمانجی دەڵمەیە. زانیاری ئەم پەنیرە بەم جۆرە بە دەستم گەیشت: دەمێکە لە فەیسبووك لەگەڵ کاك ئاری خۆرشید هاوڕێین و هەمیشە پۆست و کۆمێنتی یەك دەخوێنینەوە و زانیاری دەگۆڕینەوە. کاك ئاری بۆخۆی خەڵکی کەرکووکە و ئێستە لە وڵاتی دانمارك نیشتەجێیە. خیزانەکەی خەڵکی گوندی چوولاب نزیك شاری عەفرینە. بەڕێزیان هۆگریەکی تەواویان بە بواری فۆلکلۆر و کەلتووری کوردایەتی هەیە. زستانی ١٣٩٦ هەندێ زانیاری سەبارەت بە پەنیری تاڵمە لە پەڕەی خۆی دانابوو. بەلامەوە گرینگ و بەنرخ بوو. لە ناو مانگی گوڵان یەکێك لە خوێندکارانی فوق لیسانسی صنایع غذایی زانکۆی ئازادی سنە بە ناوی ئارەزوو موحەممەدزادە پێوەندی پێوە گرتم بۆ دۆزینەوەی ئەو گیایە کە ئەوسا لە ناوچەی خۆمان بۆ هەوێنی پەنیر بەکاریان هێناوە. پاش پشکنین و گەڕانێکی زۆر ئاخری ڕێگەمان کەوتە ئاوایی گڵیە پشت شاری سەوڵاوا. کاك عارف تەبەد بۆخۆی فوق لیسانسی گیاگەل دەرمانی هەیە و خەڵکی گڵیەیە. بەیارمەتی دایکی کاك عارف ئەو گیایەمان دۆزییەوە. گیاکە جۆرێك لە گیای خوشیلکە. دادە ئامنە بۆخۆی هەندێ لە شیری ئەو گیایە کردە سەر کلۆیەك قەند و خستیە ناو کاسەی شیر. پاش چەند کاتژمێر گرسا، بەڵام هەندێ تامی تاڵ بوو. دواتر دەرکەوت ئەو گیایە کە مەبەستی ئەم توێژینەوە بوو جۆرێك لە زریزانەیە ( *Asperula setosa*) نەك خوشیلك.

زانیاریەکانی کاك ئاری بۆ کار و توێژینەوەکەی خانم موحەممەدزادە بەکەڵك هاتن و بوونە بەرچاوڕۆشنیەك بۆ کارەکەی. دواتر لە پێوەندیەك لەگەڵ کاك ئاری زانیاری زیاترمان لەسەر پەنیری تاڵمە دەست کەوت: کاتی خۆی کابانی دیواخانی ئاغای گوندی چوولاب لە نزیك شاری عەفرین ئەم پەنیرەی داهێناوە. ئەم ئاغایە دەبێتە باوکی خەزووری کاك ئاری خورشید.

زیاتر لە سەدەیەك لەمەوبەر ماڵباتی ئەم ئاغایە لە باكووری كوردستانەوە ئاودیوی عەفرین بوون و گوندی چوولابیان ئاوەدان كردووەتەوە. ئاغای چوولاب زۆرتر حەزی لە خواردنی تازە بووە. جا بۆیە پەنیری دەڵەمە یەكێك لە خۆراكە خۆشەكانی بووە. جۆری پەنیری دەڵەمەیەك كە هەوێنەكەی لە شیلەی هەنجیر دروست كراوە. گوایە كابانی دیواخانەكەی چوولاب بەیانیانە زوو شیری بزن و مەڕەكانی دۆشیوە و چەند دڵۆپ شیلەی قونچكی هەنجیری كاڵی تێ كردووە تا شیرەكە دەڵەمە بووە و ئینجا پاڵاوتوویە و بۆ خواردنی بەیانیانەی ئاغایان داناوە. ئەگەر شیلەی هەنجیری كاڵ دەست نەكەوتووە شیلەی گەڵای هەنجیریان بەكار هێناوە. تەنانەت وەرزی گەشەی هەنجیر هاتوون جامە گڵینەیەكیان هێناوە و بەرەبەرە شیلەی هەنجیریان تێدا چۆڕاندووە و ئینجا لە شوێنێ فێنك دایانناوە تا خەست و ڕەق بووەتەوە و بەوشككراوی هەڵیانگرتووە بۆ زستان. كاك ئاری باسی لەوە دەكرد كە بۆخۆی سەردانی گوندی چوولابی كردووە و لە نزیكەوە ئەو پەنیرەی دیتووە و خواردوویە. پەنیری تاڵما ئەگەر ڕێژەی هەوێنەكەی بەچاكی ڕەچاو نەكرێت پەنیرەكە تاڵ دەبێت و ناخورێت.

**وێنە: پەنیری تاڵمە**



